# کەنیزەی شازادەی میسر

نوسینی: مایکڵ پیرامۆ

تیوەندی Aram




بەرگی یەکەم و
بەرگی دووەم

# کلیۆپاترا

چاپی نوێ
٢٠٠٩

وەرگێرانی بۆ کوردی
عومەر رەسوڵ خدر

# خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی ئارام

151

**کیلیۆپاترا**

**نووسینی:**

**مایکڵ پیرامۆ**

**وەرگێڕانی بۆ فارسی:**

**زدبیحولای مەنسوری**

**وەرگێڕانی بۆ کوردی:**

**عومەر ردسوڵ خدر ( شینکی )**

چاپی دووەم

سلێمانی............................................................................2009




کتێب: کیلیۆپاترا

بابەت: مێژوویی

نووسینی: مایکڵ پیرامۆ

وەرگێڕانی بۆ فارسی: زەبیحوڵای مەنسوری

وەرگێڕانی بۆ کوردی: عومەر ڕەسوڵ خدر (شینکی)

نەخشەسازی و بەرگ: نێوەندی ئارام

کۆمپیوتەر: وەفا صلاح

سەرپەرشتیاری چاپ: ئارام مەلامحەمەد

تیراژ: 1000 دانە

ژمارەی سپاردن: ژمارە (837)ی ساڵی (2006)ی پێدراوە

نرخ: (8000) دینار.

# پێشەکی وەرگێڕی کوردی

مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، بەلام شێوازی ڕووداوەکان گۆڕانکاریان بەسەردادێت، بەپێی ڕۆژگارو سەردەمەکان، ئەگەر لەوسۆنگەوە سەیری مێژوو بکەین، دەبێتە بۆچوونێکی ئایدیالی. ئەگەر لەگۆشەنیگای کۆمەلایەتی هاوچەرخیشەوە شیکاری ئەمە بکەین، پێوانەکان پێچەوانە دەبنەوە. خۆکە بەتێڕوانینی تایبەتیش لێیبڕوانین: نەمێژوو زانستەو نەدووبارەش دەبێتەوە، تەنها هەندێ لەیەکچوونی سادە بەرووداو وپێشهاتەکانەوە دیارن.

لێرەدا دەکەوینە بەردەم پرسیارێک، ئەویش ئەوەیە: ئایا لەکوێدا مێژوو بەهای خۆی لەدەستنادات، مادام ڕووداوەکان لەدووبارە بوونەوەدان؟

کاتێ ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، هەست دەکەیت چێژێکی تایبەتی هەیە، چونکە ئێمە بەڕۆژگارێک ئاشنادەکات، ئەگەر لەگۆشەنیگایەکەوە شیکاری پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان بکەین، زۆر جیاوازییان لەگەڵ ئەم سەردەمەماندا نییە، چ لەڕووی سایکۆلۆژیای مرۆڤەکان و چ لەڕووی پەیوەندییە ئابوورییەکان و فەرهەنگ و... تاد.

هەموو ئەمانە وادەکەن ئەم کتێبە بەزیندویی بمێنێتەوە، ئەوەندەی ئەم پەرتوکە لەڕووی مێژوویی‌یەوە گرنگی هەیە، ئەوەندەش سەبارەت بەکۆمەڵگاو شێوازی پەیوەندییەکانی ئەو بەنرخە. کاتێ (شرمیون) کارەکەرەکەی کلیۆپاترا، بەشێوەیەکی وردو جوان وسادە. ئەو ڕۆژگارەمان بۆ دەگێڕێتەوە، مرۆڤ هەستدەکات زۆر ستەم لەشارستانییە غەیرە ئایینییە ئاسمانییەکان کراوە. چونکە زۆربەیان دواتر شێوێندراون وکلێشەی ساختەیان بەبەرداکراوەتەودو دراونەتەوە بەکۆمەڵگەکان.

لەکۆتایدا ئەوەماوە بەخوێنەرانی ئازیز بڵێین، ئەم پەرتوکە زۆر حەقیقەتی جوانی لەخۆگرتووە. لەوانەیە زۆربەمان پەیمان بەوراستییە جوان وئاڵۆزانە نەبردبێت. کەلەم کتێبەدا دەکەونە بەرچاو.

## پێشەکی وەرگێڕی فارسی

هەندێك ناوی مێژوویی لەلای ئێمە ئەوەندە ئاشنایەتییان هەیە کەزۆرجار واوێنایان دەکەین، خاوەنی ئەم ناوانە دەناسین، لەکاتێکدا کۆی گشتیی زانیاریی ئێمە سەبارەت بەوانە، لەبیست ڕستە تێپەڕناکات، خۆئەگەر تێکەڵاویش نەبوبێت بەئەفسانەوە، یەکێك لەو ناوە مێژووییانەی کەهەموومان بیستومانە (کلیۆپاترا)ی پادشای میسرە، کەلەنیوەی یەکەمی سەدەی ئێستاماندا، (2) دامەزراوەکانی بەرهەمهێنانی فیلم، بوونەتەمۆی بەناوباگکردنی ئەم ناوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دەزگا ناوەندییانەی فیلمسازیی بازرگانین ودەیانەوێت ڕەواج بۆ فیلمەکانیان زیاتربکەن، ڕاستییە مێژووییەکان لەگەڵ ئەفسانەدا تێکەڵدەکەن، بەشێوەیەك کەڕەسەنایەتییەکەی خۆیان لەدەستدەدەن و لەناو هۆشی بینەردا تەنها وەك ئەفسانەیەك دەمێننەوە.

ئەوبەسەرهاتەی کەئێمە لەم کتێبەدا بەناونیشانی (کەنیزەکی کلیۆپاترای پاشای میسر) پێشکەش بەخوێنەرانی دەکەین، جیاوازە لەوەی کەتاکو ئێستا لەفیلمەکاندا پێشانی بینەران دراوە، لەبەرئەوەی دەربارەی یەکێك لەناسراوترین ناوداری مێژووییە، واتا (کلیۆپاترا) کەبەلای هەموانەوە گرنگە.

(2) ئەم کتێبە لەسەدەی ڕابردوودا چاپکراوە. بۆیە دەڵێت لەنیوەی یەکەمی سەدەی ئێستاماندا، واتا مەبەستی لەسەدەی بیستە (و- کوردی)

## ڕاوێژکارێکی شانشینی میسر

ناوی من (شیرمون)ەو باوك ودایکم خزمەتکاربوون، بۆیە منیش بووم بەکەنیزەك، دایك وباوکم کەلەکۆشکی پادشایەتیدا خزمەتکارییان دەکردو من لەوتەلارەدا چاوم بەدنیا هەڵهێناوەو چەند ڕۆژێك دوای لەدایکبوونی من، کچی پاشای میسر کەدایکی جوولەکەبوو، لەدایك بووەو ناویان ناوە (کلیۆپاترا)

من هیچ زانیاریەکم سەباردت بەسەردەمی منداڵیی خۆم نییە، بەڵام بەبیرم دێت کەلە سێ ساڵییەوە گەمەم لەگەڵ کلیۆپاترادا دەکردو ئەو لەنێوان کچۆڵە بچووکەکانی کۆشکدا، کەیفی بەمن دەهات وزیاتر هۆگری من بوو، پێموایە یەکێك لەوشتانەی منی لای کلیۆپاترا خۆشەویستکرد، ئەوەبوو لەکاتی گەمەکردندا، کاتێك ئەو لەپڕ تووڕەدەبوو ولێیدەدام و قژی ڕادەکێشام، من بەگژیدا نەدەچوومەوەو شەرم لەگەڵ نەدەکردو لەڕوویدا هەڵنەدەگەڕامەوە، بەڵکو دەچوومە گۆشەیەك ودەگریام ودوای چەند ساتێك کلیۆپاترا دەهات بۆلام و دەیگوت (شرمیون .. مەگری) زۆرجاریش بۆئەوەی دڵنەوایم بداتەوە، جۆرەکێکی شیرینی دەدامێ کەبەهەنگوین دروستکرابوو وپێی دەگوتم (بیخۆ...) منیش جۆرەکە بەلەزەتەکەم دەخستە دەممەوەو تورەیی و لێدانەکەی ئەوم بیردەچووەوە..

دواتر کەگەورەبووین، تێگەیشتم کلیۆپاترا جیاوازی لەگەڵ کچۆڵەکانی تردا هەیە، ئەو شازادەیە، ئەو تایبەتمەندییەی کەبەلای ئەوەوە سادەبوو، ئەوەبوو ئەو لەهەموو کچەکانیتر دیارتربوو، جگەلەوەی من توانیم لەوەتێبگەم کەکلیۆپاترا کیژۆڵەیەکی جوانە، پاشان کەباڵقبووم، بۆمدەرکەوت ئەو شازادەیە جوانییەکەی لەدایکییەوە بۆجێماوە، ئەو وەك دایکی چاوی گەورەو هەنگوینی و مووی ڕەش و ڕوخساری سپی وسوێ و دەمی بچووکبوو.

کلیۆپاترا، بەشێوەیەك هۆگری من ببوو، دایکی مۆڵەتی پێدام لەگەڵ ئەودا نانبخۆم، من یەکەم کچی کەنیزەك بووم کەلە کۆشکی پاشایەتیی میسردا لەگەڵ شازادەیەکدا نانم دەخوارد...

سەبارەت بەباوکی کلیۆپاترا ، شتێکم لەیادە، ئەویش ئەوەیە ئەوزۆر حەزی لەلێدانی شمشاڵبوو، باشم لەبیرە کەتا ئەو ڕۆژەی مرد، هەمیشە شمشاڵێك لەدەستی پادشای میسردا دەبینراو دەیژەنی.. جارجار کلیۆپاترا کەکچە گەورەی باوکی بوو (دوای ئەو پاشای میسر سێ ڕۆڵەی تری لەدایکی کلیۆپاترا هەبوون) شمشاڵەکەی لەدستی باوکی وەردەگرت و خەریکی لێدانی دەبوو، بەڵام نەیدەتوانی بیژەنێت، دوای ئەوەی ڕۆژگاری منداڵیی، کچی پاشای میسر بەسەرچوو وئاشنایەتی لەگەڵ مۆسیقادا پەیداکردو پەی بەبەهای کاری هونەرمەندان و مۆسیقا ژەنان برد، ئیتر گوێی بەشمشاڵی باوکی نەدەدا.

کلیۆپاترا، کاتەکانی لەگەڵ مندا بەسەردەبرد، کاتێك ئەویان دایەدەست مامۆستاکان بۆفێرکردنی، منیش بۆ پۆلەکەی دەچووم و وانەم دەخوێند، لەسەرەتاییەکاندا مامۆستاکانی شازادە خانم، ناڕازیی

بوون ودەیانویست من لەژووری دەرس خوێندنەکە وەدەرنێن، بەڵام هەموو جارێك کلیۆپاترا بەرگری لێدەکردم و ڕێگای نەدەدا دەرم بکەن، لەبەرئەوەبوو کەمن بەناچاری خوێندن و نووسینی یۆنانی فێربووم .[1]

[1] لەڕۆژگاری حوکمڕانیی بنەماڵەی بەتالیسەکاندا(304-30پ.ن) لەمیسردا، کەباوك وباپیری کلیۆپاترا بوون. میسرییەکان بەزمانی یۆنانی دەدانخاوتن ودەیاننووسی. شانبەشان لەگەڵ خەت وزمانی یۆنانیدا: فەرهەنگ وشارستانییەتی پێشکەوتووی کەبەدەریای هاژد ناوی دەرکردبوو. یەکێکبوو لەسەردارە دیارەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی ودوای مردنی ناوبراو ئەوخۆی بەپاشای میسر داناو هاتەسەر ئەم سەرزەمینەو زمانی یۆنانی لەبری زمانی میسری کۆن، جێگای گرتەوە. هەروەك چۆن لەئێراندا دوای مردنی ئەسکەندەر: نووسین وزمانی یۆنانی ڕەواجی پەیداکردو ئێمەی ئێرانی لەسەردەمی دەسەڵاتداریێتیی (سلوکییەکاندا بەزمانی یۆنانی دەمانخوێندو دەماننووسی: بەڵام هەرلەدوای بەهێزبوونی ڕۆمەکان و داگیرکردنی زۆربەی ناوچەکانی خاکی ئەورووپاو هەندێك لەئاسیاو سەرووی ئەفریقیا، زمانی لاتینی، واتا: زمانی ڕۆمی ڕەواجی هەبوو
(و- فارسی)

جگەلە نووسین و خوێندنەوە، لەبەرئەوەی لەوانەکانی کلیۆپاترا لەوێ بووم، زمانی لاتینیش (ڕۆمی) فێربووم، کەزمانی ڕەسمیی وڵاتان و ئەو شوێنانەیە کەکەوتووەتەژێر دەسەڵاتی ڕۆم. زمانی ڕۆمی کەلەمیسر زمانی خانەدانەکانەو گەورەکانی میسرو ئەو کەسانەی لەدیوانی پاشایەتیدا کاردەکەن، ناچارن فێری زمانی ڕۆمی بن.

هەروەها لەزانستەکانی مێژوو وجوگرافیاو ماتماتیك وئەندازیاریی، شارەزاییم پەیداکرد، کەئەم زانستەشیان بەشازادەی میسر دەگوتەوە، بەڵام سەبارەت بەزمان ونووسینی میسری کۆن، کەزمان ونووسینی زانایانی ڕۆحانی بوو وشازادەکان دەبوایە ئەوە فێربوونایە، بەرەوپێشچوونم بەخۆمەوە نەدی وئامادەی فێربوون ونووسینی ئەو زمانە نەبووم . بۆیە پێت سەیرنەبێت کەکەنیزەکێکی وەك من دەتوانێت قەڵەم بەدەستەوە بگرێت و ئەم یادداشتانە بنووسێتەوە.

وەك دەبینین ئەم بەسەرهاتە، بەڕێنووسی یۆنانی نووسراوە، نەك ڕێنووسی ڕۆمی، هەروەها زمان وڕێنووسی یۆنانی، بەڕێنووسی نەتەوەیی خۆم لەقەڵەم دەدرێت ومنیش زیاتر بەسەر ئەو زمانەدا زاڵم ، وەك زمانی ڕۆمی.

شوێنی من جێگایەك بوو کەکلیۆپاتراو هەموو ڕۆڵەکانی پاشای میسر لەئەسکەندەرییە ژیانیان لەوێدا بەسەردەبرد، بەشێوەیەك ئەگەر بێت وبچوونایە بۆشارەکانی خوارووی میسر، ئەوا درێژەی نەدەکێشاو بەزوویی دەگەڕانەوە.

کۆشك وباغی سەڵتەنەتی باوکی کلیۆپاترا لەئەسکەندەریە بەجوانترین کۆشك وگەورەترین وخۆشترین باغی سەڵتەنەتی دنیا دەژمێردرا. ئەمە من نایڵێم. بەڵکو خەڵکانی تریش خاوەنی هەمان ڕای منن، کەلەکۆشك وباغی سەڵتەنەتی ئەسکەندەریە جوانترو گەورەتر بوونی نەبوو. چونکە ئەوکۆشك وباغە

بەرفراوانەی ئەوان تاکوئێستاش هەرماوەو هەمووکەس دەتوانێت بچێت وبیبینێت، تابەڕاستی نووسینەکەی ئێمە بڕوابکات.

شاری ئەسکەندەریە کەپاشای میسرو خێزانەکەی تێیدا نیشتەجێبوون، جوانترین شاری دنیابوو، یەکەمجار کە (ئەنتوان)ی ڕۆمی گەیشتە ئەسکەندەریە لەتاسان وسەرسوڕماندا خەریکبوو شێت ببێت، خۆم لەدەمی ئەوەوە گوێم لێبوو، گوتی:ڕۆم، لەبەرامبەر ئەم شارە گەورەو جوانەدا، کەخاوەن شەقامی درێژو پانە، جگەلە سەرەنگوێلکێك هیچیتر نییە.

لەباغی گەورەی سەڵتەنەتی ئەسکەندەریەدا چەند جۆر ئاژەڵ بۆ کات بەسەربردن وکەیفی ڕۆڵەکانی پاشا هەیە، لەمانەش بۆ کچە گەورەکەی (کلیۆپاترا) بەڵام کلیۆپاترا زیاتر جۆرە مەیمونێکی خۆشدەویست کەشێوەی دەمیان لەمی سەگ دەچێت، هەرکاتێك لەخوێندنەوەو نووسین دەبووەوە، لەگەڵ ئەو مەیمونەدا گەمەمان دەکرد. کلیۆپاترا بەشێوەیەك هۆگری ئەومەیمونە ببوو کەئەو ئاژەڵەی لەتەك خۆیدا دەخەواند، مەیمونەکەش زۆر کەیفی بەشازادەی میسر دەهات وکاتێك ئەوی دەبینی لەخۆشیدا ڕای دەکردو خۆی پێدا هەڵدەواسی وجوڵەی پێکەنین ئامێزی دەکردو کلیۆپاترای دەخستە پێکەنین.

سالێکیان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەمیسردا تەرزە باری (لەمیسردا نەبەفر دەبارێت ونەتەرزە) بەڵام ئەوساڵە بێ ئەوەی ڕووباری نیل لافاو بەرپابکات، تەرزەیەکی درشت باری، ئەو تەرزەیە ئەوەندە گەورەبوو، کەپەلە باریکەکانی درەختەکانی دەشکاندو هەموو ئەو ئاژەڵانەی لەباغی سەڵتەنەتیدابوون، خۆیان پەناگیرکردبوو تائەو تەرزەیەیان لێنەدات. دوای ئەوەی تەرزەکە تەواوبوو، زۆر لەگوڵەکانی باغی سەڵتەنەتی لەناوچوون ولەسەر ڕووی زەوی یەك توێژاڵی سپی لەتەرزەی گەورە دەبینرا، مەیمونەکەی کلیۆپاترا ڕایکردو لەسەر تەرزەکە خزاو کەوت وپاشان هەستایەوەو چنگێك تەرزەی هەڵگرت وبەئاسماندا هەڵیداو پەرشی کردەوە، بەڵام دوای ماوەیەك ساردیی تەرزەکە کاری لەوئاژەڵە کردو دەستیکرد بەهەڵەرزین، منیش مەیمونەکەم هەڵگرت وبردمە هۆڵەکەو بەفەرمانی کلیۆپاترا بەپارچە قوماشێکی نەرم کەوتمە وشککردنەوەی، مەیمونەکە لەسەرماندا هەڵدەلەرزی، کەگەرمی بووەوە دەستیکردبە وازیکردن، بەڵام هەمان شەو توشی نەخۆشی بوو وتابەیانی ناڵاندی.

پاش پرشنگی بەیانی، کلیۆپاترا پزیشکی هێناو داوای لێکرد دەرمانی مەیمونەکە بکات، پزیشکەکەش گوتی: ئەو مەیمونە تای گرتووەو پێویستە دەرمانی بدرێتێ، تاچاك دەبێتەوە، بەڵام دەرمانەکەی دوکتۆر چاری مەیمونەکەی نەکردو ڕشانەوەی توندیش دەستیپێکرد، لەوکاتەدا پزیشکەکە گوتی: مەیمونەکەی کلیۆپاترا دووچاری هەوکردنی سییەکان بووەو ئەم نەخۆشییە لەنێو مەیموندا مەترسیدارەو بەڕێکەوت ئەگەر مەیمونێك بتوانێت لەونەخۆشییە ڕزگاری بێت ونەمرێت.

پاش سێ ڕۆژ، لەکاتێکدا کەمن مەیمونەکەم لەباوەشدابوو، هەستمکرد لەپڕدا لەشی قورس بوو وچاوەکانی بەکراوەیی مانەوە، هەرچەندە تائەوکاتەیش منداڵبووم، بەڵام تێگەیشتم مەیمونەکە مردووە. کاتێك کلیۆپاترا زانیی مەیمونە ئازیزەکەی ڕۆح لەلەشیدا نەماوە، گریاو باوکی فەرمانیدا ئەومەیمونە مۆمیا بکرێت، ئینجا بینێژن. بۆئەوەی بۆ هەمیشە تێك نەچێت، لەسەر داخوازیی کلیۆپاترا، مەیمونەکەیان لەباغی سەڵتەنەتیدا ناشت.

هیچ کەس لەوانەی کەلەکۆشکی پاشایەتیدا خزمەتیان دەکرد، بەقەدەر من جێگای متمانەی کلیۆپاترا نەبوون، هۆکەیشی

ئەوەبوو کلیۆپاترا هیچ یەکێك لەوانەی بەشایستە نەدەزانی نهێنییە بچوکەکانی خۆی لایان بدرکێنێت، هەروەها هیچ کام لەوکەنیزانەی کەلەکۆشکدا خزمەتیان دەکرد، خوێندەوارییان نەبوو، نەیاندەتوانی بنووسن وبخوێننەوە، هەندێك لەوانە نەیشیاندەزانی ئایا ڕۆم کەوتۆتە سەرووی میسر- یان خوارووی، لەنێوان کەنیزەکەکانی کۆشکی پاشایەتیدا تەنها من بووم زمانی ڕۆمیم دەزانی ودەمتوانی لەگەڵ شازادەی خۆمدا باسی مێژوو وجوگرافیا بکەم، کاتێك گەورەبووین، هەرچەندە هەندێك لەژنی پیاوە گەورەکانی میسر، بەهۆی ئەوپلەو پایەیەی هەیانبوو، بوونە دەستەخوشکی وتێکەڵاوییان لەگەڵدا پەیداکردبوو؛ بەڵام کلیۆپاترا، هیچ کام لەوانەی بەشایستە نەدەزانی تاقسەی دڵی خۆی بۆئەوان باسبکات.

کلیۆپاترا هیچ ڕازێکی لای من نەدەشاردەوەو من ئاگاداری هەموو نهێنییەکانی ژیانی ئەوبووم ودەتوانم بەبوێرانە بڵێم، هیچ کەسێك وەك من کلیۆپاترای نەناسیوەو نهێنییی ژیانی ئەوی نەزانیوە، بەڵام لەبەرئەوەی کەنیزەك بووم، بەیەکێك لەئاشناو هاوڕێکانی کلیۆپاترا نەدەژمێردرام ولەتەشریفات وخواندارییی میوانەکاندا شوێنی من، لەگەڵ خزمەتکارەکاندابوو.

هەتا ئەوکاتەی تەمەنم گەیشتە باڵقبوون، پێموابوو کلیۆپاترا تەنیا کەسێکە ئەوناوەی هەڵگرتووە، بەڵام پاش ئەوەی گەورە بووم وزانیاریم لەسەر مێژوو پەیداکرد، بۆم دەرکەوت کەپێش خانمی من، شەش شازادە خانمی تر بەناوی کلیۆپاترا هەبوون وهەمووشیان بوونەتە پاشاو شاژن. کلیۆپاترای منیش بەحەوتەمین کلیۆپاترا هەژماردەکرێت، لەنێوان کلیۆپاتراکاندا کەلەڕابردوودا بەوناوەوە هەبوون، لەگەڵ کلیۆپاترا خانمەکەی مندا جیاوازیان هەبووە، چونکە ئەو کلیۆپاترایەی من بەژنێکی نوێخواز لەقەڵەمدەدرێت. نازانم باوکی کلیۆپاترا بە چ نەخۆشییەك مرد، باوکی کلیۆپاترایان وەك باوك وباپیرانی بە(بەتلیمۆس) ناودەبرد کە(12) کەس پێش ئەوبەهەمان ناو لەمیسردا پاشایەتییان کردووەو باوکی کلیۆپاترایش بە بەتلیمۆسی سێزدەهەم دەژمێردرێت، بەڵام گەلی میسر ئەوەیان بەشمشاڵ ژەن دەناسی، لەبەر ئەوەی هەمیشە شمشاڵی لێدەدا.

شمشاڵ لێدانی پاشای میسر بەبڕوای من جۆرێکبوو لەشێتی، چونکە مرۆڤ هەرچەندە هۆگری مۆسیقایشبێت، بەدرێژایی تەمەنی شمشاڵ لێنادات ..!!

ئەوەبوو باوکی کلیۆپاترا چەند ڕۆژێك وازی لەشمشاڵ لێدان هێنا، هەموو وایان دەزانی کەنەخۆشە، چونکە هەرکاتێك پاشای میسر نەخۆشبوایە؛ دەستی لەشمشاڵ لێدان هەڵدەگرت، جاران هەرکاتێك بەتلیمۆسی سێزدەهەم.

لەسەر جێگای نەخۆشی هەڵدەستایەوە، ئەوشتەی کەداوای دەکرد، شمشاڵ بوو، بەڵام ئەوساڵە نەیتوانی لەنەخۆشییەکەی چاکبێتەوەو لەسەرجێگا هەڵبستێتەوە. ڕۆژێکیان کچە گەورەکەی (واتا: کلیۆپاترا)و ڕۆڵەکانی تری بانگکردو لەوکاتەدا خزمەتکارەکانی کۆشکیش، لەوانە منیش ئامادەبووین،

دەستی کوڕەکەوی، واتا براکەی کلیۆپاترای گرتودەستی کلیۆپاترایشی خستەناو دەستی براکەیی و گوتی: پێویستە ئێوە ببنە ژن ومێردو ڕۆڵەی بەهێزو جوانتان ببێت.
کلیۆپاترا سەری نەوی نەکردو براکەشی هیچی نەگوت وسێ ڕۆژ دوای ئەوە پاشا مردو تەرمی پاشای میسر دوای مۆمیاکردنی بردیانە شوێنی تایبەتیی خۆی وچوار لەڕۆڵەکانی کەیەکێك لەوانە کلیۆپاترا بوو، لەچوار دەوری تەرمەکەی ڕاوەستابوون.
هەموو ئەو ئاژەڵانەی کەپاشا خۆشی دەویستن، لەوانەش چوار سەگ، کەنەژادی سەگەکانی حەبەشەو پڵنگێك کەلەنەژادی یوزپڵنگی سوریایی بوون وئەسپی عەرەبی بەتلیمۆسی سێزدەیەم- کەیەکێك لەمیرەکانی عەرەبستان بەدیاریی بۆی ناردبوو، هێنایانن بۆ نزیك تەرمەکەی، پڵنگ وسەگەکان لەتەکیدا کەوتن، بەڵام ئەسپەکە هەر بەڕاوەستاوی مایەوە.
لەبەرئەوەی پاشای میسر لەژیانیدا حەزی لەشمشاڵ لێدانبوو، دەستەیەك لەشمشاڵ ژەن هاتن وتاتوانییان، بێهیلاکبوون بەدرێژایی مەراسیمەکە شمشاڵیان دەژەنی، ئەم باوە لەداب و نەریتی میسریانەو لەنەریتی یۆنانیدا نییە (بەتلیمۆس)ی یەکەمی پاشای میسر کەسەردارێکی ئەسکەندەری مەکدۆنی بوو، دوای مردنی ئەسکەندەر لەمیسردا حوکمی کردو بەکەسێکی یۆنانی لەقەڵەم دەدراو تەنها پەیرەویی داب ونەریتی یۆنانی دەکرد، بەڵام ڕۆڵەکانی ئەو دوای ماوەیەك لەحوکمکردنیان لەمیسردا، کەوتنەژێر کاریگەریی داب ونەریت و مەراسیم و سروتەکانی میسری وماوەیەکیش بۆ فریودانی خەڵك، وایان پێشاندەدا کەیەکێکن لەپەیرەوانی مەراسیمەکانی میسر.
میسرییەکان باوەڕیان وایە، کاتێك کەسێك دەمرێت، ئەوشتانەی لەڕۆژگاری ژیانیدا خۆشی ویستوون، پێویستە لەتەکیابن، بۆیە ئەوئاژەڵانەی کەخۆشەویستی پاشا بوون، هێنابوویاننە تەنیشت تەرمەکەو شمشاڵ ژەنەکانیش بەردەوام شمشاڵیان دەژەنی. دواتر ئەوکەسانەی کەکاریان گریانبوو بۆمردووان، هاتن، یەکێك لەوانە بەئاوازێکی غوربەت وسۆزدار دەیلاواندەوەو ئەوانیتریش بۆیان دەستاندەوەو دەگریان، کرووزانەوەو گریانی ئەمانە بەشێوەیەك کاریگەربوو کەهەمووانی گریاند،
بەکلیۆپاتراشەوە. دواتر ڕۆحانییەکان هاتن، بەڵام ئەوانە میسری بوون و وەك کاهینەکانی میسر سەریان دەتاشی وکەللەیان چەور دەکردو لەسەرشانی ڕاستی هەمووان یەك پارچە پێست دەبینرا.
پێشوازیکردنی ڕۆحانییەکان دوو جیاوازیی لەوانیتر هەبوو، پێشەوای ڕۆحانییەکان بەدوو نیشانەی تایبەت لەوانیتر جیادەکرایەوە، کەیەك کەشکۆڵی پڕ لەڕۆنی پیرۆزی لەدەستدابوو وپریاسکەیەکیشی لەشاندابوو، ڕۆحانییەکانی میسری لەنزیك تەرمی پاشای میسردا بەیەك ڕیز ڕاوەستان و ئەوپیاوەی کەشکۆڵی لەدەست وپریاسکەی لەشاندابوو، بەرامبەر ڕۆحانییەکانی تر وەستاو پێکەوە دەستیانکرد بەوتنی یەك سروودی ئایینی، ئەم مەراسیمە کەمن بۆ یەکەمجارم بوو لەنزیکەوە بیبینم، بەڕای من پێشەنگ وشکۆمەندییەکی تایبەتیی هەبوو. سەرئەنجام بەجوڵەیەکی هێواشی دەستی پێشەواکەیان کۆتایی بەسرودی ڕۆحانییەکان هات، دواتر تەرمەکەیان هەڵگرت بۆ ئەوەی بیبەن بۆ ئارامگای پاشایانی میسر، من بینیم هەندێك لەئەفسەرانی ڕۆمیش، لەگەڵ مەراسیمی ناشتنی تەرمی پاشادان.
کاتێك تەرمەکەیان بەرەو دوا ئارامگا دەبرد، ڕۆحانییەکان کەوتنە ڕیزی پێشەوەو دوای ئەوان ئافرەتەکان وپاش ئەوانیش کلیۆپاتراو هەموو ڕۆڵەکانی تری پاشای میسرو ئاژەڵەکانی، کەلای پاشا

**خۆشەویست بوون، دەڕۆیشتن. دوای ئەوان ئێمە کەخزمەتکاری کۆشکی پاشا بووین، دەستمانکرد بەڕۆیشتن وهاولاتیانی شاری ئەسکەندەریەو ئەفسەرانی ڕۆمی لەپشت ئێمەوە دەهاتن، من لەشوێنێکەوە دەڕۆیشتم کەگوێم لەگفتوگۆکانی ئەفسەرانی ڕۆمی بوو، ئەوان باسی مەراسیمی بەخاکسپاردنی پاشایان دەکردو دەیانگوت، لە(یۆنان و ڕۆم)دا مەراسیمی بەخاکسپاردنی ئەم سادەیە. لەبەرئەوەی (بەتلمیۆسی سیزدەهەم)یش یۆنانی بوو، نەدەبوایە تەرمی ئەویان بەشێوازی مەراسیمی میسری بۆ دوا ئارامگای ببەن.**

**لەو ڕۆژانەدا (ئەنتوان)ی ڕۆمی لەناو ئەفسەرەکاندا نەبوو (*) بۆیە کلیۆپاترا لەو ڕۆژانەدا زۆر گوێی نەدەدا بە ئەفسەرەکانی ڕۆمی .**

(*) لێرەدا پەیێویستی ناناسێنی ئەنتوان بەخوێنەران بناسێنین. چونکە لەمەودوا باسی لێوەدەکرێت (وە-رگێڕی کوردی).

**من دەمزانی (ئەنتوان) چووە بۆشەڕ لەگەڵ ئێرانییەکانداو دەنگۆی ئەوەش هەیە، لەسەر زەمینی (بین النهرین)دا توشی شەڕو پێکدادان بووەتەوەو شکستێکی گەورەی هێناوەو ڕوون نییە زیندووە- یان مردوو.**

**دوای ئەوەی تەرمی (بەتلیمۆسی سیزدەهەم) بەخاکسپێردرا، ئاهەنگی گواستنەوەی کلیۆپاترا بۆبراکەی ئەنجامدرا، سێ مانگ دوای کۆچکردنی باوکی کلیۆپاترا.**

**من لەژوورەکەی ئەودابووم، دنیا بەرەو تاریکی دەچوو، شەو دادەهات، کەنیزەکەکان چراکانیان هەڵدەکردو بۆ ژوورەوەیان دەهێنان، لەوکاتەدا نۆکەرێك هاتەژوورێ وگوتی سێ وەزیرەکانی میسر دەیانەوێت بۆیەك ئیشی گرنگ بۆخزمەت پاشا بێن.**

**کلیۆپاترا کەببووە هاوسەری براکەی خۆی، بوو بەشاژنی میسرو هەموو ئەویان وەك پاشای میسر سەیرد دەکرد.**

**لەو ڕۆژەوەی کلیۆپاترا بووبە شاژن، تائەو ڕۆژە ڕێك نەکەوتبوو کەوەزیرەکانی میسر دوای تاریکداهاتن بێن بۆلای پاشاو سەبارەت بەکاروبارەکانی وڵات گفتوگۆ بکەن، من کاتێك گوێم لێبوو کەوەزیرەکان دەیانەوێت سەردانی پاشابکەن، کەوتمەڕێ تالە ژوورەکە بچمەدەرەوە، بەڵام کلیۆپاترا گوتی : شرمیون، بۆکوێ دەچیت .. ؟ ڕاوەستە، کاری وەزیرانی میسر هەرچەندە گرنگبێت، من تۆ بەناشایستە نازانم ودەتوانیت لێرە بمێنیتەوە، گوێت لەخواست و داواکارییەکانیان بگریت.**

**من ڕاوەستام و وەزیرەکان هاتنەژوورەو لەبەرامبەر شاژنی میسردا چەمانەوە تاسەریان نزیك زەوی بووەوە، دوای ئەوەی ڕاست بوونەوە، کلیۆپاترا لەئەوانی پرسی ئەوکارە زۆر گرنگە چییە کەئێوەی والێکردووە لەم کاتەدا داوای بینینی من بکەن و بێن بۆلام؟**

**یەکێك لەوانە کەلەدوو وەزیرەکەی تر گەورەتربوو، سەیرێکی منی کردو پرسیی: ئایا دەتوانین نهێنیی گرنگی وڵات بڵێین یان نا؟**

کلیۆپـاترا تێبینیـی ئـەو تێروانینـەی ئـەوی لـەمن کـردو گـوتی: شـرمیون لەمنداڵییـەوە لەگـەڵ منـدا گەورەبووەو خۆمانەیەو ئێوە دەتوانن هەرچی دەتانەوێت دەری بڕن.

وەزیر، گوتی: ئەو شتەی کەمن دەمەوێت بیڵێم، یەکێك لەنهێنییەکانەو نابێت کەسانی تر بیبیستن.

شـاژن گـوتی: شـرمیون کـەنیزەکی تایبـەتیی منـە، لەمنداڵییـەوە لەگـەڵ منـدا گـەورەبووەو کەنیزەکێکە نهێنی نادرکێنێت. من دڵنیات دەکەمەوە شرمیون ئەو ژنەیە کەنهێنیی تۆ نادرکێنێت!!

وەزیـر گـوتی: پاشـام تـۆ لـەو ڕۆژەوەی شـوتکردووە، هـەتا یـەك شـەو ڕێگـات نـەداوە ئـەو بێتـە ژووری نوسـتنەکەتەوەو هـەموو شـەوێك کـاتی خـەو براکـەت بـەرەو ژوورەکـەی تـۆ دێـت ودەیـەوێت بێتـە پاڵـت، کەچی تۆ دەرگای ژوورەکەت لەدیوی ناوەوە دادەخەیت. ئەم کارەی تۆ بەپێچەوانەی داب ونەریتمانەو بەدرێژەپێـدانی ئـەوکارەت میللـەت نـاڕازی دەبێـت، چـونکە میـسر نابێتـە خـاوەنی شانـشینی تـازەو براکەشت نیگەرانە، بۆیە ناتوانێت لەو ژن ومێردایەتییە ڕازی بێت.

کلیۆپاترا گوتی: بۆ قەناعەت پێکردنی ئێوە، دوو بەڵگە دەدەم بەدەستەوە:

بەڵگـەی یەکـەم: ئەوەیـە مـن یەکـەم ، یۆنـانیم وشـوکردن بـەبرای خـۆم، بەیـەك کـاری ناسروشـتی و وەحشییانە دەزانم.

دووەم: ئێوە هەرسێکتان یۆنانین، پێویستە باوەڕ بەقسەکانی من بکەن.

وەزیـرە گەورەکـەیان گـوتی: ئێمـە سـەبارەت بەنـەژادمان یۆنـانین، بـەڵام وەزیـری وڵاتـی میـسرین وهاوسـەرێتی خوشـك بـۆ بـرا ڕەوایـە، بـەڵکو شـتێکی دڵخۆشکەریشە. تائەوکاتـەی تـۆ بـرات هەیـەو دەتوانێت ببێتەت مێردت، لەگەڵ بێگانەیەکدا پەیمانی خۆشەویستی ببەستیت وخۆت لەهاوسەریەتیی براکەت ببوێریت، چونکە ئەو وایردەکاتـەوە تـۆ لەوانەیـە کـەموکوریی جەستەییت هـەبێت وهەستی ژنانەیت تێدانەبێت.!

کلیۆپـاترا گـوتی: بەهەڵـەدا دەچیت کـەوابزانیت لەمنـدا هەسـتی ژنێتـی نـەبێت، بـەڵام براکـەی مـن لەتایبەتمەندییـەکانی پیـاوەتی دامـاڵراوەو بێبەشـەو ئەگـەر تـۆ توانیـت بـۆمنی بـسەلمێنیت کەبراکـەم خاوەنی سیفەتەکانی پیاوەو بەکارە، پەیمانت دەدەمێ هـەموو شـەوێك لەژوورەکەی خۆمدا پێشوازیی لێبکەم

()- خوێنـەران، لێکۆڵەردوان دەزانن کەلەمیسری کۆندا (لەچەند وڵاتێکی تریش) هاوسـەرێتی لـەنێوان خوشك وبرادا، باوك و کچ، هاوسەرێتیی لەنێوان خێزان وبنەماڵەدا بەشێوەیەکی ڕەسمی و وەك شتێکی ئاسایی و سروشتی بووە. فیرعەونەکانی میسرو جێنشینانی ئەوان لەوبڕوایەدا بوون، ئەوان خەڵکانێکن لەنەژادی خوایان وجیاوازییان هەیە لەگەڵ خەڵکی عادیدا. بۆ پاراستنی توخمی پاشایەتیش لەنێوان خۆیاندا هاوسەرێتییان دەبەست. ئەم باوەڕە خراپە ئەوەندە چووبوودناو ناخی بنەماڵەکانی پاشاکانی میسرو (چەند شانشینێکی تر) هەتا بەتلیستەکانی کەبە ڕەچەڵەك یۆنانیش بوون وحکومەتی ئەوان دوای مردنـی ئەسـکەندەری مەکـدۆنی دامـەزراو بەدەسـەڵاتدارێتیی حـوکمی بەتلیمۆسـی یەکـەم

دەستپێکرد: ئەم مەراسیمە ناپەسەندەیان دەکرد، هاوسەرێتیی کلیۆپاتراو براکەی (بەتلیمۆسی چواردەهەم) دوایینییان بوو کەپەیڕەویی دەکرا. دواتر ئەم شێوە کۆنەی تێدا هەڵوەشێندرایەوەو نەما.

کاتێك گفتوگۆی کلیۆپاترا گەیشتە ئێرە، دەرگا کرایەوە، بەتلیمۆسی برای کلیۆپاترا هاتەژوورەوە، دیاربوو سێ وەزیرەکەی میسر لەگەڵ بەتلیمۆسدا وارێککەوتبوون کەماوەیەك پاش چوونی ئەمان بۆ ژووری کلیۆپاتراو گفتوگۆیان دەستپێکرد، ئەوان بێن.

بەتلیمۆس دوای تەواوبوونی قسەکەی کلیۆپاترا گوتی: کلیۆپاترا تۆ چۆن دەوێریت سەبارەت بەمە قسەبکەیت، لەکاتێکدا دەزانیت من حەزناکەم سەبارەت بەوبابەتە قسەبکەم وهەرگیز شانازیی بەوەناکەم کەناشناییم لەگەڵ ژنی تردا هەیە، بەڵام تۆ بەبەرچاوی دانیشتوانی ئەم شارەوە، لەگەڵ ئەنتوانی ڕۆمیدا لەسەر کەژاوە دادەنیشیت تاخەڵك ببینێت کەعاشقی ئەویت، هەمان ئەو شرمیونەی کەنیزەکی تۆ، کەلێرە ڕاوەستاوەو گوێی لەقسەکانی ئێمەیە، گەواهی دەدات، هەروەها هەرکاتێك تۆ لەگەڵ ئەنتواندا لەسەر کەژاوە * دادەنیشن و ئەو لەگەڵ خۆتدا دەبەیت تالەناو کەژاوەکەدا باوەشێنتان بکات.

* مەبەستی لەکەژاوەی ئاسییەکەی نییە، بەڵکو ئەو کەژاوەیە دەیخەنە سەرشان وپاشا لەناویدایەو لەهەندێ بۆنەوبەسەرهاتی تایبەتی لەو شارو شوێنی نزیك بەکار دەهێنرا:(و - کوردی)

کلیۆپاترا گوتی: من دانی پێدادەنێم لەگەڵ ئەنتواندا گەڕاوم وگەشتمکردووە، بەڵام بەهەر شێوەیەکبێت من ئافرەتم و ئەو پیاوەو ئەگەر ژن و مێردیش یەکتریان خۆشبوێت عەیب نییە، بەڵام تۆ چی دەڵێیت کەماوەیەك لەگەڵ ئەولاوە ئەڵمانییەدا دەگەڕێیت وجارێکیتر لەگەڵ فلان وجەحێڵی قبروسیدا. لەم شارەدا کەسێك نییە ئاگای لەپەیوەندییە ناوبراوەکانی تۆ نەبێت لەگەڵ ئەو لاوانەدا !!

بەتلیمۆس هاواریکرد. ئەو قسەیە بوختانە، چونکە تۆ دەتەوێت ئێمە لەدەسەڵاتدارێتی سەڵتەنەت دوور بخەیتەوە. ئەم بوختانە ناڕەوایانە بۆ من هەڵبەستیت.

کلیۆپاترا گوتی: من بوختان ناکەم و ئامادەم گوتەکەی خۆم لەڕێگای کەسانی شاهید بەسەرتەوە بسەلمێنم.

لەوکاتەدا ئارسینۆهە، خوشکە بچوکەکەی کلیۆپاترا هاتەژوورەوەو ئاشکرابوو کەبەئەویشیان گوتووە، لەکاتی گفتوگۆکەدا بێتە ژوورەوە.

ئارسینۆهە، دوای هاتنەژوورەوەی گوتی: چ باسە، بۆچی شەڕتانە؟

بەتلیمۆس گوتی: خوشکەکەت ئێمە تاوانباردەکات وبوختانی ئەوەدەداتە پاڵم پیاوێکی دەبەنگم.

ئارسینۆهە گوتی: من دەزانم خوشکەکەی ئێمە کلیۆپاترا بۆچی ئەم بوختانە بۆ تۆ دەکات، مەبەستی ئەوەیە بەڕێگای درۆ بۆهەڵبەستن، ئێمە لەسەڵتەنەت دووربخاتەوەو بۆ خۆی بەتەنهایی لەم وڵاتەدا دەسەڵات بگرێتەدەست. خۆ ئەگەر ئەمڕۆ وڵاتی ڕۆم تووشی بێنەوبەرەو پەشێوی نەبوایە، کلیۆپاترا بەبێ دوودڵی یەك ژەنەراڵی ڕۆمی وەك ئەنتوانی عاشقی خۆی دەکردو ناچاری دەکرد لەشکرکێشی

بۆسەر میسر بکات و تۆ لەسەرکورسی دەسەڵات لابەرێت و تاج وتەختی پاشایەتی پێشکەش کلیۆپاترا کردبا.

کلیۆپاترا گوتی: ئارسینۆهە، تۆ تاکو ئێستاش یەك کچۆڵەی منداڵیت و ئەوجۆرە قسانە لەسەر زمانی کەسێکی وەك تۆ جێگای سەرسوڕمانە، بێگومان کەسانی تر تۆیان فێری ئەم قسانەکردووە، بۆیەش من لەتۆ دڵنیگەران نیم، چونکە دەزانم ئەوانە دەرسی تۆیان داداوە.

بەتلیمۆس گوتی: ئەم قسانە کێشەکەیان چارەنەکرد، تۆ ئەی کلیۆپاترا تائێستاش ڕازی نەبویت، ڕێگای من بدەیت بێم بۆ ژووری خەوتنەکەت، ل شەوەکانی ڕابردوودا هەرکاتێك ویستبێتم بێم بۆ ژووری خەوتنەکەت، تۆ دەرگات بەڕوومدا داخستووە.

کلیۆپاترا گوتی: تۆ دەزاینت من ڕێگا بەتۆ نادەم بێیتە ژووری خەوتنەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا بۆلای ژووری خەوەکەی من دەهاتیت، بۆ ئەوەی ئەمە بکەیتە بەهانەو لەگەڵ مندا بیکەیتە ناخۆشی وشەڕ.

بەتلیمۆس گوتی: کەواتا لەم حاڵەتەدا من چی بکەم؟

کلیۆپاترا وەڵامی دایەوە، چارەی تۆ ئەوەیە بۆلای ژووری خەوەکەی من نەیەیت وپێتوانەبێت پەیوەندییەکانی من وتۆ پەیوەندیی ژن ومێردایەتییە، چونکە دەبێت مێردی من کەسێك بێت برام نەبێت.

بەتلیمۆس گوتی: من دەزانم تۆ دڵت بەئەنتوانەوەیەو چاوەڕوانیت ئەوبێت وپەیوەندییە خۆشەویستییەکانی خۆت لەگەڵ ئەو پیاوە ڕۆمییەدا بەسەربەریت، بەڵام ئیتر ئەنتوان نایەت!!

کلیۆپاترا گوتی: برام، تۆ وابیردەکەیتەوە من ناتوانم ئارەزووم ئەنتوان بێت؟ بەڵام چ ئەنتوان بێت و چ ئەنتوان نەبێت من دەتوانم.

دواتر من نەفرەت لەوەدەکەم براکەم مێردم بێت، ئەو کوڕەی کەلەمنداڵییەوە لەگەڵ مندا گەورەبووە، سەرجێگایی من بکات،

نەخێر من ئەم هاوسەرێتییە قبووڵ ناکەم.

بەتلیمۆس گوتی: ئایا سەرجێیکردنی ئەنتوان قبووڵ دەکەیت؟

کلیۆپاترا وای نیشاندا پەیوەندییەکانی ئەو وئەنتوان پەیوەندییەکی دۆستانەیە، بەڵام هەرکاتێك بەشێوەیەکیتر وەرچەرخا، نابێتەجێگای نەفرەت لێکردنی من، دواتر ئەنتوان نەبرامەو نەیەك پیاوی دەبەنگ وگێل.

سێ وەزیرەکانی میسرو بەتلیمۆس وئارسینۆهە، لەژوورەکەی چوونە دەرەوەو دوای ڕۆیشتنی ئەمان، کلیۆپاترا بەمنی گوت: شرمیون دڵم دەڵێت ئەنتوان دێت.

وەك گوتم کلیۆپاترا هیچ شتێکی لەمن نەدەشاردەوەو من هەموو نهێنییەکانی ئەوم دەزانی، لەوانەش دەمزانی کلیۆپاترا ئەنتوانی خۆشدەوێت.

## گەڕان لەگەورەترین شاری دنیادا

من هەرگیز ئەو ڕۆژەم لەبیرناچێت کەکلیۆپاترا بۆیەکەمجار لەگەڵ ئەنتواندا چوون بۆگەڕان ومنیش لەناو ئەوکەژاوەدا بووم، کەئەوانی تێدابوون وباوەشێنم دەکردن، شازدە کەس کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو، جلێکی هاوشێوەی یەکتریان لەبەردابوو، جلوبەرگی ئەوان بریتیبوو لەیەك پارچەی مۆر کەبەتەقەڵی گەورەی ڕەنگ زیویی چنرابوو، پێڵاوەکانیان کەبە قەیتانێکی پێستی ڕەنگ سپی دەبەسترا، لەپێدابوو. ئەو تاسمانە بەشێوەی مارپێچی لەلاقیان هاڵابوو ویەك پارچە پەڕۆی زەردیشیان لەسەربوو کەوەك شەدە دەیانبەست ولەکاتی پشوودانیدا دەیانکردەوەو عەرەقیان پێ دەسڕییەوە، لەپێش ئەوانەی کەکەژاوەکەیان هەڵگرتبوو، یەکێك لەلێپرسراوەکانیان لەپێشەوە دەڕۆیشت وبەئەویان دەگوت پێشەنگ، جلەکانی وەك جلوبەرگی نۆکەرەکان بوو، بەڵام ئەوپارچە قوماشێکی گەورەی لەبەردابوو، کەقۆڵی نەبوو ودوو دەستەکانی بەڕووتی دەردەکەوتن.

پێشڕەوەکە کلاوێکی میسریی لەسەرنابوو وهەموو دەیانزانی کەکلاوی میسری وەك کۆچکەیە[8]

8- ئەوکلاوە میسرییە کۆنە. زیاتر لەکۆچکەی کوردیی دەچێت. بەڵام لەپێشەوە کەمێك درێژترە. (و-کوری)

کەلەپشتەوە پەردەیەك شۆڕ دەبێتەوە تاسەرسمت ودایدەپۆشێت، بۆئەوەی لەپشتەوە هەتاو بەر سەرو مل نەکەوێت.

پێشڕەوەکە یەك لوولەیی داری ئەستوری بەدەستەوەبوو وئەو دارە چەورکرابوو، نیشانەی کاری لێپرسراوێتی نۆکەرەکانی تری دەگەیاند، کاتێك خەڵك لەشەقامەکاندا ئەو پێشڕەویان بەو جلو لوولەیە تایبەتییەوە دەبینی، دەکشانەوە گالیسکەکانیان لادەدا، بۆئەوەی کەژاوەکە بەبێ وەستان تێپەڕێت.

کلیۆپاترا بەبێ پارێزەر لەشەقامەکانی ئەسکەندەریەدا دەگەڕا، ئەو ڕۆژەش کەبۆیەکەمجار لەگەڵ ئەنتواندا سواری کەژاوە ببوو بۆئەوەی ناوشار نیشانی ئەنتوان بدات، بێپارێزەر بوو.

کلیۆپاترا نەك هەر شەقامەکان وتەلارەکانی باش دەناسی، بەڵکو سەبارەت بەڕابردووی ئەوانیش شارەزایی تەواوی هەبوو، بەشێوەیەك زۆرجار پێشینەی مێژوویی شەقامەکانیشی بۆ ئەنتوان باسدەکرد، ئەو ژەنەراڵە ڕۆمییە سەری سوڕمابوو لەوەی چۆن کچێکی لاو ئەوهەموو زانیارییەی هەیەو هەموو شوێنەکان بەباشی دەناسێت؟!

ئەوەشمان لەبیرنەچێت یەکەم شت کەبووە جێی سەرسوڕمانی ئەنتوان، پانی وفراوانی شەقامەکانی ئەسکەندەریە بوو، چونکە لەشەقامە پلە یەکەکانی ئەسکەندەریەدا دوازدە عەرەبانە دەتوانن لەتەك یەکدا بێن وبچن، دوای پانی شەقامەکان، ئەوەی جێی سەرسوڕمانی ئەنتوان بوو، بەلوعەکانی ئاوبوون کەبەلولە ڕاکێشرابوون؛

- پرسیی: ئەو ئاوەی کەبەبەلوعەکاندا دێت لەکوێوەدێت؟!

– کلیۆپاترا وەڵامی دایەوە: دوو سەدەو نیوە ئەم شارە خاوەنی ئاوی بۆرییە، کەئاوی ڕووباری نیل دەهێنرێتە یەك عەمباری گەورەی ئاو ولەوێوە بەلولەکاندا تێدەپەڕێندرێت وخەڵك هەموو کاتێك ئاویان هەیە، ئەو بەلوعانەی لێواری شەقامەکانیش بۆ کەڵك وەرگرتنی گشتی دانراون، تاکو ڕێبواران کەڵکی لێوەربگرن.

– ئەنتوان پرسیی کێ ئەم شەقامانەو ئەو بۆرییە ئاوانەی دروستکردووە؟

– کلیۆپاترا لەوەلامدا گوتی: نەخشەی ئەم شارە ئەندازیاری ئەسکەندەری مەکدۆنی، دایڕشتووە، بەڵام کاتێك ئەسکەندەر مرد، ئەم شارە ئاوەدان نەبوو وباپیرەگەورەی من (بەتلیمۆس)ی یەکەم دەستیکرد بەئاوەدانکردنەوەی ئەم شارەو دوای ئەویش نەوەکانی ئەوان لەم شارەدا تەلاری گەورەیان دروستکردووەو بۆریی ئاویان ڕاکێشاو ئاوەڕۆیان، دروستکردووە، وەك دەیبینیت ئەمڕۆ گەیشتوەتە ئێرە.

کاتێك گەیشتینە بەرامبەر مۆزەخانە گەورەکەش، گەورەیی بینای ناوبراو وپایەکانی ئەو، بووبەهۆی ئەبڵەقبوونی ئەنتوان و – پرسیی: ئێرە کوێیەو ئەوانەی لەسەر پلیکانەی ئەو تەلارەدا دانیشتوون وگوێ لەکەسێك دەگرن، کەلەئەوان بەرزتر دانیشتووەو قسەدەکات؟!

– کلیۆپاترا گوتی: ئەو شوێنە مۆزەیەو بەناوی خوای هونەرەوە دروستکراوەو ئەوانەی کەدەیانبینیت فەیلەسووفن و ئەو کەسەی قسەشدەکات لێپرسراوی ئەوانەیە، ئەوانە هەموو ڕۆژێك لەوشوێنەدا کۆدەبنەوەو گوێ لەقسەکانی مامۆستای خۆیان، کەهەمان ئەو وتەبێژەیە گوێی لێدەگرن.

– ئەنتوان گوتی: فەیلەسوف چییە؟

– کلیۆپاترا گوتی: فەیلەسوف، واتا کەسێك کەهەوڵدەدات کێشەکانی دنیا بەگفتوگۆ چارەسەربکات.

– ئەنتوان گوتی: گەلی ڕۆم نەیتوانی کێشەکانی دنیا بەلەشکر چارەسەربکات، ئەوانە چۆن دەیانەوێت کێشەکانی دنیا بەقسە چارەسەربکەن،

– کلیۆپاترا گوتی: ئەوانە وابیردەکەنەوە ئەگەر نەتوانن کێشەکانی دنیا بەگفتوگۆ چارەسەربکەن ، ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بەوە دادەنێن وئەنجامی ئەو ڕوونکردنەوەیەش دەبێتەهۆی قەناعەت پێهێنان.

– ئەنتوان پرسیی: ئایا هەمووکەس دەتوانێت لەسەر ئەو پلیکانانەدا دابنیشێت وگوێ لەگوتەکانی ئەو مامۆستایە بگرێت؟

– کلیۆپاترا گوتی: نەخێر. دانیشتن لەسەر ئەو پلیکانانەو گوێگرتن لەقسەکانی ئەو مامۆستایە، پێویستیی بەوەیە دوو فەیلەسوف- یان قوتابیەکانی ئەمانە گەواهی بدەن کەگوێگر خاوەنی زەوقی فەلسەفییەو هەڵبەتە دەبێت خوێندەوارییشی هەبێت.

ئەنتوان تکای لەکلیۆپاتراکرد، تاکەژاوەکە ڕابگرێت وبچێت گوێ لەقسەکانی ئەو مامۆستایە ڕابگرێت، داخوا چیدەڵێت.

کلیۆپاترا فەرمانیدا کەژاوەکە ڕابگرن. بەڵام ئەنتوان دابەزی. مامۆستاکە بێئەوەی گوێ بەئەنتوان بدات، وەك ئەوەی نەیبینیبێت درێژەی بەقسەکانیدا. من گوێم لێبوو کەقسەکانی سەبارەت بەئەفلاتوون بوو،

ئەوی بەعەقڵی گشتیی دەزانی و لەوباوەڕەدا بوو کە: پێویستە هەندێك لەبۆچوونەکانی ئەو لەگەڵ بارودۆخی ئەم ڕۆژگارەدا جێبەجێبکرێت.

کلیۆپاترا بۆ ئەنتوانی ڕوونکردەوەکە: هەموو ئەوانەی لەم قوتابخانەیەدا دەردەچن، لایەنگرانی ئەفلاتوونن وئەو بەیەکەمین مامۆستای مرۆۋ وعەقڵی گشتی دەزانن و لەوبڕوایەدان پێویستە بۆچوونەکانی ئەفلاتون لەگەڵ ئەم ڕۆژگارەماندا جێبەجێ بکرێن، بۆیەش مامۆستایان وقوتابییەکانی ئەومۆزەیەیان بەناوی ئەفلاتوونەوە ناوناوەو لەگەڵ ئەوەشدا کەتیۆرییەکانی ئەفلاتونیان قبوڵە، دەڵێن: پێویستە چاوپێداخشاندنەوە لەبۆچوونەکانی ئەودا بکرێت.

- ئەنتوان گوتی: باشتروایە بڕۆین، هەروەك چۆن لەئەفلاتونی یۆنانی تێنەگەیشتم، لەئەفلاتونەکانی ئێرەش چ تێنەگەیشتم.

کلیۆپاترا فەرمانیدا نۆکەرەکان بکەونەڕێ. پاش ئەوەی لەمۆزە تێپەڕین، ئەنتوان چاوی بەیەك تەلاری ڕەنگ سپی گەورە کەوت کەڕووی دەرەوەی ئەو لەشێوەی سێرك دەچوو وپرسیی: ئێرە کوێیە؟

- کلیۆپاترا گوتی: ئێرە هەمان ئەو شوێنەیە کەلەسەرانسەری دنیادا تایبەت بەهەندێك کەسەو هاوشێوەی نییە.

- ئەنتوان لەکلیۆپاترای پرسی: ئەو دامەزراوە بێ هاوتاو تایبەتە ناوی هەیە؟

- کلیۆپاترا گوتی: ئەی چۆن.. ناوی ئەو بینایە کتێبخانەیە.

- ئەنتوان پرسیی: کتێبخانە چ کارێك دەکات؟!

- کلیۆپاترا گوتی: کتێبخانە، زانست وپیشەسازی وئەزمونەکانی دایك وباوك وباپیران بۆ ڕۆڵەکانیان دەگوازێتەوەو پاش مردنی ئەوکەسانەش کەخاوەن زانست و ئەزموون و دانایی بوون، ڕێنوێنەکانیان بەزیندوویی دەیانهێڵێتەوە، وەك ئەوەی نەمردبن، نەوەی تازەش لەزانست وئەزمونەکانیان بێبەش نابن، ئەوگەلەی کتێبخانەی هەبێت، هەرگیز نامرێت. ئەو نەتەوانەی مردوون ولەناوچوون ئەوانەبوون کەکتێبخانەیان نەبووە.

- ئەنتوان گوتی: باشە، ئەی بۆچی میللەتی ڕۆم کتێبخانەشی نییەو زیندووەو ناشمرێت؟

- کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر سەبربکەیت، دەبینیت میللەتی ڕۆم بەهۆی نەبوونی کتێبخانەوە چۆن وردەوردە بەرەو لەناوچوون دەڕۆن.

حەزدەکەیت دابەزین و چاوێك بەکتێبخانەکەدا بخشێنین؟

- ئەنتوان گوتی: من هیچ لەکتێب تێناگەم تابچمەناو کتێب وکتێبخانە ببینم!

- کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر زەوقی کتێب خوێندنەوەت هەبووایە، دەمبردیت بۆ ئەو کتێبخانەیەو کتێبی بێهاوتام نیشاندەدایت، لەوکتێبخانەیەدا کتێب هەن لەپێستی مەڕ نووسراون ودرێژییان بەقەد باڵای مرۆڤە، زۆرینەی کتێبەکانی ئەوکتێبخانەیە دانسقەن ولەشوێنێتر دەستناکەون، ڕۆژانە دووسەد کارمەند چاودێریی کتێبەکان دەکەن، بەشێوەیەك نابێت تۆز لەسەر ئەو کتێبانە بنیشێت.

لەوکتێبخانە بێ نەزیرەدا سەدو پەنجا هەزار کتێب هەیەو زانستی دنیا لەوشوێنەدا کۆبووەتەوە، ئەگەر ڕۆژێك ئەو کتێبخانەیە لەناوبچێت، خەڵکی دنیا لەڕووی زانستی وپیشەسازییەوە هەژاردەبێت.

- ئەنتوان گوتی: ئای چەند قسەت دەربارەی کتێبخانە کرد، بەسە، باشتروایە لێرە بڕۆین وبچین بۆبەشێکی تری شار.

پاش ئەوەی لەکتێبخانەکەمان جێهێشت، بەناو دوو شەقامی گەورەی شاردا تێپەڕین، کەدادگاو بازاڕی بازرگانی ماڵە خانەدانەکان بوو، تاگەیشتینە کێوی مەی فرۆشان، مەیخانەکانی ئەسکەندەریە لەوشوێنەدابوون ولەنێوان مەیخانەکاندا هەندێك ماڵ دەهاتنەبەرچاو کەلەوێوە دەنگی قاقای ژنان وئاهەنگ وسازو سەنتوورو ئاواز دەبیستران.

- ئەنتوان پرسیی: ئەم شوێنە کوێیەو ئەو دەنگانە چین؟

- کلیۆپاترا گوتی: ئێرە جێگای مەی فرۆشان وشوێنی ڕابواردنی گشتیی ئەسکەندەرییەیەو هەموو ئەو ئافرەتە لەشفرۆشانەی ئەم شارە لێرەدا نیشتەجێبوون.

هەندێك لەو ژنە لەشفرۆشانە، لەبەردەم دەرگاکانی خۆیاندا ڕاوەستابوون- یان لەپەنجەرەکانەوە سەیری ڕێبوارانیان دەکردو بانگیان دەکردن، تابێن بۆ ماڵەکانیان.

- کلیۆپاترا گوتی: باوکی من وهەموو باپیرانم لەوەگەیشتوون شارێکی گەورەی وەك ئەسکەندەریە، کەبەندەرێکی سەر دەریای ڕۆمەو ڕۆژانە پەنجا کەشتی لەم شارەوە دەڕۆن ودێن، بۆیە پێویستە شوێنێك بۆ ڕابواردنی خەڵك وگەشتیاران هەبێت، هەروەها بۆ ئەوکەسانەی کەشەیدای ڕابواردنن، تاخەڵکی شار هەراسان نەکەن، لەبەرئەوە ئەم شوێنەیان بۆکاری ڕابواردن دروستکردووە.

هەموو مەیخانەکان لەم شوێنەدان وهەموو ئەو ژنانەی کەئامادەن بەشێوەی کاتی ببنە کەرەستەی چێژو خۆشیپێدانی خەڵکی شارو گەشتیاران، لێرەدا نیشتەجێن. لەم شوێنەدا هەمووکەس بۆ ڕابواردن ومێبازی ئازادە، بەڵام لەدەرەوەی ئەم شوێنەدا هیچ کەسێك ڕێگای پێنادرێت ڕابواردن بکات وکەس ناتوانێت بەشێوەی ئاشکرا لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرێت.

- ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا، من پێموایە ئەوشوێنە ناوبنێن بەهەشتی خوایان، هەروەها من لەهیچ شوێنێکی تردا ژنی واجوانم نەدیون، ئەو هەموو ژنە جوانانە چۆن لەوشوێنەدا کۆبوونەتەوە؟

-کلیۆپاترا: ئەم شوێنە لەبەشی خۆرئاوای دەریای ڕۆمدا ناوبانگی هەیەو لەسوریاو یۆنان و لیبی و هەموو وڵاتانی خۆرهەڵاتی سەر دەریای ڕۆمدا ناسراوە.

ئەنتوان گوتی: من تاقەتم نەبوو گوێ لەقسەی فەیلەسوفەکانی مۆزەکە بگرم وپیاوێك نەبووم بچمەناو کتێبخانەو کتێبەکانی ئەسکەندەریە ببینم، بەڵام بەتەواوی ئارەزووم لەم شوێنەیە، لەکەژاوەکە دێمەدەرێ ودەچمە ئەوماڵە خۆشانە، بۆئەوەی لەگەڵ خەڵکی ناو ئەوماڵانەدا ئاشناییم هەبێت.

کلیۆپاترا گوتی: ئەنتوان لەتیری نیگای ژنانی ئەم شوێنەو کاریگەریی لاواندنەوەی پرئەفسانەیی ئەوانە وریابە، چونکە زۆر لەکەسانی بەتواناو پیاوانی خاوەن کەسایەتی وناسراو دوای ئەوەی گەیشتوونەتە ئەم شوێنە، لەژێر کاریگەری عەشقی پیرۆزیاندا، توانای خۆیان لەدەستداوە، چونکە ئیتر تەماو ئومێدی گەڕانەوەیان بۆنیشتمان نەماوە، خۆیان کوشتووەو تەرمی ئەمانە لەگۆڕستانی عاشقان، کەلەم دەورو بەرەیە نێژراون، گۆڕستانی عاشقان یەعنی عاشقی تێکشکاو.

- ئەنتوان گوتی: ئەوانە گەمژەبوون ونەیانتوانیوە ئەوعەشقەی لەلایەن ئەو ژنانەوە سەبارەت بەوان دەربڕاوە، مامەڵەی بازرگانی بووە، کاتێك پیاو ئەوەندە گەمژەبێت عەشقی یەك ژنی لەشفرۆش

بەعشقێکی واقیعی بزانێت، سزای هەرئەوەیەکە لەبەردەستی ئەوژنەدا هۆشی خۆی لەدەستبدات وتێکبشکێت ودەست بۆخۆکوشتن ببکات.

- دوای تەواوبوونی ئەو قسەیە، ئەنتوان لەکەژاوەکە دابەزی تاذانیشتوانی ئەوشوێنە لەنزیکەوە ببینێت. دوای تێپەڕبوونی سەعاتێك بەسەر ڕۆشتینی ئەنتواندا، کلیۆپاترا لەنەهاتنەوەی ئەو دڵنیگەران بوو وفەرمانی بەهەڵگرانی کەژاوەکەدا، بەڕێ بکەون، تاکو ئەنتوان بدۆزنەوە، کەژاوەکە کەوتەڕێ وئێمە ماوەی نیو سەعات گەڕاین، بەڵام ئەنتوانمان نەدۆزییەوە.

- کلیۆپاترا گوتی: شرمیون من پێموایە میوانەکەی ئێمە دووچاری کەمەندی خۆشەویستیی یەکێك لەژنانی ئێرە بووەو ئەو عیشقە سەبارەت بەپیاوێکی وەك ئەو پەسەند نییە، پێموانەبوو پیاوێکی وەك ئەنتوان بەوئەندازەیە بێئیرادەبێت کەخۆی تەسلیمی ژنانی ئێرەبکات.

- پێم گوت: ئەی خاتوونی گەورەم، ئەمە ناتوانرێت ناو بنرێت عەشق، گەڕانی ئەنتوانیش لەم شوێنەدا جگەلەسوڕانەوە، هیچ هۆکارێکی تری نییە، چونکە ئەوشوێنە سەبارەت.بەمیوانی ڕۆمی ئێوە، تازەیە، دەیەوێت تێبگات لێرەدا چ ڕوودەدات و ئەوکەسانەی لەناو ئەو خانووانەدا دەژین، ژیانیان چۆنە.

- کلیۆپاترا گوتی: شرمیون، سەرەتا هەموو عەشقێك گەڕانی لەگەڵدایە، لەزۆر کاتدا بەدواداچوون والەپیاوێك دەکات ناچاربێت بۆلای ژنێك بچێت، بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەوپیاوەی بەلای ژنێکەوە دەچێت واتێدەگات بوونەوەرێکی تازەی دۆزیوەتەوەو عاشقی دەبێت، ئەگەر وانەبێت ئەوا بەنائومێدی دەگەڕێتەوە.

گوتم: ئەی خاتوونی گەورەم، ئایا تۆ پێتوایە لەنێوان ژنانی ئەو شوێنەدا کەسانێك هەبن بتوانن سەرنجی پیاوێکی وەك ئەنتوان ڕابکێشن؟

- کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ من وێنای ئەوەدەکەم، چونکە لێرەدا ژنی واهەن لەهونەری دڵبردندا مامۆستان ودەتوانن تەنانەت کاهینێکیش فریوبدەن، چجای پیاوێکی وەك ئەنتوان.

- قسەکانی کلیۆپاترا هەر بەردەوام بوو کەئەنتوان لەماڵەکان هاتەدەرێ وهاتەسەر شەقامەکەو دیاربوو دەیویست بچێتە ماڵی ترەوە، بەڵام کەکەژاوەکەی بینی وکلیۆپاترا فەرمانی ڕۆیشتنیدا، بەرەو ڕووی ئێمەهات.

- کلیۆپاترا گوتی: کەژاوەکە بخەنەسەر زەوی تائەنتوان سواربێت، ئەنتوان سواری کەژاوەکەبوو، گوێم لێبوو کلیۆپاترا لێی پرسی: ئەنتوان ئەوەی حەزت دەکرد ببیینیت بینیت؟

- ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا، من لەشاری ئەسکەندەریەدا شارێکم بینی کەپڕ خرۆشترو سەرسوڕهێنەرتربوو لەشاری پەریان وجادووگەران، مرۆڤ پێ بنێتە هەریەك لەماڵەکانی ئەوشوێنە وادەزانێت دنیایەك دەبینێت جیاوازە لەدنیای ماڵەکەی تر، عەقڵی مرۆڤ لەبینینی ئەم هەموو ژنە جوانانە وڕدەبێت، من سەرم سوڕماوە کەئێوەو ئافرەتانی ئەسکەندەریە بەوە ڕازی.دەبن، لەشارەکەی ئێوەدا جێگایەکی ترسناکی لەم شێوەیە هەبێت؟

- کلیۆپاترا لێی پرسی: تۆ بۆچی ئەو شوێنە بەمەترسیدار دەزانیت؟

- ئەنتوان گوتی: لەبەرئەوەی پیاوەکانی ئەسکەندەریە کاتێك دێن بۆئێرەو ئەو ژنانە دەبینن، ئیتر ناتوانن بچنەوە ماڵەکانی خۆیان ولەگەڵ ژنەکانی خۆیاندا بژین.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەنتوان ڕێبواران وسەفەرکەران لەبەرچاوبگرە، پێم بڵێ چەندکەس لەوپیاوانە خەڵکی ئەسدەندەریەن ؟

– ئەنتوان چاوی لەڕێبواران کردو گوتی: بەپێی جلو بەرگەکانیان خەڵکانی سەفەرکەرن وڕێبوارن و بەدەگمەن پیاوانی ئەسکەندەریە بەرچاودەکەون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوونی ئەوشارە پڕعەیش ونەیشە سەبارەت بەژنانی ئەم شارە مەترسیدارە، پێم سەیرە کە باوکت[9] فەرمانناداتا ئەوسفرەی ڕابواردن وگاڵتەو گەپە کۆکرێتەوە؟

[9] - لەوکاتەدا بەتلیمۆسی سێزدەهەم ماوەو ئەوی شرمیون دەیگێڕێتەوە، یادەوەرییەکی پێشووە کەبۆ یەکەمجار کلیۆپاترا چۆن سەرەتا لەگەڵ ئەنتواندا تێکەڵاوبووە. (وەرگێڕی کوردی)

کلیۆپاترا گوتی: بەهەمان شێوەی کەباکویاپیرانم فەرمانیان نەداوە ئەم سفرەی ڕابواردنە نەهێڵدرێت، باوکیشم دانیشتوانی ئەم شوێنە بەرهەمهێنە نارەحەت ناکات، داهاتی ئەوشوێنە بۆپاشای میسرە، چونکە بەتەنها داهاتی ئەوشوێنە بەرامبەر بەهەموو داهاتی ساڵانەی باجی دەوڵەت وگومرگی بازرگانی بەندەری ئەسکەندەریەیە.

ئەم داهاتە سەبارەت بەباوکم وپێش ئەویش پاشایانی میسر، لایەنێکی بژێوی هەبووەو هەیە، جگەلەمەش کاریگەرترین شت کەزۆرینەی گەشتیاران وجیهانگەڕان بەرەو ئەسکەندەرییە ڕاکێشدەکات، ئەم شوێنەیە.

ئایا تۆ تائەمڕۆ گوێت لێبووە کەئەسکەندەریە خاوەنی چرای دەریاییە؟ ئایا هەرگیز گوێبیستبوویت کەبڵێن: ئەسکەندەریە لەمۆزەی ئەودا گەورەترین فەیلەسوفەکانی دنیا دەرس دەڵێنەوە؟ ئایا هەرگیز بیستووتە کەخەڵك باس لەکتێبخانە دەگمەنەکەی ئەم شارەبکەن و بڵێن: لەدنیادا بێ هاوتایە؟ بەڵام هەموویان دەڵێن ئەم شارە بووکی دنیایەو هەر کەسێك بیەوێت لەزەت لەو پێنج ودوو ڕۆژەی تەمەنی وەربگرێت، دەبێت سەفەرێك بۆئەسکەندەریە بکات و ئەوشوێنە ببینێت.

لەبەرئەوەیە پاشایانی میسر هەرگیز لەوبارەیەوە بەخەیاڵیاندا نەهاتووە، ئەم شوێنە نەهێڵن، چونکە هیچ شتێکی وەك ئەو شوێنە گەشتیاران وسەفەرکەران بۆئەسکەندەرییە ڕاکێش ناکات.

لەوانەیە لەساڵێکدا سەد کەسی دانیشمەند بەشەیدایی کتێبخانەو مۆزەی ئەسکەندەرییە سەردانی ئێرەبکەن، بەڵام ساڵانە هەزاران گەشتیار لەسەرانسەری دنیاوەدێن بۆئەسکەندەریە، تائەم شوێنە ببینن وچەند ڕۆژێك لێرەدا سەرقاڵی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بن، هەندێك لەمانە سامان وسەریان لەپێناو ئەوئارەزووەدا دادەنێن ودوای ئەوەی سەرمایەی خۆیان لەدەستدەدەن خۆیان دەکوژن، بەڵام کەس لەمردنی ئەوانە غەمگین نابێت ولەسەر گۆڕەکەیان ناگرێت، هەروەها بەردەوام لێشاوی زێڕو زەردو زیو لێرەوە بۆخەزنەی باوکم دەچێت.

– کلیۆپاترا، تۆ کچە گەورەی باوکتی، ئەگەر ڕۆژێك کورسی دەسەڵاتت بکەوێتەدەست وببیتە پاشای میسر، ئایا ئەم

شوێنە دەهێڵێتەوە- یان نا ؟

- کلیۆپاترا گوتی: دەبێت من شێتبم ئەم شوێنە نەپارێزم وخۆم لەوداهاتە زۆرە بێبەش بکەم؟!

من ئەگەر رۆژێك بچمەسەر کورسی دەسەڵات، نەك هەر لەدرێژەدانی ڕابواردن وگاڵتەوگەپی ئەم شوێنە ڕێگریی ناکەم، بەڵکو بۆ بەرفراوانترکردن و زۆرترکردنی داهاتی ئەم شوێنە، لەدەرەوەی میسر بەجددیی پڕوپاگەندەی بۆدەکەم ، چونکە تاکو ئەمڕۆش باپیرانی من و باوکم سەبارەت بەمە مشوریان نەخواردووەکە ئەم شوێنە بەشێوەیەکی ڕەسمی لەدەرەوەی میسر بناسێنن، ئەوان پێیانوابوو پڕوپاگەندەی ڕەسمی لەلایەن دەوڵەتی میسرەوە بۆناساندنی ئەم شوێنە لەدەرەوەی وڵاتدا، زیان بەکەسایەتی ئەوان دەگەیەنێت، بەڵام من بەوشێوەیە بیرناکەمەوەو لەوبڕوایەدام بۆ زیاترکردنی داهاتی ئەم شوێنە، کەهیچ کانزایەکی زێڕ لەڕووی دەستکەوتەوە ناتوانێت پێی بگات، داهاتی ئەم شوێنە بۆ بوارو پرۆژە گەورەکانی تر کەڵکی لێوەردەگرم.

کاتێك لەشوێنی ڕابواردنی گشتی تێپەڕین، کەمێك کات مابوو، ئەنتوان داوای لەکلیۆپاترا کرد ئەوببات بۆتەلاری سێرك و پێشانی بدات.

- کلیۆپاترا گوتی: چوونی ئەمڕۆ بۆ سێرك بێسوودە ، چونکە نمایش ناکەن، پێویستە ئەو ڕۆژانە بچیت بۆسێرك کەخەریکی نمایشکردنن.

- ئەنتوان گوتی: ئەو ڕۆژانەش دەچین بۆسێرك، بەڵام ئەمڕۆ بەمەبەستی بینینی تەلاری سێرك دەچم.

- کلیۆپاترا بەهەڵگرانی کەژاوەی گوت: ڕێگای سێرك بگرنەبەر، ڕێگای نێوان ڕابواردنی گشتی وسێرك زۆر دووربوو، شوێنی ڕابواردنی گشتی لەخۆرئاوای ئەسکەندەریە بوو، بەڵام تەلاری سێرك کەوتبووە خواروویەوە، بەهۆی دووری ماوەکە، کلیۆپاترا ناچاربوو بەهەڵگرانی کەژاوەکە بڵێت: ڕابوەستن بۆئەوەی کەمێك پشووبدەن، دوای پشودان جارێکیتر بەڕێ کەوتنەوەو لەگەڕەکەکانی خوارەوەی شار تێپەڕین وگەیشتنە بینای سێرکەکە.

مەزنی بینای سێرك بووەهۆی سەرسوڕمانی ئەنتوان وگوتی: من پێموایە سێرکی ئەسکەندەریە لەدنیادا بێ هاوتابێت، دەروازەی سێرك لەو ڕۆژانەی کەنمایش پێشکەش ناکرێت، دادەخرێت وڕێگا بەکەس نادرێت بچێتە ژوورەوە، بەڵام کاتێك پاسەوانان وخزمەتکارانی تەلاری سێرکەکە کچی پاشای میسریان بینی، ڕێگایان چۆڵکرد تاکەژاوەکە بچێتە ژوورەوە بۆناو تەلاری سێرکەکە.

سێرکی ئەسکەندەریە بریتیبوو لەیەك مەیدانی بەرفراوان وبازنەیی کەچوارقات لۆج لەدەوری ئەودا دروستکرابوون، ئەو لۆجانە بەدرێژایی ساڵ گیراون وپیاوە گەورەکانی میسر هەرساڵەی هەندێك پارەی ئەو لۆجانەدەدەن، تاکو لەوڕۆژانەی یاریی سێرك نمایشدەکرێت شوێنیان هەبێت بۆسەیرکردنی.

لەپێش لۆجەکاندا دە پلیکانەیان دروستکردبوو کەلەڕۆژانی نمایشکردندا کەسانی ڕەشۆکی لەسەرئەو پلیکانانە دادەنیشن و تەماشا دەکەن.

منیش دەمزانی یارییەکانی سێرك چۆنە، بەڵام ئەنتوان زانیاریی سەبارەت بەجۆری یارییەکان نەبوو، داوای لەکلیۆپاتراکرد بۆی شیبکاتەوە چۆنە؟ کاتێك گوێی لێبوو لەسێرکی ئەسکەندەرییەدا بەپێچەوانەی سێرکی ڕۆمەو گلادیاتۆری تێدا نییە، نائومێدبوو وگوتی سەیرکردنی ئەسڵی سێرك

بریتییە لەشەڕکردنی کلادیاتۆرەکان وبەبێ ئەونمایشە، سێرك ئەوەندە دڵگیرنین کەمرۆڤ کاتی خۆی لەسەیرکردنیدا بەفیڕۆبدات.

– کلیۆپاترا بزەیەکی هاتێ وگوتی: ئەنتوان ئێمە لێرەدا شەڕی گلادیاتۆرەکان پێشانی تەماشاکەران نادەین، بەڵام نمایشی وامان هەیە زۆر سەرنجڕاکێشترە لەشەڕی گلادیاتۆری، هەرکاتێك سێرك هەبوو وتۆ لەئەسکەندەریە بوویت، من لەگەڵخۆمدا بۆ ئەم شوێنەت دەهێنم ونمایشی سەرنجڕاکێشی میسرت پێشاندەدەم.

– ئەنتوان گوتی: ئایا دەتوانیت پێم بڵێیت ئەونمایشانە لە چ جۆرێکن؟

– کلیۆپاترا گوتی: لەسێرکی ئێمەدا، گالیسکەچی پێشبڕکێ دەکەن.

– ئەنتوان لەگوێنەدانی بەوقسەیە شانەکانی جووڵاندو گوتی: ئایا دەتەوێت بڵێیت، لێرەدا عارەبانە نیشانی تەماشاکەران دەدەن ؟ ئەوە شتێکی تازەو سەرنجڕاکێش نییە، پێشبڕکێی عەرەبانەیی لەپێش ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیش هەبووە.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا لەپێشبڕکێکانی کەلەپێش دروستبوونی ڕۆمەوە کراون، شێرەکانیان بەگالیسکەکانەوە دەبەستەوە؟

– ئەنتوان بەسەرسوڕماوییەوە گوتی: نا من هەرگیز نەمبینیوە شێر بەعەرەبانەوە ببەستنەوە!

– کلیۆپاترا پێی ڕاگەیاند: لێرەدا شێر لەبری ئەسپ بەعەرەبانەوە دەبەستنەوە، ئەوان هەرچوار شێر بەعەرەبانەیەکەوە دەبەستنەوە، چونکە بیست وپێنج عەرەبانە لەوشوێنەدا پێشبڕکێ دەکەن وسەد شێر پێکەوە دەکەونە پێشبڕکێ.

– ئەنتوان لەسەرسوڕماویی هاواریکردو گوتی: ئەمە جێگای باوەڕکردن نییەو شێر جانەوەرێکی دڕندەیەو ناتوانرێت بەعەرەبانەوە ببەسترێتەوە، ئەوکەسەی عەرەبانەکە لێدەخورێت دەیکوژێت.

– کلیۆپاترا گوتی: لەڕۆمدا وایە، ناتوانن شێر بەعەرەبانەوە ببەستنەوە، بەڵام لێرەدا ڕۆژانی پێشبڕکێ چوارشێر بەیەك عەرەبانەوە دەبەسترێنەوەو ئینجا بیست وپێنج عەرەبانە، کەهەریەکەیان یەك لێخوڕی هەیە، دەستدەکەن بەپێشبڕکێ.

– ئەنتوان گوتی: ئەگەر بەم شێوەیەبێت ئەوا لەجوڵانەوەی عەرەبانەکان دیمەنێك دروستدەبێت لەجوانترین دیمەنی دنیا.

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ، هەندێکجاریش لەخوێناویترین دیمەن، چونکە شێرەکان بەلەسە دەبن وهێرش دەکەنەسەر عەرەبانچییەکان وئەوان لەت وپەت دەکەن، خۆئەگەر بتوانن ئەوا هێرش دەکەنەسەر بینەرانیش، بەڵام بەهۆی ئەو تەلبەندە ئاسنانەی کەلەڕۆژانی نمایشکردندا لەچواردەوری مەیدانەکە دادەنرێت، دەبنەڕێگر لەبەردەم شێرەکانداو ناتوانن هێرش ببەنەسەر تەماشاچییان.

خەریکبوو شەودادەهات وئەنتوان برسیی بوو ودەیویست نانبخوات، زۆر لەسێرکەکەدا نەماینەوەو دواتر گەڕاینەوە، پێش ئەوەی بگەینە کۆشکی پاشایەتی، تاریکی داهات وفانۆسی دەریای ئەسکەندەرییە دەرکەوت.

ئەنتوان گوتی: من برسیمەو هەڵگرانی کەژاوەکەش زۆر ماندووبوون، ئەگەرنا داوام لەکلیۆپاترا دەکرد فانۆسی دەریایشم نیشانبدات، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم شەو ناتوانین بچین سەیری فانۆسی دەریا بکەین، هەڵیدەگرین بۆ کاتێکی تر.

رۆژی دواتر ئەنتوان داوای لەکیلۆپاترا کرد، برۆن فانوسی دەریایی ئەسکەندەرییە ببینن.

– کیلۆپاترا گوتی: باهەندێك لەشەو تێپەرێت و فانوسەکە چواردەوری خۆی رووناك بکاتەوە، ئەوکاتە ئێمە دەچین بۆسەیری. دوای ئەوەی هەندێك شەو بەسەرچوو، جارێکیتر بەهەمان تەشریفاتی کەباسمکرد، کیلۆپاتراو ئەنتوان سواری کەژاوەکە بوونەوەو منیشیان لەگەل خۆیان برد، شەقامەکانی ئەسکەندەریە چرایان هەبوو و رووناك بوو وئێمە پێویستمان بەوەنەبوو وەك هەندێك لەرێبوارانی شارەکانی تر لەکاتی شەودا چرا لەگەل خۆمان بەرین بۆئەوەی بتوانین پێش چاوی خۆمان ببینین. چراکانی هەردوو لای شەقامەکە لەقەپاغی گەورەدابوون، ئەوەندە بەشەوق بوون، سەرانسەری شەقامەکەیان رووناك کردبووەوە. ئێمە پێشئەوەی لەکۆشکی پاشایەتی بێینەدەرێ هەریەکەو پالتۆیەکمان لەگەل خۆماندا هێنا، چونکە کیلۆپاترا دەیزانی لەشەودا لەسەردەریا هەوا ساردەبێت وپێویستە پالتۆکە باش لەخۆمانەوە بپێچین، تاخۆمان لەسەرما بپارێزین، دوای ئەوەی شەقامەکانی وەسکەندەریەمان بری، گەیشتینە رۆخی دەریا و لەوێدا هەڵگرانی کەژاوەکە کەژاوەکەیان لەسەر زەوی دانا، کیلۆپاتراو ئەنتوان لەکەژاوەکەوە هاتنەدەرەوە، یەك بەلەمی گەرە لەبەلەمەکانی پاشا کەخاوەنی دە سەوڵ لێدەربوون، یەك جۆر جلوبەرگیان لەبەردابوو، چاوەڕوانی کچی پاشای میسرو میوانەکەیان دەکرد، ئێمە سواری بەلەمەکە بوین وکەوتینەرێ، لەپشت ئێمەوە یەك بەلەمی تر کەپر لەسەربازی پرچەکبوون، بەتیروکەوان بەدووماندا هاتن، ئەمانە پارێزەرانی کیلۆپاترا بوون، ئێمە بەنێوان ئەوکەشتیانەدا تێپەرین کەلەبەندەری ئەسکەندەریەدا لەنگەرەیان گرتبوو– یان لەرۆیشتندابوون، لەناکاودا یەك رووناکی درەوشاوە دەرکەوت، کەبەشێوەیەك دەریای رووناك کردەوە، پێتوابوو لەوشەوە تاریکەدا خۆر هەڵهاتووە. زیاتر لەسەد پاپۆڕو بەلەم کەهەندێك لەوانە گەورەو هەندێکیان ناوەندیو هەندێکیشیان بچوك بوون، لەوکاتەدا لەناو دەریادا دەسورانەوە.

من دەمزانی هەموو ئەوانەی کە لەدەریادا دانیشتون بۆ تەماشاکردنی فانۆسی دەریای ئەسکەندەرییە هاتوون ، بەلەمە گەورە هی کرێ بوون کە هەریەکیان جێگای سەد کەسیان هەبوو وسەول لێدەرەکان بە بازووی بەهێزیانوو بەبە لێدانی سەوڵی گەورە ئەو بەلەمانەیان دەجووڵاند .

من دەمزانی خەڵکی ئەسکەندەریە بەشەو لەدەریادا گەشت ناکەن، هەروەها بینینی فانۆسی دەریایی سەبارەت بەئەوان شتێکی تازەنەبوو، بەلام ئەشرافانی ئەسکەندەریە، بەلەمی تایبەتیان هەبوو سەعاتەکانی سەرەتای شەویان لەدەریادا بەسەر دەبرد، لەبەر رۆشنای فانوسی دەریادا شەرابیان دەخواردەوەو گوێیان لەمۆزیکاو قسەی ژنان دەگرت، جگە لەبەلەمە گەورەکانی کەبۆ کرێ بوون، هەموو بەلەمە ناوەنجی و بچوکەکان کەلەو کاتەدا لەناو دەریا جموجۆڵیان دەکرد، هی خەڵکی ئەشراف بوون وهەندێك لەسەرنشینانی ناوئەو بەلەمانە کلیۆپاترایان دەناسیەوە، کاتێك بەلەمی ئێمە لەتەنیشت بەلەمەکانی ئەوانەوە تێدەپەری، هەڵدەسانو هەردوو دەسیان بەشێوەیەك رادەگرت کەدەگەیشتنە بنی بەلەمەکەی ئێمە، بەم شێوەیە رێزیان لەکلیۆپاترا دەگرت.

بەشێوەیەک دەریای بەرامبەری ئەسکەندەریە ڕووناک ببۆوە کەجارجار یەکێك لەباڵندەکانی دەریای هەڵدەخەڵەتاندو وایدەزانی ڕۆژەو دەستی دەکرد بەفڕین، چەند لەفانۆسی دەریایی نزیك دەبووینەوە، ڕووناکی ئەو زیاتردەبوو، بەڵام وامان هەستدەکرد کەژێر فانۆسەکە تاریکە، چونکە فانۆسی دەریایی وادروستکرابوو هەموو لایەك ڕووناك بکاتەوە جگەلەژێر خۆی.

ڕۆشنایی ئەو فانۆسە ئەوەندە بەهێزبوو نەدەتوانی لەچەند چرکەیەك زیاتر تێی ڕابمێنێت وتەماشای بکەی، چونکە پاش ساتێك چاوەکانت پڕدەبوون لەئاو ونەیدەتوانی خۆی ببینێت.

– ئەنتوان لەکلیۆپاترای پرسی: بێگومان دروستکەری ئەو فانۆسە ناوی داهێنەرەکەیەتی وبۆیە ناویانناوە فانۆس ؟

– کچی پاشای میسر گوتی: ناوی دروستکەری ئەوفانۆسە نییە، بەڵکو ناوی دورگەیەکەیە کەئەو چرایەیان لەوێ دروستکردوەو دوای ئەوەی گەیشتینەژێر فانۆسەکە تۆئەو دورگەیە دەبینیت.

– ئەنتوان گوتی: ئایا دەزانیت دروستکەری ئەو فانۆسە کێیە؟

– کلیۆپاترا وەڵامی دایەوە: ئەم فانۆسە (سوسترادوس کیندۆس) دروستیکردووە، کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆنزیکەی (250) ساڵ لەمەوبەرو ئەوەی لەسەر قوللەیەکی پێنج قات داناوەو ئێمە دەتوانین چوار قاتی ئەوقوللەیە ببینین، بەڵام چوون بۆقاتی پێنجەم قەدەغەیە.

– ئەنتوان گوتی: بۆچی ناتوانین بچینە قاتی پێنجەم؟

– کلیۆپاترا وەڵامی دایەوەو گوتی: یەکەم: گەرمایی فانۆسەکە زۆر بەهێزە، لەقاتی پێنجەمدا کەس بەرگەی ئەوگەرمایە ناگرێت.

دووەم: پاسەوانانی فانۆسەکە لەخراپکردنی فانۆسەکە دەترسن، کەبەدکاران فانۆسەکە بکوژێننەوە، خۆئەگەر فانۆسەکە بکوژێنرێتەوە ئەواکەشتییەکان شەوانە ناتوانن بێن بۆبەندەری ئەسکەندەرییەو زیانێکی گەورە بەبازرگانی ئەم شارە بگەیەنن.

– ئەنتوان بەسەرسوڕماوییەوە گوتی: فانۆس شتێکی گرنگ نییەو دەتوانیت هەموو چرایەك بکوژێنیتەوەو هەڵیبکەیتەوە!

– کلیۆپاترا گوتی: ئەم فانۆسە جیاوازی هەیە لەگەڵ فانۆسی سادەدا، چونکە دوای ئەوەی کوژێندرایەوە، بەئاسانی هەڵناکرێتەوەو ماوەیەك درێژە دەکیشێت تابتوانن دایبگیرسێننەوە.

– ئەنتوان گوتی: ڕووناکی ئەم فانۆسە زۆر زۆرەو هەرگیز فانۆسم نەدیوە بەوشێوەیە ڕووناکبێت.

– کلیۆپاترا گوتی: کەشتییەکان لەکاتی شەودا ڕووناکی ئەوفانۆسە لەدووریی دە فەرسەخەوە [10] دەبینن وبەهۆی ئەو فانۆسەوە بەبێ مەترسی دەگەنە بەندەری ئەسکەندەریە.

10 – فەرسەخێك، شەش کیلۆمەترە.(و – کوردی)

لەوکاتەدا بەلەمی کلیۆپاتراو میوانەکەی گەیشتە دورگەی فانۆس ولەتەنیشت سەکۆیەکی بچووک دابەزین و راوەستان، پاشان منیش پێم نایەسەر وشکانی، ئەوە یەکەمجارم بوو، چونکە تائەوکاتە پێم نەنابووەسەر دورگەی فانۆس وقوللەی فانۆسی دەریاییم نەبینیبوو.

لەوشەوەدا دوای ئەوەی گەیشتینە ئەودورگەیە، کاتێك سەرم هەڵبڕی ولەقوللەکەیدیم ڕوانی، شتێکم هاتەبەرچاو سەیرتر لەئەهرامەکان، ئەوەی کەزیاتر ئەو قوللەیەی سەیرو سەمەرەکرد، ئەوەبوو لەسەرەوە یەك کڵاوڕۆژنە هەبوو، بەڵام ڕووناکی ئەو وەك یەك تیشکی ڕاست نەدەهاتە خوارێ ومرۆڤ دەیتوانی لەبەر ڕووناکی ئەو کڵاوڕۆژنەیەدا پایەکانی قوللەکە ببینێت و ئەو نهێنییە ببێتەجێگای سەرسوڕمانی.

پاسەوانانی قوللەکە کلیۆپاترایان ناسی وچرایان هێناو ڕێگەکەیان بۆ ڕووناککردەوەو بەرەو قاتی یەکەمی قوللەکە ڕۆیشتین ولەپلیکانەکان سەرکەوتین وچووین بۆقاتی دووەم. قاتی یەکەم بەوشێوەیەی پاسەوانەکان باسیاندەکرد، سەدو پەنجا ئانیشك [1] پانبوو، کەهەندێکی ماڵی پاسەوانەکانی تێدابوو.

[1]- هەر سێ باڵ مەترێکە. لەئانیشکەوە بۆسەری پەنجەیە (و-کوردی)

لە قاتی دووەمدا هەستمکرد لەقاتی یەکەم بچووکترەو هەتا بەرەو سەرەوەتر بڕۆیشتباین، فێنکتر دەبوو، منیش لەسەرماندا هەڵدەلەرزیم.

کلیۆپاترا کەپاڵتۆکەی هۆی لەبەرکردبوو، بەمنی گوت: شرمیون پاڵتۆکەت لەبەربکە، چونکە ئێرە ساردە.

منیش گوێڕایەڵیم کردو پاڵتۆکەمم لەبەرکرد، لەبەرئەوەی ئێمە گەیشتبووینە قاتی چوارەم، کاتێك سەرمان بەرزکردەوە، ئەو قاتەی لەنێوان قاتی چوارەم وفانۆسەکەدابوو، تاریك دەهاتەپێشچاو، بەڵام دەوروبەری فانۆسەکە وەك ڕۆژ ڕووناکبوو وبایەکی توند لێیدەدا.

ئەنتوان لەڕێگای کلیۆپاتراوە لەپاسەوانەکانی پرسی کە: ئایا بەرزیی ئەو قوللەیە چەندە ؟

– پاسەوانەکان گوتیان: بەرزی فانۆسەکە تاسەر زەوی، نزیکەی سەد ئانیشکە.

– ئەنتوان گوتی: ئەم چرایە بەرزترین چرای دنیایەو هەرگیز نەبیستراوە چرایەك لەسەر قوللەیەك دابمەزێنن کەبەرزییەکەی سێسەد ئانیشك بێت. ئایا دەتوانین بچین بۆ قاتی پێنجەم؟

سەرۆکی پاسەوانەکان کەلێپرسراوی فانۆسی گەورەی دەریایی بوو، گوتی: ئەگەر بچیت بۆقاتی پێنجەم، دەوروبەری خۆت نابینیت، چونکە ڕووناکی فانۆسەکە دەبێتەڕێگر لەبەردەم بینینی دەورویشتی خۆت، ئەگەربتەوێت لەشەودا لێرە دەوروبەری خۆت دەبینیت، لێرەدابیت واتا قاتی چوارەم باشترین شوێنە بۆبینینی دیمەنی ئەسکەندەرییە، لەقاتی پێنجەمدا تەنها چاوت بەئاگر دەکەوێت.

– ئەنتوان گوتی: لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێت قاتی پێنجەم ببینم ولەنزیکەوە سەیری ئەوفانۆسە بکەم.

سەرۆکی پاسەوانەکان کەمێك بێدەنگ بوو وسەیری کلیۆپاترای کرد.

کلیۆپاترا گوتی: من پێموایە ڕۆیشتنی ئەنتوان بۆقاتی پێنجەم ڕێگریی هەیە، بۆیە ناتوانێت وەڵامی داواکارییەکەی بدەیتەوە.

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: ڕێگانادرێت بۆقاتی پێنجەم، فەرمانێکە کەلەلایەن پاشای میسرەوە دەرکراوە، ئەگەر پاشا بڵێت میوانەکەی ئێوە بابچێت بۆقاتی پێنجەم، من بەخۆشحاڵییەوە ڕێنماییکردنی ئەو دەگرمە ئەستۆ.

با لەقاتی چوارەمدا ئەوەندە بەهێزبوو، کەڕاوەستان لەوشوێنەدا گرفتی تێدابوو، ئێمە لەقاتی چوارەمدا لەسەر پێگەیەکی بەرزبووین، کەلەهەموو لایەکەوە بەسەر بەندەری ئەسکەندەرییەدا دەیڕوانی، بەڵام خۆمان لەتاریکیدابووین، ئەوکاتەی ئێمە بەقوللەکەدا دەچووینەسەرەوە، دووکەشتی بەچرای هەڵواسراوی بەرزەوە بەتەك قوللەکەدا تێپەڕین وبەرەو بەندەرەکە ڕوۆیشتن وچارۆکە سپیەکانی ئەو دوو کەشتییە لەبەر ڕووناکیی فانۆسی دەریاییدا دەدرەوشانەوە.

کاتێك ئەنتوان زانیی ڕێگای پێنادەن بچێت بۆقاتی پێنجەم وئاگری فانۆسەکە لەنزیکەوە ببینێت، دەستیکرد بە پرسیارکردن سەبارەت بەئاگرەکەی وسەری بەرزکردەوە، تاقوللەکە ببینێت وگوتی: من دووکەڵ نابینم و وەك ئەوەوایە فانۆسەکەی ئێوە دووکەڵی نەبێت؟

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: ئەم فانۆسە بێ دووکەڵە، چونکە دروستکەری ئەوفانۆسە وای کردووە دوکەڵی نەبێت.

– ئەنتوان گوتی: وەك بیستوومە ئەوفانۆسە با ناتوانێت بیکوژێنێتەوە؟

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: دەوروبەری فانۆسەکە شووشەی ئەستورو مووبڕی پێوەیەو با لەهیچ لایەکەوە لێینادات. ئایا تۆ ئەودوو پایەیە دەبینیت؟

– ئەنتوان گوتی: بەڵێ دەیانبینم.

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: دووتیغەی لوولەیی ناوپۆشن ولەوێوە هەوادەگاتە فانۆسەکە، بێئەوەی بێڵێت بیکوژێنێتەوە، سەرووی شووشەی فانۆسەکەش کراوەیەو ئەوهەوایەی کەلە لولەکانەوە دێن، بەوێدا تێدەپەڕێت، بەم شێوەیە هەوا دەکات بەئاگرەکەداو باش ناتوانێت بیکوژێنێتەوە.

– ئەنتوان پرسی: ئەو ڕۆنەی کەئێوەی دەیکەنە ئەوفانۆسەوە چ جۆرێکەو چۆن ئەو فانۆسە ئاوابەدرەوشاوەیی دەهێڵێتەوە؟

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: ئەو ڕۆنەی بەکاری دەهێنین، لەجۆری ڕۆنی فانۆسی سادەنییە، بەڵکو یەك جۆر ڕۆنی ڕەشە پونت [12] کەبۆ میسر دەهێنرێت.

12– پونت: بەو ناوچانە دەگوترا کەسەرووی تورکیاو خۆرئاوای قەفقاسی ئەمڕۆیە، لێکۆڵەرەوان پێیانوایە ئەو ڕۆنە ڕەشەی لەفانۆسی دەریایی ئەسکەندەرییە کراوە، نەوتی قەفقاسی بووە. (و– فارسی)

ئەنتوان گوتی: ئەو ڕۆنە لەبازاڕدا دەستدەکەوێت؟

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: ئەو ڕۆنە تەنها بۆهەڵکردنی فانۆسی دەریایی ئەسکەندەرییە بۆ میسر دەهێنرێت، تاکو ئێستا نەمانبینیوە لەبازاڕدا بفرۆشرێت.

– ئەنتوان ئەوەی دەربڕی کەزۆر حەزدەکات هەندێك لەوڕۆنەی دەستبکەوێت: دەتوانیت کەمێك لەو ڕۆنەم بدەیتێ؟

جارێکیتر سەرۆکی پاسەوانەکان سەیرێکی کلیۆپاترای کردو بێدەنگ بوو.

– ئەنتوان گوتی: بۆ بێدەنگ بووی، ئایا ئامادەنیت داواکارییەکەی ئێمە قبوڵ بکەیت؟

– سەرۆکی پاسەوانەکان گوتی: قبووڵکردنی داواکارییەکەی تۆ لەسەرووی دەسەڵاتی منەوەیە، ناتوانم کەمێك لەو ڕۆنەت بدەمێ.

– کلیۆپاترا بە ئەنتوانی گوت: ئەو ڕۆنە تەنها بۆ ئەوچرایە بەکاردێت، نابێك بەکەس بدرێت وباوکم ڕێگا نادات.

– ئەنتوان پێی سەیربوو و گوتی: تۆزێك لەڕۆنی ڕەش چ بەهاو گرنگییەکی هەیە تالەوەرگرتنیدا تەشەبوس بەکەسانی تر بکرێت؟!

– کلیۆپاترا گوتی: کەڵك وەرگرتن لەوڕۆنە یەکێکە لەدەستکەوتەکانی میسرو ئەسکەندەرییە، پاشاکانی میسر لەمانەش باوکم، نەیانویستووە ئەم دەستکەوتە لەدەستبدەن، ئەگەر کەسانیتر ئەو ڕۆنەت بدەنێ، تۆ ناتوانیت کەڵکی لێوەربگریت.

– ئەنتوان گوتی: بۆچی؟

– کلیۆپاترا گوتی: چونکە شێوازی بەکارهێنانی ئەو ڕۆنە بۆ فانۆس، یەکێکە لەنهێنییەکان.

– ئەنتوان پێکەنی– کلیۆپاترا گوتی: ماوەیەك لەمەوبەر پاشای لیبیا بووبە میوانی باوکم وشەوێکیان حەزیکرد فانۆسی دەریایی ببینێت، دوای هاتنی بۆئێرەو بینینی ئەو فانۆسە، کەوتە بیری ئەوەی کەمێك لەڕۆنی ئەو فانۆسەی دەستبکەوێت؛ سەرۆکی پاسەوانەکان وەك ئەم شەو گوتی: ناتوانێت لەم ڕۆنەی بداتێ وپاشای لیبیا داوای لەباوکم کرد کەمێك لەو ڕۆنەی بدەنێ.

پاشایش فەرمانیدا یەك کوویەی گەورە لەوڕۆنەڕەشە، بدەن بەپاشای لیبیا، ئەو پاش چەند ڕۆژێك مانەوەی لەمیسرو دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی، دوای مانگێك نێردراوێکی بۆ ئەسکەندەرییە ڕەوانەکردو تیایدا بەباوکمی ڕاگەیاندبوو کە: ئەو ڕۆنەی لەفانۆسێکی هاوشێوەی فانۆسی دەریایی ئەسکەندەرییەدا بەکارهێناوە، بەڵام ئەو فانۆسە ڕۆشنایی نەداوە، بەڵام لەتێکردنی چرای سادەدا بەباشی دەسوتێت وکاری پێدەکات.

باوکم بەهەمان ڕەوانەکراودا پەیامێکی نارد، کەڕۆنی ڕەش ئەگەر لەلامپای ئاسایی بکرێت، کەڵکی لێوەردەگیرێت و دەسووتێت،بەڵام کەلە فانۆسێکی شێوەی فانۆسی ئەسکەندەرییە بکرێت، ئەوا پێویستیی بەوەیە ئەوڕۆنە سازبکرێت، ئەگەرنا کەڵکی لێوەرناگیرێت. دوای ماوەیەك پاشای لیبیا پەیامێکی بۆ باوکم ناردو داوایکردبوو چۆن دەتوانرێت ڕۆنی ڕەش سازبکرێت؟ باوکم وەڵامی بۆناردەوە، ناتوانێت شێوازی سازکردنی ئەو ڕۆنە بەپاشای لیبیا بڵێت.

– ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا، دەتوانیت بەباوکت بڵێیت هەندێك لەوڕۆنە ڕەشەمان بداتێ؟

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ دەتوانم داوا لەباوکم بکەم هەندێك لەو ڕۆنە بەتۆ بدات، بەڵام شێوازی سازکردنی ئەو ڕۆنە ڕەشە بۆ سووتاندنی بەتۆ ناڵێت.

ئێمە لەقاتی چوارەمی قوللەکەوە هاتینەخوارێ و ئەنتوان یەك مشت پارەی لەباغەڵی دەرهێناو خستییەناو دەستی سەرۆکی پاسەوانەکان، تالەنێوان پاسەوانانی ئەودورگە بچووکەی فانۆسی دەریادا دابەشی بکات، دواتر سواری بەلەمەکە بووین وبەرەو ئەسکەندەرییە بەڕێ کەوتین، کاتێك گەیشتینە ڕۆخی دەریا، ئەنتوان بەخشیشێکی تری دابە سەوڵێدەرەکانی بەلەمەکەو ئێمە سواری کەژاوەکە بووینەوە.

پاش ئەوەی کەژاوەکە دەستی بەڕێیشتن کرد، ئەنتوان لەکلیۆپاترای پرسی: ڕەوشی باوکت بووەتەجێگای سەرسوڕمانی

من.

کلیۆپاترا پرسیی: چ شتێکی ئەو بوەتەجێگای سەرسوڕمانت؟

– ئەنتوان گوتی: سەرم لەوەسوڕماوە بۆچی پاشای میسر ڕێگانادات شێوازی بەکاربردنی ڕۆنی ڕەش بەخەڵکانی تر بڵێت، لەکاتێکدا هەمووکەس دەتوانێت هەندێك پارەبدات بەوکرێکارانەی کەشێوەی سازکردنی ئەو ڕۆنە دەزانن، هەتافێری گرتنەوەی ئەو ڕۆنە بین.

– کلیۆپاترا گوتی: لەسەرتاسەری میسردا تەنها دووکەس شێوەی سازکردنی ئەو ڕۆنە دەزانن، یەکەمیان: پاشاو دووەمیان یەك وەستاکارە، جگەلەو دووکەسە، هیچ کەسێکیتر زانیاری سەبارەت بەسازکردن وبەکارهێنانی ئەو ڕۆنە ڕەشەی فانۆسی دەریایی وچۆنێتیی سووتاندنی نییە.

ئەنتوان لەبیستنی ئەو قسەیە، واقی وڕما.

کلیۆپاترا پێی گوت: باوکم هەرگیز شێوازی سازکردن و بەکارهێنانی ئەو ڕۆنە بەکەس ناڵێت، ئەمە جگەلە وەستاکاری ناوبراو کەدوای پاشا تاکە کەسە دەزانێت، بەڵام ئەگەر خەڵکانی تر فێری شێوەی سازکردن و بەکارهێنانی سووتاندنی ئەو ڕۆنەبن، پاشا خێزانی وەستاکارەکە بەبەرچاوی خۆیەوە دەکوژێت ودواتر خۆشی لەخاچ دەدەن، چونکە ئاشکرا دەبێت شێوازی سازکردن وبەکارهێنانی ئەو ڕۆنە تەنها لەدەمی ئەوەوە باسکراوە.

ئەنتوان گوتی: گوێم لەباسێکە کەلەوەوپێش گوێم لێنەبووەو سەرم سوڕماوە، ڕۆنی ڕەش چەندە گرنگەو درکاندنی سازکردن و بەکارهێنانی ئابەو شێوەیە پارێزراوە.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەم نهێنییە لەبەر ئەوە دەپارێزرێت، چونکە ڕۆنی ڕەش بۆگەورەترین وکاریگەرترین چەکی میسری بەکاردەبرێت.

– ئەنتوان گوتی: ئەگەر بەهەڵەدانەچووبم کاریگەرترین چەکی میسری ئاگری یۆنانییە[13] ئایا لەئاگری یۆنانیدا ڕۆنی ڕەش بەکاردەبرێت؟

13- ئاگری یۆنانی بەیەکێك لەچەکە ترسناکەکانی دنیای کۆن حساب دەکراو کاتێك ئاوت بەوئاگرەدا بکردبا، نەدەکوژایەوە، تەنانەت ئەگەر ئەوئاگرەت لەسەر ڕووی دەریاش دانابا، هەر نەدەکوژایەوە (و-فارسی)

کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ.

ئەنتوان: ئەوەی تۆ گوتت، بەلای منەوە زۆر جێگای سەرنجە، بەتایبەت ئەوەی تۆ دەزانیت چۆن ڕۆنی ڕەش بۆ دروستکردنی ئاتەشی یۆنانی بەکاردەهێنرێت، بێگومان شارەزایت لەپێکهاتەی دروستکردنی ئاگری یۆنانیدا هەیە؟

– کلیۆپاترا گوتی: من شارەزایی تەواوم لەپێکهاتەی ئاگری یۆنانیدا نییە.

– ئەنتوان گوتی: ئەی چۆن دەزانیت لەدروستکردنی ئاگری یۆنانیدا، ڕۆنی ڕەش بەکاردێت ؟

– کلیۆپاترا گوتی: تۆ لەم شارەدا لەهەر کەسێك بپرسیت بۆچی شێوەی سازکردنی ڕۆنی ڕەش زانینی قەدەغەیە، پێت دەڵێن، ڕۆنی ڕەش کەسازکرا بۆ دروستکردنی ئاگری یۆنانی بەکاردەهێنرێت، لەبەرئەوە باسکردنی ئەوە لەلایەن منەوە زانیاری پێدان نییە.

– ئەنتوان پرسیی: چۆن دەبێت تۆ کچە گەورەی پاشای میسریت، شێوەی سازکردنی ڕۆنی ڕەش نەزانیت، چۆن ؟

– کلیۆپاترا گوتی: لەوڵاتی میسردا هیچ پاشایەك ئەم نهێنییە بەڕۆڵەکانی خۆی نالێت، جا چ کوڕبن-یا کچ، تەنها لەکاتێکدا ئەونهێنییە بەجێنشینی خۆی دەڵێت، ئەویش لەسەرەوبەندی مردندا.

– ئەنتوان گوتی: کەواتە تۆ کاتێك باوکت مرد، ئەم ڕازە دەزانیت؟

– کلیۆپاترا گوتی: لەکاتی کۆچی پاشای میسردا، ئەگەر جێنشینەکەی تەمەنی نەگەیشتبێتە بیست وپێنج ساڵ، نهێنی سازکردنی ڕۆنی یۆنانی لەدەمی باوکییەوە دەبیستێت، بەڵام کەنەگەیشتبێتە تەمەنی بیست وپێنج ساڵی ئەونهێنییە دەنووسرێت ودەخرێتە سندوقێکەوەو لەناو کۆشکی پاشایەتیدا دەخرێتەژێر گڵەوە، هەتا ئەوکاتەی جێنشینی پاشای میسر تەمەنی دەگاتە بیست وپێنج ساڵ، ئەوکاتە سندووقەکە دەردەهێنرێت ونووسراوەکەی ناوی دەخوێنرێتەوە، تائەو نهێنییە بزانێت.

– ئەنتوان پرسیی: بۆ تەمەنی بیست وپێنج ساڵییان بۆ ئەوە دیاریکردووە؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەمە نەریتێکی کۆنەو ئەوان لەوبڕوایەدابوون پێش گەیشتن بەتەمەنی بیست وپێنج ساڵی، مرۆڤ ناگاتە قۆناغی کامڵبوونی عەقڵی وئەگەری ئەوەهەیە ئەو نهێنییە بدرکێنێت، بۆیە ئەگەر لەکاتی مردنی باوکمدا تەمەنم نەگاتە بیست وپێنج ساڵی، ئەوا ناتوانن لەنهێنیی سازکردنی ڕۆنی ڕەش ئاگادارم بکەن.

ئەنتوان گوتی: کاتێك باوکت مرد لەبەر بەکارهێنانی ڕۆنی ڕەش لەدروستکردنی ئاگری یۆنانیدا، ئەو نهێنییە بپارێزیت، ئەوا شتێکی سەیرە، چونکە ئاگری یۆنانی لەمەیدانی شەڕدا وەك چەکێك هێندە مەترسیدارو یەکلاییکەرەوە نییە، زۆرجار چەکی ئاگری یۆنانییان لەشەڕەکاندا بەکارهێناوە، بەڵام هیچ سەرئەنجامێکی وای نەبووە.

– کلیۆپاترا گوتی: جگەلەوەش بەرژەوەندی سەربازیی هەیە لەشەڕەکاندا، ئاگری یۆنانی، میسریش هەیەتی، لەبەر ئەوە باوکم حەزناکات کەسانیتر هەیانبێت.

ڕێگای گەڕانەوەمان شەقامێك بوو بەبەردەم کتێبخانەدا دەڕۆیشتین، کاتێك گەیشتینە ئەوێ تەواوی پەنجەرەکانی کتێبخانەکە ڕووناکی چراکانی لێوەدیاربوو.

– ئەنتوان گوتی: ئەو تەلارە چییە ئەوەندە ڕووناکە؟

کلیۆپاترا وەڵامی دایەوە: ئەو تەلارە کتێبخانەیە کەبەڕۆژ پێشانم دایت.

– ئەنتوان گوتی: بۆچی ئەوەندە ڕووناکە؟

– کلیۆپاترا گوتی: چونکە شەوانە خەڵك لەوێدا کتێب دەخوێننەوە.

– ئەنتوان گوتی: من پێموایە شارێك کەشوێنی ڕابواردن وبەزم ورەزمی تایبەتی هەبێت، نەدەبوایە کتێبخانەی تێدابووایە.

کلیۆپاترا گوتی: لەشارەکەمدا کتێب خوێنەرەوەی زۆرهەن، جگەلەوەی هەندێك لەوخوێنەرانە دانان ولەچوارلای دنیاوە بۆ ئێرەدێن، تاکەڵك لەوکتێبانە وەربگرن کەدانسقەن. لەبەرئەوە کتێبخانە شەوو ڕۆژ کراوەیەو لەخۆرئاوابوونەوە تابەری بەیانی چراکان دادەگیرسێن هەتاهەمووکەس لەوانەش دانشمەندانی بیانی، بتوانن کەڵك لەکتێبەکانی ئەوشوێنە وەرگرن.

– ئەنتوان گوتی: من پێم سەیرە، ئەسکەندەر کەبەردەوام سەرقاڵی جەنگ بوو، چۆن بواری هەبووە، ئەم کتێبخانەیە لەم شوێنەدا دروست بکات؟!

– کلیۆپاترا لێی پرسی: تۆ گوتت ئەسکەندەر ئەم کتێبخانەیەی دروستکردووە؟

– ئەنتوان وەڵامی دایەوە: من ئەم قسەیەم لەکەس نەبیستووە، بەڵکو بۆخۆم وا وێنام کرد ئەسکەندەر ئەم کتێبخانەیەی دروستکردووە.

کلیۆپاترا گوتی: ئەسکەندەر هەموو کاتەکانی بەشەڕو نۆشینی شەراب– یان ڕابواردن لەگەڵ ژناندا بەسەربردووەو بواری ئەوەی نەبووە خەریکی کاری زانستی بێت. ئەم کتێبخانەیە باپیرەم (بەتلیمۆسی یەکەم) کەناسراوە بە (ڕزگارکەر) دروستیکردووە.

– ئەنتوان پرسیی: کەی ئەم کتێبخانەیەی دروستکردوە؟

– کلیۆپاترا گوتی: لەوانەیە بزانیت کەدامەزرێنەری پشتاوپشتی پاشایەتی، باوکم سێزدەهەمین پاشایە، باپیرەی ئێمە بەتلیمۆسی یەکەم ناسراو بە (ڕزگارکەر) بووە، ئەو حوکمڕانی میسری لەدەستدابووە، پاش مردنی ئەسکەندەر[14]

14– مەبەست لەئەسکەندەری مەکدۆنییە (و– کوردی)

خۆی بەپاشای میسر داناوە، ئەو ماوەی بیست ساڵ حوکمڕانی میسری کردووەو ئەم کتێبخانەیەی لەڕۆژگاری حوکمڕانی خۆیدا دروستکردووە، بەڵام ئەو بیست ساڵە بەس نەبوو کەئەو کتێبخانەیە لەکتێبی بەکەڵك پڕبکات. بەڵکو دوای ئەو باوك و باپیرانی من بۆکاملبوون وگەورەکردنی ئەو

کتێبخانەیە تێکۆشاون، تاگەیشتووەتە ئەم ئاستەی ئەمڕۆ. بەداخەوە تۆ کتێب خوێنەرەوەنیت، دەنا تۆم دەبرد بۆ کتێبخانەکە هەتابتدیبایە بۆچی ئەم شوێنە بەگەورەترین گەنجینەی دنیا لەقەڵەمدەدەن.

– ئەنتوان گوتی: من نەفرەتم لەخوێندنەوەی کتێبە، ئەمە بەپیشەوکاری ئەوکەسانە دەزانم کەلەژیانیاندا خاوەنی لێوەشاوەیی نین وناتوانن بگەنە پلەوپایەی بەرز، بۆ ئەوەی ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەموکوڕییانەیان پەنادەبەنەبەر کتێب.

– کلیۆپاترا گوتی: بەڕای تۆ لێوەشاوەیی چییە؟

– ئەنتوان گوتی: لێوەشاوەیی بریتییە لەدلاوەری ونەبەردی لەمەیدانی جەنگداو زاڵبوون وبەدەستهێنانی هێز بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات.

– کلیۆپاترا گوتی: لەبەرئەوەی تۆ سەروکارت لەگەڵ کتێبدا نییە، باشتروایە زوو لەم شوێنە دووربکەوینەوە.

– ئەنتوان گوتی: من هۆگری کتێب نیم، بەڵام هۆگری بینینی شتی سەیرم، حەزدەکەم بچمەناو ئەو کتێبخانەیەو ئەوکەسانە ببینم کەتەمەنی خۆیان لەگەڵ کتێبدا بەسەردەبەن، واتا تەمەنیان لەڕێگای تراویلکەییدا بەڕێدەکەن، ئەوانە چ کەسانێکن؟!

بەفەرمانی کلیۆپاترا هەڵگرانی کەژاوەکە ئەوانی لەسەر زەویی داناو من کەلەپشت ئەوانەوە دەڕۆیشتم، چووینەناو کتێبخانەکە، پاش ئەوەی پێماننایە سەرسەرای کتێبخانەکە، من ئەو شوێنەم وەك هەشت گۆشەیەکی گەورە هاتەبەرچاو ولەوهەشت گۆشەیەدا هەشت خانەی کتێب دانانی گەورەم بینی، کەلەبەرامبەر هەر یەکێکیاندا نووسینێك لەبەرد هەڵکەندرابوو، بەخەتێکی ڕەشیش لێی نووسرابوو، ئەم نووسینانەی لێ هەڵکەندرابوو، میسری، یۆنانی، ڕۆمی، فارسی، عیبری، هیندی، سریانی وعەرەبی وخانەی وەرگێران.

بەم شێوەیە دەزانرا کەهەر یەك لەوهەشت گۆشانە، تایبەتبوون بەکتێبی ئەو زمانانەو یەکێکیشیان تایبەت بوو بەخانەی وەرگێران.

ئەنتوان گوتی: سەرەتا واباشە بچینە بەشی میسری، تاببینین چی لەوێدا هەیە؟

کلیۆپاترا میوانەکەی بردەبەشی میسری ومنیش لەپشتیانەوە ڕۆیشتم، لەو دوو گۆشەیەی کەئێمە چووینەناوی چەند هۆدەیەکی گەورەی لێبوو لەهەر هۆدەیەکدا چەند سندووقێك بەرچاو دەکەوتن کەلەبری ئەوەی هەڵبدرێنەوە، لەپێشەوە دەکرانەوە، ئەگەر بتویسایە دەرگاکانی بکەیتەوە، دەبووایە بەرەولای خۆت، واتا بۆدەرەوە بتکردایەتەوە [15] ئەو سندووقانە پڕبوون لەکتێبی میسری کەهەندێك لەوکتێبانە لەسەر (پاپی ڕووس) [16] نووسرابوون وهەندێکی تریان لەسەر پێستی ئاژەڵ نووسرابوون.

لەهەر هۆڵێکدا کۆمەڵێك پیاو کەهەندێکیان بەساڵاچووبوون وهەندێکی تریشیان گەنج بوون، نووسراوەکانیان دەکردەوەو دەیانخوێندنەوە، هەندێکیش لەوانە لەسەر تەختە [17] دەیاننوسینەوە، بۆئەوەی نوسخەیەك لەوکتێبانەیان هەبێت.

– کلیۆپاترا سەرەتا میوانەکەی خۆی بردەهۆدێکی لای ڕاست ودواتر بەشی چەپی هۆدەکەی ترو گوتی: سەیرکە.. هەموو ئەو هۆدانەی چ لەلای ڕاست و چ لەلای چەپ، ڕێڕەوێکی بۆسەر پەنجەرەکان

هەیە، بەشێوەیەك کەلەکاتی ڕۆژدا هیچ یەکێك لەوهۆدانە تاریك نەبێت و ڕووناکیی لێبدات، چونکە باپیرەی من بەتلیمۆسی یەکەمە، ئەم تەلارەی بەشێوەی ئەستێرەیەکی هەشت گۆشە دروستکردووە، کەلەنێوان هەردوو گۆشەیەکدا باغی گوڵ ودرەخت دروستکراون، ئەگەر تۆ باڵندەیەك بیت و بەئاسماندا بفڕیت، لەوێوە ئەو تەلارە هەشت گۆشەیە باش دەبینیت کەلەنێوان هەردوو گۆشەدا باغێکی بچووك هەیە، بەشێوەیەك لەم کتێبخانە گەورەیەدا ژوورێك نییە تاریکبێت و ڕووناکیی لێنەدات، ئەمجۆرە بیناسازییە لەهیچ شوێنێکی تری دنیادا بوونی نییەو وەك دەبینیت هەر گۆشەیەك سێ قاتەو هەموو نهۆمەکانیش پڕلە کتێبن.

15- شێوەی باوڵی دیوارییە کەبۆ دەرەوە دەکرێتەوە(و-کوردی)

16- پاپی رووس: شێوە کاغەزێکی سەرەتایی بووە:(و-کوردی)

17- مەبەست لەکاغەزی ئەوکاتەیە کەشێوە تەختەیی بووە:(و-کوردی)

کلیۆپاترا دەیویست میوانەکەی ببات بۆ نهۆمی سەرەوە، بەڵام ئەنتوان نەچوو وگوتی: بێگومان نهۆمەکانی تریش وەك ئەم نهۆمەوان وئێمە لێرەدا شتێکی تازەی وامان نەبینی.

کلیۆپاترا میوانەکەی لەبەشی کتێبەکانی میسری بردەدەرەوەو بەرەوکتێبە یۆنانییەکان چوون، ئەوکتێبانەی لەوبەشەدابوون، لەکتێبەکانی بەشی میسری زیاتربوون وهەندێك لەکتێبەکانی یۆنانی کەلەسەر پێستی گیانداران نووسرابوون، ئەوەندە گەورەبوون کەسندوقێکی گەورەیان پڕدەکرد، لەوێشدا کۆمەڵێك لەپیرو لاو خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوون، لەوانەش پیرەمێردێکیان بینی شەدەیەکی سووری بەسەرەوەبوو، ڕیش وقژی سپیی شکۆداریی پێ بەخشیبوو، ئەو پیرەمێردە خەریکی خوێندنەوەبوو، بۆئەوەی بتوانێت کۆمەڵێك لاپەڕە لەبەر ڕووناکی چراکە بخوێنێتەوە دەبووایە دانەدانە لەلای ڕاستییەوە هەڵبگرتایەو بیهێنایەتەبەر ڕووناکی چراکەو پاش خوێندنەوەی بیخستایەتە لای چەپییەوە. من کەدەمزانی زمانی یۆنانی بنووسم وبیخوێنمەوە، نزیکی ئەوکتێبە بوومەوە، بۆئەوەی بزانم چ کتێبێکە، بینیم ئەو کتێبە دەربارەی مێژووی یۆنانە کەباسی لەهەزار ساڵ لەوەوبەری دەکرد. پیرەمێردەکە بەشێوەیەك سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبەکەبوو، سەری نەسووڕاند تابزانێت ئێمە کێین و وەك ئەوەی کەئاگای لەهاتنی ئێمە بۆئەو ژوورەنەبێت.

کاتێك ئەنتوان ئەو پیرەمێردەی بینی بەوشێوەیە لەخوێندنەوەی ئەو کتێبەدا قووڵبووەتەوە، بەگاڵتەجاڕییەکەوە سەری بادا، پاش ئەوەی ئێمە لەوژوورە چوینەدەرەوە، بەکلیۆپاترای گوت: ئەم پیرەمێردە بەدبەختە هەموو تەمەنی هۆی بەکارێکەوە بەفیڕۆدەدات کەنەکەڵکی بۆخۆی هەیەو نەبۆخەڵکیش، خۆئەگەر لەبری خوێندنەوەی کتێب، شمشێرێکی بەدەستەوە بگرتایە، ئەمڕۆ دەبوو بەیەکێك لەسەرداران- یان پاشایانی دنیا، خۆئەگەر کەشتییەکی دروستبکردایەو خەریکی بازرگانیکردن بووایە، ئەوائەمڕۆ دەبووە یەکێك لەدەوڵەمەندو بەتواناکان!

**دوای ئەوەی لەبەشی کتێبی یۆنانی چووینەدەرەوە، چووین بەبەشی عیبریدا گەڕاین. کلیۆپاترا لەوێدا بردینی بۆهۆدەیەك بەهاوکاری لێپرسراوی بەشەکە سندوقێکی کردەوە کۆمەڵێکی زۆر لەکاغەزی (تیماجی)[28] مان هاتەبەرچاو.**

28- پێست وشککراوەی بزنەکە پارچەپارچە دەکرێت و وەك کاغەزی لێدێت.(و- کوردی)

**- کلیۆپاترا گوتی: لەهەموو سندووقەکانی ئەم بەشەدا، تەنها یەك کتێب هەیە ئەویش (تەوراتە)**

**- ئەنتوان پرسی: تەورات چییە؟**

**- کلیۆپاترا گوتی: تەورات کتێبی جوولەکەیەو هەمان ئەو تەوراتەی کەتۆ لێرەدا دەیبینیت لەبەشی کتێبەکانی یۆنانیشدا هەیە.**

**- ئەنتوان گوتی: ئایا یۆنانییەکانیش تەوراتیان هەیە ؟**

**- کلیۆپاترا پێی گوت: نەخێر، بەڵام ئەو تەوراتەی کەلەبەشی کتێبی یۆنانیداهەیە، وەرگێڕانی ئەم تەوراتەیە بەزمانی یۆنانی و ئەو وەرگێڕانەیشیان هەر لەسەر پێستی بزن نووسیوەتەوە، بۆیە یەك ژووری پڕکردەوە.**

**- ئەنتوان بەپێکەنینێکی گاڵتەجارییەوە گوتی: ئایا ئەو وەرگێڕانەی کەژوورێکی پڕکردووە، هەر دەبووایە تەوراتێکیتر بەزمانی یۆنانی هەبووایە؟**

**کلیۆپاترا گوتی: وەرگێڕانی تەورات باپیرەی من (بەتلیمۆسی دووەم) کەبە (فیلادلف)[19] ناسراوەو سی ونۆ ساڵ پاشایەتی کردووە.**

19- بەتلیمۆسی دووەم کەناسراوە بەفیلادلف- یان فیلادلیفۆس، واتا خۆشەویستی باوك؛ کەلەساڵی (285 تا 246)ی پێش زاین. لەمیسردا پاشایەتی کردووەو یەکێکبووە لەپاشا بەتواناکانی میسرو ڕۆژگاری خۆی. لەسەردەمی ژیانی بەتلیمۆسی یەکەمدا هاتەسەر تەختی پاشایەتی ولەماوەیەکی کەمدا دەستی بەسەر فینیقییەو سوریاو سعودیەو ئەسیوبیاو لیبیاو بەشێك لەئاسیای بچووك وهەندێك لەدورگەکانی ڕۆمدا گرت.

ناوبراو لەهەمان کاتدا کەسێکی لێودشاوەو لێزانبوو سەبارەت بەکاروبارەکانی ئیدارەی دەوڵەت وبەرەوپێشبردنی بازرگانی میسردا زۆر بەجددی کۆششی دەکرد، هەروەها لەکارەکانیدا پشتی بەزانایان وئەدیبان وهونەرمەندان دەبەست وپشتگیری و کۆمەکی زانستی وئەدەبی دەکرد. وەرگێڕانی تەورات کەبەسەردەمی دێرینی تەوراتی حەفا ناسراوە، لەلایەن ئەودوە کراوە، هەروەها قانۆسی دەریاییش هەر لەسەردەمی ئەودا دروستکراوە (و- فارسی)

**- ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا من پێموایە دەبێت لەتۆ بترسم!**

**- کلیۆپاترا گوتی: لەبەرچی؟**

– ئەنتوان گوتی: لەبەرئەوەی من کەدەزانم ناوی باپیرەی چوارەمم چیبووە، بەلام تۆ باپیرانی خۆت بەشێوەیەك دەناسیت وەك ئەوەوایە یەك بەیەك ئەوانت بینیبێت.

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ من دوانزە پشتی خۆم، کەهەموویان پاشای میسر بوون، بەشێوەیەك دەناسم، وەك بڵێیت من لەڕۆژگاری پاشایەتی ئەواندا ژیاوم.

– ئەنتوان بەپێکەنینەوە گوتی: چونکە باوکی تۆش پاشایە، لەبەرئەوە پشتی تۆ سێزدەهەمین پاشادەبێت، چۆنچۆنی پیاوێکی وەك من کەناوی چوارەمی باپیرەی خۆی نازانێت، دەتوانێت ئافرەتێکی خۆشبوێت کەسیانزە پشتی پاشابوون؟

– کلیۆپاترا پێکەنی وگوتی: کاتێك عیشق هات بنەچەو خانەدانی گرنگی نامێنێت.

ئەنتوان گوتی: بەتلیمۆسی دووەم سی ونۆ ساڵ پاشایەتی کرد، تەنها بۆئەوەی تەورات لەزمانی عیبرییەوە بۆزمانی یۆنانی وەربگێڕێت؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەو ئەوکارەی نەکردووە، بەڵکو کۆمەڵێك لەشارەزایانی زمان، وەرگێڕانی ئەوەیان گرتووەتە ئەستۆ وبەئەوان سپێردراوە لەعیبرییەوە وەریبگێڕنە سەرزمانی یۆنانی.

– ئەنتوان گوتی: باپیرەی تۆ دەیویست میللەتەکەی بکات بەجوولەکە؟

– کلیۆپاترا گوتی: نەخێر،باپیرە گەورەم نەیدەویست ئایینی جوولەکە لەناو میللەتەکەیدا ڕەواجی هەبێت، بەڵکو زانستی خۆشدەویست وپێیوابووە پێویستە کتێبە مەزنەکان وەربگێڕدرێنە سەرزمانی یۆنانی، تائەم میللەتەی میسر تێبگات خەڵکانیتر چی دەڵێن وچۆن بیردەکەنەوە، کەئەمە تەنها تایبەت بەتەوڕان نییە، لەم کتێبخانەیەدا کتێبی تریش هەن بۆکەڵك لێوەرگرتنی خەڵکی میسر وەرگێڕدراون.

– ئەنتوان گوتی: واباشتربوو بەتلیمۆسی دووەمی باپیرەی تۆ، ڕۆژگاری سی ونۆ ساڵ حوکمڕانیکردنی خۆی، بەکاری بەکەڵك بەسەربردبا، جگەلەوە وەرگێڕانی تەورات بۆ زمانی یۆنانی نەبووەتەهۆی بەرەوپێشبردنی میسرو نەلەسەروەتی باپیرەی تۆی زیادکردووە.

– کلیۆپاترا پێی گوت: کارەکانی بەتلیمۆسی دووەم، تەها وەرگێڕانی تەوڕات نەبووە، لەزمانی عیبرییەوە بۆ زمانی یۆنانی، بەڵکو زۆرکاری گەورەی تری ئەنجامداون، یەکێك لەوانە دروستکردنی فانۆسی دەریایی ئەسکەندەریەیە کەئەم شەو تۆ بینیت.

ئەنتوان گوتی: بەلام ئەگەر لەیادم مابێت تۆ گوتت، دروستکردنی فانۆسی دەریا لەلایەن پیاوێکەوە دروستکراوە بەناوی، سوستراوس کیندوس؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەوپیاوە تەنها نەخشەی داهێنانی فانۆسەکەی دروستکردووەو پێشکەشی پاشای کردووەو ئەو داهێنەری ئەوفانۆسەیە، نەك دروستکردنی، سوستراوس کیندوس کەسێکی هەژاربووەو نەیتوانیوە فانۆسی دەریای ئەسکەندەریە دروستبکات، بەلام کاتێك باپیرم زانیی داهێنانەکەی ئەو بوڕەواجی بازرگانیکردن لەبەندەری ئەسکەندەرییەدا بەکەڵکە، ئەم چرایەی دروستکردو بۆئەوەی سوستراوس کیندوسیش بەخۆشگوزەرانی بژی، مووچەی بۆ بڕییەوەو ئەو داهێنەرە تائەو ڕۆژەی مرد بەئاسودەیی ژیاو دوای مردنیشی ڕۆڵەکانی ئەو بەخۆشگوزەرانی ژیان.

ئێمە لەوبەشەی کتێبخانەکە هاتینەدەرەوەو چووین بۆبەشێکیتر، کەتایبەتبوو بەخانەی وەرگێڕان، لەوشەوەدا ئەوکەسانەی کەلەبەشی خانەی وەرگێڕان کاریاندەکرد زۆرنەبوون، بەڵکو زۆرینەی ئەوکەسانەی لێرەدا کاردەکەن، شەوانە دەچنەوە ماڵەکانی خۆیان و ڕۆژانە کاردەکەن.

– ئەنتوان بەدەستی ئاماژەی بۆچەند کەسێك کرد کەلەوێدابوون وپرسیی ئایا ئەوانە شارەزایانن؟

– کلیۆپاترا گوتی: لەم کتێبخانەیەدا هەموویان شارەزاو دانان، جگەلە خزمەتچییانی کتێبخانەکەو پاسەوانان، کەسیتر لێرەدا نییە کەدانا نەبێت، ئەوانەشی لێرەدا کاردەکەن کارمەندی دەوڵەتن ومووچە لەدەوڵەت وەردەگرن، خۆ ئەگەر شەوانەش سەرقاڵی کارکردنبن، ئەوا کرێی سەربار وەردەگرن.

– ئەنتوان گوتی: ئایا وەرگێڕەکانی ئێوە زمانی ڕۆمی دەزانن؟

– کلیۆپاترا پێکەنی وگوتی: لەبەرئەوەی زمانی ڕۆمی دووەم زمانە، هەموو ئەشرافەکان[22] دەیزانن، جا چجای وەرگێڕەکانی ئێرە کەزۆر لەزمانە گەورەکانی دنیا دەزانن، ئایا حەزدەکەیت ئەوکتێبانە ببینیت کەئەو وەرگێڕانە لەزمانێکەوە بۆزمانێکیتر وەریان گێڕاون؟

– ئەنتوان گوتی: تاقەتی بینینی کتێبم نەماوە.

– کلیۆپاترا گوتی: چونکە تۆ پیاوێکی جەنگاوەریت، نازانیت بەشی وەرگێڕانی ئەم کتێبخانەیە چ کارێکی گەورەی بێپێشینەی کردووە، پێشئەوەی بەشی وەرگێڕانی ئەم کتێبخانەیە دروستبکرێت، ئەگەر میسرییەك ویستبای لەزمانی ڕۆمی بخوێنێت دەبووا بۆفێربوونی زمانی ئێوە بچووایە بۆ ڕۆم وکرێی بدایە بەکەسێکی ڕۆمی، بۆئەوەی فێری زمانی ڕۆمی بکردایە، بەڵام ئێستا دەتوانن بێت بۆئەم کتێبخانەیەو خەریکی خوێندنەوەی فەرهەنگی زمانی یۆنانی بەڕۆمی بن ولێوەی فێربن، هەروەها زمانەکانی هندی وعیبری و عەرەبی وفارسی وسریانیش بەوشێوەیە.

چونکە قاموسی زمانی ئەوزمانانە بەزمانی یۆنانی هەیە، ئەمە ئەوهۆکارانەن کەوەرگێڕەکان بەدرێژایی سەدو پەنجا ساڵ ئەنجامیانداوە، ئەمڕۆ هیچ زمانێکی ناسراونییە لەم کتێبخانەیەدا کەبەفەرهەنگی زمانی یۆنانی وەرنەگێڕدرابێت. پێموابێت

من [20] لەئەنتوان زیاتر لەقسەکانی کلیۆپاترا دەگەیشتم وچێژم لەقسەکانی ئەو وەردەگرت، ئەنتوان بەهای مەعنەوی کتێبخانەکەی نەدەزانی وتەنها سەری لەزۆری کتێبەکان وبوونی دانایانی نەتەوەی هەمەجۆر سوڕمابوو، چونکە لەوکتێبخانەیەدا دانایانی میللەتی هەمەجۆر بونیان هەبوو، بەتایبەت دانیشمەندانی ئێرانی و یۆنانی.

20– من: شرمیون (و– کوری)

هەر دانشمەندێکیش جلوبەرگی میللیی خۆی لەبەردابوو کەزۆربەی ئەوانە زمانی یۆنانی– یان ڕۆمییان دەزانی، بەڵام ئەگەر ئەو دوو زمانەشی نەزانیبا ئەوا هەردەیتوانی کەڵك لەکتێبەکانیتری کتێبخاەکە وەربگرێت، ئەمەجگەلەوەی بەزمانی خۆشیان کتێبیان لەوێدا دەستدەکەوت.

-کاتێك کلیۆپاترا زانی میوانەکەی ماندووە، وتی: تەماشاکردن بەسەو پێویستە لەکتێبخانەکە بچینەدەرەوەو بڕۆین و ئیسراحەت بکەین. ئێمە لەگۆشەی کتێبخانەکە هاتینەدەرەوەو پێماننایە هۆڵە

گەورەکەی کەهەموو بەشەکانی دەکەوتنەسەر، لەوکاتەدا لەپڕ کلیۆپاترا وەستاو گوتی: هەریەك لەدوانزە باپیرە پاشاکانی من لەرۆژگاری حوکمڕانی خۆیاندا پارێزگاری ئەم کتێبخانەیان کردووەو گرنگییان پێداوە، لەم کتێبخانەیەدا کتێب هەن بۆدەستکەوتنی ئەمانە لەوڵاتانیتر، کەسانێك بۆ مەملەکەتی دوورەدەست ڕۆیشتوون وبەرگەی ماندووبوون وئازاریان گرتووەو زێڕو زیویانداوە، بۆئەوەی ئەوکتێبانە بهێنن بۆ ئێرە، بۆئەوەی لە لەناوچوون ڕزگاریان بکەن وبەپارێزراوی بمێننەوەو شکۆیی ومەزنی ئەم کتێبخانەیەش مەرکەزییەت پەیدا دەکات.

– ئەنتوان گوتی: من پێموایە جگەلەوەی کۆکردنەوەی ئەوکتێبانە کەڵکی بۆپاشایانی میسر نییە، نەیەك جەنگاوەر زیاد دەکات ونەیەك لیرەی زیریش دەچێتە خەزنەی ئەوانەوە، هەتا سەبارەت بەوشێتانەی کەتەمەنی خۆیان بەکتێبەوە خەریك دەکەن وکەڵکی لێوەرناگرن.

– کلیۆپاترا لێی پرسیی: بۆچی؟

– ئەنتوان گوتی: شەڕێك بەسە.ئەم کتێبانە لەناوببات وشوێنەواری کتێبەکانی نەهێڵێت.

– کلیۆپاترا گوتی: شەڕ چ کاری بەو کتێبانەیە؟

– ئەنتوان بەپێکەنینەوە گوتی: ئەگەر سەرکردەیەکی داگیرکار کتێبی خۆش نەوێت و(وەك من) میسر بگرێت، دوورنییە ئەو کتێبانە لەناوبەرێت وسەرئەنجام ڕەنجی هەموو باوك وباپیرانی تۆ وئەوکەسانەی لەو کتێبخانەیەدا ڕەنجیان کێشاوەو ماندووبوون بەبا بەرێت!

دوای ئەم قسەیە کلیۆپاتراو میوانەکەی لەکتێبخانەکە هاتنەدەرەوەو سواری کەژاوەکەبووین وڕێگای کۆشکی پاشایەتیمان گرتەبەر.

* * *

## بەتلیمۆسی شمشاڵ ژەن وحەزو گرفتارییەکانی ئەو

لەهیچ ڕۆژگارێکی پاشایەتی میسردا، کوڕو کچەکانی پاشا بەقەد کوڕو کچەکانی بەتلیمۆسی سیانزەیەم ناسراو بەشمشاڵ ژەن، ئازادییان نەبووە. پاشای میسر سەبارەت بەکاروباری وابەستەبە ڕۆڵەکانی خۆی، بچووکترین دەستێوەردانی نەدەکردو ئەوانە دەیانتوانی بۆ هەرشوێنێك حەزیان لێبووایە بچوونایەو لەگەڵ هەرکەسێکیشدا دۆستبوونایە.
هەرکاتێك باوکی کلیۆپاترا (واتە باتلیمۆسی سیانزەیەم) کاری دەوڵەت وپاشایەتی تەواودەبوو بەرەو شمشاڵەکانی دەچوو ویەکێکیانی هەڵدەگرت ودەستیدەکرد بەلێدانیان- یائەوەتا ڕێگای باغی شێرەکانی دەگرتەبەر بۆئەوەی بزانێت شێرەکانی ساغن- یان نا. ئەوکەسانەی کەلەباغی شێرەکانی بەتلیمۆسی سێزدەهەمدا کاریان دەکرد دەیانزانی هەرکاتێك لەبەشی گۆشتی شێرەکان بدزن بەتوندی سزا دەدرێن. لەنێو خزمەتکارەکانی شێرەکاندا پیرەمێردێك هەبوو منی زۆر خۆشدەویست و هەر کاتێك کەمن دەچووم بۆ ئەوباغە بۆبینینی شێرەکان، لەباوەشی دەگرتم وماچی دەکردم ودەیگوت: شرمیون ، من کچێکم هەبوو کاتێك گەیشتە تەمەنی تۆ، نەخۆشکەوت ومرد، بۆیە هەرکاتێك تۆدەبینم پێموایە کچەکەم دەبینم، کەتۆش ماچ دەکەم وادەزانم ماچی ڕوومەتی کچەکەم دەکەم.
منیش(ئاوتی)ی پیرەمێردم زۆر خۆشدەویست، زۆرجاریش کەدەچووم بۆ باغی شێرەکان، میوەم لەگەڵخۆمدا دەبردو دەمدا بەو(ئاوتی) یەی کەددانەکانی نەمابوون وتێبینی ئەوەشم دەکرد میوەی گەییوی بۆببەم تابەبێ ئەزیەت بیانخوات، ئاوتی پیاوێکبوو دەستپاك، هەرگیز لەبەشە گۆشتی شێرەکانی نەدەدزی، ڕۆژانە بۆ تێرکردنی شێرەکان دوازدە گایان لەناوباغی شێرەکاندا سەردەبڕی، گۆشتەکەیان لەنێوان شێرە نێرو مێکان وبەچکەکانیاندا دابەشدەکرد، سەروپێکانیشیان دەدرا بەکرێکارانی شێرخانەکە، بەڵام پێستی گاکان بۆپاشای میسر دادەنراو دەیانبرد بۆدەباغخانە بۆئەوەی پێستکە چاخۆشی بکەن وچەرمەکەی ببەن بۆیەکێك لەوکارخانانەی کەتایبەت بەکۆشکی پاشایەتی بوو، تالەوێ بیکەن بەپێڵاو.
بەمنداڵی نەم دەزانی نرخی شتومەك چەندە، بەڵام کاتێك گەورەبووم بۆم دەرکەوت کەگرانترین خۆراك گۆشتی ماڵاتەو هیچ خۆراکیکیتر بەقەدەر گۆشتی گا گران نەبوو. ئەوگایانەی کەبۆ شێرەکانیان دەبرد، دەبووایە گای دابەستە بوونایە، چونکە پاشای میسر فەرمانی پێدابوون کەدەبێت خۆراکی شێرەکانی ئەو لەباشترین وقەڵەوترین گا هەڵبژێردرێت، تاکو شێرەکان نەخۆش نەکەون، هەندێك لەوکەسانەی کەلەباغی شێرەکاندا کاریان دەکرد، فێرببوون هەموو ڕۆژێك هەندێك لەوگۆشتی گایانەی بۆ شێرەکانیان سەردەبڕی لەبازاڕدا دەفرۆشتەوە (ئاوتی)ی شێرەوان لەودزییەدا شەریکنەبوو، بەڵام ئەم مەسەلەیەی دەزانی وئاشکرای نەدەکرد. کاتێك بەتلیمۆسی سیانزەهەم بەدزینی ئەوگۆشتەی زانی فەرمانیدا هەموو ئەوانەی دزیان کردووەو ئەوانەشی کەئاگادارن وئاشکرایان نەکردووە، ببڕێن ڕەوانەی کانەکانیان بکەن، بۆدەرهێنانی کانزا.

کاتێك ئاوتی پیرەمێردیان لەگەڵ ئەوانیتردا بەزنجیر بەستەوە تائەوکاتەی سواری کەشتییانکردن هەتابیانبەن بۆکانی دەرهێنانی کانزا، کەکەوتبووە خوارووی میسرەوە، ئەو پیرەمێردە دەگریاو دەیگوت گوناهم نییە، هەرچەند کەسێکی خاوەن ئەزموونیش بوو، سەبارەت بەکەویکردنی شێر، بەتلیمۆسی سێزدەهەمی پاشای میسر ئامادەنەبوو بیبەخشێت وئەویشیان وەك ئەوانیتر بردبۆ کانزا دەرهێنان، من نازانم ئەوانەی کەدەیانبەن بۆ کانی کانزا دەرهێنان چۆنچۆنی کاردەکەن، بەڵام بیستوومە دەڵێن، کارکردن لەدەرهێنانی کانزادا زۆرگرانترە لەسەوڵلێدانی کەشتی جەنگی گالدی [24] پاشای میسر، هەروەها گوایا دەڵێن: ئەوانەی کەبۆ دەرهێنانی کانزا دەیاننێرن، دەبێت لەژێر زەویدا کاربکەن، کەگەرمای ئەو وەك گەرمی تەندوور وایەو لەوێدا ئەوەندە ماندوودەبن وعەرەق دەرێژن کەهیچ کەسێك لەدووساڵ زیاتر بەرگەناگرێت و دەمرێت.

– ئاوتی، لەکاتی ڕۆیشتنیاندا زنجیرکرابوو، منی بینی وگوتی: وەرە شرمیون بابۆ دوایین جار تۆ لەباوەش بگرم، چونکە ئیتر من تۆ نابینمەوە، من ڕۆژێك پێشئەوە سەبارەت بە ئاوتی قسەم لەگەڵ کلیۆپاترادا کردبوو و داوام لێکرد داوا لەباوکی بکات لە ئاوتی خۆشبێت.

– کلیۆپاترا گوتی: کاتێك باوکم سەبارەت بەشتە تایبەتییەکانی وەك شمشاڵەکانی وشێرەکانی بڕیاردەدات، هیچ کەس ناتوانێت بڕیارەکەی هەڵبوەشێنێتەوەو بگۆڕێت، ئەوپیاوەش لەبەرئەوەی ئاگاداری دزینی بەشە گۆشتی شێرەکان بووەو ئاشکرای نەکردووە، ئەمە بووەتەهۆی توورەبوونی باوکم وئەویش دەبێت بچێت لەکانی کانزادەرهێناندا کاربکات، لەبەر ئەوەی پیرەمێردیشە ئەوابەزویی دەمرێت. ئاوتی، بەخت ڕەش کاتی ڕۆیشتنیهات منی لەباوەشدابووم و دەگریاو منیش دەگریام، تاپاسەوانەکان منیان لەباوەشی دەرهێناو ئەوانیان برد، تاسواری کەشتییان بکەن وبیانبەن بۆ سەرووی میسر [25]

24– گالد: کەشتی بچووکی جەنگییە کەبەسەوڵ دەڕۆیشت وسەوڵلێدەرەکانیان بەزنجیر لەتەختەکانی ژێریان دەبەستەوەو هەرگیز نەیاندەکردنەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی زیندووبان دەبووایە لەپشتی سەوڵەکانیانەوە بوونایەو لەوێدا گیانیان سپاردبا (وەرگێڕی فارسی)

25– بەشی خوارووی میسر، چونکە نزیکی سەرچاوەی ڕووباری نیل بووە، بەمیسری سەروویان داناوەو ئەسکەندەرییەشیان بەخوارو زانیوە (وەرگێڕی فارسی)

باغی شێرەکان لەپێشدا نزیك کۆشکی پاشایەتی بوو، کلیۆپاترا ڕۆژانە منی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆسەیرکردنی شێوەی خواردنی شێرەکان، من لەتەماشاکردنی شێوەی گۆشتخواردنی شێرەکان تێرنەدەبووم، کاتێك کارمەندەکانی باغی شێرەکان خواردنیان بۆبەردەم شێرەکان هەڵدەدا، ئەو ئاژەڵە درندانە بازیانەداو دەکەوتنەسەر خواردنەکەو لەکاتی خواردندا لەیەکتریان دەڕفاندو پچڕپچڕیان دەکرد، من وردەوردە تێگەیشتم کەشێرەکان خواردن ناجوون، بەڵکو قووتی دەدەن، هەروەها بیستوومە هیچ ئاژەڵێکی گۆشتخۆر خواردن ناجووێت، چونکە ددانی جووینی خواردنیان نییەو گەدەی ئەو ئاژەڵانە بەڕاددەیەکی واگەرمە کەگۆشتی نەجووراو دەکوڵێنێت ولەت لەت وشی دەکاتەوە.
دایکی کلیۆپاترا لەنەڕەی بەردەوامی شێرەکان هەراسان ببوو ودەیگوت: نەڕەی ئەو درندانە نایەڵێت شەوانە بخەوم ولەوەدەترسم ڕۆژێك ئەو درندانە بەربن وهێرش بکەنەسەر کۆشك وئێمە لەتوپەت بکەن.
دایکی کلیۆپاترا ئەوەندە لەشێرەکان دەترساو سکاڵای دەکرد، تاپاشا ناچاربوو شوێنی شێرەکانی لەنزیك کۆشك دووربخاتەوە بۆباغێکیتر کەکەوتبووە دەرەوەی شارو لێواری ڕووباری نیلبوو، تائەوکاتەی باغی شێرەکان لەنزیك کۆشکی پاشایەتی بوو وڕۆژانە گاڵتەوگەپمان لەگەڵ بەچکە شێرەکاندا دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی شێرەکانیان گواستەوە، ئێمە نەماندەتوانی ڕۆژانە بچین لەگەڵیاندا گەمەبکەین.
لەکۆتایی تەمەنی پاشای میسردا (بەتلیمۆسی سانزەیەم) توندوتیژیی پاشای میسر سەبارەت بەشێرەکانی زیادیکرد، کەئیتر شێرەوانی دزی نەدەنارد بۆ کانی کانزا دەرهێنان، بەڵکو هەڵیدەدانە بەردەم شێرەکان تابیخۆن ودەیگوت هەر کەسێك لەبەشی شێرەکان گۆشت بفرۆشێت، دەبێت خۆی ببێت بەخۆراکی شێرەکان.
بۆ یەکەمجار ئەم سزایەی بەسەر یەکێك لەخزمەتکارەکانی شێرەکاندا سەپاندو ئەوکەسەیان هەڵدایە بەردەم شێرێکی برسی، شێرەکە ئەو پیاوەی نەخوارد، چونکە دەیناسی، بەڵام ئەگەر یەکێك گۆشتی شێرەکانی بدزیایە هەڵیاندەدایە بەردەم شێرێك کەنەیناسێت.
دیارە لەشێرخانەی پاشادا هەرشێرێك وبەکەسێکیان دەسپاردو هەرکەسەو ئاگاداری ئەوشێرەی دەکرد کەبەو سپێردرابوو وکاری بەشێرەکانی ترەوە نەبوو، شێرە برسییەکان ئەگەرچی خزمەتچییەکانی خۆیان نەدەخوارد، بەڵام خزمەتچییەکانی شێرەکانی تریان دەخواردو کەلەپاچەیان دەکردن، پێشئەوەی بەتلیمۆسی سیانزەهەم بمرێت، دوو شێر بەخێوکەر بەهۆی دزینی گۆشتی شێرەکان، بوون بەخۆراکی شێرەکان.
لەوشەوەدا کەئەنتوان بەهاوەڵی کلیۆپاترا چوون بۆبینینی فانۆسی دەریایی وسەردانی کتێبخانەکەیان کرد، ئەنتوان لەکۆشکی پاشایەتیدایەو ژوورەکەی ئەو بەتەنیشت ژوورەکەی کلیۆپاتراوە بوو ومنیش وەك هەمیشە لەنزیك ژوورەکەی کلیۆپاترا دەخەوتم، بەڵام ئەوشەوە نەمتوانی زوو بخەوم، چونکە ئەنتوان لەگەڵ کلیۆپاترادا قسەیان دەکرد. پاش ئەوەی ئەنتوان چووە ژووری کلیۆپاتراوە، بەرەولای قەفەسێك چوو کەلەوهۆدەیەدابوو وبینیی دوو درندە لەناو ئەو قەفەسەدابوون، سەری سوڕماو دوو هەنگاو پاشەوپاش کشایەوەو گوتی: کلیۆپاترا، ئەمانە چین وبۆچی ئەمانەت هێناوەتەناو ئەم ژوورەوە؟

- کلیۆپاترا پێکەنی وگوتی: ئەم دوو جانەوەرە دوومـاری عاشـقەو ماشـقەن و مـارە دایکانەکـە هێلکەدەکات ولەسەر هێلکەکانی دەکەوێت وکڕدەبێت، پاش دوو مانگ تووڵەمار لەهێلکەکان دێنەدەرێ، بەڵام مـن ئەمانـە دەخەمـەناو کیسـەیەکەوەو دەڵێم: ئەو کیسـەیە بخەنـەناو ڕووبـاری نیلـەوە، خۆ ئەگـەر بمـەوێت تووڵـەمارەکان چاودێری بکـەم، ئـەوا کۆشـکی پاشـایەتی بـۆ چاودێریکردنی ئەمانـە بەرتـەنگ دەبێتەوە.

- ئەنتوان گوتی: من بینیومە کەبولبول دەخەنـەناو قەفەسـەوە تابخوێنێت، بـەڵام هـەرگیز نەمبیسـتووەو نەمبینیوە کەسێك مار ڕابگیردرێت وقەفەسەکەش لەژووری خۆتدا دابنێت.

- کلیۆپاترا گوتی: باوەڕبکە ئەو جووتە مارە عاشقەوباشقەیەی کـەمن خسـتوومنەتەناو ئـەو قەفەسـەوە، زۆر لـەبولبول جـوانترن، باشـە هـیچ دیمـەنێکی نیگارکێـشێکت بینیـوە وەك خـەت وخـاڵی ئـەم دوومـارە عاشقەوباشقەیە جوانبێت؟

- ئەنتوان گوتی: باوەڕدەکەم کەخەت وخاڵی ئـەو مارانـە زۆرجوانن ، بـەڵام پێویـستە لـەژەهری ئـەو دوو جانەوەرە بترسیت، لەڕۆمدا مار هەن، بەڵام بەم شێوەیە جوان نین.

-کلیۆپاترا گوتی: ئەنتوان کەم کەس هەیە بەقەد من شارەزایی لەسەر مار هەبێت، دەزانم چەندجۆر مـار هەیـە، کـەژەهری هەنـدێکیان زۆر لـەوانیتر زیـاترە، جـوانترین جـۆری مـار ئـەو دوو مارەیـە لەوقەفەسـەدا دەیانبینیت وئێمە ئەو مارەمان بەناوی ئسپیك، ناسیوە.

- ئەنتوان پرسی: مەترسی ئەم ئاژەڵانە چەندە؟

- کلیۆپاترا گـوتی: ئەگـەر ئاشـنایەکم هـەبێت وبیـەوێت خـۆی بکوژێـت، ئـەوا ئامۆژگـاری دەکـەم دەسـتی بباتەناو ئەو قەفەسەوە، بۆ ئەوەی یەکێك لەومارانە پێوەی بدات.

- ئەنتوان گوتی: ئایا پێوەدانی ئەم مارە زۆر ئازاری هەیە؟

- کلیۆپاترا گوتی: پێوەدانی مارەکە وەك پێداچوونی دڕکێك وایە، دەستبڕینێکی کەم بەچەقۆ، سـەدجار لەئازاری پێوەدانی مارەکە زیاتر ئێشی هەیە، بۆیـە کەسـێك کەئـەومارە پێـوەی بـدات، زۆر ئـازاری نابێـت وتەنها هەست بەسووتانەوەیەکی کەم دەکات وساتەوەختی دواتر بێ ئەوەی هەست بەئێش وئازاربکات، دەمرێت.

- ئەتوان پرسی: کەمێك دوای پێوەدانەکە بەبێ ئێش وئازار دەمرێت؟

- کلیۆپاترا گـوتی: بـەڵێ، چونکە کاریگـەری ئـەو ژەهـری (ئسپیك)ە دەسـتبەجێیە، تەنانـەت لەوکاتـەی پێوەدەدات یەکسەر دەمریت.

- ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا کاتێك من هاتمەناو ئەم ژوورە، دەمویـست سـەبارەت بەخۆشـەویستی لەگـەڵ تۆ قسەبکەم، بەڵام دوای بینینی ئـەم دوو ئاژەڵـە، ئەوشـتانەی لـەتۆم گـوێ لێبـوو، دەترسـم نـاوی عیـشق بهێنمە سەر زمانم، چونکە لەتێڕوانینی من بۆ تۆ وەك ئەو دوومارە خەت وخاڵی جوانت هەیـەو جوانیـت وژیریشی.. تۆ سەرنجی من ڕادەکێشیت، وەلێ لەژەهرەکەت دەترسم!

- کلیۆپاترا گوتی: چییە. تۆ وادەزانیت من ژەهرم هەیە؟

ئەنتوان گوتی: مەبەستم لەژەهری تۆ بریتییە لەو کەسایەتییە سەیرەی کەهەتە، من هەرجارەی دەمەوێت لەتۆ نزیکببمەوە، لەترسی کەسایەتی تۆ، دەکشێمەوەو یەکێك لەوشتە سەرسوڕهێنەرانەت، ڕاگرتنی مارە، بۆ لەدنیادا ئاژەڵ کەمبوون تاتۆ مار بخەیتە قەفەسەوەو ڕاییگریت؟

– کلیۆپاترا گوتی: بۆ ڕاگرتنی مار سەیرترە لەڕاگرتنی شێر؟ باوکم بەردەوام شێر ڕادەگرێت وپەروەردەیان دەکات وئەوەشی کردووەتەداب ونەریتێکی میسری و کەسیش ڕەخنەی لێناگرێت، بەڵام تۆ ڕەخنە لەمن دەگریت، بەوەی بۆ مار ڕادەگرم؟

– ئەنتوان گوتی: ئاخر شێر لەمار جیاوازە، ئێمەش لەڕۆم شێر ڕادەگرین وپەروەردەی دەکەین، ڕاگرتنی شێر دلاوەری و جوامێری دەگەیەنێت، لەکاتێکدا مار جگەلە نەفرەت ولەرز نیشاندان هیچیتر ناگەیەنێت.

– کلیۆپاترا گوتی: لەمنداڵییەوە مارم خۆشدەوێت وچێژم لەخزانی ئەو ئاژەڵانە وەردەگرت، دوای ئەوەی گەورەبووم، سەرەتا ماری ئاویی بێ ژەهرم ڕادەگرت و زۆرجار ئەومارانە پێوەیان داوم، بەڵام تەنها بەقەد تێهەڵچقانی چقڵێك ئازاریان هەبووە، دواتر بەمارگرەکانی کەلەبیابانی خۆرئاوای میسردا ماردەگرن، گوتم مارم بۆبهێنن، بەڵام هیچ کام لەومارانەی کەبۆیان هێنام بەدڵم نەبوون، تەنها ئەو دوو مارە نێرومێیە نەبێت کەسەرنجیان ڕاکێشام ولێمکڕین، ئێمە زۆر سەبارەت بەمار قسەمان کرد، باشتروایە هەندێك سەبارەت بەخۆمان قسەبکەین.

– ئەنتوان گوتی: من وتۆ جگەلە عیشق قسەی ترمان نییە، بەڵام هەرکاتێك چاوم بەو دوو مارە دەکەوێت کەبەردەوام لەقەفەسەکەیاندا دەجووڵێنەوە، قسەم بیردەچێتەوە.

– کلیۆپاترا گوتی: پشتت بکەرە قەفەسەکە بۆئەوەی نەیانبینیت.

من لەژووری کلیۆپاترا نەبووم ونەمبینی داخۆ ئەنتوان پشتیکردە قەفەسەکە- یان نا؟ بەڵام هەستمدەکرد پشتی تێکردوون، دوای ماوەیەکی کورت، ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا، تۆ دەزانیت عاشقی تۆم وچاوەڕوانی ئەوەم بەوەسڵی خۆتم بگەیەنیت، باشترین کاتیش بۆئەوەی پێت بگەم، ئێستایە کەمن وتۆ لەم ژوورەدا تەنهاین، وەرە بابۆ سەعاتێك جگەلەخۆمان هەموو شتێك لەبیربکەین.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەنتوان، ئەگەر تۆم خۆشنەویستایە میواندارییم نەدەکردیت و ڕێگام نەدەدا بێیت بۆ ئەم ژوورە، بوونی تۆ لێرە ئەوەدەگەیەنێت کەتۆم خۆشدەوێت، بەڵام من سێزدە پشتم پاشان، نامەوێت وەك یەکێك لەژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریە، خۆم بەدەستەوە بدەم.

– ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا، تێکەڵاوبوونی نێوان نێرومێ لەعەشقی یەکتری، لەڕێگایەك زیاتری نییەو تەواوی شاکانی میسر لەوڕێگایەوە عاشقی یەکبوون.

– کلیۆپاترا گوتی: تۆ لەمەبەستی من تێگەیشتیت، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەوکەسەی کەبیەوێت بەوەسڵی من بگات، دەبێت برام بێت، واتا ئەو بمهێنێت وببێت بەمێردم.

– ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا، ئەی تۆ بڵێی باوکت ڕازی بێت من بکاتە برات؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر تۆ بتوانیت بۆ باوکمی بسەلمێنیت کەپیاوێکی بەتواناو دڵسۆزیت، ئەو ڕازی دەبێت.

– ئەنتوان گوتی: ئەوەی تۆ دەیڵێیت پێویستی بەبەسەرچوونی کاتەو دەبێ ڕۆژگارێك بڕوات تامن بتوانم ئەوەندە ناو وناوبانگ دەربکەم وخۆشەویستبم، ئینجا ڕەزامەندی باوکت بەدەستبهێنم، تاببینە خوشك وبرا.

– کلیۆپاترا گوتی: کاتێك ئەسکەندەر ئەم شارەی دروستکرد، لەماوەی دوورکەوتنەوەی لەمەکدۆنیای نیشتمانی خۆی ناو وناوبانگی دەرکرد، تۆ دەتوانیت لەماوەی دوو ساڵ– یان سێ ساڵ– یان زیاتریشدا خۆت بکەیت بەخاوەنی ناو وناوبانگ. ئەنتوان گوتی: دڵنیانیم لەوەی کەبتوانم لەماوەی دوو ساڵ– یان سێ ساڵدا ببمە خاوەنی ناو وناوبانگ، خۆئەگەر بشزانم کەلەماوەی دوو، سێ ساڵدا دەبمەخاوەنی ناو وناوبانگی جیهانیش، ئەوەندە سەبرم نییە بتوانم دوو، سێ ساڵ لەگەیشتن بەوەسڵی تۆ چاوەڕوانبم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا پێتوایە دوای سێ ساڵ، تۆ پیردەبیت– یان من پیردەبم؟ من وتۆ هەردووکمان گەنجین ودەتوانین دوو سێ ساڵیتر سەبربگرین، دوای ئەوەی ئەوکات بەیەکتر گەیشتین، چێژی زیاتر دەبینین، چونکە تامرۆڤ ئەرك نەکێشێت لەوپاداشتەی کەدەستی دەکەوێت، چێژ نابینێت.

– ئەنتوان گوتی: من لەشتێکی تریش دەترسم، ئەویش ئەوەیە باوکت لەماوەی دوو تا سێ ساڵیتردا تۆ بەشووبدات.

– کلیۆپاترا گوتی: من مێرد ناکەم.

– ئەنتوان گوتی :ئەگەر باوکت بیەوێت بەشووبدات، تۆ ناتوانیت مێرد نەکەیت.

– کلیۆپاترا گوتی: بۆچی؟

– ئەنتوان گوتی: لەبەرئەوەی کچی پاشایت.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا کچی پاشا ناچارە کەشووبکات؟

– ئەنتوان گوتی: کچی خەڵکی ئاسایی دەتوانێت شوو بەوپیاوە نەکات کەحەزی لێنییە، بەڵام کچی پاشا دەبێ بەپێی نەریت وتێڕوانینی باوکی شووبکات، هەتا ئەگەر زاواش جێگای نەفرەتی ئەوبێت، چونکە کچی پاشا بەپێی ئەوشتەی کەبەناوی بەرژەوەندی پاشاو میللەتە کچ بەشوودەدەن، نەك بەخواستی خۆی، ئەگەر وانییە بۆچی کچەکانی پاشاکانی میسر یەك لەدوای یەك شوویان یەکوڕە پاشاکانی سوریاو ئێران کردووە، لەکاتێکدا ئەوانەشیان خۆشنەویستووە، بەڵام بەرژەوەندی سیاسی واپێویستدەکات، کچی پاشای میسر ببێتە ژنی شازادەی سریانی– یان ئێرانی؟

– کلیۆپاترا گوتی: دڵنیام باوکم من نادات بەهیچ یەکێك لەشازادەکانی دەرەوە.

ئەنتوان پرسیی: ئەم دڵنیاییەت لەکوێوە دەستکەوتووە؟

– کلیۆپاترا پێی ڕاگەیاندکە: باوکم پێیوایە من کچێکی جوان وژیرم، لەو بڕوایەدایە کچێکی ئاوا بەتوانا نابێت شووبە شازادەیەکی بیانی بکات ولەبنەماڵەکەمان بچێتە دەرەوە، بۆیە دەبێت ئەوبدرێت بەبراکەی تالەبنەماڵەکەماندا بمێنێتەوەو جوانی وژیریی ئەو، بۆ ڕۆڵەکانی پاشایەتی بگەڕێتەوە.

ئەنتوان گوتی: بەڵام براکەی تۆ بچووکەو ناتوانێت ببێت بەهاوسەرت.

– کلیۆپاترا گوتی: باوکم سەبردەگرێت تابراکەم گەورەدەبێت ولەوکاتە ئێمە بەیەکتری دەدات.

– ئەنتوان پرسیی: ئایا تۆ براکەت خۆشدەوێت– یان نا؟

– کلیۆپاترا گوتی: براکەم تاکو ئێستاش کوڕێکی مێردمنداڵەو من ناتوانم ئەوم وەك پیاو خۆشبوێت، پێشبینیی ئەوەش دەکەم هەرگیز نەتوانم ئەوم خۆشبوێت[22].

22– لێرەدا مەبەست لەخۆشەویستی خوشك وبرایەتی نییە،(و–کوردی)

لەوکاتەدا دەنگی کۆمەڵێك خەڵك لەدەرەوە بیسترا کەبەرەو کۆشکی پاشا دەهاتن، ئەنتوان گوێی گرت وگوتی:ئەو دەنگە چییە؟ ئایا خەڵك خۆپێشاندان دەکەن؟

– کلیۆپاترا گوێی هەڵخست وگوتی: هیچ هۆکارێك نییە تادانیشتوانی شار خۆپێشاندان بکەن، لەبەرئەوەی ئەسکەندەرییە ئاوەدانترین شاری دنیایەو تەواوی دانیشتوانی ئەم شارە لەڕووی بژێوییەوە بێ خەمن، ئایا تۆ لەوڕۆژەوەی کەهاتوویتە ئەسکەندەریە سواڵکەرت دیوە– یان نا؟

ئەنتوان وەڵامی دایەوە: من تێبینیی ئەوەم نەکردووە، بەڵام ئەوەم هاتەوە خەیاڵ، لەو ڕۆژەوەی هاتووم بۆ ئەم شارە سواڵکەرم نەدیوە.

کلیۆپاترا گوتی: ئایا باوەڕدەکەیت لەشارەکانی ڕۆمدا سواڵکەر هەن؟

– ئەنتوان گوتی: بەڵێ، لەشارەکانی ڕۆمدا سواڵکەری زۆر هەیە.

– کلیۆپاترا گوتی: لەئەسکەندەرییەدا هەموو خەڵك بەشی بژێوی خۆی هەیەو داهاتی هەیەو هیچ کەس گەداو چاولەدەست نییە، لەشارێکی ئاوابەختیاردا خۆپێشاندان وگێرە شێوێنی بوونی نییە.

ئەنتوان گوتی: یەکێك لەوشتانەی کەدەبێتەهۆی بێ سەروبەرەیی وئاژاوەگێڕی، بەختیاربوونی میللەتێکە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت ماوەیەکی دوورو درێژ بەرگەی خۆشی بگرێت، بەدەستی خۆی هەندێك کار دەکات کەکۆشکی بەختیاری وێران بکا، میللەتی خێرخواش ناتوانن ماوەیەکی دوورو درێژ بەرگەی بەختیاری بگرن، بۆیە بەهانەی بێبنەما دادەتاشن وبەبەدەستەوە گرتنی ئەوبەهانانە دەستدەکەن بەگێرەشێوێنی وئاژاوە نانەوە.

پاسەوانانی کۆشکی پاشایەتی ئامادەی بەرگریکردن بوون ، من لەبەر ڕۆشنایی مەشخەڵەکاندا دەمبینی کەشمشێرو ڕمەکانیان بەدەستەوە گرتبوو، بەڵام ئەو خەڵکەی دەرەوە کاتێك گەیشتنە بەردەم کۆشکی پاشایەتی، بێدەنگبوون. منیش پەنجەرەکەی خۆم کردەوەو گوێم ڕاگرت بۆئەوەی بزانم ئەو خەڵکە چییان دەوێت، کەسێك لەوانە کەدیاربوو نوێنەری ئەو خەڵکەبوو هاواریکرد: ئێمە دەمانەوێت پاشا ببینین وداوای دادپەروەریی لێبکەین.

دەنگێك لەکۆشکی پاشایەتییەوە بەرزبووەوە کەمن دەمناسی ودەمزانی دەنگی فەرماندەی پاسەوانانی کۆشکی پاشایەتییە، گوتی: بۆچی دەتانەوێت پاشا ببینن و چ ستەمێك لەئێوە کراوە، تامن بەپاشای بڵێم؟

– فەرماندەی پاسەوانەکانی کۆشکی پاشایەتی گوتی: ئێوە داواکاری خۆتان بەمن بڵێن، منیش دەیگەیەنمە پاشاو وەڵامەکەیتان بۆ دەهێنمەوە.

ئەوپیاوەی نوێنەری خەڵکەکەبوو گوتی: ئێمە هەموومان کرێکاری بەندەرین، شەوانە دوای ئەوەی کارەکانمان تەواودەبێت، دەچین بۆ شوێنی ڕابواردنی گشتی، ئەمشەویش دوای تەواوبوونی کارەکانمان، کاتێك چووین بۆشوێنی ڕابواردنەکە، لەپڕدا خۆمان لەبەردەم ستەمێکی گەورەدا بینییەوە!

– فەرماندەی پاسەوانەکانی گوتی: ئەو زولمە بێئابڕووییە چییە؟

پیاوەکە گوتی: وەك خۆت دەزانی خاوەنی خانوەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی سەندیکایان هەیە، لەو یەکێتییەدا پلانی ئەوەیان داناوە لەبەرامبەر ئێمەدا ستەمکاربن وئەو پلانەش لەم شەوەوە لەشوێنی ڕابواردنەکەدا کاری پێدەکرێت.

– فەرماندەی پاسەوانەکان گوتی: ئەو پلانە چییە؟

– نوێنەری خەڵکەکە گوتی: پلانی ناوبراو ئەوەیە ئەم شەو لەهەمووماڵەکانی شوێنی ڕابواردندا بۆ ڕۆمی وسریانییەکان یەك لەسەرچوای نرخی دیاریکراوی ڕابواردنیان کەمکردووەتەوە، لەکاتێکدا ئێمە دەبێت نرخی تەواوبدەین.

من دەمەوێت بەپاشا بڵێم: لەم شارەدا ستەم لەلایەنگرانی ئەوەدەکەن وجیاوازیمان پێدەکەن، بۆ بەرژەوەندی بێگانە ئەوە بەڕەوا دەزانن ؟

من دەمەوێت بەپاشا بڵێم:

23– من: شرمیون,

بۆچی ڕۆمییەك– یان سریانییەك، کاتێك دەچێت بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی، لەماڵەکانی ئەوێدا یەك لەسەرچواری نرخی دیاریکراو کەمتربدات، بەڵام ئێمە کەمیسرین دەبێت نرخی تەواوبدەین؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئێوە بەوشەوە تەنها بۆ ئەوەهاتوون، ئەمە بەپاشای میسر بڵێن، باشە نەتان دەتوانی بەیانی بێن وپاشای میسرتان لێئاگادار بکردایەتەوە؟

– نوێنەری خەڵکەکە گوتی: یەکەم کاتی ڕابواردنی ئێمە ئێستایەو تائەم کاتە ئاگامان لەوجیاوازییکردنە نەبووە، ڕۆژانە ئێمە لەبەندەردا خەریکی کارکردنین وناتوانین کاری خۆمان جێبهێڵین وبێین بۆ ئێرە.

– فەرماندەی پاسەوانەکانی کۆشکی پاشایەتی گوتی: سەبربکەن بابڕۆم بزانم پاشای ئێمە خەوتووە– یان بەخەبەرە، ئەگەر خەوتبوو، ناتوانم ئەم مەسەلەیە بەوڕابگەیەنم، چونکە نابێت پاشا لەخەو هەڵبستێندرێت بۆئاگادارکردنەوەی ئەمە، بەڵام کەبەخەبەربێت، مەسەلەکەی پێدەڵێم و وەڵامەکەشتان بۆ دەهێنمەوە.

خەڵکەکە لەچاوەڕوانیدا ڕاوەستان وکەس هاواری نەدەکرد، تەنها غەڵبەغەڵبی ئەوخەڵکە بەرگوێ دەکەوت.

لەژوورەکەی تردا، ئەنتوان بەکلیۆپاترای گوت: ئایا تێگەیشتیت کاتێك من دەڵێم میللەتێك ناتوانێت بۆماوەیەکی دوورو درێژ بەرگەی بەختیاری بگرێت، ڕاستمکرد– یان نا؟ ئێرە شارێکە ئاوەدان وخەڵك لەفکرو سەرقاڵیی بژێویدا نین، سواڵکەر لەوشارەدا نییە، خەڵك ناتوانێت بەردەوام لەخۆشگوزەرانی

وئیسراحەتدابێت. ئەم بەهانەیان دۆزیوەتەوە کەبۆچی لەماڵەکانی شوێنی ڕابواردندا، ڕۆمی وسریانییەکان کەمتریان لێوەردەگیرێت وئەوانیش زیاتر.
لێپرسراوی پاسەوانەکانی کۆشکی پاشایەتی، چووەلای پاشاو هاتەوەو بەخەڵکەکەی گوت: پاشا هێشتا نەخەوتبوو، کاتێك چوومە ژوورەکەی سەرگەرمی شمشاڵ لێدان بوو ومنیش مۆڵەتم لێوەرگرت کەسکاڵای ئێوەی پێڕابگەیەنم، ئەویش گوتی:هەر لەبەر ئەمە منت لەشمشاڵ لێدان وەستاند؟
پێم گوت: من هیچ چارەیەکم نییە، جگەلەوەی سکاڵای خەڵك بەتۆ بگەیەنم.
پاشا گوتی: بەکرێکارەکانی بەندەر بڵێ، ئەگەر دەتوانن ئەم شەو چاوپۆشی لەڕابواردن بکەن، تامن سبەینێ فەرماندەدەم سەبارەت بەم مەسەلەیە لێکۆڵینەوە بکرێت وتێبگەین بۆچی سەندیکای بەڕێوەبەرانی ماڵەکانی ئەوگەڕەکە ئەم کارەیان کردووەو هۆکەی چیبووە؟
کاتێك خەڵکەکە گوێیان لەم وەڵامەبوو، هاواریانکرد کەناتوانن سەبربکەن وچاوپۆشی لەداواکارییەکەیان بکەن، وتیشیان: ئەگەر پاشا بتوانێت شەوێك شمشاڵ لێنەدات، ئەوا ئێمەش دەتوانین دەست لەڕابواردن هەڵبگرین.
– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: کەواتە لێم بگەڕێن بابچم ئەمەش بەپاشا بڵێم.
جارێکی تریش خەڵکەکە بێدەنگ بوونەوە، تاوەڵامی بەتلیمۆسی سێزدەهەمیان دەستبکەوێت. پاش کەمێك لێپرسراوی پاسەوانەکان هاتەوەو گوتی: پاشا دەڵێت: کاتێك کاری بەپەلەو پێویست دێتەپێشەوە، دەست لەشمشاڵ لێدان هەڵدەگرم و کارەکان ئەنجام دەدەم، ئێوەش ئەگەر دەتوانن ئەمشەو دەست لەڕابواردن هەڵبگرن، ئەگەر ناشتوانن بڕۆن نرخی تەواوبدەن،
خۆئێوە بەدرێژایساڵ ئەوپارەیەتانداوە، ئەمشەویش بەدانی ئەوپارەیە ئەوەندە زیانتان پێناگات.
– ئەوپیاوەی نوێنەری خەڵکەکەبوو هاواریکردو گوتی: ئایا پاشای میسر بیانییەکانی لەئێمە لەپێشتر دەزانێت وڕازی دەبێت لەوڵاتدا کەسانێکی سوودخۆر کەبوونیان قازانجێکی ئەوتۆیان بۆ وڵات نییە، لەپێناو پڕکردنی باخەڵی خۆیان ئیمتیاز بەبێگانان دەدەن وئێمەش کەمیسرین و بەلاینەنگران و خەڵکی ئەو حسابدەکرێین، مافمان پێشێلبکرێت؟
لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: من ئەم شەو دوجار بوومەهۆی هەراسانکردنی پاشاو ناوێرم جارێکیتر ئەو ئەزیەت بدەمەوەو پەیامی ئێوەی پێبگەیەنم، بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەم بڕۆن وبەپێی ڕێنمایی وبڕیاری پاشای میسر هەڵسوکەوت بکەن.
– ئەو پیاوەی کەنوێنەری خەڵکەکەبوو گوتی: ئەگەر تۆ ناتوانیت داواکاریی ئێمە بگەیەنیتە پاشا، لێگەڕێ بابۆخۆمان بێینەناو کۆشکی پاشاو داواکارییەکانمان بەپاشا ڕابگەیەنین.
– لێپرسراوی پاسەوانەکانی کۆشك گوتی: من ناتوانم ڕێگاتان پێبدەم تابێنەناو کۆشکەوە، چونکە پاشا مۆڵەتی ئەوەی بەمن نەداوە.
نوێنەری خەڵکەکە گوتی: کەواتە مادام وایلێهات، ئەوائێمە دەچین بۆئەو شوێنەو بەوشێوەیەی خۆمان دەمانەوێت دادپەروەری دەسەپێنین.
ئەوخەڵکەی کەبەژاوەژاو بۆکۆشکی پاشایەتی ئەسکەندەرییە هاتبوون، بەهەمان شێوە بەدەنگەدەنگ وژاوەژاوەوە گەڕانەوەو وردەوردە لەدوورکەوتنەوەیاندا دەنگەکانیان کەمبووەو نەما.

– ئەنتوان بەکلیۆپاتری گوت: باوکت هەڵەیکرد، نەدەبا بەوشێوەیە وەڵامی ئەوپیاوانەی بدایەوەو لێیان گەڕابا ئەوانە لەم کاتەدا بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی بگەڕێنەوە، دەیتوانی تەنها یەك کەس بۆ ئەوشوێنە بنێرێت تالێی بکۆڵیبایەوەوبیزانیبا بۆچی بەڕێوەبەرانی ماڵە گشتییەکان[24] ئەم کارەیان کردووە.

24- مەبەست لەماڵە گشتییەکان: واتا ئەوماڵانەی کەتاترۆی تێدان وهەموو کەس بۆی هەیە بچێت بۆ ڕابواردن.(و- کوردی)

-کلیۆپاترا پشتگیری قسەکەی ئەنتوانی کردو گوتی: باوکم لەوبارەیەوە ووردبین نەبوو، چونکە لەوشوێنەدا داهاتی باش دەدرێت بەخەزێنەی باوکم، بۆیە نایەوێت بەڕێوەبەرانی ماڵەکانی ئەوشوێنە برەنجێنێت

– ئەنتوان گوتی: ئایا کەمکردنەوەی نرخ سەبارەت بەڕۆمی و یۆنانییەکان بەئاگاداری باوکت کراوە؟

– کلیۆپاترا گوتی: نەخێر، باوکم ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نییە، چونکە ئەگەر ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بووایە، بەوشێوەیە وەڵامی خەڵکەکەی نەدەدایەوە.

زۆری پێنەچوو لەخۆرئاوای شار شوێنی ڕابواردنەکە، هاتووهاوارێکی ترسناك پەیدابوو، هەرچەندە نێوانی کۆشکی پاشایەتی وشوێنی ڕابواردنەکە دووربوو، بەڵام بەشێوەیەك ئەو هاتووهاوارە دەبیسترا، وەك ئەوەوابوو لەپشتی دیواری کۆشکی پاشایەتییەوە هاواربکەن.

دەنگی نەڕەی پیاوان و زریکەو شیوەنی ژنان لەوشەوەدا بەشێوەیەك ترسناکبوو کەمن نەمتوانی لەژوورەکەمدا بمێنمەوەو چوومە سەربانی کۆشك تابزانم چیبووە.

لەدوورەوە ڕووناکی چراکانی شوێنی ڕابواردنەکە کەئاسمانیان ڕووناك کردبووەوە، چونکە شەوانە زۆر چرایان هەڵەکردو شەوان دەبووە چراخان. لەوژاوەژاو وهاتوهاوارەی کەلەدوورەوە دەبیسترا، بۆم دەرکەوت لەوێ شەڕە، پاش نیو سەعات هەندێك پیاوی بریندار کەخوێن لەسەروچاویان دەچۆڕا، خۆیان گەیاندە کۆشکی پاشایەتی وگوتیان: هەندێك پیاو کەکرێکاری بەندەرن، هێرشیان کردووەتەسەر ماڵەکانی شوێنی ڕابواردن وهەر کەسێك ببینن- یان دەیکوژن- یان برینداری دەکەن. خاوەنی ماڵە گشتییەکانیش ناچاربوون داوای یارمەتی لەکۆمەڵێك ملهوربکەن کەهەمیشە لەوشوێنەدا کەوتوونەوەو بەموشەخۆری بەرماوەی بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنەکە دەژین. ئێستا لەوشوێنەدا شەڕ لەنێوان کرێکارانی بەندەرو ملئەستوورە گەلحۆکانی ئەوێدا بەردەوامە، بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەی کرێکارانی بەندەر زۆرن، ئەگەر دەستبەجێ یارمەتی نەگاتە خاوەنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی، ئەوامەترسی ئەوەهەیە تابەیانی هەموو ئەو پیاو وژنانەی کەلەوشوێنەدان بریندار- یان بکوژرێن.

پاشای میسر فەرمانیدا، لێپرسراوی کۆشکی پاشایەتی دووسەد سەرباز لەگەڵ خۆیدا ببات وبچێت ئاگری فیتنەیی لەوێ بکوژێنێتەوەو سەرانی ئاژاوەگێڕیش دەستگیربکات، تائەو کاتەی بڕیاری سزادانیان دەدرێت.

لێپرسراوی پاسەوانەکانی کۆشك کەپرچەك بوون بەشمشێرو نێزەو رم، کەوتنەڕێ، من پێموابوو دوای ئەوەی لێپرسراوی کۆشك لەگەڵ دووسەد سەربازدا ڕۆشتن، ئیتر ئەو گێرەشێوێنی وشەڕە کۆتایی

پێدێت، بەڵام هاوارو شیوەنی ئەوشوێنە زیاتر بوو وزیاتر گوێم لەدەنگی زیرەی ژنان دەبوو، پاش بەسەرچوونی سەعاتێك، هەندێك لەوسەربازانە گەڕانەوەو بەپاشایان ڕاگەیاند کە: فەرماندەکەیان لەوێ کوژراوەو سەریان لەلەشی جیاکردووەتەوەو بەبەرزی قەدی پایەیەکدا هەڵیانواسیوە، من لەبەرئەوەی لەناو کۆشکی پاشەیەتیدابووم لەوشەوەدا ئاگاداری هەموو هەواڵ وپلانەکان بووم وتێگەیشتم پاشای میسر بەکوژرانی فەرماندەی پاسەوانەکانی کۆشك زۆر دڵگرانبووەو داوای ڕوونکردنەوەی زیاتری لەوسەربازانەی کەلەوێ گەڕابوونەوە دەکرد،

ئەوان دەیانگوت: هەموو هاوەڵەکانی ئێمەن کوژراو– یان بەشێوەیەکی سەخت بریندارن وناتوانن جووڵەبکەن، هەروەها ئەو کەسانەی کەهێرشیان کردووتەسەر شوێنی ڕابواردنەکە، بەدڕندانەترین شێوە ژنەکان دەکوژن وسەریان لەلاشەیان جیادەکەنەوەو ورگیان دەدڕن– یان کۆئەندامی زاو وزێیان دەبڕن، لەکاتێکدا ئەو ژنانە گوناهیان نییەو پلانەکە خەڵکیتر دایانڕشتووە.

لەوکاتەی ئەوچەند سەربازە لەخزمەتی پاشای ئێمەدا وەستابوون وخەریکی گێڕانەوەی ڕووداوەکەبوون، سەرۆکی پۆلیسی شار هات وبەپاشای گوت: بۆ بەرقەراربوونی ئاسایش لەشوێنی ڕابواردنی گشتی، ئەو هیچی پێناکرێت، چونکە ئەو لەسێسەد پۆلیس زیاتری نییە، ژمارەی کرێکارانی بەندەریش کەلەوێدا خەریکی ڕاو وڕووت وکوشتن وبڕینن، چەند هەزار کەسێکدەبن.

– بەتلیمۆسی شمشاڵژەن گوتی: بیستوومە دەڵێن: زیاتر ژنان دەکوژن؟

– سەرۆکی پۆلیس گوتی: ئەو قسەیە ڕاستەو ئەوانەی کەزیاتربوون بەقوربانی ژنن، بەڵام خۆئەوانە گوناهیان نییە، چونکە ئەو ژنانە کەسانێکن وەك کرێگرتە لەوماڵانەدان وناتوانن سەبارەت بەکاروباری وابەستە بەکارەکەیان نەخشەو پلان دابنێن. ئەوپلانەی سەبارەت بەنرخی تازە دانراوە بۆبیانییەکان، لەلایەن بەڕێوەبەرانی خانووەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی کێشراوە، بەڵام ئێستا ئەوانە هەموویان خۆیان پەناداوەو لەبری ئەوان ژنی لەشفرۆشی بەکرێگیراو دەکوژرێن.

– پاشای میسر گوتی: بۆ ڕێگرتن لەکوشتن و تاڵانی، پێویستە ڕێگاچارەیەك بدۆزینەوە.

– سەرۆکی پۆلیس گوتی: هەندێك لەپۆلیسەکانی ئێمە کوژراون وئێمە ناتوانین بەوژمارەیەی کەماون ڕێگا لەپیاوکوژو ڕاو وڕووتکەرەکان بگرین، ژمارەی پارێزەرانی کۆشکی پاشایەتییش زۆرنین تابتوانین ژمارەیەکیتر بۆشوێنی شەڕەکە بنێرین، ئەگەر ئەمانەش بنێرین، ئێرە چۆڵدەبێت، بۆیە پێویستە ئاگامان لەئەگەری هەڵگەڕانەوەو هێرشکردنیان بۆسەر کۆشکی پاشایەتییش هەبێت، لەوانەیە لەپڕ بەرەو کۆشکی پاشایەتیی بێن.

– پشای میسر ئەم قسەیەی بەدروستزانی وگوتی: کەوابێت ناچارین داوای یارمەتی سەربازیی لە (قەڵای دەمەنهور)[25] بکەین، هەتاهەندێك لەسەربازەکانیان بۆئێرە بنێرن.

25– قەڵای دەمەنهور: ناوی سەربازگەیەك بووە لەشێوەی قەڵادا، ئێستاش هەر بەناوی ئەو ناوچەیەوە ناونراوە(و–کوردی)

قەلاتی دەمەنهور یەك سەربازگەی گەورەبوو لەنزیك ئەسكەندەرییە، من چەندجارێك لەگەڵ كلیۆپاترادا بەنزیكیدا تێپەڕیوم، خودی قەلاّی دەمەنهور ئەوەندە بەرفراوان نەبوو تابتوانرێت ژمارەیەكی زۆر سەرباز لەوێدا بحەوێنەوە، بەلاّم لەنزیك قەلاّكەدا سەربازگەیەكی گەورە دروستكرابوو ولەدروستكردنی ئەو سەربازگەیەدا كەڵك لەهونەری سەربازی ڕۆمی وەرگیرابوو، بەشێوەیەك ئەوسەربازگەیە هەم سەربازگەو هەم لەمپەرێكی بەهێزیش بوو، ئەگەر هێرشبكرایەسەر ئەوشوێنە، ئەوا سەربازەكانی ناوی ماوەیەكی زۆر دەیانتوانی لەبەرامبەر سوپایەكی بەهێزمدا خۆڕابگرن. خودی قەلاتی دەمەنهور بەیەكێكە لەقەلاّ دێرینەكانی میسر لەقەڵەمدەدراو دەیانگوت گوایا، یەكێك لەفیرعەونەكانی میسر ئەوەی دروستكردووە كەشێوازی دروستكردنی قەلاّكەش ئەوەی نیشاندەدا، نێوانی ئەسكەندەرییەو دەمەنهور زۆر دووربوو، تاتەتەرێكی سوار دەگەیشتە ئەوێ وپەیامی پاشای دەگەیاندە، فەرماندەی ئەو سەربازگەی دەمەنهورو سەربازەكان لەوێ دەكەوتنەڕێ ودەگەیشتنە ئەسكەندەرییە، درێژەی دەكێشا. سەربازەكان نەیاندەتوانی زووتر لەئێوارەی ڕۆژی دوایی بگەنە ئەسكەندەرییە، تائەوكاتە لەشوێنی ڕابواردنەكەدا هیچ شتێك نەدەما، بەلاّم بەهەر شێوەیەك بوو دەبووایە هەندێك لەسەربازانی دەمەنهور بهێنن.
پاشامان فەرمانێكی دەركردو تەتەرسواری گورج وخێرایان ڕەوانەكرد بۆئەوەی پەیامی پاشا بگەیەننە سەربازگەی دەمەنهور. ئەوشەوە بەتلیمۆسی سێزدەهەم هەستی بەپێویستیی بوونی سەربازگەیەكی بچووك كرد، لەئەسكەندەرییەدا، چونكە بەدرێژایی حوكمڕانیكردنی ئەوپاشایە ڕووداوێكی لەمشێوەیە نەهاتبووەپێش هەتا پاشابوونی لەشكرێك بەپێویست بزانێت لەئەسكەندەرییەدا.
لەشوێنی شەڕەكەوە هەرساتەو هەواڵێكی ترسناك دەگەیشتە كۆشكی پاشایەتی، بەشێوەیەك پاشا هێندە تینی بۆهات خەریكبوو هەندێك لەسەوڵێدەرانی (گالد)ەكان كەلەبەندەری ئەسكەندەرییەدابوون بۆشوێنی شەڕەكە بنێرێت تارێكا لەو گێرەشێوێنی وبێ سەرووبەرەییە بگرن، بەلاّم بەپاشایان گوت: سەوڵێدەرانی گالدەكان بۆخۆیان لەمەترسیدارترین كەسانی ڕاووڕووتكەرو پیاوكوژن، خۆ ئەگەر ئەوانە زنجیرەكانیان لەدەست بكرێتەوەو بیانێریت بۆشوێنی شەڕەكە، ئیتر كەس ناتوانێت ئەوانە بۆ گالدەكان بگەڕێنێتەوە.
كرێكارانی بەندەر كەلەگەڕەكی ڕابواردندا خەریكی كوشتن وتالاّن وبڕۆن، هەرچیبن ئەوابەدانیشتوانی ئەسكەندەرییە لەقەڵەم دەدرێن وئەوانە لەهەموو كۆلاّنەكانی شارداماڵیان هەیەو نایانەوێت شەڕو پێكدادانەكە لەسنووری شوێنی ڕابواردنەكە تێپەڕێنێت وبگاتە شوێنیتر، بەلاّم سوڵێدەرانی گالدەكان لەئەسكەندەرییەدا ماڵیان نییەو لەنەتەوەو نەژادی هەمەجۆرن، ئەگەر ئەمانە لەزنجیرەكانیان بكەیتەوەو بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی بنێرین، بۆئەوەی بەربەكوشتن وتالاّنكاری بگرن، بەپێچەوانەوە هێرش دەكەنەسەر دووكان وگەڕەكەكانی شارو لەوانەیە ئەسكەندەرییە وێرانبێت ودانیشتوانیشی ڕەشەبكوژ بكرێن.
من دوای هاتنەخوارەوەم لەسەر سەربانی كۆشكی پاشایەتی، لەبەرئەوەی نەمدەتوانی بخەوم، لەژوورەكەی خۆمدا بەخەبەربووم وگوێم لەدەنگەكانی دەرەوە دەگرت وهەندێكجاریش لەژوورەكەم دەچوومەدەرەوە، بۆئەوەی زانیاری وهەواڵی تازە وەربگرم، تاجارێك خاتوونەكەم، كلیۆپاترا بانگی كردم

وگوتی: شرمیون ئامادەی چوونە دەرەوەبە، چونکە فەرمانمداوە کەژاوەمان بۆ ئامادەبکەن، ئێمە لەکۆشکی پاشایەتی دەچینەدەرێ.

لێم پرسیی: خاتوونەکەم دەتەوێت بۆکوێ بچیت؟

کلیۆپاترا گوتی: بەتەمام بۆشوێنی شەڕەکە بچم.

پێمگوت: چۆۆن.. چۆۆن، ئایا تۆدەتەوێت بەوشەوە بچیت بۆشوێنی ڕابواردنە گشتییەکە، بۆ نازانیت کەکرێکارانی بەندەر ئەمشەو لەوێدا خەریکی ڕەشەبکوژیین؟

کلیۆپاترا گوتی: ئەی چۆن ئاگام لێی هەیەو لەبەرئەوەش دەچم بۆئەوێ.

بەتلیمۆسی سێزدەهەم، کەڕۆڵەکانی ئازادکردبوون وهەرچییان بویستایەو بخواستایە دەیانکرد، کاتێک گوێی لێبوو خاتوونی من دەیەوێت بەم شەوە بچێت بۆئەوێ، لەکاتێکدا خوێن بەری چاوی کرێکارانی بەندەری گرتووەو ڕەشەبکوژیی ژنان دەکەن، ترساو گوتی: کلیۆپاترا، ئەگەر ئەمشەو تۆ بچیت بۆئەوێ، لەشوێنی شەڕەکە دەکوژرێیت.

– کلیۆپاترا بەباوکی گوت: ئەگەر من ئەمشەو نەچم بۆئەوێ، ئەوا گەورەترین داهاتی تۆ لەبەین دەچێت وڵەشوێنی ڕابواردنی ئەسکەندەرییەدا جگەلە وێرانەیی، هیچیتر نامێنێتەوە.

– پاشای میسر گوتی: ڕۆیشتنی تۆ بۆجێگای ڕابواردنەکە کەڵکی نابێت ولەوێدا بەدەستی کرێکارانی بەندەر دەکوژرێیت.

– کلیۆپاترا گوتی: من ناکوژرێم و ئەوپێکدادان وکوشتن وبڕینە ناهێڵم، کرێکارانی بەندەر ناچاردەکەم لەوناوچەیە بچنەدەرەوە.

– پاشای میسر گوتی: هەرنەبێت هەندێک سەربازی پڕچەك لەگەڵخۆتداببە تالەوێدا پارێزگاریت لێبکەن.

– کلیۆپاترا گوتی: من هەندێک لەمەشخەڵدارو سەرباز لەگەڵخۆم دەبەم وچوار جارچی و زوڕناژەنیشم[26] بدەیە، تاگەیشتنی ئێمە بەگوێی خەڵکانی ناوچەی ڕابواردنەکە ڕابگەیەنێت وجارپدەن کەمن لەوێدام، چونکە لەناو ئەوجەنجاڵیی و ڕەشەبکوژییەدا کەس ئاگای لەهاتنی من نابێت.

– کاتێک ئەنتوان گوێی لێبوو کەکلیۆپاترا دەیەوێت بەم شەوە بچێت بۆشوێنی شەڕەکە، گوتی: من لەگەڵ تۆدا دێم بۆئەوەی پارێزگاریت لێبکەم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر خەڵك تۆ لەگەڵ مندا ببینن، ئەوا دەتکوژن ، چونکە تۆ ڕۆمییت، هەروەها منیش دەکوژن، ئەم فیتنەیە بەهۆی ئەوەوە سەریهەڵداوە، چونکە بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنەکە نرخیان بۆبیانیان کەمکردووەتەوە.

– ئەنتوان تێگەیشت کلیۆپاترا ڕاستدەکات، وازی لەوڕۆیشتنە هێنا، دوای ئەوەی کلیۆپاتراو من سواری کەژاوەکەبووین و ڕۆیشتین، لەدەوروبەری ئێمەدا هەندێک مەشخەڵبەدەست وچەکدار لەڕۆشیتندابوون ولەپێش کەژاوەکەشەوە چوار جارچی دەمێك دەڕۆیشتن ودەمێکیش ڕادەوەستان وزوڕنایان لێدەدا، کاتێکیش دەنگی زوڕناکە تەواودەبوو، هاواریان دەکرد: کلیۆپاترا هات!

– هەرچەند لەشوێنی شەڕەکە نزیکدەبووینەوە، ژاوەژاو زیاتردەبوو، پێش چوونەناو ئەوشوێنەوە، خاتوونەکەم بەمەشخەڵدارەکانی گوت: بەشێوەیەك بڕۆن ڕووناکی مەوشخەڵەکانم بەباشی لێبدات.

- کلیۆپاترا لەسەرکەژاوەکە هەستایە سەرپێ، بەڵام من لەبەرپێیدا لەتەکییەوە دانیشتبووم، پێویستە ئەوەش بڵێم کە، دانیشتنی من زیاتر لەترساندابوو، چونکە هەر کەگەیشتینە ئەوێ وچاوم بەولاشانەکەوت کەلەوچواردەورەدا کەوتبوون، لەرزم لێهات.

جاڕدەرەکان زوڕناکانیان لێدەداو پاشان هاواریان دەکرد: کلیۆپاترا هات !

لەیەکەم شەقامدا کۆمەڵێك پیاومان بینی دیاربوو لەکرێکارانی بەندەربوون وکێردو شمشێریان بەدەستەوەبوو، لەشیان شەڵاڵی خوێن ببوو، کاتێك کەزانییان کلیۆپاترا هاتووە، دەوری کەژاوەکەیان گرت، بەڵام سەربازەکان کەوتنە نێوان ئەوان و کەژاوەکەوە.

20- دیارە مارشی ئەوکاتە، زیاتر لەزوڕنای کوردی چووە، بۆیە زوڕنامان داناوەتەوە (وەرگێڕی کوردی

چەکە خوێناوییەکانی ئەوپیاوانە بەشێوەیەك ترسناکبوو، نەمدەوێرا سەرم بەرزبکەمەوەو ئەوانە ببینم. کلیۆپاترا چەند جارێك بەهێواشی دەستی خۆی جووڵاند، واتا دەیویست بێدەنگبن، پیاوە لەش خوێناوییەکان کەلەبەر ڕووناکی

مەشخەڵەکاندا دیاربوون ، بێدەنگ بوون.

- کلیۆپاترا لەسەر کەژاوەکە ڕاوەستاو گوتی: ئێوە دەمناسن کچی پاشام وبەپشتبەستن بەوخۆشەویستییەی کەلای ئێوە هەمە، هاتووم بۆ ئێرە، تابەئێوە بڵێم، لەمەزیاتر بەخوێنڕشتن ڕازی مەبن، ئەو ژنە بەدبەختانەی کەئێوە دەیانکوژن، گوناهیان نییە، چونکە ئەوانە هەموویان کرێگرتەن. ئەوپلانە لەلایەن بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنەکە دانراوە.

سەبارەت بەکەمکردنەوەی پارەش بۆخەڵکی بێگانە، دڵنیاتان دەکەمەوە هەرلەسبەی شەوەوە، دۆخەکە وەك خۆی لێدێتەوەو جیاوازیی لەنێوان کەسدا ناکرێت وبیانییەکانیش ناتوانن لەونرخە کەمتر حسابیان بۆبکرێت، چونکە هۆی ناڕەزای ئێوە ئەمەیەو سکاڵایەکی ترتان نییە. من بەڵێنتان پێدەدەم جیاوازیکردن لەسبەی شەوەوە نامێنێت، داوا لەوکەسانەش دەکەم کەگوێیان لەدەنگمە، هەر ئێستا دەستهەڵبگرن وبچنەوەماڵەکانی خۆیان.

کلیۆپاترا بەشێوەیەك لەناو خەڵکدا خۆشەویست بوو، ئەو کۆمەڵە پیاوە لەش خوێناوییە پاش بیستنی دەنگی خاتوونەکەم، بوون بەمەڕی بێ زمان وکێردو شمشێرەکانیان خستەوەناو کێلانەکانیان وسەریان نەویکردو بەرەو ماڵەکانیان کەوتنەڕێ. - - کلیۆپاترا بەهەڵگرانی کەژاوەکەی گوت: بەرێبکەون.

جارچییەکان دەستیانکردەوە بەزوڕنا لێدان، کاتێکیش دەنگی زوڕناکە نەدەما هاواریاندەکرد: کلیۆپاترا هات ..!

پاش ئەوەی دووسەد هەونگاوێکیتر چووینەناوەوە، ڕاوەستاین وکۆمەڵێك پیاویتر کەبەهەمان شێوەی ئەوانەی پێشوو سەرتاپایان شەڵاڵی خوێن ببوو، نزیکی کەژاوەکە بوونەوەو کلیۆپاترا ئەوەی کەپێشتر گوتبووی جارێکیتر دووبارەی کردەوەو گوتیشی: ئەو شتەی سەبارەت بەکەمکردنەوەی نرخە بۆ بیانییەکان، باوکم ئاگادارنییە، ئەمە لەلایەن بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنەکە داڕێژراوە. خۆ ئەگەر باوکم- یان من ئاگامان لەوپلانەبووایە، ئەوا ڕێگامان نەدەدا نرخی ڕابواردن بۆ بیانییەکان هەرزان

بکرێت، بەڵام ئەم پلانە ئیتر هەڵدەوەشێتەوەو لەم شەوەوە جیاوازی لەنێوان بیانی وهاوڵاتییانی خۆماندا نامێنێت.

پاشان خاتوونەکەم لەوێشدا داوای لەومرۆڤکوژانەکرد، بگەڕێنەوە ماڵەکانی خۆیان ورازی نەبن لەمەزیاتر خوێنبڕێژێت ولەوە زیاتر ژنانی شوێنی ڕابواردنەکە بکوژرێن، چونکە ئەوانە گوناهییان نییە. لەبەرئەوەی لەناو خەڵکیدا خۆشەویست بوو، بۆیە ئەوپیاوانەش گوێڕایەڵی بوون وڕێگاچارەی ئەویان قبووڵکردو ڕێگای چوونەوە ماڵەکانیان گرتەبەر.

تائەوکاتەش من لەبەرپێی خاتوونەکەمدا دانیشتبووم، غیرەتم نەبوو باش بەدەوروبەری خۆمدا بڕوانم وهەموو ساتێك چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد، کۆمەڵێك لەوپیاوکوژانە هێرشمان بکەنەسەرو من وکلیۆپاترا بکوژن، بەڵام پاش ئەوەی بینیم بۆ جاری دووەم پیاوەکان گوێڕایەڵی خاتوونەکەم دەبن وقبووڵیانەو پەلامارمان نادەن، غیرەتم هاتەبەرو سەرم بەرزکردەوە، لەوشەقامەدا کەئێمە پێیدا تێدەپەڕین، بینیم لەهەموو شوێنێك پەنجەرەی ماڵەکان شکابوون ولەبەر ڕووناکی مەشخەڵەکان دیاربوو خوێن بەدەرگاو پەنجەرەکانەوە پڕژابوو.

هەروەك گوتم، شوێنی ڕابواردنی ئەسکەندەرییە لەکاتی ئاساییدا وەك چراخان وابوو، تائەوپیاوانەی کەدێن شەوق وزەوق پەیدا بکەن، تامەزرۆی ڕابواردنی زیاتربن، لەوکاتەدا هەندێك لەچراکانی ئەوشوێنە نەکوژابوونەوەو لەبەر ڕووناکی ئەو چرایانەو مەشخەڵەکانی خۆماندا، دەمبینی چۆن ژنەکان ورگیان هەڵدڕاوەو ورگ وریخۆڵەیان هاتبووە دەرەوە- یان ئەوسەرە بێ لاشانەم دەبینی.

لەگەڵ ئەوەشدا خاتوونەکەم کچی پاشابوو، دیارە کچی پاشا غیرەتی لەکەنیزەکێك زیاترە، بەڵام لەبینینی ئەم دیمەنە سامناکە تۆقیبوو، چون دەموچاوی هەڵبزڕکابوو، کاتێك بۆ سێیەمین جار کەژاوەکەمان وەستاو خاتوونەکەم دەستی بەقسەکردن کرد، هەستمکرد لینگی دەلەرزن، ئەوکەسانەی کەلەدەوروبەری کەژاوەکەدا وەستابوون، سەرتاپایان خوێناوی بوو، وەك ئەوەی ئەوانیان لەگۆمێکی خوێن هەڵکێشابێت، زەوی ئەوناوچەیە هێندە لاشەی لێکەوتبوو ڕەشدەچووەوە، بەڵام لەنێوان ئەو لاشانەدا بەدەگمەن پیاوت دەکەوتە بەرچاو، تەرمەکان بەزۆری ژن بوون.

تانزیکی بەرەبەیان کلیۆپاترا لەوێدامایەوەو جارجارە فەرمانی دەدا، کەژاوەکە ڕابگرن وقسەی بۆخەڵك دەکردو ئامۆژگاری دەکردن لەوەزیاتر بەخوێنڕشتنی ئەو ژنە کرێگرتانە ڕازی نەبن ولەکوشتار دەستهەڵبگرن وبچنەوە ماڵەکانیان.

کۆتاییهاتنی شەو لەلایەك وئامۆژگارییەکانی کلیۆپاترا لەلایەکیتر، کاریکردەسەر ئەو پیاوکوژانەو شوێنی ڕابواردنەکە چۆڵبوو، جگەلە تەرمی کوژراوەکان کەسی لێنەما.

کلیۆپاترا لەوەگەیشت ئەوکەسانەی ئەمشەو لەشوێنی ڕابواردنەکەدا خەریکی کوشتن وتاڵان و بڕۆبوون، تەنها کرێکارانی بەندەرنەبوون، بەڵکو کۆمەڵێکیش لەخەڵکی شار لەگەڵ ئەمانەدابوون. کرێکارەکانی بەندەریش خاوەن جلوبەرگێکی تایبەت نەبوون، تابتوانرێت بناسرێنەوە، وەك چۆن پۆلیس- یان سەربازانی میسری هەموویان جلوبەرگێکی تایبەتییان لەبەردایە، تالەخەڵکی جیابکرێنەوە، هەر بەوهۆیەوە کۆمەڵێك لەخەڵکی شاریش بەشدارییان کردبوو، بۆئەوەی لەکاتی ئاشوب و شەڕەکەدا دەستکەوتی مادییان دەستبکەوێت، لەکاتێکدا دانیشتوانی ئەسکەندەرییە لەڕووی ژیان وبژێوییەوە

سەنگەسار نەبوون، تابۆ بەردەوامی ژیانیان پێویستییان بەدزی وڕێگری بێت ، بەلاٌم مرۆڤ هەمیشە لەهەولَی ئەوەدایە هەمیشە هەلٌپەبکات وئەو سەروەتەی هەیێتی زیاتری بکات. ئەو بیرمەندانەی لەکتێبخانەکاندا کات بەسەردەبەن، نەیانتوانیوە خەلٌك والێبکەن قەناعەتیان هەبێت وبەپێی پێویستی بژین.

تاریك وروونی بەیانی بوو، کاتێك لەشوێنی ڕابواردنەکە گەڕاینەوە، کلیۆپاترا دوای ئەوەی گەیشتە کۆشکی پاشایەتی، چوو بۆلای باوکی، تاپێی ڕابگەیەنێت کەشەڕو ئاژاوەی تێکدەران لەشوێنی ڕابواردنەکە کۆتاییپێهاتووەو کرێکارانی بەندەرو هەموو ئەوانەی کەچوو بوون بۆئەوێ، گەڕاونەتەوە، بەلاٌم بەتلیمۆسی سێزدەهەم خەوتبوو، بۆیە کلیۆپاترا نەیتوانی چاوی پێی بکەوێت.

ڕۆژی دوایی کاتێك خەلٌکی شار زانییان شەو ئەوکوشتوبڕە ترسناکە لەشوێنی ڕابواردنەکەدا ڕوویداوە، زۆر ترسان، چونکە تائەوکاتە شتی لەم بابەتە لەئەسکەندەرییەدا پێشینەی نەبوو، بەتایبەت کەخەلٌکی بیانی وژنی بێگوناه بکوژرێن.

دەمەو چێشتەنگاو دەستەیەك لەنوێنەرانی بەندەر هاتن بۆکۆشکی پاشایەتی وداوایانکرد لەلایەن کلیۆپاتراوە پێشوازییان لێبکرێت.

کاتێك ئەوانەهاتن پاشا لەخەو هەلٌنەستابوو، بەلاٌم کلیۆپاترا بەخەبەربوو وپێشوازی لێکردن ولێیپرسین: چیتان دەوێت؟

– دوو کەس لەئەندامانی ئەو دەستەیە کەبەنوێنەرایەتی ئەوانیتر قسەیان دەکرد، گوتیان: دەمانەوێت بەڕێوەبەرانی شوێنی– ڕابواردنەکە سزابدرێن ، چونکە ڕووداوەکەی دوێنێ شەو ئەوانە ناویانەتەوە، ئەگەر ئەوان بڕیارێکی واناڵەباریان دەرنەکردبا، کەلەبەرژەوەندی بیانییەکان وبەزیانی میسرییەکان بێت، ئەوکارەساتەی دوێنێ شەو ڕووی نەدەدا.

– ئەو نوێنەرانەی لەلایەن کرێکارانی بەندەرەوە نێردرابوون، بەخاتوونەکەمیان گوت: ئێمە لەقسەکانی دوێنێ شەوی تۆ هیوادار بووینەوەو تێگەیشتین دەتەوێت بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنەکە تەمبێ بکەیت، بۆئەوەی لەداهاتوودا کەس نەوێرێت جیاوازی میسرییەکان وکەسێکی بیانی بکات، بۆ بەرژەوەندی بیانی وزیانی میسرییەکان.

– کلیۆپاترا گوتی: وەك خۆتان دەزانن، من کچی پاشام ودەسەلاٌتی ئەوەم نییەو ناتوانم دادپەروەری بسەپێنم وبڕیارو جێبەجێکردنی دادپەروەری لەدەستی باوکمدایە، ئەو دەتوانێت گوناهباران سزابدات، بەلاٌم ئێوە دلٌنیادەکەمەوە دوای ئەوەی باوکم لەخەو هەستا، ئەم باسەی پێدەلٌێم وئاگاداری دەکەمەوە کەنوێنەرەکانی کرێکارانی بەندەر هاتبوون و پێیان ڕاگەیاندووین داوای سزادانی بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنەکە دەکەن.

من لەوبڕوایەدابووم ئەگەر شەوی ڕابردوو کلیۆپاترا نەبووایە، ئەوائاگری شەڕو تالاٌن وبڕۆ لەوشوێنەدا کۆتایی نەدەهات و شوێنی ڕابواردنەکەش بەتەواوەتی کاولدەبوو.

من لەقسەی خاتوونەکەمەوە بۆم ڕوون بووەوە، هەرکاتێك شوێنی ڕابواردنەکە لەناوبچووایە ئەوازیانێکی واگەورە بەئابووری ئەسکەندەرییەو خەزنەی پاشای میسر دەکەوت، کەلەباسکردن نەدەهات، چونکە لەدنیادا شارێکی جوان هەبوو، ئەویش ئەسکەندەرییەبوو، لەچوار لای دنیاشەوە خەلٌك بۆگەشت

وگوزارو خۆشگوزەرانی ڕوویان لەوشارە دەکرد، ئەوشارەو شوێنی ڕابواردنەکەی ئەو بوو کەسەرنجی گەشتیارانی ڕاکێشابوو، ئەوانەی بۆ بینینی مۆزەخانەو کتێبخانەکە دەهاتن، هەندێك خەڵکی تایبەت بوون وڕێژەیان کەم بوو، بەڵام ئەوانەی بۆشوێنی ڕابواردنەکە دەهاتن، بەدەیان هەزار کەس بوون کەبۆ سەردانی ئەو شوێنە دەهاتن.

مــن لــەزۆر کەســم بیســتووە کەگوتوویانــە، فانۆســی دەریــایی ئەســکەندەرییە لەحــەوت شــتە سەرسوڕهێنەرەکەی دنیا نییە، بەڵکو شوێنی ڕابواردنە گشتییەکەی ئەسکەندەرییە، یەکێکە لەحەوت شتە سەرسوڕهێنەرەکەی دنیا.

ڕۆژێك دوای ئەوکارەساتە، ڕای گشتی شڵەژا، کەس پرسەی دانەدەنا، هۆکەیشی زیاتر ئەوەبوو، ئەو ژنانەی لەشوێنی ڕابواردنەکەدا کوژرابوون ، خەڵکانی بیانی بوون ولەمیسردا خزم وکەسیان نەبوو-تاپرسەیان بۆدابنێن ، تەنها چەند کەسێك کەخەڵکی میسربوون و نەیانتوانیبوو خۆیان ڕزگاربکەن کوژرابوون، بەڵام مردنی ئەوانە نەبووەجێگای گرنگیی خەڵکی ئەسکەندەرییە تاپرسە، باڵ بەسەر خەڵك وشارەکەدا بکێشێت. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە بەڵێندەرەکان [27] زۆر دڵخۆشبوون لەبەرامبەر ئەوشەڕو کوشتارەی کەلەشوێنی ڕابواردنەکەدا ڕوویدابوو، چونکە دەیانزانی دوو لەسەرسێی ژنەکانی ئەوێ کوژراون وخاوەن ماڵەکان بەناچاری دەبێت ژنی تری بۆبهێنن و ئەوژنە لەشفرۆشانەش دەبێت لەمەملەکەتی ترەوە بهێندرێن، ئەمەش بەقازانجی ئەوان دەشکێتەوە.

27- بەڵێندەر: مەبەست لێرەدا بازرگانی بچووکە، واتا ئەوبازرگانانەی بەهێنان وبردنی ئافرەتەوە بازرگانی دەکەن- یان ئەو بەڵێندەرانەی کەتایبەتمەندنین هەر بەبوارێك، وەك بیناساز- یان شتێکیتر. بەڵکو بەڵێندەری هەمەکارەن وبەپێی خواستی ڕۆژ (و-کوردی)

هەروەها بەڵێندەرەکانیش ئەوەیان دەزانی ئەوخاوەن ماڵانەی لەشوێنی ڕابواردنەکەدا خانویان هەیە، بەئاسانی ڕازی نابن ژنی تازە بهێنرێتەوە ناو خانووەکانیان ، پێدەچوو هەندێك لەوخاوەن خانووانە، خانووەکانیان دابخەن- یان بیفرۆشن لەئەسکەندەرییە بڕۆن ولەسوریا- یان لەڕۆمدا بژین، چونکە زۆربەی خاوەن خانووەکانی شوێنی ڕابواردنەکە دەوڵەمەند بوون و زۆر پێویستییان بەکرێی ئەوخانووانە نەبوو، بۆیەش گرنگییان بەوخانووانە دەدا، چونکە داهاتێکی باشی هەبوو وهەر کاتێکیش بیانویستایە بڕۆن لەشوێنێکیتر بژین، دەیانتوانی خانووەکانیان دابخەن، سەرباری ئەوەش بەڵێندەرەکان دەیانزانی ، پاشای میسر دەیەوێت ئەو خانووانە بەکراوەیی بمێننەوە، چونکە ئەگەر ماڵەکانی شوێنی ڕابواردنەکە نەمێنن ، ئەوا بەتلیمۆسی سیانزەهەم داهاتێکی زۆری لەکیس دەچێت.

جگەلە پاشای میسر، هەریەك لەچین وتوێژەکانی میسر، لەوانیش کرێکارانی بەندەر، پێیان خۆشبوو کەشوێنی ڕابواردنەکە بەکراوەی بمێنێتەوە، تاگەشتیارانی بیانی بۆشارەکەیان ڕابکێشێت، بێگومان ئەوەش لەبەرژەوەندی وقازانجی خەڵکی ئەسکەندەرییە بوو.

لەبەرئەوە بەڵێندەرەکان دەیانزانی خاوەن ماڵەکان ئەمڕۆ تا سبەی دەستدەکەنەوە بەڕازاندنەوەی خانووەکانیان وبۆ خۆشکردنەوەو پڕکردنەوەی ماڵەکانیشیان، دەستی یارمەتی بۆ بەڵێندەرەکان درێژدەکەن.

وەك لەوەوبەر باسمکرد، لەشوێنی ڕابواردنەکەدا گۆڕستانێك هەبوو بەناوی (گۆڕستانی عاشقان) ئەوگەشتیارانەی لەوڵاتانی ترەوە دەهاتن وپارەوپوولیان پێ نەدەما، لەشوێنی ڕابواردنەکەدا هەموویان بەفیڕۆدەداو خەرجدەکردو ڕیسواو ڕەجاڵ دەبوون ونەیاندەتوانی لەمیسردا هەڵبکەن وبمێننەوە، نەدەیشیان توانی بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، هەربۆیە خۆیان دەکوشت وتەرمی ئەوانەش لەوگۆڕستانەدا دەنێژران، هەر بۆیە باشتروابوو لەبری ئەوەی بەگۆڕستانی عاشقان ناوبنرێت، دەبووایە ناوبنرایە (گۆڕستانی نائومێدان)

لەو ڕۆژەشدا بیریان لەوەدەکردەوە لاشەی ئەو کوژراوانە لەسەر ڕێڕەو وناو ماڵەکانی شوێنی ڕابواردنەکەدا لاببەن و لەگۆڕستانی عاشقان تەرمەکانیان بنێژن، بەڵام سەرۆکی شارەوانی ڕێی رازینەبوو وگوتی: ناشتنی ئەوتەرمانە لەوگۆڕستانەدا دەبێتەهۆی نەهێشتنی ناو وناوبانگی گۆڕستانی عاشقان وگۆڕستانەکە دەکاتە گۆڕستانێکی ئاسایی، چونکە گۆڕستانی عاشقان ناوبانگێکی جیهانی هەیەو یەکێکە لەوشتانەی کەئەسکەندەرییەی پێ دەناسرێتەوە، زۆرێك لەگەشتیاران کەدێن بۆئەم شارە، بۆئەوە دێن تائەو گۆڕستانە ببینن.

لەسەرکێلی هەرگۆڕێك لەگۆڕەکانی گۆڕستانی عاشقان، ناوی ئەوکەسانەی کەخۆیان کوشتووە، نووسراوە، هەروەها ناوی وڵاتەکەیان ومێژووی خۆکوشتنەکەیان، دیاریکردووە، لەسەرکێلی هیچ گۆڕێکیش نەنووسراوە فلان کەس کەخەڵکی فلانە وڵات بووە، لەبەر ڕیسوایی وڕووت وڕەجاڵی خۆی کوشتووە، بەڵام هەموو کەس دەیزانی خۆکوشتنی ئەوانە جگەلە دەستکورتی ونەبوونی، هیچ هۆیەکیتر نەبووە، ئەویش پاش ئەوەی هەرچییەکیان هەبووە لەشوێنی ڕابواردنەکەدا خەرجیان کردووەو دووچاری هەژارییەکی سەخت بوون وپاشان بەناچاری کۆتاییان بەژیانیان هێناوە، بۆئەوەی لەناو خەڵکی وئەو ژنانەی کەمەعشوقەیان بوون، ڕیسواو سەرشۆڕ نەبن.

- سەرۆکی شارەوانی دەیگوت: [28] نابێت ناو وناوبانگی گۆڕستانی عاشقان بسڕێتەوەو ببێتە گۆڕستانێکی ئاسایی وگشتی. هەروەها گوتیشی: گۆڕستانی عاشقان کەنزیکی شوێنی ڕابواردنەکەیە، جگەلەوەی جێگای شانازی خەڵکی ئەسکەندەرییەیە، هەروەها کەڵك وسودێکی زۆریشی بۆخەڵکی ئێرە هەیە، چونکە کاتێك گەشتیاران دێن بۆئەسکەندەرییەو ئەو گۆڕستانە دەبینن، پارەیەکی زۆر لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن، تاگرفتاری هەمان چارەنووسی مردووەکانی گۆڕستانی عاشقان نەبنەوەو بتوانن بگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان.

ئەگەر کەسێك ببووایە ڕەخنەی لەسەرۆکی شارەوانی بگرتایەو بیگوتایە، گۆڕستانی عاشقان دەبێتەهۆی ئەوەی ئەو کەسانەی دێن بۆشوێنی ڕابواردنەکەو پاش بینینی، دەکەونە بیروخەیاڵی ئەوەی بۆگەڕانەوەی نیشتمان پێویستە پارەیان پێبمێنێت، لەبەرئەوە دەست بەپارەکانیانەوە دەگرن وسەرئەنجامیش شوێنی ڕابواردنەکەو شوێنەکانیتری ئەسکەندەرییە کەمتر کەڵك لەوگەشتیارانە وەردەگرێت.

28- سەرۆکی شارەوانی: بەپێی دەستوری ئەوکات وهەندێك لەولاتانی تری دنیای ئەمڕۆش، لێپرسراوێتی کاروباری شاری لەسەر شانە. (و- کوردی)

- سەرۆکی شارەوانی وەلامی دەدایەوەو دەیگوت: ئەوگەشتیارانەی کەدێن بۆ ئەسکەندەرییە، تەواوی سامانەکەی لەشوێنی ڕابواردنەکەو شوێنەکانیتردا خەرجدەکات، پاش ئەوەی خۆی دەکوژێت وەك دارێکی لێدێك کەبۆ کەڵك وەرگرتن لەمیوەکەی بیبڕیتەوەو ڕیشەکێشی بکەیت، ئەوکەسەش کەدرەختێك ڕیشەکێش دەکات بۆکەڵك وەرگرتن لەمیوەو بەرەکەی، تەنها یەك جار کەڵکی لێوەردەگرێت، بەلام ئەگەرلێی بگەڕێت درەختەکە بمێنێتەوەو هەڵی نەکەنیت ونەیبڕیتەوە، ئەواهەموو ساڵێك کەڵك لەمیوەکەی وەردەگرێت.
ئەوگەشتیارەی بۆ چێژوەرگرتن وخۆشگوزەرانی بۆشوێنی ڕابواردنەکەدێت، وەك ئەودرەختەوایە. ئەگەر ئەوانە هەرچییەکیان هەیە خەرجی بکەن ودواتر لەمایەپووچییاندا خۆیان بکوژن، تەنها جارێك کەڵك لەسامانی ئەوانە وەردەگرین، بەلام کەهەندێك پارەیان پێ بمێنێت وبەوپارەیە بگەڕێنەوە ولاتەکەی خۆیان ولەوێدا سەرقاڵی کاری خۆیانبن ودووبارە سامان کۆبکەنەوەو ساڵێك- یان دووساڵیتر هەرسەردانی ئەسکەندەرییە دەکەنەوەو لەهاتنەوەیان قازانج دەکەینەوە. بوونی ئەمجۆرە شوێنانە بۆگەشتیاری وەك درەخت وایەو میوەو بەری هەیە، چونکە ڕەگ وڕیشەی هەیەو هەموو ساڵێك میوەدەگرێتەوە.
- من ڕۆژێکیان لەخاتوونەکەمم پرسی: ئایا ئەومەسەلەیە ڕاستە کەدەڵێن : ئەوکەسانەی دێن بۆئەسکەندەرییە جاری تریش سەردانی دەکەنەوە؟
کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ شرمیون، ئەو گەشتیارەی ئەسکەندەرییە ببینێت ولەخۆشی ئەوشارە بگات، هەرگیز ئێرە لەبیرناکات، هەرکاتێك پارەی هەبێت جارێکیتر دێتەوە. لەڕۆم ویۆنانیشدا لەمجۆرە چێژوەرگرتنانە هەن، بەلام بەشێوەیەکی نهێنییە. هەرلەبەر ئەوەی نهێنیشە، ئەو بەیەك گەیشتن وجووتبوونانە بەشێوەی ترس وناڕەحەتییە، بەلام لەشوێنی ڕابواردنی ئێرەدا کەهەروەك شارێکی گەورەوایە، نەك هەرهەموو پێداویستییەکی خۆشی بۆگەشتیاران ئامادەیە، بەڵکو ئەوانەی کەدەچنە ئەوشوێنە ئازادی تەواویان هەیەو هەرچییەکییان بوێت دەیکەن، بەمەرجێك کەسانیتر ئازارنەدەن، بەلام ڕەشەبکوژی ئەوشەوە لەکەیەکی گەورەی بەشاری ئازادی شوێنی ڕابواردنەکەوە نا، چونکە لەوشەوەدا ئەو ڕۆمی وسریانییانەی لەشوێنی ڕابواردنەکەدابوون، بەدەستی کرێکارانی بەندەر کوژران وئەمەش بووەهۆی ئەوەی ئیتر بیانییەکان لەئاسایش وسەلامەتی خۆیان دڵنیانەبن وبەگومانبن.
پاشای میسر تائکیدی لەسەر ئەوەکردەوە، نابێت هەواڵی کوژرانی ڕۆمی وسریانییەکانی لەشوێنی ڕابواردنەکەدابوون ، بلاوببێتەوەو خەڵك بیبیستێت، بەلام ڕۆمی وسریانییەکانی ئەسکەندەرییە، تەنها بریتینەبوون لەوکەسانەی کەئەو شەوە لەشوێنی ڕابواردنەکەدا کوژرابوون، بەڵکو هەندێکیتر لەوانە لەشوێنیتری شاردا دەژیان، هەربۆیە ئەوان بۆ ڕۆژی دوایی زانییان دۆست وئاشناو خزم وکەس وهاونیشتمانییەکانیان لەشوێنی ڕابواردنەکەدا کوژراون، بێئەوەی پاشای میسر توانیبێتی ڕێگا

لەڕەشەکوژی ئەوانە بگریێت، هەواڵەکەیان گەیاندە ڕۆم وسوریاو سەرئەنجام لەڕۆمدا ئەوەبلاوبووەوە کەڕۆمی وسورییەکان لەشوێنی ڕابواردنی ئەسکەندەرییەدا ئاسایشیان پارێزراو نییە.
کەبیانییەکان ئەم قسەیەیان بیست، ترسان، کاتێك ڕۆمی وسورییەکان بەوەیان زانی ئاسایشیان پارێزراو نابێت، هەرچەندە پەیوەندییەکی نزیکیشیان لەگەڵ میسرییەکاندا هەبوو، هەربۆیە زۆر ئاسایی وسروشتییە بیانییەکانیتر زیاتر مەترسییان لەسەردەبێت.
پاش ئەوەش کەس نەیدەگوت ئەوەی بووەتەهۆی کوژرانی سریانی وڕۆمییەکان لەوشوێنەدا، ئەوەبووە بەڕێوەبەرانی ماڵەکانی شوێنی ڕابواردنەکە لەئەسکەندەرییەدا ئیمتیازی زیاتریان بەبیانییەکان داوەو مافی خەڵکی میسریان پێشێلکردووەو ئەم جیاوازیکردنەش بووەتەهۆی ئەوەی کرێکارانی بەندەری ئەسکەندەرییە تووڕەبن. لەبەرئەوە لەمانگەکانی دوای ڕەشەبکوژییەکەوە ژمارەی گەشتیارانی بێگانە بۆئەسکەندەرییە، ڕووەو کزی چوو وداهاتی شوێنەکەش کەمبۆوە.
ئەوانەی لەهەموو کەس زیاتر بەورووداوە ناڕەحەتتر بوون، خودی کرێکارانی بەندەربوون.
کرێکارانی بەندەر مانگانە داهاتی باشیان هەبوو، هەموو شەوێك دەچوون بۆشوێنی ڕابواردنەکەو سەرقاڵی ڕابواردن دەبوون وخۆشیان دەگوزەراند، بەڵام پاشئەوەی پروپاگەندەی ئەوەبلاوبووەوە، گوایا گەشتیاران لەشوێنی ڕابواردنەکەدا ئاسایشیان پاریزراونییەو دەیانکوژن، گەشتیارانی بیانی کەمتر دەهاتن بۆئەسکەندەرییە، ئەوانەی کەدەشهاتن کەمتر غیرەتی ئەوەیان هەبوو بچن بۆشوێنی ڕابواردنەکە، داهاتی کرێکارەکانی بەندەر کەبەشێکی لەگەشتیارانی بیانییەوە دەستیان دەکەوت، کەمبووەوەو تاماوەیەك شوێنی ڕابواردنەکە بەهۆی ڕەشەبکوژیی ئەوشەوەو خراپیی بازاڕ، شوێنی ڕابواردنی گشتی نەیتوانی ژنی تازەی بۆبێنێت وشوێنەکە نوێ بکاتەوە.
لەیادمە بەتلیمۆسی سیانزەهەم کۆششی دەکرد بۆئەوەی بگەشێتەوەو ڕەواج پەیدا بکاتەوەو شوێنی ڕابواردنەکە وەك جاران لێبکاتەوە.. هەندێك پارەی دایە بەڕێوەبەرانی شوێنی ڕابواردنی گشتی، بۆ هێنانی ژنی بیانی، بەڵام زۆر درێژەی نەکێشاو وەك جاران درەوشایەوەو ڕەواجی پەیداکردەوە، بیانیەکانیش دوودڵی وگومانیان سەبارەت بەوشوێنە نەماو وەك ڕابردوو گەشتیاران دەستیانکردەوە بەهاتنەوەو چوون بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی وپارەخەرجکردن لەوێدا.
ئێوارەیەکیان (لژبوون)ێك[29] لەسەربازگەی (دەمەنهور)ەوە دەهاتن کەپەنجا عەرەبانەی جەنگییان پێبوو، کاتێك ئەو لژبوونە گەیشتە ئەسکەندەرییە، کلیۆپاترا لەپەنجەرەکەوە سەیری تێپەڕینی سەربازەکانی لەبەردەم کۆشکی پاشایەتییەوە، دەکرد.

29- لژبوون: یەکەیەکی سەربازییە لەڕۆمی کۆندا ، میسرییەکانیش وەك ڕۆمییەکان بەکاریان دەهێنا، هەر لژبونێك لەوڵاتی ڕۆمدا شەش هەزار سەرباز بوو، کەدابەشدەبوو بەسەر سێ یەکەی بچوکترداو بەهەر یەکێکیان دەگوت(مانیپول) و هەر مانیپولێکیش دوو (سنتوری) بوو وهەر سنتورەیش سەد سەربازی هەبوو، بەفەرماندەی یەك سنتوریشیان دەگوت(سنتوریون) ئەم ناوانە لەڕۆمییەکانەوە وەرگیرابوون (وەرگێڕی فارسی)

– من لەپشتی خاتوونەکەمەوە وەستابووم وگوێم لێبوو لەبەرخۆیەوە قسەی دەکردو دەیگوت: حاڵی مەملەکەتەکەمان بەشێوەیەك تێکچووە سەربازانی لژبوون بەڕێگا ڕۆیشتنیشیان بیرچووەتەوە، کاتێك کەجاران سەربازەکان بەڕێگادا دەڕۆیشتن زەوی لەژێر پێیاندا دەلەرزییەوە، بەڵام ئێستا ئەوسەربازانە دەڵێی سەرخۆشن وتازە لەمەیخانە هاتوونەتەدەرەوەو ناتوانن هەنگاوی جێگیربنێن، خۆ ئەگەر من بەخزمەتکارەکانی کۆشکی پاشایەتیم گوتبا بەڕێگادابڕۆن، زۆر لەوسەربازانە باشتر هەنگاویان دەنا. من لەم بارەیەوە باوکم بەگوناهبار دەزانم، چونکە ئەو زۆربەی کاتی خۆی بەشمشاڵێدان– یان وریای لەشێرەکانی بەسەردەبات وئاگای لەکاروئەرك وفەرمانە گەورەکانی دەوڵەت نییە.

سەربازانی لژبوون نەیاندەتوانی ڕێك بڕۆن ، بەڵام عەرەبانە جەنگییەکانی ئەوان ونەڕەی ئەفسەرەکان لەکاتی دەرکردنی فەرمانی سەربازیدا، زۆر کاریگەربوون وئەو کەسانەی دەیانگوت دەبێت خاوەنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بەداردا هەڵبواسرێن، دوای بینینی سەربازانی لژبوون، ئیتر سەبارەت بەسزادانی ئەوکەسانە سوورنەبوون.

لەڕاستیدا خاوەنماڵەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی کەئیمتیازی زیاتریان بەڕۆمی وسریانییەکان دابوو، لەشەوی ڕەشەبکوژییەکەوە تەواو تەمبێبوون ، جگەلەوەی هەندێك لەمانە کوژراشن ، زۆریش لەوژنانەی بۆئەوان کاریاندەکرد لەناوچوون ، بەم شێوەیە هەندێك لەسەرمایەی خاوەن ماڵەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی تێداچوو.

ئەگەر مەبەستی کرێکارانی بەندەر تەمبێکردنی ئەوان بووبێت، ئەوا تائاستێکی باش تەمبێببوون، ئیتر پێویستی نەدەکرد هەموویان لەسێدارەبدەن، ئەمە جگەلەوەی دانانی ئەونرخە لەلایەن بەڕێوەبەرانی خانووەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی شتێکی نابەجێبوو، لەبەرئەوەی ڕۆمی وسریانییەکان لەشوێنی ڕابواردنی گشتیدا لەهەموو نەتەوەکانیتر زیاتر پارەیان خەرجدەکرد، بەبێ دەستپێوەگرتن لەخواردنەوەی شەراب وخواردن ومیوەو شیرینی وڕابواردن لەگەڵ ژنە جوانەکانی ئەو شوێنەدا، ئەمەش شتێکی ئاساییە کەهەر فرۆشیارێك کڕیارێکی باش وبەردەوامی هەبێت، بەنرخی کەمتر لەکەسانیتر حسابی بۆدەکات.

دوای گەیشتنی سەربازانی لژبوون بۆئەسکەندەرییە، بارودۆخەکە ئارامبووەوەو کرێکارانی بەندەر سەرقاڵی کارەکانی خۆیان بوونەوە، بەڵام سێ ڕۆژ دوای ڕەشەبکوژییەکە، ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی دەستیان لەکارەکانیان کێشایەوە، ئامادەنەبوون بۆخۆشگوزەرانی وڕابواردنی موشتەرییەکان خەریکی کاربن.

مەسەلەی ئیشکردنی ژنان لەشوێنی ڕابواردنی گشتی، سەبارەت بەبەتلیمۆسی سیانزەهەم گرنگییەکی زۆری هەبوو، چونکە بەشێکی گرنگ لەداهاتی ئەو لەوشوێنەدا بەدەستدەهات، لەبەرئەوە پێشوازی لەدەستەیەك لەوژنانەی لەکۆشکی پاشایەتیدا کرد، تابزانێت بۆچی دەستیان لەکارکێشاوەتەوە؟

– ژنەکان گوتیان: لەبەرئەوەی ئێمە بێگوناهبووین، لەشەوی ڕەشەبکوژییەکەشدا هەرئێمە تێداچووین، لەوانەشە ئەوکارەساتە دووبارەببێتە، تەنانەت هێندەبەسە کەخاوەنی خانووەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی نرخی خۆیان گرانبکەنەوە، تاجارێکیتر ژنانی ئەوشوێنە بەکوشت بچنەوە، لەبەرئەوەی ئاسایشمان نەپارێزراوە، ئێمە لەوشوێنەدا کارناکەین.

پاش ئەوەی بەتلیمۆسی سیانزەهەم لەگەڵ لێپرسراوەکانیدا ڕاوێژی کرد، کەوتە تەگبیری ئەوەی کەنیزەکەکانی کۆشکی پاشایەتی میسر، بنێرێت بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی، تاکو لەبری ژنەکانی ئەوێ کاربکەن. ئەگەر پاشای میسر ئەوەی جێبەجێ بکردایە، ئەوامنیش ناچاردەبووم وەك کارەکەرەکانیتر بچم بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی ولەوێدا نیشتەجێ ببم، بەڵام جارێکی تریش کلیۆپاترا چارەسەری ئەوکێشەیەی کردو ڕێگریی کرد لەوەی کارەکەرەکانی کۆشکی پاشایەتی بنێردرێن بۆ شوێنی ڕابواردنی گشتی. چارەسەرەکەی ئەویش ئەوەبوو کەژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بینەبەشێك لەکارمەندانی پاشای میسر، لەوڵاتی میسردا بەپێی ئەودەستورەی کەدەسەڵاتداریێتی پاشایەتی دایناوە، هەندێك کەس کارمەندانی تایبەتی پاشابوون وئەوانە پارێزراوبوون، تەنانەت لەکاتی تاوانکردنیشدا بەڕەزامەندی پاشا- یان نوێنەری ئەو نەبووایە، لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا نەدەکرا. ئەوکەسانەی کەلەمیسردا پارێزرابوون، بریتیبیوون لەهەموو ئەوکەسانەی لەکۆشکی پاشایەتیدا کاریاندەکرد، هەروەها ئەوانەی کەلەسێرکدا کاریان دەکرد، سزادانی ئەمانە تەنها لەدەستی پاشادابوو وکەسانیتر نەیاندەتوانی ئەمانە سزابدەن.

کلیۆپاترا پێشنیاری ئەوەی بۆ باوکی کرد: بۆئەوەی ژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی دڵنیابن وبزانن کەئیتر کەس ناتوانێت دەستدرێژیان بکاتەسەرو بیانکوژن، قەباڵەیەك بنووسرێت کەبەپێی ئەوە، ئەوژنانەی لەشوێنی ڕابواردنی گشتیدا کاردەکەن، وەك کارمەندانی پاشا لەقەڵەم دەدرێن، بۆئەوەی ئەوانە پارێزراوییان هەبێت لەلایەن پاشاوەو کەس نەتوانێت بیانکوژێت و ئازاریان بدات.

ژنەکان بەوە ڕازیبوون ودەستیان بەکارکردەوە، بەڵام نەنگی هەندێك کەباوەڕیان بەدروشم ونەریت بوو، بەرزبووەوە، کەدەیانگوت: نەدەبووایە بەتلیمۆسی سیانزەهەم ژنەکانی شوێنی ڕابواردنی بکردایە کارمەندانی تایبەتی پاشای میسر، چونکە ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەپێگەو کەسایەتی ئەو باشنییە.

بەڵام بەتلیمۆس بەهای بۆ ڕەخنەکانی ئەوانە دانەنا، چونکە دەیزانی ئەو زێڕو زیوەی کەلەشوێنی ڕابواردنی گشتییەوە دێت، گیانیان لەبەردا نییە تاشەرمەزاربن.

## نمایشی سەرسوڕهێنەری سێرککاران

یەکێك لەورووداوانەی لەژیانمدا بیری ناکەم، ئەوەیە بەهاوڕێیەتی کلیۆپاترا چووم بۆسەیرکردنی نمایشێکی سێرك، لەئەسکەندەرییە. تائەو ڕۆژە ناوی سێرکی ئەسکەندەرییەم زۆر بیستبوو، بەڵام نمایشەکانیانم نەدیبوو. دەیانگوت لەدنیادا نمایشەکانی سێرکی ئەسکەندەرییە بێهاوتایەو هەرکەسێك ئەوسێرکە نەبینێت، وەك ئەوەوایە دنیای نەدیبێت وبێچێژوەرگرتن لەدنیا دەرچوویێت، ئەوڕۆژەی بۆ سەیرکردنی نمایشی شێرەکانی سێرك چووم، وەك هەرکاتێکیترو هەمیشە لەگەڵ کلیۆپاترادا بووم.

کلیۆپاتراو هەموو ڕۆڵەکانی پاشای میسر لەیەك لۆجی گەورە کەتایبەتبوو بەوان، دانیشتن ومنیش لەپشتی ئەوانەوە ڕاوەستابووم وجارجارە شەرابم بۆ کلیۆپاتراو منداڵەکانیتری پاشای میسر دەهێنا.

سەرەتا چاوم بەپیاوی بالأبەرزکەوت، کەبەرزی بالأیان دەگەیشتە نزیکەی دوو مەترو نیو، لەتەنیشت ئەمانەوە پیاوی کورتەبالأ دەجوولأنەوە کەبالأی ئەمانە لەبەرزیی بالأی منداڵێك زیاتر نەبوو، بەشێوەیەك جیاوازی لەنێوان پیاوە درێژەکان و پیاوە گرگنەکاندا هەبوو، مرۆڤی دووچاری سەرسوڕمان دەکرد، من هەرگیز پیاوی ئاوام نەدیبوو کەئەوەندە درێژبن،

هەروەها پیاوی وابالأ کورتیشم نەبینیبوو کەبالأیان بەقەد منداڵێکبێت.

مـن دەمویـست بـزانم ئـەم پیـاوە درێـژو کورتانـە لـەکوێوە هـاتوون ؟ بیـستوومە پیـاوە بالأبـەرزەکان لەخوارووی میسر لەناوچەیەکدان کەپێی دەڵێن (نوبە) بەڵام پیاوە کورتەبالأکان لەدانیشتوانی بەشێکی ئـەو زەوییانـەن کەکەوتووەتەسـەر سەرچاوەی نیلـەوە، کەبەدەگمـەن ڕاوچـیانی دلێـر پێیـان ناوەتـە ئەوناوچەیەو دەچن. چونکە بیستوومە کەلەوێدا چەند خێڵ دەژیـن، هـەموویان کورتـەبالأو پێسترەشن، کـەڵك لەوپیاوانـە وەردەگیرێـت بۆسـێرك، پاشـئەوەی پیـاوە درێـژو گرگنـەکان تێدەپـەڕین، دیمـەنێکیتر دەسـتپێکرد، مـەیمونی گـەورە هاتنـەناو سـێرکەکەوە، مـن سـەرم سوڕما کـەبینیم، هەنـدێك لەمانـە سـینییەکیان لەسـەر سـەردانابوو کەچـەند خـۆراکی لەسـەربوو، چـەند مـەیمونێکیش کورسـییان بەدەستەوەبوو لەشـوێنێکی نزیـك ناوەڕاسـتی مەیدانەکـەدا کورسـییەکانیان دانـاو لەسـەری دانیـشتن وسـینییەکانیان لەبـەردەم خۆیانـدادانـاو دەسـتیانکرد بـەنانخواردن، بـەجۆرێك جوولـەو هەڵسوکەوتی مەیموونـەکان لەشێوەی جوولـەی مـرۆڤ دەچوو، من وامنـەدەزانی ئەوانـە مـەیموونبن، بەڵکو وامدەزانی کۆمـەڵێك مـرۆڤن وخـەریکی نـانخواردنن، لـەنیوەی کـاتی نانخواردنەکـەدا دەنگێکهـات و مەیموونـەکان بەبیستنی ئەودەنگـە گوێقولأغبـوون لـەوەی هەسـتن- یـان نـا، بـەڵام دواتـر هەسـتان وسـینییەکانیان لەسەرسەریان دانایەوەو کورسییەکانیان هەڵگرتەوەو بەوشێوەیەی هاتبوون، ڕۆیشتنەوە.

بەشێوەیەك هەڵسوکەوت ورەفتـاری مەیموونەکان سـەیرو سـەمەرەبوو، کلیۆپـاتراو هـەموو ڕۆڵـەکانیتری پاشای میسر، بەقاقا پێدەکەنین ومنیش دەتریقامەوە.

دواتر نمایشێکیتر دەستپێکرد، ئەمجارەیان چەند سەگێك هاتنەناو گۆڕەپانی سێرکەکەو هەریەکەیان ئاوسارێکیان بەددان گرتبوو کەشێرێکی پێوە بەسترابۆوە، دیاربوو سەگەکان، شێرەکان بەدوای خۆیاندا ڕادەکێـشان، کاتێـك تەماشـاکاران چـاویان بەوسـەگانە کـەوت هەریـەکێکیان شـێرێك ڕادەکێـشێت، لەخۆشییاندا وروژان، چونکە دیمەنێکیان دەبینی نەیاندەتوانی وێناشی بکەن، هـەموو دەیانزانی، شێر دڕندەترین گیانلەبەرەو بەهێزتر لەوئاژەڵە دڕندەیە، گیانلەبەرێکیتر لەنێوان گۆشتخۆرەکاندا نییە، لەگەڵ ئەوەشـدا سەگێك ڕێشمەی شێرێکی گرتـووەو بـەدوای خۆیـدا ڕایدەکێشێت وشێرەکەش بەگوێڕایـەڵیی تەواوەوە ملی دەنا، بێئەوەی پەلاماری سەگەکە بدات، لەپشتییەوە دەهات.

- کلیۆپـاترا بەپێکەنینـەوە گـوتی: بینـەران سـادەن ونـازانن ئـەم سـەگانە کەهەریەکـەیان ئاوسـارێکیان بەددان گرتووەو ئەو دڕندەیە بەدوای خۆیاندا ڕادەکێشن، دایەنی ئەوشێرەن، چونکە هەنـدێکجار شێرە دایکانـەکان کەبەچـکەیان دەبێت بۆ تێرکردنـی بێوەڵـەکانی خـۆی، شـیری نییـەو ناتوانێت بەچکەکانی گـەورەبکات، خزمـەتکارەکانی بـاوکم بێوەڵـە شـێرەکان بەدێڵـە سـەگەکان دەدەن وسـەگەکانیش مـەمکی خۆیان دەدەن بە بەچکە شێرەکان وبەشیری خۆیان گـەورەیان دەکـەن، ئەو شێرەی کەمەمکی لـەگوانی دێڵە سەگێك خواردبێت وڕاهاتبێت لەگەڵ ئەودا ژیابێت وبەخێوکەری بێت، بەشێوەیەك هۆگری سەگەکە

دەبێت کەگەورەشبوو پەلاماری نادات ودێلە سەگەکە دەتوانێت ئەوشێرە بەدوای خۆیدا ببات بۆهەر شوێنێك بیەوێت.
دێلە سەگەکان کاتێك ئاوساری شێرەکانیان بەدەمەوە گرتبوو، خولێك بەدەوری گۆڕەپانەکەدا سوڕانەوەو دواتر ڕۆیشتنەوە.
دوای ئەوە فیلەکان هاتنەناو گۆڕەپانی سێرکەکە، کەژمارەی ئەوانە دە فیلی[30] نێرومێ بوون.

30- مەبەست لەفیلی ئەفریقاییە کەئەوکاتە لەمیسردا هەبوو (و- فارسی)

کلیۆپاترا کەهەموو شتێکی دەزانی دەیگوت: ماڵیکردنی هیچ ئاژەڵێك بەقەد فیل گرفت نییە، فیل تەنها کاتێك کەبەچکەیە دەتوانرێت کەوی بکرێت، بۆئەوەی وردەوردە لەگەڵ مرۆڤدا ڕابێت ودوای ئەوەی گەورەبوو لەمرۆڤ نەترسێت.
فیلێکی گەورە بەهیچ شێوەیەك ڕامنابێت وئەو دە فیلە نێرومێیە کەهێواش لەناو سێرکەکەدا دەجوولانەوەو بەپێی خواستی فیلەوانەکان دەجوولێنەوە، لەبەچکەییانەوە لەباوك ودایکیان جیاکراونەتەوەو هۆگری مرۆڤبوون.
ئەونمایشەی ئەو ڕۆژە لەسێرکی ئەسکەندەرییەدا پێشکەشدەکرا، پێشەکیەك بوو بۆ پێشکەشکردنی نمایشی گەورە، ئەویش پێیان دەگوت: عەرەبانە لێخوڕین، لەوڕۆژەدا دە عەرەبانە لەناومەیدانی سێرکەکەدا دەستدەکەن بەپێشبڕکێ کەهەریەك لەوعەرەبانانە چوار شێری پێوە بەستراوەتەوە، من ناتوانم باوەڕ بەو قسەیە بکەم، چونکە وامدەزانی دڕندەی وەك شێر بەوشێوەیە بەعەرەبانەوە ببەسترێنەوەو لەگەڵ یەکتریدا شەڕنەکەن مەحاڵە. پێشئەوەی عەرەبانەکان بێنەناو گۆڕەپانەکە، کۆمەڵێك سەربازی پڕچەك وڕم وتیرو کەوان وشمشێر، هاتن ودەوری سێرکەکەیان گرت.
خاتوونەکەم گوتی: بۆیە ئەم سەربازانە لەدەوروبەری سێرکەکەدا دانراون، هەتا هەرکاتێك ئەوشێرانە بەربوون وپەلاماری بینەرانیاندا، ئەو سەبازانە بیانکوژن.
پاشئەوەی ئەوسەربازانە جێگاکانی خۆیان گرت، عەرەبانەیەك دەرکەوت چوار ئاژەڵی پێوە بەسترابوو، من بەوردی تێڕامام تائەو گیاندارانە ببینم، داخۆ ئەسپە- یان ئێستر، بەڵام دیم هەرچوار ئاژەڵەکە شێرن.
ئەو عەرەبانەیە تەنها یەك لێخوڕەی لەسەربوو ودارێکی درێژی لەجۆری حەیزەران بەدەستەوەبوو وئەودارەی لەسەر سەری شێرەکان دەجوولاندەوە بێئەوەی لێیانبدات، تەنها بۆ ترساندنی شێرەکان بوو. شێرەکان بێگوێدان بەوهەموو خەڵکە، بەهێواشی هەنگاویان دەنا، تاگەیشتنە خاڵێکی دیاریکراوی سێرکەکەو ڕاوەستان، من زانیم عەرەبانچییەکە بۆئەوەی شێرەکان ڕابگرێت، تێخوڕینێکی تایبەتی کردو ئاوسارەکانی ڕاکێشان. پاش ئەمە عەرەبانەی تری هاوشێوەی ئەم هاتن، بەڵام تەنها ڕەنگیان جیابوو، هاتن لەتەنیشت عەرەبانەی یەکەمدا وەستان، کاتێك زانیم ئەوشێرانەی بەعەرەبانەکان بەسترابوونەوە، شەڕناکەن، تێبینی ئەوەمکرد ئاخۆ شێرەکانی عەرەبانەیەك لەگەڵ ئەوانەی عەرەبانەیەکیتردا شەڕناکەن،

بەڵام هیچ شەڕو نەڕەومڕیان لەنێواندا نەبوو، بەشێوەیەك ئەوشێرانەیان پەروەردە کردبوو، کەنەبنەڕێنن ونەسەروکەللەیان گرژی وتووڕەبوونی پێوەدیاربێت.

میسرییەکان، بەتایبەت دانیشتوانی ئەسکەندەرییە شێرەکانیان دیبوون ودەیانناسین ودەیانزانی تووڕەبوونی شێر بەجەستەیدا دیارە، چونکە گرژدەبێت، لەبەرئەوە بەلای بینەرانەوە گرنگ نەبوو بزانن ئایا شێرەکانی کەبەعەرەبانەکانەوە بەسترابوونەوە تووڕەن- یان خەریکی شەڕکردنن- یان نا؟

پاش ماوەیەکی کەم دە عەرەبانە بەدە ڕەنگی هەمەجۆر هاتنەناو گۆڕەپانی سێرکەکەو لەتەك یەکدا وەستان، شێرەکانی ئەو دە عەرەبانەیەم ژمارد، چل شێریان پێوە بەسترابووەوە، هەموویان نێرن وملیان تووکی پێوەیە.

لەهەمان کاتیشدا ئەم دیمەنە ترسناکە سەرنجڕاکێش بوو، هەرچەندە شێرەکانیشم بەچاوی خۆم دەبینی، بەڵام پێموانەبوو چل شێر لەڕیزی یەکتریدا بن بێئەوەی بنەڕێنن وپەلاماری یەکتری بدەن، ئەمانەیان چۆن پەروەردە کردووە. شێری بێشە خۆی بیربچێتەوە؟

گوێم هەڵخستبوو تابزانم ئەندامانی خێزانی پاشا سەبارەت بەوشێرانە چی باسدەکەن؟ بەڵام ئەوان بێدەنگبوون وبەسەرسوڕماوییەوە سەیری شێرە نێرە بەهێزەکانیان دەکرد.

لەوکاتەدا دەنگی تەپڵێك بەرزبووەوە، دیاربوو ئەوتەپڵە بۆ دەستپێکردنی پێشبڕکێکەبوو، دە عەرەبانەکە کەوتنە جووڵە، ئەوکاتە تێگەیشتم جیاوازی ڕەنگی عەرەبانەکان بۆئەوەیە کاتی پێشبڕکێکە لەیەکتری جیابکرێنەوە، تائەوکاتەی عەرەبانەکان جووڵان، شێرەکان بێدەنگبوون، بەڵام کاتێك تێیانخوڕین، شێرەکان دەستیانکرد بەنەڕەنەڕ، بەڵان نەڕەنەڕیان لەکاتی ڕاکردنیاندا وەك نرکەو ناڵەیەکی درێژبۆوە هاتەگوێ، دەنگی چل شێر سێرکەکەی پڕکردبوو ونەمدەتوانی گوێم لەدەنگی ئەندامانی خێزانی پاشا بێت. بۆئەوەی شێرەکان ناچاربکەن خێراتر بڕۆن، عەرەبانچییەکان دارە درێژەکانیان لەسەرسەریان هەڵەسووڕاند، شێرەکان کەدەمیان کراوەو ئاوسارکرابوون، دیاربوو دەیاننەڕاند، بۆیە دەنگی عەرەبانچییەکان نەدەبیسترا.

کاتێك عەرەبانەکان کەمێك لەئێمە ڕەتبوون ودوورکەوتنەوە، دەنگی شێرەکانیش وردەوردە کەمبووەوە، گوێم لێبوو کەخێزانی پاشایەتی سەبارەت بەڕاکردنی شێرەکان قسەیاندەکردو دەیانگوت شێر لەکاتی ڕاکردندا خۆی هەڵدەدات و هەڵبەزودابەز دەکات، بەڵام عەرەبانچییەکان نایەڵن شێرەکان هەڵبەزودابەز بکەن وخۆیان هەڵبدەن، چونکە دەزانن ئەگەر بازبدەن ئەوا عەرەبانەکە وەردەگەڕێت، هەروەها گوێیشم لەوەبوو دەیانگوت، ئەگەر عەرەبانەکە وەرگەڕێت ئەواشێرەکان هێرش دەبەنەسەر عەرەبانچییەکەو کەرت وپەرتیان دەکەن، بۆیە هەرکاتێك شێرەکان دەیانەوێت بازهەڵبدەن، عەرەبانچییەکان ناهێڵن، بۆئەوەی بتوانن بەشێوەیەك ئاوسارەکە بگرن کەڕێگربێت لەبەردەم خۆهەڵدان وقەڵەمبازی شێرەکان، هەروەها ئەو قایشانەی کەشێرەکانیان پێبەستراوەتەوە لەگەڵ ئاوسارەکەدا بەیەکەوەن ولەدەست عەرەبانچییەکەدان.

لەگەڵ ئەوەی من ئافرەتم وزۆرم نییەو زۆرداریم تاقی نەکردووەتەوە، زانیم عەرەبانچییەکان بۆ زاڵبوون بەسەر شێرەکاندا، هێزو توانا بەکاردەهێنن.

هەموو عەرەبانچییەکان پیاوی لاو وخاوەن جەستەی بەهێزو بازوو ئەستووربوون، خاوەنی سنگ ومەمکی زل وپڕ ماسوولکە بوون، کاتێك کەڕێشمەی شێرەکانیان دەگرت وڕادەکێشا، ماسوولکەکانیان

دەردەکەوت، دواتر لەوەگەیشتم کەکاتێك شێرەکان دەیانەوێت قەڵەمبازبدەن، عەرەبانچییەکان ئاوساری شێرەکان ڕادەکێشن.
کلیۆپاترا دەیگوت: پێویستە عەرەبانچییەکان بتوانن شێرەکان بەخێراییەکی زۆر لێبخوڕن وئاگاشیان لەوەبێت کەئەو گیاندارە دڕندانە قەڵەمبازنەدەن وعەرەبانەکە وەرنەگەڕێت، ئەگەر نەتوانن شێرەکان بەخێراییەکی زۆر غارپێبکەن، ئەواناتوانن پێشبڕکێکە ببەنەوە، هەروەها ئەوئاژەڵە دڕندەیە، لەکاتی ڕاکردنـدا حـەزدەکات بازبـدات، بۆیـە پێویـستە عەرەبانـچییەکان ڕێگایـان لێبگـرن تاعەرەبانەکـە وەرنەگەڕێت.
بەتلیمۆسی برای کلیۆپاترا دەیگوت: بەستنەوەی شێر بەعەرەبانەی پێشبڕکێوە منداڵانەیە لەچاو پێشبڕکێی بەستنەوەی ئەسپ بەعەرەبانەوە، چونکە ئەسپەکان عەرەبانەی عادییان هەیە کەئەسپەکان پێکەوەو بەهاوشانی یەکتری ڕادەکەن، لەکاتێکدا شێرەکان عادەتیان بەمەوە نەگرتووە.
عەرەبانەکان لەئێمە دوورکەوتبوونەوە، پاشان جارێکیتر دوای سووڕێك لەئێمە نزیك کەوتنەوەو دووبارە نەڕەی شێرەکان بەسەر قسەکانی خێزانی پاشایەتیدا زاڵبووەو نەمتوانی گوێم لەقسەکانیانبێت، هێڵی ڕاکردنی شێرەکان کەوتبووە لێواری مەیدانی سێرکەکەو دەبووایە سێ جار بەدەوری گۆڕەپانەکەدا بسووڕابایەتەوە جاکۆتایی بەپێشبڕکێکەدەهات وئەو عەرەبانەیەی لەپێشەوەبووایە، یەکەم دەبوو.
سەرەتا بینەران بێدەنگبوون، دواتر لەکاتی سووڕی دووەمدا، ورووژان ودەستیانکرد بەهات وهاوارو ژاوەژاو.
منیش بەشێوەیەك ورووژام ئەگەر کلیۆاپترا و ئەندامانی خێزانی پاشای میسر نەبووایە، هاوارم دەکرد، ئیتر لەنەڕەی شێرەکان وهاواری بینەران کەس گوێی لەقسەی کەس نەبوو.
من پێموابێت هاواری دەیان وسەدان کەس لەناوسێرکەکەدابوو بەهۆی ئەوەی زیاتر شێرەکان هاربن، وادەهاتنەبەرچاو کەگشتبوون وسات بۆسات دەیانەوێت قەڵەمبازبدەن، عەرەبانچییەکانیش بەهەموو هێزو توانای خۆیانەوە هەوڵیاندەدا نەیەڵن شێرەکان بەرزببنەوە.
بینەرەکان هەڵسابوونە سەرپێ‌و هاواریاندەکردو هاتوهاوارو خرۆشانی خەڵکەکە کاریکردەسەر ئەندامانی خێزانی پاشاو ئەوانیش هەڵسانە سەرپێ وهاوارو جوولەی دەستی عەرەبانچییەکانیان پێخۆشبوو وهاندەدا.
یەکێك لەوعەرەبانانەی کەڕەنگی زەردبوو وعەرەبانچییەکەی کەسێکی مەیلەو لاوازبوو، لەسووڕی دووەمدا کاتێك کەعەرەبانەکان لەبەردەم ئێمەدا دەڕۆیشتن، کەوتە پێشەوەیان، من لەدوورەوە ئەو عەرەبانچییەم بینی زانیم تەمەنی لەنۆزدە بۆ بیست ساڵ زیاترنەبوو، هەرچەندە من بۆیەکەمجاربوو کەبۆ پێشبڕکێی ئاوابێم، بەڵام دەمزانی پێشکەوتنی عەرەبانەی زەرد لەسووڕی دووەمدا بەومانایەنییە ئەوئیتر دواناکەوێتەوەو پێشبڕکێکە دەباتەوە، چونکە ئەگەری ئەوەهەیە لەسووڕی دووەمدا پێشی بکەونەوە، عەرەبانـچی نـاوبراو لاوێکـی باڵابـەرزبوو، هەرچـەندە پەیکـەری وەك عەرەبانـچییەکانیتر قەڵـەو نەدەهاتەبەرچاو، بەڵام دیاربوو ماسوولکەی بەهێزی ئەولاوە بەرجەستەو دیاربوون وهەرجارەی کەئاوساری شێرەکانی ڕادەکێشا، بازووەکانی زیاتردەرکەوتن. قەدو باڵای ئەو عەرەبانچییە لەدوورەوە زۆر نازدارو جوان دیاربوو، کاتێك کەعەرەبانە زەردەکەی لێدەخوڕی، هەروەها زانیم ئەولاوەی عەرەبانە

زەردەکە لێدەخورێت لەنەژادی میسری نییە، چونکە ئێمەی میسری ئەگەر جوانیشبین، خاوەنی لەشولارو دەمووچاوی سپی وناسکنین، لەبەژن وبالای جوانترین ژن وپیاوی میسریدا ئاکارێک دەردەکەوێت کەنیشانەی هەندێك گرژی ودزێوی پێوەدیارە. بەژن وبالای ئەوپیاوە گەنجە خاوەنی قەدوبالای یۆنانی ولەشێوە بالای سریانیش دەچوو، دوور نەبوو کەتێکەڵەیەك بێت لەهەردوو نەژادی یۆنانی وسریانی.

من تائەو رۆژە ئەوکورە گەنجەم لەئەسکەندەرییەدا نەبینیبوو، زانیاریم لەسەری نەبوو، بەلام هەرکە ئەوم بینی لەخولی دووەمدا کەوتووەتەپێش عەرەبانەکانیتر، بێ ئیرادەی خۆم بووەجێگای سەرنجم، لەوکاتەی ئەوخەریکی لێخورینی عەرەبانەکەبوو، پێمخۆشبوو ئەو لەنزیکەوە ببینم وقسەی لەگەڵدابکەم ودەستم لەسەرسنگی بگێرم وپەنجەم بخەمەسەر دوو لێوەکانی ئەو

وسەیری دەموچاوی بکەم.

من لەمەوبەر ئەوجۆرە هەستەم نەکردبوو وئەو پیاوانەی بەبەردەممدا تێدەپەرین، لەبەرچاوی من لەگەڵ داروديواردا جیاوازییان نەبوو، بەلام لەورۆژەدا بۆیەکەمجار ئەوەم زانی ئەوپیاوە وەك دیوارو درەخت سەیرناکەم، بەڵکو ئەو بەپیاوێك دەبینم کەشایستەی خۆشەویستی ولاواندنەوەیە، سینگ ودەست وپەلی ئەولاوە جوانە، وەك هەموو عەرەبانچییەکانیتر رووتبوون، جگەلەو جیاوازییەی کەلەشی عەرەبانچییەکانیتر کەمێك ئەسمەرتر دیاربوو، بەلام لەشی ئەوکورە گەنجە لەسپێتیدا دەرەوشایەوە.

کاتێك ئەوکورەم بینی هەستم کرد ئارەزوو دەکەم لەئەو نزیکبمەوەو دەستم بخەمەسەر روومەت وسنگی وبەخۆم گوت گوایا ئەوەی کەناوی خۆشەویستییە ئەوەیە؟

دای تێپەرینی عەرەبانەی ئەوگەنجە، عەرەبانەکانی تریش بەبەردەم خێزانی پاشای میسردا تێپەرین، لەناوەندی هاتوهاواری بینەران ونەرەی شێرە نێرەکانیش کەهەندێکیان تووکی ملیان گرژببوو، عەرەبانچییەکان هەوڵیاندەدا نەهێڵن شێرەکان تەکان وقەڵەمبازبدەن، بەهۆی جەنجاڵی وبیرپەرتی بوو-یان لەبەرئەوەی ئەو عەرەبانچییە توانای نەمابوو رێگا لەگرژبوونی پرچی شێرەکانی بگرێت، یەکێك لەشێرەکان قەڵەمبازێکی هەڵداو عەرەبانەکە وەرگەرا، چونکە ئەو عەرەبانەیە رەنگ سووربوو لەنێوان عەرەبانەکانیتردا باشتردیاربوو، عەرەبانچییەکەی پیاوێکی بەهەیکەل وبەهێز دەهاتەبەرچاو وبازوێکی بەرزو ئەستووری هەبوو، هەرکەعەرەبانەکەی ناوبراو وەرگەرا، ئەو شێرانەی کەبەقایش وقروشی قایم بەعەرەبانەکەوە بەسترابوونەوەو نەیاندەتوانی خۆیان رزگاربکەن، بەعەرەبانەکەوە خشان وپەلاماری عەرەبانچییەکەیاندا. من لەوکاتەدا پێموابوو ئەوپاسەوانانەی کەلەچوار دەوری گۆرەپانی سێرکەکەدا جێگیربوون، هێرش دەکەنەسەر شێرە تووکنەکان وبەشمشێرو تیرەکانیان دەیانکوژن وناهێڵن ئەوعەرەبانچییە شرودر بکەن، کەچی پاسەوانەکان جوولەیان نەکردو بچووکترین هەوڵیاننەدا، ئەو عەرەبانچییە بەدبەختە رزگاربکەن.

لەبەرچاوی ئێمەو دەیان هەزار تەماشاچی، کەلەخۆشیاندا هاتوهاواریان دەکرد، شێرە نێرەکان عەرەبانچییەکەیان لەچەند ساتێکدا کوشت، من بەشێوەیەك لەکوژرانی ئەوپیاوە ترسام کەخۆم بیرچووەوەو یەکەو دەردوو بەکلیۆپاترام گوت: بۆچی پاسەوانەکان نەچوون ئەوپیاوە لەچنگ شێرەکان دەربازبکەن؟

- خاتوونەکەم گوتی: شەرمیون، ئەوپاسەوانانەی کەلەدەوروبەری سێرکەکەدا ڕاوەستاون، بۆ پارێزگاریکردنی عەرەبانچییەکان لەشێرەکان نییە، بەڵکو بۆ پارێزگاریکردنی بینەرانە، ئەو عەرەبانچییەی کەلەم پێشبڕکێیەدا بەشداریدەکات، خۆی بۆمردن ئامادەکردووەو نابێت پارێزگاریی لێبکرێت، بەڵام بینەرانی سێرك دەبێت بپارێزرێن ونابێت ڕێگابدرێت شێرەکان هەڵمەتیان ببەنەسەر، ئەو شێرانەی کەلەناو سێرکەکەدا دەیانبینیت بەهاونرخی خۆیان هەیەو باوکم بۆپاراستنی ئەوشێرانە زۆری خەرجکردووە، ئەگەر پاسەوانەکان هێرش بکەنەسەریان وبیانکوژن، باوکم زیانی پێدەگات، بۆیە تەنها کاتێك پاسەوانەکان هێرش دەکەنەسەر شێرەکان کەشێرەکان هەڵمەت بەرنەسەر خەڵکەکە، چونکە ئەگەر بینەر بزانێت لەسێرکەکەدا ئاسایش وگیانی پارێزراو نییەو کەس بەرگری لێناکات، نایەت بۆ سێرك وئەو داهاتەی باوکم لەم سێرکەدا دەستی دەکەوێت نامێنێت.

لەوکاتەدا کەشێرەکان خەریکی کەلەپاچەکردنی عەرەبانچییە سوورەکەبوون وبینەران هاتوهاواری شادییان لێهەڵدەستاو پاسەوانەکان بەبێبەزەییانە سەیری کوشتنی عەرەبانچییەکەیان دەکرد، عەرەبانەکانیتر بەردەوامبوون لەڕاکردن وهیچ یەکێك لەمانە ئاوڕی لەوەنەدایەوە ئاخۆ عەرەبانە سوورەکە چیی بەسەردێت ؟

کاتێك عەرەبانە سوورەکە وەرگەڕاو شێرەکان پەلاماری عەرەبانچییەکەیاندا، ئاگام لێنەبوو دەستەیەك لەشێرەوان[31] لەدەروازەی سێرکەکە هاتوونەناوەوەو بەرەو ئەوشوێنەی عەرەبانەکەی تێدا وەرگەڕاوە دەچوون،

31- مەبەست لەوکەسانەیە کەخزمەت وێر دەکەن وپەروەردەیان دەکەن و ئەو کەسانە دەناسنەوە ،(و- کوردی)

بەڵام ئەمان تائەوکاتەی گەیشتنە ئەوشوێنە، شێرەکان عەرەبانچییەکەیان هەڵدڕیبوو، دواتر شێرەوانەکان چواردەوری شێرەکانیان گرت بۆئەوەی پەلاماری بینەران نەدەن، چونکە هەر وەك ئاشکرایە شێرە دڕندەکان کەبۆنی خوێنیان کرد، زیاتر هاردەبن وئەگەری هێرشبردنیان زیاتردەبێت، کەشێرەوانەکان وچواردەوری شێرەکانیان گرت، شێرەکان هێوردەبوونەوە، من دەمزانی شێری تووڕە بەئاسانی ئارام نابێتەوە، دواتر بۆم دەرکەوت شێرەوانەکان بۆئارامکردنەوەی شێرە نێرەکان، چوار شێری مێیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، لەوکاتەی چوار شێرە نێرەکە چاویان بەچوار شێرە مێیەکان کەوت، بەشێوەیەك هێوربوونەوە دەتگوت مەڕن، پاشان شێرەوانەکان بەبێ ترس شێرەکانیان لەعەرەبانەکە کردەوەو شێرە نێرەکانیش کەوتنەدوای مێیەکان ڕۆیشتن.

لەقسەکانی کلیۆپاتراو خوشکەکەی ئارسینۆهەو ئەوانیترەوە تێگەیشتم کەلەباغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییەدا شێرەنێرەکان لەمێینەکان جیادەکەنەوەو ناهێڵن ئەمانە لەتەك یەکتریدا بژین، تەنها لەهەندێك وەرزی ساڵدانەبێت. بوونی شێری مێ باشترین هۆکارە بۆ هێورکردنەوەی نێرەکان، چونکە هەر کەچاویان بەشێرە مێینەکان کەوت، یەکسەر دەکەونە جۆش وخرۆشی ئەوان وتووڕەبوونیان هێوردەبێتەوە.

لەوکاتەدا شێرەوانەکان، شێرە نێرەکانیان دەبردە دەرەوەی سێرکەکە، چەند کەس لەکرێکارانی سێرکەکە هەندێك خۆڵیان هێناو کردیانەسەر خوێنی خاوەن عەرەبانە سوورەکە، تاکورەنگ وبۆنی خوێن، شێرەکانیتر هارنەکات، لاشەی عەرەبانچییەکەشییان لەگۆڕەپانی سێرکەکە بدردە دەرەوە.
بەدرێژایی ئەوماوەیە هات وهاواری بینەران هەربەردەوامبوو، بەجۆرێك کەنەڕەی شێرەکان نەدەبیستران، خولی سێیەمی پێشبڕکێکە هاتەوە، بەڵام تائەوکاتەش عەرەبانچییەکانیتر نەیاندەتوانی خۆیان بگەیەننەوە عەرەبانچییە نازدارو لەشجوانەکە، ئەوکوڕە بۆ لێخوڕینی عەرەبانەکەی خۆی شێوازێکی تایبەتی هەبوو، کەئەوانیتر نەیاندەتوانی لاسایی ئەوبکەنەوە، پێموابوو شێرەکانی عەرەبانەکەی ئەو، باشتر لەشێری عەرەبانەکانیتر گوێڕایەڵی دەکەن، عەرەبانچییەکانیتر بۆئەوەی بتوانن کۆنترۆڵی شێرەکانیان بکەن، ناچاربوون ئاوسارەکانیان ڕابکێشن وهاواربکەن، بەڵام ئەوکوڕە گەنجە بەڕووکەش وادیاربوو هاواریان بەسەردا ناکات وبەردەوامە لەڕاکردن وجارجارەش ئەوداره درێژەی کەلەدەستیدابوو هێواش لەسەرشێرەکانی دەگێڕا، شێوازی لێخوڕینی عەرەبانەی کوڕە ناسك ولەشجوانەکە سەرنجی هەموو ئەندامانی پاشای ڕاکێشابوو.
– کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو نەیەتەپێش ئەوگەنجە دەبێتە یەکەمی پێشبڕکێکە.
– بەتلیمۆس، برای کلیۆپاترا، ستایشی لێوەشاوەیی عەرەبانچییە زەردەکەی دەکردو گوتی: سەیرکەن چۆن قیت لەسەر عەرەبانەکەی خۆی ڕاوەستاوەو بەپاش وپێش وئەملاولادا ناچەمێتەوە، لەکاتێکدا عەرەبانچییەکانیتر بەهۆی تەکاندانی شێرەکان جارێك بۆپێشەوەو جارێکیش بەپشتدا دەچەمنەوە، ئەگەر ئاوساری شێرەکانیان لەدەستدانەبووایە لەعەرەبانەکەیان دەکەوتنەخوارێ !
– هەروەها بەتلیمۆس کەبە تامەزرۆوە سەیری پێشبڕکێکەی دەکرد، گوتی: ئەوگەنجە ئەوەندە لەشولاری جوانە، دەبووایە پەیکەری ئەو وەك پەیکەری ئەپۆلۆن دروستبکرایە، تانەوەکانی ئاییندە بیانزانیبا لەم ڕۆژگارەشماندا لاوی بەژن وباڵاجوان هەبوون.
من لەستایشەکەی پاشا ئەوەندە دڵخۆش وخرۆشبووم، ئەگەر منیان بەوشێوەیە ستایشبکردایە، ئەوا هێندە دڵخۆشنەدەبووم وهەر وشەیەك کەلەدەمی ئەوانەوە سەبارەت بەوگەنجە دەهاتەدەرێ، لەدڵی مندا جێگای دەگرت، بینەران کەپێیانوابوو ئەو کوڕە لەشولارجوانە یەکەم دەبێت، هەڵسانە سەرپێ وبەهاوارەکانیان ئەوەیان نیشاندەدا کەحەزیان دەکرد ئەوسەرکەوتوو بێت وهاواریان دەکرد، کاڵ...کاڵ ، ئەوکاتە بۆم ئاشکرابوو ئەوکوڕە ناوی کاڵە.
– ئارسینۆهەی خوشکی کلیۆپاترا گوتی: ناوی ئەو عەرەبانچییە کاڵە، هەر لەبەرئەوەشە خەڵکەکە ناوی دووبارە دەکەنەوەو دەیڵێنەوە.
نازانم ئەوخەڵکە چۆن ناوی ئەوکوڕەیان دەزانی وناویان دەبرد، بەڵام ئەوناوە لەبەرگوێی من، ناوێکی زۆرخۆش وجوان بوو،
من چەندجارێك لەبەرخۆمەوە وشەی کاڵم دووبارەکردەوە.
پێشبینیکردنی ئەندامانی خێزانی پاشا سەبارەت بەکاڵ، ڕاست دەرچوو وعەرەبانەی ئەو لەپێشەوەی عەرەبانەکانیتر بەبەردەم لۆژی خێزانی پاشادا تێپەڕی وکاڵ بوو بەیەکەمی پێشبڕکێی ئەوڕۆژە.

کاتێک عەرەبانەکە بە بەردەم لۆژی خێزانی پاشادا تێپەڕی، ئەندامانی خێزانی پاشا دەستیان بەرزکردەوەو هاواری ستایشکردنیان بۆکرد، منیش هەردووک دەستم بەرەوکاڵ بەرزکردەوە، هەرچەندە دەمزانی ئەو من نابینێت، چونکە لەپشت ئەندامانی خێزانی پاشاوە ڕاوەستابووم، من ئەوم دەبینی، بەڵام کاڵ منی نەدەبینی.

دوای ئەوەی ئەو عەرەبانەیەی کاڵ بەبەردەممانـدا تێپەڕی، لەکاتێکدا پێشبڕکێکەش کۆتایی هاتبوو، بەڵام بەردەوامبوو لەسووڕانەوە، چونکە نەکاڵ ونەعەرەبانچییەکانیتر، نەیانـدەتوانی یەکسەر عەرەبانەکانیان ڕابگرن، بۆیە درێژەیان بەسووڕانەوەکەیان دەدا، تابتوانن خۆیان بگەیەننە دەروازەی سێرکەکە.

دواتر زانیم تائەوکاتەی دەتوانرێت شێرەکان لەوروژان هێمن بینەوەو کۆنترۆڵبکرێن وڕابگیردرێن ، وەك چۆن سەرەتا هاتنەناو سێرکەکەو هێواش دەڕۆیشتن ونەوروژابوون، بەڵام کاتێك شێرەکان تووڕەبوون، عەرەبانچییەکە ناتوانێت ئاوساری ئەوانە توند ڕابکێشێت، هەتاڕایانبگرێت، چونکە شێرەکان ڕوو وەردەگێڕنەوەو پەلاماری عەرەبانچییەکە دەدەن ودەیکوژن.

ڕێگای وەستاندنی شێرە نێرەکان کەبەعەرەبانەکانەوە بەسترابوونەوە، ئەوەیە شێرە مێینەکانیان پیشانبدەن، هەربۆیە عەرەبانەکان هەڵدەسووڕێن، تابگەنە ئەودەروازەیەی کەلەوێدا کۆمەڵێك شێرەوان بەچەند شێرێکی مێینەوە وەستاون، هەتا پێشانی شێرە نێرەکانی بدەن.

وارێدەکەوێت لەخولی یەکەمی شێرە نێرەکان مێینەکان نەبینن، بۆیە خولێکیتریش دەخۆنەوەو عەرەبانچییەکانیش دەبێت لەگەڵیاندا خولبخۆنەوەو تاشێرە نێرینەکان مێینەکان دەبینن وسەرنجیان بەرەولایان کێشدەبێت ودەچنەلایان، ئەوکاتە هێوردەبنەوەو عەرەبانەکە دەچێتە دەروازەکەوەو دەڕۆن.

کاڵ پێش کۆتاییهاتنی پێشبڕکێکە لەسووڕی یەکەمدا نەیتوانی لەسێرکەکە بێتەدەرێ وجارێکیتر بەبەردەم لۆجی خێزانی پاشادا تێپەڕییەوەو خەڵك وەك پێشوو هاواریان بۆدەکردو شادمانی خۆیان دەردەبڕی، من دەمزانی تەنها سەرکەوتنی کاڵ نەبووەتەهۆی شادی خەڵکەکە، بەڵکو جوانی لەش ولاریشی کارگەری کردووەتەسەر بینەران.

ئەگەر یەکێك لە عەرەبانچییە دزێوەکان پێشبڕکێکەی ببردایەتەوە ، خەڵکی بەو شێوەیە شادمانییان دەرنەدەبڕی ، بەڵام کە بینیان سەرکەوتووەکە لاوێکی جوانی بەژن وباڵا ڕێکە، هاواریان دەکردو بەسەرکەوتنی ئەولاوە دڵشادبوون، کاتێك عەرەبانەکەی کاڵ لەسێرکەکە چووەدەرەوە، زۆر حەزم دەکرد لەسێرکەکە بچمەدەرەوەو خۆم بگەیەنمە ئەوگەنجە سەرکەوتووەو پێی بڵێم: ئەمڕۆ هەمووکەس بەسەرکەوتنی تۆ دڵخۆشن، بەڵام کەسیان بەقەد من بەوسەرکەوتنەت دڵشادنین و حەزدەکەم دەستم بخەمەسەر سینگ ولێوەکانت و بەوشێوەیەی دایك منداڵی خۆی دەلاوێنێتەوە، بتلاوێنمەوە.

پێمخۆشبوو بچم پێی بڵێم: کاڵ، ئایا دایکت زیندووە؟ ئایا بەدیداری کوڕێکی جوان ونازداری وەك تۆ، دڵشاد دەبێت و دەتلاوێنێتەوە؟

پێمخۆشبوو بچم پێی بڵێم: تۆ لەکوێ نیشتەجێیت، ئەوشوێنەی تێیدادەژیت شایستەی جوانی ونازداری تۆیە- یان وەك عەرەبانچییەکانیتر لەکوخێکی بچووك کەلەخشتی قوڕ دروستکراوە دەخەویت؟

حەزمدەکرد لێی بپرسم: خواردنی تۆ چییە؟ چونکە پێموابوو، ئەوگەنجەی ئەوەندە جوانبێت، دەبێت گوڵی نیلۆفەرو کاهوو[32] بخوات، نەك گەنم ولۆبیاو گۆشتی گیانداران، بەڵام لەبەرئەوەی کەنیزەکی کلیۆپاترابووم، لەترسی ئەو نەمدەتوانی لەدەوری ئەوان ولەکۆشکی پاشایەتی دووربکەومەوەو خۆم بگەیەنمە کاڵ.

32- کاهووی کێوی: لەکۆندا بەگیای پیرۆز ناسرابوو، لەمیسرداو لەسەردەمی پاشایەتی یۆنانیدا (پاشایەتی بەتالیسە) میسرییەکان، وەك باوکو باپیرانیان، کاهووی کێوییان بەگیایەکی پیرۆز دەزانی (و- فارسی)

پاش ئەوەی دوایین عەرەبانە لەگۆرەپانی سێرکەکە چووەدەرەوەو خەڵکەکە بێدەنگبوون ومنیش میوەو شیرینیم بۆخێزانی پاشا دەگێرا، هەتا تامی دەمیان بگۆڕن.
لەهەموو لایەکەوە بینەران دەستیانکرد بەکردنەوەی ئەوپڕیاسکانەی کەلەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان ودەستیان بەنانخواردن کرد، چونکە دەیانزانی پاش کۆتاییهاتنی پێشبڕکێی ڕاکردنی عەرەبانەی شێرەکان، ماوەیەکی دەوێت تانمایشێکیتر دەستپێدەکاتەوەو پێویستە خەڵك لەوهەلە وەربگرن ونانبخۆن.
زۆر لەفرۆشیارانی خۆراك، چاوەڕوانی ئەوکاتەیان دەکردو خواردنەکانیان کەبریتیبوو لەبابۆڵەنان ولۆبیای کوڵاو وهێلکەی کوڵاو، دەیانگێڕاو هاوری کڕیارانیان دەکرد.
خواردنی سەرەکی زۆرینەی خەڵکی ئەسکەندەرییەو شوێنەکانیتری میسر، بریتیبوو لەنان ولۆبیاو پاقلەو شەراب وگەنم. لۆبیاو پاقلە لەمیسردا بەشێوەیەکی زۆر دەچێندراو هەموو دەیانتوانی بەوخواردنانە سکیان تێربکەن.
دوای ئەوەی خەڵکەکە نانیانخواردو فرۆشیارەکان لەناوخەڵکەکە چوونەدەرەوە، نمایشی شەڕی کەرکەدەنەکان دەستپێکرد، کەرکەدەن لەشێر دڕندەترەو من لەباغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییەدا بیستوومە گیانلەبەری دڕندەتر لەکەرکەدەن بوونی نییە.
چەند قەفەسێکییان هێنا کەتایەیان[33] لەژێردابوو،

33- تایە: مەبەست لەچەرخی تەختەیە، کەئەوکاتە تەختەداری خڕیان دروستدەکردو ناوەکەیان کوندەکردو هۆرەیان تێدەبڕی ودەخولایەوەو لەسەری دەڕۆیشتن(وەرگێڕی کوردی)

هەر قەفەسێکیش کەرکەدەنێکی تێدابوون، ئەو قەفەسانەی کەرکەدەنەکانی تێدابوو، گا ڕایدەکێشان وچاوی گاکانیشیان بەستبووەوە، بۆئەوەی کەرکەدەنەکان نەبینن وبەبینینی ئەو دڕندەیە نەتۆقن، هەریەك لەوکەرکەدەنانە دووشاخیان لەسەر لووتیان هەبوو، کاتێك دەرگای یەکەم قەفەسیانکردەوە، کەرکەدەنەکەی ناوی لەقەفەسەکە هاتەدەرەوەو دەسیکرد بەڕاکردن و هەندێك بەناو گۆڕەپانی

سێرکەکەدا گەڕا، لەوکاتەدا کەرکەدەنێکی تریان لەقەفەسەکەیدا بەرداو ئەویش پاش کەمێك ڕاکردن، هەڵوێستەیەکی کردو بەرەو ڕووی کەرکەدەنەکەیتر چوو، ئەو دوو گیاندارە بەخێرایی بەرەو ڕووی یەکتر ڕایانکردوو بەشێوەیەك خۆیان بەیەکتریدادا، کەمن پێموابوو هەردووکیان مردن، یەکێك لەکەرکەدەنەکان لەژێر کاریگەری ئەو پێکدادانە کەوتە سەرزەوی، هەروەك بەردێك وابوو کەمنداڵێك بیهاوێت، بەڵام پاش ساتێك هەڵسایەوەو پەلاماری کەرکەدەنەکەی تریدا.

خزمەتچییانی باغی ئاژەڵان دوو کەرکەدەنی تریان بەرداو لەمەیدانی سێرکەکەدا ئەم دووانەش دەستیانکرد بەشەڕ، هەڵمەت وپەلاماردانی کەرکەدەنەکان لەهی شێرەکان ترسناکتربوو، هەرچەندە من شوێنی خۆم کەلەگەڵ خێزانی پاشادابووم، بەئەمین وبێترس دەزانی، بەڵام هەردەترسام وبیرم لەوەدەکردەوە هەرکاتێك هێرش بکەنەسەر بینەران، هەموویان دەکوژن.

هەریەکێك لەکەرکەدەنەکان لەکاتی هەڵمەت بردنیاندا هەوڵیاندەدا بەشێوەیەك پەلاماری بەرامبەرەکەیان بدەن، دوو شاخەکەیان لەورگی ڕۆبکەن، پێستی کەرکەدەن زۆر ئەستوورەو شاخی ئەمانە پێستی یەکتری بەزەحمەت کوندەکەن، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ پێستی شوێنەکانی تری لەشیان پێستی ورگیان کەمێك تەنکترە، کەرکەدەنەکانیش ئەوە دەزانن وهەولی ئەوەیاندەدا شاخەکانیان لەورگی یەکتری هەڵبچەقێنن وهەڵیدڕن، بەڵام ئەمانە هەوڵەکانیان بێهودەبوو وهەموو جارێك بەو لەش زەبەلاحەیان بەریەك دەکەوت، کاتێك لەشی کەرکەدەنەکان بەوتوندی وبەهێزییەوە بەیەکتریاندا دەدا، دەنگێکی لێوەدەهات وئەوەدەنگە لەناو سێرکەکەدا دەنگی دەدایەوە، شەڕی کەرکەدەنەکان ماوەیەکی خایاندو هیچ کام لەمانە نەیانتوانی بەسەر ئەویتریاندا زاڵبێت، سێرکەکە پڕبوو لەخەڵك، هەموویان چاوەڕوانی کۆتاییهاتنی ئەونمایشەبوون، چونکە چێژی خۆی لەدەستدابوو وبێتام ببوو، منیش پێموابوو ئەگەر پێشهاتێکی چاوەڕوان نکراو ڕوونەدات، چەند سەعاتێك هەر بەوشێوەیە نمایشی کەرکەدەنەکان بەردەوام دەبێت.

جووڵانەوەی ئەوگیاندارە ماندوو وتووڕانە، لێکهەڵسوڕان ونەڕەی تریشقە ئاسای ئەوانە لەگەڵ یەکتریدا، شێوەیەك لەبێزاری دروستکردو وردەوردە بینەران لەدرێژبوونەوەی نمایشەکەو بێئامانجی ململانێکە، بێتاقەت بوون وهاواریانکرد، کۆتایی بەشەڕی کەرکەدەنەکان بهێنرێت.

– کلیۆپاترا لەوئارسینۆهەی خوشکی پرسی: تۆ دەزانیت چۆنچۆنی کۆتایی بەشەڕی کەرکەدەنەکان دەهێنرێت؟

– خوشکەکەی وەڵامی دایەوەو گوتی: من ئەمە یەکەمجارمە شەڕی کەرکەدەنەکان دەبینم، لەبەرئەوە نازانم چۆن کۆتایی بەشەڕی ئەوگیانلەبەرانە دەهێنرێت، پاش قسەکەی ئارسینۆهە، کۆمەڵێك لەکرێکارانی باغی ئاژەڵان کەدواتر زانیم ژمارەیان دووسەد کەس بوو، بەمەشخەڵی گەورەی داگیرساوەوە هاتنەناو گۆڕەپانی سێرکەکەو بەرەوڕووی کەرکەدەنەکان چوون، ئەودووکەڵەی کەلەمەشخەڵەکان بەرزدەبووەوە، بەشێکی لەبۆشایی سێرکەکە مەیلەوتاریك کرد، بەڵام چوون بای شەماڵ هەڵیکردو دووکەڵەکەی پەرتدەکردەوە.

خێزانی پاشا باسیان لەوەدەکرد، کەرکەدەن لەدووکەڵ دەترسێت، بەڵام لەکاتی ڕۆژدا پرشنگی ئاگرەکە بەپێی پێویست نابینرێت، بۆیە لەئاگری مەشخەڵەکاندا شتێکیان دەسووتاند تاکو دووکەڵەکەی زۆربێت، بۆئەوەی کەرکەدەنەکان بزانن ئاگر بەرەو ڕوویاندێت.

مەشخەڵ بەدەستەکان بەرەو ڕووی کەرکەدەنەکان ڕۆیشتن، کاتێك ئەوگیانداره گەورانە ئاگرەکەیان بینی، ترسان و شەڕەکەیان ڕاگرت وخەریکی هەڵاتن بوون، بەڵام مەشخەڵ بەدەستەکان بەشێوەیەك دەوریان دابوون، بۆهەر لایەك ڕایانکردبا بەرەوڕووی ئاگر دەبوونەوەو تەنها یەك ڕێگایان لەبەردەمدا کراوەبوو، ئەو ڕێگایەش دەچووەناو قەفەسە گەورەکانەوەو هەر کەرکەدەنێکیش کەدەچووەناو قەفەسێکەوە، یەکسەر دەرگای قەفەسەکەیان دادەخست وگایەکەیان دەنگدەدا بۆئەوەی کەرکەدەنەکە لەگۆڕەپانەکە ببەنەدەرەوە.

پاش کۆتاییهاتنی شەڕی کەرکەدەنەکان، دوایین نمایشی سێرکەکە دەستپێکرد، کەئەویش بەڕێز ڕۆیشتنی ئاژەڵانی باغی ئاژەڵان بوو، جوانی بەڕێز ڕۆیشتنی گیانلەبەرانی باغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییەی ئەم ڕۆژەم زۆر لاپەسەندبوو، باغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییە کەگەورەترین باغی ئاژەڵانی جیهانە، ئەوەندە گیانلەبەری هەیە، ئەگەر هەموو ئاژەڵەکانی ئەوباغە بهێنن بۆناو سێرکەکە ئەواجێگایان نابێتەوە، هەروەها لەبەرئەوەی هەندێك لەگیانلەبەرانی باغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییە دڕندەن، ناتوانرێت ئەوانە ڕامبکرێن، تابەشێوەی ڕیزبەندی بڕۆن.

باغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییە ئەوەندە گەورەیە، تەنانەت بۆدابینکردنی پێویستییەکانی ئاوی ئەوباغە، یەك جۆگەیان لەڕووباری نیلەوە ڕاکێشاوە، بەشێوەیەك پاش تێپەڕبوونی ئەوجۆگەیە بەناوباغی ئاژەڵاندا، جۆگەکە دەچێتەوەسەر ڕووباری نیل، ئەگەر ئەوئاوەیان لەنیلەوە بۆباغی ئاژەڵان ڕانەکێشایە، ئەوا هەندێك لەگیانلەبەرانی گەورەی وەك فیل وئەسپی ئاوی لەگەرماندا دەمردن، چونکە ئەوئاژەڵانە زیاتر لەئاژەڵەکانیتری وەك شێرو مەیموون و.. هتد، پێویستییان بەئاوە.

لەکاتی ڕۆیشتنی ئاژەڵەکان پۆلپۆل، سەرەتا فیلەکان هاتن وهەموویان عاجی ئەستووریان هەبوو.

کلیۆپاترا گوتی: بەگشتی تەمەی نزیکەی چل ساڵە، فیلەکان چوارچوار بەڕێز دەڕۆیشتن وهێواشهێواش هەنگاویان دەنا، بەهۆی هێواش هەنگاونانیان بەشێوەیەك ڕیزەکەیان ڕێکوپێکبوو، کەواتەدەزانی دەستەیەك سەربازن وبەبەردەم پاشای میسردا تێدەپەڕن. سەد فیلی گەورەی عاجدار لەونمایشەدا بەشداربوون، دوای ئەوەی فیلەکان تێپەڕین، ڕیزی زەڕافەکان دەرکەوت، کاتێك زەڕافەکان هاتنەناو گۆڕەپانی سێرکەکەوە، دەنگی قاقای بینەران بەرزبووەوە، چونکە ملی زەڕافە ئەوەندە درێژە کەمرۆڤ بەناچاری پێکەنینی دێت. زەڕافە سەرێکی بچووکی هەیە، بەڵام لەکاتی ڕۆیشتندا سەرە بچووکەکەی بەلای ڕاست وچەپدا دەسووڕێنێت وجووڵانەوەی سەری بەشێوەیەك پێکەنیناوییە، کەمرۆڤ ناتوانێت خۆی بۆڕابگیرێت، زەڕافەکانیش وەك فیلەکان چوارچوار بەڕێز دەڕۆیشتن، بەڵام هەرچوار بەهۆی نیرێکەوە بەیەکتریەوە بەسترابوونەوە بۆئەوەی زۆر لەیەکتری دوور نەکەونەوە.

ڕیزی زەڕافەکان وەك ڕیزی فیلەکان ڕێکو ڕاست نەبوون، زەڕافەکان بێئەوەی ساتێك لەسەربادان بەملاو بەولادا بوەستن، دەڕۆیشتن وسەرنجی بینەرانیان ڕادەکێشاو قاقاو تریقانەوەی خەڵکەکەیان زیاددەکرد، ژمارەی ئەو زەڕافانەش کەبەشداریان لەونمایشەدا کردبوو، وەك فیلەکان سەد دانەبوون.

دوای تێپەڕبوونی زەڕافەکان سەرەی ڕیزی بزنە کێوییەکان هات، بزنە کێوییەکانیان واڕامکردبوو کەچوارچوار بەیەك ڕیز بڕۆن وهەر ڕیزەشیان لەدەستی خزمەتچییەکی باغی ئاژەڵاندابوو، ئەمانیش سەد بزن بوون، کەبەشداریان کردو بەبەردەم دەممانداتێپەڕین وچوونە دەروازەی، چوونەدەرەوەی گۆڕەپانی سێرکەکە، دوای ئەوە نمایشی سێرکی ئەوڕۆژە کۆتاییهات و تێکڕا خەڵکەکە هەستان وبلاوەیان لێکردو بۆماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە، بۆئەوەی خەڵکەکە زووتر بچنەدەرەوە، هەموو دەرگاکانی سێرکەکەیان کردبۆوەو خستبوویانە سەرپشت.

هەموو بەیانییەك پاش ئەوەی کلیۆپاترا لەخەو هەڵدەستا، من عەترم بەگیانیدا دەکرد، کاتێك ویستبێتی نانبخوات، زوو لەبەردەمیدا دامدەنا، هیچ کاتێك خواست وئارەزوویەك نەدەهاتەناو دڵمەوە، کەوا هەستبکەم لێی بێبەشم ودەستم نایگاتێ و بمەوێ لەکلیۆپاترا دووربکەومەوە، بەڵام لەوڕۆژەدا هەستمدەکرد ناتوانم ئارام بگرم وبەهەر شێوەیەکبێت دەبێت بڕۆم وکاڵ لەنزیکەوە ببینم.

ئەوکەسانەی کەبۆ نمایشی سێرکەکە هاتبوون، بۆئەوەی بتوانن بگەنەوە عەرەبانەو ئەسپ وکەژاوەکانی خۆیان لەدەرەوە، بەرەو ئەوێ دەڕۆیشتن، وەك گوتم لەوشوێنەی کەئاگاداری چوارپێکانیان دەکرد، خەڵکەکە ئەشرافەکە سواردەبوون و دەڕۆیشتن، بەڵام کەژاوەی ئەندامانی خێزانی پاشایان هێنایەناو سێرکەکەوەو سواربوون ومنیش دوای ئەوان سواری کەژاوەکە بووم وبەڕێکەوتین.

من ئەوهەلەم قۆزتەوە کەلەماوەی کۆتاییهاتنی سێرکەکەو هێنانی کەژاوەی خێزانی پاشادابوو، لەبەڕێوەبەری سێرکەکەم پرسی: شوێنی نیشتەجێبوونی کاڵ لەکوێیە؟

- بەڕێوەبەرکە گوتی: شرمیون تۆ بۆچی شوێنی نیشتەجێبوونی کاڵم لێدەپرسیت؟

- منیش پێمگوت: ئەی بەڕێوەبەر تۆ پێویستە کەمێك هۆشت هەبێت، کاتێك من شوێنی کاڵت لێدەپرسم، ئەو زانیاری وەرگرتنە بۆخۆم نییە.

- بەڕێوەبەری سێرکەکە گوتی: شرمیون تۆ ڕاست دەکەیت، هیوادارم لەوبەدواداچوونەی ئێمە ببوریت، کاڵ لەشەقامی ئەرستۆ لەمیوانخانەی (سور) نیشتەجێیە، ئەرستۆ، یەکێکە لەفەیلەسوفەکانی یۆنان وماموستای ئەسکەندەربووە، کاتێك ئەسکەندەر شاری ئەسکەندەرییەی دورستکرد، هەموو شەقامەکانی بەناوی داناو فەیلەسوفەکان وناودارانی یۆنانییەوەنا،

(سور)یش یەکێکە لەشارەکانی سوریاو هەندێك لەئوتێلەکانی ئەسکەندەرییە ناوی شارەکانی سوریایان لێنراوە.

وەك لەمەوبەر گوتم، سێرکی ئەسکەندەرییە کەوتووەتە خوارووی ئەسکەندەرییەو بەردەم بینای سێرکەکە نزیکەی پێنج سەد هەنگاو بەتاڵە، کەشوێنی ئەسپ وعەرەبانەو کەژاوەی بینەرانەو لەوێدا نۆکەران ئاوساری ئەسپەکان بەدەستەوە دەگرن و چاوەڕوانی ئەوەدەکەن نمایشی سێرکەکە تەواوبێت وخاوەنەکانی ئەمانە بێنەوەلای ئەسپ وعەرەبانەو کەژاوەکانیان. ئەوکەسانەی کەنۆکەریشیان نییە، دەتوانن ئەسپ وعەرەبانەکانیان بەوکەسانە بسپێرن کەلەڕۆژانی نمایشکردندا دێن بەپارە چاودێری ئەسپ وعەرەبانەکان دەکەن، تانمایشی سێرکەکە تەواودەبێت.

دوای ئەوەی لەسێرکەکە چووینەدەرەوە، ڕۆژ کەمێکی بەبەرەوە مابوو، خاتوونەکەم حەزیدەکرد بچێت سەردانی باغی ئاژەڵان بکات، بەڵام ئارسینۆهەی خوشکی کلیۆپاتراو بەتلیمۆسی برای گوتیان: ماندووین وئەمڕۆ ئاژەڵمان زۆر بینیوە، باشتروایە بگەڕێینەوە کۆشکی پاشایەتی وپشوو بدەین.

منیش حەزم لێنەبوو بچین بۆباغی ئاژەڵان، جگەلەوی ئەو ڕۆژ ئاژەلمان زۆر بینیبوو، دڵم بۆ بینینی کاڵ لێیدەداو پێمخۆشبوو بەشێوەیەك بێت بتوانم زووتر لەکۆشکی پاشایەتی بێمەدەرەوەو خۆم بگەیەنمە کاڵ ولەنزیکەوە ببینم.

من نەمدەتوانی پێش گەیشتنەوەمان بەکۆشکی پاشایەتی لەخاتوونەکەم جیاببمەوە، چونکە هەرگیز لەودوور نەکەوتبوومەوە، ئەگەر گوتبام حەزدەکەم بڕۆم، ئەوا سەری دەسوڕما، تەنانەت بەدگومانیشی پەیدادەکرد، تائەو ڕۆژە تەنانەت بۆجارێکیش داوای مۆڵەتم لەخاتوونەکەم نەکردبوو، جگەلەکاتی خەو-یان تەواوبوونی کارەکانی ئەو نەبێت، دەنا تەواوی کاتەکانی خۆم لەگەڵ ئەودابوو ولێی نزیك بووم، هەرگیز حەزم نەدەکرد لەخاتوونەکەم دووربکەومەوە، هەرکاتێك کلیۆپاترا ماندوو دەبوو، من لەشیم دەشێلاو پێی دەگوتم: شرمیون. دەستی هیچ کام لەکەنیزەکەکانیتر بەقەد دەستەکانی تۆ نەرم ونیان نین.

دوای ئەوەی گەیشتینەوە کۆشکی پاشایەتی، کلیۆپاترا لەوانیتر جیابۆوەو چووە شوێنەکەی خۆی، منیش لەگەڵ ئەودا ڕۆیشتم.

کلیۆپاترا گوتی: شرمیون ئەمشەو کارم بەتۆنییە، ئەگەر ماندوویت بڕۆبخەوە، من لەبری ئەوەی بخەوم، لەکۆشکی پاشایەتی هاتمەدەرەوەو بڕیارمدا خۆم بگەیەنمە شەقامی ئەرستۆ لەئوتێلی(سور)[34] دا.

[34] ئوتێل سور: ئێمە بۆیە لێرەدا وشەی ئوتێل لەبری میوانخانە دادەنێین، نەك لەگەڵ میوانخانەی دیوەخان و ..هتد، جیانەکرێتەوە، چونکە ئەمەی دواییان خەو وخواردنی تێدا موفت وخۆڕاییە. بەڵام ئوتێل بەپێچەوانەوە(و- کوردی)

## لەمیوانخانەی سوور

زۆرجار ڕێکدەکەوێت شەوانە لەکۆشکی پاشایەتی بێمەدەرەوە، بەڵام هیچ کاتێك بەتەنهایی نەدەچوومە ناوشار- یان لەخزمەت کلیۆپاترادا بووم- یان چەند کەنیزەکێك ونۆکەرێك پێکەوە دەچووین بۆگەڕان، بەڵام ئەوشەوە بەتەنهایی لەکۆشکی پاشایەتی هاتمەدەرەوە، چونکە نەشمدەزانی شەقامی ئەرستۆ کەوتووەتە کوێوە، لەڕێڕەوانم دەپرسی تابزانم لەکوێدایە، هەندێك لەوکەسانەی دوای ئەوەی ڕێگای شەقامی ئەرستۆیان نیشاندەدام، پێشنیاری ئەوەیاندەکرد لەگەڵمدابێن تابمگەیەننە ئەوشوێنە، بەڵام من لەوپیاوانە دەترسام وپێمدەگوتن پێویستیم بەهاوەڵی ئەوان نییە، چونکە شەقامەکانی ئەسکەندەرییە بەشەو ڕووناکن، لەتاریکی نەدەترسام وبەخێرایی هەنگاوم هەڵدەهێنایەوە، ئەوەندە ڕۆیشتم تاهەستمکرد پێیەکانم ماندووبوون، بۆپشودان لەلێواری شەقامێکدا دانیشتم، یەکێك لەپۆلیسەکانی شەو لەتەك منەوە دەپەڕییەوەو منی بینی ولێیپرسیم: لێرە چی دەکەیت کچەکە؟

گوتم: دەمەوێت بچم بۆشەقامی ئەرستۆ، چونکە ماندوو بووم، لێرە دانیشتم تاکەمێك پشووبدەم.

گوتی: لەشەقامی ئەرستۆ چ کارێکت هەیە؟

گوتم: گەشتیارێك لەئوتێلی ئەوشەقامەدا نیشتەجێبووەو خزمی منەو دەمەوێت بچم بیبینم.

ئەو پیاوە، گوتی: ئەگەر هەڵسی وبکەویتەڕێ دوای دووسەد هەنگاویتر دەگەیتە شەقامی ئەرستۆ، ئایا ئەو چرایە دەبینیت کەکەوتووەتە ناوەڕاستی شەقامەکە؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: ئەوچرایە لەناوەڕاستی چوار ڕێیەکەدایە کەشەقامی ئەرستۆ لەوێوە تێدەپەڕێت، ئەم قسەیەی ئەو هێزی بەبەر منداهێنایەوەو هەڵسام وبەخێرایی هەنگاوم نان، تاگەیشتمە ئەو چوار ڕێیانە، چونکە نەشمدەزانی ئوتێل سوور کەوتووەتە کوێی ئەوشەقامە، دووبارە لەخەڵکم دەپرسییەوە، بەردەوام بووم لەڕۆیشتن تاگەیشتمە ئوتێلەکە، ئوتێل سوور، دەرگایەکی بچوکی هەبوو، کاتێك کەمن چووەناوەوە، ڕێڕەوەکەی کەمێك تاریکبوو، ئەوپیاوی کەهەر زووزانیم میسری نییەو بیانییە، لێیپرسیم: کچەکە چ کارێکت هەیە؟

گوتم: هاتووم ئەوپیاوە ببینم کەلەم ئوتێلەدا نیشتەجێیە.

لێی پرسیم: ئەوپیاوە کێیە؟

پێم گوت: ناوی کاڵە،

کاتێك بۆم دەرکەوت ئەوپیاوە خاوەنی ئوتێلەکەیە.

لێی پرسیم: ئێستا تۆ دەتەوێت ئەو ببینیت؟

گوتم: بەڵێ، چونکە ڕێگاکەم زۆر دوورەو کاتێکیتر ناتوانم بێمەوە بۆ ئێرە.

خاوەنی ئوتێلەکە گوتی: ئێستا کاڵ خەوتووە، ئەگەر بڕۆیت وبەیانی بێیتەوە، دەتوانیت بیبینیت.

پێم گوت: ئێستا هیچ لەشەو تێپەڕنەبووەو کاتی خەوتن نییە.

خاوەنی ئوتێلەکە گوتی: ڕاستە ئێستا کەسانی ئاسایی ناخەون، بەڵام ئەوپیاوەی لەسێرکدا ململانێ لەگەڵ شێرەکاندا دەکات، بەشێوەیەك ماندوودەبێت پێویستدەکات زۆریش بخەوێت.

گوتم: لەوانەیە نەخەوتبێت وبتوانم ببینم.

خاوەن ئوتێلەکە گوتی: ئەوخەوتووە، سەبارەت بەمە دڵنیام.

گوتم: ئەو یەکێکە لەکەسوکارەکانم، ئەگەر بزانێت من هاتوومەتە ئێرە بۆ بینینی، لەخەو هەڵدەستێت.

خاوەن ئوتێلەکە بەپێکەنینەوە گوتی: بەڵێ چونکە خەوتووە، ناتوانێت بزانێت کەتۆ هاتویت بۆ ئێرە، تابیبینیت.

پێم گوت: ناتوانیت خەبەری بکەیتەوە؟

خاوەنی ئوتێلەکە گوتی: من بۆم نییە ئەوکارە بکەم، چونکە ناوێرم.

پێمگوت: تۆ ژوورەکەیم پیشانبدە، من خۆم کاڵ بەخەبەر دەکەمەوە.

بەڕێوەبەری ئوتیلەکە گوتی: زۆرباشە من ڕازیم، چوکە تۆ خزمی کاڵیت، بچۆ بۆ ژوورەکەی، بەڵام دوای ئەوەی ئەوت بەخەبەرهێنایەوەو تووڕەبوو، ئەوا تۆ بەرپرسياريت.

لەدڵی خۆمدا گوتم، پاش ئەوەی کاڵم بەخەبەرهێنایەوەو ئەوم بینی، تووڕەشبێت کەخەوتەوە ئەو تووڕەییەی بیردەچێتەوە.

بەڕێوەبەری ئوتێلەکە گوتی: وەرە لەگەڵم.

منیش لەگەڵ بەڕێوەبەری ئوتێلەکە کەوتمەڕێو ئەوپیاوە بەپلیکانەیەکدا بردمییە سەرەوەو لەوێوە بەڕێڕەوێکی درێژدا تێپەڕین ولەکۆتایی ڕێڕەوەکەدا ژوورێکی پێنیشاندام وگوتی: ئەوە ژوورەکەی کاڵە.

لەوکاتەدا بەڕێوەبەری ئوتێلەکە گەڕایەوەو منی بەتەنها جێهێشت، تائەو شەوە ڕووینەدابوو من بچمەناو ژووری پیاوێکەوە، لەکردنەوەی دەرگاکە دەترسام، سەرئەنجام غیرەتم دایەبەرخۆم وبەهێواشی دەرگای ژوورەکەم کردەوەو دوای چوونەژوورەوە، بەهێواشی دەرگاکەم پێوەدایەوە.

یەك چرای خەفەکراو، لەسەرمێزێکی تەنیشت جێگاکەدابوو، ڕووناکی چراکە ئەوەندە کەمبوو کەمن سەرەتا لەژوورەکەدا هیچم نەدەبینی، دوای ئەوەی چاوم لەگەڵ تاریکییەکەدا ڕاهات وبەرچاوم ڕووناکبۆوە، بینیم کەسێك لەسەر تەختێکی خەو پاڵکەوتووە، لەسەر نووکی پێ بەهێواشی لێی نزیکبوومەوە، هەتادەموچاوی ببینم، بەڵام لەبەرئەوەی ژوورەکە تاریکبوو، نەمدەتوانی بەباشی دەموچاوی ببینم، یەك خێوی سامناك لەبالای ئەوپیاوەی خەوتبوو، دەهاتە پێشچاوم، زانیم بۆئەوەی ڕووی کاڵ ببینم، پێویستە ڕووناکی چراکە زیادبکەم، تالەبەر ڕووناکی چراکەدا دەموچاوی عەرەبانچییە یەکەمەکەی سێرك دەربکەوێت.

دەمی کاڵ نیوەکراوەبوو، بەشێوەیەك ددانە سپییەکانی دیاربوون، لەڕۆژدا لەبەرئەوەی من ئەوم لەدوورەوە بینیبوو، نەمدەتوانی پەی بەئاکارەکانی ئەوگەنجە بەرم، بەڵام لەکاتی خەوتندا توانیم بەباشی کاڵ ببینم، عەرەبانچییەکە کەلەوڕۆژەدا پێشبڕکێیەکەی بردبووەوە، لەوەجوانتر دەهاتەبەرچاو کەمن وێنام دەکرد، ئەو دوو بڕۆی کەوانەیی جوان وتەوێڵێکی بەرزی هەبوو، چونکە چاوەکانی لێکنرابوون نەمدەتوانی ڕەنگی چاوەکانی ببینم، بەڵام برژانگە درێژەکانی ئەوەیان نیشاندەدا

کەچاوەکانی کاڵ، وەك هەموو ئەندامەکانیتری جوان بێ، بەهەمان شێوە کەڕۆژ بینیبووم، دەموچاوی ئەوپیاوە سپی بوو وئەوەی دەردەخست میسری نییە، چونکە ڕەنگی دانیشتوانی میسر کەگەنمڕەنگێکی مەیلەو ئەسمەرن.

ڕووخساری سپی و ڕێکی ئەندامەکانی لەشی وجوانی لێوەکانی ئەوگەنجە، ئەوەی پیشاندەدا کەلەنەژادی یۆنانییە، بەڵام کەوانەیی دوو برۆ جوانەکانی ئەو، ئەوەیان دەگەیاند کەلەنەژادی سریانی- یان ئێرانییە، مووە ڕەشەکانی کاڵیش تائکیدیان لەسەر ئەو ئەگەرە ئەکردەوە.

کاتێك لەنزیکەوە جوانی ئەولاوەم بینی، زۆر دڵتەنگبووم، چونکە خۆم لەبەرامبەر ئەودا بەبچووك دەزانی، من میسریم هەرچەندە دزێویش نیم، بەڵام جوانی من جوانی میسرییە، هەموو دەزانن میسری هەرچەندە جوان نین لەڕووی چۆنێتییەوە ناگەینە جوانی یۆنانی وسریانی وئێرانییەکان. من لەدڵی خۆمدا بەرامبەر بەوگەنجە هەستم بەخۆشەویستی وهۆگریی زیاددەکرد، بەڵام پێشبینی ئەوەم دەکرد کەئەو من ببینێت، ئەوا مەیلی بەلای مندا نابێت وخۆشیناوێم، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەمن ناشرینم، بەشێوەیەك لەم بیرکردنەوەیە دڵتەنگبووم، کەوتمەگریان، من بەهێواشی دەگریام، لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی گریانی من کاڵی لەخەو بەخەبەرکردەوەو چاویکردەوەو منی بینی.

- کاڵ لەبینینی من لەژوورەکەیدا، سەری سوڕماو پرسیی: تۆ کێیت. لێرە چیدەکەیت؟

کاتێك کاڵ ئەم قسەیەیکرد لەسەرجێگاکەی نەجوولایەوەو تاسەریشی لەسەر سەرینەکەی بەرزنەکردەوە. ئەو گەنجە جوانە ئەم چەند وشەیەی بەزمانی میسری گوت، بەڵام من بەشێوەی ئاخاوتنەکەی زانیم بیانییەو بێدەنگ بووم، چونکە نەمدەزانی بڵێم بۆچی هاتوومەتە ژوورەکەی.

- کاڵ دووبارە پرسییەوە تۆ کێیت، لێرە چیدەکەیت و بۆهاتوویتە ئەم ژوورەو بۆدەگریت؟

گوتم: بۆ ئەوەدەگریم، چونکە تۆ زۆرجوانی وئەمڕۆ کەتۆم لەسێرکەکەدا دیی، وێنای ئەوەم نەدەکرد کەئاوا جوانبیت.

- کاڵ نەیتوانی تێبگات، من دەڵێم چی وگوتی: من لەشێوازی قسەکردنی تۆ سەرم سوڕماوە.

- لێم پرسی: بۆچی قسەکردنی من بووەتەجێگای سەرسوڕمانی تۆ؟

- کاڵ گوتی: لەبەرئەوەی بەشێوەیەك قسەدەکەیت، ئاشکرایەکە لەجۆری ئەو ژنانەنیت لەشوێنی ڕابواردنی گشتیدان.

- پێم گوت: تۆ پێتوایە من لەوجۆرە ژنانەم کەلەشوێنی ڕابواردنی گشتیدان؟

- کاڵ گوتی: کاتێك تۆم بینی، وامزانی لەئەوانی، چونکە ئەگەر وەك ئەوان نەبیت، لەکاتی شەودا ناچیتەژووری پیاوێکی نەناسراو.

- پێم گوت: تۆ بەهەڵەداچووی، من لەوجۆرە ژنانەنیم.

- کاڵ گوتی: بەڵێ من بەهەڵەداچووم، چونکە تۆ لەوژنانە باشتر گفتوگۆ دەکەیت، بەشێوەی دەربڕین وقسەکانتدا دیارەکە خوێندەواریت هەیە، چونکە هیچ میسریەك ئەگەر خوێندەواری نەبێت، ناتوانێت بەوشێوەیە قسەبکات.

– گوتی: بەڵێ خوێندەواریم هەیەو دەتوانم بنووسم وبخوێنمەوە، بەڵام ئەمجارەیان نۆبەی منە کەلەتۆ بپرسم، چونکە سەرم لەوقسەیەی تۆ سوڕماوە کەتۆ چۆن زانیت من خوێندەواریم هەیە؟ بۆتۆیش خوێندەواریت هەیە؟

– کاڵ گوتی: بەڵێ.

– پێم گوت: کاڵ، ئایا تۆ ڕاستدەکەیت؟

– ئەو گەنجە جوانە گوتی: بۆچی درۆدەکەم؟

– پێم گوت: تاکوئێستا کەنەمبیستووە عەرەبانچیی پێشبڕکێ، خوێندەواری هەبێت، چونکە ئەوپیاوەی خوێندەواری هەبێت، عەرەبانە لێناخوڕێت، بەڵکو لەژمێریاری دادەمەزرێت، ئەگەر نەشیتوانی ئەوالەکارە پیشەییەکانی تری دەوڵەدا کاردەکات، –یان ئەوەتا دەبێتە میراو وئاوی ڕووباری نیل بەسەر جووتیاراندا دابەشدەکات.

– کاڵ، گوتی: بەڵێ: لەمیسردا ئاوایە، ئەوکەسانەی خوێندەوارییان هەیە، نابنە عەرەبانچی وعەرەبانەی پێشبڕکێ لێناخوڕن، بەڵام لەهەندێك وڵاتیتر بەوشێوەیە نییەو هەندێك لەعەرەبانچییەکان خوێندەوارییان هەیە.

– لێم پرسی: تۆ دەتوانیت بەزمانی میسری بنووسیت وبخوێنیتەوە؟

– گوتی: بەڵێ، دەتوانم بەزمانی میسری بشنووسم وبشخوێنمەوە.

– پێم گوت: کاڵ، دەزانی ئەوقسەیەی تۆ چەند منی شادمانکرد؟

– کاڵ گوتی: بۆچی بەقسەکەی من شادمان بوویت؟

– گوتم: ئەمڕۆ کاتێك جوانی بەژن وباڵای نازداری تۆم لەسێرکەکەدا بینی، هەستمکرد شتێك بەرەوتۆم ڕادەکێشێت، بەشێوەیەك لەمەوبەر ئەوشێوە ئارەزووەم لەخۆمدا هەست پێنەکردبوو، کەبەلای پیاوێکدا سۆزم هەبێت، بەڵام ئەمڕۆ دوای ئەوەی تۆ سەرکەوتوو بوویت، گەیشتمە ئەوقەناعەتەی دەبێت خۆم بگەیەنمە تۆ ولەنزیکەوە تۆ ببینم، بەڵام شتێك هەیە منی هەندێك دڵساردکردەوە، ئەویش ئەوەبوو تۆ بەوجوانی ودڵگیرییەوە عەرەبانچیی پێشبڕکێیت لەمیسردا، کەسێکی خوێندەوار خەریکی کاری لەو شێوەیە نابێت، پێموابوو تۆش وەهەموو لێخوڕی عەرەبانەکانی پێشبڕکێکە، کەسانێکی نەخوێندەوارو بێئاگان.

– کاڵ گوتی: کچەکە وەك ئەوەوایە تۆخاتوو شازادەبیت، وائێمە بەچاوی سووکەوە سەیردەکەیت.

– پێم گوت: من شازادە خانم نیم، بەڵام لەگەڵ شازادە خانمدا گەورەبووم وهەر لەبەرئەوەشە هەڵسوکەوت وزەوقی من لەهی شازادە خانمان دەچێت. من پێموابوو کەتۆ لەنزیکەوە ببینم، لەوانەیە بێئومێدبیم وئەوەم بۆدەربکەوێت کەژیری تۆ بەئەندازەی جوانییەکەت نەبێت.

– کاڵ گوتی: من لەتۆم پرسی بۆچی گریایت، بەڵام تۆ وەڵامێکی دروستت نەدامەوە؟

– گوتم: کاتێك هاتمەناو ئەم ژوورە تۆخەوتبویت، بۆئەوەی کەتۆ باشتر ببینم، ڕووناکی چراکەم زیادکردو تۆم لەنزیکەوە بینی وزانیم زۆرجوانیت وئەمەش منی دڵتەنگکرد، چونکە پێشبینی ئەوەم دەکرد دوای ئەوەی منت بینی، لێم بێزاردەبیت و چارەت ناوێم.

– کاڵ گوتی: من لەبینینی تۆ بێزار نەبووم، چونکە خوێندەواریت هەیە، جگەلەوەی زۆر لەژنە دزێوەکان خاوەن دەنگێکی گەرم ودڵگرن ودەنگی تۆش ئەو واقیعەی تێدایە.

– من دووبارە دەستم بەگریان کردەوە،

– کاڵ پرسیی: بۆ دەگریت؟

– گوتم: من جوان وناسکۆڵەنیم، بەڵام پێموانەبوو کەدزێوم ، تۆ بەمن دەڵێیت دزێویت.

– کاڵ کەتا ئەوکاتەش ڕاکشابوو، هەستاو لەسەرجێگاکەی دانیشت وبەپێکەنینەوە گوتی: کچەکە من نەمدەویست بەتۆ بڵێم دزێویت، بەڵکو مەبەستم ئەوەبوو بڵێم، زۆرجار پەروەردگار دزێوی ژنێک بەدەنگێکی سازو دڵگیر هاوتادەکات وبەمەش ناشیرینییەکەی دەشارێتەوە. باشە تۆ ناوی من دەزانیت، بەڵام من تائێستاش ناوی تۆنازانم، پێم بڵێ ناوت چییە؟

گوتم: ناوم شرمیونە.

– کاڵ گوتی: شرمیون، یەکێکە لەناوە دێرینەکانی میسرو لەم ڕۆژانەدا کەمتر ئەوناوانە بەرگوێ دەکەون، خەڵك زیاتر ناوی یۆنانی ورۆمی لەمنداڵەکانیان دەنێن.

– گوتم: دایك وباوکی من لەوکەسانەبوون کەباوەڕیان بەناوە کۆنەکانی میسری بووەو ئەوناوەیان لەمن ناوە.

– کاڵ گوتی: باشە شرمیون، ئینجا بڵێ بۆچی هاتوویت بۆ ئێرەو چیت لەمن دەوێت؟

– گوتم: من هیچم لەتۆناوێت، تەنها حەزم دەکرد تۆلەنزیکەوە ببینم وپەنجەکانم لەلێوەکانی تۆ بخشێنم.

– کاڵ گوتی: دەزانم لەوڵاتی ئێوەدا ئەگەر کەسێك کەسێکیتری خۆشبوێت، ئەواپەنجەکانی بەلێوەکانیدا دەهێنێت، باشە وەرە پەنجەکانت بخەسەر لێوەکانم.

– من بەوەی کەزۆر حەزیشمدەکرد پەنجەکانم بخەمەسەر لێوی کاڵ، لەهەمان کاتیشدا زۆریش دەترسام لێی نزیك بکەومەوە.

– کاڵ گوتی: شرمیون دەترسیت کەلەمن نزیکبیتەوە؟

– گوتم: بەڵێ کاڵ، من لەنزیکەوە لەتۆ ترسم هەیەو لەهەمان کاتیشدا دەزانم دەبێت لەتۆ نزیکببمەوە، دواتر بەهەنگاوی کورتکورت لەوتەختەوە نزیکبوومەوە کەکاڵی لەسەربوو وپەنجەکانم ڕاستکردنەوەو لەسەر لێوی کاڵم دانان، هەرکە پەنجەکانم بەرلێوی کەوت، گیانم گەرم داهات، جۆرە لەزەتێك بەگیانمدادەهات، کەپێشینەی نەبوو، چەندجارێك پەنجەکانم بەهێواشی لەلێوەکانی کاڵ خشاندو پێمگوت، دەزانیت لێوەکانی تۆ چەند نەرم ونیانن؟

– کاڵ گوتی: نەخێر من ئاگام لەوەنییە.

– گوتم: کاڵ، تۆ لەنەژادی میسری نیت، چونکە جوانییەکەی تۆ لەوێنەی جوانی میسری ناچێت، ئایا دەزانیت خواکان چەند جوان تۆیان دروستکردووە؟

– کاڵ گوتی: ئاگام لەم مەسەلەیەش نییە.

– لێم پرسی: تۆ نازانیت کەقۆزیت؟

– کاڵ گوتی: تائەمڕۆ ئەوەم نەزانیوە.

– گوتم ئایا تابەئەمڕۆ کەسێك بەتۆی نەگوتووە ڕووی قۆزی ونازدارییەوە لەهەموو گەنجان جوانتریت؟

- کاڵ وەڵامی دایەوەو گوتی: نەخێر.

- گوتم: ئەمە شتێکی سەیرە.

- کاڵ گوتی: بۆچی؟

- پێم گوت: لەوانەیە دزێوی باش نەکەوێتەبەرچاو، بەڵام ناتوانرێت جوانی بشاردرێتەوەو نەکەوێتە بەرچاوی کەسانیتر، خەڵك کەپیاو- یان ژنێکی جوان دەبینێت، پێی دەڵێت خاوەنی ئاکاری جوانی وئەو لەمە ئاگاداردەکاتەوە.

- کاڵ گوتی: ئەوەی تۆ باسیدەکەیت، بەلای منەوە تازەیە.

ئاشکرابوو کەکاڵ ڕاستدەکات، لەوەگەیشتم ئەوگەنجە ئەوەندە سادەیە ناتوانێت درۆبکات، تائەوشەوە کەس بەئەوی نەگوتبوو لەڕووی ئاکاری جوانی دەمووچاو ولەشولارەوە لەخەڵکانیتر جوانترەو ئاوازی پێڕاگەیاندنی ئەمەی بەرگوێ نەکەوتبوو، گوڵەکانی باغی پاشایەتی میسریش ئاوان، چونکە کەس بەئەوان ناڵێن جوانن، لەقەشەنگی خۆیان بێئاگان.

- لێم پرسی: کاڵ تۆ لەکوێ بوویت، چیت دەکرد، تائێستا کەس بەتۆی نەگوتووە قۆزیت؟

- ئەو کوڕە گەنجە وەڵامی دامەوەو گوتی: لەچەند وڵاتێك بووم وخەریکی خوێندنی وەرزش بووم.

- گوتم: کاڵ، پێمخۆشە لێت بپرسم وبزانم باوکت کێیەو لەکوێیە، ئایا دایکت ماوە- یان نا؟ تۆ لەکوێ لەدایکبوویت وچۆن هاتیت بۆئێرەو بەشداری پێشبڕکێی عەرەبانەت کرد؟

- کاڵ گوتی: بۆ حەزدەکەیت ئەم شتانە بزانیت؟

- گوتم: چونکە بەدیتنت دڵشادبووم، مرۆڤ کاتێك بەدیداری کەسێك دڵخۆشدەبێت، حەزدەکات بزانێت ئەوکەسە لەکوێ لەدایکبووەو دایك وباوکی کێن؟

- کاڵ گوتی:من لەبیزانس[35] لەدایکبووم.

- گوتم: ڕەنگ وڕوخسارو پێستت، گەواهی ئەوەدەدەن تۆ یۆنانیت، هەروەها بیزانسیش یەکێکە لەشارەکانی یۆنانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێموایە تۆ یۆنانی بێخەوشنیت، چونکە مووی سەرووچاو وبرژانگەکانت ڕەشن ویۆنانییەکان موویان بەوشێوە نییەو موویان خورماییە، هەروەها شێوەی برۆکانت کەکەوانەییە لەبرۆی هاوڵاتیانی یۆنانی ناچێت، بەڵکو زیاتر لەبرۆی خۆرهەڵاتییەکان[36] ئەگەر تۆ لەشاری بیزانس لەدایکبوویت، ئەی بۆ برۆکانت ئاوایە؟

35- بیزانس: شارێکبووە لەسەر ڕۆخی بۆسفۆر، کەئەمڕۆ پێی دەگوترێت، ئەستەمبوڵ، واتا بەشی ئەوروپای تورکیا.
(وە- فارسی)

36-خۆرهەڵاتییەکان: مەبەست لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستی ئەمڕۆ وئاسیای ناوەڕاستە.(و- کوردی)

- کاڵ گوتی: لەبەرئەوەی باوکم ئێرانی بووە.

– لێمپرسی: مەبەستت ئەوەیە باوکت لەئێرانەوە کۆچیکردووە بۆبیزانس؟
– کاڵ لەوەڵامدا گوتی: بەڵێ، باوکم لەئێرانەوە چووە بۆ سوریاو ماوەیەك لەووڵاتەدا ژیاوەو لەوێ دایکم کەخەڵکی ئەوێ بووە، شووی پێکردووەو بوون بەهاوسەر، دواتر باوکم زانیویەتی لەبیزانسدا دەتوانێت باشتر بژێیت، ڕێگای ئەو شارەی گرتووەتەبەرو من لەوێ لەدایکبووم.
– پێمگوت: کاڵ، تۆ خوشك وبرات هەیە- یان نا؟
– کاڵ ماوەیەك بێدەنگبوو، پاشان گوتی: نەخێر، من براوخوشکم نییە.
– کەواتە دایك وباوکت تەنها یەك ڕۆڵەیان هەیە، ئەویش تۆیت؟
– دووبارە بەدوودڵییەوە ئەمجارەیان گوتی: بەڵێ ئەوان تەنها یەك ڕۆڵەیان هەبووە، ئەویش منم.
– لەوەوە تێگەیشتم کەدایك وباوکی نەماون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێمپرسی: ئایا دایك وباوکت مردوون؟
– کاڵ گوتی: بەڵێ مردوون.
– گوتم: بەلاوێتیدا دیارە کەبەگەنجی مردوون.
– کاڵ گوتی: پێشبینییەکەت ڕاستە، چونکە دایك وباوکم بەپیری نەمردوون.
– لێم پرسی: ئەی بەچی مردوون؟
– کاڵ وەڵامی دایەوەو گوتی: باوکم بەنەخۆشی کۆلێرا لەبیزانسدا چاوی لێکناوە، کاتێك نەخۆشی کۆلێرا بڵاوبووەوە، ماڵی ئێمە لەشار چوونەدەرەوەو بەرەو ناوچەیەکی شاخاوی ڕۆیشتوون وئەو ناوچەیە پەیوەندی لەگەڵ شاردانەبووە، لەوێدا نیشتەجێبوین ویستمان تائەوکاتەی نەخۆشییەکە نامێنێت بمێنینەوە، ئەوجا بۆبیزانس بگەڕێینەوە، هەندێك لەخەڵکی بیزانسیش بەهەمان شێوە شاریان جێهێشت وماڵەکانیان چۆڵکردو بەرەوچیاکانی خواروو ڕۆیشتن، چونکە وایان دەزانی نەخۆشی کۆلێرا لەدەریاوەدێت وبیزانسیش شارێکە کەوتووەتە ڕۆخی دەریا، باوکم بۆماوەی پێنج هەفتە لەوێ لەگەڵ ئێمەدابوو، بەڵام ڕۆژێکیان گوتی: پێویستە بۆ جێبەجێکردنی هەندێك کاری خۆی، بچێتەوە بۆ بیزانس.
– دایکم ڕازینەبوو وگوتی: چوون بۆ بیزانس ترسناکە.
بەڵام باوکم گوتی: من بیستوومە نەخۆشییەکە لەشاردا کەمبووەتەوە، کاتێکیش نەخۆشی کۆلێرا بکەوێتە کەمبوونەوە، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کەوتووەتە حاڵەتی نەمان وتامن دەگەمە بیزانس، ئەو نەخۆشییە لەناودەچێت.
باوکم کەوتەڕێ وڕۆیشت وئیتر ئێمە ئەومان نەدییەوە، ڕۆژێکیان بەئێمەیان گوت باوکم لەبیزانسدا بەنەخۆشی کۆلێرا مردووەو تەمری ئەویان ناشتووە.
من نەمتوانی لەکاتی تووشبوونی بەنەخۆشییەکە باوکم ببینم، بەڵام دوای ئەوەی ئەونەخۆشییە نەماو ئێمە گەڕاینەوە بیزانس، من گۆڕەکەی ئەوم بینی، لەوڕۆژگارەدا خەڵك ئەوەندە بەونەخۆشییە مردبوون، گۆڕەکان نەدەناسرانەوە، هەندێك لەوکەسانەی کەگەڕابوونەوە شار، نەیاندەتوانی گۆڕی کەسوکارەکانیان بدۆزنەوە، ئەوگۆڕەی کەپیشانی من ودایکمیاندا، گوایا هی باوکمە، ئێمە دڵنیانەبووین لەوەی ئەوەگۆڕی ئەوبێت.

دایکم گوتی: بۆئەوەی دڵنیابم لەوەی ئایا تەرمی باوکت لەوگۆڕەدایە، هەڵیدەدەمەوە بۆئەوەی تەرمەکەی ببینم، بەڵام ئەوانە کەبەرپرسی کاروباری گۆڕستان بوون، ڕێگایان پێنەداین، دایکم چوو بۆلای سەرۆکی شارەوانی بیزانس وشکاتیکردو گوتی: دەمەوێت گۆڕی مێردەکەم هەڵبدەمەوە بۆئەوەی دڵنیابم، ئایا ئەوتەرمەی لەوگۆڕەدایە مێردەکەمە- یان نا؟

- سەرۆکی شارەوانی بەدایکمی گوت: ئەگەر گۆڕی کەسێك کەبەنەخۆشی کۆلێرا مردبێت هەڵبدەیتەوە، تەرمەکەی بهێنیتە دەرەوە، دووبارە نەخۆشی کۆلێرا بڵاودەبێتەوە.

- دایکم گوتی: من تەرمی ئەو لەگۆڕەکەی دەرناهێنم وتەنها سەری کفنەکەی دەکەمەوە بۆئەوەی بزانم ئەوە- یان نا؟

- سەرۆکی شارەوانی گوتی: ئەگەر دەمی کفنی کەسێك کەبەنەخۆشی کۆلێرا مردووە بکەیتەوە، دووبارە ئەونەخۆشییە بڵاودەبێتەوەو ئەگەر تۆ دەمی تابووت مێردەکەت بکەیتەوە، دەبێتە هۆکاری مردنی هەزاران کەسیتر، ئەوتەرمەی کەلەو گۆڕەدایە- یان مێردی تۆیە- یان مێردی تۆنییە، ئەگەر مێردەکەت بێت، دڵنیا دەبیتەوە، خۆکەمێردەکەشت نەبێت، ئەوا تۆ ناتوانیت گۆڕی ئەو بدۆزیتەوە، چونکە ناتوانیت یەك بەیەك گۆڕی ئەوکەسانەی بەنەخۆشی تاعوون مردوون هەڵبدەیتەوە، تابزانیت کام لەوانە مێردەکەتە، دوای بیستنی ئەم قسەیە دایکم بێدەنگی لێکردو چاوپۆشی لەم کارەکردو بەردێکی بێدەنگی خستەسەر مەزارەکە.

لێم پرسی: کاڵ، کەی دایکت مرد؟

گوتی: دوای ئەوەی لەچیا گەڕاینەوە بۆ بیزانس، دایکم لەدووکانکەی باوکمدا دەستی بەکارکردنکرد.

- پرسیم: بۆچی باوکت دووکانی هەبوو؟

- کاڵ وەڵامێکی ڕەوانی دامەوەو گوتی: باوکم لەدووکانکەیدا ئاوریشمی دەفرۆشت.

- پێم گوت: من ناوی ئاوریشمم بیستووەو نمونەی ئەویشم بینیوە.

- کاڵ گوتی: لەبیزانسدا ئاوریشم نییە، بەڵکو لەئێرانەوە دەیهێنن، ئێرانیش ئاوریشم لەچینەوە دەهێنێت، باوکم کەئیرانی بوو، ئاوریشمی چینی لەڕێگای ئێرانەوە دەهێنا بۆ بیزانس وبەنرخێکی گران دەیفرۆشت.

دایکم کەلەبەردەستی باوکمدا شارەزایی لەبازرگانی ئاوریشم پەیداکردبوو، لەڕێگای کاروانچییان وبازرگانانی ئێرانییەوە ئاوریشمی دەهێناو دەیفرۆشت، بۆیە دوای مەرگی باوکیشم ژیانی ئێمە گۆڕانکاری بەسەردانەهات، بەڵام جارێکیتر ئەوبەڵایە لەناو شاردا بڵاوبووەوەو کۆمەڵێك خەڵکی تری کوشت، کەیەکێك لەوانە دایکم بوو ومن بەتەنهایی مامەوە.

- پێم گوت: کاڵ، دوای ئەوەی دایکت مرد، تۆ دووکانی ئاوریشم فرۆشتنەکەت کردەوە؟

- کاڵ گوتی: کاتێك دایکم مرد، من بچووکبووم ونەمدەتوانی دووکانەکە بکەمەوەو بەڕێوەی بەرم.

لەبیزانسدا ڕێسایەك هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێك منداڵێك بێکەسوکار دەمێنێتەوەو دایك وباوکی دەمردن، شارەوانی بیزانس کەسێك دیاری دەکەن کەسەرپەرشتی ئەو منداڵەبکات، وەك سەرپەرشتیاری ئەومنداڵە دادەنرێت وبەرپرسیارێتی ئەو دەگرێتە ئەستۆ، تائەو منداڵە گەورەدەبێت، بۆیە شارەوانی بۆئاگاداریکردنی من، یەك سەرپەرشتیاران دانا.

- گوتم: ئایا سەرپەرشتیارەکەی تۆ ناچاری کردیت بخوێنیت وبڕوانامەی زانستی وەرزش بەدەست بهێنیت؟

- کاڵ گوتی: سەرپەرشیارەکەی من کەسێکبوو خوێندەواری هەبوو وڕێنمایی منی زۆر دەکردو ئەوەی کەخۆی دەیزانی فێری دەکردم ومن توانیم ببمە خاوەنی خوێندەواری وبەزۆر فێربکرێم.

- گوتم: کەواتە سەرپەرشتیارەکەی تۆ بەزۆر فێری خوێندەواری کردیت؟

- کاڵ گوتی: بەڵێ، هەموو کەسێك ئەوەی کەدەیزانێت بەمنداڵەکەی خۆی دەڵێت وئەویش زانیارییەکانی خۆی بەمندا.

- پرسیم: بۆ بەزۆر خوێندن وفێرکردن لەشارەکەی ئێوەدا باوە؟

- کاڵ گوتی: بەڵێ شرمیون، لەشارەکەی ئێمەدا بەزۆر فێرکردنی خوێندەواری بووەتە پیشەو ئەوکەسانەی کەبتوانن لەپێشبڕکێی بەزۆر فێرکردن وخوێندەواریدا سەرکەوتووبن، خەلات وبەڵگەنامەی قانوونی پێدەدرێت.

- پێم گوت: بەڵام لەمیسردا بەوشێوەیە نییە.

- کاڵ گوتی: لەمیسریشدا بەوشێوەیەیە، بەڵام بەزۆر فێرکردنی شارەکەی ئێمە لەگەڵ ئێوەدا جیاوازە، لەئەسکەندەرییەدا بەزۆر فێری لێخوڕینی ئەوعەرەبانانەی کەشێری پێوە بەستراونەتەوە دەبن، بەڵام لەبیسزانسدا لێخوڕینی عەرەبانە کارێکی گرنگ وبەرجەستە نییە، چونکە لەوێدا شێر بەعەرەبانەوە نابەستنەوە، ساڵی یەکجار بۆماوەی دە ڕۆژ پێشبڕکێی ڕاکردن ڕێکدەخرێت و تیرو[37] قورس، هەڵدەدرێن و زۆرانبازی دەکەن، هەرکەسێك لەوپێشبڕکێیەدا یەکەم بێت، خەلات وەردەگرێت، جگەلەوەی ئەوکەسانەی لەوپێشبڕکێ وەرزشیانەدا یەکەم دەبن، موچەیان بۆدەبڕدرێتەوەو کێشەی بژێوی ژیانیان نییە.

- گوتم: کاڵ، بێگومان باوك ودایکی تۆ کەلەبیزانسدا مردوون، قۆزبوون وئەوجوانییەی تۆش لەوانەوە بۆتۆ بەجێماوە؟

- کاڵ گوتی: لەوانەیە من لەباوك ودایکم بچم.

- گوتم: ئێستا دەزانم کەدایك وباوکی تۆ کێبوون و بەچی مردوون، بەڵام نازانم چی وایکردووە تۆکە لەبیزانسدا دەژیایت، بێیت بۆمیسرو ئەمڕۆ لەم پێشبڕکێیەدا بەشداری بکەیت؟

- کاڵ گوتی: دوای ئەوەی سەرپەرتیارەکەم مرد، من جارێکیتر بەتەنهایی مامەوە، بەڵام ئەمجارەیان کەسێکبووم دەمتوانی خۆم بەڕێوەببەم وپێویستم بەچاودێرو سەرپەرشتیار نەبوو.

ئەو دەریاوان وبازرگانانەی کەدەهاتن بۆ بیزانس سەبارەت بەسامانی زۆری ئەم وڵاتە باس وپڕوپاگەندەی زۆریان دەکردو دەیانگوت:لەمیسردا زێڕوزیو بەشێوەیەك زۆرە کەبێبەهایەو ئەوەی بیەوێت ببێتە کەسێکی خاوەن سامانی بەتوانا، پێویستە ڕێگای میسر بگرێتەبەر، ئەمە جگەلەوەی کەسەبارەت بەئەسکەندەرییە شتی سەرنجڕاکێشیان باسدەکردو ئەوان دەیانگوت، ئەسکەندەرییە شارێکە لەهەر شوێنێکی ئەوشارەدابیت دەتوانیت بۆری ئاوبکەیتەوەو هەرچەند ئاوت بوێت دەستت دەکەوێت، چونکە لەهەموو ماڵ وڕێڕەوکانیدا بۆری ئاو هەیە.

- بۆ لەبیزانسدا لوولەی ئاو نییە[38]

– کاڵ وەڵامیدایەوە: نەخێر.
– لێم پرسی: هاوشارییەکەی تۆ لەکوێ ئاویان دەستدەکەوێت؟
– کاڵ گوتی: لەڕێڕەوەکانی بیزانسدا ئاوبە جۆگاکاندا دەڕوات وهەر کەسێك پێویستی بەئاوبێت دەچێتەسەر ئەو جۆگایانە.
– دواتر گوتی: ئەوشتانەی کەمنی بەرەو ئەسکەندەرییە ڕاکێشا، ئەوەبوو بیستم ڕێڕەو وشەقامەکانی میسر لەکاتی شەودا وەك ڕۆژ ڕووناکە، چونکە لەهەموو ڕێڕەوەکاندا لەسەرەتای شەوەوە تابەرەبەیان چرادەسووتێن، فانۆسی دەریایی ئەسکەندەرییەش وەك خۆر بەدرێژایی شەو دەسووتێت.
– هەروەها دەیانگوت: لەئەسکەندەرییەدا زێراب هەیە، من حەزم دەکرد ئەوشتانە کەبەلای منەوە تازەبوون ببینم.
– لێم پرسی: ئایا لەوشتانەی کەلەم شارەدا دیوتن ڕازییت؟
– کاڵ گوتی: هەرچی لەمشارەدا دیومە، بووەتەجێگای سەرنجی من وپێموانییە لەدنیادا شارێك هەبێت لەئەسکەندەرییە جوانتر.
– لێم پرسی: حەزدەکەم بزانم بۆچی تۆ لەمشارەدا بوویت بەلێخوڕی عەرەبانەی پێشبڕکێی سێرك؟

37– دیارە مەبەست لەئۆلۆمپییە. (و– کوردی)
38– مەبەست بەلوعەیە (و– کوردی)

کاڵ گوتی: ڕوونکردنەوەی ئەمە ئاسانە، من دوای ئەوەی هاتم بۆئەم شارە، زانیم دەبێت بژێوی ژیانم پەیدابکەم و بۆ دابینکردنی بژێوییش دەبێت کارێك پەیدابکەم، لەم شارەدا کەس منی نەدەناسی، هیچ کەس ئامادەنەبوو پارێزگاری لەمن بکات، کاتێك مرۆڤ بەبێ هیچ سەرمایەیەك دەچێتە شارێك، کەکەس نایناسێت، ناچارە ئەوجۆرە کارانەش بکات، کەحەزی لێنین، سەرەتا من چەند ڕۆژێك لەبارداگری بەندەردا کارم دەکرد، چونکە هێزو بازووم هەڵکەوتوبوو، خاوەن کارەکە لەمن ڕازیبوو، بەڵام من حەزم لەوکارەنەبوو، ڕۆژێکیان لەکاتی کارکردندا پیاوێك بەمنی گوت: باغی ئاژەڵان پێویستی بەچەند کرێکارێکە تائاگاداری ئاژەڵەکانی بکەن، ئەوکەسانەش هەڵدەبژێرن کەشان وبازوویان باشبێت. هەمان ڕۆژ چووم بۆباغی ئاژەڵان وخۆم ناساندو گوتم ئامادەم لێرەکاربکەم، کارکردن لەباغی ئاشەڵانیشدا سەختبوو، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ کارەکەی پێشوومدا کەمێك ئاسانترو ئابڕومەندتربوو، لەوێ بەبێ هیچ گرفتێك منیان وەرگرت وئیتر شەو وڕۆژم لەباغی ئاژەڵاندا بەسەردەبرد. هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کەچووم بۆباغی ئاژەڵان، منیان کردە چاودێریکاری شێرەکان، بەزووی لەنێوان من وئەو شێرانەی کەبەمن سپێردرابوون، هۆگری پەیدابوو، شێرەکان منیان دەناسییەوە، کاتێك دەیانبینیم ڕەفتاری وایاندەکرد نیشانەی ئاشنایی لێدەردەکەوت.
پاش ماوەیەك بە منیان گوت: دەبێت خۆت بۆلێخوڕینی عەرەبانەی ڕکابەری ئامادەبکەیت، لەو ڕۆژە بەدواوە هەموو ڕۆژێك شێرەکانم دەهێنانەدەرەوەی قەفەسەکانیان وبەعەرەبانەکەمەوە دەمبەستنەوەو بەناوباغە بەرفراوانەکەیاندا لێمدەخوڕین تاڕابێن، دیارە ڕۆژانی سەرەتا ئەوکارە سەبارەت بەمن

مەترسیداربوو، بەڵام وردەوردە شێرەکان ڕاهاتن کەبەعەرەبانەکە بیانبەستمەوەو بڕۆن، ڕۆژێکیان گوتیان: تۆ حەزدەکەیت لەوپێشبڕکێیەدا بەشداری بکەیت- یان نا؟

- گوتم: بەڵێ.

- گوتیان: دەبێت ئەو ڕۆژە تۆ بەشێریتر بەشداری پێشبڕکێکە بکەیت.

- گوتم: بۆچی؟

- لەوەڵامدا گوتیان: چونکە شێرەکانی تۆ ڕاهاتوون تۆ ببینن، لێخوڕینی ئەوانە لەلایەن تۆوە کەڵکی نییە، بۆیە دەبێت شێریتر لێبخوڕیت، بۆئەوەی کینەت لەبەرامبەردا پەیدابکەن. منیش ڕازیبووم وبەمنیان گوت، لەڕۆژی پێشبڕکێیەکەدا دەبێت زۆر وریابیت، عەرەبانەکە وەرنەگەڕێت، چونکە کەعەرەبانەکە وەرگەڕا، شێرەکان دەتخۆن.

- گوتم: من بۆمەرگ ئامادەم ولەهێرشی شێرەکان ناترسم.

- لێم پرسی: کاڵ، ئایا پێشبینی ئەوەت دەکرد کەلەو پێشبڕکێیەدا یەکەم دەبیت؟

- کاڵ گوتی: نەخێر. ئەمەم پێشبینی نەدەکرد، هەربۆیە بەسەرکەوتنی خۆم زۆر ڵخۆشم.

- لێم پرسی: کاڵ، لەمشارەدا چی لەهەموو شتێك زیاتر سەرنجی تۆی ڕاکێشاوە؟

- کاڵ گوتی: ئەوەی لەهەموو شتێك زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشاوە، کلیۆپاترای کچی پاشای میسرە.

- کاتێك گوێم لەم قسەیەبوو هەستمکرد دڵم دەستیکرد بەترپەترپ، تاچەند چرکەیەك قسەم نەکردو دواتر لێم پرسی، کلیۆپاترا، لەچ ڕووێکەوە سەرنجی تۆی ڕاکێشاوە؟

- کاڵ گوتی: لەڕووەوە جوانترین ژنە لەئەسکەندەرییەدا بینیبێتم، جارێکیتر دڵم دەستیکردەوە بەترپە تۆتکەو واملێهات ماوەیەك نوتقمگیراو قسەم نەکرد، ئینجا لەکاڵم پرسی، جگەلە کلیۆپاترا، لەم شارەدا ژنێکیترت نەبینیوە کەببێتەجێگای سەرنجت؟

- کاڵ گوتی: نەخێر شرمیون.

- لێم پرسی: ئەگەر کلیۆپاترا لێرەبێت حەزدەکەیت چی لێبکەیت؟

- کاڵ گوتی: حەزدەکەم تەماشای بکەم.

- پرسیم: ئایا کاڵ تۆ لەبینینی من زیاتر چێژ وەردەگریت- یان کلیۆپاترا؟

- کاڵ چەند ساتێك لەمنی ڕوانی ودواتر گوتی: شرمیون من نامەوێت شتێکت پێبڵێم کەببێتە مایەی دڵگرانیت ونیگەرانت بکات، بەڵام ئایا تۆ کلیۆپاترات بینیوە؟

- گوتم: بەڵێ.

- گوتی: ئایا ئەوت لەنزیکەوە بینیوە_ یان دووربەدوور؟

- گوتم: ئەوم لەنزیکەوە بینیوە، ئایا تۆش ئەوت لەنزیکەوە بینیوە؟

- کاڵ گوتی: بەڵێ.

- گوتم: کەی ئەوت لەنزیکەوە بینیوە؟

- کاڵ گوتی: ڕۆژێکیان کلیۆپاترا لەگەڵ چەند کەسێکیتردا هات بۆباغی ئاژەڵان ومن ئەوم بینی.

دڵنیابووم ئەو ڕۆژەی کلیۆپاترا چووە بۆباغی ئاژەڵان، منی لەگەڵدابووم، چونکە کچی پاشای میسر بۆهەر شوێنێك بچووایە منی لەگەڵ خۆیدادەبرد، بەڵام من لەوڕۆژەدا کاڵم لەباغی ئاژەڵاندا نەدیبوو،

چونکە ئەو لەوێدا کەسێکی دیارنەبوو، ئەوەی بووەهۆی ئەوەی من کاڵ ببینم، ئەوەبوو لەسێرکەکەدا بووبە کەسێکی دیار، ئەگەرنا بەرچاوم نەدەکەوت.

– کاڵ پرسی: من سەبارەت بەکلیۆپاترا لەتۆم پرسی، تۆش گوتت لەنزیکەوە دیومە، ئایا ئەو باشترە– یان تۆ؟

– گوتم: تێڕوانین سەبارەت بەباشی لەکەسێکەوە بۆکەسێکیتر جیایە، ئەوشتەی کەلەبەرچاوی کەسێك باشە، لەوانەیە بەلای کەسێکی ترەوە باشنەبێت.

– کاڵ گوتی: من بەشێوەیەکی گشتی دەڵێم، ئایا تۆ خۆت بەباشتر دەزانیت– یان کلیۆپاترا؟

– گوتم: کلیۆپاترا ژنێکی جوانە، هەر ژنێکی جوانیش بەئارایشتکردن جوانتردەبێت، یەکێك لەوشتانەی کەژن جواندەکات، پلەوپایەیە، تۆئەگەر کلیۆپاترا نەناسیت ونزانیت ئەوکچی پاشای میسرە، بینینی ئەو زۆر کارناکاتەسەر تۆ، بەڵام هەرکەزانیت کلیۆپاترا کچی پاشای میسرە، بینینی ئەو ژنە زۆر کاردەکاتەسەرت، چونکە پلەوپایەی ئەو بەشێکە لەجوانی ژن وجوانتری دەکات. کلیۆپاترا ژنێکە مووی ڕەشەو برۆی ڕەشەو چاوی هەنگوینییە، هیچ عەیبێکی نییە، جگەلەوەی کەمێك لووتی گەورەیە، هەرچەندە بچوکی دەم بەڕێژەیەکی زۆر لەگەورەیی لووت کەمدەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەوە سەبارەت بەکلیۆپاترا نوقسانییەو بۆیەش زۆر لەژنان کلیۆپاترا بەژنێکی جوان نازانن.

– کاڵ لێی پرسیم: چۆن. ئایا تۆ ئەوژنە بەجوان دەزانیت– یان نا؟

– گوتم: بەڵێ، من بەجوانی دەزانم.

– کاڵ گوتی: ڕاستییەکەی بڵێ، تۆ لەوجوانتری– یان ئەو؟

– گوتم: من لەسیمای خۆمدا هیچ کەموکوڕییەك نابینم.

– کاڵ گوتی: کەواتە تۆخۆت لەکلیۆپاترا بەجوانتر دەزانیت؟

– گوتم: بەڵێ، من لەکلیۆپاترا جوانترم.

– کاڵ گوتی: شرمیون، من نامەوێت شتێك بڵێم تۆ بڕەنجێنم، بەڵام پێویستە بڵێم تۆ بەهەڵەداچوی، چونکە ڕووخساری ئەو سپییە، بەڵام دەموچاوی تۆ ئەسمەرە. کلیۆپاترا ئاکاری یۆنانی هەیە، تۆ ئاکاری میسری، گەورەیی لوتی کلیۆپاترا نابێتە هۆی کەموکوڕیی ئەو، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوی جوانترکردووە.

– گوتم: کاڵ، تۆ ئەوەندە حەزت لەکلیۆپاترا کردووە، کەموکوڕییەکانیشی بەجوان دەبینیت.

– کاڵ گوتی: بۆئەگەر کەسێك کەسێکیتری بوێت، کەموکوڕییەکانیشی بەجوان دەبینێت؟

– گوتم: بەڵێ، ئەوە یەکێکە لەتایبەتمەندییەکانی خۆشەویستی.

– کاڵ گوتی: کەواتە دەڵێی لەڕابردوودا کەسێکت خۆشویستووە، کەموکوڕییەکانی ئەوت بەجوان دیون؟

– گوتم: نەخێر، من خواستی کەسم نەبووە، ئەم مەسەلەیەم لەکتێبی دیموکراتیسدا خوێندووەتەوە.

– کاڵ گوتی: دیموکراتیس لەکتێبەکەیدا دەڵێت چی؟

– گوتم: دیموکراتیس یەکێکە لەفەیلەسوفەکانی یۆنانی کەلەکۆندا ژیاوە، زۆر شتی گوتووە، لەمانەش سەبارەت بەپیاوێك قسەدەکات کەکچێکی خۆشدەوێت، ئەو کچە چاوێکی کوێربوو، شەلیش بوو. ڕۆژێك

ئەوکچە یەکچاو وشەلە قەولی جێژوانی پێدەدات لەیەکێك لەڕێگاکان، کوڕە گەنجەکە لەدەم ڕێگاکەدا دادەنشێت وچاوەڕوانی دەکات.

ئەم سەرگوزەشتەیە لەیۆناندا ڕوویداوە، یۆنانیش وەك خۆت دەزانیت ولەوێشدا ژیاویت، مەملەکەتی جوانانە، زیاتر لەسەد ژنی جوان بەوڕێگایەدا تێدەپڕن وهەندێك لەوژنانە نزیکی کوڕە گەنجەکە دەبنەوەو لێی دەپرسن: بۆچ لێرەو لەسەر ئەم ڕێگایە دانیشتوویت ؟ ئایا غەریبی وخانەخوێت نییە- یان ڕێگات لێونبووە؟

چونکە ڕۆژگارە کۆنەکان لەیۆناندا بەشێوەیەك پاکبوون کەژنی گەنج لەکۆڵانەکاندا قسەیان دەکرد، بێ ئەوەی کەس ئەو قسەکردنەیان پێ شتێکی سەیربێت. چەند ژنی جوان لەوکوڕە کۆدەبنەوەو قسەیان لەگەڵ دەکرد، ئەوسەرنجی هیچیانی نەدەدا، چونکە هیچ یەکێك ئەوانی بەهاوتای جوانی ئەودەزگیرانە یەکچاو وشەلەی خۆی نەدەبینی، دیموکراتیس بۆیە ئەوە دەگێڕێتەوە، تابڵێت: لەبەرچاوی ئەوکەسەی حەزی لەیەکێکیترە، هەموو کەموکوڕییەکانی خۆشەویستەکەی بەجوان دەبینێت.

- کاڵ گوتی: شرمیون، من خوازیاری کلیۆپاترانیم، بەڵکو وەك یەك پەیکەرساز سەیری ئەودەکەم وەرەخنەگرم نەك پیاهەڵدەر، من ئەگەر پەیکەسازبوومایەو بمویستایە پەیکەری ژنێك دروستبکەم، کەمێك لووتی ئەوم گەورە دروستدەکرد.

- گوتم: بەڵام ئەگەر من پەیکەرسازبوومایە، لووتی ئەوم زۆر بچووك دروستدەکرد، چونکە چەند لووتی ژن بچووکتربێت جوانترە، ئایا لووتی هەریسەت دیوە؟

- کاڵ گوتی: هەریسە کێیە؟

- گوتم: کاڵ، تۆ لەئەسکەندەرییەدا دەژیت ونازانیت هەریسە کێیە؟

- کاڵ گوتی: بەڕاستی نایناسم.

- گوتم: هەریسە هونەرمەندی شانۆیە، ژنێکە ئاوازەکانی ئەو لەیۆنان وڕۆم و سوریادا دەنگیداوەتەوە، تۆ چۆن لەم شارەدا دەژیت وئەو ناناسیت؟

- کاڵ گوتی: لەوڕۆژەوەی هاتووم بۆئەسکەندەرییە، نەچووم بۆشانۆ، تاهەریسە ببینم، هەموو کاتەکانی خۆم لەباغی ئاژەڵاندا بەسەربرد، لەگەڵ شێرو فیل و کەرکەدەن و زەڕافەو... ئاژەڵیتر.

- گوتم: دەتوانیت دووسبەی شەو بێیت بۆهۆڵی شانۆ؟

- کاڵ گوتی: دوو سبەی شەو بۆچی بێم بۆهۆڵی شانۆ؟

- گوتم: چونکە هەریسە لەڕۆڵی دیانای خوای شکاردا دێتەسەر تەختی شانۆ و تۆ ئەودەبینیت ولووتی بچووکی ئەوت دەکەوێتەبەرچاو.

- کاڵ گوتی: من ناتوانم دووسبەی شەو بچم بۆشانۆ، چونکە دوای ڕکابەرییەکە دوو ڕۆژ مۆڵەتم هەیە. ئایا تۆ دەچیت؟

- منیش گوتم: من لەم کاتەدا ناتوانم دڵنیابم لەوەی ئاخۆ دێم- یان نا؟

- گوتی: بۆ ناتوانیت گفتم پێبدەیت؟

گوتم: چونکە دەسەڵات لەدەستی خۆمدانییەو دەسەلاتم لەدەست کەسانی تردایە، ئەگەر ئەوبچێت بۆشانۆ، ئەوامنیش دەچم، ئەگەرنا، ناتوانم.

– کاڵ گوتی: ئایا ئیش دەکەیت، دەسەڵاتت لەدەست خۆتدانییە؟

– گوتم: کاڵ، کرێکارێك دەسەڵاتی لەدەست خۆیدایە، دەتوانێت کارنەکات وکەسیش ناتوانێت ناچاری بکات کاربکات، بەڵام من بۆیە دەسەڵات لەدەستخۆمدا نییە، چونکە کارەکەرم.

– کاڵ گوتی: کەنیزەکیی کێیت؟

– گوتم: ناتوانم پێت بڵێم کەنیزەکی کێم، بەڵام تۆ دووسبەی شەو بۆبینینی هەریسەی ئەکتەر بچۆ بۆ شانۆ، لەوانەیە منیش بێم بۆئەوێ...ئاه... شتێکم وەبیرهاتەوە.

– کاڵ گوتی: چ شتێکت بیرهاتەوە؟

– گوتم: ئەوەی بەبیرم هاتەوە پەیوەستە بەتۆوە، ئەگەر دووسبەی شەو تۆم لەهۆڵی شانۆکەدا بینی، ئەوا پێت دەڵێم، ئەگەر نەشم بینیت، ئەواشەوی دواتر دێم بۆئێرەو بەتۆ دەڵێم، بێگومان تۆدوایین ڕۆژانی مۆڵەتەکەت لێرە بەسەردەبەیت؟

– کاڵ گوتی: بەڵێ، من هەموو ئەو ڕۆژانە لێرەدەبم، هەموو شەوێك لەم میوانخانەیەدا دەخەوم، بەڵام ئایا باشتروانییە کەئێستا پێم بڵێیت ئەوشتە چییە پەیوەندیی بەمنەوەهەیە؟

– گوتم: لەبەرئەوەی ئەوشتە مژدەیەکە، من ئەوەلێدەگەڕێم بۆ دووسبەی شەو- یان شەوی دواتر، لەم میوانخانەیەدا پێتدەڵێم، تابەبێ بەهانە نەیەم بۆلات.

– کاڵ گوتی: بەهەمان شێوەی ئەم شەو کەتۆ بەهانەت نەبوو بۆ هاتنەکەت، لەئایندەشدا دەتوانیت بەبێ بەهانە سەردانم بکەیت.

– کاتێك لەمیوانخانەی سور بۆکۆشك گەڕامەوە، پێم سەیربوو لەهەندێك لەماڵەکاندا چراهەڵکرابوو، هەتا چرای ژووری کلیۆپاتراش هەڵگیرسابوو.

بەخێرایی خۆم گەیاندەوە ژوورەکەی خۆم، کەلەتەك ژوورەکەی کلیۆپاترادابوو.

– خاتوونەکەم بانگی کردم وگوتی: شرمیون لەکوێ بوویت؟

– گوتم: خاتوونەکەم، ئەم شەو من نەمتوانی بخەوم، بۆئەوەی بتوانم خۆم ماندووبکەم، چووم بۆناو باغەکەو ماوەیەك پیاسەم کرد تاماندووبم ودواتر بگەڕێمەوەو بخەوم.

–گوتی: کەواتە ئاگات لەوشتە نییە کەڕوویداوە؟

– پرسیم: خاتوونەکەم چی ڕوویداوە؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەمشەو نێردراوێك لەلایەن (تەبس)ەوە هاتووەو نامەیەکی بۆباوکم هێناوە، لەونووسراوەدا باس لەوەکراوە، ڕەشپێستەکانی باشوور ڕاپەڕیون وبە بەلەمی زۆرەوە بەدرێژایی نیل بەرەوئەسکەندەرییە دێن، لەهەر شوێنێك بگەنە هەر ئاوەدانییەك، دانیشتوانەکەی دەکوژن وژنەکانیش ئەتکدەکەن وهەرچییەك خەڵك هەیەتی، بەتایبەت دانەوێڵە، دەستی بەسەردادەگرن، لەهەندێك شوێندا ئەوەندەیان خەڵك کوشتووە کەئاوی نیل بەخوێنی ئەوان سووربووە.

– گوتم: ئەی خاتوونەکەم، ئەمە هەواڵێکی ترسناکەو من بیستوومە هەرکاتێك ڕەشپێستەکانی باشوور ڕاپەڕیبێتن، هەموو هاوڵاتیان دەسەڵاتی پاشایەتییان خستووەتە مەترسییەوە.

- کلیۆپاترا گوتی: هەرساڵێك ئاوی نیل هەڵدەستێت و ئاوسواری زەوییە بەراوەکان نەبێت، ڕەشپێستەکان برسی دەبن و لەبرساندا ڕادەپەڕن، چونکە دەشزانن چەند بەرەو سەروو بچن، ئەوا بەئاوەدانیی زیاتردەگەن، لەبەرئەوەیە کەبەرەو سەروو هێرش دەهێنن.

- گوتم: بۆچی ئاوی نیل سەر زەوییە بەراوەکانی ڕەشپێستەکان ناکەوێت؟

- کلیۆپاترا گوتی: شرمیون، خۆت دەزانی وانەکانی جوگرافیات خوێندووە، لەبەرئەوە ئەگەر لەبیرت نەچووبێتەوە ئەوپرسیارەت لەمن نەدەکرد، زەوییە بەراوەکان[39] وجۆگاکانی باشووری میسر کەناوچەی ڕەشپێستەکانە، لەچاو ئاوی نیلدا بەرزترە. لەکاتێکدا زەوییەکانی دەم ڕووباری نیل لەمیسردا لەئاستی زەویدایە، لەبەرئەوەیە هەنێك ساڵ کەهەڵچوونی ڕووباری نیل زۆرنەبێت لەباشووری میسر، ئاوی ڕووبار ئەوەندە بەرزنابێتەوە تابتوانێت سواربێت بەسەر زەوییەکانیانداو زەوییەکانی دەم ڕووباری نیل پاراوبکات. جگەلەوەش کاتێك کەئاو کەم دەبێت، ڕەشپێستەکان ناتوانن لەڕێگای ئەوجۆگایانەی کەهەڵیانکەندووە کەڵك لەئاوی نیل وەربگرن وزەوییەکانیانی پێ پاراوبکەن وکشتوکاڵەکانیان وشکدەبێت و بەروبوومیان نایەتەبەر، بەڵام زەوییە بەراوەکانی میسر بەوشێوەیە نییەو لەکاتی هەڵچوونی نیلدا ئاوی ڕووبارەکە هەردوو لای زەوییەکانی دەم ڕووبارەکە دادەپۆشێت وکاتێك ئاوەکە کشایەوە، یەك توێژ سەماد لەسەر زەوییەکە دەمێنێتەوە کەباشترین پەیینی کشتوکاڵییە. لەزەوییەکانی میسردا هەتا ئەگەر ئەوساڵانەشی ئاوی نیل کەمیشبێت، دەتوانێت ئاوی نیل لەڕێگای ئەوجۆگایانەی کەلەهەردوو لای نیلەوە هەڵکەندراون، زاڵبن بەسەر زەوییەکانداو کشتوکاڵ وشك نابن.

- هەروەها کلیۆپاترا گوتی: بەپێی ئەونامەیەی کەهاتووە، وادیارە جگەلەکەمی ئاوی نیل، کشتوکاڵی ڕەشپێستەکان ڕووبەڕووی ڕەوە کوللەش بووەتەوە، بۆیە بەبرسییەتی ماونەتەوەو برسییەتی ئەمانەی وەك شێت لێکردووە، ئەگەر دەستبەجێ ڕێگا لەمانە نەگیردرێت لەوانەیە هەموو شارەکانی میسر تاڵان بکەن وڕەشەبکوژیی گشتی بکەن.

39- بەراو: مەبەست لەزەویی دەم ڕووبارەکان- یان زێ- یان دەریا- یان ئۆقیانووسەکانە،کاتێك ئاوی ڕووبارەکان سێڵاو دەکات، ئەو زەوییانە پاراودەبن ودەکرێن بەکشتوکاڵ.وەك مڵکی دەم زێیێ. (و- کوردی)

## ئەسکەندەرییە لەبەردەم هێرشی باشوور نشینەکاندا

ئەوشەوە پاشا کۆبوونەوەی لەگەڵ لێپرسراوانیدا کرد، سەبارەت بەدانانی ڕێ وشوێن بۆشەڕکردن، سەرئەنجام بڕیار لەسەر ئەوەدرا، هەرچی سەرباز لەسەربازگاکانی دەمەنهور دایە، تەیاربکرێن وئامادەی

شەڕبن، جگەلە هێشتنەوەی چەند یەکەیەك بۆپاراستنی ئەسکەندەرییە، دەنا ئەویتر دەبێ بۆخوارووی میسر بنێردرێن.

ئینجا پاشا فەرمانی بەیەکە سەربازییەکانی کەلەخوارروی میسردا هەبوون، دا، خۆیان ئامادەیی جەنگ لەگەڵ ڕەشپێستەکان بکەن.

ڕۆژێك پێش ئەمە خەڵکی ئەسکەندەرییە زۆر دڵیان بەبینینی پێشبڕکێکەی سێرك خۆشبوو، بەڵام ئەمڕۆ غەم وپەژارە بەسیمایانەوە دیاربوو، هەموویان دڵەڕاوکێیانبوو دەبێ چی ڕووبدات، دەیانزانی ئەگەر ڕەشپێستەکانی باشوور خۆیان بگەیەننە ئەسکەندەرییە، ئەوا کەس خاوەنی ماڵ وگیانی خۆی نابێت، خەڵك لەشەقامەکانی شاردا هەتا لەشوێنی ڕابواردنی گشتیش کۆمەڵ دەبوون و سەبارەت بەهێرشەکانی ڕابردوی ڕەشپێستەکان دەمەتەقێیان دەکرد، خاتوونەکەی من کلیۆپاترا بۆئەوەی لەحاڵی خەڵك بزانێت، سواری کەژاوەکی بوو ومنیشی لەگەڵ خۆیدابرد، کاتێ ئێمە گەیشتینە شەقامەکانی شار، ترس ولەرز بەهەڵسوکەوتی خەڵکەوە دیاربوو ورەنگیان بزرکابوو کەکلیۆپاترایان دەبینی هاواریان دەکرد، بەڵای ڕەشەکان نزیکبۆتەوە.

من بەکلیۆپاترام گوت: ئەی خاتوونەکەم بۆناتوانرێت لەڕووباری نیلدا پێش بەڕەشپێستەکان بگیردرێت؟ کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر ڕەشپێستەکان لەڕێگای ئاسایی کەڕووباری نیلە، بێن، ئەوا ڕێگرتن لەوانە لەلایەن هێزی دەریایی ئێمە ئاسانە، بەڵام ئەوانە هەرکەزانیان ڕووبەڕووی بەرگریکردن بوونەوە لەدەشتاییەکاندا بڵاودەبنەوەو شەڕکردن لەگەڵ ئەمانە لەهەردوولای ڕووباری نیللەوە سەختدەبێت.

گوتم خاتوونەکەم: بیستومە ڕەشپێستەکان جارێکیتر تائەسکەندەرییە هاتوون؟

کلیۆپاترا گوتی: لەسەردەمی ئەسکەندەرەوە تائێستا ڕەشپێستەکان حەوت جار لەهێرشەکانیاندا خۆیان گەیاندۆتە ئەسکەندەرییەو هەمووجارێکیش ئەم شارە زۆرزیانی پێگەیشتووە، ئەوماتی وبێزارییەی ئەمڕۆش کەبەسیمای دانیشتوانی شارەوە دیارە، لەوڕاستییە مێژووییە سەرچاوەی گرتووە کەئەوان دەیزانن، یەکێك لەوهێرشانەی ڕەشپێستەکان لەسەردەمی بەتلیموسی دووەم باپیری مندابووە، هەمان ئەوپاشایەی فانۆسی دەریایی دامەزراندووە.

– من سەرم لەوقسەیە سوڕماو گوتم: چۆن ڕەشپێستەکان توانیویانە لەسەردەمی پیاوێکی وەك بەتڵیمۆسی دووەمدا کەکەسێکی ناودارو مەزن بووە، هێرش بکەنەسەر ئەسکەندەرییە.

– کلیۆپاترا گوتی: باپیرەی من هەرچەندە پاشایەکی گەورەبوو، بەڵام هەرگیز نەیتوانیوە بەربەرەوە کوولەو نەخۆشی کوڵێرە بگرێت، ڕەشپێستەکانیش شتێکی وەك کوڵێرەو ڕەوە کوللەن، ناتوانرێت پێشبینی ئەوە بکرێت چ کاتێك هێرشدەهێنن.

– لێمپرسی: لەسەردەمی باپیرەی دووەمی تۆدا کەڕەشپێستەکان هاتنەناو ئەسکەندەرییە ئەو چی کرد؟

– کلیۆپاترا گوتی: ڕەشپێستەکان لەڕێگای ڕووباری نیلەوە بەرەوسەروو هێرشدەکەن بەتڵیمۆسی دووەم پێیوابوو ئەگەر ڕێگای ڕووباری نیل لەوانە بگرێت، ئەوادەتوانێت نەهێڵێت ڕەشپێستەکان هێرشەکەیان بکەنەسەر ئەسکەندەرییە، بێئاگابوو لەوەی ئەگەر ڕەشپێستەکان زانیان ڕێگای ڕووباریان لێگیراوە لەدەشتایی هەردوولای لێوار ڕووبارەکەدا بڵاودەبنەوەو بەڕێگای پیادە خۆیان دەگەیەننە

ئەسکەندەرییە، هەرواشبوو ڕەشپێستەکان بەڕۆخی ڕووباری نیلدا هاتن هێرشیان کردەسەر ئەسکەندەرییە، لەکاتێکدا ئەسکەندەرییە سەربازی تێدانەبوون.

– لێمپرسی: دواتر چ ڕوویدا؟

– کلیۆپاترا گوتی: دوای ئەوەی ڕەشپێستەکان هاتنەناو ئەمشارەوە، هەرچی پیاوی بەگیریانهات کوشتیانن، هەموو ژنەکانیان ئەتککردن وهەموو ماڵی خەڵکیان بەتاڵانبردو ئیتر شار لەبەر بۆگەنی لاشە، بواری ژیانی تێدانەما.

– ئەوکارەی بەتلیمۆسی دووەم، توانی ئەنجامی بدات، ئەوەبوو کاتێ زانی ڕەشپێستەکان گەیشتوونەتەناو شاری ئەسکەندەرییە، لەنێوان ئەو وڕەشپێستەکانی کەهاتبوونەناو شارەوەو ئەوانەی خەریکبوو بێنەناو شار، هێرشی بدرو کردنی بەدوو کەرتەوە، تائەو ڕەشپێستانەی لەناو شارن، یارمەتی وپشتیوانی لەئەوانەی دوای خۆیانەوە پێنەگات، ئینجا هەموو گەنجی ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی خۆیدابوون، چەکدارکردن وبەرەو ئەسکەندەرییە کەوتەڕێ وگەمارۆی ئەم شارەیداو هەندێکیش لەهێزەکەی خۆی ناردبۆسەر بەندەرەکە، تاڕەشپێستەکان سواری کەشتی وبەلەمەکان نەبن ولەوێوە هێرشبکەنەسەر ئەسکەندەرییە، ڕەشپێستەکان توانیان ماوەی پێنج ڕۆژ لەئەسکەندەرییەدا بەرگری بکەن، بەڵام چوون لەچوارلاوە هێرشیان دەکرایەسەر، نەیانتوانی لەمەزیاتر خۆیان ڕابگرن ولەشکرەکەی باپیرەم هاتەناو شارەوە.

– لێم پرسی: دوای ئەوەی هێزی باپیرەت شارەکەی گرتەوە، چی لەڕەشپێستەکان کرد؟

– کلیۆپاترا گوتی: باپیرەی من پیاوێکی داناوبوو، بەڵام کرداروکارەساتی ڕەشپێستەکان لەسنووری تێپەڕاندبوو، بۆیەش فەرمانیدا هەموو ڕەشپێستەکان زنجیرکێش وکۆتیان بکەن ودواتر ناچاریان بکەن ئەولاشە کوژراوانەی خەڵکی کەخۆیان کوشتبوویانن بنێژن، دوای ئەوەی تەرمەکانیان بەخاکسپارد، باپیرم داوای لەکۆمەڵێك خەڵکی ئەسکەندەرییە کرد، ببن بەخۆبەخش بۆجەللادی، ژمارەی خۆبەخشان ئەوەندە زۆربوو بۆئەوەش نەتوانرا هەموویان وەربگرن، چونکە دەبا خەرجیات بکێشرابایە [40]

40- مەبەست لەخەرجی دانە بەوجەللادانە(و- کوردی)

باپیرەم هەرکۆمەڵێك ڕەشپێستی دایەدەست دەستەیەك جەللادو پێی گوتن، چۆنتان پێخۆشە ئاوا بیانکوژن(دوای تۆپاندنیان لاشەی ئەمانە بخەنە ڕووباری نیلەوە) بۆئەوەی ئاوتەرمی بۆ دەریا ببات، چونکە ئەو بوونەوەرانەی کەوەك دڕندەوان، شایستەی ئەوەیان نییە لەخاکی میسردا بنێژرێن.

ماوەی سێ ڕۆژ جەللادەکان خەریکی کوشتنی ڕەشپێستەکان بوون، بەهەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك ئەوەندەیان دەکوشتن لەبەیانییەوە تائێوارە هاواری ڕەشپێستەکان دەبیستراو بۆنی گۆشتی سوتاویش دەهات.

باسکردنی ئەشکەنجەدانی ڕەشپێستەکان لەمشارەدا دوورودرێژە، گێڕانەوەی دەبێتەهۆی کارتێکردنی خراپ، دوای سێ ڕۆژ یەك ڕەشپێستی دەستگیرکراو بەزیندویی نەمایەوە، تادواینیان کوشتن، دوای ئەم

ڕووداوە باپیرەی من بەتلیمۆسی دووەم، بڕیاریدا لەخوارووی میسردا دیوارێك دروستبکات بۆئەوەی ببێتە ڕێگر لەبەردەم هاتنی ڕەشپێستەکاندا.
بەتلیمۆسی دووەم گوتویەتی: فرعەونەکانی کۆنی میسر، بەرگەی ئەوهەموو خەرجییە زۆرەیان گرتووە بۆئەوەی شتێکی وەك ئەهرامەکان دروستبکەن کەبۆ خەڵك بچوکترین کەڵکی نییە، دەتوانین بەخەرجییەکی کەمتریش بەکەڵك وەرگرتن لەوزەی کاری خەڵکی میسر، دیوارێك لەخوارووی میسردا دروستبکەین بۆهەمیشە میسرییەکان لەمەترسی هێرشی ڕەشپێستەکان بپارێزێت.
باپیرەم دەستی بەدروستکردنی ئەودیوارەکردو چەندین خزمەتکاری لەخوارووی میسردا بۆئیشکردن لەودیوارەدا تەرخانکرد، بەڵام مەرگ بوای باپیرەمی نەدا ئەودیوارە تەواوبکات، دوای مردنی ئەویش ئەوکەسانەی بوونە پاشای میسر نەیانتوانی پەی بەگرنگی دروستکردنی ئەودیوارە ببەن، ئێستاش شوێنەواری ئەودیوارە لەخوارووی میسردا ماوە.
ئەو ڕۆژە کلیۆپاترا هەندێ بەناو شاردا گەڕا، کەگەڕاینەوە کۆشکی پاشایەتی، چوو بۆلای باوکی و گوتی، دانیشتوانی شار زۆر پەشۆکاون دەبێ بۆبەرزکردنەوەی مەعنەویاتی ئەوان، مشورێك بخۆی.
– بەتلیمۆسی سێزدەهەم لەکچەکەی خۆی پرسی چی بکەم باشە؟
– کلیۆپاترا گوتی: پێویستە فەرماندەرکەیت لەشاردا جاڕبدەن کەپاشا بۆ ڕێگاگرتن لەهێرشی ڕەشپێستەکان هێزی تەواوی ئامادەکردووەو بۆئەو ناوچانەی ناردووە کەئەگەری هاتنی ڕەشپێستەکان لێیەوە بەرەوسەروو هەیە، خەڵکینە دڵنیابن ڕەشپێستەکان ناتوانن خۆیان بگەیەننە ئەسکەندەرییە.
هەمان ڕۆژ جاڕچییەکان لەگۆڕەپانەکانی شارو فولکەکان وشوێنە قەرەباڵغەکاندا جاڕیاندا کەپاشا ئەو ڕێگایانەی گومانی ئەوەی لێدەکرێت ڕەشپێستەکان لێیەوەبێن سوپای ناردووەو نایەڵێت ئەوانە بگەنە ئەسکندەرییە، جاڕچییەکان خەڵکەکەیان هێورکردەوەو وەك شەوانیتر شوێنی ڕابواردنی گشتی پڕبۆوە لەپیاوی داوێن پیس ومێباز، بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر، ئەوکەشتییانەی کەلەخوارووی میسرەوە دەهاتن، هەواڵی بەرەوپێشهاتنی ڕەشپێستەکانیان بڵاوکردەوەو دەیانگوت ژمارەی ڕەشپێستەکان لەدووسەد کەس زیاترەو هەموویان پرچەکن وتیروکەوان ورم وگورزیان پێیەو دەگەنە هەر شوێنێکی ئاوەدان پیاوەکان دەکوژن وهەموو ژنکانیش دوای ئەوەی ئەتکیان دەکەن، لەگەڵ خۆیاندا دەیانبەن، دوای ئەوەی دەگەنە ئاوەدانییەکیتر یەك پیاو وژن ومنداڵی بەزیندویی تێدا نایەڵن، زۆر لەدانیشتوانی ئەسکەندەرییە لەبیستنی ئەم هەواڵانە، وایانلێهات بەکەشتی لەئەسکەندەرییە بڕۆن وڕووبکەنە سوریاو ڕۆم ویۆنان، لەڕۆژێکدا کرێی سواربوونی کەسێك لەکەشتی پێنج بەرامبەر بۆوە.
– لەوڕۆژەدا لەخاتونەکەی خۆم پرسی: ئەگەر ڕەشپێستەکان بگەنە ئەسکەندەرییە، ئایا پاشای میسر لەمشارە دەڕوات؟
– خاتوونەکەی من لەوەڵامدا گوتی: نەخێر شرمیون، باوکی من لەمشارە ناچێتەدەر، ئەو ڕۆژەی باپیرەم بەتلیمۆسی دووەم، لەشاری ئەسکەندەرییە چۆدەرێو بەرەوخوارووی میسر ڕۆیشت، دواتر بەسوپایەکی تەواوەوە گەڕایەوەو چواردەوری شاری گەمارۆداو هەموو ڕەشپێستەکانی کوشت، ئەسکەندەرییە نەکتێبخانەی هەبوو نەفانۆسی دەریایی ونەئەو تەلارە گەورانەی کەئەمڕۆ دەکەونە

بەرچــاو، لــەورۆژگارەدا هەرچــەندە شــەقامەکان هــەبوون و (دینــوکرات) ئەنــدازیاری بــەناوبانگی ئەسکەندەر[41]

41- مەبەست لەئەسکەندەری مەکادۆنییە.

ئاو وئاوەڕۆی ئەم شارەی دروستکرد زۆری دانیشتوان وئاوەدانی ئەمشارە وەك ئێستا نەبوو، ئەم شارە لەئەنجامی ئەرك وماندووبوونی دوازدە پاشای پشتاوپشتی من، ئاوا پێشکەوتووەو ئاوەدان بۆتەوە.

– گوتم خاتوونەکەم: داوای لێبوردنم هەیە، ئەو ڕۆژانەی کەتۆ منت لەگەڵخۆتدا دەبرد بۆژووری دەرس خوێـندن، لەوانـەی جوگرافیـاو مێـژوودا خوێنـدمان کـە(دینـوکرات) دوای مردنـی ئەسـکەندەر خـۆی کوشتووە .

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ شرمیون دیارە بیری تۆتیژە، من زۆر لەوشتانەی لای مامۆستا خوێـندمان بیرم چوونەتەوە، بـەڵام تـۆ لـەیادت مـاون، دینـوکرات کەنەخشەی شـاری ئەسـکەندەریەی کێشاو پلانـی ئـاو وئاوەڕۆی دانا، دوای مردنی ئەسکەندەر بەجۆرێك نائومێدبوو ئیتر نەیتوانی درێژە بەژیانی خۆی بدات وخۆی کوشت، بەڵام نەخشەی ئاو وئاوەڕۆی شاری کێشابوو ودوای مردنـی ئـەو باپیرانی مـن لەمانـەش بەتلیمۆسی دووەم، ئەو نەخشەیەی جێبەجێکرد.

– گوتم: کەواتە نەخشەی شاری ئەسکەندەرییە لەڕۆژگاری ئەسکەندەر[42]دا دینوکرات، کێشاویەتی؟

– کلیۆپاترا گوتی: نا، چونکە دینوکرات دوای کێشانی نەخشەی شاری ئەسکەندەریە چوو بۆ یۆنان، تاپەیکەری ئەسکەندەر دروستبکات.

– گوتم: بۆ دینوکرات پەیکەرتاشیش بووە؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەو بڕیاریدابوو کێوی (ئافس) لەیۆناندا بەشێوەیەك داتاشێت، پەیکەری ئەسکەندەر بەشێوەیەکی زەق لێی بەدیاربکەوێت، هەندێ کاریشی تێداکرد، بەڵام مـەرگی ئەسکەندەرو خۆکوشـتنی دینوکرات، کۆتایی بەوکارەهێنا.

– گـوتم خاتونەکـەم: پێتوانییە ئـەوپارەی باپیرەت بۆفانۆسـی دەریـایی خـەرجکردووە، بۆ دروسـتکردن وتــەواوکردنی دیوارەکــە بایــە باشــتربوو، تاڕێگــا لەڕەشپێــستەکان بگرێــت، ئایــا لــەقازانجی وڵات وشانشینەکانی میسردا نەبوو؟

– کلیۆپاترا گوتی: نەخێر، مەسەلەی ڕەشپێستەکان پەیوەندی بەباشووری میسرەوەیە، بەڵام فانۆسی دەریایی کەوتۆتە سەرووی میسرو ئەم دووانە لەگەڵ یەکتریدا جیاوازیان هەیە،

هەرچەندە باپیرەی من بۆ دروستکردنی فانۆسی دەریـایی ئەسـکەندەرییە، زۆری پـارە خـەرجکرد، گوایـە دەڵـێن هەشـسـەد (تالانـت)[43] زیـوی لەدروسـتکردنی ئـەم چـرایە خـەرجکردووە، بـەڵام لەبەرامبـەردا ئەسکەندەرییە بووبە گـەورەترین بەنـدەری دنیـاو ئەوقازانجـەی فانۆسـی دەریـایی بەئەسکەندەریەکەی گەیانووە، دەیانجار خەرجی دروستکردنەکەی تێهەڵێناوەتەوە،

42- مەبەست لە(دینوکرات)ە نەخشەسازی ئەسکەندەر(و- کوردی)

43- تالانت: پێوەرێکی کۆنە (وەك هۆقەی و تەغارو ڕبەی کوردی، هەر تالانتێك نزیکەی "26" کیلۆ دەکات، ئەمە وەك یەکەیەکی ژمێریاری بووە. سەبارەت بەزێرو زیوو، لەیۆناندا، یەك تالانت، ئەمڕۆ نزیکەی(5850) فرانك دەکات، دیارە وەرگێڕی فارسییەکە بەهەڵە نووسیویەتی: (32) کیلۆگرام دەکات. (وەرگێڕی کوردی)

ئەگەر لەشکرێك لەباشووری میسردا دانێن، ئەوا ڕەشپێستەکان هەرگیز ناتوانن هێرشبکەن، هەر کاتێ ئەوان (ڕەشپێستەکان) هێرش دەهێننەسەر ئەسکەندەرییە، ئینجا پاشاکانی میسر دەکەونە بیری ئەوەی لەشکرێك لەخوارووی میسردا جێگیربکەن، پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێکیش لەدانی خەرجی ئەولەشکرە بێزاردەبن ودەیانگێڕنەوە.

ئەو هەواڵە ترسناکەی کەدەریاوانەکان وگەشتیاران لەباشوورەوە دەیانهێنا، زۆر لەودڵدانەوەی جارچییەکانی پاشا بەهێزتربوون، لەڕۆژانی دواتردا نەك هەر دەوڵەمەندەکانی ئەسکەندەرییە بەرەو ڕۆم ویۆنان وسوریا ڕۆیشتن، بەڵکو خاوەنی خانووەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتیش کەداهاتی باشیان لەوشوێنە دەستدەکەوت، لەترسی ڕەشپێستەکان هەڵاتن وئەوژنانەی لەخانووەکانیشیاندا ئیشی تاترۆییان دەکرد، لەگەڵخۆیانیاندا بردن، چونکە ئەوژنانە بەشێکبوون لەسەرمایەی ئەوانە، کەسەبارەت بەهەندێ لەوکەسانە لەخانووەکانیان زیاتر بەنرختر بوون.

بەڕێوەبەری کتێبخانەکە چوو بۆلای پاشاو پێی گوت، من پێموایە ناتوانرێت پارێزگاری لەئەسکەندەرییە بکرێت، پێویستە فەرمان بەکەشتی بازرگانی وجەنگی بدەیت کتێبەکانی کتێبخانەکەمان بۆبگوازنەوە سوریا- یان ڕۆم.

بەتلیمۆسی سێزدەهەم گوتی: بەرگری لەئەسکەندەرییە دەکرێت وناهێڵم ڕەشپێستەکان پێبنێنە ئەسکەندەرییەوە.

- کلیۆپاترا پێش دوو ڕۆژ لەوەی ڕەشپێستەکان بگەنە دلتای ڕووباری نیل، چووبۆ کتێبخانەکەو وەك هەمیشە منی لەگەڵخۆیدا برد، بەڕێوەبەری کتێبخانەکە پێشوازی لەکلیۆپاترا کردو ترس ولەرزی خۆی لەهێرشی ڕەشپێستەکان بەکلیۆپاترا ڕاگەیاندو گوتی: ئەی کلیۆپاترا ئەو پەرتوکانەی لەم کتێبخانەیەدان، بەری ڕەنجی هەموو بیرمەندانی دنیایە، خۆئەگەر باوکت بەهای ئەوکتێبانە نەزانێت، ئەواتۆ دەزانی ئەم پەرتوکانە چەندە بەنرخن وهەر یەکێك لەم کتێبانە لەبەین بچێت، ئیتر بەدەست ناکەوێتەوەو بەپێی گوتەی ئەوگەشتیارانەی کەلەباشوورەوە دەهاتن ودەیانگوت ڕەشپێستەکان دووسێ ڕۆژیتر دەگەنە دەلتا(واتە دەگەنە شوێنێك کەلەوێدا ڕووباری نیل بەسەرچەند زێیەکدا دابەشدەبێت، زێیەکیان بەرەو ئەسکەندەریەدێت، بەدڵنیاییەوە ڕەشپێستەکان دەزانن کام زێیەیان دەچێتەوە ئەسکەندەرییەو لەوێوە شاڵاوەکەیان دێنن، چونکە ئەوانە بوونەوەی دڕندەن، دەست لەهیچ شتێك ناپارێزن و نایانەوێت هچ شتێك وەك خۆی بمێنێتەوە، ئەم کتێبانەش دەسوتێنن، من بەباوکم گوت، ئەگەر ناتوانرێت بەرگری لەم شارە بکرێت، باکەشتییەکان بێن وئەوکتێبانە بۆ وڵاتێکیتر ببەن، بەڵام باوکت بەمنی گوت: نایەڵم ڕەشپێستەکان بێنەشارەوە، من ناتوانم باوەڕ بەقسەکەی بکەم، چونکە ئەگەر باوکت توانیبای پێش هێرشی ڕەشپێستەکان بگرێت، تائێستا دەیگرت، لەم شارەوە یەك سوپای

گەورەیان بۆخوارووی میسر ناردووە، نابێ سوپای میسر لێگەڕێت ڕەشپێستەکان لەئەسکەندەرییە نزیک ببنەوە (بەڵام ئەوەتا دەبیستین ئەوانە گەیشتونەتە دلتاو تاچەند ڕۆژێکیتر دەگەنە ئێرەو کتێبخانەکەش دەسوتێنن ودەستخەڕۆمان دەکەن.

- کلیۆپاترا گوتی: من هەرکە لێرەوە گەڕامەوە، هەوڵدەدەم یەك هێزی خۆبەخش دروستبکەم بۆ ئەوەی بەرگری لەئەسکەندەرییە بکەن، کەئەم هێزشم دروستکرد بەشێکی تایبەتی بۆپاراستنی کتێبخانەکە دادەنێم، خەیاڵت ئاسودەبێ ئەگەر ڕەشپێستەکان بێنەناو ئەسکەندەرییەش ئەواناتوانن دەست بەسەر کتێبخانەکەدا بگرن وپەرتووکە بەنرخەکانی ئێرە لەناوبەرن.

بەڕێوەبەری کتێبخانەکە، بەم قسەیەی ئەو ورەی بەرزبۆوە.

ئینجا کچی پاشای میسر لەکتێبخانەکە هاتەدەرێ وسواری کەژاوەکە بووینەوەو ڕێگای کۆشکی پاشایەتیمان گرتەبەر، هەرکە گەیشتینە کۆشك، کلیۆپاترا چوو بۆلای باوکی وداوای لێکرد هەندێ پارەی بداتێ بۆدەستەبەرکردنی خۆراك وشتومەك بۆئەو لەشکرەی کەلەفیداییان دروستی دەکات.

- بەتلیمۆسی سێزدەهەم پرسی: دەتەوێت چ لەهێزی فیدای بکەی؟

- کلیۆپاترا گوتی: بۆ بەرگریکردن لەئەسکەندەرییەو بەتایبەتیش سورم لەسەرئەوەی بۆپاراستنی کتێبخانەکە، دەبێ ئەوهێزە دروستبکەین، ئەو سەربازانەی دێنەناو هێزی بەرگری میللی (بەبێ مووچە شەڕدەکەن، پێویستە ئێمە ئازووقەی ئەوانەبدەین) چونکە ئەوسەربازانەی لەحاڵەتی شەڕدان، ناتوانن کاربکەن بۆپەیداکردنی بژێوی خۆیان وخێزانەکانیان، ئێستا من فەرماندەدەم لەناوشاردا جاڕبدەین کەپاشا داوا لەهەموو دانیشتوانی ئەسکەندەیە دەکات، بێنە ڕیزی هێزی خۆبەخشانەوە، هەربەیانی چەك وپێداویستی سەرباز وەربگرن وخەریکی مەشقی سەربازین، هەتائەگەر ئەسکەندەرییە کەوتەبەر هێرشی ڕەشپێستەکان، ئەوان بتوانن بەرگری لێبکەن ،ئایا باوکە بەڕای تۆ، کۆشکی پاشایەتی باشە- یان یان باغەکە، بۆکۆکردنەوەو چەکدارکردنی فیداییەکان؟

- بەتلیمۆسی شمشاڵ ژەن، گوتی: کچم ئەگەر خەڵك بەپیر داواکارییەکەی تۆوەبێن، ئەوا کۆشکی پاشایەتی بۆئەمە بچوکە، دەبێ شوێنێکی بەرفراوان دیاری بکرێت بۆئەوانە، بەڕای من باشترین شوێن سێرکەکەیەو دەتوانی هەرلەوێدا ئەوفیداییانە چەکداربکەیت وبیاننێریت بۆیەکە سەربازییەکان.

- کلیۆپاترا گوتی: باوکە ئەم کارە لەدەست تۆدێت، دەبێ بەئەفسەرانی سوپای خۆت بڵێیت، ئەو خۆبەخشانە وەربگرن وبیانخەنە یەکە جەنگییەکانی خۆیانەوەو مەشقیان پێبکەن.

- پاشای میسر گوتی: من ئەوکارە دەکەم، بەڵام ئایا دەزانیت چەند کاتی دەوێت تادەستەیەك سەرباز بۆشەڕ ئامادە دەکرێت؟

- کلیۆپاترا گوتی: هەر چۆندێکبێت بوونیان لەنەبوونیان باشترە، ئەگەر نەتوانن پارێزگاری لەهیچ شتێك بکەن، بەدڵنیاییەوە دەتوانن کتێبخانەکە بپارێزن ونایەڵن ڕەشپێستە درندەکان کتێبخانەکە بسووتێنن.

- کاتێ پاشای میسر بینی ئەوەندە کچەکەی لەگوڕو دڵسۆزە بۆ بەرگریکردن لەئەسکەندەرییە، ڕازیبوو هەندێ پارە بدات بەکلیۆپاترا، بۆکڕینی پێداویستی وخۆراك بۆهێزی بەرگری میللی.

لەهەمان ڕۆژدا جاڕیان بەناوشاردداو داوایان لەپیاوانکرد، بەتایبەتی گەنجەکان کەسبەی بێن بۆسێرکەکە بۆبەشداریکردن لەهێزی فیدایید!.
کلیۆپاترا بەرەبەیانی زوو سواری کەژاوەکەی بوو ومنیشی لەگەڵ خۆیدا بۆسێرکەکە برد، کاتێ ئێمە گەیشتینە سێرکەکە بینیمان کۆمەڵێ ئەفسەرو سەربازیش لەوێدا ئامادەبوون، هەندێ لەفیدایییش هاتبوون بۆپەیوەندیکردن بەهێزی میلیییەوە (بەلام هەرکە هەتاو کەوت، نزیکەی دە هەزارکەس کەزۆربەیان گەنجبوون، لەمەیدانی سێرکەکەدا کۆبوونەوە)
خاتوونەکەی من لەکاتێکدا لەناو لۆژیکدابوو ومنیش لەتەکییەوە وەستابووم (ئەوانەی هاتبوون بۆ بەشداریکردن لەوهێزە بەبەردەم کلیۆپاترادا تێدەپەڕین وبەدەستوری سەربازانی یۆنانی دەستی ڕاستیان بەرزدەکردەوە)
لەپڕ چاوم بەپیاوێك کەوت وبینیم ئەو لەهەموو ئەوپیاوانە جوانترەو دواتر دڵە تۆتکەم گرت، چونکە زانیم ئەوپیاوە کاڵە، کەبڕیاروابوو من ئەو لەهۆڵی شانۆکەدا ببینم، بەلام مەسەلەی ڕەشپێستەکان بەشێوەیەك تەشەنەی کردبوو وترسی خستبۆ دڵی هەمووان، کەبەڕێوەبەرانی شانۆ لەپێشکەشکردنی شانۆکەیان پاشگەزببوونەوە، چونکە دەیانزانی خەڵك بەجۆرێ ترس وسامیان لێنیشتووە، کەس نایەت بۆشانۆ، چوون بۆشانۆ ودیتنی هەریسە لەڕۆڵی دیان، خەیاڵێکی ئاسودەی دەویست ودانیشتوانی ئەسکەندەریەش ئەوەندە بێخەم نەبوون، تابتوانن پارەی خۆیان بۆبینینی شانۆکاری ناودار هەریسە خەرجبکەن.
کاڵ هاتەپێشترو بەبەردەم کلیۆپاترادا تێپەڕی ودەستی بەرزکردەوە، تێبینیمکرد کاتێ کاڵ تێدەپەڕی ئەوەندە بەسوێ و وردییەوە سەیری کلیۆپاترای دەکرد، تامنی لەپشت خانمەکەشەوە نەدیت.
لەوچەند ساتەی کاڵ بەبەردەم کلیۆپاترادا تێدەپەڕی، دڵم بەتوندی لێیدەدا، زۆرم حەزدەکرد دەستم بەرزبکەمەوەو بجوڵێنم، بۆئەوەی سەرنجی کاڵ بۆلای خۆم ڕاکێشم، بەلام زانیم ئەگەر ئەوکارەبکەم ئەوا خاتوونەکەم تێی دەگات.
پەشۆکاوی ئەوکاتەم لەوەزیادیکرد کەکاڵ بەبەردەم کلیۆپاتردا تێدەپەڕی خاتوونەکەی منیش بەوردی سەیری کاڵی دەکرد، دوای تێپەڕبوونی ئەوڕووی بەلای وەرسوڕاندو گوتی: شرمیون ئایا ئەوگەنجە دەناسیت کەئێستا بەبەردەمماندا تێپەڕی؟
- منیش خۆم نەشارەزا کردو گوتم: خاتوونەکەم کام پیاوە دەڵێیت؟
- گوتی: ئەوپیاوە جوانە دەڵێم کەبەبەردەممدا تێپەڕی، وەك ئەوانیتر دەستی بەرزکردەوە، من ئەوم ناسییەوەو زانیم هەمان ئەوکەسەیە کەلەپێشبڕکێی سێرکەکەدا یەکەم بوو، بەژن وبالای ئەوم والەخەیاڵمدا ماوە، پێموایە لەئەسکەندەرییەدا کەس لەوجوانترنییە، پەیکەرتاشانی یۆنانی ئاگایان لەوگەنجەنییە کەلەم وڵاتەدا دەژیت، ئەگەر بیانزانیبا لەمیسرە دەهاتنە ئێرەو دەیانبرد بۆ یۆنان، تالەش ولاری ئەو دروستبکەنەوە، کاتێ کلیۆپاترا ئەم قسەیەی کرد، من ئەو قسەیەی ئەوم لەگەڵ ڕاکەی کاڵدا بەراوردکرد، کاڵ پێیوابوو جوانترین ژنی میسر، کلیۆپاترایە، کلیۆپاتراش کاڵ بەجوانترین گەنجی ئەسکەندەرییە دەزانێت، ئەم دووانە یەك بۆچوونیان سەبارەت بەیەکتری هەبوو، دووربەدووریش

یەکتریان لاپەسەند بوو، تائەو رۆژە من نەمدەزانی ئیرەیی چییە، زۆرجار گوێم لەو وشەیە دەبوو، بەڵام من هیچ ئیرەییەکم لەبەرامبەر هیچدا نەبوو، تالەو رۆژەدا بۆم دەرکەوت غیرە چییە.
کاتێ گوێم لێبوو خاتوونەکەی من ستایشی جوانی کاڵ دەکات وئەو بەجوانترین گەنجی ئەسکەندەریە دەزانێت، لەپڕ خۆم بەچارەڕەش وبەدبەخت دیتەوە، چونکە پێموابوو جوانی کاڵ نەدەبا سەرنجی ژنێکی وەك خاتوونەکەی من رابکێشێت، بەڵکو ئەوەمنم کەدەتوانم جوانی ئەوکوڕە ببینم وپەسەندبکەم وبەردەوام بیری لێبکەمەوە، کەسانیتر ئەوئامادەباشییەیان تێدا نییە، ئیتر بیرم لەوەدەکردەوە، خاتوونەکەی من کچی پاشایەو هەرچی بیەوێت دەتوانێت بەدەستی بێنێت وهەرکەسێك حەزبکات بەرەوخۆی ڕاکێشبکات، سەبارەت بەوگەنجی جوان کەمنیں وهەموو لاوەکانی میسر خوازیاری ئەوەن کلیۆپاترا ببێت بەئاشنایان، بەڵام هیچ یەك لەوانە سەیری من ناکەن، چونکە دەزانن من کارەکەرم، هەرچەندە کاڵیش سەبارەت بەمن هیچ هۆگریەکی لادروست نەبوو، بەڵام ڕێزدارانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدادەکردم، کاتێ من لەئوتێل سوور لەوجیابوومەوەو گەڕامەوە کۆشکی پاشایەتی، تێبینیمکرد لەمن بێزارنەبوو، بوونەجێی سەرنجی کاڵ لەلایەن کلیۆپاتراوە، مەسەلەی هێرشی ڕەشپێستەکانی لەبیربردمەوە، من ئەو رۆژە هیچ بیرم بەلای هێرشی ڕەشپێستکانەوە نەچوو، تەنها خەیاڵم لای کلیۆپاتراو کاڵ بوو.
رۆژی دواتر هەواڵی گەیشت ڕەشپێستەکان دلتایان[44] کۆنترۆڵکردووە،

44- دلتا: شوێنێکە ئەوکات ڕووباری نیل تێدا دابەشبووەبەسەر چەند زێیەکداو لەجیابوونەوەی ئەوحەوت زێیە، نێوانێکی وشکایی گەورە دروستبووە، ئەو زەویەش لەشێوەی یەکێك لەپیتەکانی یۆنانی چووە، ناویان لەوناوچەیەناوە دلتا، دواتر لەسەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلامدا، شاری قاهیرەی پایتەختی میسری ئەمڕۆ، لەسەر ئەوناوچەیەدا دروستکراوە، بەڵام ئەمڕۆ نیل تەنها دەبێت بەدوو بەشەوە کەناویان ناوە (دامیت و روزت) تائێستاش بەودوو بەشەی ڕووباری نیل دەڵێن: دلتای نیل.(و- فارسی)

ئیتر ژیانی ئاسایی لەئەسکەندەرییەدا ئیفلیج بوو، بەوەی پاشای میسرو کلیۆپاترا پەیمانیاندابوو بەرگری لەئەسکەندەریە بکەن، لەورۆژەدا هەموو دوکانەکانی ئەسکەندەرییە داخران وفرۆشتن وئالوویر هەڵگیرایەوە، لەکاتی ئاساییدا بەشێك شتومەك لەخوارووی میسرەوە دەهات، کەشتییەکان ئەوخواردنانەیان بۆئەسکەندەرییە دەهێنا، بەڵام چون ڕەشپێستەکان دلتایان گرتبوو، کەشتییەکان تەنها دەیانتوانی لەنێوان پێش دلتاو ئەسکەندەرییەدا هاموشۆبکەن ونەیاندەتوانی لەدلتا تێپەڕن. ئەو رۆژە ئێستا نیوەڕۆ دانەهاتبوو کەکلیۆپاترا سواری کەژاوەکەی بوو ولەگەڵ کۆمەڵێك سواردا ڕۆیشتین ولەشەقام وبازارەکانی شاردا گەڕاین، کلیۆپاترا سەیریکرد هەموو دوکانەکان داخراون و ئەوخەڵکەی دەیانەوێت شتبکرن، سەرگەردان ماونەتەوەو نازانن بۆکوێ بچن.
- کلیۆپاترا فەرمانیدا کەژاوەکە وەرسوڕێننەوە بۆکۆشکی پاشایەتی ویەکسەر چووەلای باوکی وپێی گوت: بۆ بڕیارێك دەرناکەیت دوکاندارەکان دەبێ دوکانەکانیان بکەنەوەو شتومەك بەخەڵك بفرۆشن؟
- باوکی گوتی: خەڵك دەترسێت وپێیانوایە ئەگەر دوکانەکانیان کراوەبێت ئەوارەشپێستەکان تاڵانی دەکەن.
- کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر ڕەشپێستەکان بێنەناو ئەمشارەوە داخرانی دووکانەکان ڕێگر نابێت لەبەردەمیانداو دەیانشکێنن وئاگری تێبەردەدەن، دەستبەجێ فەرماندەبکە جاڕبدەن دووکاندارەکان

دوکانەکانیان بکەنەوەو پێداویستییەکان بەخەڵك بفرۆشن، هەر فرۆشیارێکیش دوکانەکەی نەکردەوە، ئەوا لەلایەن مامورانی پاشاوە قفڵەکەی هەڵدەتۆقێندرێتەوەو دوکانەکان دەکرێنەوە، ئێستا شار نەکەوتۆتەبەردەم مەترسی جددی هێرشی ڕەشپێستەکان، تاخەڵك گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆنەبن وتۆش چاوپۆشیان لێبکەیت.

– بەتلیمۆسی سێزدەهەم، قسەی کچەکەی کاریتێکردو فەرمانیدا جارچییەکان جاربدەن، دەبێ دووکانەکان بکرێنەوەو شت بەخەڵك بفرۆشرێت، ئەوەی سەرپێچیشبکات ئەوالەلایەن مامورانی دەوڵەتەوە دوکانەکان دەکرێنەوە، ئەوفەرمانەی پاشا کاریگەری هەبوو، لەبەرئەوەی خاوەن دووکانەکان زانیان ئەوهەڕەشەیە بەڕاستییەو ئەگەر دوکانەکانیان نەکەنەوە، ئەوالەلایەن مامورانی پاشاوە قفڵی دووکانەکان هەڵدەپەڕێندرێن وهەرچی شتومەکی ناویەتی بەتاڵان دەبرێت، چونکە کەس دڵی بەماڵی بێخاوەن ناسوتێت، دوای ئەوەی دووکانەکان کرانەوە.

– کلیۆپاترا بەباوکی گوت: فەرمانێکیتر دەربکە، ئەویش ئەوەیە، هەڵاتنی خەڵك لەڕێگای دەریاوە قەدەغەیە.

– بەتلیمۆسی سێزدەهەم، ئەم ڕایەی کچەکەی پێ باشنەبوو وگوتی: یەکێك لەبەرەواجی وجوانییەکانی ئەسکەندەرییە، دەریاوانییە بەهاموشۆی کەشتییەکان بەئازادی، ئەگەرمن بڕیارێك دەربکەم خەڵك لەم شارە نەڕوات، دەبێت هەموو کەشتییەکان لەجموجوڵ بکەون، ئەمەش زیان بەکەشتیرانی ئازاد دەگەیەنێت، نابێ ئەوبۆچوونە بێتەپێش کەئێمە دەمانەوێت هاموشۆی دەریایی کەم بکەینەوە.

– کلیۆپاترا لەبەرامبەر بۆچوونەکەی باوکیدا قەناعەتی کرد، چونکە زانی باوکی دروست شتەکانی لێکداوەتەوە.

– پاشای میسر گوتی: پیاوی ئەم شارە دووجۆرن هەندێکیان بەغیرەتن وهەندێکیش ترسنۆك، ئەوانەی کارامەن ئەوانەن چوونەتەناو هێزی بەرگری میللی وئامادەن بەرگری لەشاربکەن، ترسنۆکەکانیش ئەوانەن دەیانەوێت لەڕێگای دەریاوە هەڵێن، بوونی ئەمانە لەم شارەدا کەڵکیان نییە، چونکە ئەوانە دەترسن شمشێر بەدەستەوەبگرن وبەرگری لەئەسکەندەرییە بکەن، کەسانی تۆقیو کاتێ لەنێوان کۆمەڵێ سەربازی ئازادابن ورۆحیەتی ئەمانیش لاوازدەکەن، باشترایە ترسنۆکەکان بڕۆن ودلێرەکان بمێننەوە، بۆئەوەی بتوانن باشتر بەرگری لەشاربکەن.

بەرووکەش شاری ئەسکەندەریە ئاسایی بۆوە، بەپێی فەرمانی پاشای میسرو کچەکەی کلیۆپاترا، ئەفسەرانی سوپا بۆمەشقدانی فیداییەکان بەخێرایی سەرقاڵی ڕاهێنانیان بوون.

من چون ژنم، هونەری شەڕنازانم، بەڵام گوێبیستبووم کەئەفسەرانی سوپا هەوڵدەدەن فیداییەکان خاوەن ئیرادەو دڵبەهێزبکەن، بەفێرکردنیان بەئەزموونی سەربازی ومەشقی بەردەوام، ئەوانە گورج وگۆڵ بکەن، ئەفسەرەکان بە خۆبەخشەکانیان دەگوت: ئێوە دەبێ لەگەڵ دژمندا بجەنگن، ئەو دوژمنە نازانێت شمشێر بەکاربێنێت، بەڵام بەغیرەتن، چونکە ئەوانە وەك دڕندەوان، کاتێ کۆمەڵێ دڕندە هێرشتان دەکەنەسەر، باشترین ڕێگاچارە ئەوەیە نەترسیت وبەرگری بکەیت، ڕەشپێستەکان چەند بەغیرەتبن لەشێر سەرکێشترنین، شێر کاتێ ڕووبەڕووی بەرەنگاری بەهێزبۆوە، دەترسێت و هەڵدێت.

یەکێك لەو دەستپێشخەریانەی کلیۆپاترا کەدڵی منی خۆشکرد، ئەوەبوو ڕۆژێ دواتر لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆسەیری مەشقکردی فیدایییەکان، چونکە کاڵیش لەنێوان ئەوسەربازانەدابوو، بەڵام کاتێ بینیم کلیۆپاترا تاوناتاوێك ڕوو وەردەگێڕێت وتەماشای کاڵ دەکات ولەهەموو سەربازەکانیتر زیاتر سەرنجی ئەودەدات، هەناسە ساردبووم، کاڵ لەهەموویان باشتر مەشقیدەکرد، بەجۆرێك ئەفسەرەکەی تەمرینی پێدەکردن، لەنێوان فیدایییەکانیتر دەرهێناو گوتی: ئەم گەنجە شایستەی ئەوەیە ببێتە ئەفسەری فیدایییەکان ومەشق بەئەوان بکات، بەتایبەت بۆ ڕم هاویشتن، لەوکاتەدا کاڵ بەپێی ڕەسمی سەربازی، سێ جار لەبەردەم کلیۆپاترادا ڕمەکەی هاویشت وهەمووجارێك ڕمەکە ئامانجەکەی دەپێکا، کلیۆپاترا بەلەقاندنی سەری ئاماژەی بۆ کاڵ کرد، کەنزیك بێتەوە لێی، من زانیم ئەوەتەنها بۆ ڕێزلێنان لەتوانای ئەونییە، بەڵکو دەیەوێت بەو بەهانەیەوە ئەوگەنجە جوانە لەنزیکەوە ببینێت.

کاڵ لەکلیۆپاترا نزیکبۆوە، وەك خۆی هەمیشەیی خۆی، بەسەری بڵندو سینگی دەرپەڕیوەوە، سەیری کچی پاشای میسری دەکرد.

هەرکەسێ لەوکاتەدا کاڵی دیتبا نەیدەزانی کەیەکێکە لەعەرەبانە چییەکانی پێشبڕکێکەی سێرك وکرێکاری باغی ئاژەڵانی ئەسکەندەرییە، چونکە ئەوکەسەی لەباغی ئاژەڵاندا خەریکی خزمەتکردنی گیانلەبەرانبێت، بەگشتی ئاوانین. کاڵ جلوبەرگی باشی لەبەردانەبوو، هیچ ئارایشتێکیشی نەکردبوو، بەڵام کاتێ لەبەرامبەر کلیۆپاترادا ڕاوەستا ئەوەی ئەوی بینیبا وایدەانی یەك شازادەیە، دوای ئەوەی کاڵ نزیکبۆوە کلیۆپاترا بەوردی سەیریکرد، منیش لەپشت خاتوونەکەی خۆمەوە وەستابوم وبەوردی لێم ڕوانی، من ئەوشەوە لەئوتێل سووردا، ئەوم لەنزیکەوە بینی، بەڵام دیتنی کەسێ بەشەو جیاوازە لەڕۆژ، بەشێوەیەك جوانی کاڵ بەرامبەر ڕووناکی خۆرەکەدا دەدرەوشایەوە، من لەدڵمەوە گوتم، ئەی کوڕی ئاکارجوان ئایاهەتاوی خۆری سیمای تۆ دەدرەوشێنێتەوە- یان تۆی کەتیشکی خۆر بەجوانیەکەی خۆت دەڕەنگێنی؟

- کلیۆپاترا خۆی بواردو بەشێوەیەك لەگەڵ کاڵدا دوا، گوایە نایناسێت ولێی پرسی، ناوت چییە؟

- گەنجەکە گوتی: ناوم کاڵە.

- کلیۆپاترا پرسی: خەڵکی کوێیت؟

- کاڵ گوتی: من لەبیزانس لەدایك بووم.

- کاڵ گوتی: لەڕووی زێدەوە یۆنانیم، بەڵام باوکم ئێرانی ودایکم سریانی بوون.

- من تێبینم کرد شێوازی قسەکردنی کاڵ لەگەڵ کلیۆپاترادا، وەك شێوازی قسەکردنی لەگەڵ مندایە، کاتێ لەئوتێل سووردابووین، من لەهەردوو چاوی ئەوکوڕەم دەڕوانین، چونکە دەمویست بزانم لەچاوەکانیا دیاردەکەوێت داخوا چ هۆگریەکی بۆکلیۆپاترا هەیە- یان نە، بەڵام من هەستم بەوەنەکردو کەمێ دڵم هاتەوەسەرخۆ، دواتر کلیۆپاترا ویستی شێوازی قسەکانی بگۆڕێت وبەشێوەیەك لەگەڵیدا بدوێت، کەکچی پاشای میسر ئەودەناسێت وگوتی: ئایا تۆ هەمان ئەوکەسەنیت کەلەپێشبڕکێی عەرەبانەکانی سێرکدا یەکەم بویت؟

- کاڵ گوتی: بەڵێ ئەی کچی پاشای میسر، من ئەوم.

- کلیۆپاترا لێی پرسی: ئایا تۆبەشدای شەڕتکردوون؟

- کاڵ گوتی: من هەرگیز بەشداری هیچ شەڕێکم نەکردووە.
- کلیۆپاترا پرسی: ئەی چۆن بەو لێزانییەوە ڕم دەهاوێژیت؟
- کاڵ گوتی: من هونەری هاویشتنی ڕم لەوەرزشگادا فێربووم.
- کلیۆپاترا گوتی: جگەلە هاویشتنی ڕم، کام چەکی جەنگیتر دەتوانیت بەکاربهێنیت؟
- لەوەڵامدا کاڵ گوتی: دەتوانم قورسی (سقل) هەڵبدەم.
- کلیۆپاترا گوتی: ئەوپیاوەی بتوانێت قورسی هەڵبدات، ئەوادەتوانێت بەردهاوێژی جەواڵیش[45] بێت، تۆ دەتوانیت لەمەیدانی شەڕدا، جگەلەهاویشتنی ڕم بەڕێگای هاویشتنی بەرد پاشەکشە بەدوژمن بکەیت؟

45- لەدەقە فارسییەکەدا(فلاخن) نووسراوە، لەکۆندا سەربازانی تیرهاوێژو ڕم هاوێژو شمشێر بەدەست وزۆر جۆریتری سەربازی تایبەن بەچەکێك هەبوون، کەئەمە تائەمڕۆش هەرباوە، وەك عدد دۆشکەو ڕەشاش وهتد...، فلاخن جۆرە چەکێکبووە کەکۆمەڵێ بەردیان لەناو تورەکەیەکی ئەستوور هاویشتووەو لەبەرەی شەڕدا بەدوژمنیانداداوە، ئەوتورەکەیە بەپێی وەسفەکەی زۆر لەجەواڵی کوردی- یان لەجۆری کوردی چووە، بۆیە ئێمە جەواڵمان داناوە.(و- کوردی)

- کاڵ گوتی: من تائێستا لەمەیدانی شەڕدا نەبووم، تابزانم دەتوانم ئەم کارەبکەم- یان نا.
- کلیۆپاترا گوتی: من دەزانم ئەوکارانەت پێدەکرێن وگومانم لەبەغیرەتیت نییە، چونکە کەسێك چوار شێری نێر بوروژێنێت ولێخوڕێت، دەبێ خاوەنی غیرەتی دلێرانەبێت.
- من نەمدەزانی مەبەستی کچی پاشا لەم قسانەی چییە؟

هەتا گوتی: کاڵ من دەمەوێت بەشداری لەشەڕدابکەم، ناڵێم دەتوانم شیمشێر بوەشێنم- یان ڕم بهاوێژم، بەڵام دەزانم بەشداریکردنی من لەشەڕدا، دەبێتەهۆی خۆڕاگری پیاوەکان بەتایبەت ئەوانەی تووشی گومان ودوودڵی دەبنەوە، لەوەی بەرگری بکەن- یان نا، من پەیمانم بەبەڕێوەبەری ئەم شارە داوە کەبەرگری لەکتێبخانەکە بکرێت، ئەوپەیمانەش دەهێنمەدی، دەبێ لەکاتی شەڕدا دەستەیەك لەفیداییەکان لەگەڵ مندابن، منیش هەڵبژاردنی ئەوکەسانە دەخەمە ئەستۆی تۆ، بەڵام تۆش لەگەڵ لێپرسراوەکانی سوپای میسردا مشوەرەت بکە، چونکە ئەوانە پیاوی جەنگین وبەشداری شەڕانیان کردووەو ئەزمونی وایانهەیە تۆنایزانیت، دوای ئەوەی سەربازە فیداییەکان هەڵبژێردران من تۆ دەکەم بەفەرماندەی ئەویەکەیە، تۆ دەبێتە لێپرسراوی ئەوسەربازانەی لەگەڵ مندا لەمەیدانی شەڕدا دەبن، هەرئەمڕۆ ئەوسەربازانە جیابکەرەوە، بۆئەوەی سبەی دەستەکەی تۆ مەعلومبێت.

## لەشەڕی دژبە باشوور نشینەکان
## بەرگریکاران لەئەسکەندەریە سەرکەوتووبوون

یەکەم ڕۆژی شەڕ کەلەمێژووی میسردا، بەشەڕی دلتا ناسراوەو لەسەردەمی بەتلیمۆسی سێزدەهەمدا، کەدلتای گرتەوە، دیاربوو ئامانجی ڕەشپێستەکانی دانیشتووی خوارووی میسر[46] کەلەبرسێتی وهەژاری سەرئەنجامی وشکەساڵی ونەبوونی دانەویڵەو بەرەوسەروو کشابوون وهێرشیان بۆسەر شاری ئەسکەندەرییەی پێشکەوتوو وخاوەن سامان هێنابوو، ئەوانە تێبینیی تەپۆلکەو بەرزاییەکان وباغەکانی نێوان زێکانی نیل وبیابانیان نەکردبوو ودەیانویست خێراتر خۆیان بگەیەننە ئەسکەندەرییە.

سوپای پاشای میسر لەسەری دلتاوە لەوناوچەیەی کەنیل تێیدا دابەشدەبێت بەسەر چەند زێیەکدا، پێشی بەڕەشپێستەکان گرت وهەندێکی لێکوشتن، کاتێك ڕەشپێستەکان زانییان ناتوانن یەکسەر بەرەو ئەسکەندەریە بچن، تاکتیکی دێرینی خۆیان گرتەبەرو سووربوون لەسەر ئەوەی لەڕێگای ترەوە خۆیان بگەیەننە ئەسکندەرییە، ئەو ڕێگایەی تریش بریتیبوو لەگرتنەبەری زێکانی کەلەڕووباری نیل دەبوونەوەو ئەوزەوییانەی کەوتبوونە نێوان هەردوولای خۆرهەلاّت وخۆرئاوای نیل، کاتێك ڕەشپێستەکان پلانی ئەوەیاندانا لەڕێگایترەوە خۆیان بگەیەننە ئەسکەندەرییە، سوپای پاشای میسریش ناچاربوو تاکتیکی شەڕکردنی ڕۆژگاری بەتلیمۆسی دووەم، بگرێتەبەر، واتا لەپشت ڕەشپێستەکانەوە بێن، تائەوانە لەئەسکەندەریەدا گەمارۆبدەن وبیانکوژن، بەلاّم بارودۆخی ئەسکەندەرییە لەسەردەمی باوکی خانمەکەم (کلیۆپاترا) واتا بەتلیمۆسی سێزدەهەمدا، لەسەردەمی بەتلیمۆسی دووەم جیاوازبوو، ئەوکاتە ئەسکەندەرییە هێزی بەرگریکاری نەبوو، بۆیە ڕەشپێستەکان توانییان بچنەناو شارەوەو چییان لەدەستهات کردیان، بەلاّم لەسەردەمی بەتلیمۆسی سێزدەهەمدا هێزی فیدائی هەبوو، ئەوهێزە دەیتوانی بەرگری لەشاربکات، خۆئەگەر نەشتوانێت ڕێگری لەهاتنەناوەوەی ڕەشپێستەکان بکات، بەلایەنی کەمەوە دەتوانێت ئەوانە دوابخات لەهاتنەناوەوەیان بۆئەسکەندەرییە، تائەوکاتەی سوپای میسر لەپشتەوە زەبر لەڕەشپێستەکان دەوەشێنێت ولەناویان دەبات. لەبەرئەوەی کلیۆپاترا بەلێنی بەرگریکردنی لەکتێبخانەکەو پاراستنی دابوو، گروپی سەربازەکانی کەپارێزەری خۆی بوون، بەسەرکردایەتی کاڵ لەبەرامبەر کتێبخانەکەدا دامەزراندو بەکاڵی گوت: بەسەربازەکانی خۆت بڵێ هەرچۆنێکبێت نابێت ڕەشپێستەکان بچنەناو کتێبخانەکە، چونکە بەهای بەلای میسرییەکانەوە لەبەهای کەسەکان زیاترە، ئەگەر لەکاتی شەڕدا ولاّتێك کۆمەڵێك خەڵکی بکوژرێت، جێگایان پڕدەبێتەوە، چونکە دایکانی میسری دووبارە ڕۆڵەیان دەبنەوەو گەورەیان دەکەن وجێگای کوژراوەکان دەرگرنەوە، بەلاّم ئەگەر کتێبێك لەناوبچێت ئەوازیانێکە ناتوانرێت جێگای پڕ بکرێتەوە، هیچ شتێك شوێنی بەهای ئەوکتێبە ناگرێتەوە.

46- باشوری میسر : مەبەست لە سودانە، ئەوکاتە سەر بەمیسر بووە .. وەرگێڕی کوردی .

- کـاڵ گـوتی: تائـەو ڕۆژەی مـن وسـەربازەکانم زینـدووبین، نـاهێڵم یـەك ڕەشپێـست بـچێتەناو کتێبخانەکەوە.

- هـەروەها کلیۆپـاترا بـەکاڵی گـوت: منـیش لەگەڵتـدام جگەلـەوەی جارجـار شـوێنەکانی بـەرەی شـەڕ بەسـەردەکەمەوە، دەنا هەرلەگـەڵ ئێوەدادەبم، ئێوەش ئاگـادار دەکەمـەوە، نابێـت خۆتـان بەکوشـتبدەن، وانەزانن کەخۆتان بەکوشتدا من لـەئێوە ڕازیدەبم، بەسـەربازەکانت بڵێ ئەنجامـدانی ئەرکـەکانیان بریتـی نییە لەوەی خۆیان بەکوشتبدەن، بەڵکو ئەوەیە بەزیندویی بمێننەوەو ڕەشپێستەکان بکوژن، لەبەرئەوەی ڕەشپێستەکان پەلەیانە کەزووترخۆیان بگەیەننە ئەسکەندەریەو هەرئاوەدانی وگوندێك لەڕێگایاندابێت، ئـاگری تێبـەردەدەن وهـەر میـسرییەکیش دەبیـنن دەیکـوژن، چـونکە ئەمانـە دەزانـن کەمیـسرییەکان خەڵکانی خـاوەن سـامانن، شـارەکانیان ئاوەدانـە، کشتوکاڵەکانیان سـەوزە، لـەخانووی باشـدادەژین، ژن ومنداڵـەکانیان ئاسایـشیان هەیـەو تێرخـواردن دەخـۆن، بۆیـە ڕەشپێـستەکان ڕقیـان لەهاوسـێکانی سەروویان دەبێتەوەو چێژ لەکوشتنی میسرییەکان وەردەگرن، ڕەشپێستەکان ئەوەندە کەنەفت وبرسی وڕەجاڵبوون کەهـەرگیز تێرنـەدەبوون ولەهـەموو ئەوکاتانـەی کەبەخەبـەربوون، خـەریکی خواردنبـوون، کاتێك بەگۆشتی ماڵات وباڵندەکانی کەلەدەم ڕۆخی ڕووباری نیلدا زۆرن، دانەدەکەوتن، گۆشتی تیمساح وئەسپی ئـاوی ومـاری ڕووبـاری نیلیان دەخوارد، ئەوەش تایبەتمەندییەتی ئاژەڵی ئەمانەیە، بەهـەمان شـێوەی کەهەنـدێك ئـاژەڵ هـەرگیز تێرنـابن ولەتـەواوی ئەوکاتانـەی بێـدارن هـەرخۆراك دەخـۆن، ڕەشپێستەکانیش ئاوا هەرخـەریکی خـواردنن وهـەرگیز دەمـی ئـەوان لەجوڵـە ناکـەوێت، تـەنها لـەکاتی خـەو- یـان کاتێـك کەهیـچیان دەسـت نەکـەوێت بیخـۆن، شـێوازی شـەڕی ئەمانـەش وەك ئـاژەڵانبوو، بەیەکجار شاڵاویان دەهێناو هەرچی لەڕێگای خۆیاندا بینیبیان دەیانکوشت، چونکە ئەوانە هیچ لـەبیری خۆپاراستن وپەنادانی خۆیاندا نەبوون، کوشتنی ئەمانە ئاسانبوو، ئەگەر سەربازەکانی ئێمـە خۆڕاگربن دەتوانن ڕەشپێستەکان بکوژن وپاشەکشەیان پێبکەن، لەپێدەست وبەری پێی ڕەشپێستەکان وەك سمـی ئەسـپ وهێـستر ڕەقبـوو، کـەتیر نەیـدەبڕی ونینـۆکی درێـژیان هـەبوون، کاتێـك چـەکەکانیان لەدەست دەکەوتەخوارەوە بەچڕنووك شەڕیان دەکردو هەوڵیاندەدا چڕنووکەکانیان لەچاوی سەربازکان بچەقێنن وکوێریان بکەن.

کـاڵ لەهاویـشتنی ڕمـدا کارامـەبوو، سـەربازەکانی خـۆی فێردەکـرد، چـۆن کاتێـك ڕەشپێـستەکان ڕم دەهاوێژن، بەرگریی لەخۆیان بکەن، کاڵ کەشێوازی شەڕکردنی ڕەشپێستەکان لەئەفسەرانی میسرییەوە فێرببـوو، بەسـەربازانی یەکەکـەی خـۆی گـوت: چـەکی ڕەشپێـستەکان ڕمـە، کەدەیانهاوێـژن، بـەڵام لەبەرئەوەی شارەزاییان لەهونەری شەڕدانییە، عەقڵی ئەوەیان نییە لەوکاتەی کەئەوان ڕمەکە دەهاوێژن، لەوانەیـە دوژمنـی بەرامبـەریان خۆبـدات بەزەوییـدا- یـان خـۆی لابـدات وڕمەکـە بەسـەریاندا بـڕوات، هەرکاتێك ڕمەکانیشیان هاویشت، یەکسەر بەرەو ئەوشوێنە ڕادەکەن کەمەبەستیانە، بۆ ئەوەی دەستی بەسـەردابگرن. دەبێـت لەوکاتانـەدا کەئـەوان ڕمـەکانیان هاویـشتیووەو دێنەپێشەوە، سـەربازانی فیدائی ڕمـەکانی خۆیـان بهاوێـژن، بۆئـەوەی بتـوانن هێرشـی ئەمانـە ڕابگـرن، ئەگـەر زانییـان ئـەوە نابێتـەهۆی ڕاگرتنـی هێرشـەکەیان، ئـەوادەبێت شمـشێرەکانیان لـەکالان دەربهێـنن وبـەکاریبهێنن، چـونکە ئـامرازی

خۆپاراستن لەچرنوکی درێژی ڕەشپێستەکان شمشێرە، ئەوان شمشێریان نییەو نازانن بەکاری بهێنن وەدەکوژرێن.

ڕەشپێستەکان شمشێریان پێنەبوو، بەڵام گورزی مەترسیداریان هەبوو، گورزی ئەمانە بریتیبوو لەیەک پارچە بەرد کەدەیانخستنەناو یەک کیسەی چنراوی گیاییەوەو ئەوکیسەیەیان بەوپەتانەی کەبەشووڵی گیا چنرابوون بەکۆمەڵێک تەختەدارەوە دەبەستەوە، بوونی ئەوبەردە لەناو کیسەکەداو بەستنەوەی ئەوکیسەیە بەکۆمەڵێک تەختەدارەوە، بۆ ئەوەبوو لەتەبەردەکە وردنەبێت وبەساغی بمێنێتەوە، کردنی ئەمکارە سەبارەت بەڕەشپێستەکان ئەزیەتی زۆربوو، لەکاتێکدا خستنە کیسەی بەردێک بەڕووکەش ئاسانە، بەڵام سەبارەت بەئەوان گرانبوو، گورزی بەردینی ناوبراو لەدەست ڕەشپێستەکاندا چەکێکی مەترسیداربوو وجێگای شمشێری دەگرتەوە، کاتێک لەدوژمن نزیک دەبوونەوە، وەک ڕمەکان دەیانهاویشتن، لەبەرامبەر ئەوگورزەدا باشترین چەک قەڵغانبوو، پاشای میسر ڕازیبوو کەهەموو سەربازەکانی فیدائی هەریەکەو قەڵغانێکی تەختەیان بدرێتێ.

کاڵ سەربازەکانی خۆی هاندەدا مەشق بەگورزی هاوشێوەی گورزی ڕەشپێستەکان بکەن، بۆئەوەی لەکاتی شەڕدا بتوانن خۆیان لەگورزی ئەوان بپارێزن.

دوای ئەوەی ڕەشپێستەکان لەسەری دلتا تێپەڕین، پاشای میسر گرنگی زۆری بەمەندا، چونکە ڕێگاگرتن لەمانە لەدەشتەکانی نێوان ڕووبارەکانی نیل ولەبیابانەکانی خۆرهەڵات وخۆرئاوای ئەو ڕووبارەدا شێتی بوو، ئەنجامی نەدەبوو، جگەلەوەی سوپاو فیدائییەکانی میسر تێدادەچوون وڕەشپێستەکان بەبێ بەربەست وکێشە دەهاتنەناو ئەکسەندەرییەو ئەوشارەیان وێراندەکرد، ڕەشپێستەکان کاتێک بەبیاباندا بڵاوبوونەوە، یەک دەستەو دوودەستە نەبوون، تابتوانرێت ڕێگایان لێبگیرێت، بەڵکو سەدان دەستەی بچووک بەڕێگابڕینی بەردەوام، دەشتاییەکانی نێوان بەشەکانی ڕووباری نیل ودەشتاییەکانی تەنیشت ئەویان دەبڕی، ئەگەر هەردەستەیەک ڕەشپێست یەک دەستە سەربازیان ناردبا، ئەواپێنج بەرامبەری سوپای میسریش نەیدەتوانی ڕێگای لەمانەبگرێت،

تاکتیکی عەقڵانی ئەوەبوو کەلێبگەڕێن ڕەشپێستەوکان لەئامانجی خۆیان، ئەسکەندەرییە نزیکببنەوەو ئەوکاتە دەکەونە نێوان دووشمشێر، واتا لەلایەک فیدائییەکان، لەپێشەوە هێرش بکەنەسەر ئەوانەو لەپشتەوەش سوپای میسر ڕامالیان بکات ولەناوەڕاستدا ئەوهێرشەبکەن بەدوو کەرتەوەو لەناویان ببەن.

ئەگەر پاشای میسر ویستبای سوپای میسر- یان هێزی فیدائی خەریکی شەڕی لاوەکی وجیاجیا بکات، ئەواسەربازەکانی میسر لەملاولا لەشەڕی لاوەکی وبچووکدا دەکوژران وڕێگای ئەسکەندەرییە دەکرایەوە، چونکە لەپێش شاردا هێزی بەرگریکار نەدەما.

ڕەشپێستەکان لەناوچەی دلتادا یەک گوندیان بەسەلامەتی نەهێشتبۆەو، هەموویان شوێنەکانیان وێران وسووتاندبوو وهەرچی دانەوێڵەو خۆراک لەناوچەکەدابوو، خواردبوویان، لەکاتی ئاساییدا زیاتر لەسەد هەزار سەرماڵات لەلەوەڕگاکانی دەلەوەڕان، هەموو ئەوانە لەلایەن ڕەشپێستەکانەوە خوران ولەناوبران، هەرچەندە پەیوەندی نێوان ئەسکەندەرییەو خوارووی ولات نەمابوو، بەڵام شار لەڕووی بوونی شت ومەکەوە کێشەی نەبوو، چونکە کەشتی زۆر لەسوریاوە شت ومەکیان دەهێنا، پاشاش وەک پێشوتر

باسمانکرد کاسبکارانی ناچارکرد کەبەزۆر دووکانەکانیان بکەنەوەو وەك ڕۆژانی ئاسایی شت وەك بەخەڵك بفرۆشن.

دوو تەلاری گەورەی ئەسکەندەریە سێرك وبینای شانۆکەبوون، تایبەتکران بەجێنشینکردنی ئاوارەکان، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر لەدێهاتەکان وکۆچەرییە شوانکارەو خێڵەکییەکان هەموویان ڕایاندەکردو خۆیان دەگەیاندە ئەسکەندەرییە، ئەم دوو بینایە بەشی ئەوانەی نەدەکرد، لەوکاتەدا پاشای میسر فەرمانیدا بەشێك لەعەمبارەکانی بەندەری ئەسکەندەرییە، کەئەوکاتە بەتاڵبوون، بدات بەوئاوارانەو ئەوانی تریش لەدەم بەندەری نیلدا لەسەر ئەو لمەدا نیشتەجێبکرێن، چونکە کەژی پاییز تازەهاتبوو، ئاوارەکان بەڕۆژ لەدەست گەرما هەراسان نەدەبوون، بەڵام بەشەو بەدەست سەرماوە دەیانناڵاند.

ئەوەشمان بیرنەچێت کەڕەشپێستەکان گەیشتنە ئەسکەندەرییە، کاتێك بوو کەباڵندەکان لەئاسماندا دەنگی کۆچ وباری گەرمیان وکوێستان کردنیان دەهات، چونکە لەوەرزی پایزدا باڵندەکانی سەرووی دەریای ڕۆم، بەرەو ڕۆخەکانی میسر کۆچییان دەکردو دەنگی قاڕەقاڕی ئەمانە لەئاسماندا دەبیستران.

لەوشەوەدا کەبۆ یەکەمجار دەنگی باڵندە کۆچەرییەکان لەئاسمانداد‌ەهات ولەڕۆخی نیلدا دەنیشتنەوە، ڕەشپێستەکان هێرشیان دەهێنایەسەر ئەسکەندەرییە، ئەوانە پێیانوابوو تاریکی شەو لەبەرژەوەندی ئەواندایەو بەرگریکاران لەشار ناخافڵن، لەوە بێئاگابوون کەفیدائییەکان بەفەرمانی ئەفسەرانی سوپاو تائکیدکردنەوەی کلیۆپاترا، خۆیان بۆشەڕی شەو ئامادەکردووەو مەشخەڵی زۆریان کۆکردبوەوە، بۆئەوەی شوێنەکانی شەڕی پێ ڕووناك بکەنەوە، پاشا فەرمانی دەرکردبوو شوێنی شەڕەکە لەکاتی شەڕدا بەسەر پەرشتیاری ولێپرسراوانی فانۆسی دەریایی بگەیەنن، بۆئەوەی فانۆسەکەی تێبگرن وڕووناکبێتەوە، ئەوانە نەیاندەتوانی بەردەوام ڕووناکی فانۆسی دەریایی لەشوێنی شەڕەکان بدەن، چونکە ئەو کەشتییانەی کەلەدەریاوە دەهاتن، پێویستییان بەڕووناکی فانۆسەکەبوو، بۆیە هەندێك ڕووناکی فانۆسی دەریایی لەشار دەگێردرا بۆئەوەی بەرگریکاران دۆخی شەڕەکە ببینن. لەهەمان ئەوکاتانەی کەلەئەسکەندەرییەدا خەریکی دابینیکردنی کەرەستەی بەرگریکردن بوون، ڕێژەیەکی زۆریشیان لەچەکی ئاگری یۆنانی دروستکرد.

من گوتم: چۆن دەتوانرێت نهێنی ئاگری یۆنانی لەمیسردا بپارێزرێت، ئەگەر جگەلەپاشاو یەك وەستاکار نهێنیی ئەمە نەزانن؟ لەوکاتەدا کۆمەڵێك کرێکار بەهاوکاری ئەو وەستاکارە، ئاگری یۆنانییان دروستدەکرد، بەڵام نەیاندەزانی ئەو ماددانەی کەلەدروستکردی ئەوچەکەدا بەکاردێت چییە، بەپێی فەرمانەکانی وەستاکارەکە هەندێك کەرەستەی ڕەنگاو ڕەنگیان لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵاودەکرد، بۆئەوەی ئاگری یۆنانی دروستبکەن.

ئەوشەوەی کەڕەشپێستەکان هێرشیان هێنایەسەر ئەسکەندەرییە، بەلای منەوە شتێکەو بیرناچێتەوە، لەوشەوەدا لەهەر چوارلاوە جگەلەبەشی سەرووی ئەسکەندەرییە، دەنگی تەپڵلێدانی ڕەشپێستەکان دەهات، ئەمانە بەدوو مەبەست تەپڵیان لێدەدا: یەکەم: بۆئەوەی بەرگریکاران لەشاردا بترسێنن.

دووەم: بۆئەوەی بەهۆی ئەو تەپڵلێدانەوە پەیوەندییان لەگەڵ یەکتریدا نەپچڕێت، هەر دەستەیەك هەواڵی شەڕو پێکدادانەکانی خۆیان بەیەکتری دەگەیاند.

کاتێك ڕەشپێستەکان هێرشیان هێنایەسەر شار، هێزی فیدائی ئێمە مەشخەڵەکانیان هەڵکردو بۆ بەریگریکردن ئامادەبوون، پاشای ئێمەش کەهەر شمشاڵی لێدەدا، لەوشەوەدا جلوبەرگی جەنگی لەبەرکردبوو وئامادەی بەرگریکردن لەشاربوو، گوێم لێبوو بەوکەسانەی دەوروبەری خۆی دەگوت: لەبەر ئەوەی ئەم شارە بەرپرسیارێتی لەئستۆی منە، بۆیە پێویستە من لەپێش کەسانیتردا بەرگری لێبکەم.
پاش ئەوەی ڕەشپێستەکان هێرشیان هێنا، فەلەقەکانی[47] بەرگریکاران کەوتەکارو بەردیان بەسەر سەری هێرشبەراندا دەباراند. ڕەشپێستەکان ئەوەیان پێشبینی ڕوودانی شتێکی لەوجۆرەیان نەدەکرد، تاوەك باران بەردیان بەسەردابباریێت، بۆیە بەسەرسوڕماوییەوە کوژراو وبریندارو هەموویان کەوتەسەر زەوی ودواتر زیندووەکانی کەدەیانتوانی هەڵبێن، بەرەودوا ڕایانکرد.

47- فەلەق: جۆرە چەکێکی جەنگییە لەکۆندا بەکاردەهات وشێوەی وەك مینێکی درێژبوو. لەسەر بنکەیەکی قورس دەکێشراو لەکاتی جەنگدا بەردی پێ هەڵدەدرا (و- کوردی)

بەڵام دواتر تێبینی ئەوەیانکرد فەلەقەکانی ئێمە کەموکوڕی ولاوازییەکیان هەیە، ئەویش یەکێکیان ئەوەیە کەژمارەیان کەمە. ئەویتریشیان ئەوەیە کەپڕکردنەوەو بەستنەوەی بەردەکان سستەو ئەو کەسانەی کەپڕکەرەوەی ئەوچەکەن، ژمارەیان کەمە، پاشان من لەدواتردا لەکاڵم بیست گوتی: ئەگەر لەوشەوەدا هێزی بەرگریکار لەئەسکەندەرییەدا فەلەقەی تەواویان هەبووایەو ئەو فەلەقەیان بەسەر سێ دەستەدا دابەشبکردایەو هەردەستەیەك لەپشت یەکتریەوە دامەزرابان، بەشێوەیەك کەلەهەر چەند ساتێکدا دەستەیەك لەوفەلەقانە بەردی بهاویشتایەو ئەوانیتر سازبکرانایەتەوە، ئەوا هێرشی ڕەشپێستەکان شکستی دەخواردو پێویستی بەکەرەستەیتر نەدەکرد.
هۆی کەمی فەلەقەکان ونەبوونی پارەو توانای سەربازیبوو، چونکە بۆ دروستکردنی هەر فەلەقەیەك پارەیەکی زۆری دەویست.
بەتلیمۆسی سێزدەهەم کەپاشایەکی دەوڵەمەندبوو وساڵانە سامانەکەی لەزیادبووندابوو، ڕازی نەبوو کەبۆ دروستکردنی فەلەقەیتر پارەبدات. بەپێی قسەکەی کاڵ، کەڵك وەرگرتن لەفەلەقە پێویستی بەدەستەیەك کەسی نشاگری خاوەن ئەزموون بوو، تابتوانن بەخێرایی فەلەقەکان پڕبکەنەوەو گۆشەی سێرەگرتنی فەلەقەکە دیاری بکەن.
لەوڕۆژانەدا ئەسکەندەرییە بەکارهێنەری فەلەقەی نەبوو وئەوانەش کەئەو ئەرکەیان خرابووە ئەستۆ، سەربازی سادەبوون، بۆیە نەیاندەتوانی بەخێرایی فەلەقەکان پڕبکەنەوەو گۆشەی سێرە گرتنەکەیان بەشێوەیەك ڕێکبکەن کەئامانج بپێکێت. لەبەر ئەوەی قاپولکەی[48] فەلەقەکانیش بچووکبوون، سەربازەکانمان نەیاندەتوانی بەردی زۆر بخەنەناو ئەوشوێنەو بەرەوهێرشکەران بیهاوێژن.

48- قاپولکە: مەبەست لەوشوێنەیە کەبەردەکەی لەسەر دادەنێن وسواری دەکەن. بۆکێشان و دواتر هەڵدانی لەسەر فەلەقەکە (و- کوردی)

کاتێك لەشکرێکی هێرشکەری تاڕادەیەك دڕندە، شاڵاودەهێنن، بۆڕێگرتن لەهێرشی ئەمانە پێویستە قاپولکەی فەلەقەکە بەردی زیاتری تێبکەن، بۆئەوەی کاتێك بەردەکان دەهاوێژن هێرشبەران پەرت

وبڵاوە پێبکەن وزیاتریان لێبکوژن، بەڵام لەبەرئەوەی فەلەقەکانی ئەسکەندەرییە بچوکبوون، نەیاندەتوانی بەردی زۆریان پێ بهاوێژن وئەمەش ئەنجامی زۆرباشی بەدەست نەدەهێنا، بەهۆی ئەو کەموکورییانەی کەلەپێشەوە باسمانکرد.

ڕەشپێستەکان لەبەرامبەر هەر شوێنێك کەفەلەقەی تێدابوو، پاشەکشەیان کرد، بەڵام پاش ئەوەی تێگەیشتن، دوای بەتاڵبوونەوەی فەلەقەکان، ماوەیەکی دەوێت تاپڕدەکرێنەوەو لەنگەریان دەکێشرێت ودەهاوێژرێن، دەتوانن لەوماوەیە کەڵك وەربگرن و ئەوهەلە بقۆزنەوەو هێرش بکەنەسەر فەلەقەکان ودەستیان بەسەردابگرن وتێکیان بکشێنن. هەربۆیە ئەوەی مەبەستیانبوو کردیان.

پاشئەوەی ڕەشپێستەکان دەستیان بەسەر فەلەکاندا گرت، سەربازانی فیدائی ئێمە بۆکوشتنیان، دەستیانکرد بەهاویشتنی تیرو ڕم، لەهەر شوێنێکدا لێشاوێك ڕمیان ئامادەکردبوو ویەك لەدوای یەك ڕمەکانیان دەهاویشت، یەك لەوشوێنانەش کتێبخانەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ڕمەکان ئامانجیان نەدەپێکاو بەهەڵە ئاراستەدەکران، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەشپێستەکانی دەترساندو دوودڵی دەکردن، ڕەشپێستەکان پشتیان بەزۆریی ژمارەیان دەبەست ونەدەگەڕانەوەو پێیانوابوو بەرگریکارانی ئەسکەندەرییە دەشکێنن.

بەتلیمۆسی سێزدەهەمیش ڕمی بەدەستەوە دەگرت وبەرەو ڕەشپێستەکانی دەهاویشت، کلیۆپاترا سواری کەژاوەکەبوو، کەمنیش لەناویدا دانیشتبووم، بەرێکەوت تاهانی بەرگریکارانی شاربدات و ستایشیانبکات، دەگەیشتە هەرشوێنێك، بەبەرگریکارانی دەگوت: بەوشێوەی دەبینن بەرگریکردن وخۆڕاگرتن وبەرەنگاربوونەوەی ئەودڕندانە ئاسانە، ئەوەندە بەسە ئێوە ئەوەیان نیشانبدەن، ئێوە نەلەڕەنگی ڕەشیان دەترسێن ونەلەهاوارو تەپڵ لێدانیان.

دوای ئەوەی شەڕەکە ماوەیەکی خایاندو دەنگی تەپڵلێدانەکانیان هەردەبیسترا، لەهەموو خاڵەکانی شەڕو پێکداداندا شەڕی ڕەشپێستەکان ڕاوەستاو ئیتر هێرشیان ڕاگرت. کلیۆپاترا چۆوە بۆ ناوچە تایبەتیەکەی خۆی، کەکتێخانەکە بوو.

لەوماوەیەی ڕەشپێستەکان خەریکی هێرشکردن بوون، لەناوچەکانی بەندەری ئەسکەندەرییەدا هیچ شتێك ڕووینەدا کەشایانی باسکردنبێت، لەوکاتەدا چەند کەشتییەك لەدەریاوە دەهاتن، کەگەیشتنە بەندەری ئەسکەندەرییە، لەبەرئەوەی نەیاندەزانی لەناوشاردا چی ڕوودەدات، پاش ئەوەی ئەوانیش گەیشتنە بەندەری ئەسکەندەرییە، هیچ ڕووداوێکیش تایبەتەهۆی تەنگاوکردنیان.

بەتلیمۆسی سێزدەهەم هەندێك لەئەفسەرانی سوپاو لێپرسراوانی فیدائی، لەمانەش کاڵی بۆ کۆشکی پاشایەتی بانگهێشتکرد، منیش لەگەڵ کلیۆپاترادا چووین بۆئەوێ، پاش کەمێك سەربازان، هەندێك برینداری ڕەشپێست کەگیرابوون، هێنایان بۆکۆشکی پاشایەتی، تالایەن پاشاوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدابکرێت، پاشای میسر سەبارەت بەنەخشەو پلانەکانی ڕەشپێستەکان پرسیاری لێکردن، بەڵام نەئەوان زمانی ئێمەیان دەزانی وتێدەگەیشتن، نەئێمەش دەمانتوانی لێیان تێبگەین وبەزمانی ئەوان بدوێین.

بۆیە پاشای میسر فەرمانیدا بچن لەبەندەردا بگەڕێن لەوکەشتیوانانەی کەلەخوارووەوە هاتوون و بپرسن وبزانن کەس هەیە زمانی ڕەشپێستەکان بزانێت وبێت لەگەڵ ئەوانەدا قسەبکات.

حاڵی ڕەشپێستەکان لەکۆشکی پاشایەتیدا باشنەبوو وهەندێك لەوانە لەئێمەیان هەڵدەڕوانی وئازاری برینەکانیشیان تینی بۆهێنابوون.

– کلیۆپاترا پێی گوتم: شرمیون تەماشای ڕەنگی پێستیان مەکە، چونکە ڕەنگی پێستیان پێوانە نییەو ئەمانیش هەرمرۆڤن ولەڕووی عەقڵ وهۆش و ئەوشتانەی مرۆڤ لەئاژەڵ پێجیادەکرێتەوە، هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئێمەدانییە، بەڵام لەبەرئەوەی فەرهەنگ وشارستانیەتیان نییە، کەمتر دەتوانن کەڵك لەژیری ومرۆڤبوونی خۆیان وەربگرن، هەر لەبەرئەوەشە کاتێك کەسەیریان دەکەیت، وەك ئاژەڵ دێنەبەرچاوت، ئەو بوونەوەرە بێنەوایانە کاتێك ئازادن بێبەزەییانە هەرچی ببینن دەیکوژن، بەڵام کەگیرۆدەو بێدەسەڵات بوون، وەك ئاژەڵان خۆیان بەزەبوون وبێدەرەتان دەزانن، وەك دەبینیت چۆن دەگرین وورەو غیرەتیان تێدا نامێنێت.

لەوکاتەدا دووکەس لەبازرگانانی خوارووی کەزمانی ئەوانەیان دەزانی، هاتن وبەتلیمۆس لەڕێگای ئەو دوو کەسەوە لەبریندارەکانی پرسی: ئێوە چەند کەسن؟

– ڕەشپێستەکان وەڵامیان دایەوە کە: ئێمە پازدە تایەفەین.

– پاشای میسر گوتی: ژمارەی سەربازەکانی ئێوە چەندە؟

ڕەشپێستە بریندارەکان نەیانتوانی ژمارەی سەربازەکانی خۆیان مەزەندەبکەن وگوتیان نازانین، دوای ماوەیەك قسەکردن لەنێوان وەرگێڕەکان وڕەشپێستە برینداران، وەرگێڕەکان گوتیان: ڕەشپێستەکان ژمارەکان نازانن، هەرکە نمرەکان لەبیستی تێپەڕاند، تێناگەن، بۆیە نازانن وەڵامی ئەوپرسیارە بدەنەوە، سوپاکەیان لەچەند سەرباز پێکهاتووە.

– بەتلیمۆسی سێزدەهەم سەری لەم قسەیە سوڕماو گوتی: ئەی چۆن لەکاتی شەڕدا سەرپەرشتی بەشە جیاجیاکانی سەربازەکانیان دەکەن، لەکاتێکدا نازانن ژمارەیان چەندە؟

– وەرگێڕەکان جارێکی تریش بۆماوەیەکی دوور ودرێژ دەستیانکردەوە بەقسەکردن، لەگەڵ بریندارەکانداو سەرئەنجام گوتیان: هەر یەکەیەکی سەربازی ئەمانە پێکدێت لەیەك فەرماندەو بیست سەرباز.

– پاشای میسر گوتی: ئەمانە بۆچی ژمارەی بیستیان بۆدروستکردنی یەکە سەربازییەکانی خۆیان داناوە؟

– کاتێك وەرگێڕەکان پرسیاری پاشایان بۆوەرگێڕانە سەرزمانی خۆیان، ڕەشپێستەکان هەر دە پەنجەی دەست وقاچیان پێشانی پاشادا، دیاربوو بەهۆی ئەوەی کەهەموو مرۆڤێك بیست پەنجەی هەیە، بۆیە یەکە سەربازییەکانیان لەسەر ئەوبنەمایە داناوە.

– دواتر پاشا پرسی: بۆچی ئێوە لەوڵاتی خۆتانەوە دەرپەڕیوون وبەرەوئێرە هاتوون؟

– ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو گوتیان: هەموو دەزانن لەهەرێمەکەی ئێمەدا ئاوی ڕووباری گەورە بەرەوسەروو دەڕوات، ئەویش بەوشارانەدا تێدەپەڕێت کەپڕن لەئاژووقەو ژنی پێست سپی، ئێمەش ئاراستەی ئاوەڕۆی نیلمان گرتەبەرو بەرەوسەرەوە کەوتینەڕێ، بۆئەوەی ورگی خۆمان پڕکەین لەخۆراك وچێژ لەوژنانە وەربگرین.

– پاشای میسر لێی پرسین: ئەمشەو ئێوە پاش هێرشێکی بەهێزو بەربڵاو کشانەوەو ئیتر دیارنەمان، پێم بڵێن بۆچی پاشەکشەتانکرد؟

– برینداره ڕەشپێستەکانیش گوتیان: کاتێك بینیمان چاوی ئێوە لەتاریکی شەودا باشتر لەچاوی ئێمە دەبینێت، کەبەتاریکی ڕاهاتووین، لەبەرئەوەی کەڵکتان لەمەشخەڵ وەردەگرت وخاوەن فانۆسێکی گەورەیش شەوقی ئەو، هەموو شوێنێکی ڕووناککردبووەوە، لەبەرئەوە شەڕەکەمان ڕاگرت وپێمان باش نەبوو ئەمشەو بەردەوامبین لەهێرشکردنمان وپاش ئەوەی دنیا ڕووناکبۆوە، هێرش دەکەین.

– پاشای میسر کۆمەڵێك پرسیاریتری لەڕەشپێستەکانکرد، بەڵام ئەوانە نەیاندەتوانی وەڵامی پرسیارەکانی پاشا بدەنەوە، چونکە نەیاندەزانی بەتلیمۆسی سێزدەهەم مەبەستی چییەو چی دەڵێت.

– یەك لەوشتانەی کەپاشا دەیویست بیزانێت، ئەوەبوو، ئایا ڕەشپێستەکان دەزانن سوپای میسر لەپشتی ئەوانەوەیەو دەیەوێت لەپشتیانەوە تێکیان بشکێنن– یان نا؟

بەڵام ڕەشپێستەکان نەیاندەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە.

پاشای میسر ئەوەی مەبەستی سەرەکی بوو بیزانێت، تێیگەیشت. فەرمانیدا ئەمانە لەکۆشکی پاشایەتی ببنەدەرەوەو لەلێواری نیلدا بیانکوژن ولاشەکانیشیان فڕێبدەنە ئاوەکەوە، تابۆلای دەریا[49] بچێت وببن بەخۆراکی گیانەوەرانی دەریا.

49– دەریا: مەبەست لەدەریای سپیی ناوەڕاستە، چونکە وەك ئاشکرایە نیل لەسودانەوەدێت وبەناو میسردا تێدەپەڕێت ودەڕژێتە دەریای سپیی ناوەڕاستەوە. (و– کوردی)

لەئەنجامی ئەو ڕاوێژو گفتوگۆیەی ئەوشەوە، گەیشتینە ئەوبڕیارەی پێویستە بەرگریکارانی شار لەبەرەبەیاندا چاوەڕوانی هێرشی ڕەشپێستەکانبن، چونکە لەکاتی شەودا هێرشی ڕەشپێستەکان تێکشکابوو، بەدڵنیاییەوە ئەگەر بەرگریکاران لەشاردا خۆیان لەبەردەم هێرشی ڕۆژیشدا ڕابگرن، ئەواشکستیان پێدەهێنن، چەند کەسێك لەلێپرسراوانی بەرگریکارانی فیدائی لەلایەن پاشاوە بوونە جێگای ڕێزو ستایشکردن، بەڵام هیچ یەکێك لەوانە بەقەدەر کاڵ نەبووەجێگای ستایشی پاشای میسر، بۆیە لەبەرامبەر ئەو ئازایەتییەی لەوشەوەدا نواندی، پلەی سەنتۆریۆن[50] یان دایە.

50– سەنتۆریۆن: پلەیەکی سەربازیی ڕۆمییە، میسرییەکانیش بەهەمان پێکهاتەی ڕۆمییەکان لەشکرو سوپاکەیان دروستکردووە. (و– فارسی)

سەنتۆریۆن: بەکوردی لەبری سەرتیپ دێت (و– کوردی)

زۆرم پێخۆشبوو لەوەی کاڵ لەفەرماندەی دەستەیەك فیدائییەوە، بووبە ئەفسەرێکی ڕەسمی، تەنها شتێك کاری تێکردبووم، ئەوەبوو کەپلەی ناوبراو بەپێشنیاری کلیۆپاترا لەلایەن پاشاوە درابووە کاڵ، ئەگەر کلیۆپاترا ئەوپێشنیارەی نەکردایە، کاڵ نەدەگەیشتە ئەوپلەو پایەیە.

هەرچۆنێکبێت کاڵ ئەودەرەجە وەرگرتنەی بەچاکەی کلیۆپاترا دەزانی وزیاتر هۆگری ئەودەبوو. بەیانی ڕۆژی دواتر دەنگی تەپڵ وهاواری ترسناکی ئەوانە، جارێکیتر بەرزبۆوە، ئێمە زانیمان ڕەشپێستەکان

هێرشەکانیان دەستپێکردەوە، بەوەی ئەوانە بوونەوەری نیوەوەحشی بوون، دەرسیان لەشەڕی دوێنێ وەرگرتبوو، لەوشوێنانەی کەفەلەقەی تێدا دابەسترابوون، هێرشیان بۆنەدەکرد، بۆیە هێزی بەرگریکاری ئەسکەندەرییە لەوڕۆژەدا نەیانتوانی کەڵك لەفەلەقەکانیان وەربگرن. دەکرا فەلەقەکان لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکیتر بگوازنەوە، بەڵام ئەنجامدانی ئەوکارە تاقێکی ڕۆژی خایاند، تائەوکاتەش شەڕەکە یەکلایی دەبووەوە، ئەزمونێکیتر کەڕەشپێستەکان لەشەڕی شەوی ڕابردوودا وەریانگرتبوو، ئەوەبوو بەڕێگای گورزە مەترسیدارەکانی خۆیان، ڕم هاوێژانی ئەسکەندەرییا دەکوشتن، بەوشێوەیە کاتێك سەدان ڕەشپێست بەیەکجار لەیەکلاوە هێرشیاندەکرد، گورزەکانیان بەرەو ڕم هاوێژەکانی ئێمە هەڵدەدا، هەرچەندە هێزی بەرگریکاری لەئەسکەندەرییەدا بەڕمەکانیان هەندێك ڕەشپێستیان کوشت، بەڵام ئەوانیش توانییان کۆمەڵێك لەڕم هاوێژانی ئێمە لەناوبەرن. لەسێ شوێندا ڕەشپێستەکان توانییان هێڵی بەرەی شەڕ تێکبشکێنن وبێنەناو شارەوە. ئەگەر چەکی ئاگری یۆنانی نەبووایە کەلەوسێ شوێنەدا پێشی بەهێرشکارانگرت، ئەوا ڕەشپێستەکان دەیانتوانی خۆیابگەیەننە ناوقەدی شارو لەپشت ئەوانەوە لێشاوی ڕەشپێستەکان دەهاتنەشارەوەو ئەسکەندەرییە داگیردەکرا، بەڵام چەکی ئاگری یۆنانی کەنەدەکوژایەوە، ئەوانەی هاتبوونە ناوشار تەفروتووناى کردن.

من تائەو کاتە شێوازی بەکارهێنانی چەکی ئاگری یۆنانیم نەدیبوو، تەنها ناویم بیستبوو، بەڵام لەوڕۆژەدا بینیم کەسەربازەکانی ئێمە کۆمەڵێك گرۆڵەی درێژیان بەدەستەوەبوو، کەسەرێکیان تۆپەڵەبوو وئاگریان تێبەردەداو دەیانخستەسەر فەلەقەکەو دەیانهاویشت، ئەوتۆپەڵە ئاگرەی بەماددەی تایبەت تەڕکرابوو، لەئاسماندا دەتەقییەوە، هەندێکیش لەوتۆپەڵانە دوای ئەوەی دەکەوتە سەر زەوی، دەتەقییەوە، دوای تەقینەوەی هەریەکێك لەمانە گڕێکی بەتین وپڕشنگاوی بەڕووی ڕەشپێستەکاندا دەتەقییەوە. ڕەشپێستەکان چەند هەوڵیاندەدا ئەوئاگرەی تێیانبەربووە بیکوژێننەوە، نەیاندەتوانی وبەهاواری پڕبەزەبیانەوە دەسووتان ولەجوڵە دەکەوتن.

کەموکوڕی ئاگری یۆنانی ئەوەبوو کاتێك ئەویان بەڕێگای فەلەقەکە بۆشوێنی دوور دەهاویشت، لەشوێنێ دەکەوتەوە کەشوێنێکی سەربازی گرنگنەبوو وکاریگەری لەسەر ڕێگرتن لەوهێرشە نەبوو، بۆیە دەبووایە لەنزیکەوە ئەوئاگرە بەڕەشپێستەکانەوە بنرایە، لەبەرئەوەی چەکی ئاگری یۆنانیش بەگرانی وسەختی تەواودەبوو، پاشای میسر نەیدەتوانی ڕێژەیەکی زۆر لەوەدروستبکات، دەبوا ئەو چەکە بەشێوەیەك بەکاربهێنن، تەنانەت تۆزێکیشی بەهەدەر نەچێت وبەهەر تۆپەڵەیەك کۆمەڵێك ڕەشپێست بکوژن.

تانیوەڕۆی ئەوڕۆژە شەڕ هەربەردەوامبوو، دوو کۆتر لەخوارووی ئەسکەندەرییەوە هاتن، بێ ئەوەی ڕەشپێستەکان ئاگایان لەوڕووداوەبێت. ئەودوو کۆترە تەتەرانە لەلایەن فەرماندەی سوپای میسرەوە نێردرابوون، کەلەناوچەی دلتادابوو، هەواڵی ئەوەیان بۆپاشا هێنابوو بەوزووانە سوپای میسر خۆی دەگەیەنێتە ئەسکەندەرییە.

سوپای میسر لەناوچەی دلتادا خاوەنی کەرەستەی جەنگی زۆربوو، بەتایبەتی عەرەبانەی جەنگی، فەرماندەی ئەوسوپایەش یەکێکبوو لەجەنگاوەرە خاوەن ئەزموونەکانی سوپاو ناوی (سیزاریۆ) بوو.

سیزاریۆ پیاوێکی چاونەترس وکارامەبوو، پێموابێت بەتلیمۆسی سێزدەهەمی پاشای میسر لێیدەترسا، چونکە لەکاتی ئاشتی وئاسایشدا ئەوکارەی کەشایستەو هاوشانی ئازایەتییەکەی ئەوبووایە بەویان نەدەداو کاروباری لیۆجیستی وئیداری سەربازییان پێدەداو چەند سەربازێکییان دەخستەژێر فەرماندەییەوە، بۆئەوەی لەناوچەکانیتر دانەوێڵەو ئالیك کۆبکاتەوەو بۆمیسری بنێرێت، ئەوەی لەبیرم مابێت، دووجار ئەویان نارده دەرەوەی وڵات بەبەهانەی ئەوەی شارەزایی لەسەر چەکی یۆنانی ورۆمی بەدەستبهێنێت، بەڕای من ئەمکارەش هەرلەبەرئەوەبوو کەناوبراو لەمیسر دووربخەنەوە، بەڵام لەکاتی شەڕدا نەیاندەتوانی کەسێکی لەوباشتر بدۆزنەوە، سەبارەت بەبەڕێوەبردنی سوپایەکی گەورەو سەرکەوتنی ئەو لەشەڕدا.

سیزاریۆ دوای ئەوەی بینی ڕەشپێستەکان لەبیاباندا بڵاوبوونەتەوە، نەیدەویست هێزی خۆی لەبەرامبەر ئەوانەدا لاوازبکات ولێیانگەڕا کەبەهەر لایەکدا بیانەوێت بڕۆن وهەرچی دەکەن بیکەن. ئەو دەیزانی سنووری ڕۆیشتنی ئەوان، لەمبەرو ئەوبەری بیابانی دەم ڕووباری نیل تێناپەڕێت، ئەگەر بەرەو خۆرهەڵات بڕۆیشتنایە، دەگەیشتنە دەریاو ڕێگای پەڕینەوەیان نەبوو وناچار دەگەڕانەوە، ئەگەر بەرەو خۆرئاواش بڕۆیشتنایە، ئەوابەرەو بیابانە بێئاوە گەورەکەی میسر دەچوون ولەبرسان وتینواندا لەوێدا دەمردن، لەهەردوو حاڵەتدا دەگەڕانەوەو خۆیان دەگەیاندەوە ڕووباری نیل، چونکە ڕووباری نیل لەمیسردا شوێنێکە هەرکەسێك بیەوێت بەزیندویی بمێنێتەوە، نابێت لێی دووربکەوێتەوە، لەبەرئەوەی دووچاری تینوێتی وبرسێتی دەبێتەوە.

چون سیزاریۆ ئەم ڕاستییەی دەزانی، بیری لەوەکردبووەوە کەپێویستە خۆڕاگربێت تائەودەستە دەستە بڵاوانەی ڕەشپێستەکان بۆهێرشکردنەسەر ئەسنکەندەرییە، لەسەرووی ناوچەی دلتادا کۆدەبنەوە، ئەوکاتە هێرشێکی سەخت وتوندیان دەکاتەسەرو لەناویان دەبات.

ئەو ڕۆژە کەخۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا بەرەو ئاوابوون چەمابۆوە[51] بەرگریکارانی ئەسکەندەرییە بەبەردەوامی شەڕیان دەکرد،

51- مەبەست لەدەمەو ئێوارەیە.(و- کوردی)

ژمارەی هێرشکەرەکانی خواروو، ئەوەندە زۆربوو، هەرچەندە بەرگریکاران لەشار لێیان دەکوشتن، ژمارەیان کەم نەدەبۆوە، وەك ئەوەوابوو ئەوانە لەزەوی بێنەدەرەوە.

- کلیۆپاترا گوتی: پێموابێت لەخوارووی میسردا هەرشتێك کەبۆخواردن دەستبدات، نەماوە، چونکە ئەو ڕەشپێستە بێ ژمارانە، هەرچی هەبووە خوارووویانەو بەهەر شوێنێکدا ڕەتبووبن هیچیان لەپاش خۆیانەوە جێنەهێشتووە.

لەبەرئەوەی سەربازانی فیدائی ئێمە شارەزاییان کەمبوو- یان بەهۆی برسێتی وتینوێتییەوە، ماندو دەهاتنەبەرچاو، بەڵام من لەڕەنگ وڕووی کاڵدا ماندووبوونم نەدەدی ولەنێوان سەربازە فیدائییەکاندا تەنها ئەو چینچین عارەقی دەڕشت، بەڵام بەشەکەت نەدەهاتەبەرچاو، کاتێك سێ لەسەرچواری ڕۆژ

بەسەرچوو، گوێمان لێبوو ژاوەژاوی ڕەشپێستەکان زیادیکردو زۆر وروژان وشێوازی تەپڵ لێدانەکەیان ئاوازەی گۆڕدرا.

من ئەوکاتە نەمدەزانی وروژانی نائاسایی ئەمانە چییە، دواتر بۆم دەرکەوت هۆکەی ئەوەیە سوپای میسر لەپشتیانەوەیەو نزیکی ئەسکەندەرییە بووەتەوە، کاتێک سوپای میسر لەئەسکەندەرییە نزیکبۆوە، کارەساتەکەی سەردەمی بەتلیمۆسی دووەم ڕووی نەدایەوە، چونکە ئەوکاتە شاری ئەسکەندەرییە خاوەنی سوپای فیدائی نەبوو، خەڵکەکەی ڕەشەبکوژکران وتەواوی سامانی ئەو شارە تێداچوو، بەڵام لەڕۆژگاری بەتلیمۆسی سێزدەهەمدا ئەسکەندەرییە هێزێکی بەرگریکاری بەتوانای هەبوو، کەدەیتوانی ڕێگریبێت لەبەردەم هاتنەناوەوەی ڕەشپێستەکان بۆ ئەسکەندەرییە، کەڕەشپێستەکان زانییان لەپشتەوە هێرشیان دەکرێتەسەر، کەوتنە ئەوپەڕی کۆششکردن بۆئەوەی بتوانن بێنەناو ئەسکەندەرییەوە، بەڵام هێزی فیدائی ئێمە بەرەنگارییانکردن ونەیانهێشت ڕەشپێستەکان خۆیان بگەیەننە ناوشار.

لەپڕێکدا سەیرمکرد عەرەبانەیەکی جەنگی میسری کەلەخوارەوەدەهات دەرکەوت، کاتێک ڕەشپێستەکان زانییان لەپشتەوە بەعەرەبانەی جەنگی هێرشیان دەکرێتەسەر، کشانەوە تالەهەڵمەتی ئەوعەرەبانە جەنگییانە خۆیان لابدەن، چونکە بەلای ئەوانەوە ئەوعەرەبانانە لەعەرەبانە جەنگییەکانی فیدائییەکانی ئەسەندەرییە مەترسیدارتربوون، عەرەبانە جەنگییەکانی میسر بەوەی کەمن لەوانەی مێژوودا خوێندوومە، شتێکی ترسناکبوون، چونکە بەملاولای عەرەبانەکانەوە تیغی ئاسنیان پێوەبوو، بەشێوەیەك کەوتبووەپێش ئەسپەکانیشەوە، کاتێک عەرەبانەکەیان بەخێرایی لەمەیدانی جەنگدا تاودەدا، ئەوتیغانە دوژمنیان دەکرد بەدوو کەرتەوە، ڕەشپێستەکان بۆ بەرگریکردن لەخۆیان لەبەرامبەر عەرەبانە جەنگییەکاندا پاشەکشەیانکرد، سەربازە فیدائییەکان لەپشتەوە دەستیانکرد بەهاویشتنی ڕم وهێرشیان کردنەسەر، چونکە پشتی ڕەشپێستەکان وەك ئامانجێکی سەربازیی بێ بەرگریی لێهاتبوو ودەیانتوانی لەپشتەوە ڕەشپێستەکان بکوژن، بەبێ ئەوەی ترسیان لەهێرشکردنیان هەبێت.

دوای ئەوەی عەرەبانە جەنگییەکان هەندێك لەڕەشپێستەکانیان کوشت، هێرشی گەورەی ئەسپ سوارانی سوپای میسر دەستیپێکرد، بەڵام لەوکاتەشدا هێزی فیدائییەکان دەستبەتاڵ نەمابوونەوەو بەردەوام ڕەشپێستەکانیان دەکوشت، ڕەشپێستەکان کەوتبوونە نێوان دوو ئاگرەوە، لەپێشەوەو لەدواوە داسدرەوی مەرگ کەوتبووە وێزەیان.

هێزی سوپای میسر کەگەمارۆی هێرشەکانیان دابوو، ئەوەندەیان لەوڕەشپێستانە کوشت کەلەدەووروبەری ئەسکەندەرییەدا زەویی بەخوێنی ڕەشپێستەکان سوور هەڵگەڕابوو.

من لەوڕۆژەدا نەمدەتوانی چواردەوری ئەسکەندەرییە ببینم، تەنها دەورووبەری کتێبخانەکەم دەبینی، کەلەوێدا زەوی گۆڕا بەیەك توێژاڵی سووربوو، کەلاشەیەکی بێ ژماری ڕەشپێستەکان لەوێدا کەوتبوون.

دوای ئەوەی سیزاریۆ بەردەم کتێبخانەکەی لەڕەشپێسەکان پاککردەوە، چەند عەرەبانەیەکی جەنگی وسەربازیی لەوێدا جێهێشت، بۆئەوەی ڕەشپێستەکان نەتوانن جارێکیتر تخوونی ئەوشوێنە بکەونەوە، لەوکاتەدا لەدەورووبەری کتێبخانەکەدا ئەوفیدائیانەی کەبەهۆی شەڕەوە ماندووببوون، مۆڵەتیان درایە بۆئەوەی خواردن وخواردنەوە بخۆن.

کلیۆپاترا بەمنی گوت: شرمیون لەناو کەژاوەکەدا پارچەیەك گۆشتی گا هەڵگرەو بیدە بەکاڵ، چونکە ئەوبرسیەتی وپێویستی بەخواردنە.

ئەوسەربازە فیدائییانەی لەژێر فەرماندەیی کاڵ دابوون، هەرکەزانییان مۆڵەتی پشوودانیان پێدراوە، بڵاوەیان لێکردو لەنزیك کتێبخانەکە دوورکەوتنەوە، هەندێك لەمانە ماڵەکانیان نزیکبوو، بۆنانخواردن چوونەوە ماڵی خۆیان، هەندێکیتر ماڵەکانیان دووربوون، خۆیان گەیاندە ئەوشوێنەی خۆراکی سەربازانی فیدائیی تێدا دابەشدەکراو سکی خۆیان لەوێ تێرکرد، بەڵام کاڵ نەڕۆیشت، منیش ئەوپارچە گۆشتەم هەڵگرت وچووم دامە دەستی.

– کاڵ لەمنی پرسی: ئەوگۆشتەت لەوێ هێناوە؟

لەبەرئەوەی پاشای میسر فەرمانی دەرکردبوو بەکردنەوەی دووکانەکان وڕۆژانە شتومەك بەخەڵك دەفرۆشرا، هەندێك جۆری شتومەك، بەتایبەتی گۆشتی گا، زۆرگرابنوو، چونکە هەموو ماڵاتەکانی میسر کەلەناوچەی دلتادابوون، ڕەشپێستەکان خواردبوویانن، لەبەرئەوەبوو کەکاڵ دەیویست بزانێت ئەوگۆشەم لەکوێوەهێناوە.

– پێم گوت: کلیۆپاترا فەرمانی پێدام ئەوگۆشتەت دەرخوارد بدەم.

– کاڵ ڕووی خۆی وەرگێڕا بۆئەوەی کچی پاشا ببینێت، بەڵام کلیۆپاترا لەوێ نەبوو.

– گوتم: کاڵ، ڕوخسارت عارەقی پێوەیە، لێم گەڕی تابۆت بسڕمەوە.

– کاڵ بەدامێنی جلەکانی خۆی دەموچاوی سڕییەوەو گوتی: شرمیون تۆ کچێکی باشیت، بەڵام کاتێك کەزانیم تۆ کەنیزەکی کلیۆپاترایت، لەنێوان من وتۆدا بەربەستێك دروستبوو.

– لێم پرسی: بۆچی لەنێوانماندا بەربەستێك دروستبووە؟

– کاڵ گوتی: لەوشەوەی کەتۆ هاتیت بۆئوتێلەکەو لەگەڵ مندا کەوتیتە قسەکردن وگوتت، لەبەر ئەوەی کەنیزەکیت، دەسەڵات لەدەستی خۆتدانییە، بەڵام من نەمدەزانی تۆ کەنیزەکی کلیۆپاترایت.

– گوتم: چ جیاوازییەك هەیە، کەنیزەی کلیۆپاترابم- یان نا؟

– کاڵ گوتی: فەرقی زۆرە، چونکە ئەگەر کەنیزەکی کلیۆپاترا نەبوویتایە دەمتوانی بەوپاداشتەی کەلەپای سەرکەوتنم لەپێشبڕکێی سێرکەکەدا دەستکەوت، تۆ لەئەربابەکەت بکڕمەوە، بەڵام ئێستا ناتوانم، چونکە کلیۆپاترا چاکەی لەگەڵ منداکردووە، نامەوێت ئەولەکەنیزە خاوەن متمانەکەی دووربخەمەوە، چونکە تێبینیم کردووە تۆ زۆر لەکلیۆپاترا نزیکیت، هەروەها تۆخۆشت لەوانەیە حەزنەکەیت لێی جیاببیتەوە.

– گوتم کاڵ: کاتێك دەتبینم هەستدەکەم دەتوانم لای کچی پاشای میسر بڕۆم، بۆئەوەی ژیان لەگەڵ تۆدا بەسەربەرم، ئەگەرتۆ ماندوو نەبوویتایەو پێویستیت بەپشوودان نەبووایە، ئەوا بۆم دەگێڕایتەوە چۆن هەمووشەوێك کاتێك چاوەکانم لێکدەنێم، دەکەومە حاڵەتی خەیاڵ و بیرکردنەوەی قووڵ وهەستدەکەم پەنجەکانم بەسەر لێوەکانتدا دەهێنم ولەپی دەستم بەسەرسنگتدا دەخشێنم، ئەم بیرە هیچ شەوێك لەخەیاڵمدا دەرناچێت.

– کاڵ گوتی: ڕێکەوتێکی سەیرە!

– پرسیم:ئەو ڕێکەوتە چییە؟

- کاڵ گوتی: منیش هەموو شەوێك ئاوابیردەکەمەوە.

- لێم پرسی: چۆن؟

- کاڵ گوتی: منیش هەموو شەوێك وابیردەکەمەوە کەپەنجەکانم لەلێوی ژنێك دەخشێنم.

- لەم قسەیەی کاڵ زۆر دڵخۆشبووم ولێمپرسی، ئایا تۆش هەمووشەوێك بەخەیاڵی خۆت پەنجەکانت لەلێوەکانم دەخشێنیت؟

- کاڵ گوتی: نەخێر، شرمیون ئەوژنەی کەلەخەیاڵی خۆمدا پەنجەکانم لەلێوەکانی دەخشێنم، کلیۆپاترایە!

- من لەبیستنی ئەوقسەیە کەوتمەگریان، چونکە پێوابوو وەك چۆن من لەبیری ئەودام، ئەویش ئاوا لەبیری مندایە، بەڵام بۆم دەرکەوت کاڵ لەبیری کلیۆپاترادایە.

- کاڵ کەخەریکی خواردنی گۆشتبوو، گوتی: شرمیون بۆدەگریت؟ چونکە ڕاستیم پێ گوتیت، بۆیە دەگریت؟ ئایا وات پێ باشە من درۆت لەگەڵدابکەم وبەو درۆیەم بتخەمە پێکەنین ودڵخۆشت بکەم؟

- گوتم: نەخێر کاڵ، هیچ قسەیەکی درۆ شادی بەخش نییە.

- کاڵ گوتی: بۆچی چ جیاوازییەکی هەیە، من لەحاڵەتی خەیاڵدا پەنجەکانم لەسەرلێوی تۆ- یان کلیۆپاترا بخشێنم؟

- گوتم: جیاوازییەکەی ئەوەیە هەرکاتێك تۆ لەخەیاڵتدا بیرلەمن بکەیتەوەو وابزانیت پەنجەکانت لەسەر لێوەکانم دەخشێنیت، من ئومێدەواردەبم ڕۆژێك تۆدێیت وداخوازییم دەکەیت ودەمکەیتە خوشکی خۆت

- کاڵ گوتی: شرمیون تۆ مەبەستتە ببیت بەخوشکی من؟

- گوتم: من هەرمەبەستم نییە، بەڵکو ئارەزوودەکەم، جیاوازی هەیە لەنێوان مەبەست وئارەزووکردن، کاتێك مرۆڤ مەبەستێکی دەبێت هەرکاتێك گونجا دەتوانیت بیکەیت، بەڵام کەئارەزوویەکت هەبوو، ئەوادەبێت چاوەڕوانبت تابەرامبەرەکەت ئەوکارە دەکات.

- کاڵ بەپێکەنینەوە گوتی: لەبەرئەوەی لەگەڵ شازادەدا ژیاویت، بەشێوەیەك قسەدەکەیت، هەرگیز من ناتوانم بەوشێوەیە قسەبکەم.

- گوتم: قسەکردنم کەڵکی نییە، چونکە خودی من نەبوومەتە جێگای سەرنجت!

- کاڵ بێدەنگ بوو ومنیش دەستمکردەوە بەگریان.

- کاڵ گوتی: مەگری، من حەزناکەم تۆبگریت، چونکە ئەگەر کلیۆپاترابێت وفرمێسکەکانت ببینێت، دڵی لەمن خراپدەبێت و وادەزانێت من گریاندوومی.

- گوتم: ئەگەر ئەو وابزانێت ئەوا ڕاستە، چونکە تۆمنت بەگریان هێناوە.

- کاڵ گوتی: شرمیون من تۆم نەدەناسی وهیچ خراپەیەکیشم بەرامبەرت نەکردووەو نابێت تۆش سکاڵات لێم هەبێت.

52- بمکەیتە خوشکی خۆت: مەبەست لەو داب ونەریتەی ئەوکاتەیە کەخوشك شووی بەبرا دەکرد. مەبەستی شرمیون، کردە ژنی خۆی بۆ کالە (و- کوردی)

نەمدەزانی لەبەرامبەر قسەی ئەوگەنجەدا چی بڵێم، چونکە ڕاستی دەکرد، ئەومنی نەدەناسی وخراپەی لەگەڵمدا نەکردبوو ونەدەبووایە گلەییم لەئەو هەبێت، نەمدەتوانی پێی بڵێم، گوناهی ئەو ئەوەیە زۆرجوان وقۆزە، جوانیەکەت لەئاستێکدایە هەتا کلیۆپاتراشی فریوداوە، ئەگەر گوناهی کاڵ بەجوانییەکەی بزانم، دەبێت خواکان بەگوناهبار بزانم، لەبەرئەوەی بۆچی ئەوگەنجەیان ئەوەندە جوان دروستکردووە!

لەوکاتەدا بیرم لەقسەکانی کاڵ دەکردەوە، هەوڵمدا بەسەرخۆمدا زاڵبیم وئەگەر بەڕوکەشیشبێت ئارامی خۆم بپارێزم، چاوەکانم سڕییەوەو غەم وپەژارەکەم لەناو دڵی خۆمدا حەشاردا.

- پاش چەند ساتێك کلیۆپاترا دەرکەوت وبەکاڵی گوت: ئەم ماوەیە دیارنەمام بۆبەشداریکردن لەڕاوێژو گفتوگۆ، لەکۆشکی پاشادابووم، کەئەویش سەبارەت بەوەبوو، ئیتر دەبێت هەوڵبدرێت ڕەشپێستەکان نەکوژرێن وبەدیل بگیردرێن، ئەو دەستگیرکراوە ڕەشپێستانەش ناچاربکرێن لاشەی کوژراوەکانیان لەدەوروبەری شار دووربخەنەوە، چونکە ئەوانە بۆگەنیاندێت وناتوانرێت لەئەسکەندەرییەدا کەس بژی، هەروەها دەبێت ئەوانە ناچاربکرێن ئەوخوێنەی کەڕژاوەتەسەر زەوی، بیشۆن، دوای ئەنجامدانی ئەم کارانەش، سەبارەت بەچارەنووسی دیلەکان باوکم بڕیاردەدات.

فەرمانی پاشای میسر گەیێندرایە سوپا، هەروەها گەیەندرایە ئەوکۆمەڵە فیدائییەی کەدەجەنگان، لەهەموو شوێنێکدا سەربازانی سوپای جەنگاوەرانی فیدائی هەوڵیاندەدا بەوپەڕی تواناوە خۆیان لەکوشتنی ڕەشپێستەکان بپارێزن وئەوانە دەستگیربکەن.

ئەگەر ئەوڕۆژە سەربازانی سوپای میسرو فیدائییەکان زمانی ڕەشپێستەکانیان بزانیایە، دەیانتوانی هەموو ئەوانەی کەتا ئەوکاتە نەکوژرابوون بەدیل بگرن، بەڵام ئەوان زمانی ڕەشپێستەکانیان نەدەزانی، ئەودوو وەرگێڕەی کەبازرگانی دەریایی بوون، نەیاندەتوانی لەیەك کاتدا بەهەموو لایەنەکانی بەرەی شەڕدا ڕابگەن ولەهەموو شوێنەکاندا بەڕەشپێستەکان بڵێن خۆتان بەدەستەوە بدەن، تالەمەیدانی شەڕدا نەکوژرێن.

لەهەموو شوێنێکی دنیادا دەستووروایە، کاتێك سەربازەکانی سوپایەکی سەرکەوتوو نوکی شمشێرەکانیان گرت ولای دەسکەکەیان بۆسەربازانی دوژمن ڕاداشت، مانای وایە دەست لەشەڕکردن هەڵبگرەو خۆت بەدەستەوەبدە، بەخۆڕایی خۆت بەکوشت مەدە، چونکە فیداکاریی تۆ کەڵکی نەماوە، کەچی ڕەشپێستەکان زمانی نێودەوڵەتی وئەوەیان نەدەزانی، کاتێك کەدەیانبینی سەربازەکانی ئێمە نوکی شمشێرەکانی خۆیان دەگرن ودەسکەکەی دەخەنەلای ئەوان، دڵیان خۆشدەبوو و وایاندەزانی سەربازەکانی ئێمە شەکەت وبێتوانابوون، ئەوان شاڵاوەکانی خۆیان بەهێزتردەکرد بۆکوشتی سەربازەکانمان، لەوشوێنانەی کەوەرگێڕەکانی لێبوون، توانییان لەگەڵ ڕەشپێستەکاندا قسەکەن وئەوان تێبگەیەنن، کەپێویستە دەست لەشەڕکردن هەڵبگرن بۆئەوەی بەزیندوویی بمێننەوە، ڕەشپێستەکان

دەستیان لەشەڕکردن هەڵگرت، بەلام لەشوێنەکانی تردا ڕەشپێستەکان خۆیان بەکوشتدەداو نەیاندەتوانی تێبگەن لەوەی ئەگەربەدیل بگیردرێن لەکوشتن ڕزگاریان دەبێت.
بۆیە بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی پاشای میسرەوە، ژمارەی ئەوانەی بەدیلگیران زۆرنەبوون، لەبەرئەوەی سەربازانی فیدائی بەهۆی دوو ڕۆژ شەڕکردن، ماندوو ببوون، دوای هاتنی تاریکی مۆڵەتیان بەهەموویاندا کەبچن پشووبدەن، هەندێك لەڕەشپێستەکانیش توانییان خۆیان لەوبۆسانە ڕزگاربکەن کەبۆیان دانرابوو وهەڵهاتن وکەوتنە دەشتاییەکانی دەم ڕووباری نیل.
- سیزاریۆی فەرماندەی سوپای میسر بەباشی نەزانی بەوتاریکەشەوە دوای ئەوڕەشپێستە هەڵهاتووانە بکەوێت، بۆیە گوتی: ئەوانە مەحکومن بەمردن و زوو-یان درەنگ، دەمرن، لەبەرئەوەی فیدائییەکانیش مۆڵەتی پشوودانیان وەرگرتووە، بۆیەنابێت سەنگەرەکانی بەرگری لەشار چۆڵبکەین. هەروەها ناوباو پێی وابوو، ئێمە یەك دوو ڕۆژێتر دەتوانین بەهەزار سەربازو چل پەنجا عەرەبانەی جەنگییەوە، هەموو ئەو ڕەشپێستانە بکوژین کەلەوناوچانەی دلتای نیلدا پەرش وبڵاوبوونەتەوە، بۆیە ئەمشەو بەدوانیاندا ناچم.
پاشای میسر دەیویست هەرهەمان شەو دیلەکانی شەڕ ناچاربکات لاشەی هاونەژادەکانیان لەدەروبەری شار دووربخەنەوە، بەلام ئەوگرفتە هاتەپێش، ئەویش ئەوەبوو ئەولاشانە چی لێبکەن؟
ئەگەر ئەولاشانە بخەنەڕووباری نیلەوە، هەرچەندە تەرمەکان بەرەودەریا دەبات- یان تێیدا نوقمدەبن، بەلام پاش سێ ڕۆژ ئەوتەرمانە دەئاوسێن ودەکەونەوە سەرئاو، کاتێك مردوو سەرەتا نوقم دەبێت، پاشان دوای دووسێ ڕۆژ کەئاوسا سەرئاودەکەوێتەوە، کاتێکیش تەرمی ئەو ڕەشپێستانە سەرئاوکەوتنەوە، شەپۆلەکانی دەریا ڕووەو ڕۆخەکانی نیل دەیان هێنێتەوەو بۆگەنیان تێکەڵ بەهەوای شاردەبێت وشار پڕدەکەن لەبۆگەن، هەروەك ئەوەی تەرمەکانیان لەئەسکەندەرییە دوور نەخرابنەوە وایە، لەبەرئەمە ئەورایەیان گۆڕی ولەبری ئەوەی بیانخەنە ئاوی نیلەوە، بڕیاریاندا بیاننێژن، بەلام کاتێك بیریانکردەوە، بۆیان دەرکەوت ناشتنیشیان لەقەراخ دەریاکەدا هەڵەیە، چونکە وەرزێ خاکی هەردوولای ڕووباری نیل کشتوکاڵی لێدەکرێت ودەکێڵدرێت، پاشان هەموو ساڵێکیش قوڕاوو سێلاوی نیل لەسەر ئەم شوێنانە دەنیشتن وئەو تەرمانە ژێرئاو دەکەون، هەروەها خاکی میسر کەبەلای میسرییەکانەوە خاکێکی پیرۆزە، هەرلەبەرئەوە نابێت لاشەی ڕەشپێستەکان لەشوێنێکدا بنێژرێت کەمیسرییەکان بەپیرۆزی دادەنێن، لەبەرئەوە بەتلیمۆسی سێزدەهەم، بڕیاریدا دیلەکان تەرمی هاونەژادەکانی خۆیان، بەرن لەشوێنێکی دوور لەڕۆخی ڕووباری نیل وناوچەی دلتادا بەخاکبسپێرن، لەبەرئەوەی لاشەکانیش زۆربوون، بۆیە بۆهەڵگرتنی ئەولاشانە پێویستی بەعەرەبانەبوو، تاهەرچی زووتره ئەوتەرمانە لابەن وهەوای شار بۆگەن نەکات.
دوای ئەوەی پاشای میسر فەرمانیدا هەندێك عەرەبانە کەلەشاردان، بدرێنەدەست ڕەشپێستەکان بۆلابردنی تەرمەکان. ڕەشپێستەکان تەرمەکانیان لەعەرەبانەکاندا هەڵدەچنی وبەرەو بیابانیان دەبردن، ئەوەیش بەیاوەری هەندێك لەسەربازانی سوپا، کەلەگەڵیاندا دەچوون، تاڕەشپێستەکان لەڕێگادا خۆیان نەشارنەوەو هەڵنەیێن.

لەشوێنێکی دوورەدەستی بیابانەکەدا کەدوور لەزەوییە کشتوکاڵییەکانی میسر بوو، ڕەشپێستەکان چاڵی گەورەو قوڵیان هەڵدەکەندو لاشەکانیان دەهاویشتەناوی، تاچاڵەکان پڕدەبوون لەتەرمی ڕەشپێستەکان، دواتر خۆڵیان بەسەردا دەکردن ودایان دەپۆشین.

– بەتلیمۆسی سێزدەهەم گوتبووی: پاشئەوەی تەرمەکان دەبەنە بیابان، نابێت لەوێدا جێیان بهێڵن، دەبێت بیانکەن بەژێرخاکەوە، چونکە ئەگەر ئەولاشانە لەبیاباندا جێبهێڵن، دەبێتەخۆراکی باڵندە گۆشتخۆرو ئەو باڵندانەی کەمردوو دەخۆن، دوای ئەوەی تەرمی ڕەشپێستەکانیان خوارد، بەرەو ئەسکەندەرییە دێن، ئەمەش لەوانەیە ببێتەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، بەڵام ئەگەر لاشەکان بخرێنە ژێرخاکەوە، ئەوا باڵندە گۆشتخۆرەکان ناتوانن بیانخۆن ونەخۆشی بڵاونابێتەوە.

پاشئەوەی تەرمی کوژراوە ڕەشپێستەکانیان خستەژێر خاك وهەموو ئەوخوێنەشیان کەلەسەر زەوی ڕژابوو، لەلایەن دیلەکانەوە شۆراو پاککرایەوە، خەڵکی شار چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد ڕووداوەکەی سەردەمی بەتلیمۆسی دووەم، دووبارە ببێتەوە، بەڵام ئەوە ڕووینەداو بەتلیمۆسی سینزەهەم لەجیاتی ئەوەی دیلەکان بکوژێت، وەك کۆیلە دابەشیکردن بەسەر ئەوجوتیارو ئاژەڵدارانەی لەئەنجامی هێرشی ڕەشپێستەکاندا زیانیان لێکەوتبوو.

– پاشای میسر گوتی: لەگەڵ ئەوەشدا بەتلیمۆسی دووەم، بەپاشایەکی مەزن لەقەڵەم دەدرێت، بەڵام ئەوکارەی ئەو سەبارەت بەکوشتنی ڕەشپێستە دیلەکان، کارێکی شێتانەبووە، نەدەبووایە دیلە ڕەشپێستەکانی بکوشتایە، بەڵکو دەبوو بیاندات بەجوتیاران بۆئەوەی لەکێڵگەکانیاندا کەڵکیان لێوەربگرێن وکاریان پێبکەن، تاهەندێك لەوزیانانەی کەلەلایەن ڕەشپێستەکانەوە پێیان گەیشتووە، پڕبکرێتەوەو قەرەبوو بکەنەوە.

پاشای میسر نەك هەر چاوپۆشی لەکوشتنی ئەودیلانەکرد کەژمارەیان بیست ودوو هەزار بوو، بەڵکو ئەوانەش لەدەشتەکانی دلتاشدا پەرتوبڵاو ببوونەوە، بەدیل دەیگرتن ونەیدەکوشتن وچارەنووسی ئەمانیش هەمان چارەنووسی دیلە هاونەژادەکانیان چاوەڕێیان بوو.

دوای ئەوەی ئەوڕووداوە ترسناکەی هەرگیز من لەبیرم ناچێتەوەو هیوام وایە لەمێژووی میسردا دووبارە نەبێتەوە، ئینجا سێڵاوی ڕووباری نیل دەستیپێکردو ئاو لەناوچەی دلتادا بەخێرایی بەرزبووەوەو هەموو زەوییەکانی داپۆشی.

ئەوەی کەڕەشپێستەکانی ورووژاندو هێرشیانکرد، وشکەساڵی وبرسییەتی بوو، بەڵام ئاوی نیل لەساڵانی ڕابردوو زیاتر لافاوی هێنا، بەشێوەیەك دامەزراوەی ئەندازیاری میسر کەدوو بنکەی سەرەکی هەبوو، یەکێکیان لەئەسکەندەرییەو ئەویتریان لەشارێکی کۆن بەناوی تەبس بوو، لەوساڵەدا ڕایانگەیاند کەلافاوی ئاوی نیل بەئەندازەیەك بەهێزە کەئاوی نیلی بیست وپێنج ئانیشك لەساڵان زیاتر بەرزکردووەتەوە، هیچ کەس لەئەسکەندەرییەدا چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد، ئاوی نیل ئەوەندە بەرزببێتەوە هەموو زەوییەکانی ناوچەی دلتا داپۆشێت.

ساڵانی ڕابردوو کاتێك نیل بەرزدەبۆوە لەدەوروبەری بەرزاییەکانی دلتادا نزیکەی فەرسەخێك خاك دیاردەماو ئاو هەمووی دانەدەپۆشی، بەڵام لەوساڵەدا هەموو زەوییەکانی ناوەوەی دلتا پڕبوون لەئاو، بەشێوەیەك خەڵك لەبەشێکی ئەو ڕووبارەوە بۆبەشێکیتری بەبەلەم دەپەڕینەوە.

دوای ئەوەی سێڵاوی نیل هەستا، پاشای میسر بەکلیۆپاترای گوت: ئایا حەقبوو کەلەکوشتنی دیلە ڕەشپێستەکان دەستم پاراست- یان نا؟ ئەگەر وانەبووایە ئەواجوتیارەکان لەکاری ڕەشپێستەکان بێبەشدەبوون، بەڵام ئێستا ئەوجووتیارانە دەتوانن سود لەکاری ئەو ڕەشپێستانە وەربگرن، لەکاتێکدا کەئەمساڵ ئاوی نیل هێندە زۆرە، جوتیارەکان دەتوانن سێ بەرامبەر ساڵانی پێشوو تۆ وبچێنن وبەرهەمیان هەبێت.

لەنیشتمانەکەماندا نەریتی گشتی ئەوەیە ئەوساتەی ڕووباری نیل سێڵاوی گەورە دروستدەکات وپانتاییەکی زۆری زەوی دەگرێتەوە، دوای ئەوەی ئاوەکە کشایەوە، دەتوانرێت زەوییەکان دووجار بچێنرێن، بەپێچەوانەی ئەوساڵانەی کەسێڵاوی ئاوی نیل باش نییەو ئاوی ڕووبار زۆر بەزنابێتەوە، پێشئەوەی بەروبوومی یەکەم بچێننەوە تووشی گرفت دەبن، چونکە ئەوجۆگایانەی کەلەمبەرو ئەوبەری نیلدان نزمن، ناتوانرێت بەسەر زەوییەکەدا سواربن، ئاوەکە نزمتردەبێت.

لەمێژووی میسردا بەدەگمەن وارێککەوتووە جوتیاران بتوانن لەهەموو ناوەوەوی دلتادا کشتوکاڵ بکەن، بەڵام لەوساڵەدا تەواوی زەوییەکانی ئەوناوچەیە دەتوانرا بکرێت بەکشوکاڵ، بۆئەمەش تەنها کەڵکیان لەکاری ڕەشپێستەکان وەرنەگرت، بەڵکو داوایان لەکۆمەڵێك خەڵککرد کەلەبیابانی سینادا دەژیان، بێن بۆ میسر بۆزەوی کێڵان ویارمەتییان بدەن.

ئەگەر کەسێك ساڵێك لەمیسردا ژیابێت، دەزانێت کێڵانی زەوی لەمیسردا زۆر ئاسانە، چونکە دوای ئەوەی ئاوی نیل نیشتەوە، زەوییە کشتوکاڵییەکان بەشێوەیەك نەرم دەبن، کەهەموو کەس دەتوانێت بەنیروموورەیدار، بەبێ هاوکاری کەسێکیتر هەموو زەوییەکە بکێڵێت، ئەوزەوییە چێندراوەش پێویستی بەچاودێریی نییە، جگەلەوەی لەکاتی خۆیدا ئاوی بدەیت، بۆئەوەی ئەوکشتوکاڵە زوو سەردەربهێنێت وچەکەرەبکات وپێبگات.

لەوساڵەدا هەموو زەوی وزاری دلتا داچێنندراو جووتیارەکانی میسر توانییان چەند بەرامبەری ساڵانی ڕابردوو کەڵکی لێوەربگرن، لەوساڵەدا جووتیارەکانی میسر ئەوەندە بەروبوومی کشتوکاڵییان دەستکەوت بەئاستێکبوو کەهەندێك لەدەغڵ ودانی پێویستی خۆیان لەعەمبارەکاندا هەڵبگرن وئەوی تری بەناچاری لەبیاباندا بخەنەژێر گڵ، بۆئەوەی کەباران باری، دانەوێڵەکەیان نەڕزێت وبابڵاوی نەکاتەوە.

پاشای میسریش لەحەقی ئەو زیانانەی کەبەهۆی هێرشی ڕەشپێستەکانەوە بەجوتیاران گەیشتبوو، باجی ساڵانەی بەجوتیارەکان بەخشی وئەم لێخۆشبوونە لەباج، لەلایەن پاشاوە، وەك فیداکارییەك وابوو، چونکە ئەوباجەی لەجوتیاران وەردەگیرا، یەکێکبوو لەداهاتە سەرەکییەکانی دەوڵەت. پاشا لەوساڵەدا هەندێك پارەشی بۆسوپا خەرجکرد، هەرچەندە عەمبارەکانیش بەتاڵبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزی نەدەکرد لەجوتیاران وەربگرێت، چونکە دەیزانی ماڵی جوتیارەکان بەهۆی هێرشی ڕەشپێستەکانەوە وێرانبووەو دانەوێڵەو کەرەستەکانی کشتوکاڵی ئەمانە فەوتاوە. بۆیە پاشای میسر لەبری ئەوە ویستی کەمی بودجە بەداهاتی شوێنی ڕابواردنی گشتی پڕبکاتەوە، بەوهیوایەی پاشئەوەی مەترسی ڕەشپێستەکان لەسەر ئەسکەندەرییە ڕەوییەوە، گەشتیارانی بیابانی زیاتربێن بۆئەسکەندەرییەو داهاتی شوێنی ڕابواردنی گشتی ڕوولەزیادبوون بکات.

## ئەرسینۆهە دەیویست جێگای کلیۆپاترا بگرێتەوە

من لەسەرەتای سەرگوزەشتەکەی خۆمدا گوتم: کلیۆپاترا خوشکێکی هەبوو بەناوی ئەرسینۆهە، هەر لەمنداڵییەوە ئاکاری ئەوکچە لەهی کلیۆپاترا دەچوو، هەرچەند ئەوکچە گەورەتر دەبوو، شێوەی زیاتر دەچۆوەسەر کلیۆپاترا، تەنها ئەوکەسانەی کەشەو ورۆژ لەگەڵ کلیۆپاتراو ئەرسینۆهە دابوون، دەیانتوانی درك بەجیاوازی ئاکاری نێوان ئەودوانە بکەن، کەهەم لەڕووی لەشیانەوەو هەم لەڕووی ڕۆحی وشێوازی قسەکردنیانەوە، جیاوازیان هەبوو.
کلیۆپاترا هەندێ لەئارسینۆهە بەرزتربوو ولوتێکی گەورەتریشی هەبوو، بەڵام لەدەراوی دەمیاندا زۆر جیاوازبوون، کلیۆپاترا بەدەنگێکی خۆش وگفتولفتێکی جوان دەدوا، بەشێوەیەك گوێگران لەزەتیان لەبیستنی دەنگی ئەو دەبرد، لەکاتێکا ئەرسینۆهە دەنگێکی نزم ودەراوی دەمی نائاسازبوو وبیستنی دەنگەکەی خۆشنەبوو- هەروەها هەڵسوکەوت وئەتواری کلیۆپاترا جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەرسینۆهەدا، کلیۆپاترا هەڵسوکەوتی جوان وشکۆداری هەبوون، لەقسەکردندا کاتێ سەرو دەستی دەجوڵاندن، معلوم دەبوو کەکچی پاشای میسرە، ئەرسینۆهەش نەیدەتوانی بەوشێوەیە قسەبکات، کاتێ کەقسەی دەکرد، بەشێوەیەك سەرودەستی دەجوڵاندن، مرۆڤ وادەزانی یەکێکە لەوژنانەی کەلەسەر یەکێك لەجۆگە تەختەکانی ڕووباری نیل دانیشتووەو لەگەڵ کوڵکردن وجل شتندا خەریکی قسەکردنن، لەوانەیە وای بۆبچن من چونکە کارەکەری پاشای میسر بووم، هەموو شتێکی ئەوم بەجوان هاتۆتەبەرچاو وسەبارەت بەئەرسینۆهەش، زیادی پێوەدەنێم، من تەنها کەسێك نەبووم کەسەبارەت بەکلیۆپاتراو ئەرسینۆهە ڕای خۆم دەربڕم، جگەلە من هەموو ئەوکەسانەی لەکۆشکی پاشایەتیدا خزمەتیاندەکردو ئەو دوو خوشکەیان بینیوە، دەزانن کەکلیۆپاترا لەڕووی چۆنایەتییەوە لەئەرسینۆهە لێوەشاوەترە، ئەوانەی بەوردبینییەوە سەیری جوانی ئافرەت دەکەن، تەنها یەك کەموکوڕیان لەئاکاری کلیۆپاترادا بەدی دەکرد، ئەویش گەورەیی لوتی بوو، پێویستە بڵێم لوتی کلیۆپاترا هەندێ لەلوتی ئاسایی گەورەتربوو، من گەورەیی لوتی ئەوم بەیەکێك لەشۆمەندی وگەورەیی ئەو دەزانی وپێموابوو ئەگەر لوتی کلیۆپاترا بچووکبا ئەوا ئاکاری جوانی دەموچاوی کەمدەبوو وسەرنجڕاکێش نەدەبوو، ئەمەم بەهەموو ئەوکەسانە دەگوت کەتێبینییان لەسەرجوانی کچی پاشای میسر، کلیۆپاترا هەبوو، تائەو ڕۆژەی کەکاڵ بەمنی گوت کلیۆپاترا جوانترین ژنی میسرە، من هەموو کاتێك بەرگریم لەجوانی کلیۆپاترا دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی کاڵ ئەوی پێ لەمن جوانتربوو، دڵم سیسبوو، لەگەڵ هەموو ئەوەشدا لەدڵی خۆشمدا باوەڕم کرد کەکلیۆپاترا لەمن جوانترە.
جوانی کلیۆپاترا جوانی یۆنانی بوو، مووی سەرو برۆکانی ڕەشبوون وچاوی هەنگوینی وگەورە بوون، لوتە گەورەکەی ئەو دەمە جوانەکەی شاردبوونەوە ، بەڵام من باڵای یەك جوانی ژنی میسریم هەبوو ،

ئاشکرایە جوانی میسری ناگاتە جوانی یۆنانی ، لەگەڵ ئەوەشدا من چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کاڵ ئاوا بە ڕاشکاوی بەمن بڵێت کلیۆپاترا لەتۆ جوانترە .

ئەرسینۆهە وەك خوشکەکەی بڕۆو قژی ڕەشی هەبوون وچاوی هەنگوینی بوون، بەڵام چاوی ئەرسینۆهە تۆختر دیاربوون ولەڕووناکیدا گەشاوەیی وبریقەداری چاوەکانی کلیۆپاترای نەبوو، دەمی ئەرسینۆهە وەك لێوەکانی کلیۆپاترا بچوکبوون، بەڵام ئەوەندە جوان وڕێك نەبوون، ئەرسینۆهە لەبەرئەوەی لوتێکی نەگەورەو نەبچوکی هەبوو خۆی لەکلیۆپاترا بەجوانتر دەزانی. هەتائەو ڕۆژەی بەتلیمۆسی سێزدەهەم زیندووبوو، ئەو دوو خوشکە ئەگەرچی ئازادیان هەبوو، بەڵام هەرلەژێر چاودێری باویاندابوون، دوای ئەوەی بەتلیمۆسی سێزدەهەم مرد، هەردوو ئەو خوشکانە بوونەخاوەنی ئازادی تەواو، من هەستمپێکرد کەلەنێوان کلیۆپاتراو ئەرسینۆهەدا لالوتییەك پەیدابووە.

یەکەمین هۆکاری دروستبوونی ئەو لالوتییە ئەوەبوو ئەرسینۆهە دەیگوت: بۆچی کلیۆپاترایان داوە بەبراکەم؟ بۆی منیان نەداوە بەبراکەم، لەکاتێکا من لەکلیۆپاترا جوانترم.

ئەرسینۆهە لەو بڕوایەدابوو بەدانی کلیۆپاترا بەبراکەی، زوڵمیانکردووە.

یەکێك لەمانەش ئەوەیە کەپاشای میسریان ناچارکردووە کەژیان لەگەڵ ژنێکی ناشیریندا بەسەربەرێت، بەمەش ئەرسینۆهەیان لەشوکردن بەپاشای[53] میسر، بێبەشکرد.

53- پاشای میسر، مەبەست لەبەتلیمۆسی سێزدەهەم نییە کەلێرەدا ئەومردووە، بەڵکو مەبەست لەبەتلیمۆسی چواردەهەمە، کەکوڕی پاشای ڕابردووەو برای ئەرسینۆهەو مێردو برای کلیۆپاترایە (وەرگێڕی کوردی)

من لەئەرسینۆهەم بیستووە کەدەیگوت: پاشای میسر تائێستا خوشکەکەی بەوچاوە سەیرنەکردووە کەدەبێ ڕۆژێك ببێتە ژنی، لەنزیکەوە بەوچاوە ئەوی نەدیوە، شرمیون کەکارەکەری کلیۆپاتراو ڕازی نهێنی ئەوت لایە، تۆ دەکەم بەشاهید هەرکاتێ براکەم چوو بۆ ژوورەکەی کلیۆپاترا، بەجۆرێك سەری لەزلی لوتی کلیۆپاترا دەسوڕمێت، ڕاکات، بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەرسینۆهە، بەتلیمۆسی چوارەهەم مێردی کلیۆپاترا، کاتێ دەگەیشتە هۆدەکەی ئەو لەبینینی لەلوتی کلیۆپاترا سەری نەسوڕما.

کاتێ ئەرسینۆهە زانی ناکۆکییەك لەنێوان براکەی وکلیۆپاترادا هەیە، زۆری پێخۆشبوو، ناکۆکی نێوان ئەو دووانە (وەك باسمکرد) لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کەکلیۆپاترا دەیگوت: پاشای میسر کەسێکی لاوازو بێتوانایە، بۆیە ناتوانێت ئەو بەهاوسەری خۆی قەبوڵبکات، پاشای میسریش گازەندەی ئەوەی دەکرد کەکلیۆپاترا نایەڵێت ببێت بەمێردی ونزیکی کەوێت.

دوای ئەوەی ئەرسینۆهە زانی ناکۆکی کەوتۆتە نێوان خوشك وبراکانی، ئومێدی ئەوەی پەیداکرد کەبەیەکگەیشتنی کلیۆپاتراو براکەی بەتلیمۆسی چواردەهەم، تێکبدات، ئەو چوو بووەلای ڕەهبانی پەرستگای (دلف)ی ئەسکەندەرییە کەسەبارەت بەکاروباری هاوسەرێتی سەرچاوەبوو، پێی گوتبوو: خوشکەکەم کلیۆپاترا دەڵێت مێردەکەی کەسێکی بێتوانایەو ئەو ناتوانێت لێمببێت بەپیاو، ئایا تۆ پێتوایە لەم حاڵەتەدا دەتوانی هاوسەرێتی ئەم دووانە هەڵوەشێنیتەوە، ڕەهبانی پەرستگای (دلف) پێی

گوتبوو من ئاگام لەم مەسەلەیە هەیە، چونکە وەزیرەکانی میسر منیان لەمە ئاگادارکردۆتەوەو داوای ڕێگاچارەیان لێکردووەم، منیش بەئەوانم گوتووە بێتوانایی کوڕێکی لاوی وەك بەتلیمۆسی چواردەهەم، جێگای سەرسوڕمانەو ناتوانرێت ئەو تۆمەتەی کلیۆپاترا بەشتێکی ڕاست لەقەڵەم بدرێت، بەتایبەت چونکە بەتلیمۆسیش گازندەو گلەیی لەوەهەن کەکلیۆپاترا ئامادەنییە ئەرکی هاوسەرێتی لەگەڵ ئەودا بەئەنجام بگەیەنێت.

ڕەهبانەکە گوتبووی: لەوەدەچێت ئەوەی کەبۆتەهۆی بێتوانایی پاشا، ڕێگانەدانی ئەو لەلایەن کلیۆپاتراوەیەو لەمەدا حەزیان لەیەکتری نییە، لەبەرئەوەی چارەی یەکتریان ناوێت، کاتێ بەیەکتری دەگەن خۆشەویستی ژن ومێردایەتی لەئەواندا دروستنابێت، ئەگەر ئەو خۆشەویستییەش نەبوو، ناتوانرێت ئەرکی ژن ومێردایەتی بەئەنجام بگەیەنن، ئەمە دڵی ئەرسینۆهەی خۆشکردووە. گوتویەتی: ئەگەری ئەوەهەیە ئەم دوو کەسە لەیەکتری جیابینەوەو براکەم ژنێکیتر بهێنێت؟

ڕەهبان گوتویەتی: ئەگەر ڕوون بێتەوە براکەت بێتوانایە- یان ئەگەر ساغبکرێتەوە کلیۆپاترا ئامادەنییە ئەرکی ژن ومێردایەتی لەگەڵ مێردەکەیدا جێبەجێ ناکات، حوکمی دەستلێهەڵگرتنەکەی دەردەکرێت وبراکەت دەتوانێت ژنێکیتر بهێنێت وکلیۆپاتراش شوێکیتر بکات، بەڵام سەلماندنی پروپاگەندەی ژن ومێرد، زۆر دیژوارە، چونکە پێویستی بەگەواهی دەرهەیەو بەدەستهێنانی شاهیدش بۆ پشتگیریکردنی قسەی براکەت- یان خوشکەکەت، گرفتە، لەبەرئەمە باوکت خوشکەکەتیدا بەبراکەت، بۆئەوەی کلیۆپاترا شوو بەبێگانان نەکات ونەبراکەشت ژنێکی بیانی بێنێت، مەبەستی باوکت لەمە ئەوەبوو کەڕۆڵەکانی شوو بەبێگانە نەکەن وبەهۆی ئەمەوە زنجیرەی بەتاڵسە لەمیسردا لاوازنەبێت.

- ئەرسینۆهە پرسیویەتی: ئەی چی بکرێت؟

ناوبراو لەوەڵامدا گوتویەتی، ئەگەر نەتوانێت بیسەلمێنرێت ژن- یان پیاو لەپروپاگەندەی خۆیاندا ڕاست دەڵێن، ناتوانرێت ڕێگایەك بگیردرێتتەبەر بۆ لێکجیاکردنەوەی ژن ومێرد.

ئەرسینۆهە گوتویەتی: ئایا دوای ئەوەی کلیۆپاترا لەبراکەم جیابۆوە، من دەتوانم شووی پێبکەم -یان نا؟

ڕەهبانەکە گوتیەتی: لەمەسەلەی ژن ومێردایەتیدا ڕەزامەندی هەردوولا مەرجە، مەگەر بەرژەوەندی دەوڵەت ئەمە فەرزبکات کەهاوسەرێتی بەبێ ڕەزامەندی مێردو ژنەکەبێت.

ئەرسینۆهە پرسیویەتی: هەمان ئەو بەرژەوەندیەی کەبووەهۆی ئەوەی کلیۆپاترا ببێتە ژنی براکەم، ناتوانرێت بپارێزرێت کەمن لەبری کلیۆپاترا ببمەژنی براکەم.

ڕاهیبەکە وەلامی داوەتەوە: ڕاستە، بەڵام کلیۆپاترا بەپێی دەستوری وەسیەتنامەی باوکت، بۆتە ژنی براکەی تۆ، باوکت وەسیەتی نەکردووە تۆببیە ژنی بەتلیمۆسی چواردەهەم.

سەرەتا ئەگەر ژن وپیاو ڕەزامەندی هاوسەرێتی یەکتریان نەکرد، ئەوا ناچاردەبن ببنە هاوسەری یەکتری و وەسیەتەکەی باوکت جێبەجێ بکەن، ئەمەش بۆهاوسەرێتی پێویستە بکرێت، بەڵام لێرەدا مەسەلەی تەڵاقدانەکەی بۆتە کێشە، ناتوانرێت کلیۆپاتراو براکەت لەیەکتری جیابکرێنەوە، چونکە شاهید لەنێوانیاندانییە تاگەواهی بدات کەپڕوپاگەندەی یەکێك لەمانە، ڕاستە.

ئەرسینۆهە گوتویەتی: من ئەم موشکیلەیە چارەسەر دەکەم!

ڕەهبانەکە هەندێ لەئەرسینۆهەی ڕوانیوەو ولێی پرسیوە، ئایا تۆدەتوانیت شاهید بێنیت وبیسەلمێنی کەیەکێك لەم دووانە درۆدەکات؟

ئەرسینۆهە گوتویەتی: بەڵێ.

ڕەهبانەکە، ئاگاداری کردۆتەوە: ئەرسینۆهە ئەوەبزانە سەبارەت بەم مەسەلەیە، هێنانی شاهید دیژوارە.

– ئەرسینۆهە گوتویەتی: لەگەڵ ئەمەشدا من شاهید دەهێنم، هەتا ئەگەر تۆشبیت.

– ڕەهبانی پەرستگای دلف پرسیویەتی: مەبەستت لەوەی دەڵێیت شاهیدەکە ئەگەر تۆشبیت، چییە؟

– ئەرسینۆهە گوتویەتی: کلیۆپاترا دەڵێت براکەم بێ توانایە، منیش بەبەڵگە ئەمە ڕووندەکەمەوە هەتا مەعلوم بێت، ئایا کلیۆپاترا ڕاستدەکات– یان لەبەرئەوەیە چارەی براکەمی ناوێت، بۆیە وادەڵێت، چونکە من بیستومە ئەوژنانەی کەچارەی دەزگیرانەکانیان ناوێت وئەرکی ژن ومێردایەتی ئەنجام نادەن، دەڵێن من دریغیم نەکردووە، بەڵام مێردەکەم بێتوانایەو هیچ کەسێکیش ناتوانێت قسەی ئەو ژنە بەدرۆبخاتەوە، چونکە لەڕۆژانی سەرەتای هاوسەریەتیدا کەژنەکە نەبۆتە خاوەنی منداڵ، بۆئەوەی بڵێن ئەگەر توانای ئەرکی ژن ومێردایەتی نییە بۆچی منداڵتان هەیە، کلیۆپاتراش کەچارەی براکەمی ناوێت، ئەو ڕستە کۆنە بەکاردەهێنێت، بەڵام من (ئەرسینۆهە) ئەگەر هەلم بۆبڕەخسێ وبەڕاستی پێویستکا، ئەوا ئەو فێڵەی ئەو ئاشکرادەکەم.

ڕەهبانەکە پرسیویەتی: ئەرسینۆهە ئایا تۆدەزانی بۆسەلماندنی ئەم فرتوفێڵەی کلیۆپاترا، توشی سزای کەتن دەبیت، چونکە هەر پەیوەندییەکی ژن ومێردانە لەنێوان تۆ وبەتلیمۆسی چواردەهەمدا ببینرێت، بەوەی کەئەو ژنی هەیە، بەتاوان لەقەڵەم دەدرێت وگوێ لەقسەکانت ناگیردرێت وکەس بەڕاستگۆت نازانێ.

– ئەرسینۆهە گوتویەتی: ئەگەر من ئەوکارە بەهۆی کەسێکیتر ئەنجام بدەم چۆنە؟

ڕەهبانەکە گوتویەتی: ڕاتی ئەمەش پەیوەندی بەوکەسەوە هەیە کەبەمکارە هەڵدەستێت.

– ئەرسینۆهە پرسیویەتی: ئایا ناتوانرێت لەڕێگای یەکێك لەژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی ئەم کارە بکەین؟

ڕەهبانەکە: بۆنا، بەڵام گەواهیدانی ئەمانە قبوڵنییە، چونکە گەواهیدانی ئەمانە سەبارەت بەکاروباری هاوسەرێتی گوێی لێناگیردرێت وئیعتباری نییە، چونکە ئەو ژنانە بەهۆی ئەوەی لەشوێنی ڕابواردنی گشتدا کاردەکەن، بۆ مەسەلەی گەواهیدان لەسەر ژن ومێرایەتی خەڵکانیتر، شیاونییە.

من ئەمەم لەیەکێك لەوکەسانە بیست کەلەناو کۆشکی پاشایەتیدا کاردەکەن.

من بەوەی کەکارەکەری کلیۆپاتراشبووم، وام هەستدەکرد بۆچوونەکەی ئەرسینۆهە هەڵەنییە، چونکە کلیۆپاترا چارەی بەتلیمۆسی چواردەهەمی برای نەدەویست، بەو شێوەیەی گوتم، ئەو ڕۆژە گەورەترین ئیهانە کەژنێك لەبەرامبەر پیاوێکدا بیکات، بەتایبەت یەك ژن لەبەرامبەر مێردەکەیدا بیکات، کلیۆپاترا بەبراکەی کرد، من پێموابوو کلیۆپاترا چارەی براکەی ناوێت، ئەی بۆنایەوێت لێی جیابێتەوە، بۆئەوەی خوشکەکەی ئەرسینۆهە ببێ بەهاوسەری بەتلیمۆس.

دواتر بیرمکردەوە هەرچەندە کلیۆپاترا کچی پاشای میسرەو دوای مردنی باوکی، دەبێت شاژن، ئەگەر هاوسەرێتی براکەی قبوڵبێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو ژنێکە نایەوێت کەسێکیکە ببێتە

هاوسەری براکەی وجێگاکەی ئەوبگرێتەوە، لەوانەشە قسەکەی کلیۆپاترا سەبارەت بەبێتوانایی براکەی لەجێبەجێکردنی ئەرکی ژن ومێردایەتی ڕاستبێت و ئەوخەتای نەبێت،

بەهەر شێوەیەکبێت ڕکەبەرێی ئەرسینۆهە لەگەڵ خوشکەکەیدا، سەبارەت بەهاوسەریەتیەکەی بەتلیمۆس، تاریکایی بەسەر پەیوەندی نێوان ئەو دوو خوشکەدا هێنا.

– ڕۆژێکیان ئەرسینۆهە منی لەناو کۆشکی پاشایەتیدا بینی وپێی گوتم شرمیون من ئیشێکم بەتۆ هەیە..

– گوتم: خاتوونەکەم چ فەرمانێکت هەیە؟

– ئەرسینۆهە گوتی: ئەوکارەی من بەتۆم هەیە، شتێکە ناتوانرێت لێرەدا باسی بکەم، دوای نیوەڕۆ بچۆ بۆباغی پرتەقاڵەکان وئەوێ چۆڵەو لەوێدا لەگەڵتا باسدەکەم، بەشێك لەباغی پاشا، یەك باغی پرتەقاڵی گەورەبوو، لەوێدا درەختی نارنج ولیمۆ ولالەنگی وپرتەقاڵیان ناشتبوون، لەوەرزی بەهارو هاویندا دوای نیوەڕۆیان ناو ئەودرەختە پرتەقاڵانە گەرم دەبوو، چونکە ئەودرەختانە وەك درەختە بەهێزو بەتەمەنەکانی تری بەشەکانیتری باغی پاشایەتی سێبەریان نەبوو، لەهەموو شوێنەکانی تری باغی پاشایەتیدا تۆزە تاوێك نەدەکەوتەسەر زەوی، بەڵام لەبەشی باغی پرتەقاڵەکاندا سێبەر کەمبوو، بۆیەش ئەوشوێنە گەرم بوو ودوای نیوەڕۆی بەهاران وهاوینان، کەس نەدەچوو بۆئەوێ، دوای نیوەڕۆ چووم بۆئەوێ ولەچاوەڕوانی ئەرسینۆهەدا لەژێر درەختێکی پەرتەقاڵدا دانیشتم، دوای ئەوەی ئەرسینۆهە هات، من بۆ ڕێزگرتن لەئەو هەستامە سەرپێو ئەو دەستی گرتم وگوتی: شرمیون پێش ئەوەی من بەتۆ بڵێم ئیشەکەم چییە، لەتۆ دەپرسم ئایا منت خۆشدەوێت– یان نا؟

– گوتم: خاتوونەکەم بۆدەشێت خاتوونەکەم لێرە کەس تۆی خۆشنەوێت؟ بەڵام گریمان کەسێکی واهەبوو کەتۆی خۆشنەوێت، ئایا ئەمە کاردەکاتەسەر ئێوە؟ تۆ ئەوەندە گەورەیت کەکارەکەرێکی وەکو من، ئێوەی خۆشنەوێت، بچوکترین کاریگەری لەسەر ژیانی ئێوەنابێت.

– ئەرسینۆهە گوتی: ئەگەر تۆمنت خۆشبوێت ئەوکارەی بەتۆی دەسپێرم لەڕووی ڕەزامەندی و ئارەزووەوە دەبێ ئەم کارەم بۆئەنجام بدەی، ئەگەرنا لێیی گەڕێ.

– پێم گوت: من تۆم خۆشدەوێت، چونکە تۆخوشکی ئازیزی خاتوونەکەی منی.

– ئەرسینۆهە پرسی: ئایا کلیۆپاترات خۆشدەوێت یان– نا؟

– گوتم: بەڵێ ئەوم خۆشدەوێت.

– ئەرسینۆهە گوتی: من دەمەوێت کارێك بەتۆ بسپێرم کەلەبەرژەوەندی کلیۆپاترای خاتوونی تۆیەو لەبەرژەوەندی منیشە، ئەگەرتۆ ئەمکارە بەپێی ئارەزووی من ئەنجام بدەی، تۆ لەکلیۆپاترا دەکڕمەوەو ئازادت دەکەم، هەروەها پێداویستی شوکردنەکەشت دابین دەکەم و چ گەنجێکت پێخۆشە دەتدەم بەئەو.

– پێم گوت: ئایا تۆ پێتوایە من حەزم لەشوکردن بێت؟

– ئەرسینۆهە گوتی: بەڵێ شرمیون من پێموایە تۆ گەنجێکت خۆشدەوێت لەسوپادا پلەی سەرتیپی هەیەو دەتەوێت شوو بەئەو بکەیت وجارجار تۆیان لەگەڵ ئەوگەنجەدا بینیوەو جاروباریش تۆ پەنجەکانت سەرلێوەکانی ئەو وهەندێ کاتیش لەپی دەستت لەسەرسنگی ئەودەگێریت، ژنێك کەپەنجەکانی بخاتەسەر لێوی پیاوێك ولەپی دەستی لەسەرسنگی بگێرێت، ئارەزووی شوکردنی بەئەو

کەسەهەیە، من دەزانم تۆ ئەوکورە گەنجەت خۆشدەوێت، بەڵام چونکە کارەکەری خوشکەکەمی ناتوانی بەم گەنجە، کەمنیش ئەوم دیتووەو قۆزە، شوو بکەیت، چونکە دەسەڵات لەدەست خۆتدانییەو خوشکەکەم کەتۆی خۆشدەوێت ئازادت ناکات، تابتوانیت ببیتە هاوسەری ئەوگەنجە.

کاتێ ئەوقسانەم لەئەرسینۆهە بیست، باوەڕم بەقسەکانی کرد، من تاکارەکەری کلیۆپاترابم ناتوانم شووبەکەس بکەم، چونکە جگەلەوەی کلیۆپاترا من ئازادناکات، جەزیشناکات من ببمە ژنی کاڵ، چونکە ئەو بۆخۆی ئارەزووی ئەوگەنجەی هەیە.

تەنها بەڕێگایەك دەتوانم ببمە ژنی کاڵ، ئەویش ئەوەیە لەژێر دەستی کلیۆپاترا ڕزگارمببێت وئازادبم، بەڵام من پارەم نەبوو تابتوانم بەهای خۆکڕینەوەم بدەم وئازادبم، بۆیە دەبێت تادوایین ڕۆژانی ژیانم لەخزمەتی کلیۆپاترادا بمێنمەوە.

– ئەرسینۆهە گوتی: ئەگەر تۆ مەبەستی من جێبەجێ بکەیت و ئەوئیشەی پێتدەسپێرم بەئارەزووی من بەجێبهێنی ئەوا بەختەوەردەبیت.

– پێم گوت: ئیشەکەی تۆ چییە؟

– ئەرسینۆهە گوتی: تۆکارەکەری تایبەتی کلیۆپاترای ورازونیازی ئەو لای تۆیەو جێگای متمانەیت وشەوانە لەپشت دەرگاکەی ئەودا دەخەویت وهەرچی لەو ژوورەدا بگوترێت، تۆ گوێت لێیەتی، ئایا وانییە؟

– گوتم: بەڵێ خاتوونەکەم.

– ئەرسینۆهە گوتی: چونکە تۆ یەك کارەکەری، گەواهی تۆ ئیتعباری نییە، چونکە بەپێی دەستوری ئێمە، گەواهیدانی نۆکەرو کارەکەر، قابیلی متمانە پێکردن نین.

– گوتم: تۆ بۆدەتەوێت کەگەواهی بدەم؟

– ئەرسینۆهە گوتی: ئەگەر تۆ کارەکەر نەبوایەی، ئەوا گەواهییەکەت بەهای دەبوو، بەڵام چون کۆیلەی، من داوا لەتۆ ناکەم گەواهی بدەیت، بەڵکو خواستیاری کارێکیترم، ئەویش ئەوەیە تۆبۆ ماوەی چەند شەوێك پیاوێك لەژوورەکەی خۆتدا جێبکەیتەوە، بۆئەوەی ئەویش بتوانێت وەك تۆ گوێی لەهەموو ئەوقسەو گفتوگۆیانەبێت کەلەژوورەکەی کلیۆپاترادا دەکرێن.

– گوتم ئەو پیاوەی دەبێ لەژوورەکەی خۆمدا جێگای بکەمەوە، کێیە؟

– ئەرسینۆهە گوتی: ئەوکەسە ڕەهبانی پەرستگای دلفە.

– گوتم: ئایا دەزانیت ئەگەر کلیۆپاترا بزانێت من پیاوێکم لەژوورەکەی خۆم هاویشتووە بۆئەوەی گوێی لەقسەکانی ئەوبێت، چی لەمن دەکات؟

– ئەرسینۆهە گوتی: ئەو بێبەریت دەکات ودەرت دەکات.

– گوتم: ئەو فەرماندەدات من بەرشەلاق بدەن ودوای ئەوەی لەژێر شەلاقاندا بێهۆشبووم، ئینجا پەتێکم تێدەکەن وبەئەسپێکی چەموش دەمبەستنەوەو ئەسپەکە لەبیابانێکدا بەردەدەن، بۆئەوەی ڕابکات ومنیش بەدوای خۆیدا بەسەر دڕکو چەقڵی بیاباندا ڕابکێشێت وهەنجر هەنجریم.

– ئەرسینۆهە گوتی: تۆ هەموو شەوێك لەتەك ژووری خاتوونەکەی خۆتدا دەخەویت وگفتوگۆکانی ئەو وبراکەمت گوێ لێدەبێت، دەزانیت کلیۆپاترا چارەی براکەمی ناوێت، بۆیەش ڕێگانادات براکەم ببێتە

هاوسەری ئەو ولێیبێت، دەڵێت براکەم بێ توانایە بۆئەوەی بەوبەهانەیە ئەو لەخۆی دووربخاتەوە، لەبەرئەمە پێویستە هۆکارێك لەبەر دەستدابێت بۆئەوەی ڕەهبانی پەرستگای دلف بتوانێت ئەم دووانە لەیەکتری جیابکاتەوەو تەلاق بدرێت، ئەمە لەبەرژەوەندی خوشکەکەمە بۆیەش دەڵێم هەر کاتێك کلیۆپاترا زانی کەتۆ ڕەهبانی پەرستگای دلفت لەجێگاکەی خۆتدا جێکردۆتەوە تۆ دەردەکات ومنیش پەیمانت دەدەمێ دوای ئەوەی ئەو دووانە لێکجیابوونەوەو من بووم بەژنی براکەم، تۆ لەکلیۆپاترا دەکڕمەوەو ئازادت دەکەم وکەل وپەلی شوکردنت بەکاڵ، بۆداین دەکەم.

ئەو پێشنیارەی ئەرسینۆهە بەلای منەوە سەرنجڕاکێش بوو، زەحمەتیشی نەبوو ودەمتوانی بۆچەند شەوێك ڕەهبانی پەرستگای دلف لەهۆدەکەی خۆمدا جێبکەمەوە، بێ ئەوەی کلیۆپاترا هەستبکات کەسێك لەژوورەکەی مندایە، خاتونەکەی من هەرگیز نایەتە ژوورەکەی منەوە، چونکە هەمیشە بانگی من دەکات بۆهۆدەکەی خۆی، خۆئەگەر بێتەژوورەکەی منیشەوە، ئەواناتوانێت ڕەهبانەکە ببینێت، چونکە هەر کەزانیم کلیۆپاترا دەیەوێت بێتەژوورەکەی من، ئەوا ڕەهبانی پەرستگای دلفم دەبردەناو ئەومەتبەخەی کەلەژوورەکەمدایە.

– ئەرسینۆهە بەمنی گوت: لەوانەیە شەوی یەکەم ڕەهبانی پەرستگای دلف، گوێی لەقسەکانیان نەبێت، بەڵام لەشەوەکانی تردا گوێی لێدەبێت وتێدەگات کام یەکێك لەمانە، خوشك– یان براکەم لەسەرحەقن، ئەمەش لەدوو حاڵەت بەولاوەنییە– یان ئەوەتا براکەم بێتوانایە، کەمن باوەڕم بەوەنییە– یان ئەوەتا کلیۆپاترا ڕێگای پێنادات وچارەی ناوێت، لەهەردووك حاڵەتدا ڕەهبانی پەرستگای دلف بەگوێی خۆی گوێ بیستی قسەکانیان دەبێت ودەتوانێت حوکمی تەڵاقدانەکە بدات ولێکیان جیابکاتەوە.

دیارە بەمەش خاتوونەکەی تۆ زەرەرناکات ودوای ئەوەی کلیۆپاتراو مێردەکەی لێکجیابوونەوە، تۆش بەمراد دەگەیت وشوو بەکاڵ دەکەیت.

– گوتم: ڕەهبانی پەرستگای دلف، چ کاتێك دێت؟

– ئەرسینۆهە گوتی: سبەی شەو.

– پرسیم: چ سەعاتێك دێت؟

– ئەرسینۆهە گوتی: پێش ئەوەی دەروازەکانی کۆشکی پاشایەتی دابخرێت ئەو بەجلێکی ترەوە دێتەناو کۆشکی پاشایەتییەوەو لەژوورەکەمدا دەمێنێتەوە تائەوانەی ناوکۆشك هەموویان دەخەون، دەبێ تۆش پێشئەوەی کلیۆپاترا بچێتەژوورەکەی خۆی من ئاگادارکەیتەوە، بۆئەوەی ڕەهبانەکە بنێرم بۆ ژوورەکەی تۆ، مەبەستم لەوەیە کاتێك ئەوبێتەژوورەکەی تۆ، بتوانێت گوێی لەهەموو قسەکانی کلیۆپاتراو براکەم بێت، ڕەهبانی پەرستگای دلف شەوی دواتر هاتەناو کۆشکی پاشایەتییەوەو بەو شێوەیەی نەخشەی بۆکێشرابوو چۆ ژوورەکەی ئەرسینۆهە هیچ کەس هەستی بەهاتنی ناوبراو نەکرد بۆ کۆشکی پاشایەتی، چونکە ئەو جل وبەرگێکی ئاسایی لەبەردابوون.

لەوکاتەی کەکلیۆپاترا بۆخەو چووە ژوورەکەی خۆی، براکەشی خۆی گەیاندەوەو هەردووکیان چوونە ژووری، منیش خۆم گەیاندە ئەرسینۆهەو گوتم: کلیۆپاتراو براکەی لەژوورەکەی خۆیاندان وئەگەر دەتەوێت ئەوارەهبانەکە بۆ ژوورەکەی من بنێرە.

– ئەرسینۆهە گوتی: ئێستا بۆ ژوورەکەی تۆی دەنێرم، بەڵام وریابە نابێت کەس بزانێت ڕەهبانی پەرستگای دلف بۆئەو مەبەستە هاتۆتە ژوورەکەی تۆ.

– پێم گوت: خەمت نەبێت کەس بەوەنازانێت، پاش ماوەیەك ڕەهبانی ناوبراو بەهاوەڵی من چووینە ژوورەکەمەوەو ژووری مەتبەخەکەم نیشانداو پێمگوت ئەگەر شتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویداو کلیۆپاترا هاتەناو ئەم ژوورەوە، تۆبچۆ بۆمەتبەخەکەو خۆت لەوێدا بشارەوە.

– ڕەهبانەکە گوتی: زۆرباشە، دواتر پرسی ئایا دەزانیت کلیۆپاتراو براکەی چ کاتێك دەستدەکەن بەقسەکردن؟

– گوتم: ئەوانە لەسەرەتای چوونەسەر جێگاو پێش خەوتن، پێکەوە دەکەونە قسەکردن.

– ڕەهبانەکە لێی پرسیم: ئایا واڕێناکەوێت لەنیوەشەودا– یان لەبەرەبەیانیدا، لەگەڵ یەکتردا بکەونە قسەکردن؟

– گوتم: پێموانییە، چونکە تائێستا گوێم لێنەبووە نیوەشەو– یان بەرەبەیان، قسەبکەن، ئینجا من جێگاکەم لەنزیك ڕێڕەوی ژوورەکەی کلیۆپاترادا ڕاخست وبەئەوم گوت، لەسەر ئەوجێگایە پاڵبکەوێت.

– ئەو لێی پرسیم: ئایا دوای ئەوەی لەسەر ئەوجێگایەدا پاڵکەوتم، دەبێ گوێم بەدەرگاکەی کلیۆپاتراوە بنێم؟

– گوتم: نا، بێ ئەوەی گوێ بەنزیك دەرگاکەوە هەڵخەی، دەتوانیت گوێت لەگفتوگۆی ئەوانبێت، – – ڕەهبانەکە لەسەرجێگاکە ڕاکشا، بەڵام من لەتاریکییەکەدا دەمبینی کەسەری بەدەرگاکەیەوە نابوو، بۆئەوەی گوێی لەهەموو ئەو وشانەبێت کەئەو ژن ومێردە دەیانکەن، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك ڕەهبانەکە سەرێکی بڵندکرد، بەوەی شوێنەکە تاریکبوو درەوشانەوەی ئەستێرەکان کەمێك ڕووناکییان کردبۆوە، بۆیە دەمتوانی تاریمایی هەیکەلی ئەو پیرەمێردە ببینم.

بینیم ئەو پیرەمێردە دەستی بۆلای من ڕاوەشاندو بانگی کردم، منیش لەسەرجێگاکەی خۆم هەڵسام ولەو نزیکبوومەوەو ئەویش دەمی خۆی هێنایە بنگوێم وگوتی، شرمیون گوێبگرە ئەم دووانە چی دەڵێن ؟

منیش دەمی خۆم لەگوێی ئەو پیرەمێردە نزیککردەوەو پێمگوت تۆگوێ لەوقسانە بگرە، چونکە ئەمانە بەلای منەوە تازەنین وهەموو شەوێ گوێم لەمقسانە دەبێت، ڕەهبانەکە جارێکیتر بەگوێیدا چرپاندمەوە، کەلە شێوەی قسەکردنی ئەم دوو ژن ومێردەدا ئاشکرایە مێردەکە بێتوانییە، بەڵام کلیۆپاترا نەفرەتی لەئەوەو نایەوێت پەیوەندی ژن ومێردایەتی لەگەڵدا هەبێت.

– پێم گوت: بەڵێ وایە.

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەوەی تائێستا تێی گەیشتووم بەسە، چونکە من زانیم بەتلیمۆسی چواردەهەم حەزی لەژنەکەیەتی وئامادەیی تەواوی جنسیشی هەیە، بەڵام کلیۆپاترا چارەی ئەوی ناوێت ونایەڵێت ببێتە ژنی براکەی.

– من لەڕەهبانەکەم پرسی: ئایا قانون سەبارەت بەمە چی دەڵێت؟

– ڕەهبانەکە گوتی: قانون دەڵێت: پێویستە ژنەکە هەموو ئەوخەرجیانەی لەتەداروکاتی گواستنەوەداکراوە، بژمێرێتەوە، هەروەها خەرجی نیوساڵیش بەوپیاوە بدرێت تائەوپیاوە لەوماوەیەدا بتوانێت ژنێکیتر بدۆزێتەوە.

– پرسیم: ئەی کەژنەکە پیاوەکەی ویست وپیاوەکە ئەرکی ژن ومێردایەتی بەئەنجام نەگەیاند، حوکمی قاون چییە؟

– ڕەهبانەکە گوتی: حوکمی قانون ئەوەیە پێویستە ئەوپیاوە هەموو ئەوخەرجییانە بداتەوە کەلەکاتی گواستنەوەو تەداروکاتی گواستنەوەداکراون، هەروەها دەبێ خەرجی یەك ساڵی ئەوژنە بکێشێت، ئەوکاتە حوکمی لێکجیابوونەوەکە دەردەچێت.

– لێم پرسی: بۆچی سزای ئەوپیاوەی کەنایەوێت ئەرکی ژن ومێردایەتی جێبەجێ بکات، گرانترە لەهی ئەوژنەی نایەوێت لەگەڵ مێرەکەیدا بخەوێت و بۆی ڕاوەستێت؟

– ڕەهبانەکە گوتی: چونکە پەیداکردنی مێرد بۆ ژن دیژوارترە لەدۆزینەوەی ژن بۆپیاوێك، پیاو دوای ئەوەی لەژنەکەی خۆی جیابۆوە، چونکە خەرجی نیوساڵی هەیە، دەتوانێت هەوڵبدات ودوای دوو سێ مانگ ئەوژنە بدۆزێتەوە کەبەلایەوە پەسەندەو بیکاتە هاوسەری خۆی، بەڵام ژن دەبێ ماوەیەکی زیاتر خەریکی گەڕان وهەوڵی بەردەوامبێت، ئینجا ئەگەری ئەوە دوورە کەلەماوەی ساڵێکدا پیاوێکیتری دەستبکەوێت.

لێمپرسی: ئایا سەبارەت بەکلیۆپاتراو براکەشی دەبێت مەسەلەی بژاردنەوەی خەرجییەکانی تەداروکاتی هاوسەرێتی جێبەجێ بکرێت؟

ڕەهبانەکە گوتی: چونکە ئەم دووکەسانە پاشاو شاژنی میسرن ولەڕووی ماددیەوە دەوڵەمەندن، هەروەها بەتلیمۆسی چواردەهەم داوا لەکلیۆپاترا ناکات کەئەو خەرجییەی بۆبژمێرێتەوە، دوای ئەوەی لێکجیابوونەوەکە بەڕەمسی جێبەجێکراو ئەرسینۆهە بوو بەژنی براکەی، پێموانییە کەبەتلیمۆسی چواردەهەم لەهاوسەرێتیکردنی ئەرسینۆهە ناڕازیبێت، چونکە ئەو لەکلیۆپاترا دەچێت، بەهێنانی ئەرسینۆهە وەك ئەوەوایە کەبەکلیۆپاترا گەیشتبێت.

دوای ئەوەی قسەی ڕەهبانەکە تەواوبوون شتێك ڕوویدا کەنەمن ونەئەرسینۆهەو نەخۆشی چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد، ئەویش ئەوەبوو لەپڕ ڕەهبانە پیرەکە توشی ڕشانەوەبوو دەنگی ڕشانەوەی من جیابوو لەدەنگی ڕشانەوەی ئەو، ڕشانەوەکەی ئەودیاربوو کەپیاوە، کاتێ دەنگی ڕشانەوەی ئەو پیاوە بەرزبۆوە، ئیتر لەژوورەکەی کلیۆپاترادا بێدەنگی باڵیکێشا، مەعلومبوو کەئەو وبراکەی خەوتوون- یان لەبیرە خەواندان.

ڕشانەوەی پیرەمێردەکە تەواو نەدەبوو، ئەمەش ئەوەی دەگەیان کەڕەهبانەکە هەمووشەوێك دەڕشێتەوە، بەڵام کاتێ ویستی بێتەناو ژوورەکەی منەوە بخەوێ، ڕشانەوەی نەما.

– لەوکاتەدا کلیۆپاترا لەژوورەکەی خۆیەوە بانگی کرد، شرمیون ئەوەکێیە دەڕشێتەوە؟

– من کەپێشبینی ئەو ڕووداوەم نەدەکرد، دەبوایە لەساتێکدا وەڵامی ئەوبدەمەوە بەشێوەیەك جێگای باوەڕپێکردنبێت، بۆئەوەی لەجێگاکەی هەڵنەستێت وبێت بۆژوورەکەی من وڕەهبانەکە ببینێت ؟

– من بوارم نەبوو بیربکەمەوە، ناچاربووم بڵێم ئەوکەسە ڕەهبانی پەرستگای دلفە.

– کلیۆپاترا بەدەنگێکی شێوە پەشۆکاوەوە پرسی، ئایا گوتت ڕەهبانی پەرستگای دلفە؟

– گوتم :بەڵێ.

– کلیۆپاترا گوتی ئەوە دەڵێی چی؟ ڕەهبانی پەرستگای دلف لەژوورەکەی تۆدا چیدەکات؟ – تائەوکاتەش ئەوەی گوتم ڕاستبوو، بەڵام لەنێوان قسەکانماندا بواری ئەوەم بۆڕەخسا بیرلەڕێڕەوێك بکەمەوە بۆدەربازبوون، چونکە دەمزانی کەدەڵێ ڕەهبانی پەرستگای دلف لەژوورەکەی تۆدا چیدەکات، بۆچی هاتۆتە ژوورەکەت؟

– گوتم ئەی خاتوونەکەم ڕەهبانی پەرستگای دلف لەپەرستگاوە بەپێ هاتووە بۆئەوەی بۆئێرەبێت وتۆ وبراکەت ببینێ، بەڵام چونکە بەپێیان هاتووەو ڕێگاکەش دووربووە، کاتێ گەیشتۆتە ئێرە کەتۆ خەوتوویی وئەوحەزی دەکرد بێدەرەنگان بگاتەلای تۆ ولەگەڵ تۆ وبراکەتدا قسەبکات، بەڵام من پێمگوت هیچ کەس ناتوانێت بچێتەژووری پشودانی شاژنی میسر، ئەگەر ڕەهبانی پەرستگای دلفیشبێت.

کاتێ ڕەهبانی پەرستگای دلف گەیشتەئێرە دەرگاکانی کۆشکی پاشایەتییان داخستن وئەو نەیدەتوانی بچێتەوەدەرێ وداوای لەمنکرد کەئەمشەو لای خۆم شوێنی بکەمەوە، تاکو سبەینێ بتوانێت تۆ ومێردەکەت ببینێت، منیش دەمزانی تۆ هەمیشە ڕێزت بۆڕەهبانی پەرستگای دلف هەبووە، داواکارییەکەی ئەوم قبوڵکردوو لایخۆم هێشتمەوە، دیاربوو ئەوپرەمێردە گوێی لەقسەکانی من بوو ولەو بەهانەهێنانەوانە ڕازیبوو، چونکە ئەگەر من بەوشێوەیە قسەم نەکردبا، ڕەهبانی پەرستگاش وەك من بەرپرسیاردەبوو ودەبووجێگای لێپرسینەوەی شاژنی میسرو مێردەکەی بەوەی بۆچی لەژووری کارەکەری شاژندا خۆی حەشارداوەو گوێ لەقسەکانی شاژن و پاشا دەگرێت، کلیۆپاترا لەسەرجێگاکەی خۆی هەڵساو جلێکی سادەی لەبەرکردو مێردەکەشی بەدوایدا پۆشاکێکی کردەبەرو هەردووکیان بۆ ژوورەکەی من هاتن، چرای ژوورەکەی من کوژابۆوە، بەڵام لەژوورەکەی کلیۆپاتراو مێردەکەیدا تابەیانی چرا دەسوتا، کلیۆپاترا فەرمانی بەمندا کەچراکەی خۆم بەچرای ژوورەکەی ئەو هەڵیسێنم، دوای ئەوەی ژوورەکە ڕووناکبۆوە، شاژن و پاشا توانیان ڕەهبانی دلف ببینن، بەوەی کەشاژنی میسر ئەوڕەهبانەی ناسییەوەو زانی خۆیەتی

جارێکیتر لەبینینی ئەو لەوژوورەدا سەرسامبوو، چونکە بوونی ڕەهبانی پەرستگای دلف لەناو ژووری یەکێك لەکارەکەرەکانی کۆشکی پاشایەتیدا، ڕووداوێکی نائاسایی بوو وەحکومبووبە ڕیسوایی.

لەمیسردا ڕەهبانی زۆر هەبوون ولەپەرستگای هەمەجۆردابوون وبەدرێژایی تەمەنی خۆیان هاوسەریان نەدەگرت، دەیانگوت ژیانی خۆیان نەزری خواکان کردووە، بەڵام هەندێك لەمانە بەنهێنی پەیوەندیان لەگەڵ ژناندا هەبوو، جارجارە شەو لەپەرستگا دەچوونەدەرێ وخۆیان دەگەیاندە ماڵی ژنێك وپێش سپێدەی بەیان دەگەڕانەوە پەرستگا، زۆرجاریش قژی دەستکردیان لەسەردەکردوو دەچوون بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەرییەو چەند سەعاتێکیان لەگەڵ ئەو شنانەدا بەسەردەبرد، ئەو قژانەشیان بۆیە لەسەردەکرد تانەناسرێنەوە، چونکە لەوڵاتی میسردا ڕەهبانەکان سەریان دەتاشی وجگەلەئەوان کەسیتر لەمیسردا سەریان نەدەتاشی، بۆیە هەر جلوبەرگێکیان لەبەرکردبا دەناسرانەوە، بۆئەوەی خەڵك ئەوان لەشوێنی ڕابواردنی گشتیدا نەناسنەوە، ئەو قژانەیان دەکردەسەر، کاتێ کلیۆپاتراو مێردەکەی گەیشتنە ژوورەکەم، بەوەی من گوتبووم ئەوڕەهبانە پیرە بۆیەهاتووە ئەم دووانە ببینێت، زانیم کەئەوانە سەبارەت بەمن کەوتبوونە گومانەوەو پێیانوابوو ڕەهبانی پەرستگای دلف حەزی لەمنەو بۆئەوەی دەستی بمگاتێ ئەمشەو هاتووە بۆئێرە.

پیری ئەوپیاوە سەرەتا منی لای کلیۆپاتراو مێردەکەی بەپاکیزەی دەرنەخست، چونکە زۆر لەڕەهبانە پیرەکانیش بەقژی سناعییەوە دەچوون بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی- یان لەناو ماڵەکانی ئەسکەندەرییەدا دۆستی تایبەتیان هەبون وبەدزی دەچوون بۆ ڕابواردن لەگەڵیاندا.

– کلیۆپاترا گوتی: بەپێی ئەوەی کەشرمیون دەڵێت تۆ ئەمشەو بۆیە بۆئێرەهاتووی من وبراکەم ببینی، بەڵام چونکە دەرگاکانی کۆشکی پاشایەتی داخرابوون، نەتتوانیوە بگەڕێیتەوە، ئایا شرمیون ڕاستدەکات هاتنی تۆ بۆئێرە لەبەر ئەم مەسەلەیەیە؟

– ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ ، ئەی کلیۆپاترای شاژنی میسرو تۆ ئەی چواردەهەم پاشای ئەم وڵاتە، من هاتووم لەگەڵ تۆ ومێردەکەتدا گفتوگۆبکەم، ئەوکاتە ئەو بەدگومانییەی کەسەبارەت بەمنیان هەبوو نەماو زانیان ئەو پیرەمێردە لەبەرمن نەهاتووە بۆکۆشکی پاشایەتی، بەڵکو کاری بەخودی ئەمانەیە، دواتر لەڕەهبانەکەیان پرسی چیبوو کەتۆ دوای هاتنت بۆکۆشکی پاشایەتی هاتویتەلای شرمیون و هاتویتە ئەم ژوورە، ئایا نازانی کەلەناو کۆشکی پاشایەتیدا چەند کەسانێك هەرکاریان ئەوەیە لەخەڵکی میوان وسەردانیکەر دەپرسن، کارت بەکێیەو چ ئیشێکت هەیە؟

– ڕەهبان گوتی: من ئەوەدەزانم، ئاگاداری ئەوەم هەرکەسێك بیەوێت لەگەڵ پاشاو شاژندا گفتوگۆ بکات، دەبێت بچێتەلای ئەو کەسانەی کەخاوەن پلەو کاربەدەستن، بەڵام نەمدەویست گفتوگۆکردنی من لەگەڵ تۆ ومێردەکەتدا لایەنی ڕەسمی وەربگرێت وخەڵکیتر بزانن لەبەرچی هاتووم بۆئێرە، بۆیە لەبری ئەوەی بچمەلای خاوەن پلەوپاکانی کەبەرپرسیارن لەکاروباری ناوکۆشکی پاشایەتی، هاتمەلای کارەکەرەکەی تۆ شرمیون وداوام لەئەوکرد ڕێگای چاوپێکەوتنی تۆ ومێردەکەتم بۆڕێکبخات، ئەویش گوتی تۆ ومێردەکەت خەوتون وناتوانێت ئێوە لەخەو هەڵبستێنێت، دواتر کلیۆپاترا داوای لەپیرەمێردەکەکرد بێت بۆژوورەکەی ئەو، ئەوپیاوە لەژوورەکەی من چۆدەرێ ولەپشت کلیۆپاتراو مێردەکەیەوە ڕۆیی وچووە ژوورەکەیترو دەرگاکەیان گەڵەدا، بەڵام من وەك شەوانی ڕابردوو دەمتوانی گوێم لەوقسانەبێت کەلەوژوورەدا دەکران.

دەمویست بزانم ڕەهبانی پەرستگای دلف، چۆن قسەکانی دەستپێدەکات، ئایا بەکلیۆپاتراو براکەی دەڵێت گوێم لەقسەکانتان بووە؟ ئایا دەڵێت بەهۆی گوێ گرتنمەوە بۆم مەعلومبووە کەبەتلیمۆسی چواردەهەم ڕەگی پیاوەتی تێداهەیەو دەتوانێت ببێتە مێردی کلیۆپاترا، بەڵام ڕەهبانی پیر ئەم قسانەی نەکردو دواتر زانیم خۆپاراستنی لەپێشنیارکردنی ئەمە، بۆئەوەیە گومانی خۆگرتنی لێنەکرێت، چونکە ئەگەر ڕەهبانەکە گوتبای گوێم لەقسەکانی ئێوەبووە، ئەواگومانی جاسوسی لێدەکراو کلیۆپاترا توڕەدەبوو، بۆیە باسەکەی بەمشێوەیە دەستپێکرد: ماوەیەکە بەتلیمۆسی سێزدەهەم مردووەو ئێوە دوای مردنی ئەو بوونەهاوسەر، تائێستا منداڵتان نییە، ئەمەجێگای سەرسوڕمانە چونکە ناتوانرێت باوەڕ بەوەبکرێت یەك ژن ومێرد کەلەتافی لاویدان ببنەهاوسەری یەکترو منداڵیان نەبێت، بەتایبەت ئەو منداڵە کوڕبێت دەبێتەجێگرەوەی پاشا، بۆیە لەنێوان خەڵکا دوو ئیدعا هەیە، یەکەمیان ئەوەیە دەڵێن شاژنی میسر بۆیە سکپڕنەبووە، چونکە پاشای میسر پیاونییەو ناتوانێت ئەرکی ژن ومێردایەتی بەجێبێنێت، هەندێکیتر دەڵێن هۆی سکپڕنەبوونی شاژن ئەوەیە کلیۆپاترا مێردەکەی دەدزێت

وحەزناکات ببێتە هاوسەری ڕاستەقینەی، لەبەرئەمەیە من هاتووم بۆئێرە تالەئێوە بپرسم کام یەك لەم دوو ئیدعایانە ڕاستە، ئایا کەموکوڕی ودرێغی لەپاشای میسرەوەیە- یان لەشاژن؟

– کلیۆپاترا گوتی: کەموکوڕی لەپاشای میسرەوەیەو ئەو ناتوانێت ئەرکی ژن ومێردایەتی بەئەنجام بگەیەنێت؟

– براکەی کلیۆپاترا گوتی: وانییە من کەموکوڕیم نییە، بەڵکو درێغیکردن لەلای ئەوەوەیە، ئەو حەزناکات ببێتە شاژنی من وهەتا شتی نابەجێش بەمن دەڵێت، ماوەیەك لەمەوبەر لەبەردەم سێ وەزیرەکانی میسردا قسەی ڕەق وسوکی پێگوتم.

– ڕەهبانەکە ئەوەی کەپێویستبوو لەوشەودا تێیبگات، تێگەیشتبوو، گوتی: ئایا ڕازی دەبیت کەمن لەم ژوورە بچمەدەرێ وسەیرێکی ئەستێرەکانی ئاسمان بکەم؟

– کلیۆپاترا گوتی بۆچی دەچیت سەیری ئەستێرەکان دەکەیت؟

– ڕەهبانە پیرەکە گوتی: ئەستێرەکان ئاگایان لەهەموو هەست وخوست وباروودۆخی دانیشتوانی سەرزەویەو دەزانن، بۆیە دەبێ ببینم، چونکە هیچ لەئەوان شاراوەنییە، دەچم لەئەوان دەپرسم، ئایا ژنەکە درێغی دەکات- یان مێردەکەی، ئینجا وەڵامی ئەستێرەکانتان بۆدێنمەوە.

– کلیۆپاترا لەمە دڵنیگەرانبوو، گوتی: ئەی ڕەهبان ئەستێرەکانی ئاسمان هەتا ناتوانن پێشبینی ئەوەبکەم داخوا لافاوی نیل بەهێزدەبێت، جاچۆن دەتوانن ساغی بکەنەوە دەخوا لەنێوان ژن ومێردێکدا خەتا لەژنەکەیە- یان مێردەکەی؟

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەستێرەکانی ئاسمان هەمووشتێك دەزانن، بەڵام ئێمە ناتوانین پرسیار لەئەوان بکەین، چونکە پرسیارکردن لەئەستێرەکان پێویستی بەزانینی زمانی ئەوانەیە، ئێمە سەبارەت بەهەندێ شتی وابەستە بەژن ومێرد زمانی ئەستێرەکان تێدەگەین، بەڵام نازانین سەبارەت بەهەڵچوونێك بەزمانی ئەوان پرسیاریان لێبکەین.

– مێردی کلیۆپاترا دڵنیابوو کەئەمە لەبەرژەوەندی ئەودایە، گوتی: بچۆ لەئەستێرەکان بپرسە داخوا کام لەئێمە درێغیکردووە؟

– ڕەهبانەکە لەدەرگاکەی ترەوە کەبەڕووی ژوورەکەی مندا نەدەکرایەوە، چۆدەرێ وماوەیەك لەناو باغەکەدا ڕاوەستا، دوای ئەوەی گەڕایەوە.

– بەتلیمۆسی چواردەهەم لێی پرسی، ئایا پرسیارت لەئەستێرەکانکرد؟

– ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ.

– براکەی کلیۆپاترا گوتی: ئەوانە چیان وەڵام دایەوە؟

– وەڵامی ئەستێرەکان ئەوەیە کەلەلایەن مێردەکەیەوە هیچ کەم وکوڕییەك نییە، بەڵکو ژنەکە درێغی دەکات.

– بەتلیمۆسی چواردەهەم گوتی: خۆ ئێستا باوەڕەکەی کەموکوڕی لەمنەوە نییە.

– ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ ئەوەی تۆ گوتت ڕاستبوو، دواتر ڕوویکردە کلیۆپاتراو گوتی: ئەی کچی پاشای میسر، تۆ شاژنی ئایا بیرت لەنەوەو نەژادی خۆت نەکردۆتەوە؟

لەو ڕۆژگارەی بەتلیمۆسی یەکەم تەختی پاشایەتی لەم وڵاتەدا دامەزراندووە تاوەکو ئێستا، چواردە پاشا حوکمیانکردووە کەهەریەك لەوپاشایانە کوڕی پاشای پێشخۆی بووە کەدواترینیان مێردەکەی تۆیە، هەریەك لەکوڕانی پاشا لەسەردەمی گەنجێتیاندا ئەگەر خوشکیان هەبوایە، ئەوا لەگەڵ خوشکەکەی خۆیدا دەبوون بەهاوسەر، ئەگەر خۆشکیشیان نەبوایە، ئەوا کچی پاشاکانی هاوسێی میسری دەهێنا، بۆئەوەی نەژادی پاشایەتی میسر بمێنێتەوەو لەڕووی نەبوونی جێنشینی ئەمانە کەسێك هەبێت، نەك هاوسێکانمان ودوژمنانی ناوخۆ ئەو هەلەبقۆزنەوە بۆئەوەی لەسەرتەختی پاشایەتی میسردا دابنیشن.

بەڵام تۆ کلیۆپاترا، لەسەر ڕێچکەی باوباپیرانت لادەدەی، ئەستێرەکانی ئاسمان دەڵێن، تۆ ناتەوێت ببیتە ژنی ڕاستەقینەی براکەت، بۆیەش منداڵت ناوێت تادوای مردنی مێردەکەت ببیتە پاشای میسر، لەمەملەکەتی میسردا بوونی منداڵ لەخێزانێکی هەژاردا پەروەردەکردن وگەورەکردنی زەحمەتە، بەڵام تۆ کەشاژنی سەبارەت بەخەرجی وپێداویستی ڕۆڵەکانی خۆت، نیگەرانیت نییە، ئەگەرببیتە خاوەنی دە منالیش دەتوانی ئەومناڵانە بەخێوبکەی، بۆچی ناتەوێت ببیتە خاوەنی منداڵ؟

کلیۆپاترا هەندێ بێدەنگ بوو ودواتر گوتی: ئەی ڕەهبان من دەمەوێت ببمەخاوەنی منداڵ، بەڵام لەبراکەم نا.

– ڕەهبانەکە بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی بۆچی؟ ئایا دەشێت مێرد بۆ ژن لەبراکەی باشتر هەبێت ؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئێمە لەنەژادی یۆنانین وباپیرانمان بەتلیمۆسی یەکەم لەیۆنانەوە هاتووە بۆئێرەو دوای مردنی ئەسکەندەر بۆتە پاشای میسر، لەیۆناندا خۆشك وبرا نابنە هاوسەری یەکتری، تاوەکو ئەمڕۆش.

– ڕەهبان گوتی: ئەوکارە هەڵەیە، هاوسەرێتی نێوان خوشك وبرا باشترین هاوسەرێتییە.

– کلیۆپاترا گوتی: وانییە، هاوسەربوونی خوشك وبرا لەوداب ونەریتەوە سەرچاوەی گرتووە کەسامانی خێزانێك لەدەستیان نەچێتەدەرێ وبچێت بۆخێزانێکیتر، لەڕووی دەروونییەوە هاوسەرێتی وپێکگەیشتنی خوشك وبرا یەکێکە لەدزێوترین وخراپترین شت.

– ڕەهبانەکە پرسی: بۆچی؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر تۆ وەکو من مێژووت خوێندبێتەوە دەزانی کەئەژدادی من هەموو ژن وپیاوی بەهەیکەل وجوان وبەتوانا بوون، بەڵام هەرچەندە لەئەژادی یەکەممان دوور دەکەوینەوە تادەگەینە ئەم ڕۆژگارەمان دەبینین کەدایکان وباوکانی ئێمە لەڕولاوازتر بوونەوە، ئەو لاوازی وبێمودیەی ئەژدادی ئێمە لەوەوە هاتووە کەهێندێك لەئەژدادەکانمان خوشکیان هەبووەو ناچاربوون لەگەڵ ژنی بێگانەدا هاوسەرێتی نەکەن، بەڵام چۆن هێندێك لەڕۆڵەی پاشاکان خوشکیان نەبوون و هاوسەریەتیان لەگەڵ بێگاناندا بەستووە، بۆیە کەمێك باش ماوین دەنائەمڕۆ وەچەکانی بەتلیمۆسی یەکەم لەبارکێشەکانی میسری لاوازتردەبوون.

نەریتی شوکردنی خوشك بەبرا میسریانەیەو لەم وڵاتەدا کاریکردۆتەسەر ئەژدادی من، یەکێك لەوبەدبەختیانەی ئەژدادی من، ئەوەبووە کەکچ وکوڕەکانیان کردوون بەهاوسەری یەکتری، هەربۆیەش فیرعونەکان کەمتر لەچل ساڵ دەژیان، ئەگەر فیرعەونێك چل ساڵی تەواو ژیابا، ئەوا بەشتێکی نائاسایی

سەیردەکرا، ئەگەر باوەڕ بەقسەکەی من ناکەی ئەوابچۆ بۆکتێبخانەکەو ئەوکتێبانە بخوێنەوە کەباس لەمێژووی میسر دەکەن، تابزانی بەگشتی تەمەنی فیرعەونەکانی میسر نزیکەی بیست وپێنج ساڵبووە، لەپشتاوپشتی ئێمەشدا خراپی وەچەیی دیارە، عەقڵ سووکی ئەژدادی من ولەڕی لەشیان، براکەم کەئێستا لێرەیە سەرچاوەکەی لەبەهاوسەرکردنی خوشك وبراوەیە، منیش نامەوێت منداڵی عەقڵ سوك ولەڕولاوازم بێن.

– براکەی کلیۆپاترا ڕوویکردە ڕەهبانەکەو گوتی: ئەمە پاساو هێنانەوەیە، کلیۆپاترا سەرەتا دەیگوت من توانای ئەوەم نییە لێی ببم بەپیاو، ئێستاش زانی کەئەستێرەی ئاسمان گەواهی ناڕاستی ئەو بوختانەیاندا، دەیەوێت فێلێکیتر بدۆزێتەوە بۆئەوەی نەبێتە ژنی من، لەخوشکەکەم بپرسە ئەگەر وەچەی ئێمە نەمێنێت تۆ زیاتر زەرەردەکەیت– یان من؟

چونکە من دەبێ وەچەی خۆمان بپارێزم و لەمە بەرپرسیارم نەك تۆ، لەوڕۆژەی کەپاشایەتی لەووڵاتەدا دامەزراوە هەمیشە پاشاکان، واتا پیرەکان بەرپرسبوون لەپاراستنی وەچەی خۆیان، کەس داوای لەژنەکان نەکردووە کەوەچەو نەژادی ئێمە بپارێزن.

– بەتلیمۆسی چواردەهەم دیاربوو کەزۆر ناڕەحەتەو لەدرێژەی قسەکانیدا ڕوویکردەوە کلیۆپاتراو گوتی: بەتۆوە لەبنەماڵەی ئێمەدا شەش کلیۆپاترایتر هەبوون ودووکەس لەوشەشانە بەوەجاغ کوێری ماونەتەوەو منداڵیان نەبوون، ئایا جارێك کەس بەخراپە زمانی لەمانەگێڕاوەو گوتویانە بۆچی ئەمانە نەزۆکبوون ومنداڵیان نەبووە، بۆ پاراستنی وەچەی ئیمە؟ خوشکەکەم لێرەیەو گوێی لێمە، خۆئەگەر نەزۆکیشبێت ومنداڵی نەبێت، کەس بەخراپە باسی ئەوناکات، جاچجای ئەوەی منداڵی لەڕولاوازی بێن، بەلام ئەی ڕەهبانی پەرستای دلف، لێمگەڕی بامن ڕاستییەکەی بەتۆ بڵێم، ڕاستییەکەی ئەوەیە خوشکەکەی من حەزی لەکەسێکیترەو چاو لەڕێگایە، تائەوپیاوە دێت.

– ڕەهبانەکە ئەم قسەیەی پێسەیربوو بەکلیۆپاترای گوتی: ئایا براکەت ڕاستدەکات تۆحەزت لەپیاوێکیترە؟

– کلیۆپاترا گوتی: گریمان وابوو، ئایا من گوناهم کردووە؟

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەی شازنی میسر ئەگەر تۆپیاوێکیترت خۆشبوێت، ئەوە ئەوگوناهەت لای خواکان قابیلی بەخشین نییە.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەی ئەگەر پێش بەهاوسەربوونم لەگەڵ براکەمدا، من ئەوپیاوەم بینیبێت ولەگەڵی ئاشنابیم پەیداکردبێت چۆنە؟ ئایا کەبەم شێوەیەشبێت خواکان لەمگوناهە نامبەخشن؟

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەی کلیۆپاترا تۆ ئەگەر دڵت بەپیاوێکیترەوەبوو نەدەبوو بوبایە هاوسەری براکەت وشوت پێکردبا.

– کلیۆپاترا گوتی: من پێمخۆشنەبوو ببمەهاوسەری براکەم، بەلام چونکە باوکم گوتبووی دەبێ ئەو هاوسەریەتییە سەربگرێت، ناچاربووم کەمل بۆئەوکارە بنێم.

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەی شازنی میسر تۆمادام قەبوڵتبوو کەوەسێتی باوکت جێبەجێ بکەیت، هەتا بەناچاریش، دەبوایە خۆشەویستی ئەوپیاوەت لەدڵی خۆت دەربکردایە.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەی ڕەهبانی پەرستگای دلف شتێکی تریش هەیە نازانم داخوا تۆ دەتوانیت لەناوەڕۆکی ئەو ڕاستییە بگەی– یان نا؟

– ڕەهبانە پیرەکە پرسی: ئەمە چییە؟

– کلیۆپاترا گوتی: من وبراکەم بەتلیمۆس، هەر لەمنداڵییەوە پێکەوە گەورەبووین ولەتەواوی ڕۆژگاری منداڵیماندا لەگەڵ یەکتری وازی وگاڵتەوگەپمان کردووەو هەموو شەوێ لەباوەشی یەکتریدا دەخەویتن، تائەوکاتەی گەورەبوین .

– ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ ئەمە دەزانم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئێمە ڕاهاتووین گاڵتەووازی لەگەڵ یەکتریدا بکەین، دوای تەمەنێك ئێستا ناتوانین ببینە ژن ومێرد.

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەی شاژنی میسر من ئەوەدەزانم لەناوخێزانی پاشایەتیدا، نەریتوایە خوشك وبراکان دوای ئەوەی گەورەبوون لەیەکتریان جیادەکەنەوە، بۆئەوەی ژیانێکی سەربەخۆیان هەبێت، لەناو خێزانی پاشایەتی میسریشدا دەزانن کەخوشك وبراکان وەك سەردەمی منداڵی گاڵتەوگەپ ویاری لەگەڵ یەکتریدا بکەن، ناتوانن ببنە ژن ومێرد، لەبەرئەوەشە کەلێکیان جیادەکەنەوە، بۆ ئەوەی لەساڵانی هاوسەرێتی ئەمانەدا کێشە دروست نەبێت.

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵام من ناتوانم هەست وخۆش سەردەمی منداڵی بیرخۆم ببمەوەو هەرکاتێك براکەم دەبینم ئەوبەهاو گەمەکۆنەکەی خۆم دەزانم وتەنانەت بۆجارێکیش نەمتوانیوە ئەو وەك مێرد سەیربکەم، ئەمەش یەك شتی سروشتییەو پەیوەندی بەئیرادەی منەوەنییە.

– ڕەهبانەکە لەبەتلیمۆسی پرسی: ئەی پاشا تۆ چۆن خوشکەکەت دەبینی؟ ئایا تۆش هەرجارەی کەئەو دەبینی هاوگەمەکۆنەکەی سەردەمی منداڵیت دێتەوە پێشچاو؟

– بەتلیمۆس گوتی: نەخێر ئەی ڕەهبانی پەرستگای دلف، من هەرکاتێ خوشکەکەم[55] دەبینم، وەك ژنی خۆمی سەیردەکەم.

54– ئەوپیاوە: مەبەست لەئەنتوانی، خۆشەویستی کلیۆپاترایە (و– کوردی)

55– کلیۆپاترا، (و– کوردی)

– ڕەهبانەکە بێدەنگبوو وکەوتە بیرکردنەوە، من دەمزانی ئەوبیر لەڕێگاچارەیەك دەکاتەوە، کەنەپاشای میسر برەنجێ ونەکلیۆپاتراش ڕقی لێداگرێت، دوای ماوەیەك، گوتی: خواکان بەشێوەیەك مرۆڤیان دروستکردووە کەمێرد دەتوانێت لەزەت لەژنەکە وەربگرێت، هەتا ئەگەر ژنەکە حەزی لەمێردەکەشی نەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە کلیۆپاترا دەتوانێت بەوڕێگایە مێردەکەی خۆی ڕازی بکات هەتا ئەگەر لەناخیشیەوە چارەی نەوێت.

خاتوونەکەی من بەتوڕەییەوە گوتی: ئەی ڕەهبانی پەرستگی دلف، تۆ پێتوایە ژنێکی وەك من کەسێزدە پشتی پاشابوون وەك ژنێکی بەڕەڵاو سادە بەبێ حەزو ئارەزووی خۆی، ئامادەبێت لەگەڵ پیاوێك

رابوێرێت هەتائەوپیاوە ئەگەرمێردیشی بێت؟ ئەوژنانەی کەبەدەر لەحەوئارەزووی خۆیان لەگەڵ پیاواندا رادەبوێرن، ناچارن، بەڵام من ناچارنیم ودەتوانم خۆم لەڕابواردن لەگەڵ براکەمدا بپارێزم.
ڕەهبانەکە گوتی: ئەوقسەی کردم مەبەستم لەوەنەبوو بوختانت بۆبکەم وتۆ وەك ژنە بەڕەڵڵاکان لەقەڵەمبدەم، مەبەستم ئەوەبوو بەهۆی بێمەیلی تۆ سەبارەت بەبراکەت وەچەی بنەماڵەی پاشایەتی میسر بنبڕنەبێت، چونکە ئەگەرتۆ لەگەڵ براکەتدا دەستتێکەڵاو نەکەن، نابنەخاوەنی منداڵ و وەچەی پاشایەتی میسر لەناودەچێت.
– کلیۆپاترا گوتی: وەچەی بنەماڵەی پاشایەتی میسر لەناوناچێت، چونکە ئەگەر لەدامەنی من منداڵ نەبێت، ئەوا لەشازادەکانیتر ژنەکان منداڵیاندەبێت گرێنتی مانەوەی وەچەی بنەماڵەی پاشایەتی بێت.
– ڕەهبانەکە گوتی: ئەی شاژنی میسر، ئەم قسەیە کەلەدەمی خاتوونێکی وەك نتۆ دێتەدەرێ زۆر سەیرە، چونکە بۆتۆ جوانییە منداڵی شازادەکانیتر تەختی دەسەڵات بگرنەدەست، بەمەش ناکۆکی دروستدەبێت، شەڕی خێزانی سەرهەڵدەدات ولەپای شەڕی ناوخۆیەتیدا نەوەکانی پاشایەتی میسر لەناودەچن، ئەگەر تێبینی بکەیت ماوەی دووسەدو پەنجا ساڵە لەم وڵاتەدا، سێزدە پاشا یەك لەدوای یەك حوکمی ئەم مەملەکەتەیان کردووە، چونکە ئەمانە بەمیراتگرەوەی تەخت وتاراجی پاشایەتی ناسراون وکاتێکیش لەسەرتەختی پاشایەتی دادەنیشتن، کەس دوژمنایەتی نەدەکردن، چونکە دەیانزانی پاشایەتی مافی ڕەهای پاشایە، ئەویش ڕۆڵەی خودی پاشایەو دوای باوکی لەسەرتەختی پاشایەتی دادەنیشێت، بۆیەش ئەم ڕەوشە دانراوە بۆئەوەی ناکۆکی نەکەوێتەناو بنەماڵەی پاشایەتی وتەخت وتاراجی بەئاگری شەڕی ناوخۆیی لەناونەچێت، لەدەوروبەری هەرتەخت وتاراجێکی پاشایەتیدا هەزاران شازادەخانم هەن ولەسەردەمی پاشاکانی پێشودا بنەماڵەی تۆ ژمارەی شازادەکان لەسەدان زیاتربوون وهەریەکەیش لەمانە، وایان بیرکردۆتەوەکە شایستەی ئەوەن ببنەپاشا، بەڵام کاتێ پاشا کوڕی دەبوو هیچ شازادەیەك ئیتر بیریان لەمەنەدەکردەوە کەلەسەر تەختی پاشایەتی دابنیشن و تاج لەسەربنێن، چونکە ئەمانە ئەوکاتە دەگەنە ئەو قەناعەتەی پاشایەتی مافی کوڕی پاشایە.
– کلیۆپاترا گوتی: ئەوکەسەی کەدەبێ دوای بەتلیمۆسی چواردەهەم ببێت بەپاشای میسر، ئایا هەردەبێ لەسکی من بێت؟
– ڕەهبانەکە گوتی: مەرجی یەکەمی کوڕی پاشای میسر ئەوەیە لەخودی پاشای میسربێت، هەرکاتێك ئەوکوڕە لەسکی تۆبێت مافی گرتنەدەسەڵاتی تەختی پاشایەتی زیاتردەبێت.
– کلیۆپاترا گوتی: منیش دەڵێم دەبێ ڕۆڵەی جێگرەوەی پاشا لەخودی خوێنی پاشابێت.
– ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ بەوشێوەیەیە.
– کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر جێگرەوەی پاشایەتی لەسکی من نەبێت هیچ کێشەیەك دروستناکات، وانییە؟
– ڕەهبانەکە گوتی: ئەگەر ڕۆڵەی جێگرەوەی پاشا لەخودی پاشابێت هەموو لایەك دان بەئەودادەنێن، ئەگەر لەسکی تۆبێت- یان لەسکی ژنێکیتر، بەڵام کەلەسکی تۆبێت ئەوامافی زیاتری گرتنەدەستی تەختی پاشایەتی دەبێت.
– کلیۆپاترا گوتی: من حەزناکەم ئەو ئیمتیازە بەنیسبی من بێت وجێگرەوەی تەختی پاشایەتی میسر لەمن بێت، بەبراکەم بڵێ تەڵاقم بدات وژنێکیتر بهێنێت، بۆئەوەی ئەوجێگرەوەی تەختی پاشایەتی میسر

بێتەدنیاو زنجیرەی پاشایەتی بەتالیسە بپارێزێت، جارێکیتر بێدەنگی باڵی کێشایەوەو تاماوەیەك هیچ یەکێك لەمانە قسەیان نەدەکرد، تابەتلیمۆسی چواردەهەم گوتی: من حەزناکەم کلیۆپاترا تەڵاقبدەم، چونکە خۆشمدەوێت وئامادەم سەبربکەم، چون دەزانم بەبەسەرچوونی کات پەشیماندەبێتەوەو ڕاکەی دەگۆڕێت وئامادەدەبێت ببێتە ژنی واقیعی من.

– ڕەهبانەکە بەپاشای میسری گوت: تۆ دەتوانیت سەبربکەیت، بەڵام پاشایەتی میسر ناتوانێت سەبربکات وپێویستی بەجێنشینی پاشا هەیە، لەوانەیە بۆچەند ساڵێکی تریش کلیۆپاترا ڕای خۆی نەگۆڕێت وئامادەنەبێت ببێتە ژنی ڕاستەقینەی تۆ، بەڵام تائەوکاتە لەوانەیە پەشیمانی واڕووبدات پاشایەتی لەبەین بچێت، هەرکاتێك جێگرەوەی پاشایەتی لەمیسردا هەبێت، ئەوازنجیرەی پاشایەتی نافەوتێت.

دواتر ڕەهبانەکە ڕوویکردە کلیۆپاتراو گوتی: ئایا بڕیارەکەی تۆ ڕەهایەو حەزناکەیت ببیتە ژنی واقیعی مێردەکەت و بۆ ئەو و خۆت، منداڵتان ببێت ؟

– کلیۆپاترا گوتی: نەخێر ئەی ڕەهبان من نامەوێت ببمە ژنی واقیعی براکەم وئەمەش لەنەفرەتەوە سەرچاوەی نەگرتووە سەبارەت بەبراکەم، من براکەم خۆش دەوێت، بەڵام هەرکاتێ وێنای ئەوە دەکەم کەئەو گەنجە دەبێت ببێتەهاوسەری من وپەیوەندی ژنم ومێردایەتی لەگەڵ منداهەبێت لەوپەڕی بێزاری خۆم گیانم دەکەوێتە لەرزە، بۆیەش دوایین بڕیاری من ئەوەیە کەنابمە ژنی ئەو.

– ڕەهبانەکە گوتی: ئەگەرنەبیتە ژنی براکەت ئەوامافی شاژنیەتیت نابێت وئیتردەبیتە شازادە خانمێکی سادە.

– کلیۆپاترا گوتی: خۆ ئەرسینۆهە یەك شازادەخانمی سادەیە، چ زەرەدێکی هەیە کەمنیش ببمە یەك شازادە خانمی سادە؟

– لەوکاتەدا ڕەهبانەکە بەپاشای میسری گوت: ئەگەر ناچاربووی لەکلیۆپاترا جیاببیەوە، دەتوانیت لەگەڵ خوشکەکەی ترتدا هاوسەرێتی بکەیت وئەرسینۆهە ئامادەیە شوو بەتۆبکات.

– بەتلیمۆسی چواردەهەم بەدەنگێکی پڕقین وبەسەرسامییەوە گوتی: ئایا تۆدەڵێیت من ئەرسینۆهە بکەمە ژنی خۆم؟

– ئەو قسەیەی بەتلیمۆس ئەوەی دەگەیاند کەناوبراو بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کلیۆپاترا قێزی لەشوکردن بەبراکەی دەبێتەوە، ئەویش ئەوەندە نەفرەت لەوەدەکات کەئەرسینۆهە ببێتە ژنی، من پێموایە کلیۆپاترا گوێی لێنەبوو کەبراکەی چۆن وەڵامی ڕەهبانەکەی دایەوە- یان گوێی لێبوو وتێنەگەیشت بەتلیمۆس چیگوت وتێنەگەیشت بەتلیمۆس چەند ڕقی لەوەیە ئەرسینۆهە ببێتە ژنی ،چونکە ئەگەر تێگەیشتبا براکەی لەهاوسەرێتی خۆی وئەرسینۆهە چەند نارازییە ئاوابەخێرایی ڕای خۆی نەدەگۆڕی، هەرکە کلیۆپاترا ئەوەی لەڕەهبانەکە گوێ لێبوو کەئەرسینۆهە دەتوانێت شووبە بەتلیمۆس بکات؟

کلیۆپاترا: گوتی سەیرکە سەبارەت بەتەڵاقدانەکە چاوەڕوانی ڕایەکیتربکە، من زانیم ئیرەیی بۆتەهۆی ئەوەی کلیۆپاترا ڕاکەی خۆی بگۆڕێت ئەوبیری لەوە نەکردبۆوە کەهەرکاتێ براکەی لەئەوجیابۆوە ئەوا ئەرسینۆهە دەتوانێت ببێتە ژنی مێردەکەی ومنداڵی ببێت.

– ڕەهبانەکەی پەستگای دلف هەستی کرد ئیرەیی بۆتەهۆی ئەوەی کلیۆپاترا ڕای خۆی بگۆڕێت ولێی پرسی: ئایا بڕیاری داهاتووی تۆ چەند دەخایەنێت؟

– چونکە پرسیار نەکردنەکەی ئەو کەمێ خێراو شێوە زاڵی پێوەدیاربوو بەگرانی لەسەر کلیۆپاترا کەوتەوە، ڕەهبانەکە قسەی خۆی درێژکردەوەو گوتی، ئەی شازنی میسر بەلای تۆوە شاراوەنییە سەبارەت بەکاروباری ژن ومێردایەتی تۆ وبراکەت هیچ قازانجێك ناکەم، هەروەها سەبارەت بەمەسەلەی جێنشینی پاشایەتی میسریش هیچ قازانجێکم دەستناکەوێت، ئەوەی من دەیڵێم بۆچاکەو ڕاستی پاشایەتی میسرە، لەبەئەوەش پرسیم کەی بڕیارەکەی ئایندەت دەدەیت، بۆئەوەی چیتر براکەت بەبێ جێنشین نەمێنێتەوە.

– کلیۆپاترا گوتی: من تاسێ ڕۆژیتر دوایین ڕای خۆم دەردەبڕم ومەعلومی دەکەمەوە، ئایا ئامادەم ببنە ژنی واقیعی براکەم– یان نا؟

– ڕەهبانەکە گوتی: زۆرباشە ئیتر من لێرە کارم نەماوەو دەگەڕێمەوە بۆپەرستگا.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا شەوانە دەگەڕێیتەوە پەرستگاکە؟

– ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ ئەی شازنی میسر.

– کلیۆپاترا گوتی: لەکۆشکی پاشایەتیدا دەیان ژوورهەن کەدەیان کەسی وەك تۆدەتوانن لەوێدا بخەون، من پێیاندەڵێم ژوورێك لەمانە بدەن بەتۆ ولەوێ بخەوەو سبەینێش بڕۆرەوە.

– ڕەهبانەکە پێشنیارەکەی شازنی میسری قەبوڵکردو کلیۆپاترا بانگی منی کردوو فەرمانیدا یەکێك لەو ژوورانەی کۆشکی پاشایەتی بۆڕەهبانەکە ئامادەبکەم، بەڵام دوای ئەوەی ڕەهبانەکەم گەیاندە ئەو ژوورەی کەتێیدا بخەوێت، زانیم دوودڵە لەخەوتنی لەوێ.

– لێم پرسی: ئایا ئەم ژوورەتان بەدڵ نییەو حەزناکەیت لەم ژوورەدا بخەویت؟

– گوتی: شرمیون من پێم باشترە لەژوورەکەی تۆدا بخەوم.

– گوتم: ئەم ژوورە زۆر لەژووری من باشترەو جێگایەکی نەرم ونوڵی تێدایە، تۆ لەم ژوورەدا بەئاسودەیی دەتوانیت بخەویت، بەڵام ئەگەربێیت بۆ ژوورەکەی من جێگای نەرمت نابێت.

– ڕەهبانەکە گوتی: شرمیون من کارم بەجێگای نەرم نییە، تەنها دەمەوێت بزانم کلیۆپاتراو براکەی دوای ئەوگفتوگۆیەی ئەمشەومان، چۆن لەگەڵ یەکتریدا دەدوێن.

– گوتم: ئەگەر خاتوونەکەی من بزانێت تۆم هێناوە بۆژوورەکەی خۆم، تووڕەدەبێت، چونکە ئەو گوتی یەکێك لەژوورەکانی کۆشکی پاشایەتی بۆئەو دابنێن، جاری یەکەم بوونی تۆ لەژوورەکەی مندا هەرچەندە مەترسیداربوو، بەڵام دەمتوانی بەهانە بۆبوونی تۆ بهێنمەوە، وەلێ ئەمجارەیان ناتوانم بڵێم تۆبۆچی لەژوورەکەی مندا خەوتویت، ئەگەر کلیۆپاترا تۆ لەوێ ببینێت، ئەواتێدەگات تۆ بۆجاسوسی هاتووی ومنیش ناتوانم وەڵامگۆی خاتوونەکەی خۆمبم.

– لەو کاتەدا ڕەهبانەکەی خۆی لەمن نزیککردەوەو دەستی گرتم وگوتی، شرمیون یەکەمجار کەمن هاتم بۆ ژوورەکەی تۆ دەمویست گوێم لەقسەکانی خاتوونەکەی تۆ ومێردەکەی بێت، بەڵام ئەمجارەیان مەبەستی گوێ گرتنم نییە لەم دووانە، بەڵکو بۆیە دەمەوێت بێمە ژوورەکەی تۆ تاخۆم لەژوورەکەی تۆدا

ببینمەوە، بەتایبەت دوای ئەوقسانەی کەکلیۆپاتراو مێردەکەی کردیانن، زیاتر حەزم چۆ ئەوەی لەپاڵتدا بخەوم.

– گوتم: کەواتە ئەو پڕوپاگەندانەی خەڵك سەبارەت بەڕەهبانەکان دەیکەن ڕاستە.

– ڕەهبانەکە گوتی: قسەوباسی خەڵکی سەبارەت بەڕەهبانەکان چییە؟

– گوتم: خەڵك دەڵێن پیاوانی ڕاهیب، بەپێچەوانەی ئەوەی کەبەڕووکەش دیارن، دەستیان لەدنیا هەڵگرتوەو لەتەواوی لەزەت لەتەواوی شتەخۆشەکانی دنیا وەردەگرن، لەمانەش دەستیان لەگەڵ ئافرەتاندا تێکەڵاوکردووە، بیستومە هەندێ لەپیاوانی ڕاهیب، قژی دەستکرد دەکەنە سەریان و دەچن بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی، بۆئەوەی شەو لەگەڵ ژنێکی وێدا بەسەربەرن.

– پیاوە پیرەکە پێکەنی وگوتی: شرمیون ئەوەی کەسەبارەت بەڕەهبانەکانی میسر بیستوتە، ڕاستە. پیاوانی ڕاهیب بەپێچەوانەی تێڕوانینی گشتی لەچێژو لەزەتی دنیا بێبەشنین، چونکە ئەمانەش مرۆڤن وچاو ودڵیان هەیە، بەڵام من لەوکەسانەنیم بۆڕابواردن بچم بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی، چونکە ژنەکانی ئەوێ بەلای منەوە پەسەندنین، من کچی جوانی وەك تۆم لاپەسەندن.

– کاتێ ئەم قسەیەم لەدەمی ئەو پیرەمێردەوە گوێلێبوو، قەدوباڵای کاڵم هاتەوەبەرچاو وبەدەر لەئیرادەی خۆم، بەراوردی ئەوکوڕە لەشجوانەم لەگەڵ ئەو پیرەمێردەدا کرد، مووی سەری ڕەهبانەکە ڕووتابۆوە ئەوشوێنەی کەتاشیبووی لەچاو شوێنەکانیتری سەری زۆرجیاوازی نەبوو، چەند ددانێکی پێشەوەی ئەو پیرەمێردە کەوتبوون وببوونە ڕێگر لەوەی لەکاتی قسەکردندا دروستبدوێت وهەندێ وشە بەهۆی نەمانی ددانەکانییەوە خراپ دەبیستران وتێگەیشتنیان بەزەحمەتبوو، پێستی دەست ودەموچاو وگەردنی ڕەهبانەکە ئەوەندە لۆچ ببوون کەوەك کراسی چینداری ژنەکانی میسر دەچوو، سەرم لەم چارەنووسە سوڕمابوو، بۆچ دەبێ یەك گەنجی وەك کاڵ بەوقژە قەشەنگ وئەوچاو وبرۆ دڵفرێن ودەمێکی بچوك وسیمایەکی وەك گوڵ وبەژن وباڵایەکی ڕێك، حەزی لەمن نییەو ناسازێ، یەك پیرەمێردی ڕەهبان بەوپەڕی جۆشوخرۆشەوە پێم دەڵێت، خۆشم دەوێیت؟

من پێموانەبوو کەئەو داواکارییەی ڕەهبانی پەرستگای دلف، بەجددی نەبێت، پێموابوو بەگاڵتە وادەڵێت، بەڵام دوای ئەوەی زانیم ئەو بەڕاستییەتی سەرسامبووم وپێمگوت: ئەم بیرە لەسەری خۆت دەرکە.

– ڕەهبانی پەرستگای دلف گوتی: شرمیون چونکە تۆ ئێستاش تەمەنت کەمە، نازانی ڕازیکردنی من سەبارەت بەتۆ چەند گرنگ وبەنرخە، ئەگەرتۆ ڕازیم بکەیت، ئەوادەتکەم بەخزمەتکاری پەرستگای دلف.

– گوتم من کارەکەری کلیۆپاترام تائەوکاتەی خۆم لەکلیۆپاترا نەکڕمەوە- یان کەسێکیتر لەئەوم نەکڕێتەوە، ئەواهەر کۆیلەی شاژنی میسردەبم وناتوانم لێرەبڕۆم.

– ڕەهبانەکە گوتی: کەتۆ بوویتە خزمەتکاری پەرستگای دلف ئازاد دەبیت، چونکە بەپێی قانونی شەرعی ئێمە، هەموو کارەکەرو نۆکەرێك کەببێتە خزمەتکاری پەستگای دلف، ئەوا ئازاددەبێت.

– گوتم: ئایا خاتوونەکەی من ڕێگادەدات، ببمە خزمەتکاری پەرستگای دلف؟

– ڕەهبانەکە گوتی: خاتوونەکەت ناتوانێت لەگواستنەوی تۆ لێرەوە بۆپەرستگای دلف ڕێگربێت، چونکە من خزمەتکارانی پەرستگای دلف دیاریدەکەم، ئەو دیاریکردنەی منیش، قسەیەکە کەس

ناتوانێت سەرکێشی لێبکات وقسەکەم بشکێنێت، ئەو کەسەی بۆ خزمەتکردنی پەرستگای دلف هەڵیدەبژێرم، کوڕبێت- یان کچ، خود بەخود ئازاددەبێت.

- گوتم، ئەگەر کچێکی وەکو من ببێتە خزمەتکاری دلف، چ قازانجێك دەکات وچی دەستدەکەوێت ؟

- ڕەهبانەکە گوتی: چەند دەستکەوتێکی گیردەکەوێت، یەکەم ئەوەیە ئازاددەبێت وئیتر کارەکەر نابێت، دووەم هەرکاتێك بیەوێت شووبکات ئەواسەرمایەیەکی باش لەگەڵخۆیدا دەبات، دواتر خزمەتکردن بەپەرستگایەك ئیمتیازی تری هەیە، ئەویش ئەوەیە، ئەوانە دەتوانن ژن بێنن وشوبکەن، بەڵام ئێمەی ڕەهبان ناتوانین ژن بهێنین.

- گوتم: ئەوسەرمایەیە لە چ ڕێگایەکەوە دەدرێت بەخزمەتکارانی پەرتگای دلف؟

- ڕەهبانەکە گوتی: هەرکەسێك وەك خزمەتکار بێتەناو پەرستگا، دەبێتە خاوەنی موچەیەك کەساڵانە دەیدەن بەئەو، چونکە لەپەرستگای دلفیشدا هیچ خەرجییەك نییە، خەرجی پەرستگا دابینی دەکات، ئەو موچەی ئەو کۆدەبێتەوەو کەی ویستی لەپەرستگاکە بڕوات، یەکسەر ئەوپارانەی دەدەنەوە.

- لەڕەهبانم پرسی: ڕێگای هاتن بۆپەرستگای دلف چییە؟

- لەوەڵامدا گوتی: ڕازیکردنی من.

- لێم پرسی: ئایا دوای ئەوەی بووم بەخزمەتکاری پەرستگای دلف، ناتوانم لەپەرستگا بێمەدەرێ و بچم بۆناو شارو سەردانی کەس وکاری خۆم بکەم؟

- مەبەستی من لەوپرسیارە دەیدەنی کەسەکانم نەبوو، چونکە من لەئەسکەندەریەدا کەس وکارم نەبوو، بەڵکو هەر بۆئەوە دەمەویست بێم بۆشار، تاکاڵ ببینم، چونکە بینینی ئەوکوڕە گەنجە بەلای منەوە یەکێکبوو لەپێداویستییەکانی ژیان.

ڕەهبانەکە گوتی: هەردوو مانگ جارێك دەتوانی بۆماوەی سێ ڕۆژ بێی بۆشارو هەرکەسێکی بتەوێت سەردانی بکەیت.

- گوتم: ئەی ڕەهبانی پەرتسگای دلف من داواکارییەکەی تۆ قبوڵ دەکەم.

- ڕەهبانەکە گوتی: کەواتە بابچین بۆ ژوورەکەی تۆ ولەوێدا بخەوین.

- گوتم: داخوازی تۆ بەمەرجێك قبوڵ دەکەم.

- ڕەهبانەکە پرسی: ئەو مەرجە چییە؟

- گوتم: تۆ دەزانیت کەئەرسینۆهە پەیمانی بەمنداوە هەرکاتێك کلیۆپاترا لەبراکەی جیابۆوەو بووبەهاوسەری ئەو ئێمە ئازاد دەکات.

- ڕەهبانەکە گوتی: دەزانم، ئاگاداری ئەوەم.

- گوتم: بەڵام تۆ بەشێوەیەك قسەت لەگەڵ کلیۆپاترا کرد، کەمەسەلەی تەڵاقدانی کلیۆپاترا بەکلانەبۆوەو سەری نەگرت.

- ڕەهبانەکە گوتی: ئێستاش مەعلوم نییە داخوا سەردەگرێت.

- گوتم: تۆکاتێ گوتت دوای تەڵاقدانی کلیۆپاترا، ئەرسینۆهە دەتوانێت ببێتە ژنی بەتلیمۆس، کلیۆپاترات ناچارکرد گەرم وگوڕی لەگەڵ مێردەکەیدا پەیدابکاتەوە، من دڵنیام دوای سێ ڕۆژیتر کلیۆپاترا ڕازیدەبێت ودەڵێت ئامادەم ببمە ژنی ڕاستەقینەی مێردەکەم.

لەبەر ئەوەی مەسەلەی تەڵاقدانی کلیۆپاترا سەری نەگرت، ئەرسینۆهە من لەخوشکەکەی ناکرێتەوەو ئازادم بکات، تۆش ئێستا بەمن دەڵێیت ئەگەربێیت وببیت بەخزمەتکاری پەرستگا، ئازادت دەکەم وهەرکاتێك بتەوێت لەپەرستگا برۆیت، هەموو ئەوشتانەی دەتکەوێت دەتدەمێ.

- ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ وادەبێت.

- گوتم: تۆ من بکە بەخزمەتکاری پەرستگای دلف وئازادم بکە، دوای ئەوەی زانیم ئازادبووم ولەپەرستگای دلفدام، داواکارییەکەی تۆ جێبەجێدەکەم.

- ڕهبانەکە پێکەنی وگوتی: شرمیون من تۆم بۆئەمشەو دەوێت، نەك بۆچەند مانگێکیتر، چون من ئەگەر لەشارەوە گەڕامەوە پەرستگا لەوێ ژن بۆمن زۆرن وپێویستم بەتۆ نابێت.

- من تائەوکاتەش هەوڵمدەدا دڵی ڕابگرم بەشێوەیەك هەڵسوکەوت بکەم، لەهەراسانکردنەکەی ئەو ڕزگارمبێت وبگەڕێمەوە ژوورەکەی خۆم وپشوویدەم، لەم هەموو بێشەرمی ورەفتارە دزێوەی ئەو، تورەبووم وگوتم: پێم سەیرە، ئەی تۆ چ جۆرە ڕەهبانێکی کەلەپەرستگاکەی تۆدا ژنی زۆرهەن؟

- ڕەهبانە پیرەکە زانی توند قسەکردنەکەم تورەیی پێوە دیارە بەپێکەنینەوە گوتی: پەرتسگای دلف دووبەشە، بەشێکی هی ژنانەو بەشێکی هی پیاوانە، ئەودوو بەشە کەمێك دوورن، بەڵام ئەودوو شوێنانە بۆمن کراوەن ودەتوانم ئەوخزمەتکارانەی کەلەبەشی ژناندان بیانبینم.

- کەواتە لەبەشی خزمەتکارانی پەرستگادا ژن رۆرن.

- ڕەهبانەکە گوتی: بەڵێ.

- گوتم: باشە خۆتۆ گوتت تەنها ئەمشەو بوومەتەجێگا سەرنج وئارەزووی تۆ، هەر کەلێرە گەڕایەوە بۆپەرستگا، پێویستت بەمن نابێت.

- ڕەهبانەکە گوتی: مەبەستم پێویست بوونی هەمیشەییە بەتۆ ،دوای ئەوەی تۆ گەیشتیتە پەرستگا لەوانەیە دووبارە پێویستم پێتبێتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی بەردەوام نا، من چۆن دڵنیابم لەوپەیمانەی کەتۆ بەمنی دەدەیت، ڕاستەدەرچێت؟

- پیرەمێردەکە بەسەرسوڕماویەوە گوتی: شرمیون ئایا تۆباوەڕت بەپەیمانی گەورە ڕەهبانی پەرستگای دلف نییە، ئایا پەیماندانی ئەو بۆ دڵنیابوونەوەت بەس نییە.

- من بۆجارێکیتر بەسەرخۆمدا زاڵبوومەوە، بەدەربڕینێکی هێمن، بەڵام جددی گوتم: وەعدی ڕەهبانی گەورەی پەرستگای دلفم قەبوڵە، بەڵام ئەو ڕەهبانەی شەودێت بۆکۆشکی پاشایەتی میسرو کارەکەرێك دەبینێت وبنەماو نەیتی ڕەهبانیەت دەخاتە ژێرپێی خۆیەوەو داوا لەوکارەکەرە دەکات بۆشەوێك لەگەڵیدا ڕابوێرێت، قەبوڵ نییە، چونکە من وابیردەکەمەوە ئەوپیاوەی موقەدەساتی ڕەهبانییەتی دەخاتە ژێرپێی، پەیمانەکەی خۆشی ناباتەسەرو دەیخاتە ژێرپێی، لەلایەنێکەوە پێشنیارەکەی تۆ زۆر سەرنجراکێشەو ناتوانم وەلای نێم، من ئارەزووی یەك ئەفسەری جوان ولاوم هەیە، حەزدەکەم ببمەهاوسەری، بەڵام چونکە کارەکەرم بەئاواتی خۆم ناگەم، دەزانم خاتونەکەم ئێمە ئازادناکات تاببمە هاوسەری ئەوئەفسەرە، بۆیە پێشنیارەکەی تۆ بووەجێگای سەرنجم، چونکە تێگەیشتم لەڕێگای بوونم بەخزمەتکار لەپەرستگای دلفدا، ئازادی بەدەستبهێنم وبەوکوڕەبگەم، ئیتر تۆ قەولەکەی خۆت ببەسەرێ

وئێمە ئازادبکەو هەرکاتێك زانیم ئازادبووم وبووم بەخزمەتکاری پەرستگای دلف، خواستەکەی تۆ جێبەجێدەکەم.

– ڕەهبانەکە تائەوکاتەش جارجار نەرمە خەندەی دەهاتنێ، دەمووچاوی تێکنان وگوتی: شرمیون ئایا تۆ گاڵتە بەمن دەکەیت؟

– گوتم: تۆداوایەکت لەمنکرد، منیش داوایەکم لەتۆکرد، مەسەلەی گاڵتەکردن لەگۆڕێ نییە.

– ڕەهبانەکە گوتی: شرمیون تۆمنت لەوپێشنیارەی کەکردم پەشیمانکردەوە، لەبەرئەوەی تاکو ئەمرۆش کەس گومانی لەقسەکانی من نەکردووە، دیارە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ بێئەزموونی تۆ، هەرچەندە لەشێوەی قسەکردن وهۆشی تۆوە دیارە کەخوێندەواریت هەیە، بەڵام بێسەلیقەی، چونکە تەجروبە جیایە لەخوێندەواری، هەندێ منداڵ لەبچوکییەوە فێری خوێندەواری دەبن، بەڵام تەجروبەیان نییە. ئەگەرتۆ تەجروبەت هەبایە، بەوشێوەیە لەگەڵ مندا قسەت نەدەکرد.

– ڕاهیبە پیرەکەم جێهێشت وئەونەیزانی کەمن بۆیە بەوشێوەیە قسەم دەکرد، ڕقم لێیدەبۆوە، ئەگەر ناچارنەبام گوێم لەقسەکانی ئەو نەدەگرت ولامسەللام دەکرد، بەڵام چون ئەوگەورە ڕەهبانی پەرستگای دلفبوو ومنیش کارەکەرێك، ناچاربووم ئەو داواکارییەی ئەو پیرەمێردە لەمنی کرد، ئەگەر کاڵ بوایە من بەوشێوەیە قسەم نەدەکرد، من یەك تاشەبەردی گەورەم لەبەرپێکانی ڕەهبانەکەدا دادەنا بۆئەوەی نەتوانێت بیجوڵێنێت، ئەو پێشنیارەی کەئەویشکردی من ڕەفزمکرد، بێ ئەوەی ئەو قەبوڵنەکردنە بەدەمم دابێت.

ئەوکاتەی ڕەهبانی پەرستگای دلفم لەژوورەکەدا بەجێهێشت وگەڕامەوە هۆدەکەی خۆم کەلەتەنیشت ژوورەکەی کلیۆپاتراو براکەی بوو، بۆئەوەی بخەوم، بەڵام پێشئەوەی خەوم لێبکەوێت لەژوورەکەی شاژن ومێردەکەی گوێم لەقسەی وابوو کەلەشەوانی ڕابردوو جیابوو.

دوو ڕۆژی نەخایاند لەئەسکەندەرییەدا مەراسیمێکی گەورە بەرپابوو ئاهەنگەش بەبۆنەی گواستنەوەی کلیۆپاترابوو بۆ بەتلیمۆسی چواردەهەم، هەموو پەرستگاکانی ئەسکەندەرییەو ناوچەی سەروو[50] دلتای نیلیش لەوئاهەنگەدا بەشداربوون، لەماوبەر گوتمان لەئەسکەندەریەدا سواڵکەرنییەو خەڵك موحتاج نەبوون، خواردن وخواردنەوەی میوان وگەشتیارەکان بخۆن، هەموو کەسێك دەیتوانی بەکرێ کاری ڕۆژێکی خۆراکی خۆی دەستەبەربکات،

50- بەپێی جوگرافیای ئەوکات.(و-کوردی)

هەندێ لەکرێکارانی ئەسکەندەریە بەتایبەت کرێکارانی بەندەر لەخواردنەوەی شەرابدا گەدەبەلیان دەکرد، بەوەی کەخەڵك مەجبوری خۆراك وشەرابی میوان وگەشتیاران نەبوون، ئەوڕۆژە لەسەر خەرجی بەتلیمۆسی چواردەهەم- پاشای میسر، خۆراك وشەرابی میوانەکانیاندا بەخەڵك، ئەوەندەیان شەراب دەرخواردی خەڵکدا، ئێستا نیوەڕۆ نەبوو ژن وپیاو مەست ببوون، لەنیوەڕۆدا ڕیزی گیانلەبەرانی باغی ئاژەڵان لەشەقامەکانی ئەسکەندەریەوە پۆلپۆل هاتن، شێرو فیل و زەرافەکان، وەڕێ کەوتن، لەنێوان پۆلپۆلی ڕیزبەندییەکەی ئاژەڵەکاندا، دەستەدەستە ئاهەنگی مۆسیقایان دەژەنی وئەوشیعرەی کەلەهەمان

ڕۆژا دانرابوو، ئەوشیعرەش بەبۆنەی مەراسیمی گواستنەوەی کلیۆپاترا بۆبراکەی بوو، کەبەم شێوەیە ڕێکخرابوو (دوای ئەوەی شاژن سکیپڕبوو وچوار کوڕی بەسکێکبوو...)

لەو ڕۆژەدا تەواوی دانیشتوانی ئەسکەندەریە شادمانبوون وبەزموڕەزمیان دەکرد، خاتوونەکەی من کلیۆپاترا لەکۆشکی پاشایەتی نەچۆدەرێ، دەمزانی هۆی غەمگینبوونی خاتوونەکەم چییە، ئەو براکەی خۆشنەدەویست، بەڵام لەترسی ئەوەی خوشکەکەی ئەرسینۆهە، نەبێتە ژنی پاشا، ئامادەبوو ببێتە ژنی ڕاستەقینەی ئەو، چونکە لەڕووی ناچاری ورقەوە ببووە ژنی ڕاستەقینەی ئەو، خۆی بەبەدبەخت دەزانی، ئەرسینۆهەش خوشکی کلیۆپاترا ئەو ڕۆژە لەکۆشکی پاشایەتی نەهاتەدەرێ، بەڵام نەچوونە دەرێی ئەو لەکۆشکی پاشایەتی سەرچاوەکەی لەتێشکانەوەبوو وئیرەیی دەبرد بەوەی بۆدەبێ کلیۆپاترا ببێت ژنی بەتلیمۆسی چواردەهەم وسەرئەنجام ببێتە شاژنی میسر.

بەیانی ئەوشەوەی کەڕەهبانی پەرستگای دلف لەکۆشکی پاشایەتی دابوو، ئەرسینۆهە بانگی کردم، دیارەپێش بانگکردنی من ئەوبەیانییە ڕەهبانە پیرەکەی بینیبوو، من نەمدەزانی ڕەهبانەکە چی بەئەو گوتبوو، بەڵام پێموانەبوو شتێکی بەپێچەوانەی واقیع گوتبێ، منیش ئەوشتانەی کەلەدەمی کلیۆپاتراو بەتلیمۆس وڕەهبانەکەم گوێ لێبوو، بۆ ئەرسینۆهەم گێڕایەوە.

– ئەویش لێی پرسیم: شرمیون بۆچوونی تۆچۆنە، ئایا خوشکەکەی من، دوای ماوەی ئەوسێ ڕۆژە ڕازی دەبێت ببێتە ژنی ڕاستەقینەی براکەمان– یان نا؟

من دەمویست بەئەو بڵێم: کلیۆپاترا ئەمشەو بۆتە ژنی ڕاستەقینەی ئەو (بەتلیمۆسی چواردەهەم) براکەی کلیۆپاتراو مێردیشیەتی، نەوێرام، چونکە ئەگەر ئەم قسەیەم کردبا ئەرسینۆهە تورەدەبوو.

من دەمزانی کەهەواڵی مەراسیمی گواستنەوەکەشی پێگەیشتووە، بەڵام باشتروابوو ئەوهەواڵە ناوبراوە لەدەمی خەڵکانیتر ببیستێت، جگەلەمە هەموو ڕاستییەکانیترم پێگوت، لەمانەش پێم ڕاگەیاند کەڕەهبانی پەرستگای دلف خۆی پێڕانەگیرا ناوت نەهێنێت، چونکە تائەوکاتەی ڕەهبانە پیرەمێردەکە ناوی تۆی نەگوتبوو، کلیۆپاترا بڕیاریدابوو لەمێردەکەی جیابێتەوە، بەڵام کەناوی تۆی هاتەسەر زمان، ڕای کلیۆپاترا لەچەند ساتێکدا گۆڕاو داوای ئەوەیکرد ماوەی پێبدەن تابیری لێبکاتەوەو گوتی: پاش سێ ڕۆژی تر بڕیاری کۆتایی خۆمتان پێدەڵێم.

– ئەرسینۆهە زانی ڕەهبانە پیرەکە هەڵەی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوتی: چونکە کلیۆپاترا زۆری ڕق لەبراکەم دەبێتەوە، ئومێدەوارم دوای ئەوسێ ڕۆژە بڕیاری جیابوونەوەبدات.

## کلیۆپاترا بووبە فەرماندەی لەشکری ئەسکەندەر

من لەم سەرگوزەشتەیەدا ئەوەی بەرچاوم کەوتووەو بیستومە بۆکەسانی ئایندەی دەگێڕمەوە، بۆیەش دوورنییە ئەوەی کەمن دەیڵێم، جیاوازی هەبێت لەگەڵ مێژووی ڕەسمی میسردا، چونکە زۆرجار ئەوەی بۆ مێژوو دەینووسن زۆرجیاوازە لەوەی کەلەواقیعدا ڕوویداوە.
دوای ئەوەی کلیۆپاترا بووبەژنی ڕاستەقینەی بەتلیموسی چواردەهەم وخەڵك بەوبۆنەوە ئاهەنگێکیان گێڕا، پاشای میسر کلیۆپاترای خوشکی کەلەهەمانکاتیشدا ژنی بوو کردی بەفەرماندەی لەشکری ئەسکەندەر، لەشکری ئەسکەندەر باشترین لەشکری سوپای میسربوو دەمزانی کەکاڵ بەپلەی ئەفسەری لەولەشکرەدا خزمەتدەکات.
ڕۆژی یەکەم کەکلیۆپاترا بۆسەردانی لەشکرەکەی خۆی چوو، منیش لەگەڵی دابووم، شوێنی لەشکری ئەسکەندەر(57) لەناو سەربازگەی دەمەنهوردابوو، بەڵام ئەوڕۆژەی کلیۆپاترا ویستبای لەشکرە سەربازییەکەی ببینێت، دەبوایە بچوایە بۆدەمەنهور، بۆیە ئەولەشکرە لەسەربازخانەی دەمەنهورەوە گوازرایەوە بۆسێرکەکە، بۆیەش سێرکەکەیان بۆ ڕێوڕەسمی سەربازی هەڵبژارد، چونکە شوێنێکی گەورەبوو لەئەسکەندەریەدا، بەرفراوانتر لەسێرکەکە بوونی نەبوو، کلیۆپاترا دەیتوانی لەشکری ئەسکەندەر لەیەکێك لەشەقامەکانی ئەسکەندەریە- یان شوێنی لەنگەرگای پاپۆڕەکاندا جێگیربکات، بەڵام بەمە ڕێگای هاموشۆی خەڵکی پیادەو سواران وعەرەبانەکان دەگیرا- یان جموجوڵی بازرگانی لەبەندەردا دەوەستا، بەڵام سێرکەکە شوێنێکبوو بەرفراوان لەهەمانکاتیشدا دووربوو لەڕێگای گشتی ودانانی ئەوسەربازانە لەوێ نەببوەڕێگر لەبەردەم هاتوچۆی خەڵکدا.
ئەو ڕۆژەی کەشاژنی میسر دەیویست بۆبینینی لەشکری ئەسکەندەربچێت بۆسێرکەکە جلوبەرگی فەرماندەی لەشکری لەبەردەکرد، من تائەو ڕۆژە کلیۆپاترام ئاوا بەجوانی نەدیبوو، ئەو پانتۆڵێکی نیوچیندازی ئەرخەوانی لەپێکرد کەتا سەرئەژنۆی دەهات، لەسەر ئەو پانتۆڵەوە یەلەگێکی لوسی لەبەردەکردو کاسکێتێکی توسی لەسەرکرد، کەوشەکانی کەپێلاوی سەربازی بوون ویەك قەیتانی سفتی پێوەبوون لەپێکانی توندکردن، شاژنی میسر لەسەر یەلەگەکەی خۆی قولەباڵێکی شینی لەبەرکردو چەند پەڕی نەعامەشی بەکاسیکێتەکەیەوە کرد، بەوەی کەمن بەردەوام شاژنی میسرم دەبینی وکارەکەری باوەڕپێکراوی ئەوبووم، ئەو ڕۆژە بەشێوەیەك لەئەوم دەڕوانی، کەلەسەیرکردنەکەی تێر نەدەبووم.

57- لەشکری ئەسکەندەر. واتە لەشکرێکی سەربازی بووە. کەبەناوی ئەسکەندەری ماکتدۆنییەوە نراوە.(و- فارسی)

شەش هەزار سەرازی لەشکری ئەسکەندەر لەناو سێرکەکەدا بەسەر سێ ڕیزدا، دابەشببوون، هەر بەشەو دابەشبوون بەسەر چەند تیپداو هەر یەکێکیش لەوتیپانە فەرماندەکەیان لەپێشیانەوەبوون.
کەگەیشتینە سێرکەکە، کلیۆپاترا لەکەژاوەکە دابەزی وسواری ئەسپێکبوو وبەسەر سەربازانی لەشکری ئەسکەندەرداگەڕا، کاتێ خاتونەکەی من بەسەر سەربازەکاندا دەگەڕا، من لەناو کەژاوەکەدابووم، بەڵام

کاتێ نۆرەی پیادەڕەوی سەربازەکان هات، کلیۆپاترا لەئەسپەکەی دابەزی ولەیەکێك لەلۆژەکانی قاتی دووەمی سێرکەکەدا دانیشت، منیش لەپشت ئەوەوە ڕاوەستام.

ئیتر سەربازەکانی ئەولەشکرە پۆلپۆل بەشێوەی ڕیزبەند بەبەردەم کلیۆپاترا (فەرماندەکەی خۆیان)دا دەڕۆیشتن، لەکاتی ڕۆیشتنی سەربازەکاندا لێپرسراوی دووەمی ئەولەشکرە کەناوی (لگات)بوو لەتەنیشت کلیۆپاترادا ڕاوەستابوو، منیش لەپشتیانەوەبووم، خاتونەکەم سەرنجی خۆی سەبارەت بەڕێوشوێنی سەربازەکان بۆ (لگات) دەربڕی وگوتی: ئەوانە بەشێوەیەك دەڕۆن وەك ئەوەوایە سالانێکە بەبرسیەتی بەسەریان بردووەو خۆراکی تەواویان نەدراوەتێ، هەتا من دەبینم کەهەندێك لەمانە لەکاتی ڕۆیشتنیاندا بەشێوەیەك سەریان نەویکردووە کەپشتیان کۆم بۆتەوە، بۆچی تۆ شێوەی پێڕەوی فێری سەربازەکان ناکەیت؟

من پێموایە گرنگی سەربازێك لەڕێ ڕۆیشتنەکەیدا نییە، بەڵکو وابەستەیە بەئازایەتی وبەرگەگرتنی سەختی ودیژواری مەیدانی شەڕە، لەوانەیە ئەوسەربازانەی بەسەری نزمەوە بەڕێگادادەڕۆن لەمەیدانی شەڕدا ئازایەتی ئەمانە زۆر زیاتربێت لەوکەسانەی بەسەری بەرزو سینگی دەرپەڕیوەوە دەڕۆن، بەلام من ناتوانم خۆم لەمەببوێرم کەیەك لەشکر- نابێ ئاوابڕوات، ئەگەر ویستیشیان مەراسیمی پیادەڕەوی بکەن، دەبێ جوان بڕۆن وڕیزبەندییەکەیان بپارێزن وجلی جوانیان لەبەردانێت وجوان هەنگاوبنێن، یەکێك لەمەرجەکانی ڕۆیشتن هەنگاونانی باشە، پێویستە سەری بەشێوەیەك ڕاگرێت وەك ئەوەی سەد هەنگاو پێشی سەیردەکات وبەتوندی پێکانی بەزەوی دابدات، لەوکاتەی کلیۆپاترا سەرقالی گفتوگۆکردن بوو لەگەڵ فەرماندەی ئەولەشکرەدا، کاڵ بەخۆیی وتیپەکەیەوە بەبەردەم کلیۆپاترادا دەڕۆیشتن، کلیۆپاترا کالی نیشانی فەرماندەی ئەو لەشکرەداو وتی: سەیرکە ئەوپیاوە گەنجە کەسەرتیپە، بەشێوەیەك هەنگاو هەڵدەهێنێتەوە کەمرۆڤ واهەستدەکات لەشی لەدوو پەیکەری خواکان دروستکراوە، (واتا: هرکول- خوای ڕۆژ و- ئەپۆلۆ- خوای جوانی) ئەوئەفسەرە گەنجە ئەمجۆرە ڕۆیشتنە لێرەفێرنەبووە، چونکە ئەوشێوە هەنگاونانەوەیە لێرەفێری کەس ناکەن و تۆش دەتوانی بۆفێرکردنی سەربازەکانی خۆت کەڵك لەوگەنجە وەربگریت، دوای ئەوەی مەشقەکە تەواوبوو پێی بڵێ(58) بێت بۆ کۆشکی پاشایەتی و ئێمە ببینێ.

58- مەبەست لەوەیە کە(لگات) بەکاڵ بڵێت: کلیۆپاترا گوتویەتی بێت بۆکۆشکی پاشایەتی، بۆ لام.

ئێوارەی ئەوڕۆژە من لەکۆشکی پاشایەتیدا چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد داخوا کاڵ کەی دێت دەچێت بۆلای کلیۆپاترا، کاتێ بەرەبەری ئێوارە داهات، کاڵ گەیشتە کۆشکی پاشایەتی، وەك خووی هەمیشەیی خۆی، بەسەری بڵندو سینگی بەرزو هەنگاوی ڕێك وجێگیرەوە، بەرەولای سەرای کلیۆپاترا ڕۆیشت، بینیم کەیەك خزمەتکار کالی گەیاندەسەرای کلیۆپاترا، دوای ئەوی منیش بەخێرایی خۆم گەیاندە سەرای کلیۆپاترا بۆئەوەی بزانم خاتوونەکەی من لەگەڵ ئەوکوڕەدا باسی چیدەکەن، کاتێ ویستم بچمەناو سەراکە خزمەتکارەکەی کەمنی دەناسی گوتی: شاژن فەرمانیداوە کەس نەهێتەناو سەراکەی ئەوەوە، هەرچەندە ئەوفەرمانە تۆناگرێتەوە، بەلام بائەمە بزانی.

– گوتم: من ناچم بۆژووری شاژن، بەڵکو دەچم بۆ ژوورەکەی خۆم.

– خزمەتکارەکە سەری هێنایە بنگوێم و گوتی: شەرمیون من دەزانم تۆجێگای متمانەی شاژنی، هیچ یەکێك لەخزمەتکارەکان بەقەد تۆ لەئەو نزیکنین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باشاژن نەزانێت تۆ لەژوورەکەی خۆتدای، چونکە واهەستدەکەم کلیۆپاترا نایەوێت کەس گوێی لێبێت چ لەگەڵ ئەو ئەفسەرە لاوەدا باسدەکات.

– گوتم : من بەشێوەیەکی هێواش دەچمەژوورەکەی خۆم کەشاژنی میسر هەست بەچوونم بۆ ژوورەکەم نەکات، دواتر ڕێگای ژووری خۆم گرتەبەر.

– وەکو گوتم: ژوورەکەی من لەتەنیشت ژوورەکەی شاژنی میسردابوو، هەرچی لەو ژوورەدا بگوترایە من گوێم لێدەبوو وتەنانەت کەکاتێ دەرگای ژوورەکە بەنیوەکراوەیی دەمایەوە، دەمتوانی هەندێ دیمەنی ئەو ژوورەش ببینم.

کاتێ من گەیشتمە ژوورەکەی خۆم گوێم لێبوو کلیۆپاترا بەکاڵی دەگوت: من تۆم بۆیە بۆئێرە بانگهێشت کردووە تابەتۆ بڵێم سەربازەکانم پێویستیان بەمەشقپێکردنە، چونکە ناتوانن باش بەشێوازی سەربازی بەڕێگادابڕۆن، هەندێك لەمانە لەکاتی پێڕەویدا کوّم دەبنەوە، تۆش گەنجێکی لەشجوان وبەهێزی ودەتوانی سەربازەکانی لەشکرەکەم بەشێوەیەك مەشقدادەی کەبتوانن بەباشی بڕۆن، پێم بڵێ تۆ ئەم ڕێ ڕۆیشتنە لێرەفێربووی– یان نە؟

– کاڵ گوتی: من چەند جۆر وەرزش لەمانەش ڕێ ڕۆیشتن لەشاری بیزانس(59) فێربووم

59– دیارە لەمەوبەریش ئاماژەمان بەشاری بیزانس کردووە، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، قستەنتینەی کۆن وئەستەمبوڵی ئەمڕۆ دەکات.(و– فارسی)

– کلیۆپاترا گوتی: من وای بۆدەچم تۆئەو شێوە ڕێ ڕۆیشتنە لەیۆنان فێربووی، لەکۆندا هەموو سەربازانی ئەسکەندەر هەروەها سەربازانی ئەژدادەکەشم، وەك تۆ دەڕۆیشتن، ئایە تۆئامادەی سەربازانی لەشکری من بەشێوەیەك مەشقدادەی وەك تۆبڕۆن؟

– کاڵ گوتی: ئەو ڕێ ڕۆیشتنەی کەبیبێتەجێگای ڕەزامەندی تۆ، تەنها پێویستی بەڕێنماییکردن نییە، بەڵکو هەندێ وەرزشکردنیشی دەوێت، سەربازەکانی لەشکری تۆ دەبێ وەرزشبکەن، بۆئەوەی بتوانن بەباشی بڕۆن.

– کلیۆپاترا گوتی: من ڕێگا بەتۆ دەدەم کەوەرزشیش فێری سەربازەکانم، بکەیت. دوای ئەم قسەیە شاژنی میسر باسەکەی گۆڕی وپرسی: کاڵ دایکت خەڵکی کوێ بووە؟

– کاڵ گوتی: دایکم سریانی بووەو باوکیشم ئێرانی.

– کلیۆپاترا گوتی: کەواتە جوانییە خۆرهەڵاتییەکەی تۆ لەدایك وباوکتەوە بۆت بەجێماوە، بەڵام من جوانی یۆنانی لەتۆدا دەبینم.

– کاڵ گوتی: دایك وباوکی دایکم یۆنانی بوون.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا تۆ دەزانیت چەندە جوانی، دەتوانیت پەی بەڕووخساری جوانی خۆت ببەیت؟

– کاڵ گوتی: من هەرگیز نەمدەزانی قۆزم، پێموانەبوو پیاویش دەشێ جوانبێت هەتا ڕۆژێکیان لەمشارەدا کەسێك بەمنی گوت تۆجوانی.

– کلیۆپاترا پرسی: ئەوکەسەی بەتۆی گوت جوانی کێبوو؟

– کاڵ گوتی: ئەوە کارەکەرێك بوو؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا دوای ئەوەی بەتۆی گوت جوانی، هیچ داواکاریەکی لەتۆنەکرد؟

– کاڵ گوتی: نەخێر ئەی خاتوونی گەورەی من؛ چونکە ئەودەیزانی هەرکاتێك هەر خواساتێك لەمن داوا بکات، سەرناگرێت.

– کلیۆپاترا گوتی: ئافەرین بۆ تۆ کاڵ، بزانە جوانی بریتییە لەگەورەترین سامان کەخواکان بەکەسێکی دەبەخشن وئەوکەسەی جوانە، پێویستە ڕێزی ئەوجوانییە بگرێت و ئەوبەڕێبواران نەدات، لەدەستدانی ئەم سەروەتەش ئەوەیە کەهەرژنێك داخوازیەکی لێکردی قەبوڵی بکەیت، پێویستە تەنها داواکاری ژنێك قبوڵ بکەی کەلەڕووی جوانییەوە لەناو ژیاندا بەئاستی تۆبگات- یان ئەوەتا لەڕووی پلەوپایەوە لەهەموو ژنان گەورەتربێت.

– کاڵ گوتی: ئەی خاتوونی گەورەم، ئەگەر ژنێك پەیدابێت هەم لەڕووی جوانی وهەم لەڕووی پلەوپایەوە لەهەموو ژنان باشتربێت، بۆ ئەمەیان دەڵێ‌ی چی؟ ئایا دەبێ داخوازیەکەی قبوڵ بکرێت- یان نا؟

من کلیۆپاتراو کاڵم لێوەدیار نەبوون، چونکە هەردووکیان لەبەشێکی ژوورەکەدابوون کەلەمنەوە دیارنەبوو، بەڵام بەپێکەنینەکەی کلیۆپاترایدا دەمزانی قسەی ئەوکوڕە گەنجە کاری تێکردووە، دواتر لەوژوورەدا گوێم لەجۆرە قسەکردنێك بوو کەهەردوو گوێکانی خۆم گرتن بۆئەوەی گوێبیستنی گفتوگۆی ئەو دووانە نەبم، دوای ئەو ڕۆژە کاڵ بۆبینینی کلیۆپاترا دەهات بۆکۆشکی پاشایەتی.

پێویستە ئەوەش بڵێم، کلیۆپاترا کاتێ بوو بەفەرماندەی لەشکری ئەسکەندەر، تەنها وەك فەرماندەی فەخری وابوو.

هەندێ ڕۆژ هەندێك لەئەفسەرانی ئەو لەشکرەش دەهاتن بۆلای کلیۆپاترا، ئەو ئەفسەرانە- یان لەلایەن (لگات)ەوە کەلێپرسراوی واقیعی ئەو لەشکرەبوو، دەنێردران بۆلای کلیۆپاترا- یان لەلایەن شاژنی میسرەوە داوایان دەکرا بێن، لەبەرئەوە هاتنی یەك ئەفسەر بەپلەی سەرتیپ، بۆکۆشکی پاشایەتی شتێکی ئاسایی بوو وکەسیش بەلایەوە سەیرنەبوو.

ئەمە جگەلەوەی هەموویان دەیانزانی کاڵ لەلایەن شاژنەوە بەرپرسیارێتی ئەوەی خراوەتەئەستۆ کەسەربازەکان مەشقدادەدات وفێری ڕێ ڕۆیشتنی سەربازیان بکات، تەنها من دەمزانی کاڵ بۆکۆشکی پاشایەتی وچوونی بۆسەرای کلیۆپاترا، بەمەبەستی دانی ڕاپۆرت نییە سەبارەت بەپێشکەوتنی سەربازەکان لەمەشقەکانیاندا.

دوای چەند مانگێك بەم شێوەیە، کلیۆپاترا سکپڕبوو وکوڕێکی بوو، هەموو وایاندەزانی ئەو کۆرپەلەیە کوڕی بەتلیمۆسی چواردەهەمە، کاتێ کۆمەڵێك لەخێزانی پاشایەتی میسر لەدەوری ئەو کۆرپەلەیەدا کۆبوونەوە، کلیۆپاترا دەیگوت سەیرکەن دەمی کوڕەکەی من لەدەمی باوکم بەتلیمۆسی سێزدەهەم دەچێت ودەستەکانیشی لەدەستی من دەچێت.

هەموویان باوەڕیان بەوقسانەی کلیۆپاترا دەکرد، چونکە زۆربەی ئەمانە ئاکارو تایبەتمەندییەکانی بەتلیمۆسی سێزدەهەم ودوازدەهەمیان نەدەزانی چۆنبووە، هەروەها کاتێ دایکێك سەبارەت بەشێوەی ئەندامەکانی منداڵەکی لەگەڵ کەسانیتردا قسەدەکات، هەمووکەس دەکەوێتەژێر کاریگەری قسەکانی ئەودایکەو هەموو وادەزانن ڕاستدەکات، چونکە خەڵك پێیوایە دایکێك باشتر لەهەموو کەس منداڵی خۆی دەناسێت وئاگاداری تایبەتمەندییەکانی ئاکاری رۆڵەکەیەتی، دوای ئەوەی کلیۆپاترا کوڕێکی بوو هەموو کرژی وناکۆکییەکی کەلەنێوان بەتلیمۆسی چواردەهەم وئەودابوو نەما، چونکە براکەی یەقینی تەواوی وابوو ئەومنداڵەی کلیۆپاترا بوویەتی، لەخوێنی ئەوە، بەلاّم کاڵ دوای لەدایکبوونی ئەومنداڵەش دەهات بۆکۆشکی پاشایەتی، دەیزانی ئەومنداڵە لەخوێنی ئەوە، نەك هی بەتلیمۆسی چواردەهەم.

پاش ماوەیەك ڕۆژێکیان پێشئەوەی کاڵ بگاتە کۆشکی پاشایەتی وبچێتەسەرای کلیۆپاترا، خاتوونەکەی من بانگی کردم وگوتی: شەرمیون ئاگات لێبێت دوای ئەوەی کاڵ هات بۆکۆکشی پاشایەتی، لەگەڵ خۆت بیبە ژوورەکەی خۆتەوەو لەزمان منەوە بەئەو بڵێ ئیترنەیێت بۆکۆشکی پاشایەتی، ئەگەر لەتۆشی پرسی بۆچی ئیتر بۆئێرە نەیەم، بەئەوبڵێ شەوی ڕابردوو براکەم گوتویەتی ئەو ئەفسەرە گەنجە کێیە کەئەوەندە بۆلای تۆدێت؟

من بەپاشام گوت کاڵ مەشقدادەری سەربازەکانی لەشکری ئەسکەندەریەیە کەمن فەرماندەی ئەوم، هەروەها من مەشقدانی سەربازەکانم خستۆتەئەستۆی ئەو، بەشێوەیەك ڕایانبێنێت بەسەری بەرزو هەنگاوی توندو جێگیرەوە بڕۆن، بەلاّم براکەم پێی گوتم: بائەو ڕاهێنەری سەربازەکانی لەشکری تۆشبێت، نابێت ئەوەندەبێت بۆئێر، چونکە دانی ڕاپۆرتی مەشقی سەربازی دوومانگ جارێك- یان مانگی جارێك دەدرێت، نەك هەموو ڕۆژێ، دواتر لەڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکیتر ئەوپێشکەوتنانەی کەڕوودەدەن ئەوەندەنین کەپێویستیان بەگەیاندنبێت بەفەرماندەی لەشکرەکە(60). منیش گوتم: چونکە کاڵ دەزانێت من زۆرحەزدەکەم سەربازانی لەشکرەکەم باشتر بەڕێکادابڕۆن، بۆیە هەموو ڕۆژێك دێت بۆئێرە، تاڕاپۆرت سەبارەت بەمەشق وڕاهێنانی سەربازەکان بەمن ڕابگەیەنێت، براکەم گوتی: ئەوپیاوە نزیکەی ساڵێکە هاتوچۆی کۆشکی پاشایەتی دەکات بۆئەوەی ڕاپۆرت بدات بەتۆ، ئایا لەماوەی ساڵێکدا نەیتوانیوە سەربازەکانی تۆ فێری ڕێوڕۆیشتنی سەربازی بکات؟

ئەم قسانە ئەوە دەگەیەنن براکەم لەکاڵ کەوتۆتە گومان، لەبەرئەمە بەئەوبڵێ ئیتر نەیەت بۆکۆشکی پاشایەتی، بەلاّم بۆخۆم وەك سەرپەرشتیاری لەشکرەکە دێم بۆسەربازخانەی دەمەنهوور، ئەولەوێ ئەبینم وپێی دەڵێم ئیتر لەکوێدا یەکتری ببینن.

ڕاستییەکەی ئەوەبوو کاڵ مەشقدادانی سەربازەکانی تەواوکردبوو وئەوانە دەیانتوانی بەباشی ڕۆیشتنی سەربازی بڕۆن وخودی کاڵیش نەدەچوو بۆسەربازگەی دەمنهوور وهەمیشە لەئەسکەندەریەدابوو، بۆئەوەی نزیکبێت لەکلیۆپاتراو بیبینێت، ئەگەر کاڵ لەسەربازگەی دەمەنهووردا مابایەوە، نەیدەتوانی ماوەماوەی کورت کلیۆپاترا ببینێت، هەتا ئەگەر بەعەرەبانەی ئەسپیش بهاتبا.

60- هەر کلیۆپاترا دەدوێت ومەسەلەکە بۆشەرمیون باسدەکات، منیش واتە کلیۆپاترا.(و- کوردی)

من ئەوڕۆژە لەوشوێنەدا وەستام كەهەمیشە كاڵ بەوێدادەهات بۆلای كلیۆپاترا، ئەوئەفسەرە گەنجە لەكاتێكی دیاریكراودا هات و وەك هەموو جارەكانیتر بەسەری بەرزو هەنگاوی توندەوە دەڕۆیی، بەشێوەیەك هەتا منیشی نەبینی، منیش خۆم گەیاندێ، كاڵ كەسەرەتا لەبینینی لەپڕی من كەمێ سەرسامبوو وگوتی: شەرمیون ئەوەتۆی ....؟ وەك ئەوەوایە ئیشێكت بەمن بێت؟ بەڵێ ئیشم بەتۆیە ودەمەوێت لەگەڵ تۆدا قسەبكەم، وەرە بۆ ژوورەكەی من، تالەگەڵتدا قسەبكەم، من جگەلەو ژوورەی كەلە تەنیشت ژوورەكەی كلیۆپاترادابوو وشەوانە لەوێدا دەخەوتم، ژوورێكی تریشم هەبوو لەبەشی دەرەوەی سەراكەی كلیۆپاتراداو دەمتوانی لەوكاتانەی كەشاژن ئیشی بەمن نەدەبوو، لەوێدابم.

– كاڵ گوتی: پێویستە من ئێستا بچم بۆلای شاژن وگوزارشتی سەربازی پێبدەم ودوایی دێمەوە بۆلای تۆ تاگوێت لێبگرم.

– گوتم ئەوەی كەمن دەمەوێت بەتۆی بڵێم، پەیوەندی بەشاژنەوە هەیەو فەرمانی بەمنداوە پەیامێكی خۆی بەتۆ بگەیەنم.

– كاڵ گوتی: ئایا بەتۆی گوتووە پێشئەوەی بچم بۆلای ئەو پەیامەی ئەوم پێبڵێیت؟

– گوتم: بەڵێ.

– كاڵیش گوتی: گەروابێ ئامادەی گوێگرتنم.

– من كاڵم برد بۆئەو ژوورەی خۆم كەلەبەشی دەرەوەی كۆشكی كلیۆپاترادابوو ولەوێدا پێم گوت: ئەوقسەیەی كلیۆپاترا بەمنی گوتووە بەتۆی بڵێم، ئەوەیە تۆئیتر نابێ بێیت بۆكۆشكی پاشایەتی.

– كاڵ دوای ئەوەی گوێی لەم قسەیەبوو ڕاچڵەكی وپرسی لەبەرچی نابێ بێم بۆكۆشكی پاشایەتی؟

– گوتم: چونكە براكەی كلیۆپاترا لەتۆ كەوتۆتە گومان وپێی وایە هاتنت بۆكۆشكی پاشایەتی وبۆ هێنانی ڕاپۆرتی سەربازی نییە، بەڵكو هۆكاریتری هەن.

– كاڵ بێدەنگبوو ومنیش لێم پرسی: بۆ چ كەوتییە بیركردنەوە؟

– گوتی: بیستنی ئەم هەواڵەبوو بەهۆی غەمگینی من.

– گوتم: دیارە كلیۆپاترات خۆشدەوێت، ئەگەر ئەوت خۆشنەویستبا ئەوا بەبیستنی ئەمە دڵگران نەدەبووی.

– كاڵ گوتی: من لەوەغەمگین نیم نەتوانم كلیۆپاترا لەكۆشكی پاشایەتیدا ببینم، چونكە دەزانم كەكاتێ هات بۆسەرپەرشتیاری وسەردانی لەشكرەكە، دەتوانم لەوێدابیبینم.

– لێم پرسی ئەی شاژنی میسر بۆچی غەمباریت؟

– كاڵ گوتی: بۆئەوە غەمبارم، ئەگەر نەتوانم بێم بۆكۆشكی پاشایەتی، ئەوالەبینینی بوونەوەرێكی زۆر ئازیز بێبەشدەبم.

– پرسیم: ئەو بوونەوەرە كێیە؟

– لەوەڵامدا گوتی: ئەو بوونەوەرە ئازیزە منداڵی كلیۆپاترایە.

– گوتم: ئایا منداڵی كلیۆپاترا ئەوەندەلای تۆ ئازیزە كەئەو نەبینیت هەراسان ببی؟

– كاڵ گوتی: بەڵێ چونكە لەیەكەم ڕۆژی لەدایكبوونی ئەومنداڵە، وەك ڕۆڵەی خۆم سەیرم كردووە.

– گوتم کاڵ: ئایا دەزانیت تائەو منداڵە گەورەتردەبێت، شێوەی زیاتر دەچێتەوە سەرتۆ؟

– کاڵ گوتی: دیارە هۆکەی ئەوەیە کاتێ کلیۆپاترا سکپڕبوو ئێمەی زۆر دەبینی، هەر لەبەرئەوەشە ئەوکوڕەی کەلەسکی دابوو شێوەی هاتەوەسەر من.

– گوتم: ئەو لێکچوونە یەك لێکچوونی لاوەکی نییە، بەڵکو ئەو لێکچوونە ئەوەنیشاندەدات تۆباوکی ئەو کوڕەیت.

– کاڵ گوتی: شەرمیون تۆ ڕاستدەکەیت، من باوکی ئەومنداڵەم، بەڵام نامەوێت خەڵکانیتر ئەمەبزانن.

– گوتم: لەوانەیە شای میسر هەستی بەولێکچوونەی نێوان تۆ وئەو کوڕەیە کردبێت، لەبەرئەوەش بۆتەڕێگر لەهاتنی تۆ بۆکۆشکی پاشایەتی.

– کاڵ وتی: من پێموانییە بەوشێوەیەبێت، چونکە کلیۆپاترا ژنێکە درۆ لەگەڵ منداناکات، ئەگەر لەیەکچوونی نێوان من وئەو منداڵە دەترسێت، بۆخۆی ئەم مەسەلەیەی بەمن دەگوت، بەڵام ئەو بەمنی نەگوتووە کەلێکچوونی ئەومنداڵە لەمن کێشە بۆئەو دروستدەکات، بۆیە ئەوەی شازنی میسر تۆی ڕاسپاردووە بەمن بڵێی نەیەمەوە کۆشکی پاشایەتی، هەمان ئەوگومانەی براکەیەتی، بۆیەش ئیتر من نایەمەوە ئێرە، بەڵام زۆر حەزدەکەم ڕۆڵەکەی خۆم ببینم.

– پاش کەمێ بیرکردنەوە کاڵ گوتی: من دیتوومە هەندێکجار ئەومنداڵە وەتۆدەدەن، ئایا دەتوانیت هەندێ ڕۆژ ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتی بهێنیتە دەرێ تامن بتوانم ئەوببینم؟

– گوتم: من سەربەخۆ ناتوانم ئەم کارەبکەم، چونکە ئەومنداڵە جێگرەوەی پاشای میسرەو ڕۆژێك دەبێتە (بەتلیموسی پازدەهەم) ئەومنداڵەی کەجێنشینی پاشای میسربێت لەکۆشکی پاشایەتی ناهێندرێتەدەر، بۆئەوەی تۆ ئەوببینیت، ئەگەر مۆڵەت وەرنەگیردرێت ئەوامن ناتوانم ئەمکارەبکەم.

– کاڵ گوتی: شەرمیون ئایا لەبیرت ماوە، چیت بەمن گوت؟

– وەڵامم دایەوەو گوتم: بەڵێ دەزانم چیم بەتۆ گوت، وەڵامەکانی تۆشم هەرلەبیرمان.

– کاڵ گوتی: من ئامادەم لێرەودوا سەبارەت بەداخوازییەکەی تۆ وەڵامێکیتر بدەمەوە، کەتۆ لەمن دڵنیگەران وتوڕەنەکات، ئایا حەزدەکەیت پەنجەکانی خۆت لەسەر لێوەکانی من دابنێیت؟ ئایا دەتەوێت لەپی دەستت لەسینگی من نزیکبکەیتەوە.

– گوتم بەڵێ کاڵ: من زۆ رحەزدەکەم پەنجەکانم بخەمەسەر لێوەکانی تۆ.

– کاڵ گوتی: پەنجەکانت بێنەو بیخەسەر لێوەکانی من.

– منیش لەئەو نزیکبوومەوە، پەنجەکانم خستەسەر لێوی ئەوکوڕە گەنجە، دواتر لەپیدەستم خستەسەر سینگی ئەو و لەم دیوی سینگییەوە بۆئەو دیوی سینگی دەستم دەگێڕا.

– کاڵ گوتی: شەرمیون ئەگەر تۆ داواکارییەکەی من قبوڵ بکەیت، لەمەزیاتر کەڵك لەمن وەردەگریت، ئەوخواستەی لەتۆی داوادەکەم، داواکارییەك نییە نەکرێت ، تۆکارەکەری بڕواپێکراوی شازنی وئەو منداڵەکەی خۆی بەتۆ دەسپێرێت، تۆش دەتوانیت لەگەڵ ئەومنداڵەدا لەکۆشکی پاشایەتی بێیتە دەرێ تامن ئەومنداڵە ببینم، هیچ کەس نازانێت ئەومنداڵەی لەباوەشتایە بەوەی لەکۆشکی پاشایەتی دێیتەدەرێ ئەومنداڵە جێنشینی پاشای میسرە، چونکە لەکۆشکی پاشایەتیدا منداڵی ساوازۆرن ولێکیشدەچن.

– لێم پرسی: ئەگەر زانیان منداڵەکەم بردۆتە دەرەوەی کۆشکی پاشایەتی، چی وەڵامیان بدەمەوە؟

– گوتی: کاتێ تۆ جێنشینی پاشای میسرت بەساغ وسەلامەتی گێڕایەوە کۆشکی پاشایەتی، کەس لێپرسینەوە لەگەڵ تۆدا ناکات بەوەی بۆچی ئەومنداڵەت لەکۆشکی پاشایەتی بردۆتەدەرێ.

– گوتم: ئەی ئەگەر پێشهاتێك ڕوویدا چۆن؟

– کاڵ گوتی: سەبارەت بەمنداڵێك هیچ پێشهات ڕونادات.

– گوتم: ئەگەر ئەومنداڵێکی سادەبێت ئەواتوشی هیچ نابێت، بەڵام ئەم منداڵە ڕۆڵەی کلیۆپاتراو بەتلیمۆسی چواردەهەمی میسرو جێنشینی پاشایە، منداڵێکی ئاوا دوورنییە دوژمنی هەبن.

– کاڵ گوتی: ئەو منداڵی کلیۆپاترایە، بەڵام هی بەتلیمۆسی چواردەهەم نییە، بەڵکو منداڵی منەو بۆیە پێمخۆشە کەئەو منداڵە ڕۆژ بەڕۆژ ببینم، ئەوە ئەگەر تۆ بەمن بڵێیت لەچ ڕۆژێکدا ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتی دەهێنیتەدەرو من دەتوانم لەباوەشی خۆمی بگرم.

– گوتم کاڵ: تۆ یەك کاری گەورەو مەترسیدار بەمن دەسپێری.

– کاڵ گوتی: ئایا تۆ لەوەدەترسیت لەلایەن منەوە مەترسییەك توشی ئەومنداڵەبێت.

– گوتم : نا، تۆباوکی ئەو منداڵەیت ولەلای تۆوە ئەومنداڵە توشی هیچ نابێت وبەبێ دوودڵی تۆ منداڵی خۆت خۆشدەوێت، بەڵام کەسانێتر کەبزانن ئەومنداڵەی لەکۆشکی پاشایەتی دێتەدەرێ تەنهایەو تەنها ژنێکی لەگەڵدایە، لەوانەیە هەوڵبدەن ئەومنداڵە بڕفێنن– یان بیکوژن.

– کاڵ گوتی: بۆخۆم باشترین پارێزەری ئەومنداڵەدەبم هەرکاتێك لەگەڵ تۆ ومنداڵەکەدابم، هیچ کەسێك غیرەت ناکات لەومنداڵە نزیکبێتەوەو ئەوبڕفێنێ– یان بیکوژێت.

– گوتم: ئەی ئەوکاتەی تۆ لەوێ نیت، من چۆن پارێزگاری لەومنداڵە بکەم؟ چونکە کاتێ من لەکۆشکی پاشایەتیدا دێمەدەرێ دەبێ بەتەنیا بگەڕێمەوە کۆشکی پاشایەتی، باوەڕبکە تۆ ناتوانیت لەنزیك کۆشکی پاشایەتیدا چاوەڕوانی ئەومنداڵە بکەیت، چونکە تۆ دەبینن، هەروەها لەکاتی گەڕانەوەشدا ناتوانیت تادەروازەی کۆشکی پاشایەتی لەگەڵ مندابێیت، چونکە دووبارە تۆدەبینن لەبەرئەوەی کەپاشای میسر سەبارەت بەتۆ بەدگومانی هەیە، ئەگەر ببینێ تۆ ومن لەگەڵ منداڵەکەدا نزیکی کۆشکی پاشایەتی دەبینەوە، بارێکی دیژوار بۆمن دێتەپێش خۆئەگەر پاشای میسر من سزانەدات ئەوا بەدڵنیاییەوە کلیۆپاترا لێم توڕەدەبێت وتۆش دەزانی سزادانی کارەکەرو نۆکەران لەکۆشکی پاشایەتیدا چەندە ترسناکە.

من نەدەبوایە داواکارییەکەی کاڵم قبوڵکردبا، بەڵام چون حەزم لەقسەکردن دەکرد لەگەڵ ئەودا، سەرئەنجام داخوازییەکەی ئەوم قبوڵکرد، کلیۆپاترا بەدڵنیاییەوە منداڵەکەی خۆی بەمن دەسپارد بۆئەوەی ژێری بکەم– یان بیخەوێنم– یان لەباغی پاشایەتیدا بیگێڕم، منیش ئەومنداڵەم خۆشدەیست، نەك لەبەرئەوەی ڕۆڵەی کلیۆپاترابوو، بەڵکو لەبەرئەوەی دەمزانی لەخوێنی کاڵە.

–کاڵ دەیگوت: دەبێ هەفتەی دوو ڕۆژ ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتی بێتەدەرێ، بۆئەوەی بیبینێت، بەڵام من ئەوم تێگەیاند لەوەی هێنانەدەری ئەومنداڵە هەفتەی دوو ڕۆژ ناتوانرێت،

پێویستە بەهەفتەی جارێك قەناعەتبێت.

– کاڵ ڕازی بوو وبڕیارابوو هەموو ڕۆژانی شەممان ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتی بهێنمەدەرێ و لەشوێنێك کەکەمێ دووبێت لەکۆشکی پاشایەتی نیشانی کاڵی بدەم، کاتی نیشاندانی منداڵەکە دیاریکرابوو، من بەخۆم وئەو کوڕپەلەیەوە لەکۆشکی پاشایەتی هاتمەدەرێ وبەرەوشوێنی کاڵ کەوتمەڕێ و کاتێ دەگەیشتینەلای کاڵ، منداڵەکەی لەباوەشی خۆی دەگرت وپەنجەی دەخستەسەر لێوەکانی وهەندێ لەگەڵمندا دەدواو دواتر من منداڵەکەم دەگەڕاندەوە کۆشکی پاشایەتی.

کاتێ دەگەڕامەوە کۆشکی پاشایەتی کاڵ دووراودوور لەپشت منەوە دەهات، بەڵام نزیکی دەروازەی کۆشك نەدەبۆوە، تامنی دەگەیاندە بەردەم کۆشکی پاشایەتی، چاودێری دەکردین، من ئەمکارە پڕمەترسییەم بۆ کاڵ جێبەجێدەکرد، چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد، کاڵ ڕازی خۆشەویستیم بۆ دەربڕێت، لەکاتێکا ئەوگەنجە باسی خۆشەویستی لەگەڵ نەدەکردم وحەزی نەدەکرد من بۆماڵەکەی خۆی ببات، ڕۆژێکیان دوای ئەوەی منداڵەکەم لەکۆشکی پاشایەتی هێنایەدەرێ وبردم بۆلای کاڵ، لەئەوم پرسی ئایە ناتەوێت وەڵامی خواستەکەی ئێمە بدەیتەوەو من ببەیت بۆماڵەکەی خۆت.

– کاڵ گوتی: چۆن؟

– گوتم: بۆچی پەیمانی خۆت نابەیتەسەر؟

–.کاڵ وتی: لەبەرئەوەی چاوەڕوانی ئەوەم ئەوخزمەتەی تۆ بۆمنی دەکەیت، تەواویبکەیت ؟

– گوتم: بۆ ئەوخزمەتکردنەی ئێمە تەواونییە؟ ئایا دەزانی هەرجارەی من لەگەڵ ئەومنداڵەدا لەکۆشکی پاشایەتی دێمەدەرێ، چۆنچۆنی ڕووبەڕووی مەترسی دەبمەوە؟

– کاڵ گوتی: منیش هەرجارەی ئەومنداڵە دەبینم، خۆم لەبەرامبەر مەترسییەکی گەورەدا دەبینمەوە.

– گوتم: تۆ باوکی ئەومنداڵەیت، ئەگەر لەپێناو دیتنی ئەودا توشی مەترسیش ببیەوە، شتێکی سروشتییە؟ بەڵام من نەدایك ونەباوکی ئەو منداڵەم، بۆیە قبوڵی ئەومەترسییە دەکەم، هەمووجارێ ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتی بێتەدەرێ تاتۆ لەمن ڕازیبیت.

– کاڵ گوتی: شرمیون پێشنیارێکت بۆدەکەم ئەویش ئەمەیە کەیارمەتیم بدەیت من بتوانم منداڵەکەی خۆم بەردەوام لەلای خۆم بێت، ئەگەرتۆ ئەوهارکاریەم بکەیت، ئەوایەیمان بەتۆ دەدەم هەفتەی یەکجار بتبەم بۆماڵی خۆم، ئیتر تۆش زەحمەتی هێنانی منداڵەکەت لەکۆڵ دەبێتەوەو ئەو ڕۆژانەی منداڵەکەت لەکۆشکی پاشایەتی دەهێنایەدەرێ، واتا ڕۆژانی شەممە ڕاستەوخۆ وەرە ماڵەکەم.

– لێم پرسی: ماڵەکەی تۆ لەکوێیە؟

– کاڵ وتی: ماڵەکەم لەئوتێلی سوردایە.

– گوتم: ئا... ئایا تۆ ئێستاش لەوئوتێلەدا دەژیت؟

– کاڵ گوتی: بەڵی شرمیون.

– گوتم: من ناتوانم بۆبینینی تۆ بێم بۆ ئوتێل سور.

– کاڵ گوتی: ئەی بۆچی ئەوشەوە هاتیت بۆئوتێل سورو منت بینی؟

– گوتم: ئەوشەوەی کەبۆ بینینی تۆهاتم بۆمیوانخانەی سور، ئەوکات لەباروودۆخێکدابووم کەزۆر جیاوازە لەگەڵ ئێستادا، ئەوشەوە من بۆجارێك هاتم بۆئەو میوانخانەیەو ئیتر پێم نەنایەوە ئەوێ، بەڵام

لێرەودوا هەموو ڕۆژی شەممان بێم بۆ میوانخانەی سووورو تۆ لەوێ ببینم، لەوێ دەبمە کەسێکی ناسراو.

– کاڵ گوتی: ئەگەرتۆ نەتوانی بێیت بۆمیوانخانەی سوور، ئەوامن دەتوانم خانوێك بەکرێ بگرم بۆئەوەی لەوێدا تۆببینم.

– گوتم: ئەگەروابێت باشترەو من دەتوانم بەئیسراحەت تۆلەوێ ببینم، ئێستاش پێم بڵێ چ خزمەتێك لەمن داوادەکەیت؟

– گوتی: من داواکارییەکم لەتۆ ئەوەیە شتێك بکەی ئەومنداڵە بۆ هەمیشەیی لای خۆم بمێنێتەوە، ناچارنەبم بەترس ولەرزەوە لێرەدا منداڵەکەم ببینم.

– گوتم: ئایا تۆ مەبەستت ئەوەیە، منداڵەکەت ببەیتەوە ماڵی خۆت ؟ ئایا کاری ئاوا دەگونجێت ؟ ئایا دەتوانم منداڵی شازنی میسر بدەمە تۆ، بۆئەوەی بیبەیتەوە ماڵی خۆت؟ گریمان تۆ دوای وەرگرتنی ئەومنداڵە لەئەسکەندەرییە ڕۆیشتی، من کەناتوانم لەمشارە بڕۆم، توشی سەختترین سزادەبمەوە– یان ئێمە بەزیندویی دەسوتێنن– یان بەخاچمانەوە دەکەن– یان ئەوەتا فڕێماندەدەنە بەردەم شێرە دڕندەکانی باغی ئاژەڵان.

– کاڵ گوتی: من ئەوداوایە لەتۆ ناکەم، چونکە قابیلی جێبەجێکردن نییە، نەتۆ دەتوانیت منداڵی شازنی میسر بەمن بدەیت ونەمنیش دەتوانم ئەومنداڵە لەماڵەکەی خۆم خزمەت بکەم.

– لێم پرسی: ئەی چیتدەوێت ؟

– کاڵ کوتی: ئەگەر کەسانیتر نەزانن، تۆ ئەی شرمیون ئەو ڕاستییە دەزانی ئەومنداڵە لەمنە، نەك لەبەتلیمۆسی چواردەهەمی برای کلیۆپاترا.

– گوتم: ئاگاداری ئەوەم لێکچوونی ئەومنداڵە لەتۆ ئەوەندەدیارە کەهیچ دوودڵییەك قبوڵناکات.

– کاڵ پرسی: ئایا منداڵێك زیاتر پەیوەندی بەدایکییەوە هەیە– یان باوکی؟

– گوتم: شتێکی بەڵگە نەویستە پەیوەندی زیاتری بەباوکییەوە هەیە.

– کاڵ گوتی: کەواتە ئەگەر من ئەومنداڵە ببەم بۆماڵی خۆم، ئەواشتێکی ناکۆکم لەگەڵ قانوندا نەکردووە.

– گوتم کاڵ: ئەگەرتۆ ئەمکارە بکەیت، ئەواشتێکی دژی هەقت نەکردووە، بەڵام ئەوکارەی تۆ دژی قانونە، چونکە قانون پاشای میسر بەباوکی ئەومنداڵە دەزانێت، نەك تۆ.

– کاڵ گوتی: منیش بۆئەوەی بتوانم ڕۆڵەی خۆم دەستکەوێتەوەو بیبەمەوە ماڵەکەی خۆم وچیتر ناچارنەبم وەك دزان منداڵەکەم ببینم، قانون فریودەدەم.

لێم پرسی: چۆن قانون فریودەدەیت؟

– کاڵ گوتی: دەزانم ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتیدا دایانی هەیەو لەمەمکی ئەودایانەی شیر دەخوات، نەك لەمەمکی کلیۆپاترا.

– گوتم: بەڵێ وایە.

- کاڵ گوتی: کلیۆپاترا کەمتر منداڵەکەی خۆی دەبینێت و ئەولەباوەشی خۆیدا نایخەوێنێت، ئەم منداڵە چونکە لەتەك دایانەکەی خۆیدا دەخەوێت هۆگری ئەوبووەو کەمتر هۆگری دایکییەتی، لەبەرئەوە ئەگەرئێمە ئەومنداڵە لەگەڵ منداڵێکیتردا بگۆڕین، کلیۆپاترا نازانێت کەمنداڵەکەیان لێگۆڕیوە.

- گوتم کاڵ: تۆقسەی سەیردەکەیت، چۆن دەتوانرێت ئەومنداڵە بەمنداڵێکیتر بگۆردرێت؟

- کاڵ وتی: ئەمکارە ئاسانە، ڕۆژنییە ئاوی نیل چەند منداڵێك کەهەندێك لەمانە زیندون نەهێنێت، من یەکێك لەومنداڵانە لەئاوی نیدا دەگرمەوەو دەیهێنم بۆئێرەو جلوبەرگی منداڵەکەی خۆمی لەبەردەکەم وتۆش ئەومنداڵە دەبەیت بۆکۆشکی پاشایەتی، منیش منداڵەکەی خۆم لەگەڵ خۆمدا بۆ ماڵەکەم دەبەمەوە.

- گوتم: ئەگەر هیچ کەس نەزانێت، ئەوادایانەکەی هەستی پێدەکات، تۆ لەکوێ دەتوانیت منداڵێك پەیدابکەیت کەلەڕووی شێوەو ئاکارو تەمەن لەم منداڵەبچێت ودایانەکەیی ودایکی وخەڵکیتر فریوبخۆن؟

- کاڵ گوتی: بەڵێنت پێدەدەم ئەومنداڵانەی کەڕووباری نیل دەیانهێنێت، کوڕێەیەکی کوڕی وایەیدادەکەم کەلەکوڕەکەی من بچێت، دوای ئەوی ئەومنداڵەم دەستکەوت، ئەم منداڵەی خۆم دەبەم بۆماڵێ وبەشیری مانگا گەورەی دەکەم.

- گوتم: ماڵی تۆ سەربازخانەی دەمەنهورەو ئەو ڕۆژانەی کەدەشهێت بۆنەسکەندەریە لەمیوانخانەی سوردا بەسەری دەبەیت، لەهیچ یەك لەودوو شوێنانەدا ناتوانرێت ئاگاداری منداڵێکی شیرەخۆرە بکرێت، چاودێریکردن وبەخێوکردنی منداڵێکی شیرەخۆرە ئیشی ژنە، نەك ئیشی تۆ کەپیاویت.

- کاڵ کوتی: من بۆ ئەوەی بتوانم ئاگاداری ئەومنداڵە بکەم، یەك خانوون بەکرێ دەگرم وتۆش لەوماڵەدا لەلای من دەمێنیتەوە، ئەگەر تۆ ئەوهاوکاریەم بکەیت لەئایندەدا دەبیت بەخوشکی(61) من

61- دەبیت بەخوشکی من، مەبەستی لەوەیە دەبێت بەهاوسەری. (و- کوردی)

- بەکاڵم گوت: ماوەیەکم پێبدە تابیر لەگۆڕینی منداڵەکە بکەمەوەو لێکی بدەمەوە داخوا دەتوانرێت ئەومنداڵە بگۆڕدرێت، چونکە پێویستە هەندێ قسە لەگەڵ دایانی ئەومنداڵەدا بکەم ولەقسەکانییەوە تێبگەم داخوا دوای ئەوەی منداڵەکە گۆڕدرا دەتوانرێت هەستی پێبکات- یان نا؟ ئایا دەتوانرێت ڕەنگی چاوی منداڵەکە بزانێت چۆنە؟ ئایا دەتوانێت هەستی پێبکات ڕەنگی مووی منداڵەکە چۆنە؟ ئایا شێوەی دەست وپێی منداڵەکە دەناسێتەوەو دەزانێ چۆنە؟ ئەگەر ئەم شتانە بزانێت گۆڕینی ئەومنداڵە شتێکی مەترسیدارەو دایانەکەی دەزانێت وبەکلیۆپاترا دەڵێت منداڵەکەیان گۆڕیوە، من ئەوەندەی لەدایانی منداڵەکە دەترسام ئەوەندە مترس لەکلیۆپاترا نەبوو، چونکە دەمزانی شاژنی میسر شەو ڕۆژ خەریکی منداڵەکەی نییە تائەو بەباشی بناسێتەوەو هەست بەوگۆڕینە بکات کەبەسەر ئەومنداڵەدادێت، بەهۆی گەورەبوونییەوە.

من نیشانەکانی ئەومنداڵەم دەزانین، ڕۆژی دوایی کەمنداڵەکە خەوتبوو، لەگەڵ دایانەکەیدا کەوتمە گفتوگۆکردن، لەگەڵ قسەکانماندا بەئەوم گوت: چاوەکانی کوڕەکەی کلیۆپاترا وەك چاوی دایکی جوان ورەنگ هەنگوینین، دایانەکە قسەی منی بەڕاستزانی وگوتی وایە، منیش لەمە زۆر سەرم سوڕما،

چونکە چاوی کوڕەکەی کلیۆپاترا ڕەشبوون، نەك هەنگوینی، هەردوو چاوی کلیۆپاتراو خوشکەکەی ئەرسینۆهە هەنگوینی بوون بەکەمێ جیاوازی لەکاڵی وتۆخیدا، بەڵام چاوی کوڕەکەی کلیۆپاترا لەڕەنگی چاوی کاڵ دەچوو، کاتێ زانیم ئەودایانەی کەشیردەدات بەومنداڵە نازانێت ڕەنگی چاوی چۆنن، لەوەگەیشتم هەرکاتێك ئەومنداڵە بگۆڕدرێت هەستی پێناکات، چونکە دایانێك بەوئاستە دەبەنگبێت ڕەنگی چاوی ئەومنداڵەی کەشیری دەداتێ نەزانێت، ئاگای لەتایبەتمەندی و نیشانەکانی تری بەدەنی ئەومنداڵە نابێت.

## سەرهەڵدانی کێشەیەکی تازەو
## ئەو ڕێگاچارەی کەکلیۆپاترا پێشنیاری دەکات.

ڕۆژی دواتر دەمویست کلیۆپاترا بەهەمان شت تاقی بکەمەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە لەبەردەم کۆشکی پاشایەتیدا خۆپیشاندان وژاوەژاوێکی زۆر دروستبوو کەبەشێوەیەکی کاتی مەسەلەی منداڵەکەم لەبیرچۆوە.

من وامزانی جارێکیتر ڕەشپێستەکان هێرشیان هێناوەتەوە بۆئەوەی مەترسی بخەنەوەسەر ئەسکەندەریە، بەڵام دواتر ڕوونبۆوە ئەوکەسانەی کەلەبەردەم کۆشکی پاشایەتیدا کۆبوونەوەو هاتوهاوار دەکەن، ژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتین، بەتلیمۆسی چواردەهەم براومێردی کلیۆپاترا، چەند کەسێکی نارد بۆئەوەی بزانن ئەوانە بۆچی لەبەردەم کۆشکی پاشایەتیدا کۆبوونەوەو هاواردەکەن، ئەوانە چوون ودوای ئەوەی گەڕانەوە بەپاشای میسرو کلیۆپاترایان، گوت: سکاڵای ئەوژنانە ئەوەیە بڕیاری کۆشکی پاشایەتی سەبارەت بەوەی ئەمان لەسزادان پارێزراون، ئەوانە لەگەڵ ئەوبڕیارەدا حسابکراون کەقانون ناتوانێت سزایانبدات، ئەمە پێشێلکراوەو لێرسراوی پۆلیس یەکێك لەوژنانەی گرتووە کەپیاوێکی کوشتووە، ئەو ڕووداوە بەگوێرەی ئەوقسانەی لەکۆشکدا باسدەکرا، ئەوەبوو شەوی ڕابردوو، لەنێوان یەکێك لەوژنانەن پیاوێکی سوریدا کەبۆ ڕابواردن چووەبۆ ئەوماڵە، کێشەیەك دروستدەبێت وئەوەش وەك هەموو کێشەکانی تری ڕابردوو بەهۆی سەرخۆشی هەردوولاوە ڕوویداوە، ئەوژنە لەتوڕەیی خۆی وسەرخۆشیدا، چەقۆیەك کەبۆ پاککردنی میوە لەبەردەستی دابووە، لەورگی ئەوپیاوەی ڕۆکردووەو ورگی لەم دیواودیوەوە هەڵدڕیوەو پیاوەکەش هاوارێکی کردووەو کەوتۆتەسەر زەوی وپاش کەمێ مردووە، کاتێ لێپرسراوی پۆلیس ئەوڕووداوەی زانیوە، ئەوژنەی دەستگیرکردووەو بردویەتی بۆزیندان، بۆئەوەی چاوەڕێی یاسابکات داخوا چ سزایەکی بۆدادەنێت، ژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتیش چوونەلای لێپرسراوی پۆلیس وگوتویانە دەبێ ئەو ژنە بەربدەیت، بەڵام ناوبراو پێی گوتوون ئەوژنە بکوژەو پێویستە لەزینداندا بمێنێتەوە تاسزای خۆی وەربگرێت، ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتیش کاتێ زانیویانە ناتوانن یاریدەی هاوکارەکەی خۆیان بکەن وئازادی بکەن ڕێگای کۆشکی پاشایەتیان گرتۆتەبەر.

– بەتلیمۆسی چواردەهەم کاتێ گوێبیستی سکاڵاو داواکاری ئەوژنانەبوو، بەکلیۆپاترای گوت: چی بکەین باشە؟

– کلیۆپاترا گوتی: لەسەردەمی پاشایەتی باوکمدا، دەنگ بۆیاسایەك درا کەبریتیبوو لەوەی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بەبەشێك لەدەستەو کرێکارانی کۆشکی پاشایەتی حسابدەکرێن ولەڕووی یاساییەوە پارێزراودەبن، ئەگەر تاوانێك بکەن ناتوانرێت لەئەوانە بکۆڵدرێتەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵدابکرێت، تەنها بەڕەزامەندی پاشا نەبێت.

– پاشای میسر گوتی: ئەم قانونە بەتەواوی پشتگیری لەژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی دەکات.
– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ ئەی پاشا، ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بەڕەزامەندی تۆدەخرێنەژێر لێکۆڵینەوە.
– پاشا گوتی: ئەو ژنەی ئێستا گیراوە پیاوکوژەو ئەگەر من فەرمان دەرکەم ئازادی بکەن، واتا فەرمانی ئازادکردنی یەك مرۆڤ کوژم دەرکرد، بەمەش دادپەروەری نامێنێت، بۆیە ڕازیم سزای ئەوژنە بدرێت، تاکو دادپەروەری ڕەوشی خۆی وەربگرێت.
– کلیۆپاترا گوتی: ئەمکارە نەکەیت، چونکە دەبێتەهۆی تورەبوونی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی.
– پاشا گوتی: ناتوانم بۆئەوەی نەبمەجێگای تورەیی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی، بەڕێوەبردنی دادپەروەری لەپایتەختەکەی خۆمدا چاوپۆشی لێبکەم.
– دەست وپێوەندەکانی کۆشکی پاشایەتی فەرمانی پاشایان وەرگرت ولەکۆشکی پاشایەتی چوونەدەرێ و بەوژنانەیان گوت: قانونی پاراستنی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی ئێوەش دەگرێتەوە، کەسزا بدرێن کاتێ تاوانێکتانکرد، چونکە لەوقانونەدا هاتووە، تاوانبار بەبڕیاری پاشا سزادەدرێت، ئێستاش پاشا ڕازیبووە ئەوژنە پیاو کوژە سزابدرێت، بۆیە واباشە ئێوە لەمە زیاتر لێرە بێکار نەوەستن وبگەڕێنەوەماڵەکانی خۆتان وئەوژنە تاوانبارەش لەسێدارە دەدرێت، ئەوژنانە بێئەوی ناڕەزایی دەربڕن وهاواربکەن، ڕۆیشتن وبەری دەروازەی کۆشکی پاشایەتیان چۆڵکرد، دوای گەڕانەوەی ئەوژنانە لەبەردەم دەروازەی کۆشکی پاشایەتی بۆماڵی خۆیان، دەستیان لەئیشکردن[62] هەڵگرت وشوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریە کەوتە حاڵەتی وەستان.
– لەکۆشکی پاشایەتیدا، کلیۆپاترا ماوەیەکبوو سەرگەرمی تازەی پەیداکردبوو وکاتەکانی خۆی بەخوێندنەوەی کتێبی یۆنانی وڕۆمی بەسەردەبرد، پێش هەمووان لەوەستانی ئیشی شوێنی ڕابواردنی گشتی ئاگاداربۆوە، بەڵام لەوکاتەدا ئەوەی بەجددی وەرنەگرت وگوتی: شرمیون دەبێ ئەم کێشەیە بەزوویی چارەسەردەکرێت.
من لەمەوبەر گوتم کلیۆپاترا ژنێکی بەهۆش و وردبین وبەئیرادەو پڕتوانایە، ئەو حەزیدەکرد ئاگاداری هەموو کاروبارەکانی دەوڵەتبێت، دەستی لەهەموو ئیش وکارەکان وەردەدا، کلیۆپاترا دوای لەدایکبوونی کورەکەی زۆربەی کاتەکانی لەتەك براکەی بەتلیمۆسی چواردەهەمدا بەسەردەبرد، بەوشێوەیە وەك شاژنی میسر ئاگاداری هەموو ئەوشتانەبوو کەلەوڵاتدا ڕوویاندەدا.

[62]- دەستیان لەئیشکردن هەڵگرت، واتا لەگەڵ ئەوپیاوانەی کەدەهاتن بۆڕابواردن، ڕایان نەدەبوارد (و- کوردی)

لەکاتی پێویستدا دەستپێشخەری دەکرد، من لێنیابوم ئەم کێشە تازەیەش بەدانانی تەگبیرورای کلیۆپاترا چارەسەر دەکرێت.
وەستانی ئیشی شوێنی ڕابواردنی گشتی کاری کردەسەر ئابووری ئەسکەندەریە، دیارە من پێشتر باسی ئەوەمکرد لەهەموو وڵاتانەوە بۆ ڕابواردن دەهاتن بۆئەسکەندەریە، هەرکەسێك ویستبای

خۆشگوزەرانی بکات وڕابوێرێت، ئەوارێگای شوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریەی دەگرتەبەر، چونکە ئەوشوێنە گەورەترین جێگای ڕابواردنبوو لەدنیادا، لەهیچ شوێنێکیتری دنیادا ئەوتاترۆیانەی لەشوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریەبوون، نەیاندەتوانی ئاوا ئارام وئاسایش بژین، ئەوگەشتییە نەفەر هەڵگرانەی کەلەولاتانی ترەوە بۆئەسکەندەریە دەهاتن، بۆئەوەی ڕابوێرن، لەناو شوێنەکانی تری شاریشدا وەك شوێنی ڕابواردنی گشتی، ئازادی تەواویان هەبوو وکەس نەیدەتوانی ئازاریانبدات وزێڕو زیوی ئەوانە ببات، زۆر لەئەوانەی دەچوون بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریە، زێڕو زیوی خۆیان لەدەستدەداو هەژاردەبوون و دواتر خۆیان دەکوشت، بەلام ژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریە زێڕو زیوی خۆیان لەبانك دادەناو ئاسودە دەبوون لەوەی لێیان نادزرێت.

مـن بیـستومە لـەولاتانی تـریش شـوێنی ڕابـواردنی گـشتی هەیـە، بـەلام ئەوجێگایـە بۆتەشـوێنی دزوجەردەکان وکۆمەڵێ دزو باخەڵبڕ لەوشوێنانەدا، خۆیان بۆبڕینی باخەڵی خەڵك مەڵاسداوە- تەنانەت بـۆ کوشتنیـشیان بۆئـەوەی پـارەو زێـڕو زیـوی ئەوانـە ببـەن، بـەلام لەشـوێنی ڕابـواردنی گـشتی ئەسـکەندەریەدا، هـەموو گەشـتیارانی بیـانی وخـەڵکی نـاوخۆش کەدەچـوون بـۆ ئەوشـوێنە ئاسایش وزەمانەتیان هەبوو، ئەگەر لەوێ پارەشیان لێبدزرایا دەچوون لەسەرۆکی پۆلیسی شاریان دەستاندەوەو دەیاندایەوە ئەوکەسەی کەدزی لێکرابوو، چونکە پاشای میسر دەیگوت ئەگەر لێپرسراوی پۆلیس و پۆلیسەکان ئـەرکی خۆیـان بەباشی جێبەجێبکـەن، ئـەوا دز ناتوانێـت پـارەی بیانیـەك- یـان کەسـێکی مولکی ببات.

من لەسەرەتای بەسەرەهاتی خۆمدا گوتم شوێنی ڕابواردنی گشتی هەندێ خەڵکی موشەخۆری مل ئەستوری لێبوون، بەلام ئەمانە هەرگیز ڕامالی موشتەرییەکانی ئەوشوێنەیان نەدەکرد، بەڵکو بەرامبەر بەئەنجامدانی هەندێ کاروئیشی بچوك بەخشیشیان لەوانە[63] وەردەگرت، هەرکەسێك کەدەهاتە شوێنی ڕابواردنی گشتی، ئەوەی دەزانی ئەگەر پارە خەرجبکات ئەوا هەموو خۆشی ولەزەتێکی دەستدەکەوێت، لەکارکەوتنی شوێنی ڕابواردنی گشتی لەوەزیاتر درێژەی کێشا کەپاشای میسر چاوەڕوانی دەکرد، هەر ڕۆژێك لەداخرانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بەسەرچووبا، ئەوا زیانێکی گەورە بەرداهاتی بەتلیمۆسی چواردەهەم دەکەوت، دانیشتوانی شوێنی ڕابواردنی گشتی ناچارنەبوون لەژێر فشاردا دەسبکەنەوە بەئیشکردن وداوایـان لەپاشـای میـسر دەکـرد کەپاراسـتنی تـەواوی قانونیـان هـەبێت، واتـا بیانـەوێ هەرکەسێك بکوژن بیکوژن و زسا نەدرێن.

یەکێك لەوشتانەی کەدوای وەستانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بووەجێگای سەرسوڕمانی کلیۆپـاتراو پاشا، ئەوەبوو ئایە دانیشتوانی شوێنی ڕابواردنی گشتی چۆن بژێوی وئەرزاقی خۆیان دابین دەکەن، لە چ ڕێڕەوێکـەوە درێـژە بـەژیانی خۆیانـدەدەن، هـەموو لایـەك دەیـانزانی ئـەو ژنانـەی کەلەوشـوێنەدان خەڵکانی کـرێ گرتـەن، جگەلـە هەنـدێکیان کەسـەرمایەکیان هەیـە، ئـەوانیتر ڕۆژ بـەڕۆژ بـژێوی خۆیـان پەیـدادەکرد، ئەوانـە نەیانـدەتوانی بۆماوەیـەکی دوورو درێـژ بەرگـەی بێکـاری بگـرن، لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشدا، ڕۆژانێك بەسەردەچوون بەبێ ئەوەی ئەوژنانە ناچارین دەستبکەنەوە بەئیشەکەی پێشوی خۆیان.

63- لەوانە: واتا ئەوکەسانەی کەدەچوون بۆ ڕابواردن (و- کوردی)

پاشای میسرو کلیۆپاترا پێیانوابوو خاوەنی خانووەکانی ئەوشوێنە یارمەتی ئەو ژنانەدەدەن، بەلام دواتر ئاشکرابوو ئەو بۆچوونە ڕاستنییە، خاوەن خانووەکان زۆر لەوەبێبەزەیتن کەیاریدەی ئەو ژنە برسییانەبدەن، بەتەمانی ئەوەی لەداهاتوودا ئەو قەرزانەیان بدەنەوە.

پاشای میسرو کلیۆپاترا سەد کەسیان نارد بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی، تالەوەبکۆڵنەوە داخوا ئەو ژنانە لەکوێوە خۆراك وبژێویان بۆدێت، ئەو ژنانەی کەلەکاتی ئاسایی وئیشکردنیاندا قەرزدارن، چۆن لەم کاتە سەختەدا ژیان بەسەردەبەن ونارەزایی دەرنابڕن؟

ئەوکەسانەی لێپرسراوێتی ئەو لێکۆڵینەوەیان پێسپێردرابوو لەوەگەیشتن کەسانێك هەن دێن بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی ویارمەتی ئەو ژنانەدەدەن، بۆیە ئەوان دەتوانن درێژ بەژیانی خۆیانبدەن وبەرگەی ئەوبێکارییە دەگرن، پاشای میسر فەرمانیدا لەوکەسانە بکۆڵدرێتەوە کەیارمەتی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی دەدەن، داخوا ئەوانەکێن، جارێکیتر مامورانی لێکۆڵینەوە چوونەوە بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی ودەستیانکردەوە بەلێکۆڵینەوە، دوای گەڕانەوەیان بەپاشایان گوت ئەوکەسانە هەندێ خەڵکی خێرخوازن ودەڵێن ناکرێ لەشارێکی وەك ئەسکەندەریەدا کەهەموو لەڕووی بژێوییەوە باشن وکۆمەڵێ ژنی بێگانەو بێنەواش لەشوێنی ڕابواردنی گشتیدا بەبرسێتی ژیان بەسەربەرن.

- پاشای میسر گوتی: ناتوانین ڕێگا لەویارمەتییانە بگرین وهیچ قانونێك ڕێگا بەئێمەنادات ڕێگا لەوکەسە خێرخوا مرۆڤ دۆستانەبگرین کەدەیانەوێت یارمەتی برسییەکان بدەن.

- کلیۆپاترا گوتی: من دەستی بێگانە لەوکارەدا دەبینم، تەنها بێگانەکان دەتوانن بەزیان گەیشتن بەمیسر، کەڵك وەرگرن، بۆیەدەبێت ئێمە لەمە ئاگاداربین.

- پاشای میسر گوتی: من بەڕوونی دەستی ڕۆمییەکان لەمکارەدا بەدی دەکەم، ڕۆمییەکان چاویان لەسەر میسر لانابەن، چاوەڕوانی هەلێکن بۆئەوەی دەست بەسەر ئەم وڵاتەدابگرن.

ئێستا ئەوان لەوەگەیشتوون کەشوێنی ڕابواردنی گشتی بەردەوامبێت لەکارکەوتنەکەی زیاتر لەڕووی داراییەوە من لاوازدەبم وبەهۆی بەردەوامبوونی ئەم بارودۆخە پێشەنگی شاری ئەسکەندەریە نابێتەجێگای سەرنجی گەشتیارانی بیانی، ئەمەش زیان بەوڵاتەکەمان دەگەیەنێت.

- کلیۆپاترا گوتی: وەك دیارە تۆش لەم بارەوە لەگەڵ ڕاکەی مندایت کەڕۆمییەکان بەیارمەتی دانیان بۆتاتڕۆکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی، درێژە بەلەکارکەوتنی ئەوێ دەدەن، ئێستاش ئەوە بێنەبەرچاوی خۆت، ئەگەر ئەم ئیشنەکردنەی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بۆچەند مانگێك درێژە بکێشێت، میسر توشی چ زیانێکی گەورەدەبێتەوە، لەوماوەیەدا هەموو ئەو کەشتیانەی کەلەڕێگای ئەسکەندەریەوە هاموشۆیان دەکرد، ڕادەوەستن وبەرەو بەندەرەکانی ڕۆم- یان ئەوخاکانەی کەسەر بەخۆیانن دەچن وهەموو ئەو گەشتیارانەی کەپارەی خۆیان لەمشارەدا خەرجدەکرد، دەچن بۆ بەندەرەکانیتر،

- لەسەرئەنجامدا دوای ئەوەی هاوسێکانی ئێمە دەوڵەمەندبوون، ئێمەش هەژاردەبین، ئایا تۆ سەبارەت بەکۆتاییهاتنی ئەم مەسەلەیە هیچ تەگبیرێکت لێنەکردەوە؟

- پاشای میسر گوتی: من ئاگام لەهەموو ئەوشتانەیە کەتۆ باسیاندەکەیت وزۆرم بیر لێکردۆتەوە، لەوانەیە ڕێگاچارەیەك بۆ ئەم گرفتە بدۆزمەوە، بەڵام تائێستا نەگەیشتوومەتە ئەنجام، ئایا تۆ هیچ بیرت لەچارەیەك نەکردۆتەوە؟

- شازنی میسر وەڵامی دایەوەو گوتی: من زۆر بیرم لێکردۆتەوە، بەڵام تائەم ساتەوەختەش نەگەیشتومەتە سەرئەنجامێکی باش، کەسێك پێشنیارێکی بۆمن کرد، پێموابێ بۆچونێکی خراپ نییە، ئینجا کلیۆپاترا ڕوویکردە پاشاو گوتی: ئایا دەزانی (زتاپە) دەیگوت چی؟

- پاشای میسر پرسی: زتاپە، کێیە؟

- کلیۆپاترا گوتی: تۆ زتاپە ناناسیت، لەکاتێکا بەناوبانگی ئەو لەئاسۆدا پرشنگی داوەتەوە؟

- پاشا گوتی: لەوانەیە (زتاپە) یەك سەرداری گەورەی سەربازی ئێمەبێت؟

- کلیۆپاترا گوتی: ئەوسەرکردەی جەنگی نییە، بەڵکو یەك دانایەو جێگری بەڕێوەبەری کتێبخانەی ئەسکەندەریەیە.

- پاشای میسر گوتی: چونکە من سەروکارم زۆر لەگەڵ کتێبدانییە، ئەو کەسانەی لەکتێبخانەکەدان نایانناسم.

- کلیۆپاترا گوتی: دوێنێ شەوێ من چوم بۆ کتێبخانەکەو لەگەڵ زتاپەدا سەبارەت بەلەکارکەوتنی شوێنی ڕابواردنی گشتی گفتوگۆم کردو بەئەوم گوت، ئایا هیچ بیرۆکەیەکی سەبارەت بەمە بەخەیاڵدانایەت تاجێبەجێبکەین وکۆتایی بەومانگرتنەی ژنانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بێنێت؟

ئەو گوتی: ئەگەر بتەوێت لەکارکەوتنی شوێنی ڕابواردنی گشتی بکەوێتەوەگەڕ، پێویستە یەك شوێنی ڕابواردنی گشتیتر دروستبکەیت، بەوشێوەیە ڕکەبەرێ دەستپێدەکات وژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی لەترسی ئەوەی کرانەوەی ئەوشوێنە تازەیەی ڕابواردن، جێگای ئەوانە نەگرێتەوە، دەچنەوەسەر ئیشەکانی خۆیان وکۆتایی بەو مانگرتنەیان دێت.

- بەتلیموسی چواردەهەم گوتی: بیرۆکەیەکی باشە، بەڵام جێبەجێ کردنی ئەمە سەختە، چونکە دروستکردنی شوێنی ڕابواردنی گشتی تازە لەیەك دوو ڕۆژدا دروستناکرێت.

- کلیۆپاترا گوتی: من ئەمەشم لەگەڵ زپاتەدا باسکرد، ئەو گوتی: ئەگەر پاشای میسر ڕازیبێت من لەوڕووەوە پلانێکم هەیە کەجێبەجێکردنی ئەمە دەتوانێت کۆتایی بەم موشکیلەیە بهێنێت.

- پاشای میسر گوتی: بۆسەرگرتنی پلانەکەی زپاتە، هەموو ئیماکاناتێك دابین دەکەم.

- کلیۆپاترا گوتی: کەواتە تۆ ڕازی بەنەخشەکەی ئەو؟

- پاشای میسر گوتی: بەڵێ من ئەو بۆچوونەی ئەو لەئێستاوە پەسەند دەکەم، هەمان ڕۆژ پاشا فەرمانیدا ئیش بکرێت بۆجێبەجێکردنی ئەو نەخشەیە.

هەر کەهەواڵی دروستکردنی شوێنێکیتری ڕابواردنی گشتی بەناوشاردا بڵاوبۆوە، دانیشتوانی شوێنی ڕابواردنی گشتی کۆنەکە کەمەرجی ئەوەیان هەبوو تائەوژنە پیاوکوژە بەرنەدەن ناچنەوەسەر کارەکانی خۆیان، گەڕانەوەسەر ئیشەکەی خۆیان وپێشوازی پیاوانیان دەکرد بۆڕابواردن، ئەوشوێنە تازەیە بەزویی دروستکراو ئەسکەندەریە بووبە خاوەنی دوو شوێنی ڕابواردنی گشتی وجارێکیتر ڕەونەقی پێشووی خۆی پەیداکردەوەو کرێکارانی بەندەری ئەسکەندەریە لەهەموو کەس زیاتر بەمکارە

خۆشحاڵبوون، چونكە هەم دەستكەوتی زیاتریان دەستدەكەوت وهەم شوێنی تازەشیان بۆ دروستكرابوو، بۆ ئەوەی كاتەكانی خۆیا لەوێدا بەخۆشی بەسەربەرن وپشووی تێدابدەن، بەڵام زیاتر قازانج بۆپاشای میسر دەگەڕایەوە، چونكە داهاتی ساڵانەی ئەو دوو بەرامبەریبۆوە- تەنانەت زیاتریش.

من تێبینیم دەكرد كلیۆپاترا گرنگی زۆری بەگەشانەوەی شوێنی ڕابواردنی گشتیدەدا، دوای ئەمە سیاسەتی حكومەتی میسر كەوتەسەر ئەوەی كەدەبێ بۆهەمیشە دوو شوێنی ڕابواردنی گشتی بوونیان هەبێت.

كلیۆپاترا بەشێوەیەك حەزیدەكرد بازاڕی شوێنی ڕابواردنی گشتی ڕەواج پەیدابكات، تەنانەت بیری لەوەدەكردەوە بینای شانۆكەش بگوازێتەوە بۆئەو شوێنە، بۆئەوەی بیانییەكان ڕۆڵی ئەكتەرەكان لەسەرشانۆ لەوشوێنەدا ببینن، بەڵام سووربوونی هونەر پیشەی بەناوبانگ (هەریسە) كەمن لەمەوبەر ناوی ئەوم برد، ڕێگربوو لەسەرگرتنی ئەو نەخشەیەی كلیۆپاترا.

هەریسە لەهۆڵی شانۆی گەورەی ئەسكەندەریەدا هەر ڕۆڵێكی كەبە ئەویان دەدا بەوپەڕی سەركەوتوانە ئەنجامیدەدا، بەڵام لەكار ئەكتەری ڕۆڵی (خوای شكار)دا ئەوەندە لێوەشاوەبوو هەرشەوێك كەهەریسە ڕۆڵی كارئەكتەری (دیان- خوای شكاری) دەگێڕا، بلیتی چوونەژوورەوە دوو بەرامبەر دەبۆوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەموو شوێن ولۆژەكان پڕدەبوون لەخەڵك، ئەسكەندەریە سێ شتی هەبووەوەو هەیە كەلەدنیادا بێهاوتان، یەكێكیان فانۆسی دەریایی ئەوی تریان سێركەكەو دواینیان هۆڵی شانۆكەی، من پێموانییە هاوتای بینای شانۆی ئەسكەندەریە لەدنیادا دروستبێت، خۆئەگەر ڕۆژێك شانۆیەكی هاوتای ئەو دروستبكەن، ئەوا بێگومان لاسایی كردنەوەی بینای شانۆی ئەسكەندەریەدەبێت، هۆڵی شانۆ ئەسكەندەریە بەقەد سێركەكە بەرفراوان نییەو زۆر لەوبچوكترە، بەڵام یەك تەلاری چوارقاتەو هەرقاتەو چەند لۆژێكی تێدایە كەبینەران لەوێدا دادەنیشن وڕۆڵی هونەرپیشەكان دەبینن.

لەسێركەكەدا لۆژەكان بەشێوەیەك دروستكران كەڕووی هەموویان بەرەو مەیدانی سێركەكەیە، چونكە هەرنمایشێك بكرێت لەومەیدانەدا، دەبینرێت، بەڵام بینای شانۆ چوارقاتەكە بەشێوەیەك دروستكراوە ڕووی بینەران بەرەو ئاڕاستەیەك بێت كەلەوێدا نمایش[٥٤] پێشكەش دەكرێت، بەڵام بینا چوارقاتەكەی شانۆیان بەشێوەیەك دروستكردووە، هەموو تەماشاكەران ڕوویان لەبەشێكی ئەوبێت، واتا تەختی شانۆكە، گۆڕەپانی سێركەكە نوای نەبوو، ئەگەر لەكاتی نمایشكردنەكەدا باران ببارێت ئەوكەسانەی خەریكی پێشبڕكێن تەڕدەبن، بەڵام هۆڵی شانۆكە میچی هەیە نەباران ونەهەتاو لێیدەدات، بۆیەش ئەوانەی لەلۆژەكانیشدانین نەتاویان لێدەدات ونەبارانیان پێدەكەوێت، ئەو ئەندازیارانەی كەبینای شانۆكەیان دروستكردووە، لۆژەكانیان بەشێوەیەك دروستكردووە كەهیچ لۆژێك هەراسانی لۆژێكیتر نابێت.

لەوشەوانەی هەرچوار قاتی شانۆكە پڕلەخەڵك دەبێت، هەموو بینەرێك لەهەرشوێنێكدا دانیشتبێت دەتوانێت بەئاسانی سەرتەختی شانۆكە ببینێت، ئەوانەی لەلۆژەكانیشدانین وبەڕیز دانیشتون، بەرچاوی ڕیزەكانی دوای خۆیان ناگرن، چونكە بەشێوەیەك دروستكراوە كەپلەپلەییەو قالدرمەیی هەڵكەوتووە، چون شوێنی دانیشتنی بینەرانیان سەرەوژێر دروستكردووە بۆئەوەی ئەوانەی لەپێشەوە

دادەنیشن بەرچاوی ئەوانەی دوای خۆیان نەگرن، پارەی ئەوکەسانەی کەلەلۆژەکاندا دادەنیشن، زیاترە لەپارەی ئەوکەسانەی کەلەهۆڵی شانۆکەدا دادەنیشن وسەیری ئەکتەرەکان دەکەن.

64- لێرەدا مەبەستی لەسەرتەختی شانۆیە، نەك هۆڵی شانۆ(و- کوردی)

من چەندجارێك کارئەکتەری هەریسەم لەسەرتەختی شانۆ بینیوە، ئەوم لەکارئەکتەری (دیان- خوای شکار)دا بینیوە، بۆیەکەمجار کەلەگەڵ کلیۆپاترادا چووبم بۆشانۆ، هەرسەم لەکارئەکتەری خوای شکاردا بینی، بەئاستێك نمایشکردنەکە سەرنجراکێشبوو لەسەیرکردنی ئەو تێرنەدەبووم، دەسەیەك لەژنی گەنج کەهاودەمی (خوای شکار)بوون جارێك لەئەویان دەڕوانی وجارێکیش ئەویان بۆشکارکردن دەبرد، من سەرم لەوەسوڕمابوو چۆن گیانلەبەرانی درندەیان لەشکارکردنەکەدا دێناودەبرد بۆئێرەشیان هێنابوون، من دەمزانی ئەو گیانلەبەرانەیان لەباغی ئاژەڵانەوە هێنابوون بۆشانۆ، بەڵام نەمدەتوانی تێبگەم چۆنچۆنی ئەو گیانلەبەرانەیان هێنابووە سەرتەختی شانۆ ولەناو دیمەنی دەستکردا بەجۆرێك دەجولانەوە دەتگوت لەدەشتودەردان، کاتێ هەریسە لەڕۆڵی کار ئەکتەری خوای شکاردا، تیری بەرەو ئەوئاژەڵانە دەهاویشت، گیانلەبەرەکانی کەتیرەکەکان دەیپێکان دەکەوتن وهەندێکیش لەوانە کەتیرەکانیان بەردەکەوت ڕایاندەکرد.

پاشای میسر لەشانۆکەش وەك سێرکەکەو شوێنی ڕابواردنی گشتی باجی وەردەگرت.

یەکێك لەسەرنجراکێشترین نمایشەکانی هۆڵی شانۆکە ئەوگۆرانیانەبوون کەلەوێدا دەگوتران، من لەمرووشەوە هۆڵی شانۆی ئەسکەندەریە بەبێ نەزیر دەزانم لەدنیادا، گۆرانییەکان تائەوکاتەی هەریسەبوو وڕۆڵی دەگێڕاو ئەودەیگوتن، چونکە دەنگێکی خۆشی هەبوو.

لەهۆڵی شانۆکەدا کۆمەڵێك مۆسیقاژەن هەبوون کەنزیکەی هەشتا کەسبوون بەسازو سەمتورو عودو نەیی و دەف و... هتد- یان دەژەنی وئاوازەکانی ئەو گۆرانیانەیان دەژەنی کەهەریسە دەیگوت: گۆرانییەکانی شانۆ سێجار دەگوترا، لەسەرەتاو ناوەڕاست وکۆتایی نمایشەکەدا، بۆئەوەی بینەران زیاتر چێژ وەربگرن، چوون ئەمە تاقی کرابۆوە بینەر کاتێ گوێی لەیەك گۆرانی تازەدەبێت یەکەمجار کەم لەزەتی لێدەبینێت، بەڵام کەجاری دووەم دووبارەبۆوە هۆش وبیری دەخاتەسەر وشەکان وئاوازەکەی، بەڵام گوتنەوەی بۆجاری سێیەم، چونکە ئامادەیی هۆشی زیاتردەبێت زووتر لەزەت لەمە دەچێژن، بۆیەش هەر گۆرانییەك لەشانۆی ئەسکەندەریەدا سێجار دەگوترایەوە- لەسەرەتاو ناوەڕاست وکۆتاییدا.

خەڵك وشەو ئاوازی گۆرانییەکانی شانۆیان لەبەردەکردو لەدەرەوەدا دەیانگوتەوە، گەشتیارو ڕێبواران ودەریاوانان، وشەی گۆرانییەکانی شانۆیان دەگوتەوەو لەکلێشەیاندا دەمایەوەو بۆ وڵاتەکانی خۆیاندەبردەوە، ئەوئاوازەی کەهەریسە دەیگوتن لەوڵاتانیتر دەگوترانەوە، لەبەرئەمە ئەسکەندەریە لەسەردەمی گەنجییەتی مندا ئاوازو گۆرانی بۆدنیا بەرهەمدەهێنا، چونکە ئەوگۆرانیانەی ڕۆڵەکانی دەیانگوت، هەمان ئو گۆرانیانەبوون کەباوك ودایکان فێری ببوون، من پێشبینی ئەوەدەکەم کەئاوازو گۆرانییەکانی ئەسکەندەریە تاسەدان سالیتر لەدنیادا دەمێننەوە.

یەکێك لەوکەسانەی گۆرانی وئاوازی سەرشانۆی لەبەرخۆی دەگوتەوە، کلیۆپاترابوو، کەزۆر لەزەتی لەمۆسیقا وەردەگرت وهۆشێکی باشی هەبوو بۆدەرخکردنی وشەو ئاوازەکانی ئەو گۆرانیانە، منیش جارجار هەندێك ئاوازو گۆرانیم لەبیر دەمان، بەلاّم تەنها ئاوازە سادەکانم بیردەمان ونەمدەتوانی ئاوازی گۆرانییەکی ئالۆز دەرخبکەم، بەلاّم کلیۆپاترا ئالۆزترین ولێکهالاّوترین ئاوازو ئاهەنگی لەبیردەمان ولەکۆشکی پاشایەتیدا بەدەنگی بەرز دەیگوتنەوە.

چونکە هەریسە دیارترین گۆرانبێژی شانۆ بوو، لەهەندێك ولاّتدا بەتایبەت لەسوریاو ڕۆم وبیزانس ئاوازو گۆرانییەکانی شانۆی ئەسکەندەریە بەناوی هەریسەوە ناوبانگیان دەرکردبوو، گۆرانی بێژو مۆسیقاژەنی ولاّتانیتر بۆئەوەی ئاوازو گۆرانی خۆیانی پێبەرەواجتر بکەن، دەیانگوت ئەم ئاوازو گۆرانییە هی هەریسەیە، لەشارەکانی میسریشدا گۆرانی وئاوازی شانۆی ئەسکەندەریە بەناوی هەریسەوەبوون، وردەوردە وشەی هەریسە لەناوهۆشی خەلّکدا جێگای گرت تاوایلێهات وشەی ئاواز لەزمانی میسریدا نەماو وشەی هەریسە لەبری وشەی ئاواز بەکاردەبرا، ئەمڕۆش لەمیسردا هەر کەسێك بیەوێت بلّێت فلاّن کەس گۆرانی گوت، دەیگوت فلاّنکەس هەریسەی گوت، هەریسە کەناوەکەی بوو بەجیهانی، دوای ئەوەی پیربوو وجوانییەکەی لەدەستداو هەندێك لەددانەکانی کەوتن، ئیتر نەدەتوانی گۆرانی بلّێت ولەسەرتەختی شانۆ ڕۆلّ بگێڕێت، کلیۆپاترا کەهەریسەی لەڕابردوودا بینیبوو وگوێی لەگۆرانییەکانی ئەوببوو، هەموو سالّێك مەبلەغێك پارەی بۆ ئەوژنە بڕیبوّوە، بەلاّم دوای ئەوەی کلیۆپاترا مرد، ئەوپارەیەی کەدەدرا بەهەریسە بڕاو کەس نەبوو یارمەتی ئەو ژنەبدات، من ماوەی چەند سالّێك ئاگام لەحالّی هەریسە نەبوو ونەمدەزانی ئەو ژنە لەکوێیەو چی دەکات؟

ڕۆژێکیان کەبەسەر لێواری بەندەری ئەسکەندەریەدا دەڕۆیشتم، پیرێژنێکم بینی خەریکی گەڕانبوو لەناو زبلّدانی بەندەرەکەدا، سەکۆی بەندەری ئەسکەندەریە بەرفراوانن وهەموو ڕۆژێ کەشتییە بارییەکان لەوێدا دادەگرن- یان کەشتی باردەکەن، زۆرجار لەکاتی داگرتنی شتومەکی ناوکەشتییەکان- یان کاتی داگرتنیان، هەندێ شتومەك دەکەوێت، ئەمە جگەلەوەی دانەوێلّەو شتی وشکیش دەڕژێت، خەلّکی هەژارو دەستکورت ئەم شتانە کۆدەکەنەوەو دەیبەنەوە مالّی خۆیان، ئەو پیرێژنەی کەلەسەرانگوێلکی بەرندەردا خەریکی گەڕان بوو، بۆئەوەی شتی کەمێ بەکەلّکی دەستبکەوێت و بیباتەوە مالّەکەی، ئەوم بەکەسێکی ئاشنا هاتەبەرچاو ونەمتوانی بەبێ قسەکردن لەگەلّ ئەودا، بەتەکیا تێپەڕم، لەئەو نزیکبوومەوەو گوتم: دایکە تۆ لەبەرچاوی من وەك کەسێکی ئاشنا دەچی، بەلاّم ناتوانم تۆبناسمەوە، ئایا دەکرێت پێم بلّێی تۆ کێیت؟ پیرەژنەکە سەیرێکی منی کردوو کەوتەدوان، من دەمبینی ددان لەدەمیدا نەمابوون ونەیدەتوانی بەباشی بدوێ وگوتی: من هەمان ئەو هەریسەم کەڕۆژگارێك لەشانۆدا سەدسککەی زێڕیاندەدا تەنها بۆئەوەی پەنجەکانیان لەسەر لێوەکانی من بخشێنن، من لەسەرسامیدا لەرزیم وگوتم...ئێی... ئایا ئەو پیرێژنەی کەئێستا لەبەرامبەر خۆمدا دەیبینم هەمان ئەو هەریسەیە کەدانیشتوانی دنیا ئارەزووی بینینی ئەویان دەکردو لەسەرانسەری جیهاندا گۆرانییەکانی ئەویان دەگوتەوە؟

- پیرێژنەکە گوتی: بەلّێ، ئەم ژنە هەمان ئەوئافرەتەیە، بەلاّم ئێستا ددانی لەدەمدا نەماون، مووی سەری سپیبوون وچاوەکانی بەباشی نابینن وبەپشتی کۆمەوە بەڕێگادا دەڕوات.

من پێنج سکەکەی پارەم پێبوو کردمە دەستییەوە، وەك گوتم لەئەسکەندەریەدا سواڵکەرنەبوو کەس گەدایی نەدەکرد، بەڵام ئەم ژنە لەدەستکورتیاندا پارەکەی منی وەرگرت، کاتێ بەجێم هێشت بینیم چاەکانی پڕببوون لەئاو، لەوساتەدا منیش چاوەکانم پڕبوون لەفرمێسك، بەڵام ئەم گریانەی من تەنها لەبەر هەریسەی هونەرمەند نەبوو، بەڵکو بۆخۆشم دەگریام، چونکە دیتنی پیری هەریسە بووەهۆی ئەوەی منیش بەخۆمدا بچمەوەو لەخۆم بپرسم، ئایا منیش وەك ئەو پیربووم ؟

من تائەو ڕۆژە پێموانەبوو کەپیربووم، چونکە هەرجارەی سەیری ئاوێنەم دەکرد ڕوخساری خۆی وەك ڕۆژی پێشتر دەبینی، ئەگەرچی هەندێ مووی لاجانگم سپی ببوون، بەڵام من ئەوەندە مووە سپییەم بەبەڵگەی پیری نەدەزانین وخۆم بەگەنج دەبینی، لەمیسردا ژنەکان مووی سەری خۆیان بۆیە دەکرد، ژنە ئەستوکراتەکان هەموو ڕۆژێ مووی سەریان لەگەڵ شێوەی جلوبەرگەکانیاندا ڕەنگدەکرد، کەسیش بەئەمانی نەدەگوت پیربوون، کەواتە بۆچی من کەشەرمنم بەوەی هەندێ موو لەسەرم سپی بووە، ناچاربم خۆم بەپیر بزانم؟ هەرچەندە دوو ددانی پێشەوەی من کەوتوون، بەڵام من دوای بینینی هەریسەو بیستنی دەنگی ئەو لەسەرساسیدا لەرزیم، چونکە هەریسە ددانەکانی پێشەوەی نەمابوون ولەکاتی دواندا نەیدەتوانی بەباشی قسەبکات، کاتێ وشەکان لەدەمییەوە دەهاتنەدەرێ بەشێوەیەك دەکەوتنە بەرگوێ کەمرۆڤی بێزار دەکرد.

بەخۆم گوت کەواتە منیش لەکاتی دواندا وەك هەریسە قسەدەکەم، چونکە دوو ددانی پێشەوەی من کەوتبوون، خۆئەگەر من وەك هەریسە قسەبکەم، هاوار بۆخۆم.

من پێموانەبوو پیربووبم، کەسانی دەوروبەرم ئەوانەی کەهاوتەمەنی من بوون، پیربوون، بەڵام من خۆم بەپارێزراوی ڕۆژگاری ڕابردوو دەزانی، پێموابوو ئەوکەسانەی هاوتەمەنم بوون ومن ئەوانم بەپیر دەبینی، ئەوکەسانەن کەبوونەتە جێگای تورەیی خواکان، بۆیەش ئەمانە ساڵبەساڵ پیردەبن وهەر ساڵێك تێدەپەڕێت لەڕووخساری ئەمانەدا شوێنەواری وادەبینم کەئەوە نیشاندەدات لەساڵی ڕابردوو زیاتر لەلێواری گۆڕ نزیکبوونەوە، بەڵام من جێگای سەرنجی خواکانم وپیر نابم.

کەسیش بەمنی نەگوتووە پیربووی، هەتامن پەی بەئاکارو ڕووخساری خۆم ببەم وبزانم ئیتر گەنج نیم، هەرچەندە من تێبینی ئەوەم دەکرد کەپیاوە گەنجەکان وەك جاران سەیری ڕووخساری منیان نەدەکردو دەستی خۆیان لەسەر لێوەکانی من وسینگی بگێڕن، بەڵام من هۆی ئەمەم بۆ ئەوەدەگەڕانەوەکە ببووم بەژنێکی دیارو دەوڵەمەندو خاوەن کەسایەتی وکوڕە گەنجەکان نەدەوێران حەزی خۆیان لەڕووی مندا بەیانبکەن، هیچ کەس بەمنی نەگوتووە لەکاتی دواندا، بەوەی دوو ددانی پێشەوەم کەوتوون، ناتوانم وشەکان بەباشی دەربڕم، زۆرجار لەکاتی دەربڕینی وشەیەکدا نەرمە فیتوو لێدەدەم، چونکە ئەودەنگە بەشێوەیەك لەدەمم هاتەدەرێ کەلەشێوەی نیمچە فیتوو دەچوو، ئەو ڕۆژەی کەهەریسەم بینی، بووبەهۆی ئەوەی بەخۆمدا بچمەوەو بۆ یەکەمجار تێگەیشتم لەژیانی مرۆڤدا یەك واقعیەتی گاڵتەجاڕی هەیە، ئەویش ئەوەیە کەسێکی پیر ئەوکەسانەی کەلەدەوروبەریدا دەژین هەست بەپیربوونیان دەکات، بەڵام پیربوونی خۆی نابینێت. ئەوەی دەبێتەهۆی ئەوەی مرۆڤ پیری خۆی نەبینێ، ئەوەیە هەموو ڕۆژێك سەیری ئاوێنەدەکات، ئێمەی ژن لەوانەیە ڕۆژی دەجار سەیری ئاوێنە بکەین، بۆیە لەماوەی نێوان سەیرکردنێك بۆسەیرکردنێکی تری ئاوێنە. خۆمان بەپیر نابینین، یەقینی تەواومان هەیە هەمان ئەوەین

کەسەعاتێک- یان ڕۆژێك لەمەوبەربووین، بەڵام ئەگەر هەرپێنج ساڵ- یان دەساڵ جارێك سەیری ئاوێنە بکەین، ئەوکات دەزانین پیربووین، چونکە پیری خەڵکانیتر دەبینین وپیری خۆمان نابینین، پیرەکان بەچاوی ڕقەوە سەیردەکەین وپێمانوایە ئەمانە کەوتوونەتە بەرتوڕەیی وخواکان وسزای ئەوانە بەڵای پیرییە کەپێوەی گرفتاربن.

لەو ڕۆژەوەی هەریسەم بینی، بەخۆم گوت بەوەی پیاوی گەنج دەوروخولمنادەن وگوێم پێنادەن، لەوانەیە ئەوەبێت کەمنیش وەك هەریسە پیربووم ڕووخسارم پرلۆچ بووە، بەڵام من چرچ ولۆچیی ڕووخسارم کەمە، ئەوڕۆژە دوای ئەوەی لەسەرسەکۆی بەندەری ئەسکەندەریە گەڕامەوەو گەیشتمەوەماڵەکەم، ئاوێنەیەکم بەدەستەوەگرت وبەوردی لەدەموچاوی خۆم ڕوانی بۆئەوەی بزانم ئایا دەموچاوی منیش وەك هی هەریسە چرچ ولۆچی گەورەو بچوکی تێکەوتوون- یان نا؟ بەڵام ئەوجۆرە لۆچانەم لەڕووخساری خۆمدا نەبینی، تەنها کەمێ پێڵوەکانم ئەستور ببوون، لەڕابرووشدا هەرکاتێ شەرابم زۆر بخواردبایە پێڵوی چاوەکانم ئەستور دەبوون، بەڵام من ئیتر پشتم بەبینینی چاوەکانم نەدەبەست وپێموابوو بەهەمان شێوەی کەگوێچکەکانی من ناتوانێت وشەی نارێك کەلەدەمی من دەردەچێت ببیستێت، چاوەکانیشم ناتوانن چرچولۆچی ڕووخسارم ببینن، خۆزگە هەریسەم نەبینیباو ئومێدم سەبارەت بەگەنجی وجوانی خۆم لەقنەدەبوو، لەو ڕۆژەوەی هەریسەم بینی ئیتر ناتوانم خۆم بەجوان وگەنج بزانم وپێموایە منیش وەك خەڵکانیتر هەرساڵێ کەبەسەردەچێت زیاتر لەمردن نزیکدەبمەوە، لەوباوەڕەدام هەریسەش سەرەتا تێبینی ئەوەی نەکردووە کەپیربووە، بەڵکو کەسانیتر بەئەویان گوتووە بەساڵاچووە، بەڵام کەس تائێستا لەڕووی نەداوم کەپیربووم، هۆکەشی ئەوەیە من ماڵ وسامانم هەبوو، بەڵام هەریسە هیچی نەبوو، کاتێ خەڵك منی دەبینی نەیاندەتوانی بەمن بڵێن پیربووی، چونکە پێشبینی ئەوەیاندەکرد نابێ دڵی ژنێکی دەوڵەمەند لەخۆیان بڕەنجێنن، بەڵام لەهەریسە نەدەترسان وشەرمیان نەدەکردو بەئەویان دەگوت، پیربووی، ئەویش پەی بەبەساڵاچوویی خۆی بردبوو.

## چۆن جێنشینی پاشای میسر ڕفێندرا؟

کاڵ، وەك لەمەوبەر باسم کرد، ماوەی مانگێك مۆڵەتی وەرگرتبوو، تابتوانێت ئەومنداڵانەی کەبەڕووباری نیلدا دێن بگرێتەوەو یەك یەك سەیریان بکات داخوا کامیان لەشێوەی منداڵەکەی خۆی دەچێت، کۆمەڵێ منداڵی گرتبوونەوە کەکچ بوون وکاڵ نەیزانیبوو، بەڵام دواتر سەیری دەکردن وئەوەی کە کچ با- یان کوڕباو لەشێوەی کوڕەکەی خۆی نەچووبا، دەیخستەوەناو شوێنەکەی خۆیی وبەئاوەکەیدا دەدایەوە.

من لەپشوودرێژی ئەوپیاوە سەرم سوڕمابوو، بیرم لەوە3دەکردەوە ئەگەر منباوم و ویستبام یەکێك لەومنداڵانە بگرمەوەو لەگەڵ منداڵەکەی خۆمدا بیگۆڕم، ئەوەندەم تاقەتنەدەبوو کەیەك بەیەك منداڵان لەڕووباری نیل بگرمەوەو سەیریان بکەم و بەدوای منداڵێکی هاوشێوەی منداڵی خۆمدا ئەوەندە بگەڕێم،

هەموو ئەوکەسانەی لەمیسردا دەژین، دەزانن ئەومندالانەی بەئاوی نیلدا دێن، زۆربەی شیرەخۆرەن ولەدوسێ ڕۆژ- یان ئەوپەڕی مانگێك تەمەنیان هەیە، کەمتر وارێدەکەوێت مندالی شیرەخۆری گەورەتر بەئاوی نیلدا بدەن، چونکە کاتێ مندالی شیرەخۆرە کەمێك گەورەبوو بەشێوەیەك لای دایك وباوکی خۆشەویست دەبێت، ناتوانن دلیان لەبەری بێتەوە.

مندالی کلیۆپاترا وکال کۆرپەیەکی شیرەخۆرەی دووسێ ڕۆژە نەبوو کەبتوانرێت ئەولەگەل مندالێکی شیرەخۆرەی دوو سێ ڕۆژیدا ئالوگۆڕیکەن.

ڕۆژێکیان کەدەبوا من چووبام بۆلای کال، بۆئەوەی مندالەکەی نیشانبدەم، بریارمدا مندالەکە لەگەل خۆمدا نەبەم، چونکە دەمزانی کال بۆپەیداکردنی مندالێك کەلەشێوەی مندالەکەی کلیۆپاترا بچێت، تووشی گرفت بۆتەوە، لەوەدەترسام لەپڕ مندالی کلیۆپاترا لەدەستم وەرگرێت وبیبات، ئەگەر کال ئەومندالەی لەمن ستاندباو ڕۆیشتباو بەکەشتی ئەسکەندەریەی جێهێشتبا، دەستی پاشای میسرو شاژنی پێنەدەگەیشت، منیش نەم دەویست ئەم شتە ڕووبدات، چونکە ئەگەر کال مندالەکەی ڕفاندباو دواتر گرتبایان، ئەوا بەسەختترین شێوە سزایاندەداو تێدادەچوو.

- ئەو ڕۆژە بەدەستی بەتال چووم بۆلای کال وبینیم ئەومندالێکی لەباوەشدایە، لەکالم پرسی: ئەومندالەت کەی پەیداکرد؟

- کال گوتی: ئەم مندالەم پێریێ لەڕووباری نیلدا گرتۆتەوەو سەیرمکرد زۆر لەڕۆلەکەی خۆمدەچێت وئەمڕۆش ئەوم هێناوە تالەگەل مندالەکەی خۆمدا ئالوگۆڕی پێبکەم، ئینجا بەسەرسوڕماویەوە پرسی شرمیون تۆبۆچی ئەمڕۆ مندالەکەت نەهێناوە بۆئەوەی لەگەل ئەم کۆرپە کوڕەدا ئالوگۆڕم کردبا؟

- گوتم: کال تۆ باشدەزانیت من کارەکەرێکم ودەسەلات لەدەستی خۆمدانییە. ڕۆژانیتر کەمندالەکەم لەکۆشکی پاشایەتی دەهێنادەرێ کەس ڕێگرنەبوو، بەلام ئەمڕۆ کاتێ کلیۆپاترا منی بینی خەریکبووم لەکۆشکی پاشایەتی دەهاتمەدەرێ، گوتی شرمیون ئەومندالە بۆکوێ دەبەیت؟

منیش وەلامێکم پێنەبوو وسەرەتا پەشۆکام وگوتم ئەومندالە لەخەوهەلساوەو لەباوەشمکردووە بۆئەوەی بیگێڕم، ئیتر نەمتوانی مندالەکە لەکۆشکی پاشایەتیدا بهێنمەدەرێ وناچار ئەوم بۆلای لانکەکەی بردەوەو خەواندم وخۆم بەتەنها هاتم، تابەتۆ بلێم ئەمڕۆ ناتوانم مندالەکە لەکۆشکی پاشایەتی بهێنمەدەرێ.

- کال گوتی: خراپبوو زۆرخراپ، من باوەڕی تەواوم هەبوو کەبەمرادی خۆم دەگەم وئەومندالە ئالوگۆڕی پێبکەم، ئایا ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆکۆشکی پاشایەتی وکەکلیۆپاتراو دایانەکەی خافلان تۆمندالەکە بۆئێرە بێنی؟

- گوتم: ئەمڕۆ ناتوانم ئەوکارەبکەم، چونکە ئەوسەعاتەی من دەمتوانی لەکاتی سەرقالی وجەنجالی ئەوانەدا مندالەکە بهێنم ڕۆیی.

لەوکاتەدا لەکالم پرسی تۆچۆن ئاگاداری ئەومندالە دەکەیت؟

- کال گوتی: من لەم شارەدا مالێکم دابینکردووەو ژنێکی خزمەتکارم بۆئەومالە بردووەو ئەوژنە شیری مانگا دەدات بەومندالە، دواتر کال مندالەکەی لەباوەشی من هاویشت وگوتی، شرمیون باوەڕبکە ئەومندالە جیاوازی لەگەل مندالەکەی مندا نییە!

– من منداڵەکەم لەئامێزگرتوو خەریکی سەیرکردنی بووم، چاوەکانی ئەو کۆرپەیە تەواو لەچاوی منداڵەکەی کاڵ و کلیۆپاترا دەچوو، بەڵام ڕەنگی پێستی ئەومنداڵە لەگەڵ ڕەنگی پێستی منداڵەکەی کلیۆپاترادا جیاوازبوو، بیرم لەوەدەکردەوە مەحاڵە کلیۆپاتراو دایانی منداڵەکە تیبینی گۆڕانی ڕەنگی پێستی منداڵەکەنەکەن ونەزانن منداڵەکە گۆڕدراوە، کلیۆپاترا لەنەژادی یۆنانی بوو کاڵیش لەنەژادی ئێرانی، منداڵی ئەم دووانە پێستێکی سپاتی هەبوو هەرکەسێك دیتبای دەیزانی ئەومنداڵە جوانی یۆنانی وخۆرهەلاتی هەیە، بەڵام ئەومنداڵانەی کەبە ڕووباری نیل دەدران و ئاو بەرەوخوارووی میسری دەهێنان، هەموو منداڵی خەڵکی موڵکی میسری بوون بەدەگمەن ڕێدەکەوت لەنێوان ئەومنداڵانەدا کۆرپەیەك لەنەژادی بێگانانی تێدابا.

– گوتم: کاڵ، ئەم منداڵە تەنها چاوەکانی لەچاوی منداڵەکەی تۆدەچن، پێستی لەشی لەپێستی لەشی تۆ وکلیۆپاترا ناچێت، جگەلەمەش تەمەنی ئەم منداڵە لەتەمەنی لەمنداڵەکەی تۆ کەمترە، ئەگەر ئێمە بمانەوێت لەگەڵ منداڵەکەی کلیۆپاترادا ئاڵوگۆڕی بکەین، دەبێتەجێگای سەرسامی ئەوان ولەئەنجامی بەدواداچوون ولێکۆڵینەوە تێدەگەن ئەومنداڵە گۆڕدراوە، چونکە ڕاستە نەمن ونەتۆش بوارمان نەبووە سەیری نیشانەکانی لەشی ئەومنداڵەی کلیۆپاترا بکەین، بەڵام لە لەشی هەرمنداڵێکدا نیشانەی خۆی هەن، کەتەنها دایك وباوك ودایانەکەی دەزانن، ئەم منداڵەش نیشانەکانی منداڵی کلیۆپاترای پێوەنین، ئەوکاتە بەبێ دوودڵییەوە دەزانن ئەم منداڵە گۆڕدراوە لەگەڵ منداڵێکیتردا.

– کاڵ گوتی: یەك مانگە لەسەر ڕۆخی نیلدا دەگەڕێم، هەرکە سەبەتەیەکم لەسەرئاو دیبا بەبەلەم خۆم دەگەیاندێ تابزانم ئەو کۆرپەلەیە کوڕە– یان کچ، دواتر لەمنداڵەکەی من دەچێت– یان نا؟

مـن دوای یەك مانگ هەوڵ وکۆشش توانیم ئەوکۆرپەیە کەلەمنداڵەکەی من دەچێت، بەدەستبێنم وبیهێنم، ئێستاش داوا لەتۆ دەکەم کەئەم منداڵە لەگەڵ منداڵەکەی کلیۆپاترادا ئاڵوگۆڕ بکەی، کەچی تازە تۆ دەستتکردووە بەکەموکوڕی دۆزینەوەو ڕەخنەگرتن لێی ودەڵێیت ڕەنگی لەشی ئەم منداڵە لەڕەنگی لەشی منداڵەکەی من ناچێت ومنداڵی من لەنەژادی یۆنانی وئێرانییەو ئەم منداڵەش لەنەژادی میسرییە.

– گوتم کاڵ: دەزانی خۆشمدەوێیت وئەوەی من بەتۆشی دەڵێم لەخۆشەویستی تۆوەیە، ئەگەر تۆم خۆشنەویستبا، ئایا ئەگەری ئەوەهەبوو ئەوکارانەی تائێستا بۆتۆم کردوون، ئەنجامم دابان؟ ئایا دەتوانرا هەفتەی جارێك منداڵی کلیۆپاترا لەکۆشکی پاشایەتی بێنمەدەرێ وبۆتۆی بهێنم بۆئەوەی بیبینی؟ لەکاتێکا ئەگەر کلیۆپاترا بیزانیبا بەبێ ڕەزامەندی ئەو منداڵەکەی ئەوم لەکۆشکی پاشایەتی بردۆتەدەرێ، منی بەتوندترین سزا دەگەیاند– یان لەکۆشکی پاشایەتیان دەردەکردم، کارکەرەکان ئەشکەنجەدەکەن، فەللاقەیان دەکەن، دەیانکوژن، بەڵام دەریان ناکەن، چونکە دەزانن هەرکاتێ ئەودەرکەن ئازادی خۆی وەردەگرێت، ئەوەی کەمن دەیڵێم لەبەرژەوەندی تۆدایەو نامەوێت شتێکی وا بێتەپێش تۆ پلەوپایەی سەربازیت وگیانی خۆت لەدەستبدەیت، لەهەمان کاتیشدا کەمێك لەخەم خۆشمم، چونکە ئەگەر ڕێ‌ڕونبن لەوەی من لەئاڵوگۆڕکردنی منداڵەکەدا یارمەتی تۆمداوە ئەوابەسزادانێکی سەخت گیانی خۆم لەدەستدەدەم.

– کاڵ گوتی: شرمیون ئایا تۆ ئامادەنیت بۆگۆڕینی منداڵەکە یارمەتی من بدەیت؟

– گوتم: من بۆهەموو یارمەتی دانێك ئامادەم، بەمەرجێك یارمەتی دانێکی باشبێت وتۆش بەشێوەیەکی ژیرانە بتەوێت منداڵەکە ئاڵوگۆڕی بکەیت، گۆڕینی ئەم منداڵە لەگەڵ منداڵەکەی کلیۆپاترادا کارێکی شێتانەیە.

– کاڵ گوتی: شرمیون ئەگەرتۆ منت ویستباو حەزتکردبا لەگەڵمدا بژیت، ئەوەندە ڕەخنەت نەدەگرتن.

– گوتم: من تۆم دەوێت پێشئەوەی ببیتە خۆشەویستی کلیۆپاترا، من تۆم خۆشدەویست، ئایا لەیادتماوە ئەوشەوەی تۆ لەمیوانخانەی سووربووی ومن هاتم بۆلات؟ خۆشەویستی ئەوشەوە منی گەیاندە ئێرە، چونکە ڕۆژێك پێشئەوە تۆم لەرکەبەریّی سێرکەکەدا بینی وگوتم دەبێ لەگەڵ ئەوکوڕە لاوەدا، ببمەئاشناو پەنجەکانم لەسەرلێوی ئەودانێم ولەپی دەستم لەسینگی بخشێنم.

من ئەمڕۆ وەك ئەوڕۆژە حەزم لەتۆیەو گلەییم لەتۆ نییە بەوەی بۆ کلیۆپاترات لەمن بەجوانترزانی، هەر گەنجێکیتر لەجێگای تۆدابایە کلیۆپاترای بەلەمن باشتر دانەدەنا، هەرلەبەرئەوەی ئەوشاژنەو من کارەکەر، ئەو لەنەژادی یۆنانییەو من لەنەژادی میسری، جوانی ئەو یۆنانییەو جوانی من جگەلە ڕووخساری جوانی میسریانە، هیچ جوانییەکیتر نییە، بەڵام ئەوەی تۆ لەمنی داوادەکەیت کارێکی ئەستەمە، ناڵێم ئاڵوگۆڕکردنی منداڵەکە مەحاڵە دەتوانرێت بەئاسانی ئەومنداڵە بگۆڕدرێت ولەبری منداڵی کلیۆپاترا منداڵێکیتر لەلانکەکەدا بخەوێنرێت، بەڵام ئەوئەنجامەی کەلەمە دەستدەکەوێت بۆ تۆ خراپە، بۆیەش من نامەوێت تخونی ئیشێك بکەوم سەرئەنجامەکەی ببێتەهۆی بەدبەختی تۆ.

– کاڵ گوتی: زۆرباشە شرمیون من بەبێ یارمەتیدانی تۆ، ئەومنداڵە ئاڵوگۆڕ دەکەم.

– گوتم: کاڵ، ئەوکارەمەکە خۆت سەرگەردان وهەڵوەدامەکە، من دەزانم کوڕەکەی کلیۆپاترا ڕۆڵەی تۆیە، نەك هی براکەی، بەڵام ئەگەر ئەوکوڕە لەکۆشکی پاشایەتیدا لای دایکی بمێنێتەوە، ڕۆژێك دێت دەبێت بەپاشاو حوکمی وڵاتی میسر دەکات، بەڵام کەبێتەلای تۆ وبەڕێزت بەخێوی بکەیت وگەورەی بکەیت، من بەدووری دەزانم ئەوبتوانێت هەتا بەپلەی سەرتیپیش وەك ئێستای تۆ، بگات، تۆ لەبەرئەوەبوو بووی بەسەرتیپی سەربازی، چونکە گەنجێکی جوانبووی وجوانییەکەی تۆ سەرنجی کلیۆپاترای ڕاکێشاو ئەوتۆی پەسەندکردووەو بەپلەی سەرتیپی گەیشتی، بەڵام منداڵەکەت لەوانەیە جوانی تۆی نەبێت ونەبێتەجێگای سەرنجی هیچ کەس، وەلێ کەلەکۆشکی پاشایەتیدابێت ولەوێدا گەورەبێت، دوای بەتلیمۆسی چواردەهەم دەبێت بەپاشای میسر، ئەگەرتۆش منداڵی خۆت خۆشدەوێت، پێویستە بیرلەداهاتووی بکەیتەوەو تێبگەیت کەبۆ ئەو پاشایەتی باشترە لەوەی ببێتە کەسێکی سادە.

– کاڵ گوتی: شرمیون من ئەم قسەیەی تۆ بەڕاستدەزانم، ئەم کوڕە ئەگەر لەکۆشکی پاشایەتیدا بمێنێتەوە، ئەوا دوای بەتلیمۆسی چواردەهەم، دەبێت بەپاشای میسر، بەڵام شکۆمەندیم ڕێگای ئەوەم پێنادات ئەومنداڵە لەکۆشکی پاشایەتیدا بمێنێتەوە، خۆم بەخۆم دەڵێم ئەوکوڕە چونکە لەخوێنی منە پێویستە لەلای خۆم بژیت وچۆنم پێخۆشبێت ئاوا گەورەی بکەم، وەك شێوەی تەربیەتدانی خۆم، من نامەوێت کوڕەکەم وەك بەتالیسەکان لەڕولاوازبێت، بەڵکو حەزدەکەم ئەو بەشێوەیەك پەروەردەبکەم وەك ئەوەی چۆن منیان لەڕابردوودا پەروەردە کردووە.

دەمەوێت منداڵەکەم دوای ئەوەی گەورەبوو ئاشنایەتی لەگەڵ زۆربەی وەرزشەکاندا پەیدابکات، وەك خۆم ئەندامەکانی لەشی جوان وبازوڵەداربێت. کاتێ منداڵەکەم لەش ولاری جوانبوو، یەکێك

لەتایبەتمەندییەکانی ئەوەدەبێت جوانییەکەی بۆ دەمێنێتەوە، چونکە دایك وباوکی جوانن، مامۆستا بۆ منداڵەکەم دەگرم، بۆئەوەی فێری نووسین وخوێندنەوە بێت، بۆ ئەوەی کاتێ کەگەورەبوو پلەوپایە وەربگرێت، ئەگەر کورەکەم لەکۆشکی پاشایەتیدا بمێنێتەوەو لەوێ گەورەبێت وببێت بەپاشا ئەوا پەیوەندی بەمنەوە نابێت، چونکە ئەو بەڕۆڵەی کەسانیتر دەزانن وئەویش یەقینی تەواوی دەبێت کەکوری بەتلیمۆسی چواردەهەمە، بەڵام کەلەلای خۆم بژی ولەماڵەکەی مندا گەورەبێت وتەنها ببێت بەسەرتیپێکی سەربازیش، ئەوا شانازی بەوەوە دەکەم کەکورەکەی من بۆتە ئەفسەر.

– گوتم کاڵ: من لەوەزیاتر باسی مەترسیداری ئاڵوگۆڕکردنی ئەوکورە ناکەم، دوای ئەوەی بۆم روونکردیەوە کەچی تۆ هەرسوری لەسەرئەوەی منداڵەکەی کلیۆپاترا برفێنی، بەتۆ دەڵێم کەمن یارمەتی تۆ نادەم، چونکە ئەگەر من یارمەتیرت تبدەم، ئەواخیانەت دەکەم، بەم کارەم نەك لەگەڵ کلیۆپاترادا خیانەتم کردووە، بەڵکو لەگەڵ تۆشدا خانەت دەکەم، چونکە بەرەو مەرگت ڕاکێشدەکەم.

– کاڵ گوتی: شرمیون تۆ سەرەتا بەئاڵوگۆڕکردنی منداڵەکە ڕازیبووی چ بووە ئێستا ڕای خۆت گۆڕیوە؟

– گوتم: سەرەتا من بیرم لەقسەکانی تۆ دەکردەوەو پێموابوو ئاڵوگۆڕکردنی ئەومنداڵە کارێکی ئاسانەو لەوانەیە دایك ودایانەکەی هەستی پێنەکەن، بەڵام ئەمڕۆ لەوەگەیشتوم ئەمکارە ناکرێت وکلیۆپاتراو دایانەکەی دەزانن منداڵەکە گۆڕدراوەو تۆ سزادەدەن، ئەگەر تۆ توانیبات منداڵێك پەیدابکەیت لەڕووی ڕوخسارو ڕەنگی پێستی وچاوی ونیشانەکانی تری لەشی لەمنداڵەکەی کلیۆپاترا بچێت، بۆخۆم منداڵەکەم دەگۆڕی وئەومنداڵەی تۆ دۆزیوتەتەوە تالەجێگای منداڵەکەی کلیۆپاترادا، من لەلانکەکەی ئەودا دەمخەواندو منداڵەکەی ئەوم بۆ تۆ دەهێنا ، ئەو منداڵەی کەتۆ هێناوتە ناتوارێت لەجێگای ئەودابنرێت.

ئیتر کاڵ قسەی نەکردو منیش ڕۆیشتمەوە بۆکۆشکی پاشایەتی، سێ ڕۆژ دوای ئەوە لەوکاتەی لەلایەکی باغەکەوە دەمویست بچم بۆلاکەیتر چاوم بەباڵای یەك باغەوانی گەنج کەوت، ڕاچڵەکیم چونکە زانیم کاڵە سپۆرتی ونازەنینی کاڵ بەشێوەیەك بوو لەگەڵ کەسیتردا لێم نەدەگۆڕا، دەمزانی لەئەسکەندەریەدا پیاوێك لەوجوانتر نییە، هەرچەندە کاڵ جلوبەرگی باغەوانی لەبەرکردبوو، بەڵام قۆزیەکەی ئەو لەدوورەوە سەرنجی ڕادەکێشا.

من کاتێ کاڵم لەوجلوبەرگانەدا دی، تێگەیشتم بۆ ڕفاندنی منداڵەکەی کلیۆپاترا هاتووە، بەڵام نەمدەزانی ئەومنداڵەی کەلەڕووباری نیل گرتبوویەوە لەکوێی داناوە، لەکۆشکی پاشایەتیدا شوێنێکی لێنەبوو باشبێت وکاڵ بتوانێت ئەو منداڵەی کەلەئاودا گرتبوویەوە لەوێی دابنێت، ئەو ڕۆژە هەموو شوێن وجێگاکانی کەئەگەری ئەوەی لێدەکرا کاڵ منداڵەکەی تێدا دانابێت گەڕام وهیچی لێنەبوو، ئەوەبوو کاڵ ئەومنداڵەی لەوخانوەدا جێهێشتبووە کەبەکرێی گرتبوو، شاگرد باغەوانەکان شەوانە لەکۆشکی پاشەیەتیدا دەخەوتن وجێگای خەوتنی ئەمانە خانوێکی بچوکبوو وکەوتبۆ سوچی خوارووی باغەکەوە، زانیم کاڵ شەوانە لەوخانووەدا دەخەوێت، بۆئەوەی بتوانێت منداڵەکەی کلیۆپاترا برفێنێ، من بەبێ ئەوەی لەگەڵ کاڵدا بدوێم، دەمتوانی پێشبینی ئەوەبکەم چۆن هاتۆتەناو باغی پاشایەتی.

كاڵ كەلەسوپای میسردا ئەفسەرەو پلەی سەرتیپی هەیە بەڕێگای یەكێك لەخاوەن پلەكانی برادەری خۆی- یان یەكێك لەئەفسەرە گەورەكان، لەوانەیە لەڕێگای (لگات)ەوە واتە فەرماندەی ئەولەشكرەی كەئەو خزمەتی تێدادەكرد، بەلێپرسراوی باغەوانەكانی كۆشكی پاشایەتی گوتبێ یەكێك لەدۆستەكانی كاڵ دێت بۆلات بەباغەوانی قبوڵبكەو وەری بگرە، لێپرسراوی باغەوانەكانیش ئەم ڕاسپاردەیەی قبوڵكردبێت وهەمان ڕۆژ- یان ڕۆژێك دواتر كاڵ بەجلوبەرگی عادی، خۆی بەلێپرسراوی باغەوانەكان ناساندبێت وگوتبی من ئەوكەسەم كەبەتۆیان گوتبوو دەینێرین بالەكۆشكی پاشایەتیدا ببێت بەباغەوان، ئیتر كاڵ لەوڕۆژەوەی دەستی بەباغەوانی كردبوو تائەو ڕۆژەی من دیتم، لەكۆشكی پاشیەتیدا كارەكەرو نۆكەرەكان ودەست وپێوەندەكان ئاسایی بوو- كەقسەیان لەگەڵ باغەوانەكاندا كردبا، بەلاّم من ئەوڕۆژە كەكاڵم لەوێدابینی لێی نزیك نەكەوتمەوە، چونكە لەئەنجامی كارەكە دەترسام، ئەگەر من لەوگەنجە نزیكبوومایەوەو قسەم لەگەڵدا كردبان، دوای ئەوەی مەسەلەی گۆڕینی كوڕی كلیۆپاترا ئاشكرادەبوو، ئێمەیان ئەشكەنجەدەداو دەیانكوشتم، من كاڵم خۆشدەویست وحەزیشم نەدەكرد بكوژرێت، بەلاّم ئەو بەقسەی منی نەدەكردو دەیەوێت خۆی توشی مەترسی بكاتەوەو منیش نەمدەویست لەگەڵ كاڵدا خۆم گرفتاری مەترسی بكەمەوە.

من بیرم لەوە نەدەكردەوە بەكلیۆپاترا بڵێم كاڵ لەجلوبەرگی باغەوانیداو دەیەوێت منداڵەكەت ببات، چونكە ئەگەر ئەم قسەیەم بەكلیۆپاترا بگوتبا، كاڵ بەكوشتدەچوو ونەیاندەهێشت بەزیندویی بمێنێتەوە، ئەگەر خودی كلیۆپاتراش نەیویستبا بكوژرێت، ئەوامێردەكەی بەتڵیمۆس ئەوی دەكوشت، ئەگەر ئەمەشم بەكلیۆپاترا نەگوتبا ئەوا كاڵ منداڵەكەی شاژنی میسری دەبردو منداڵێكیتری لەجێگاكەیدا دادەنا، ئەومنداڵەش بەشێوەیەكی ئاشكرا دەناسرا كەمنداڵی كلیۆپاترا نییە، ئەو بێدەنگییەی من بەخیانەت لەقەڵەمدەدرێت، دوای ئەوەی منداڵەكەی شاژنی  میسر ڕفێندرا، من خۆم بەگوناهبار دەزانی، نەمدەتوانی ڕاستییەكەی بەكلیۆپاترا بڵێم ونەشمدەتوانی لەشاردنەوەی ڕاستییەكان خۆم ڕاگرم، لەلایەك كاڵ بەكوشتدەچوو، لەلایەكیش من خۆم بەگوناهبار دەزانی، لەنێوان ئەم دوو گرفتەدا، تەنها ئەوشتەی كەسێبووری پێدەبەخشیم ئەوەبوو كەهەركاتێك منداڵەكەی كلیۆپاترا ببرێت، تاوانێك نییە، چونكە ئەومنداڵە ڕۆڵەی كاڵە، نەك منداڵی بەتڵیمۆسی چواردەهەم.

ڕۆژی دواتر زوو لەخەوهەستام لەپەنجەرەی كۆشكی پاشایەتییەوە لەباغەكەم ڕوانی، بینیم كاڵ لەوێیە.

هەرچەندە كاڵ هەندێ دووربوو، بەلاّم من لەدرەوشاوەیی دەموچاوییەوە ناسیم خۆیەتی، ئەوئاگای لەمن نەبوو، زانیم سەرنج نەدانی كاڵ لەهۆدەكەی من لەئەنقەست نییە، چونكە ئەونەیدەزانی هۆدەكەی من لەكۆشكی پاشایەتیدا كەوتۆتە كوێ، لەوكاتەدا جگەلە كاڵ هیچ باغەوانێكیتر لەباغەكەدانەبوو، پێشموابوو جگەلە من كەسیتر لەناو كۆشكی پاشایەتیدا بەخەبەر نەبێت، بینیم پاش ئەوەی كاڵ هەندێ لەسەر زەویەكە ڕاكشا، هەستاو چوو لەگۆشەیەكی باغەكە لەژێر گیادا شتێكی هەڵگرت، زانیم ئەوشتەی هەڵی گرت، منداڵەكەبوو، دواتر بەهەنگاوی بەپەلەودرێژ بەرەو ئەوشوێنەهات كەمن لەوبەشەیدا بووم، كلیۆپاترا شاژنی میسر لەهەمان بەشی كۆشكی پاشایەتیدا دەخەوت، هەروەها دایانی منداڵەكەی كلیۆپاتراش لەوێدابوو.

من لەوهەڵەشەییەی کاڵ سەرم سوڕمابوو، چونکە دەیویست بچێتەژووری دایانەکەو ئەومنداڵەی پێیبوو لەگەڵ کوڕەکەی کلیۆپاترادا ئاڵوگۆڕی بکات، ئەگەر دایانەکە لەخەو بەئاگاهاتبایەوە- یان ئەگەر یەکێکیتر لەکۆشکی پاشایەتیدا بەخەبەرهاتبایەوەو کاڵی بینیبا، هاواری دەکردو ئەوکوڕە گەنجەیان دەستگیردەکرد.

تێگەیشتم کاڵ بۆچی ئەم کاتەی هەڵبژاردووە، چونکە لەکاتی شەودا کاتێ باغەوانەکان دەچنە ماڵ وئەو خانووەی کەبۆ پشودانی ئەوان لەسوچی باغەکەدا دروستکراوە- تابەیانی نەیاندەتوانی لەوماڵە بێنەدەرێ، بۆیە کاڵ نەیدەتوانی لەکاتی شەودا لەخانووەکە بێتەدەرێ ومنداڵی شاژنی میسر ئاڵوگۆڕ بکات، بەڕۆژیش هەموو ئەوانەی لەناو کۆشکی پاشایەتیدا بوون، بەخەبەربوون، ئەگەر کاڵ خەریکی گۆڕینی منداڵەکەبا هەموو دەیانبینی، کەواتە باشترین کات بۆ ئاڵوگۆڕکردنی منداڵەکە ئەمکاتە بوو، چونکە لەم کاتەدا دەرگاکەیان بۆ باغەوانەکان دەکردەوەو ئەوان دەیانتوانی بێنەژوورەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەوانەی لەناوکۆشکدا دەژیان، لەخەودابوون، ئەمەبوو کاڵ توانی خۆی لەژووری دایانەکە نزیکبکاتەوەو منداڵەکەی کلیۆپاترا ئاڵوگۆڕبکات.

کە کاڵ لەباغەکەوە هات وچووەناو ژووری دایانەکە، من ئەوم بینی لەچوونە ژوورەوەیدا، دوای کەمێك ئەوم بینی لەبینای کۆشکەکە چۆدەرێ وهەر منداڵێکی پێبوو، کاڵ بەپەلەکردن وپەشۆکاوی نەدەڕۆیشت تابێتەجێگای سەرنج وگومان، کاتێ دوورکەوتەوە دیتم منداڵەکەی خستەناو ئەوعەرەبانەی کەگیاو گوڵی بێکەڵکی پێدەبەنە دەرەوەی کۆشکی پاشایەتی، لەکۆشکی پاشایەتیدا عادەتوابوو باغەوانەکان پەلی وەریوو وشکوگیاو شتیتریان کۆدەکردەوەو دەیانخستەسەر عەرەبانەو بۆ دەرەوەی کۆشکی پاشایەتیان دەبردو دوای فڕێدانی خەڵکانیتر کەڵکیان لێوەردەگرت، کاڵ بەبەهانەی بردنەدەرەوەی ئەوگیاو چیلکەو چاڵەوە، منداڵەکەی بەعەرەبانەی دەستی لەناوکۆشکی پاشایەتیدا بردەدەرێ، من خۆم بەخۆم گوت، ئیتر کاڵ نابینمەوە، دوای ئەوەی کاڵ منداڵەکەی کلیۆپاترای برد، من ئەوەندە پەرێشانبووم نەمدەتوانی ساتێ تۆتکەبگرم، دەمزانی کاڵ منداڵی خۆی برد، بەڵام من خۆم بەبەرپرسیار دەزانی ودەمگوت دەبا من کلیۆپاترام لەوە ئاگاداربکردبایەوە کەکاڵ لەناو باغەکەدایەو ئەو مەبەستەی لەژێر سەردایە کەمنداڵەکەی ببات، بەڵام ئەگەر بەکلیۆپاترام گوتبایە، کاڵیان دەکوشت، منیش نەمدەویست ئەوگەنجە جوانە تێدابچێت.

لەهەموو میسردا گەنجێکی وەك کاڵ نەبوو، تەنانەت تائەمڕۆش کەوا من یادداشتەکانم دەنووسم، یەك پیاوی گەنجم نەدیتووە لەڕووی قۆزی و لەش ولارو جوانییەوە بەکاڵ بگات، حەیفبوو ئەوکوڕە بەهۆی ئەوەی من بەکلیۆپاترام گوتبا ئەو منداڵەکەی گۆڕیوی، بەکوشت چووبا.

دوای ئەوەی کاڵ ڕۆیی من گوێی خۆم هەڵخست بۆئەوەی بزانم دەنگی گریانی منداڵدێت- یان نا؟ بەڵام من گوێم لەدەنگی گریانی منداڵ نەبوو هەتا دایانەکەی بەخەبەرهات، هەرکاتێ دایانەکە بەخەبەربا من دەمزانی، چونکە دەنگ لەوژوورەوە دەهات، دایانەکە هەر کەلەخەو هەڵدەستا بەرەو لانکەکە دەچوو بۆئەوەی شیربدات بەمنداڵەکە.

ئەو ڕۆژەش وەك ڕۆژانی ڕابردوو چوو بۆلای لانکەکە، منیش لەهۆدەکەی خۆم هاتمەدەرێ وچوومەناو باغەکە، بۆئەوەی بەبەهانەی پیاسەکردنەوە ناوژووری دایانەکە ببینم وبزانم دوای بینینی ئەومنداڵە

تازەیە، چیدەکات، ئایا دەزانێت منداڵی کلیۆپاترا گۆڕدراوە؟ ئایا ئەومنداڵە شیرەخۆرە مەمکی دایانەکە دەگرێت بۆشیرخواردن- یان نا؟

من دەمزانی ئەو جلوبەرگەی کاڵ لەبەر ئەومنداڵەی کردووە لەجۆری کەتانە، کەجلوبەرگی سادەی میسریانە، بەڵام دەوڵەمەندەکان کەتانی دەرەجە باش دەکڕن، تەنها دەستکورتەکان لەوکەتانە هەرزانە دەکڕن، جلی منداڵەکەی کلیۆپاتراش لەقوماشی کەتانی باشبوو.

من کەلەناو باغەکەدابووم، بینیم دایانەکە منداڵەکەی لەلانکەکە دەرهێناو لەباوەشیکرد هەتاشیری بداتێ، کاتێ منداڵەکەی لەباوەشکرد هیچ نیشانەیەك بەهەڵسوکەوت وڕوخساری دایانەکەوە دیارنەبوو- بەوەی هەستبکات منداڵەکە گۆڕدراوە، کاتێ مەمکی خۆی خستەناو دەمی منداڵەکەوە هیچ گۆڕانکارییەك لەسیمای دایانەکەدا بەدیارنەکەوت وزۆر ئاسایی بوو، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند منداڵەکە مەمکی دایانەکەی گرتووەو خەریکی شیرخواردنە.

من سەرم لەدەبەنگی ئەوژنە سوڕمابوو وپێموانەبوو ئەوژنە ئەوەندە کەمهۆشبێت، بەڵام خۆم بەخۆم گوت، دایانەکە نەیزانی منداڵەکە گۆڕدراوە، بەڵام کلیۆپاترا ژنێکی ژیرو وریایە، دەزانێت منداڵەکە گۆڕدراوە.

لەکۆشکی پاشایەتیدا عادەتوابوو نیوەڕۆیان دایانەکە منداڵەکە بەباوەشیەوە بگرێت وبۆلای دایك وباوکی ببات وکلیۆپاتراو مێردەکەی هەندێ لەگەڵ منداڵەکەدا گاڵتەوگەپیان دەکردوو دواتر دایانەکە منداڵەکەی دەبردەوە ژوورەکەی خۆی ولەلانکەی دەنا، بۆئەوەی بخەوێت، ئەوڕۆژەش لەکاتی دیاریکراودا دایانەکە منداڵەکەی لەباوەشکردوو بردی بۆلای کلیۆپاتراو پاشای میسر، بەتلیمۆسی چواردەهەم ئەوڕۆژە لەکۆشکی پاشایەتیدا نەبوو، چووبوو بۆدەم ڕووباری نیل تاڕاوی مەلی دەریایی بکات، هەرکە دایانەکە کەوتەڕێ من خۆم گەیاندە ژوورەکەی کلیۆپاتراو لەگەڵ دەست وپێوەندەکانی تری ئەوێدا ڕاوەستام، پێشئەوەی دایانەکە بگاتەژووری کلیۆپاترا، منداڵەکە بەخەبەرهات ودەستیکرد بەگریان جا لەبرسانبوو- یان نەخۆش ولەئازاری شوێنێکی، کلیۆپاترا گوتی منداڵەکەی من ئەمڕۆ سەیردەگریەت، پێموایە نەخۆشەو نەخۆشی دەنگی گۆڕیوە.

دایانەکە پێشئەوەی منداڵەکە بگەیێنێتە کلیۆپاترا، مەمکی خستەناو دەمی منداڵەکەوە، منداڵەکە ئارام بۆوەو خەریکی شیرخواردنبوو، هەتا لەوکاتەشدا دایانەکە نەیزانی کەمنداڵەکەی کلیۆپاترا نییە، دوای ئەوەی منداڵەکە دەمی لەشیرەکە کردەوە سەیرێکی دەوروبەری کردوو لەئێمەی ڕوانی- لەمانەش کلیۆپاتراش.

- کلیۆپاترا منداڵەکەی لەدایانەکە وەرگرت، پێشئەوەی سەیری دەموچاوی بکات، گوتی: سەیرە منداڵەکەی من سەنگی سوکبووە، دوای ماوەیەك دوای ئەوەی بەسەرنجەوە لەمنداڵەکە ووردبۆوە سەرسامبوو وڕوویکردە دایانەکەو گوتی، ئەم منداڵە کێیە؟

- دایانەکە گوتی: خاتوونی من ئەم منداڵە ڕۆڵەکەی تۆیە.

- کلیۆپاترا گوتی: بۆ دایا تۆ جگەلە منداڵەکەی من، ئاگاداری منداڵی تریش دەکەیت؟

- دایانەکە گوتی: نەخێر خاتوونی من.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر جگەلە کۆرپەکەی من کۆرپەی ترت لانین، بۆ ئەمڕۆ ئەم منداڵەت بۆلای من هێناوە؟ چونکە ئەم منداڵە هی من نییەو لەکۆرپەکەی من بچوکترە؟

– دایانەکە بەسەرسوڕماویەوە گوتی: خاتوونەکەی من ئەوقسەیە مەکە، چۆن دەبێت من لەبری کوڕەکەی تۆ کەشەو ورۆژ لای خۆمە، منداڵێکیتر بۆ تۆ بێنم؟ من چۆن دەتوانم منداڵێکیتر پەیدابکەم ولەکن خۆمدا گەورەی بکەم وبۆلای تۆشی بهێنم؟ ئەومنداڵە رۆڵەی تۆیە، ئەوەی کەهەموو رۆژێك لەباوەشت دەکرد، من نازانم ئەمڕۆ بۆدەڵێیت ئەوە منداڵی خۆت نییە؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئەمڕۆ بۆیە دەڵێم منداڵی من نییە، چونکە هەموو شتێکی جیاوازە لەگەڵ منداڵەکەمدا.

سەیرکە... ئەومنداڵە هۆگری من نییەو نام ناسێت، لەکاتێکا رۆژانیتر کاتێ دەهاتەناو باوەشی منەوە، هەردوو دەستی بەرەو روخساری من درێژ دەکردو پێدەکەنی، بەڵام ئەم منداڵە نەدەستی رادەدێرێت ونەپێش دەکەنێت، ئەم جلوبەرگەی کەلەبەر ئەم منداڵەشدایە لەکەتانی عادی دروارە، بەڵام جلەکانی کوڕەکەی من کەلای تۆیە لەقوماشی دەرەجە یەکە، وەرەپێشێ سەیرکە ئەوقوماشەی لەبەر ئەم منداڵەیە، چۆنە، ئایا دەشێ من قوماشی ئاواخراپ لەبەرمنداڵەی خۆم بکەم؟

دایانی منداڵەکە هاتەلای کلیۆپاتراو سەیری ئەو قوماشەی کرد کەلەبەر منداڵەکەبوو وباوەڕی کرد کەقوماشی عادیە.

لەوکاتەی کلیۆپاترا خەریکی قسەکردن بوو لەگەڵ دایانەکەدا، براکەی بەتلیمۆسی چواردەهەم لەڕاوی دەریایی گەڕایەوە، – هەرکە منداڵەکەی لەباوەشی کلیۆپاترا بینی، لێی نزیکبۆوەو خۆی نەوی کرد بۆسەر منداڵەکە، ئەویش لەبینینی منداڵەکە سەری سوڕماو گوتی: بۆچی کۆرپەکەی ئێمە ئاوای لێهاتووە؟

– کلیۆپاتراش گوتی: منیش لەگەڵ دایانەکەدا سەبارەت بەمە قسەدەکەم ودەمەوێت تێیبگەیەنم ئەم منداڵە هی ئێمە نییەو یەك منداڵی کەی بۆمن هێناوە، بەڵام دایانەکە باوەڕ بەقسەی من ناکات.

من تێبینم کرد کلیۆپاترا نەپەشۆکاوە، چونکە وایدەزانی دایانەکە بەهەڵەداچووەو منداڵی یەکێك لەنیشتەجێبوانی کۆشکی پاشایەتی هێناوە، پاشای میسریش هەمان بۆچوونی هەبوو، گومانی ئەوەیاندەکرد دایانەکە لەهێنانی منداڵەکە بەهەڵەداچووە، هیچ یەك لەمدووانە پێیانوانەبوو منداڵەکە ئاڵوگۆڕکراوە، کلیۆپاترا بۆئەوەی بەدایانەکەی بسەلمێنێت کەبەهەڵەداچووە، جلەکانی لەبەرداکەندو لەشی منداڵەکەی نیشانی دایانەکەداو گوتی: تۆ بۆخۆت دەزانی منداڵەکەی من لێرەدا خاڵی پێوەیە، بەڵام ئەم منداڵە ئەونیشانەیەی پێوەنییە.

ئینجا دایانەکە بەوەی ژنێکی کەمهۆشبوو، باوەڕی بەقسەی کلیۆپاتراکرد، دایانەکە هەموو رۆژێ منداڵەکەی دەشت وجلەکانی دەگۆڕی، ئەوخاڵەی بینیبوو، بەڵام ئێستا لەوشوێنەدا خاڵی لەسەر پێستی منداڵەکەدا نەبینی، ئەوکاتە کەوتە بیری ئەوەی بەهەڵەداچووەو منداڵێکیتری لەبری منداڵەکەی کلیۆپاترا هێناوە، ئەومنداڵەی لەباوەشی شاژنی میسر وەرگرت ورۆیشت بۆئەوەی منداڵە ئەسلیەکە بهێنێتەوە.

من بەدوای دایانەکە نەکەوتم، تابزانم کاتێ چۆتەناو هۆدەکەی خۆی چیکردووە، چونکە دەمزانی لەهۆدەکەیدا هیچی تێدانییەو لانکەکە بەتاڵەو تەنها هەرئەو منداڵەیە کەلە ئامێزی شاژندایە، بەمشێوەیە پاش ماوەیەك گەڕایەوەو بەپەشۆکاوی بەکلیۆپاترای گوت: خاتوونی من هیچ منداڵێکیتر لەژوورەکەی مندانییە تالەگەڵ منداڵەکەی تۆدا بەهەڵە هێنابێتم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا ژوورەکانیتر گەڕایت، بەڵکو منداڵەکەی من لەوێدابێت؟

– دایانەکە گوتی: خاتوونی من ئێستا دەڕۆم دەگەڕێم، دوای ئەوەی دایانەکە بەخۆی وئەومنداڵەی کەبەبەر باوەشییەوە بوو، ڕۆیی.

– کلیۆپاترا بەمنی گوت: شرمیون دایانێکی گێژە، بەڵام تۆ یەك کچی ژیری بڕۆبگەڕێ بزانە منداڵەکەی منیان بۆکام ژوور بردووە، بۆجێبەجێکردنی فەرمانی شاژن، ناچار لەژوورەکە چوومەدەرێ ودەشمزانی گەڕانەکەم بەخۆڕاییە، کلیۆپاترا بەوەفریویخواردووە کەمنداڵەکەی ئەو بەهەڵە براوە، مەحاڵە هیچ دایکێك بەهەڵە منداڵێك لەژوورێکیتر دەربهێنێت وشیری بداتێ، خۆئەگەر بەهەڵەشدابچێت، بەزویی پەی بەهەڵەکەی خۆی دەبات و ئەومنداڵەی لەوژوورەوە هێناویەتی دەیباتەوە جێگاکەی خۆی.

گەڕانی دایانەکە بەخۆڕایی بوو، منداڵەکەی کلیۆپاترای نەدۆزیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دڵنیابوونەوە، کلیۆپاترا فەرمانی دەرکرد هەرچی منداڵی شیرەخۆرە لەناوکۆشکی پاشایەتیداهەیە، بۆلای ئەوی بهێنن، تاکو ئەوانە سەیربکات و لێیان بڕوانێت داخوا کۆرپەکەی ئەو لەگەڵ ئەومنداڵانەیە– یان نا؟ هەموو منداڵە شیرە خۆرەکانیان هێنان بۆلای شاژنی میسر.

کلیۆپاترا یەك بەیەك سەیریکردن، بەڵام منداڵەکەی خۆی نەدۆزییەوە.

ئەوکاتە کلیۆپاترا ومێردەکەی زانیان منداڵەکەیان ئاڵوگۆڕپێکردووە، منداڵەکەی ئەوانیان بردووەو ئەم کۆرپەیەیان لەجێگای ئەودا داناوە، براکەی کلیۆپاتراو باوکی منداڵەکە، بانگی دایانەکەیانکردو لێیان پرسی، دوێنێ شەو خەریکی چیبووەو چ کاتێك ئەومنداڵە شیرەخۆرەی خۆیان خەوتووە؟ دواتر لەئەوی پرسی بەیانی چ کاتێك لەخەو بەئاگاهاتووەو شیری بەمنداڵەکە داوە؟

– دایانی منداڵەکە جگەلە گەمژەیی هیچ گوناهێکی تری نەبوو، ڕاستییەکانی گێڕانەوەو سوێندی بەخوکانخوارد کەنەیزانیوە منداڵەکەیان گۆڕیوە، تاخۆرئاوای ئەو ڕۆژە خەریکی لێکۆڵینەوەبوون بۆئەوەی بزانن منداڵەکەی پاشاو شاژن لەڕێگای کێوە ئاڵوگۆڕکراوە، لەولێکۆڵینەوانە هیچ ئەنجامێکیان دەستنەکەوت، سبەی بەیانی پاشای میسر فەرمانی دەرکرد لەئەسکەندەریەدا جاڕبدەن منداڵی پاشای میسرو کلیۆپاترا گۆڕدراوە هەرکەسێك ئەوکارەی ئەنجامداوە بدۆزێتەوەو شوێنی منداڵەکە بزانێت، هەزار بەتلیمۆسی[65] خەلات دەکرێت.

65– یەك بەتلیمۆس: دەکاتە دوو مسقاڵ ونیو (زێڕ) کەئەوکات گەورەترین پارەی میسری بووە.(و– کوردی)

یەك بەتلیمۆس کەدوو مسقاڵ بوو، هەزار بەتلیمۆس پارەیەك بوو زۆر لەهاوڵاتییانی ئەسکەندەرییە بەدرێژایی تەمەنی خۆیان پارەی ئاوازۆریان بەجارێك نەدیبوو، مەگەر لەدووکانی زێڕینگەرەکاندا، من

دڵنیابووم ئەگەر لەئەسکەندەریەدا کەسێك بیزانیبا کاڵ ئەومنداڵەی پاشای گۆڕیوەو منداڵێکیتری لەجێگای ئەودا داناوە، دەیاندۆزییەوەو دەیانهێنا بۆئەوەی هەزار بەتلێموۆسەکەیان دەستبکەوێت، چونکە ئەوکەسە بەهەزار بەتلێموۆس دەیتوانی بەهەموو ئارەزووەکانی خۆی بگات، بەڵام من نەمدەتوانی ناوی کاڵ بدرکێنم، چونکە خۆشمدەویست، جگەلەمەسەلەی خۆشەویستیش، ئەگەر ناوی کاڵم هێنابا، دەبوو پێشئەوەی ناوبراو ئەوکارە ئەنجامبدات من ئاگادارم کردبانەوە، بۆیە نەك هەزار بەتلێموۆس زێڕیان بەمن نەدەدا، بەڵکو بەتوندترین سزا منیان دەکوشت، کەواتە بەرژەوەندی من لەوەدابوو بێدەنگبم وتەماعی هەزار بەتلێموۆسی زێڕ فریوم نەدات.

لەوکاتەی جارچیان لەناوشاردا جاڕیان دەداو دەیانگوت هەرکەسێك ئەوکەسە بدۆزێتەوە کەمنداڵەکەی پاشای ئاڵوگۆڕ پێکردووە، پاداشتی پاشا وەردەگرێت، کلیۆپاترا بانگی منی کرد، کاتێ کەچوومەلای شاژنی میسر، دڵنیابووم ئەو سەبارەت بەڕفاندنی منداڵەکەی قسەم لەگەڵدەکات، چوومەناو ژوورەکەی کلیۆپاتراوەو بەئامادەیی چاوەڕێی فەرمانەکانی راوەستام.

– شاژن لەژوورەکەی خۆیدا بەتەنهابوو، پێشئەوەی دەست بەقسەبکات، سەیری دەرگاکەی نێوان ژووری خۆی وبراکەی کرد داخوا داخراوە، دواتر گوتی: شرمیون تۆ جیاوازیت لەگەڵ کارەکەرەکانیتری کۆشکی پاشایەتیدا هەیە، تۆ کارەکەری تایبەتیمی، ئەوانیتر ژنێکن نەخوێندەوارو نەزان، بەڵام تۆ بەقەت من خوێندەواری وزانیاریت هەیە، بۆیە هەندێك شت باش تێدەگەیت کەئەوانیتر تێی ناگەن، چونکە کەسێکی ژیری، من لەتۆ دەپرسم، بۆچوونی تۆ سەبارەت بەدزینی منداڵەکەی من چییەو کێ کۆرپەکەی منی بەمنداڵێکیتر ئاڵوگۆڕکردووە؟

– گوتم: من چۆن بزانم ئەوەی منداڵەکەی تۆی گۆڕیوە کێیە؟

– کلیۆپاترا گوتی: شرمیون بیربکەرەوە داخوا گومانت لەکێ هەیە؟

– گوتم: ئەی خاتوونی من لەدوێنێ شەوێوە کەئاشکرابووە منداڵەکەی تۆیان گۆڕیوە، سەبارەت بەمە زۆر بیرم کردۆتەوە، بەڵام نەگەیشتومەتە هیچ ئەنجامێك ونەمتوانی تێبگەم دزەکە کێیەو بۆچی ئەومنداڵەی ئاڵوگۆڕکردووە، ئەگەر مەبەستی دزەکە ئەوەبووبێت ئیترپاشای میسر جێنشینی نەبێت، بۆ لەجێگای ئەو منداڵەدا کوڕێکی کۆرپەی تری داناوە؟

– کلیۆپاترا گوتی: چونکە تۆ یەك ژیری وپەییت بەوخاڵە بردووە، ئەوکەسەی ڕۆڵەکەی منی بردووە مەبەستی سیاسی نەبووەو حەزی نەکردووە کەجێنشینی تاجی پاشایەتی میسر بکوژرێت، بۆئەوەی پاشاو وڵاتی میسر بێجێنشین بمێنێتەوە، بەڵکو شتێکیتر بۆتەهۆی ئەوەی ئەومنداڵە ئاڵوگۆڕبکات.

– گوتم خاتوونەکەم: ئەگەر منداڵەکی تۆ کوڕێکی گەورەبا، ئەواپێشبینی ئەوەمدەکرد بۆ فرۆشتن بردبیان، بەڵام منداڵەکەی تۆ تائێستاش شیرەخۆرەیەو منداڵێکی شیرەخۆرەش کەس نایکرێت، هەتا ئەوانەی منداڵیشیان نییەو حەزدەکەن منداڵێك بەڕۆڵەی خۆیان قبوڵبکەن وبەخێوی بکەن، هەروەها لەم وڵاتەدا ئاوی نیل سەرچاوەی منداڵی شیرەخۆرەیەو هەرکەسێك بیەوێت منداڵێك هەڵبگرێتەوە، دەچێت بۆ دەم ڕۆخی ڕووباری نیل ولەوێدا دەوەستێت وئەوەڵین منداڵی کەبەبەردەمیدادێت لەسەر ڕووی ئاوەکە دەیگرێتەوەو بەڕۆڵەی خۆی لەقەڵەمدەدات وگەورەی دەکات.

سەر ئەنجام گەیشتە ئەوقەناعەتەی ئەوکەسەی منداڵەکەی دزیوە، مەبەستی دوژمنایەتی بووەو ویستویەتی تۆڵەبکاتەوە، بەڵام ئەم بیرۆکەیە لاوازە، چونکە ئەگەر دزەکە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە بوبێت، ئەوا بێئەوەی منداڵێکیتر جێبێڵێت لەجێگاکەیدا، منداڵەکەی تۆی دەبرد، بۆئەوەی دڵت بسوتاباو لەونبوونی منداڵەکەت دووچاری غەم وپەژارە بووبای، بەڵام ئەوەی منداڵەکەی بردووەو یەکێکیتری لەبری داناوە، مەبەستی ئەوەبووە تۆهەستی پێنەکەیت و وابزانی هەمان منداڵی خۆتەو دڵخۆشبیت لەبینینی منداڵەکەت.

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ شرمیون ئەوەی منداڵەکەی دزیوە مەبەستی دوژمنایەتی نەبووە، تەنانەت لەوانەیە وای بیرکردبێتەوە ئەوکارەی ئەودەیکات، بۆ تۆڵەو ڕکەبەرکردن نییە، لەوانەیە ئەوکارەی خۆی بەشتێکی باش زانیبێت، بەڵام بەلای منەوە تاوانێکە قابلی بەخشین نییە.

دواتر شاژنی میسر وەك ئەوەی بیری چووبێتەوە من لەوێم، لەبەرخۆیەوە دەستیکرد بەقسەو گوتی: ئەمەیە سەرئەنجامی دەستگیرۆیی کەسانی بەرەڵلاو ناکەس بەچە، پیاوێك کەچەندان ساڵ لەزەلیلیدا ژیان بەسەردەبات وناچارە بۆپەیداکردنی بژێوی خۆی، دەست بۆ دزێوترین کارببات، ئەو پیاوە بەڕێکەوت دەبێتەجێگای سەرنجی یەك شاژن- یان شازادەخانمێك، ئەو شاژنە- یان شازادە خانمە، دەستی ناوبراو دەگرێت وئەولەسەر زەوی هەڵدەگرێتەوەو دەوڵەمەندی دەکات ودەیگەیەنێتە پلەوپایە، بۆئەوەی هەوەسی خۆی پێسێبوری بکات و زەوقی خۆی پێبشکێنێ، شەوێك- یان چەند شەوێك لەژوورەکەی خۆیدا پێشوازی لەوپیاوە دەکات وبەهۆی گرنگی پێدانی ئەوشازادە خانمەوە لەنەبوونەوە دەیگەیەنێتە بوون، چونکە چەند شەوێکی لەگەڵ ئەودا بەسەربردووە خۆی بەشازادە- تەنانەت بەرکەبەری ئەو دەزانێت و وابیردەکاتەوە چی پێخۆشبێت دەتوانێت لەشازادە خانمەکەی بکات، بۆ ئەگەر پیاوێك شەوێك- یان چەند شەوێکی لەگەڵ شازادە خانمێکدا بەسەربردو لەگەڵیدا خەوت، مافی دەکەوێتەسەر ئەو؟ کەئەوپیاوەش لەکەسانی ڕەشۆکی خەڵکبێت، نەك لەشازادەکان، بۆ خۆ خواکان شاو شازادەکانی میسریان لەکانزایەك دروستکردووە کەجیایە لەوماددەی خەڵکی عادی لێدروستکراوە؟

یەك شازادە خانمی میسری سەبارەت بەمیللەتەکەی خۆی وەك خوا وایەو هەرپیاوێکی بینی دەتوانێت بیکات بەدۆستی خۆی وئەوپیاوە دەبێ مەمنونبێت کەبۆتەجێگای سەرنج وگرنگی پێدانی شازادە خانمێك، بەڵام خەڵکی ڕەشۆکی کەم عەقڵ، هەرکەشەوێك لەگەڵ شازادە خانمێکدابوون وابیردەکەنەوە بوونەتە مێردی ئەو ودەتوانن ڕای خۆیان بەسەرئەودا بسەپێنن، من حەق بەخوای جوانی دەدەم کەهەموو سپێدەیەك مەعشوقەی ئەوشەوەی خۆی دەکوژێت، چونکە پێشبینی ئەوەی دەکرد، ئەوکەسە دەبێتەهۆی هەراسانکردنی.

لەوکاتەی کلیۆپاترا لەگەڵ خۆیدا دەدوا، من سەرم داگرتبووە خوارێ و وامنیشاندەدا ئاگام لەقسەکانی شاژن نییە.

شاژنی میسر بەردەوامبوو لەقسەکردن لەبەرخۆیەوەو گوتی: ئەی کوڕەکە، جوانی تۆ وەك گەوهەرێکوابوو کەمامەڵەچییەك بۆ وڵاتی ڕەشپێستانی ببات ولەوێدا ئەوگەوهەیە هیچ بەهایەکی نابێت، ئەوجوانییەی تۆ لەمیسردا کڕیاری نەبوو، لەشوێنی تریش کڕیاری نەبووە، چونکە ئەگەر جوانییەکەی

تۆ کڕیاری هەبایە، نەدەهاتی بۆمیسرو لەوولاتانەدا دەمایەوەو لەوێ دەژیای، جوانی کاتێ نرخی دەبێت کەکڕیاری هەبێت، هەروەك چۆن گەوهەر کاتێ بەنرخ دەبێت کەکڕیارێك ئامادەبێت بیکڕێت.

ئەوە من بووم کڕیاری جوانییەکەی تۆبووم وبەتۆم نیشاندا جوانییەکەت نرخی هەیە، بەبێ من تۆهەمان ئەوکوڕە گەنجە بێناونیشانەبووی کەهەبوویی ودەبوا تاکۆتایی تەمەنی خۆت لەباغی گیانلەبەراندا خزمەتکاری گیانلەبەران بوای وجارجارەش عەرەبانەت لێخوڕیباو وریابای لەوەی عەرەبانەکەت وەرنەگەڕێت وشێرە دڕندەکان نەتخۆن.

دوای ئەم قسانە کلیۆپاترا سەری وەرسوڕاندو گوتی: شرمیون ئایا تۆ دەتوانی پێشبینی ئەوەبکەی کێ منداڵەکەی دزیوە؟

– گوتم: نەخێر ئەی خاتوونەکەم.

– گوتی: بەڵام من ئەوەی منداڵەکەمی دزیوە دەیناسم ودەزانم کێیە.

– گوتم: ئەوەی منداڵەکەی تۆی دزیوە کێیە؟

– کلیۆپاترا گوتی: منداڵ دزەکەی من کاڵە، ئەفسەری سوپایەو لەلەشکری ئەسکەندەریەدایە، کەلێپرسراوێتی ئەو لەشکرەم لەئەستۆدایە.

– ویستم لەکلیۆپاترا بپرسم بۆچی ئەومنداڵەکەی تۆی دزیوە، بەڵام زمانی خۆم گەست ولەجیاتیان گوتم: خاتوونەکەم ئایا دڵنیای کەدزی منداڵەکەی تۆ کاڵە؟

– کلیۆپاترا گوتی: سەبارەت بەمە هیچ گومانێکم نییە، بەڵام نازانم ئەوچۆن توانیویەتی خۆی بەکۆشکی پاشایەتی بگەیەنێت، ئایا دەزانی بۆچی قەدەغمکرد کاڵ بێت بۆکۆشکی پاشایەتی؟

چونکە براکەم خەریکبوو لەئەو بکەوێتە گومان، جگەلەمەش خۆم ڕقم لەبەرامبەر کاڵدا پەیداکردبوو، چونکە خۆی بەزڵدەزانی ونازی لەسەردەکردم.

ئینجا کلیۆپاترا درێژەی بەقسەکەیداو گوتی: شرمیون من بۆیە تۆم بانگکردووە تاکارێکی گەورەت پێسبپێرم، لەنێوان ئەوکەسانەی لەکۆشکی پاشایەتیدان، جگەلە من هیچ کەس بەقەت تۆ لەگەڵ کاڵدا ئاشنایەتی نەبوو، من دەمزانی هەرجارەی کاڵ دەهات بۆکۆشك تۆخۆت لەنەو نزیك دەکردەوەو لەگەڵیدا دەدوای.

– گوتم: چونکە بینیم کاڵ بۆتەجێگای سەرنجی تۆ، منیش تێبینیم کردوو ڕێزم بۆ ئەو دادەنا.

– کلیۆپاترا گوتی: شرمیون باوەڕت پێدەکەم هەرکەسێکی بووەجێگای گرنگی پێدانی من، تۆ بەڕێزەوە سەیری دەکەیت، بەڵام پێشنەوەی کاڵ لەگەڵ مندا ئاشنایی پەیدابکات تۆبەسەرنجێکی تایبەتییەوە لەئەوت دەڕوانی و بۆساتێ ڕووت لەئەو وەرنەگێڕا، من لەمبارەوە سەرزەنشتی تۆناکەم، چونکە دەزانم تۆ ژنێکی خوێندەواری وخاوەنی زانیاریت ودەتوانی جوانی لەپیاواندا تێبینی ودیاری بکەیت، کارەکەرەکانی من ناتوانن جیاوازی لەنێوان قەدوباڵای کرێکارێکی بەندەرو پیاوێکی لەنەژادی یۆنانی بێت بکەن وهەردووکیان بەپیاو دەزانن، ئەگەرئەوان سەرپشك بکەن لەهەڵبژاردنی هاوسەری خۆیان، ئەواکرێکارێکی بەندەریان دەوێت، چونکە بەهۆی نەبوونی زانیاری ونەخوێندەواری ونەبوونی زەوقێکی باش، ناتوانن پەی بەجوانی پیاوان ببەن، هەتا لەوەش دەترسن ئەوان بەدرێژایی تەمەنی خۆیان لەدەوروبەرێکدا ژیاون کەهەموو پیاوەکانی دزێون وناشرینن، پێیانوایە پیاوێکی جوان وەك

جانەوەرێکوایە، بەڵام تۆ خوێندەواریت هەیەو زەوقێکی جوانت هەیەو جوانناسی وتوانیت پەی بەقۆزی کاڵ ببەیت وتوانیت لەوچێژو لەزەتەی سیماولەش ولاری کاڵ بگەیت کەلای پیاوانیتر نییە، من سەرنجدانی تۆ لەبەرامبەر کاڵدا بەشتێکی باش وتێبینییەکی جوانی تۆ دەزانم، نەك بەکەموکوڕیت، چونکە تێدەگەم تۆ وەك کارەکەرەکانیتر نەزان وبێئاگابای تێبینی جوانی کاڵت نەدەکرد، بەڵام ئەوئیشەی دەمەوێت بەتۆی بسپێرم، بۆئەوەی ئەنجامی بدەی، ئەوەیە بڕۆی کاڵم بۆبدۆزیەوەو منداڵەکەمی لێوەرگریتەوەو بۆمنی بهێنیتەوە، چونکە بۆخۆم ناتوانم ئەمکارە بکەم، لەبەرئەوەی ناسراوم وخەڵك چاودێریم دەکات، ئەگەر بۆ دۆزینەوەی کاڵ بچم بۆسەردانی لەشکرەکە، ئەوادەبمەجێگای سەرنج ولای ئەوانەی وێ پرسیارێك دروستدەکات. ئەگەر کاڵ لەوێ نەبێت ئەوادەبێ لەمشارەدا شوێنی نیشتەجێ بوونەکەی بدۆزینەوە، ئەمکارەش بەمن ناکرێت ومن ناتوانم لەشەقامەکانی شاردا لەمولەو بپرسم ماڵی کاڵ، ئەفسەری سوپا لەکوێیە ؟ بەڵام تۆ دەتوانی بۆ دۆزینەوەی ئەوبچیت بۆلەشکری ئەسکەندەرو ئەگەر لەوێ نەتدۆزییەوە ئەوا لەمشارەدا بگەڕێیت وبپرسی ماڵی کاڵ لەکوێیە؟

– بەکلیۆپاترام گوت: ئەی کەکاڵ لەمیسر چوبێتەدەرێ چی؟ چونکە ئەگەر ئەمەم گوتبا کلیۆپاترا تێدەگەیشت من پێشئەوەی منداڵەکەی ببرێت ئەو واقیعەم زانیوە، هەرجۆرە قسەکردنێکی من سەبارەت بەماڵی کاڵ، جۆرە گومانێکی دروستدەکردو شاژن تێبینی دەکرد کەمن لەمەسەلەی دزینی منداڵەکەی ئەو، زانیاریم هەبووەو بەئەوم نەگوتووە، هەر کاتێ کلیۆپاتراش ئەمەی زانیبا ئەوامنی لەناودەبرد، چونکە من شاژنی میسر بەباشی دەناسم ودەزانم ئەو لەهیچ شتێك بەقەد خیانەت، دەهری نابێت وهەرکەسێك خیانەتی لەگەڵکردبا دەیکوشت.

– گوتم: زۆرباشە خاتوونەکەم.

– کلیۆپاترا گوتی: پێشئەوەی درەنگبکات بکەوەڕێ وسەرەتا بچۆ بۆدەمەنهور– سەربازگەی ئەسکەندەرو بزانەداخوا کاڵ لەوێیە– یان نا؟ ئەگەر کاڵت بینی بەئەوبڵێ وتێیبگەیەنە کەپێویستە منداڵەکەت بداتەدەست، پێویستە تۆ بەشێوەیەك لەگەڵ کاڵدا بدوێیت کەنەتوانێت نوکڵی لەڕفاندنی منداڵەکەبکات، من ئەم بەشە بەهۆش وژیری تۆ دەسپێرم، دەبێ تۆ بەشێوەیەك لەگەڵ کاڵدا قسەبکەیت نەیەڵی نوکڵی لەمنداڵەکەبکات بەوەی لای خۆیەتی، خۆ زۆریش باشدەبێت کەبیبینی، شرمیون ئەگەر تۆ ئەمکارە بۆمن بکەیت وسەرکەوتووبیت، ئەو پاداشتەت پێدەدەم، واتە هەزار بەتڵیمۆس.

پێمخۆشبوو لەشاژنی میسر بپرسم ئەگەر کاڵ منداڵەکەی دامەوەو دواتر چی لەئەو دەکەن؟ بەڵام دووبارە بێدەنگیم پێباشتربوو، چونکە ئەم پرسیارەشم لەوانەبوو کلیۆپاترا بخاتە گومانەوەو سەری سوڕبمێنێت لەوەی بۆچی من دەپرسم داخوا کاڵ چ سزایەك دەدرێت.

## ئاکامە تراژیدییەکەی کۆڕپەی کلیۆپاترا

من دەمزانی ئەوکارەی کلیۆپاترا بەمنی سپاردووە سەرئەنجامی نابێت، دڵنیابووم کاڵ لەسەربازخانەی دەمەنهور نییە، هەروەها لەماڵەکەشیدا نییە، خۆئەگەر لەوێش لەئەسکەندەریەش بووبێ دوای ئەوەی گوێی لەجارچیان بووە هەڵاتووە، چونکە زانیویەتی کلیۆپاترا بەئاڵوگۆڕکردنی منداڵەکەی زانیوە.
گەروانەبا لەوانەبوو کاڵ نەیزانیبا کلیۆپاترا بەگۆڕینی منداڵەکەی زانیوەو لەئەسکەندەریەدا مابایەوە، بەڵام دوای ئەوی جاڕیاندا کەمنداڵی پاشا ئاڵوگۆڕکراوەو فێڵەکەی ئەو ئاشکرابووە، هەڵاتووە، ئەگەر کاڵ لەمیسر چووبێتەدەرێ ئەوا من نەمدەتوانی منداڵەکەی کلیۆپاترا بدۆزمەوە، خۆئەگەر لەناو میسریشدا مابێت، هەر نەمدەتوانی منداڵەکەی لێبستێنمەوەو بۆشاژنی میسری ببەمەوە، چونکە دەمزانی کاڵ منداڵەکەی خۆی ناداتەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا بۆئەوەی فەرمانی شاژن جێبەجێ بکەم، چووم بۆسەربازخانەی دەمەنهورو لەوێدا سۆراغی ئەوم پرسی.
ئەو پێشبینییەی کردبووم ڕاست دەرچوو وبەمنیان گوت: مۆڵەتی وەرگرتووە تاکۆتایی بەئیجازەکەی تەیەت، نایەتەوەو چاوەڕوانی ئەوەمەکە بۆسەربازخانە بێتەوە، کاڵ بەمنی گوتبوو کەلەئەسکەندەریەدا خانوێی گرتووەو ئەومنداڵەی لەڕووباری نیلی گرتبۆوە، لەوێ جێهێشتبوو، بەڵام من شوێنی ئەوخانووەم پێنەدەزانی وئەوکاتەش کەبەمنی گوت وەرە بۆماڵەکەم نەمویست بچم، چونکە لەوەدەترسام منداڵەکەی کلیۆپاترام لێبستێنێت.
بیرم کردەوەو گوتم لەوانەیە لەمیوانخانەی سوور کەکەوتۆتە شەقامی ئەرستۆ، بزانن ماڵەکەی کاڵ کەوتۆتە کوێ، چونکە پێشان کاڵ لەمیوانخانەی سووردابووە، هەندێ شتی ماڵیشی هەبوو، بێگومان ئەو ڕۆژەی چووە بۆئەوخانووە کەبەکرێی گرتووە، شتەکانیشی لەگەڵخۆیدا بردووە، دیارە یەك ئەفسەر شتی ماڵەکەی خۆی بەکۆڵی دانادات بۆئەوەی بیبات بۆخانووەکەی، بۆیە بەدڵنیاییەوە ئەوحەمباڵی گرتووە بۆگواستنەوەی، خۆئەگەر ئەوکۆڵبەرە لەمیوانخانەکەدابێت ئەوامن دەیبینم وپێم دەڵێت ماڵی کاڵ کەوتۆتە کوێ؟
– هەر لەگەڕانەوەم لەسەربازخانەی دەمەنهور، ڕاستەوخۆ بۆمیوانخانەی سوور چووم وپرسیم ئایا کاڵ ئێستاش لێرەدا نیشتجێیە– یان نا؟
– خاوەنی میوانخانەکە گوتی: لێرە ڕۆیشتووە.
– گوتم: ئایا دەزانی ماڵەکەی لەکوێیە؟
– گوتی: نازانم شوێنی ماڵەکەی لەکوێیە.
– پرسیم: ئەو ڕۆژەی کەڕۆیشت شتومەکی ماڵەکەی لەگەڵخۆیدا برد؟
– خاوەنی میوانخانەکە گوتی: یەك حەمباڵ شتی ماڵەکەی ئەوی بارکرد.
– لێم پرسی: ئایا ئەوکۆڵبەرە کرێکاری میوانخانەبوو؟
– ئەو گوتی: نەخێر حەمباڵێکی دەرەوەبوو هێنابووی.
– لێم پرسی: ئایا تۆ ئەوحەمباڵە دەناسیت؟
– خاوەنی میوانخانەکە گوتی: بەڵێ، دواتر ناوی باربەرەکەی بەمن گوت و پێی ڕاگەیاندم ئەوحەمباڵە هەرکاتێك بێکاربوو لەم شەقامەدا دەیبینیت و تۆدەتوانیت لەشەقامی ئەستۆدا لێیبگەڕێیت.

من لەمیوانخانەکە چوومەدەرێ وکەوتمەسەر شەقامەکە، تاچووم بۆسەربازخانەی دەمەنهورو هاتم بۆئێرە، خۆر ئاوابیوو بەشێوەیەك کاتێ کەمن لەمیوانخانەکە هاتمەدەرێ تاریکی کردبوو وچرای شەقامەکان هەڵکرابوون، دەمزانی کەحەباڵانی بازاڕ وەك کرێکارانی بەندەرنین شەوێ تابەیانی بەنۆرە ئیشبکەن، ئەوحەمباڵانەی لەشەقامەکانی ئەسکەندەریەدا کاردەکەن، دوای ئەوەی تاریك داهات، دەست لەکارهەڵدەگرن ودەچنەوەماڵەکانی خۆیان، بۆیە ئەگەری ئەوەنەبوو ئەوحەباڵە ناوبراوەم دەست بکەوێت، بەڵام دوای ئەوەی هەندێك بەشەقامەکەدا ڕۆیشتم، چاوم بەدوو حەمباڵ کەوت کەلەدەم شەقامەکەدا دانیشتبوون وقسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، کەمێ لەئەوان نزیکبوومەوەو لێمپرسین: کام لەمدووانەتان (ئوتی) حەمباڵن.

– هەردوکیان هەڵسانە سەرپێ ویەکێك لەئەوان ئانیشکەکانی خۆی وێك هێنایەوە، بۆئەوەی من بازۆڵەکانی ببینم وگوتی: سەیر کەئایا تائێستا دیوتە یەك حەمباڵ بازووی ئاوابەهێزی هەبێت؟ دواتر قەدی خۆی نیشانی منداو گوتی، ئایا لەمەوبەر دیوتە حەمباڵێك خاوەنی قەدێکی وائەستورو ڕەقبێت، تۆ ئەگەر حەباڵت دەوێت من ببە بۆبارکردن، نەك ئوتی، چونکە ئوتی ئەوەندە لەڕولاوازە هەر لەپەیکەری ئێسقانی مردوو دەچێت.

– حەمباڵەکەیتر گوتی: ژنەکە بەم شەوە دەتەوێت چ شتێك باربکەی واپێویستت بەحەمباڵە؟ بەڵام من بەتۆ دەڵێم هەرکاتێك ویستت هەرەمی گەورە هەڵگریت، باشتروایە داوا لەمنی حەمباڵ بکەیت ئەوهەرەمە گەورەت بۆهەڵگرێت، چونکە حەمباڵی لەمنت بەهێزتر لەئەسکەندەریەدا دەست ناکەوێت، پار کەشتییەك کەلەڕۆمەوە هاتبوو ویەك چرای گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کەپەنجا پەلی هەبوو وهەرپەلەو فتیلەیەکی پێوەبوو، کاتێ کەهەڵیاندەکرد تاریکە شەوی دەکرد بەڕۆژی ڕووناك، ئەو چرایەیان بۆیەکێك لەبازرگانە گەورەکانی ئەسکەندەریە هاوردبوو وبەبەرزکەرەو(رافیعە) لەکەشتییەکەیان داگرتبوو ولەلێوار سەکۆی بەندەرەکەیان دانابوو، خاوەنی چرا گەورەکە بەوحەمباڵانەی کەلەوێ بوون گوتبووی هەرکەسێك ئەم چرایەم لێرەوە ببات بۆماڵەکەم، یەك بەتڵیمۆسی دەدەمێ، بەڵام هیچ کەسێك بەرعۆدەی هەڵگرتنی ئەوچرایە نەبوو.

ئەوپیاوە بازرگانە کرێی گواستنەوی ئەوچرایەی زیادکردو کردی بەدوو بەتڵیمۆس، بەڵام دووبارە کەس ئامادەنەبوو ئەوچرایە لەبەندەرەوە ببات بۆماڵەکەی، من لەبەندەر کارناکەم شوێنی دیاری کراوم شەقامی ئەرستۆیە، بەڵام ئەوڕۆژە بەڕێکەوت دوای ئەوەی قوتی ئەو ڕۆژەی خۆم پەیداکردبوو وبەبەندەرەکەدا تێدەپەڕیم، بینیم کۆمەڵێ حەمباڵ وخەڵکیتر لەشوێنێکدا کۆبوونەوە، کاتێ چوم بۆئەوێ، چاوم بەیەك چرای گەورەی بلوری کەوت، چوومەپێشێ وگوێم لێبوو باس لەدوو بەتڵیمۆس دەکەن، دوای ئەوەی خاوەنی چراکەم ناسی پێمگوت، من سێ بەتڵیمۆس لەتۆ وەردەگرم و ئەوچرایەت بۆ دەگەیەنمە ماڵەکەت، ئەو قەبوڵی کردو منیش کەپەنکەکەی خۆم لەسەرزەوی داناو بەیارمەتی خاوەنی چراکەو چەند حەمباڵێکیتر ئەویان خستەسەر کەپەنکەکە، حەمباڵەکان بەمنیان گوت ئەوکارە مەکە، چونکە چراکە ئەوەندە گرانە ئەگەر بیخەیتەسەر سەرت ئەواملت دەخاتەناو سینگتەوە، بەڵام من گوێم پێ نەدان، کاتێ دە کەس چراکەیان بەرزکردەوە، ئەوم لەسەرسەرم داناو کەوتمەڕێ خەڵك

بەسەرسوڕماوییەوە دالآن وکۆلآنەکانیان لەبەردەم مندا چۆڵدەکرد، تاپێیدا تێپەڕم، سەرئەنجام ئەو چرا پەنجا پەلەم بەبێ کەموکوڕی گەیاندە ماڵی بازرگانەکەو کرێی خۆم وەرگرت و ڕۆیشتم.

– بەودوو حەمباڵەم گوت: دەزانم ئێوە هەردووکتان بەهێزن ودەتوانن هەرەمی گەورە لەسەر شان– یان بخەنەسەر سەرتان وهەڵیگرن، بەڵام من ئیشم بەئوتییەو دەمەوێ ئەوببینم. ئەو دووانە کاتێ زانیان من نامەوێت ئیش بەئەوان بکەم، لەسەر ئەرزەکە دانیشتنەوەو دەستیانکردەوە بەقسەکردن، منیش کەوتمەڕێ وپاش کەمێ چاوم بەحەمباڵێك کەوت بەڕواڵەت دیاربوو ئەو دەیەوێت بۆماڵی خۆیان بچێتەوە، لەئەو نزیکبوومەوەو لێم پرسی: ئایا تۆ ئوتی؟

– ئەو پیاوش بەپەشۆکاوی گوتی: بەڵێ، چ کارێکت هەیە؟

– گوتم: نامەوێت بەمشەوە ئیشی بارهەڵگرتنت پێ بکەم، بەڵکو دەمەوێت ناونیشانی ماڵێك لەتۆ وەرگرم.

–ئوتی بەوردی لەمنی ڕوانی وسەیری جلوبەرگەکانی کردم و زانی بەنرخن، گوتی: ئەی ژنی لاو ناونیشانی کام ماڵ لەمن داوا دەکەیت؟

– گوتم: بەمنیان گوتووە تۆچەند ڕۆژێك لەمەوبەر، شتومەکی ماڵی یەك ئەفسەری گەنجت لەمیوانخانەی سوورەوە بۆ خانووەکەی گواستۆتەوە، دەمەوێ من بۆ ئەوماڵە ببەیت، چونکە کارم پێیەتی.

– ئوتی حەمباڵ گوتی: ئەفسەری گەنج تەنها کەسێك و دووکەس نین، من زۆر شتومەکی ئەفسەرانی گەنجم لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر گواستۆتەوەو نازانم تۆ کام یەکێك لەمانە دەڵێیت؟

– گوتم: لەوانەیە تاناوی ئەوئەفسەرە نەزانیت، بەڵام دڵنیام ئەوت لەیاد نەچووە، چونکە جوانتر لەئەو لەسوپای میسردا نییەو لەئەسکەندەرییەشدا گەنجێك بەوجوانییە دەست ناکەوێت، هەرکەسێکی جارێك ئەوئەفسەرەی بینیبێت، هەرگیز لەبیری ناچێتەوە.

– ئوتی پێکەنی و گوتی: ئایا تۆ عاشقی ئەویت؟

– گوتم نا؟

– ئوتی گوتی: درۆدەکەیت، ئەگەر عاشقی ئەوگەنجە نەبوویت، بەوشێوەیە ناوی ئەوت نەدەبردوو پێتهەلا نەدەگوت؟

– گوتم: ئایا تۆ ئەوت دیتوە– یان نا؟

– ئوتی گوتی: بەڵێ، شتەکانی ئەوم لەمیوانخانەی سوورەوە بردە ماڵەکەی.

– گوتم: ماڵەکەیم نیشانبدە؟

– ئوتی گوتی: من ماڵەکەی کاڵت نیشان نادەم، ئەگەر پارەم نەدەیتێ؟

– لێم پرسی: دەبێ چەند پارەبدەم بەتۆ، تاماڵی ئەوئەفسەرە بەمن نیشان بدەی؟

– ئوتی گوتی: من پارەی زۆر لەتۆ داواناکەم، ئەگەر یەك سکەی زێڕ بدەی بەمن، ئەوا ماڵەکەی ئەوت نیشاندەدەم.

– گوتم: یەك سکەی زێڕم پێنییە تابیدەم بەتۆ، بەڵام دوای ئەوەی گەیشتینە ماڵی کاڵ، داوا لەئەودەکەم حەقی ئەو ئەزیەتەت بداتێ.

- ئوتی ئامادەنەبوو بۆماڵی کاڵم ببات، دەیگوت یەك سکەی زێڕم دەوێت، منیش یەك سکەی زێڕم پێنەبوو، پێم گوت: ئەی پیاو من کارەکەری یەك خانمی گەورەم وبەمشەوە بۆکارێك هاتووم پەیوەندی بەئەوەوەیە، کەدەچم بۆماڵی ئەوئەفسەرە، ئەگەر خاتوونەکەم بزانێت تۆبەماڵەکەی دەزانی وبەمنت نیشاننەداوە ڕووبەڕووی سزا دەبیتەوە، بەڵام ئەگەر من بگەیەنیتە ماڵی ئەو، ئەوا شیرینیت دەداتێ وبێکرێ نابیت، هەڕەشەی من لەبەرامبەر ئەوپیاوەدا کاریگەری هەبوو وگوتی: باپڕۆین تاماڵەکەت نیشانبدەم، ئێمە کەوتینەڕێ، دوای ئەوەی لەشەقامی ئەرستۆ تێپەڕین، گەیشتینە شەقامێکیترو لەکۆتایی ئەوشەقامەدا حەمباڵەکە ئێمەی بردە کۆڵانێك وماڵێکی نیشاندام وگوتی: ئەوە ماڵی ئەوئەفسەرەیە کەتۆ بەدوایدا دەگەڕێیت.

- بەئەوم گوت: سەبرکە تالەدەرگا دەدەم وداوا لەکاڵ دەکەم حەقی خۆت بداتێ، حەمباڵەکە ڕاوەستا تاکرێکەی وەرگرێت، ئینجا من لەدەرگامدا، بەڵام کەس دەرگای ماڵەکەی نەکردەوە، بۆجاری دووەم وسێیەم لەدەرگامدایەوە، دووبارە دەرگاکەیان لێنەکردەوە.

- داوام لەحەمباڵەکە کرد بچێتەسەر دیواری حەوشەکەو سەیربکات داخوا لەژوورەکاندا ڕووناکی داهیسێ- یان نا؟

- حەمباڵەکە گوتی: من دەترسێم ئەگەر بزانن چوومەتەسەر دیواری خەڵك، ئەوا بۆ دەرهێنانی کانزام دەنێرن.

- گوتم: من داوا لەتۆ ناکەم بچیتە ماڵی خەڵکەوە، بچۆسەر دیوارەکەو بزانە چرای ئەوماڵە دەسوتێت- یان نا؟

- حەمباڵەکە چووەسەر دیوارەکەو سەیری ناوەوەی کردو گوتی: ئەوێ تاریکەو هیچ چرایەتی تێدا ناسوتێت.

- گوتم: وەرە خوارێ.

- دوای ئەوەی هاتەخوارێ، گوتی: ئەو ئەفسەرەی کەتۆ لێی دەگەڕای لەماڵەکەیدا نییە.

- گوتم: ئایا دڵنیای ئەوماڵە هەمان ئەوماڵەیە کەتۆ شتومەکەکانت بۆهێنان ؟

- ئوتی گوتی: من هیچ گومانێکم نییە ئەو ماڵەبوو، چونکە شێوەی ئەوخانووە لەخانووەکانی تری ئەم کۆڵانە جیایە.

حەمباڵەکە ڕاستی دەکرد، شێوەی ئەوخانووە بەجۆرێکبوو لەگەڵ ئەوانیتر جیابوو.

- هەروەها گوتی: من ڕێنمایی خۆم کردو تۆم گەیاندە ئێرە، ئێستاش چونکە ماندووم دەمەوێت بچمەوە ماڵەکەی خۆم وبخەوم، کرێی خۆمان بدەیە تابگەڕێمەوە.

من نەك دانەیەك بەڵکو نیو سکەی زێڕیشم پێنەبوو وتەنها یەك سکەی زیوم پێبوو وئەومدا بەئوتی، ئەوپیاوە دەستیکرد بەبۆڵەبۆڵ وناڕەزایی دەربڕین وگوتی: حەقی من زۆر لەوەزیاترە، هەروەها ئەوشوێن نیشاندانە ڕێنماییەکی ئاسایی نەبوو، چونکە گەیاندنی دولبەربوو بۆدڵدار، ئەوکەسەی کەعاشقێك دەگەیەنێتە دڵدارەکەی، دەبێ زۆر زیاتر لەوەی بدرێتێ.

– گوتم: من عاشق نیم ونامەوێت بۆلای مەعشوقەکەم بچم، بەڵام بەهەر شێوەیەکبێت لەوانەیە سبەی بۆ ئەم ماڵە بێمەوە، هەرکاتێك تۆم لەشەقامی ئەرستۆدا بینی، یەك سکەی زێرت دەدەمێ، من بەو قەولەی بەئوتیمدا، لەئەو جیابوومەوەو ڕێگای کۆشکی پاشایەتیم گرتەبەر.

پێشبینی ئەوەم دەکرد لەوانەیە بەیانیش بۆ ئەوشوێنە بێمەوە، خۆم ئومێدەواردەکرد بەوەی لەوانەیە کاڵ لەئەسکەندەریە نەڕۆیشتبێ وئەم شەویش بەڕێکەوت لەماڵەوە نەبێت وسبەی بگەڕێتەوە ماڵەکەی، ئەوکۆششەی من تائەوکات بێسەرئەنجام بوو، دوای گەڕانەوەم بۆکۆشکی پاشایەتی دەبوا بەکلیۆپاترام بگوتبا من کاڵم نەدیتووەو نەمتوانیوە لەگەڵ ئەودا قسەبکەم، من لەکەللەپوچی ئەوپیاوە سەرم سوڕمابوو، دڵنیابووم ڕفاندنی ئەومنداڵە لەلایەن کاڵەوە بۆئەوەیە تۆڵە لەکلیۆپاترا بکاتەوە، بەوەی بۆچی ئەوی دەرکردو گوتی نەیەتە کۆشکی پاشایەتی، بەهانەی کاڵ ئەوەبوو، چونکە منداڵەکەی کلیۆپاترا ڕۆڵەی خۆیەتی، دەبێ ئەومنداڵە لای خۆی بێت وخۆی گەورەی بکات، ئەوەش پاساو هێنانەوەیەك بوو بۆلاوازیو کەسی ژێر قەناعەتی پێنەدەکرد.

کینەی کاڵ لەبەرامبەر کلیۆپاترادا، بووەهۆی ئەوەی ئەوگەنجە، منداڵەکە بڕفێنێ، نەك لەخۆشەویستی باوکایەتی، ئەگەر کاڵ سەبارەت بەمنداڵەکەی خۆشەویستی هەبوایە، ئەوا لەومنداڵە دەگەڕا لەکۆشکی پاشایەتیدا مابایەوە، تاوەکو دوای گەورەبوونی لەسەر تەختی پاشایەتی میسر دانیشتباو بەبەتلیمۆسی پازدەهەم ناوی دەرکردبا.

کاتێ گەیشتمەوە کۆشکی پاشایەتی، کلیۆپاترا بەخەبەربوو وچونم بۆلایی وپێم گوت، نەمتوانی کاڵ ببینم وئەو نەلەسەربازخانەی دەمەنهوربوو ونەلەوخانووەش کەدەیانگوت ماڵی ئەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بیرم لەوەدەکردەوە لەوانەیە کاڵ بەڕێکەوت نەچووبێتەوە ماڵی خۆی وسبەی شەو دەچمەوە ماڵەکەی ئەو، بەڵکو ئەوببینم، بەڵام چۆن من هەمیشە ڕاستییەکانم بەخاتوونەکەی خۆم دەگوت، بەئەوم گوت زۆر بەئومێدنیم لەدۆزینەوەی کاڵ.

– کلیۆپاترا بەپەشۆکاوی سەیری منی کردو پرسی: بۆچی ئومێدەوارنیت کاڵ بدۆزیتەوە؟

– من نەمندەتوانی زانیارییەکانی خۆم سەبارەت بەکاڵ بەکلیۆپاترا بڵێم، بەم شێوەیە دوام، ئەگەر کاڵ منداڵەکەی تۆی بردبێت بەشێوەیەك لەکردنی ئەوکارەی خۆی دەترسێت، لەم وڵاتەدا نامێنێت، ئەو مرۆڤەو خاوەنی هەستەو دەزانێت لەم وڵاتەدا بمێنێتەوە دەستگیر دەکرێت، دەمویست بڵێم کاڵ زۆر لەوەجوانترە بتوانێت خۆی لەبەرچاوی خەڵك بشارێتەوە، جوانیەکەی ئەو ئاشکرا دەکات، بەڵام ئەو قسەیەی ناخم شاردەوەو بەم شێوەیە کەوتمە قسە:

کاڵ پیاوێکە لەنەژادی بیانی، بیانییەکانیش خاوەنی سەروسیمای تایبەتین ودەناسرێنەوە، ئەو ناتوانێت لەم وڵاتەدا خۆی پەنابدات وبشارێتەوە، بۆهەر جێگایەك بچێت خەڵك دەزانن بێگانەیەو بەیەکتری نیشاندەدەن، بۆیە بەڕای من کاڵ لەم وڵاتە ڕۆیشتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سبەی شەو ودوو سبەی شەو سەردانی ماڵەکەی دەکەم، بەڵکو لەوێ بێت ببینم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئەو لەم شارە نەچۆتەدەرێ، ئەگەر ڕۆیشتبێ بەکەشتی نەڕۆیشتووە، چونکە ئەمڕۆ کاتێ تۆ بەدوای کاڵدا دەگەڕای، فەرمانم دەرکرد لەبەندەرەکەدا بگەڕێن و لەوەبکۆڵنەوە داخوا کاڵ بەکەشتی ڕۆیشتووە– یان نا؟

هیچ کەس لەوکرێکارانەی بەندەر کاڵیان نەبینیوە سواری کەشتی بووبێت وبڕوات، ئەگەر کاڵ دوای بردنی منداڵەکەی من هەڵاتبێت، ئەوا لەڕێگای بیابانەوە ڕایکردووەو بەرەولای خۆرهەڵات÷ یان خۆرئاوا ڕۆیشتووە.

دەمزانی کاڵ خاوەنی حەقە، بەڵام نەمدەتوانی خۆم لەپەرۆش وغەمی کلیۆپاترا ببوێرم، سەبارەت بەوەی چۆن بەجۆش هاتبوو لەتاوی منداڵەکەی، هەرچەندە شلۆنی میسر زۆر هۆگری منداڵەکەی نەبوو وکۆرپەکە دایانەکە گەورەی دەکرد، کەچی شەو ورۆژ تۆتکەی نەدەداو ئارامی لێهەڵگیرابوو، لەمەسەلەی خۆشەویستی دایکایەتی تێپەڕی کردبوو، کلیۆپاترا زیاتر پەژارەی ئەوەی دەخوارد، کاڵ توانای خواوەندیەتی ئەوی لکەدارکردووە، چونکە کلیۆپاترا خۆی بەیەك خوا دەزانی، پێش ئەویش هەموو شاکانی میسر خۆیان بەخوازانیوە، هەموو ئەوانەی دەچوونەسەر تەختی پاشایەتی، باوەڕیان وادەبوو لەخواکانن، پێویستە ئەوەش بڵێم کەبەتاڵیسەکانی میسرو کلیۆپاتراش خۆیان داهێنەری ئەوپلەو پایەی خوایەتیان بۆخۆیان دانەناوە، بەڵکو میسرییەکان ئەوانیان بەخوا دەزانی ونیشاندەدا، چونکە پێشئەوەی بەتاڵیسەکان لەمیسردا پاشانشینی دامەزرێنن، وڵاتی نیل لەلایەن فرعەونیەکانەوە بەڕێوەدەبرا، فرعەونییەکان خۆیان بەخوا دەزانی وبۆیەش میسرییەکان ڕاهاتبوون لەوەی شاکانی خۆیان بەخوا بزانن، ئەم باوەڕە بەشێوەیەك لەمیسردا باوبوو دوای ئەوەی فرعەونیەکانیش لەناوچوون بەتلیمۆسەکان جێگایان گرتنەوە، کەبەرەدەڵەك یۆنانی بوون، میسرییەکان دووبارە ئەمانەشیان بەخوا دەزانی، بەتلیمۆسی یەکەم وبەتلیمۆسی دووەم کەنەریت وباوەڕی یۆنانیان هەبوو، نەیاندەویست میللەت ئەوان بەخوا بزانێت، بەڵام خەڵك ئامادەنەبوون پاشاکانی میسر بەیەکێك لەخواکان نەزانن، بۆیە دوای بەتلیمۆسی دووەم شازادەو پاشای میسر ڕاهاتن کەخۆیان بەخواو پەروەردگار بزانن، بیروباوەڕی میسرییەکان کاریکردەسەر ئەمانە، هاوسەرێتی نێوان کوڕەکانی پاشاو کچەکانی کەخوشك وبرای یەکتربوون، هەر لەباوەڕی فرعەونیەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، چونکە لەکۆندا هەموو فرعەونە گەنجەکان لەگەڵ خوشکەکانی خۆیاندا دەبوون بەهاوسەر، ئەگەر خوشکیان نەباو دایکیان گەنج بایە، لەگەڵ دایکیاندا دەبوون بەهاوسەر، چونکە فرعەونەکانی میسر بنەماڵەی پاشایان بەخێزانی خواکان دەزانی ولەوبڕوایەدابوون هیچ کەس شایانی ئەوەی نییە ببێتە هاوسەری فرعەونی میسر (کەخوایە)بێت، تەنها یەکێك لەشازادەکانی میسر نەبێت.

فرعەونیەکان تەنها لەکاتێکا ناچاردەبوون لەگەڵ ژنی بێگانەدا ببن بەهاوسەر، ئەویش کاتێکبوو کەخوشکیان نەبا، ئەو کاتە هاوسەرەکانی خۆیان لەنێوان کچی پاشاکانیتر هەڵبژێرن، ئەوانەش دوای ئەوەی دەبوونە هاوسەری فرعەونی میسر، دەگەیشتنە پلەی خوایی وبەخوا حسابدەکران.

دوای ئەوەی کلیۆپاترا لەدایکبوو وبەوباوەڕە گەورەبوو کەئەو خوایە، بەڵام ئەو یەك خوای بەرجەستەو خوێندەوارو خاوەن زانیاری بوو، بۆیەش حەزی نەدەکرد ببێتە هاوسەری براکەی وئەوهاوسەریەتیەی بەباش نەدەزانی، بەڵام چونکە وای بیردەکردەوە کەوایە، دوای ئەوەی کاڵ منداڵەکەی ڕفاند، کاری ئەوگەنجەی وەك تاوانێك سەیردەکرد. لەوانەیە لەبەرئەمە ئەوەندە پەژارەی دەخوارد، نەك گومبوونی منداڵەکەی.

ڕۆژی دوایی کەس نەهات بڵێ ئەوەی منداڵەکەی دزیوە دەیناسم، دوای ئەوەی شەوداهات، من بەکلیۆپاترام گوت ئەمشەو دەچم بۆماڵەکەی کاڵ، بەڵکو ئەو لەماڵەکەیدا ببینم.

- شاژنی میسر لەمنی پرسی: ماڵەکەی ئەو لەکوێیە؟

- گوتم: ماڵەکەی لەیەکێك لەکۆڵانەکانی شەقامی (مەفیس) دایە.

- کلیۆپاترا گوتی: شەقامی مەفیس لەشەودا شەقامێکە چۆڵ و ڕۆیشتنی ژنێك بەتەنیا لەکاتی شەودا، لەوانەیە توشی سەنگەساری بێتەوە، باشتروایە دووخزمەتکار لەگەڵ خۆتدا ببەیت، بۆ ئەوەی ئاگاداریت بکەن.

- گوتم: ئەگەر کاڵ لەماڵەوەبێت ودووکەس لەگەڵمدا ببینێت، دەترسێت وڕێگامان نادات بچینە ماڵەکەی، چونکە وادەزانێت بۆدەستگیرکردنی ئەوهاتووین.

- کلیۆپاترا گوتی: کاتێ گەیشتیتە نزیك ماڵەکەی کاڵ، بەخزمەتکارەکان بڵێ نەیەنە نزیك ماڵەکەی.

من حەزم نەدەکرد ئەو دوو خزمەتکارانە لەگەڵ خۆمدابێم، بەڵام چووکە شاژنی میسر فەرمانیدا نەمدەویست قسەکەی ئەو بەبێ ئەهمیەت وەربگرم، بەخۆم و دوو کەسەکەوە لەکۆشکی پاشایەتی هاتمەدەرێ وڕێگای ماڵی کاڵم گرتەبەر.

لەشەقامی ئەرستۆدا پیاوە حەمباڵەکەی شەوی پێشتر ماڵی کاڵی نیشاندابووم، بینیم وئەو پارەی کەقەولم پێدابوو بیدەمێ، دامێ.

ئوتی حەمباڵ گوتی: حەز دەکەی ئەمشەویش بێم لەگەڵتدا؟

- گوتم: نەخێر، ئەمشەو خۆم پێدەزانم لەکوێیە؟

- ئوتی کەکرێکەی خۆی لەمن وەرگرت، گوتی: هیوادارم ئەمشەو بەپێچەوانەی شەوی ڕابردوو بتوانی ئەو بدۆزیەوە، لەکاتی گوتنی ئەم قسەیەدا پیاوە حەمباڵەکە زەردەی دەهاتێ، تامن تێبکەیەنێت کەمەبەستی ئەوەیە دڵدارەکەی خۆم بدۆزمەوەو بەمرادی خۆم بگەم.

- لەڕێگادا پیاوە خزمەتکارەکان لەمنیان پرسی: شرمیون بۆکوێ دەچیت؟ بۆ بەمشەوە لەکۆشکی پاشایەتی هاتویتە دەرەوەو بەرەو کوێمان دەبەیت؟

- گوتم: یەکێك لەکەسەکانم هاتووە بۆ ئەسکەندەریەو من هاتووم ئەوببینم.

- خزمەتکارەکان گوتیان: تۆ دەتوانی بەڕۆژ چووبای وخزم وکەسەکانت دیتبا، نەك بەوشەو.

- گوتم: ئەمڕۆ خەریکی خزمەتکردنی شاژن بووم وبوارم نەبوو لەکۆشکی پاشایەتی بێمەدەرێ، بەیانیش لەوانەیە کەسەکانم بەکەشتی لەئەسکەندەریە بڕۆن ونەتوانم ئەوان ببینم، بۆیە ئەمشەو کەوتوومەتەڕێ.

وەڵامەکەی من قەناعەتی بەودووانە کردو ئیتر ورتەیان نەکرد، تاگەیشتینە شەقامی مەفیس، لەوێدا من بەودوو خزمەتکارانەم گوت، لەسەری کۆڵانەکەدا بوەستن وچاوەڕوانی گەڕانەوەم بکەن، ئەوان کەفەرمانیان پێدرابوو لەقسەی من دەرنەچن، هیچیان نەگوت وبەتەنهایی بەرەو ماڵی کاڵ ڕۆیشتم، کاتێ نزیکی خانوەکە بوومەوە دڵم لەخۆشیاندا دەستی کرد بەتەپە تەپ، چونکە بینیم لەوماڵەدا چرا دەهایسێت.

بوونی ڕووناکی چرا لەماڵەکەدا، ئەوە دەگەیەنێت خاوەن ماڵ لەماڵەوەیە، من دوای دیتنی شەوقی چراکە لەدوو شت دڵخۆشبووم، یەکێکیان ئەوەبوو کەگفتوگۆ بکەم ومنداڵی کلیۆپاترا لەگەڵخۆمدا ببەمەوە، ئەویتریان ئەوەبوو کەکاڵم لەماڵێکی چۆڵدابینی، چونکە ژنێك ئەوپیاوەی خۆشیدەوێت حەزدەکات لەماڵێکی چۆڵدا ببینێت، لەدەرگای خانووەکە نزیکبوومەوەو لەدەرگامدا، من چاوەڕوانبووم گوێم لەدەنگی کاڵبێت بڵێ کێیە؟ بەڵام لەناو ماڵەکەدا گوێم لەدەنگ نەبوو، جارێکیتر لەدەرگاکەم دایەوە، دووبارە کەس نەبوو دەرگاکە بکاتەوە، من پێموابوو گوێیان لەلێدانی دەرگاکە نییە، بەتوندی لەدەرگاکەمدا، کەلەوکۆڵانەدا دەنگی دەدایەوە، سەرم لەوەسوڕمابوو بۆدەرگاکە ناکەنەوە، جارێکیتر دەرگاکەم کوتایەوە، بەڵام وردەوردە بۆم ڕوونبۆوە لەوماڵەدا چرا دەسوتێت، بەڵام خاوەن ماڵ لەوێ نییە- یان ئەوەتا کاڵ بڕیاریداوە دەرگا لەڕووی کەسدا نەکاتەوە، چونکە وابیردەکاتەوە ئەوکەسەی لەم کاتەی شەوەدا لەدەرگادەدات هەر بێگانەیەو لەوانەیە خۆی بەخۆی بڵێت ئەوانەی لەدەرگادەدەن مامورانی دەوڵەتن وهاتوون دەستگیری بکەن.

من نەمدەتوانی ناوماڵەکە ببینم، بیرم لەوەکردەوە داوا لەودوو خزمەتکارانەی کەلەگەڵمدابوون بکەم، بێن سەیری ناوەوەی ماڵەکەبکەن، چووم ئەوانم بانگکردو ماڵی کاڵم نیشاندان وگوتم یەکێك لەئێوە بچنەسەر دیواری ئەوماڵەو سەیری ناوماڵەکە بکەن بزانن چۆنە؟

– یەکێك لەودووانە چووەسەر دیوارەکە دانیشت وگوتی: لەو ژوورەدا چرا دەسوتێ.

– گوتم: جگەلە چراکە هیچیتر دەبینی؟

– خزمەتکارەکە گوتی: من منداڵێك دەبینم کەخەوتووە، دڵی من دەستیکرد بەترپەترپ، چونکە دەمزانی ئەومنداڵە کوڕیەکەی کلیۆپاترایە.

– گوتم، ئایا لەوماڵەدا هیچ پیاوێك نابینی؟

– خزمەتکارەکە وەڵامی دایەوە: نەخێر.

– لێمپرسی: ئایا لەوماڵەدا ژنێك نابینی؟

– خزمەتکارەکە گوتی: لەوماڵەدا نەیەك پیاو نەیەك ژن دیارنین.

– گوتم: بەدەنگێکی بەرز بڵێ کاڵ وچەند جارێك ئەوناوە دووبارە بکەرەوە.

– خزمەتکارەکە لەسەر دیوارەکە هاواری کرد، کاڵ، کاڵ...، بەڵام کەس جوابی نەدایەوە.

من نەمدەتوانی بەبێ گەڕانەوەی منداڵەکەی کلیۆپاترا بچمەوە بۆکۆشکی پاشایەتی، ئەگەر کوڕیەکەی کلیۆپاترا لەوماڵەدا نەبا، ئەوامن وەك شەوی پێشتر دەگەڕامەوە بۆکۆشك، چونکە منداڵەکەی کلیۆپاترایان لەوماڵەدا بینیوە، دەبوو ئەومنداڵە لەکاڵ وەربگرمەوەو بیبەمەوە بۆ کلیۆپاترا.

داوام لەوخزمەتکارەکرد کەلەسەر دیوارەکەبوو، ئایا دەتوانیت دەرگای حەوشەکە بکەیتەوە؟

– خزمەتکارەکە ترساو گوتی: شەرمیون ئەگەر من بەسەر دیوارەکەدا بازدەم وبچم دەرگاکە بکەمەوە، دەزانی چیم لێدەکەن، چ سزایەکم دەدەن؟

– گوتم: تۆ بۆجێبەجێ کردنی فەرمانی شازنی میسر دەچیتەناو ئەوماڵەوە، کەس سزات نادات.

– خزمەتکارەکە گوتی: بۆ دەتەوێت من دەرگای ئەوماڵە بکەمەوە؟

– گوتم: بۆئەوەی بچمەناو ئەوخانووەو خاوەن ماڵەکە ببینم.

– خزمەتکارەکە لەدیوارەکە چۆخواریێ ودەرگاکەی کردەوە، منیش بەخزمەتکارەکەی ترم گوت، بەدوای منداوەرە

دوای چـاونە ژوورەوە بەرەوچـراکە ڕۆیـشتم وهـەردوو خزمەتکارەکـە لەگەڵمـداهاتن، لـەژێر ڕۆشـنایی چراکەدا چاوم بەمنداڵێك کەوت خەوتبوو، بەڵام کاتێ لەمنداڵەکە نزیکبوومەوە شێوەی خەوتنی ئاسایی نەبوو، داهاتمەوەو منداڵەکەم لەسەر ئەرزەکە هەڵگرت ئەوکاتە زانیم هەناسەنادات وسینگی ناجوڵێت ودەستەکانی ساردو سڕن، بەسەرسامییەوە منداڵەکەم لەجێگاکەی خۆی دانایەوەو گوتم: ئەو منداڵە مردووە.

دوای ئەوەی لەسەر زەویم دانایەوە بەترس ولەرزەوە لەمنداڵەکەم دەڕوانی وئەو دوو کەسانەی کەلەگەڵ منیشدابوون قسەیان نەدەکرد، کاتـێ ئێمـە دەهـاتین بۆمـاڵی کـاڵ، ئـەم دوو خزمەتکارانـە نەیانـدەزانی بۆچـی بۆئەوماڵـە دەچـین، هـەتا ئەوکاتـەی دەرگـای ماڵەکـەشمان کـردەوە، نەیانـدەزانی مەبەسـتی مـن لـەهاتنمان بـۆ ئەوماڵـە چـییە؟ بـەڵام کاتـێ منداڵەکـە بـەمردوویی دۆزرایـەوە، پێـشبینی ئـەوەیانکرد کۆرپەکەی کلیۆپاترابێت.

لەهـەموو ئەسـکەندەریەدا کەسـێك نـەبوو نـەزانێ منداڵەکـەی کلیۆپـاترا دزراوە، جاچـجای ئـەودوو خزمەتکارانـە، چـونکە ئـەمان یـەکێکبوون لەخزمـەتکارانی کۆشـك، لەوکاتـە پرتـرس ولـەرزەدا سوپاسگوزاری خواوەندەکانم کرد کەئەوەی بەدڵی کلیۆپـاترادا هێنـا دوو خزمـەتکار لەگەڵمنـدا بنێرێـت، چونکە هەتا بۆخۆشم نەمدەتوانی کـەس لەگەڵخۆمدا بۆئەو ماڵە ببەم بـەبێ ئاگاداری کلیۆپـاترا، ئەگـەر ئەودوو کەسەم لەگەڵخۆمدا نەهێنابا، هیچ گەواهی دەرێکم نەدەبوو کەبەچاوی خۆی گیانی ساردبۆوەی منداڵەکەی کلیۆپاترای دیبێت، ئەگەر بەکلیۆپاترام گوتبا تەرمی منداڵەکەی تۆم لەوماڵـەدا دۆزیوەتـەوە، بـاوەڕی نـەدەکرد، ئـەرکی مـن ئـەوەبوو تـەرمی منداڵەکـە لەگەڵخۆمـدا ببەمـەوە بۆکۆشـکی پاشـایەتی وبەکلیۆپاترا بڵێم ئەوە کۆرپەکەتە کەبەدوایدا دەگەڕایت، لەوکاتەی لەلاشەی منداڵە مردووەکەم دەڕوانی کەوتمـەبیری ئەوەی کەتـەنها شـازنی میسر تووشـی ئـەم بەدبەختییە نەبووە، شـازنی پێـشئەو وهـەموو شازنەکانی کەناویان کلیۆپاترا بووە، ڕووبەڕووی بەدبەختی بوونەوە، پێش کلیۆپـاترا شـەش شازنیتر لەمیـسردابوون بەشـازن، هـەموو ئەمانـەش ڕۆڵـەکانی خۆیـان بەشـێوازی نائاسـایی ومەترسـیدار لەدەسـتداوە، یـەکێك لەمانـە کلیۆپـاترای سـێیەمە کەبینیویـەتی چـۆن مێـردە شـێتەکەی کۆرپەکـەی بەبەرچاوی ئەوەوە پارچەپارچە کردووە، چارەنووسـی هـیچ یـەك لەوشـەش کلیۆپاترایانە، چارەنووسـی شـازنێکی ئاسـایی نـەبوون، هـەروەها هـیچ یـەك لەوشـەش کلیۆپـاترا شـازنانەی پێش خاتوونەکەی مـن، کەسانی خواناس نەبوون.

سەرم لەوەسوڕمابوو منداڵەکەی کلیۆپاترا چۆن مردووە؟

لەوکاتەی کاڵ منداڵەکەی بردبوو تائەو وەختـەی مـن منداڵەکەم بەمردوویی دیـت، کاتێکی زۆر بەسـەر نەچـووبوو هەتاوابیربکەمـەوە کەبەنەخۆشـی مـردووە، خۆئەگـەر کۆرپەکـە بـەهۆی گـۆڕانی شـیرەوە نەخۆشبوبێت، نـەدەبا بەوزووییە بمرێت. لەوساتە وەختـەی کەلەسەرسامی وپەشۆکاویدا نەمدەتوانی چاولەسـەر لاشـەی منداڵەکـە لابـبەم، لەتـەك تەرمەکـەدا شـتێك سـەرنجی ڕاکێـشام وبـۆی داهاتمـەوەو

هەڵمگرتەوە، سەیرمکرد نووسراوێکی بچوکە، دەوری کاغەزەکە بەداو دروابوو، بۆ ئەوەی نەکرێتەوە، من کردمەوەو لەبەردەم رووناکی چراکەدا سەیرمکرد خەتی نامەکە یۆنانی نووسراوە، واتا خەتی میسرییە[66] پێشئەوەی نووسراوەکە بخوێنمەوە، سەیری کۆتایی نامەکەم کرد تابزانم کێ نووسیویەتی.

66- خەتی یۆنانی: خەتی میسری، نووسینی نامەکە بەیۆنانی بووە، چونکە ئەوکات لەمیسردا زمانی رەسمی یۆنانی بووە.

بیرم هاتەوە کەلەسەرەتای ئاشناییم لەگەڵ کاڵدا، پێی گوتم نووسینی یۆنانی بەباشی دەزانێت، بۆیە توانیویەتی ئەونامەیە بەدەستوخەتی خۆی بنوسێت.

نامەی ناوبراو بۆشاژنی میسر نووسرابوو ولەونامەیەدا کاڵ نووسیبووی، چونکە من دڵنیابووم ئەومنداڵە لەخوێنی منە حەزم نەدەکرد لای دایکی گەورەبێت وخۆی بەکوڕی بەتلیمۆسی چواردەهەم بزانێت ولەناونیشانی باوکی خۆی بێئاگابێت، ئەو جلوبەرگی باغەوانی لەبەرکردووەو هاتۆتەناو کۆشکی پاشایەتی ومنداڵەکەی خۆی ڕفاندووە، بەڵام کاتێ بەسەر شەقامەکانی شاردا ڕۆیشتووە لەپەشۆکاوی وپەلەپەلیدا بۆئەوەی زوو منداڵەکە بشارێتەوە، کوڕیەکەی لەباوەش کەوتۆتەخوارێ وکەلەسەر زەوی هەڵیگرتۆتەوە بینیویەتی بێهۆشبووەو هەرچەند هەوڵیداوە منداڵەکە بەهۆش بێنێتەوە نەیتوانیوەو کوڕیەکە لەباوەشیدا گیانی سپاردووە.

کاڵ لەنامەکەیدا نووسیبووی غەمگینی ئەو لەمردنی منداڵەکە بەئاستێکە کەناتوانرێت وێنای ئەوبکرێت ئەوکارەساتە قابیلی پڕکردنەوەو بیر چوونەوەبێت...، دایکی منداڵەکە کلیۆپاترایە بێگومان دوای ئەوەی زانی منداڵەکەی مردووە غەمگین دەبێت، بەڵام پەژارەی ئەو بەقەت غەمباری کاڵ نییە، چونکە کاڵ لەپێناو ئەوەی منداڵەکە لەکۆشکی پاشایەتیدا ببات، هەم کاری ئەفسەری لەسوپای میسردا لەدەستداو هەم لەگیانی خۆشی دەترسێت، ئێستاش کەمنداڵەکە مرد، تاکە سەرچاوەی ئومێدو دڵخۆشی ئەو، چوو، لەبەشێکیتری نامەکەدا کاڵ نووسیبووی: دوای ئەوەی منداڵەکەم لەباوەشمدا مرد، کەوتمە بیری ئەوەی چی لێبکەم؟ حەزم دەکرد لاشەی منداڵەکە بۆ کلیۆپاترا بنێرم، تابەبینینی تەرمی منداڵەکە کەمێ سێبوری بێت ومنداڵەکە مۆمیابکات وبەخاکی بسپێرێت، بەڵام ڕێگایەکم دەست نەکەوت تابتوانم ئەومنداڵەی لێوەبنێرم بۆ کلیۆپاترا، دواتر ئەوەم بۆمەعلومبوو، کلیۆپاترا بەهەر شێوەیەکبێت ماڵەکەی من دەدۆزێتەوە، بۆیە کەوتمە بیری ئەوەی منداڵەکە لەماڵەکەی خۆمدا جێبهێڵم وچراکەش هەڵبکەم، بۆئەوەی وابزانن ماڵەکەم خانەخوێی تێدایە،هەتا ئەوکاتەی کەسێك دێت، منداڵەکە لەماڵەکەی مندا دەبات، ئەوا من دووربەدوور چاودێری ماڵەکەم دەکەم، هەر کاتێکیش زانیم چوونەناو ماڵەکە، ئەوا دەڕۆم، چونکە دەزانم تەرمی ئەو کوڕپەلەیە لەگەڵ خۆیاندا بۆکلیۆپاترا دەبەن.

پێویستە شاژن ئەوەش بزانێت، بۆدەستگیرکرنی من باکەس ئەزیەت نەدات، چونکە منی دەست ناکەوێت وپێی دەستگیرناکرێم.

یەکەم شت کەدوای خوێندنەوەی نامەکەی کاڵ لای من ڕوونبۆوە، ئەوەبوو نابێ ئەم نامەیە جگەلە شاژن بەدەست کەسیتر بکەوێت، چونکە کاڵ لەونامەیەدا باسی پێشینەی دۆستایەتی خۆی لەگەڵ شاژنداکردووە، گوتبووی منداڵەکەی کلیۆپاترا لەمنە، نەك لەبەتلیمۆسی چواردەهەم.

من سەرم لەوەسوڕمابوو چۆن ئەوگەنجە جوان وخوێندەوارە بیری لەوەنەکردۆتەوە ئەونامەیە بەدەست کەسانێك بکەوێت کەوەك من ڕازی کلیۆپاترای لانەبێ وکارەکەری ئەونەبێت، چونکە ئەوچۆن دەتوانێت پێشبینی ئەوەبکات من دەچم بۆماڵەکەی وئەو نووسراوە دەبینم، ئەگەر کەسانیتر لەجێگای من چووبانە ئەوماڵەو ئەونامەیەیان دیتباو بیانخوێندبایەوە، شاژنی میسر ڕیسوادەبوو ونامەکەیان بەبەتلیمۆسی چواردەهەم دەدا، ئینجا نەك هەرمێردەکەی کلیۆپاترا بەمەی دەزانی، بەڵکو هەموو دانیشتوانی ئەسکەندەریەو میسر دەیانزانی کەکاڵ دۆستی نهێنی شاژنی میسر بووەو ئەومنداڵەی کەکلیۆپاترا بوویەتی، منداڵی کاڵ بووە، چونکە خۆشی بەباوکی ئەوزانیوە، منداڵەکی ڕفاندووە بۆ ئەوەی لای خۆی گەورەی بکات، بەڵام منداڵە شیرەخۆرەکە لەباوەشی کەوتۆتەخوارێ و مردووە.

– بەخزمەتکارێکیانم گوت: بچۆوە بۆکۆشکی پاشایەتی.

– لێی پرسیم: ئایا هەواڵی مردنی منداڵەکە بەشاژنی میسر بڵێم– یان نا؟

– گوتم: بەشاژن بڵێ منداڵەکە توشی ڕووداوێك بۆتەوەو شرمیون لای منداڵەکەیە، ئەگەرتۆ ئەمە بڵێیت کلیۆپاترا تێدەگات ئەوەی ڕوویداوە دڵتەزێنە، ئەگەرنا ئەوامن دەهاتمەوە بۆکۆشکی پاشایەتی ولای منداڵەکە نەدەمامەوە، خزمەتکارەکە چۆدەرێ و بەڕاکردن ڕۆیی ومن وخزمەتکارەکەیتر لەتەك تەرمی منداڵەکەدا ماینەوە، پاش ماوەیەك لەژاوەژاوی دەنگی خەڵك وڕووناکبوونەوەی کۆڵانەکە بەمەشخەڵەکان، زانیم کلیۆپاترا هاتووە، یەك کەژاوە لەبەرامبەر دەرگاکەی ماڵی کاڵدا وەستاو خستیانەسەر زەوی، کلیۆپاترا لەکەژاوەکە هاتەخوارێ وهاتەژوورەکەو هاواریکرد شرمیۆن چی ڕوویداوە؟

منیش سەرم شۆڕکردەوەو دەستمکرد بەگریان، گریانەکەی من ساختەیی نەبوو، چونکە دڵم بەئەو منداڵەو کلیۆپاترا دەسوتا، شاژنی میسر کاتێ بینی من دەگریەم، زانی منداڵەکە مردووە، هیچی نەگوت ونوشتایەوەو منداڵەکەی لەسەر زەوی هەڵگرت ولەباوەشی خۆی گرت، چەند دەقیقەیەك منداڵەکە لەباوشی دایکی دابوو، کلیۆپاترا نەیدەتوانی دەستبەرداری بێت و داینێتەوە.

– منیش لەشاژنی میسر نزیکبوومەوەو تەرمی منداڵەکەم لێوەرگرت ولەسەر زەویەکەم دانایەوە.

– شاژن کەڕەنگی پەڕیبوو، گوتی: شرموین چی بووە، کۆرپەکەم مرد؟ کوا ئەوپیاوە چارەڕەشەی منداڵەکەی منی دزی؟

– گوتم: خاتوونەکەم کەمێ ئارامبە، بۆئەوەی بتوانم لەگەڵتدا بدوێم.

– کلیۆپاترا گوتی: ناتوانم ئارام بگرم، بەڵام تۆ قسان بکە.

– من ڕووداوەکەم بەم شێوەیە بۆشاژنی میسر گێڕایەوەو گوتم: دوای ئەوەی هاتمەناو ماڵەکە، سەرەتا تەرمی منداڵەکەم بینی، دواتر چاوم بەنامەیەك کەوت کەلەتەنیشتیدا دانرابوو.

– شاژن پرسی: ئەونامەیە لەلایەن کێوە نووسراوە؟

– دەمویست بەدرۆ بڵێم من ئەونامەیەم نەخوێندۆتەوە، بەڵام بیرم لەوەکردەوە ئەودوو خزمەتکارانەی لەگەڵمدابوون دیتیان کەنامەکەم خوێندەوە، بۆیە نەدەکرا بەدرۆ بڵێم نامەکەم نەخوێندۆتەوە، ئەوەبوو گوتم: کاتێ ئەونامەیەم خوێندەوە نەمزانی لەلایەن کێوە نووسراوەو بۆکێیە، هەر کەسێکی لەجێگای منبایە ئەوا ئەونامەیەی دەکردەوە، بۆ ئەوەی بزانێت چی تێدا نووسراوە، چونکە گومانی تێدانییە

ئەوەی لەونامەیەدا نووسراوە پەیوەندی بەمنداڵەکەی تۆوەهەیە، بۆیە نامەکەم کردەوەو خوێندمەوەو دیتم بۆچوونەکەی من ڕاستدەرچوو ولەونامەیەدا هۆی مردنی منداڵەکەی تۆی تێدا نووسراوە، بەڵام خاتوونەکەم پێویستە ئەوەش بڵێم لەناو دەقی ئەونامەیەدا شتی تریش نووسراوەو نابێ کەس بزانێت، بۆیەش من ئەونامەیەم لەژێر کراسەکەی خۆمدا شاردۆتەوە، ئێستا وابەرێزت هاتی، ئەونامەیە دەدەم بەتۆ تابیخوێنیتەوە.

– کلیۆپاترا نامەکەی لێوەرگرتم ودەستیکرد بەخوێندنەوەی، من تێبینی ئەوەمکرد خوێندنەوەی نامەکە کاریگەری لەسەرئەو کەمە، وەك ئەوەی پێشئەوەی ناوەڕۆکی نامەکە تێبگات، بزانێ چی تێدانووسراوە، کاتێ گەیشتە ئەوڕستەیەی کەکاڵ دەڵێت منداڵەکەی لەباوەش کەوتۆتە خوارێ ومردووە، نامەکەی فڕێدایەسەر زەوی وبۆلای منداڵەکەی چووەو کردیەوە ئامێزی، منیش نامەکەم هەڵگرتەوەو خستمەوەژێر کراسەکەم، بۆئەوەی کەسانوتر نەیخوێننەوە، نەوێرام جارێكوتر تەرمی منداڵەکە لەدایکی وەربگرمەوە، کلیۆپاترا لەپڕ هاواروکردو گوتی: کوا ئەودزە ڕۆژگار ڕەشە؟ بۆنایگرن؟ وەك ئەوەی بۆگرتنی کاڵ بگەڕێتەوە بۆکۆشکی پاشایەتی، گوتی بابکەوینەڕێ لێرەبڕۆین، لەوکاتەدا تەرمی منداڵەکەی بەباوشەوە گرتبوو لەماڵەکە چۆدەرێ، منیش پاش چوونەدەرەوەی ئەو دوای کەوتم ولەگەڵ شاژندا چوومەناو کەژاوەکەو بەڕێ کەوتین، کاتێ گەیشتینە کۆشکی پاشایەتی وبەتلیمۆسی چواردەهەم تەرمی منداڵەکەی بینی، کەوتەگریان و فەرمانی دەرکرد ئەسکەندەریەو هەموو شوێنەکانی میسر بگەڕێن تاوانبارەکە دەستگیربکەن، هەر لەوشەوەدا هەموو سەربازەکانی ئەسکەندەریە بۆدەستگیرکردنی کاڵ کەوتنەپشکنین وبەدوایدا گەڕان.

ڕۆژی دواتر سێ کەس لەشارەزایانی مۆمیاکار، لەمردوخانەوە بۆکۆشکی پاشایەتی هاتن، تاکو تەرمی منداڵەکە مۆمیا بکەن.

لەئەسکەندەریە دوو خانەی مۆمیاکردنی تێدابوو، یەکێکیان تایبەتبوو بەخێزانە ئەرستۆکراتەکان وئەوی تریان هی چین وتوێژە جیاجیاکانیتر بوو، تەرمی ڕۆمیەکانیشیان لەخانەی ئەشرافەکاندا مۆمیادەکرد، بەتلیمۆسی چواردەهەم پاشای میسر ڕازنەبوو تەرمی منداڵەکەی ئەو لەخانەی ئەشرافاندا مۆمیابکرێت وگوتی تەواوی پێداویستییەکانتان لەناو کۆشکی پاشایەتیدا بۆدەستەبەردەکەم ودەبێ لێرە تەمری کورەکەم مۆمیابکەن.

من هەرگیز خانەی مۆمیایی کردنم نەبینیبوو، نەمدەزانی چۆن تەرمەکان مۆمیایی دەکەن، یۆنانییەکان عادەتیان نەبوو مردووەکانیان مۆمیایی[67] بکەن.

67)– لەسەر گوزەشتەی سینۆهە. پزیشکی تایبەتی فرعون. کەبەقەڵەمی والتاری فنلاندی نووسراوە، بەدرێژی شێوازی مۆمیاکردنی مردووەکانمان خۆستۆتە بەرچاوی خوێنەران. بەڵام سەرگوزەشتەی سینوهە: پزیشکی تایبەتی فرعون. هەزارو سێسەدو پەنجا ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح نووسراوە، لەکاتێکا بەسەرهاتی شرمیون کارەکەری تایبەتی کلیۆپاترا [illegible] بۆنیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی میلادی، وەك دەبینن زۆربەی سەرگوزەشتەکە زیاتر [illegible] لەسەردەمی فرعەون (ئامن عوتپ)ی چوارەم. ناسراو بە(ئەخناتون) شاری ئەسکەندەریە [illegible] لەجۆری مۆمیایی کردنی لاشەی منداڵەکەی

کلیۆپاترا، بخەینە بەرچاوی خوێنەران وبۆ ئەوانەی کەحەزیان لەخوێندنەوەی مێژووییە، کەئەمانە بێ جیاوازی ولێکنەچوون وکەموکوڕی نابێت.(و– فارسی)

مردووەکانیان بێ مۆمیایی کردن دەناشت، بەڵام دوای ئەوەی لەمیسر دەسەڵاتیان گرتەدەست عادەتی میسرییەکانیان گرت وبڕیاریاندا مردووەکانی خۆیان مۆمیایی بکەن، ئینجا بیاننێژن، تابەسەرچوونی ڕۆژگار تەرمی مردووەکە تێکنەچێت.
هەندێجار بەمنداڵی بەبەردەم خانەی مۆمیاکردنەکەدا تێدەپەڕیم وهەموو جارێك بۆنێکی ناخۆش بەبن لوتم هەڵدەهات، بۆنی مۆمیاخانەکە لەبەرلوتی من وەك بۆنی دەباغخانەبوو، لەڕۆژگاری منداڵیمدا کاتێ لەگەڵ دایکمدا بەبەردەم مۆمیاخانەکەدا تێدەپەڕیم، لەئەوم دەپرسی ئێرە کوێیە کەوابۆنێکی ناخۆشی لێوەدێت؟
دایکم دەیگوت: ئێرە شوێنێکە کەخەڵکی خۆشبەخت بۆ ڕۆیشتن بۆدنیایەکیتری تێدا ئامادەدەکەن، بەڵام ئێمە دوای مردنمان ناهێندرێین بۆئێرە، چونکە ئێمە کارەکەرین ولاشەی کارەکەرو نۆکەر، دوای مردنیان مۆمیایی ناکەن.
– لەدایکم پرسی: بۆچی لاشەی کارەکەرو نۆکەرەکان مۆمیایی ناکەن؟
– دایکم لەوەڵامدا دەیگوت: چونکە مۆمیاییکردنی لاشە خەرجی هەیەو هیچ کەسێکی کۆیلە مۆمیایی ناکرێت، ئێمە چون کارەکەرین پارەمان نییە تادوای مردنمان لاشەکەمانی پێ مۆمیایی بکەن، بۆیە ئێمە وەك ئاژەڵ دەمرین، چەند ڕۆژێك دوای ئەوەی تەرمی ئێمەیان ژێرخاککرد لاشەکەمان دەڕزێت ودواتر لەناودەچێت وهیچمان لێنامێنێتەوە، بەرلەوە مۆمیاخانەکەم نەدیتبوو، دوای ئەوەی بیستم لاشەی منداڵی کلیۆپاترا لەکۆشکی پاشایەتیدا مۆمیادەکەن، بڕیارمدا دەبێ شێوەی مۆمیاییکردن ببینم.
شارەزایانی مۆمیاکار کەلەمۆمیاخانەی ئەشرافەکانەوە هاتبوون بۆکۆشکی پاشایەتی ئەسکەندەریە، بەساڵاچووبوون و سەروسیمایان سپی ببوو، بەڵام پێچەوانەی پیرەکانیتر کەددانیان لەدەمدانەماوە، ئەوانە ددانە سپی وجوانەکانیان دەبریسکانەوە، من هەر زوو زانیم، ددانی هەرسێکیان دەستکردەو ددانی مردووەکانەو لەمۆمیاخانەکەدا لەدەمیاندا هەڵیانکێشاون.
لەو ڕۆژانەدا وەستایانی مۆمیاکردن لەکۆشکی پاشایەتیدا خەریکی مۆمیاییکردنی لاشەی منداڵەکەی کلیۆپاترابوون، سەبارەت بەمۆمیاییکردنی تەرمەکان زانیاری زۆرم دەستکەوت، لەمانەوەش ئەوەم زانی بۆئەوەی لاشەکە بەتەواوی مۆمیایی بێت، دەبێت ددانی مردووەکە هەڵبکێشرێن، چونکە ئەگەر مردووەکە ددانی لەدەمدا بمێنن، دوای ماوەیەك لەبۆشایی ناوڕیزی ددانەکاندا پووکەکە ڕزیوی دروستدەکات ودواتر تەشەنەدەکات وئەگەر هەموو لاشەکە نەگرێتەوە ئەوا دەموچاوی تێکدەدات، بۆیە ئەوکەسانەی حەزدەکەن مردووەکانیان بەشێوەیەکی تەواو مۆمیابکرێت، بڕیاردەدەن ددانی مردووەکانیان دەربهێندرێن، هەندێ لەخاوەن مردووەکان، ددانی مردووەکانی خۆیان لەکارکەرانی مۆمیاخانەکە وەردەگرنەوە، بەڵام هەندێك لەخاوەن مردووەکان گرنگییان بەوەرگرتنەوەی نەدەداو ئەوددانە بۆکارکەرەکانی مۆمیاخانەکە جێ دەماو ئەمانیش دەیانبرد بۆلای ددانسازو ددانسازەکانیش بەنرخێکی زۆر بۆژن وپیاوە ئەشرافەکانیان دادەنان.

مـن دوای بینینـی ئەوسـێ مۆمیـایی کەرانـەو قـسەم لەگەڵیانـدا کلـردن، زانـیم لەوڵاتەکـەی ئێمـەدا مۆمیـاییکردنی لاشـەی مـردووان تـەنها بـۆ دەوڵەمەنـدەکان دەکـرێن وخزمـەتکارەکان بێئـەوەی مۆمیـایی بکـرێن، دەخـرێنـە گـۆڕەوەو کـەڵك وەرگـرتن لەددانـە کێـشراوەی مردووەکـانیش هـەربۆ دەوڵەمەندەکانـە، ئێمەی خزمەتکاریش دوای ئەوەی پیربووین وددانەکانمان کەوتن بەبێ ددانی دەمێنینەوە.

پێشئەوەی ئەوان دەستبکەن بەمۆمیایی کردنی تەرمی منداڵەکەی کلیۆپاترا لەکۆکشی پاشایەتیدا، سێ حـەوزیان دروستکردن، حـەوزی یەکـەمیان پڕکـرد لـەئاو وخـوێ، حـەوزی دووەمیـان پڕکـرد لـەگیراوەی کـافور، حـەوزی سـێیەمیان پڕکـرد لـەخۆڵی مـازوو وداری نـەبقی کـوتراو، دواتـر تـەرمی منداڵەکـەیان خـستەناو ئەوحـەوزەی کـەپڕبوو لـەخوێاوك، دوای شـەو ورۆژێـك لـەناو ئەوحـەوزەیان هێنایـەدەرێ وخستیانەناو حەوزی کافورەکەوە، شەو ورۆژێکیش ئەولاشەیە لەوێدابوو، دواتر تەرمەکەیان خستە حەوزی سێیەمەوە.

ڕۆژی چوارەم منداڵەکەیان لەحەوزەکە دەرهێنایـەوەو کونێکیـان لـەورگی کـردوو ڕیخۆڵـەو دڵ وجگـەرو گورچیلەو هەموو هـەناویان دەرهێنـا، بەشـێوەیەك کـەورگ وسـینگی منداڵەکە بەتاڵبوو، دواتر بەڕێگای کونکردنی لوتییەوە بەهۆی کەرەسـتەی تایبەتـەوە مێشکی منداڵەکەیان لەناو سـەریدا دەرهێنـا ، دواتر هـەر لـەڕێگای ئـەو کونـەی لوتییـەوە کەللـەی سـەرکەیان پڕکـرد لـەڕۆنی کـافورو کونەکـەیان گـرت تائـەو شـلەیە لەلوتییـەوە نەهێتـەدەرێ، ئـەو وەسـتا مۆمیاکارانـە بۆمنیـان ڕوونکـردەوەو گوتیـان: بۆئـەوەی ئەولاشەیە مۆمیایی بێت، دەبێ هیچ شتێك لەناو سینگ وسك وکەللەیدا نەمێنێت، چونکە ئەگەرشتێك لەوێدا بمێنێتەوە دەبێتەهۆی ڕزاندنی لاشەکەو خەرای دەکات، دوای ئەوەی کەللەی لاشەکەیان لەڕێگای لوتییەوە پڕکرد لەڕۆنی کافور سینگ وسکیشیان پڕکرد لەهەمان ڕۆن وئەوکونەی کەلەورگیان کردبوو دروویانـەوە بۆئـەوەی ئەوشـلەیەی نـاوی نەیەتـەدەرێ، دواتـر تەرمەکـەیان خـستەوەناو حـەوزی خوێاوەکەوە، لاشەی ئەومنداڵ ماوەی بیست ڕۆژ لەناو ئەو حەوزی خوێاوکە خەستەدامایەوە، دوای ئەوماوەیە تەرمەکـەیان لـەناو ئەوحـەوزە دەرهێناو خستیانە حـەوزی دووەم کەپڕبووە لەشلەی کافوور، بیست ڕۆژ لەوێشدا مایەوە، ئینجا خستیانە حەوزی سێیەم کەپڕبوو لەتۆزی مازوو وخۆڵی داری نـەبق، لـەوماوەی کەشەسـت ڕۆژ تـەرمی ئەومنداڵـە لەوحەوزانـەدا مایـەوە، ئـەو سـێ مۆمیاکارانـە، لەکۆشـکی پاشایەتیدا نانیاندەخوارد، بەڵام ڕۆژی جارێك دەچوون بۆخانەی مۆمیـاییکردنی ئەشرافەکان، چونکە دەبا بچونایە ڕێنمایی کرێکارانیان کردبا.

دوای شەسـت ڕۆژ، ڕەنگـی پێـستی منداڵەکـە ڕەش هەڵگـەڕاو وەسـتاکارەکان گوتیـان ئێـستا کـاتی ئـەوەهاتووە لاشـەکە تیتـاڵ[68] پـێچ بکـەین، ئـەوان ئـەو لەفافـەیان هەڵبـژارد کەبـەگیای شـامدانەگزنە چنرابوون.

68- تیتاڵ پێچ. پەڕۆیەکی درێژی ڕاستە کەزیاتر لەلەفاف دەچێت.(و-کوردی)

پێشئەوەی لاشەی منداڵەکە بپێچن ورگی منداڵەکەیان کردەوە، من بینیم ناوسکی منداڵەکە یەك دڵۆپ ڕۆنەکەی تێدانەمابوو، ئەمانە سك وسینگی ئەو منداڵەیان پڕکرد لەکافوری وشك وخۆڵی مازو وداری

کوتراوی نەبق، ئینجا دەستیانکرد بەپێچانی لەشی منداڵەکە، پێشئەوەی لەفافەکان لەمنداڵەکە بپێچن، لەسەر ڕووی لەفافەکە یەك توێژاڵ کەتیرەیان بەسەردا سوییەوە، دواتر دەستیانکرد بەپێچانی تەرمەکە، هەتا دەموچاویشیان کرد بەیەك پارچە ریتاڵ، ئەگەر من بەچاوی خۆم نەمبینیبا ئەوا باوەڕم نەدەکرد، کەئەمە تەرمی منداڵێکە، کاتی ئەوەهات تەرمی منداڵەکە ببەن بینێژن، بەڵام بەتلیمۆسی چواردەهەم کەیەقینی تەواوی هەبوو ئەوەمنداڵی خۆیەتی، ڕازی نەبوو منداڵەکە بنێژن وگوتی: دەبێ منداڵی خۆم لای خۆم بمێنێتەوە، هەندێ لەخزمەتکارانی کۆشکی پاشایەتی ویستیان پاشا ڕازی بکەن واز لەوبیرۆکەیە بهێنێت، بەڵام بەتلیمۆسی چواردەهەم لەبڕیارەکەی خۆی پەشیمان نەبووەو گوتی: ئەو ژوورەی کەخۆی تێدادەخەوێت لەوێدا ئاگاداری منداڵەکەی دەکات، من تێبینیمکرد کلیۆپاترا لەوبڕیارەی مێردەکەی نارەحەتە، چونکە کلیۆپاترا دەیزانی ئەوە منداڵی مێردەکەی نییەو ئەو خۆشەویستییەی بەتلیمۆسی چواردەهەم سەبارەت بەومنداڵە ئازاری کلیۆپاترای دەدا.

وەساکارانی مۆمیاکردنەکە حەقدەستی خۆیان وەرگرت ومنداڵەکە نەنێژراو لەژووری بەتلیمۆسی چواردەهەم دانرا، من سەرم سوڕمابوو لەوخۆشەویستییەی بەتلیمۆسی چواردەهەم، چونکە کاتێ ئەومنداڵە زیندووبوو پاشا ئەوەندە هۆگری نەبوو، دواتر بۆم دەرکەوت هۆی ئەوخۆشەویستییەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە لەکاتی زیندوێتی منداڵەکەدا زۆرگوێی پێنەداوە، ئەو پەشیمانییە کەبۆچی لەکاتی زیندوییی ئەودا خۆشی نەدەویست، منیش لەژیانی خۆمدا ڕووبەڕووی ئەو هەستەبوومەوە، دوای مردنی دۆست وئاشناکانم، زۆر پەشیمان دەبوومەوەو دەمگوت بۆچی تائەو ڕۆژەی ئەو زیندووبوو من ئەوم زۆر خۆشنەدەویست.

دوای چەند ڕۆژێك تەرمە مۆمیاکراوەکە لەژووری بەتلیمۆسی چواردەهەمدا بوو، ڕۆژێکیان پاشای میسر لەکۆشکی پاشایەتیدا نەبوو، کلیۆپاترا بانگی منی کرد، منیش چووم بۆلای ئەو وئەویش منی لەگەڵخۆیدا برد بۆ ژووری مێردەکەی وتەرمی منداڵەکەی تیشاندام و گوتی: شرمیون سەیرکە براکەم چی کردووە؟

بینیم لەفافەکانی کەلەدەموچاوی منداڵەکە پێچرابوو، کزابۆوەو لەڕووخساری منداڵەکەدا چەند چاڵ وچۆڵ پەیدابووبون، من زانیم ئەم قوڵتانە بەهۆی چییەوە دروستبوون، چونکە ئەو کەتیرەی بەلەفافەکەوە نرابوو وشکبۆتەوەو کاتێك ئەو لەفافەشیان لەسەر لابردووە هەندێ لەوردەگۆشتی لەسەرڕووی دەموچاوی منداڵەکە هەڵکەندووە.

براکەم نەیزانیوە یەك لاشەی مۆمیاییکراو نابێ لەفافەکانی لێبکرێتەوە، چونکە ئەو کەتیرەی بەلەفافەکانەوە نراوە، بۆتە یەك چەسپی بەهێزو دوای وشکبوونەوەی بەشێوەیەك بەگۆشتەکەوە دەنوسێت، گۆشتەکەش دەپچڕێ، مەعلومبوو کەبەتلیمۆسی چواردەهەم حەزی کردووە ڕووی منداڵەکەی ببینێت، بۆیە لەفافەکەی لێکردۆتەوەو سەرئەنجام لاشەی منداڵەکەی تێکداوە، ئێمە نەماندەزانی پێویستە چی بکەین، خودی پاشای میسریش کەئەو کارەی کردبوو، نەیدەزانی چی بکات؟

– کلیۆپاترا گوتی: بڕۆن یەکێك لەوەستاکارانی مۆمیایی لەخانەی، مۆمیاکردنەکەی ئەشرافەکاندا بهێنن، بۆئەوەی ڕێگا چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە.

– یەکێك لەو وەستا مۆمیاییکەرانەی تەرمی منداڵەکەیان مۆمیایی کردبوو، هات، کاتێ بینی لەفافەکەیان لەسەرڕووی منداڵەکە لابردووە، سەرسام بوو ولەکلیۆپاترای پرسی بۆچی ئەوکارەت کردووە؟

– شاژنی میسر گوتی: من ئەوکارەم نەکردووە، براکەم لەفافەکەی لەسەرڕووی منداڵەکە لابردووە بۆئەوەی دەموچاوی ببینێت.

– مۆمیاییکەرەکە گوتی: خاتوونەکەم منداڵی تۆ بەپێی شێوازی (شێداری) مۆمیایی کراوە، لەشێوازی مۆمیایکردنی شێداردا ئێمە گۆشتی لاشەکە وشك ناکەینەوە، لەفافەکە لەتەرمەکە دەپێچین بۆئەوەی تەرمەکە وردەوردە وشکبێتەوە، ئێمە بەپێی بڕیاری پاشای میسر، منداڵەکەی تۆمان بەشێوازی شێدارانە مۆمیایی کرد، چونکە من بەپاشام گوت، ئەگەر گۆشتی تەرمەکە وشك بکەینەوە، شێوەی مردووەکە بەجۆرێك دەگۆڕێ کەناناسرێتەوە، بەڵام لەشێوازی شێداردا شێوەی تەرمەکە دەناسرێتەوە، ئەگەر دوای پێنج هەزار ساڵیتر لەفافەکە لەسەرڕووی مردووەکە لابەی، دەتوانن بەئاکارو سیمای ئەو بیناسنەوە، بەڵام کەبەشێوازی شێدار مۆمیایی کرا، نابێ لەفافەکەی لێبکرێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو کەتیرەیەی تیتاڵەکەی هەڵدەسوین، ئەوەندە بەهێزە هەرکاتێ ئەولەفافە لابەن، گۆشتەکە هەڵدەکەنێت، چونکە گۆشتی مردووەکە تازەو شێدارە.

– کلیۆپاترا گوتی: ئێستا بەشێك لەگۆشتی دەموچاوی منداڵەکەم پچڕاوە، ئایا تۆدەتوانیت وەك پێشووی لێبکەیتەوە؟

– مۆمیاکارەکە گوتی: نەخێر، چونکە ئەوگۆشتەی لەڕووی منداڵەکە هەڵکەنراوە، دەموچاوی منداڵەکە ناگرێتەوە، هیچ ڕێگا چارەیەك نییە جگەلەوەی ئەوشوێنانەی گۆشتکەی لێبۆتەوە بەکەتیرە پڕبکەمەوەو دواتر لەفافەکەی لێباڵێنمەوە.

کلیۆپاتراو براکەی ناچار ڕازی بوون، ئەو شوێنانەی چاڵببوون بەکەتیرە پڕبکرێتەوە، مۆمیاکارەکە ئەم کارەی ئەنجامداو بەلەفاف سەری منداڵەکەی پێچایەوە.

کاهینی گەورەی پەرستگای دلف، کەمن لەبیرەوەریەکەمدا لەمەبەر ناوم هێناوە، دوای ئەوەی بیستی پاشای میسر تەرمی منداڵە مۆمیاکراوەکەی لەناو ژووری خۆیدا داناوە، هات بۆ ئەسکەندەریەو چوو بۆلای پاشاو بەئەوی گوت، ئەوتەرمە لەژوورەکەی خۆتەوە بنێرە بۆگۆڕستانی پاشایەتی میسر، چونکە پێش تۆش زۆر لەئەژدادی تۆ منداڵی خۆیان لەدەستداوەو لاشەی ئەوانەیان مۆمیایی کردووە، بەڵام هیچ یەکێك لەمانە تەرمی ئەوانەیان لەژوورەکەی خۆیاندا دانەناوە، بەڵکو بردویانە لەگۆڕستانی پاشایاندا ناشتویانە، چونکە خواکان فەرموویانە کاتێ کەسێك دەمرێ، پێویستە لاشەی ئەو دوور بخرێتەوە لەوشوێنەی کەزیندووەکانی تێدادەژین، دەبێ لەشوێنێك بنێژرێت دووربێت لەماڵی خەڵکەوە، تۆش ئەمکارە بکەو تەرمی منداڵەکەت لەخۆت دووربخەرەو بۆ گۆڕستانی پاشایانی بنێرەو بڵێ لەوێدا بینێژن، هەر کاتێکیش وەرەسی ڕۆڵەکەتکرد، بچۆسەردانی گۆڕەکەی بکەو سێبوریت دێت، بۆیە خواکان گوتویانە مردووەکانتان بنێژن چونکە خاك سێبوریدەرە، تۆ ئەگەر لاشەی منداڵەکەت لەبەرامبەرخۆتدا دابنێیت، هەرگیز سێبوریت بەمردنی ئەونایەت، هەرجارەی سەیری لاشەکەتکرد وادەزانی کەلەهەمان

کاتدا مردووەو ئێشەکەی تۆ بەردەوام تازەدەبێتەوە، کەتەرمەکە چووەناو خاکەوە، تۆ سێبوریت دێت وخاك فەرامۆشیت دەداتێ.

بەتلیموسی چواردەهەم ئامۆژگاریەکەی کاهینی وەرگرت ورازیبوو لاشەی منداڵەکە لەکۆشکی پاشایەتییەوە بۆ گۆڕستانی پاشایانی میسر ببەن ولەوێدا بینێژن، بەم شێوەیە کارەساتی ڕفاندنی کۆرپەکەی کلیۆپاترا لەلایەن کاڵەوە کۆتایی پێهات وئەو ئەفسەرە گەنج وجوانە بەهۆی سەرەڕۆیی هەم منداڵەکەی خۆی لەدەستداو هەم قاچ وسەرگەردانبوو.

من گومانم لەوەنەبوو کاڵ لەمیسر چۆتەدەرێ، چونکە مەحاڵبوو ئەوگەنجە جوانە بتوانێت لەمیسردا بمێنێتەوەو نەناسرێتەوە، دڵنیابووم کاڵ لەدەرەوەی میسر ژیان بەسەردەبات، تائەو ڕۆژەی لەیەکێك لەگەشتەکان لەگەڵ کلیۆپاترادا چووم بۆپەرستگای دلف، لەوێدا کۆمەڵێ کوڕی گەنجم دیتن کەتازەببوون بەڕەهبان، ئەوکاتە ئەوەم بەبیرداهات پەرستگاکانی میسر کەلەناو ئەوانەدا ئایینی کۆنی میسریان دەپەرسترا داخراون، ئەگەر کەسێك بچێتە یەکێك لەوپەرستگایانەو ببێتە خزمەتگوزاری ئەوپەرستگایە، بەوەی لەگەڵ ڕۆحیانییەکاندا هەژماربکرێت، کەس ناتوانێت ئەو لەوپەرستگایە دەربهێنێت، ئەگەر توانیبای خۆی بگەیەنێتە یەکێك لەپەرستگاکانی میسر، ڕزگاری دەبوو، چونکە ئەگەر پاشای میسریش بیزانیبا کاڵ لەوێیە نەیدەتوانی لەوپەرستگایەی دەرکێشێتەدەرێ.

پێشینەکەی ڕەهبانی گەورەی دلف کەیەك پەرستگای یۆنانی بوو، ڕاستدەرچوو، دوای ئەوەی تەرمی منداڵەکەیان برد بۆگۆڕستانی پاشایانی میسرو لەوێدا ناشتیان، پاشای میسر مردنی منداڵەکەی بیرکردو کلیۆپاتراش کەمتر یادی منداڵەکەی دەکردەوە.

# کلیۆپاترای حەوتەم

# گەورەترین و بەرجەستەترین کەشتی دنیا

ئێستا دەمەوێت باسی واقیعیەتێك بکەم، کەلەڕۆژگاری دەسەلاتداریتی کلیۆپاترادا ڕوویداوە ئەویش مەلەسەی دروستکردنی کەشتییە.

ڕۆژێکیان لەخزمەت کلیۆپاترادابووم بینیم چەند کەسێك لەوەستایانی کەشتی دروستکردن لەوێن و کلیۆپاترا سەبارەت بەدروستکردنی کەشتی لەگەڵیاندا دەدواو گوتی: من داوا لەئێوەدەکەم کەشتییەکم بۆدروستبکەن لەسەرەتای دروستبوونی دنیاوە تائەمڕۆ هاوتای نەبووبێت ولێرەودواش تاکۆتایی دنیادێت کەس نەتوانێت کەشتییەکی لەوشێوەیە دروستبکات.

کەشتی سازەکان سەیرێکی یەکتریانکردوو یەکێك لەمانە گوتی: خاتوونەکەم تۆ چ جۆرە کەشتییەکت دەوێت؟

– کلیۆپاترا گوتی: من کەشتییەکم دەوێت کەدرێژیەکەی چوارسەد ئانیشك بێت.

– ئەوپیاوەی دەمڕاستی کەشتی سازەکانیتر بوو، لەسەر سوڕماویدا هاوارێکی لێهەڵساو گوتی: خاتوونەکەم ئایا گوتت درێژی کەشتییەکە دەبێ چوارسەد [69] باڵبێت ؟

(68)– ئەگەر یەك باڵ (زراع) بەنیومەتر مەزەندە بکەین ئەوا کلیۆپاترا ویستویەتی کەشتییەك دروستبکات کەدرێژیەکەی دووسەد مەترو بەرزیەکەی پازدە مەتربێت، تائەو ڕۆژە کەشتی چارۆکەدار– یان سەڵبەیی. بەوگەورەییە دروست نەکرابوو، تەنانەت تائەمڕۆشمان کەسەدەی بیستەمە، کەشتییەکی چارۆکەدار– یان سەڵبەیی ئاوا دروستنەکراوە (و– فارسی)

(69) دیارە لەکوردیدا ئانیشکیشمان هەیە– بەلام لیرەدا بەمەبەستی درێژی باڵ دانراوە، کەئەوکات باوبووە(و– کوردی)

– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ دەبێ کەشتییەکەی من سی ئانیشکیش بەرزی بێت!

– ئەو پیاوەی کەسەرەی وەستاکارەکان بوو گوتی: خاتوونەکەم کەشتییەك کەچوار سەد باڵ درێژی وسی ئانیشکیش بەرزبێت ئەوامەحاڵە بەهۆی چارۆکەوە بتوانرێت بەڕێگا بکەوێت و بڕوات.

– کلیۆپاترا گوتی: من بەهۆی سەڵبەلێدانەوە دەیڕۆیەنم.

– وەستاکارەکان کەوتنە بیرکردنەوەو سەرۆکی ئەمانە گوتی: خاتوونەکەم دەزانی ئەوکەشتییە کەچوارسەد باڵ درێژی وسی ئانیشك بەرزی بێت پێویستە چەند پانیبێت؟

– کلیۆپاترا گوتی: دەزانم دەبێ پانی کەشتییەکە یەك لەسەرشەشی درێژیەکەی بێت کەدەکاتە نزیکەی شەست ئانیشك.

– سەرۆکی وەستاکارەکان گوتی: خاتوونەکەم کەشتییەك کەچوار سەد باڵ درێژو شەست ئانیشك پانی وسی ئانیشك بەرزی بێت، ئەوەندە گران دەبێت کەبەقەت قورسایی هەرەمی گەورە دەبێت، ئایا دەزانی بۆبەجوڵەخستنی ئەمەو ڕۆیشتنی ئەوکەشتییە پێویستی بەچەند سەڵبەلێدەرە؟

– کلیۆپاترا گوتی: زۆری سەڵبە لێدەرەکان بەلای منەوە ئەوگرنگییەی نییە، ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەوەیە تاکۆتایی دنیا کەس نەتوانێت لەوکەشتییە گەورەتر دروستبکات.

– سەرۆکی وەستاکارەکان گوتی: خاتونەکەم ئایا بیرت لەوەکردۆتەوە دروستکردنی ئەو کەشتییە چەند خەرجی دەوێت؟

– کلیۆپاترا گوتی: من گرنگی بەتێچوونی خەرجی زۆری ئەونادەم، خەرجی دروستکردنی کەشتییەکە چەندبێت دەیدەم.

– دواتر کلیۆپاترا گوتی: ئایا ئێوە ڕازین کەشتییەکی ئاوا بۆمن دروستبکەن؟

– سەرۆکی وەستاکارەکان گوتی: خاتوونەکەم پێویستە ماوەیەکمان مۆڵەت بدەیتێ بۆئەوەی بڕۆین لێکی بدەینەوە، حسابی بکەین داخوا کەشتییەك بەوچۆنایەتییە قورساییەکەی چەند دەبێت، چونکە لەوانەیە دوای ئەوەی ئێمە ئەو کەشتییەمان دروستکردو خستمانە ڕووبارەوە بەهۆی گرانییەوە نقوم بێت، چونکە هەر لەسەرەتای دروستبوونی دنیاوە تاوەکو ئەمڕۆ کەشتی وا دروستنەکراوە، تائێمە بتوانین کەڵك لەئەزموونی خەڵکانی ڕابردوو وەربگرین، بەڵام ئەگەر ئێمە بتوانین ئەم کەشتیە دروستبکەین ئەواخەڵکانیتر کەڵك لەئەزمونی ئێمە وەردەگرن، ئایا دەزانی قەبارەی ئەوکەشتییە چەند دەبێت؟

– کلیۆپاترا بەخێرایی لەمێشکی خۆیدا لێکی دایەوەو گوتی: قەبارەی ئەوکەشتییە دەبێتە حەوسەدو نەوەت و دوو هەزار ئانیشك سێ جا.

– سەرۆکی وەستاکارەکان گوتی: خاتوونەکەم ئەم کەشتییە ئەوەندە مەزن دەبێت، کەبەقەبارە حەوسەدو نەوەت و دووهەزار سندوق دەبێت کەهەر سندوقێك نیوئانیشك درێژ وپانی وبەرزی هەبێت؟

– کلیۆپاترا گوتی: من ئاگام لەمە هەیەو دەزانم.

– سەرۆکی وەستاکارە کەشتی سازەکان گوتی: خاتوونەکەم تۆ سێ ڕۆژ مۆڵەتی ئێمەبدە تالێکی بدەینەوەو مشوەرەتێکی خۆمان بکەین وبزانین ئایا دروستکردنی ئەم کەشتییە ئەگەری هەیە– یان نا؟ دوای سێ ڕۆژیتر ئەگەرئێمە هاتینەلای تۆ تەنها دەڵێین دروستکردنی ئەو کەشتییە ئەگەری هەیە– یان نا؟ بەڵام ناتوانین سەبارەت بەشتیتر کەوابەستەیە بەدروستکردنی کەشتییەکەیە هیچ بڵێین، ئێمە ناتوانین پێت بڵێین خەرجی ئەوکەشتییە چەندە– ناتوانین بڵێین بۆ ڕۆیشتنی ئەوکەشتییە لەسەرئاو چەند سەڵبەلێدەری دەوێت؟ بەڵام ئەمانە شتێکن پێویستە ئێمە لەبەرچاویان بگرین.

– کلیۆپاترا گوتی: زۆرباشە ئێوە بڕۆن مەشوەرەتی خۆتان بکەن، داخوا دروستکردنی ئەو کەشتییە ئەگەری هەیە– یان نا؟ دوای سێ ڕۆژیتر وەرن وئەنجامی گفتوگۆکانی خۆتان بەمن بڵێن، ئەگەر بزانم ناتوانن ئەوکەشتییەم بۆدروستبکەن، ئەوا وەڵام دەنێرم بۆبەندەری سور بۆ دروستکردنی ئەم کەشتییە.

– سەرۆکی کەشتی سازەکان گوتی: خاتونەکەم گەورەترین کارخانەی کەشتی سازی دنیا لەئەسکەندەریەدایەو ئەگەر ئێمە نەتوانین ئەوکەشتییەی تۆ مەبەستتە دروستبکەین ئەواهیچ کەسێکیتر ناتوانێت ئەو کەشتییە دروستبکات.

– وەستارەکان ڕۆیشتن وسێ ڕۆژی پێچوو وهاتنەوەو بەشاژنیان گوت: ئەنجامی مشوەرەتەکەیان ئەوەبووە ئەگەری دروستکردنی ئەوکەشتییە هەیە، دوای ئەوەی دروستکرا هەرچەندە زۆر قورس دەبێت، بەڵام نقوم نابێت، چونکە وشکە، چونکە ئەوکاتەی کەشتییەکەم بەئاودادا تادوازدە ئانیشکی دەچێتەئاوەوە.

– کلیۆپاترا گوتی: کەواتە ئەگەر وابێت ئەواتەنها هەژدە ئانیشك لەکەشتییەکەی من لەسەر ئاوەوە دەبێت؟

– سەرۆکی وەستاکارەکان گوتی: بەڵێ خاتوونەکەم.

– کلیۆپاترا گوتی: من دەمەوێت بەرزی دیاری کەشتییەکەم سی ئانیشکبێت.

– سەرۆکی وەستاکارەکان گوتی: کەواتە دەبێ بەرزی کەشتییەکە پەنجا ئانیشك دابنرێت تابیست ئانیشکی ژێرئاو کەوێت وسی ئانیشکیشی لەسەر ئاوبێت، من پێموانییە ئەگەر بەرزی کەشتییەکە پەنجا ئانیشکبێت، تەنها بیست ئانیشکی ژێرئاو دەکەوێت، بەڵام دڵنیانیم چۆنە باش حسابمان نەکردووە، بۆیە ناتوانم زانیاری تەواوت پێبدەم.

لەو ڕۆژەدا وەستاکارەکان وکلیۆپاترا بەدرێژی سەبارەت بەشێوازی دروستکردنی کەشتییەکە قسەیانکردوو لەسەر ئەنجامدا لەسەر ئەوەرێککەوتن کەدرێژی وپانی وبەرزی هەمان ئەندازەی سێ ڕۆژ لەمەوبەربێ کەبڕیاری لەسەردرابوو، دواتر کەشتی سازەکان ڕۆیشتن بۆئەوەی بزانن خەرجی دروستکردنی ئەوکەشتییە چەندەوچەند سەڵبەلێدەری دەوێت، دوای سێ ڕۆژیتر دووبارە کەشتی سازەکان هاتنەوەلای کلیۆپاتراو گوتیان تەنها دروستکردنی پەیکەری کەشتییەکە دووسەدو پەنجا هەزار سکەی زێری بەتلیمۆسی دەوێت؟

– وەستاکارەکان گوتیان: ئەمە وابەستە بەوەنییە کەتۆ شێوەی دروستکردنی ناوەوەی کەشتییەکە چۆنبێت، واتا ناوەوەی کەشتییەکە چ تەلارو ژووری تێدا دروستبکەیت.

– لەو ڕۆژەدا کلیۆپاترا نەخشەیەکی گشتی پێدان وکەشتی سازەکان قەولیاندا پاش پێنج ڕۆژیتر نەخشەی ناوەوەی کەشتییەکە بکێشن وبێنەوە نیشانی شاژنی بدەن، ئەگەر کلیۆپاترا ئەو نەخشەیەی بەدڵ بوو، ئەوا ئەوان دەستبەکاکردن بکەن، دوای پێنج ڕۆژ وەستاکارەکان بەخۆیان و ئەونەخشەی کەکێشابوویان هاتنەوەو نیشانی کلیۆپاترایانداو گوتیان خەرجی دروستکردنی ناوەوەی کەشتییەکە بەمەزندەکردن نزیکەی ملیۆنێك ودوو سەدوپەنجا هەزار بەتلیمۆسی دەوێت.

– کلیۆپاترا بەونەخشەیە ڕازیبوو گوتی: ئەوپارەیە ماوەماوە دەدەم بۆدروستکردنی کەشتییەکە، کەشتییە مەزنەکی کلیۆپاترا تەنها کەشتییەکی گەشت وگوزاربوو، بەڵام لەکاتی شەڕدا دەتوانرا کەڵکی لێوەربگیرێت، کاتێ خەریکی دروستکردنی ئەو کەشتییەبوون، شاژنی میسر ماوەماوە دەچوو بۆسەردانی کارخانەی کەشتی دروستکردنەکە، چونکە تائەو ڕۆژە لەدنیادا کەشتییەك بەوگەورەییە

دروستنەکرابوو، بۆ دروستکردنی ئەو یەک کارخانەی تایبەتییان دروستکرد کەدرێژیەکەی پێنج سەد ئانیشکبوو وبەردەوام دوو هەزار کرێکار کاریان تێدا دەکرد.
لەوڵاتی میسردا ئەو تەختەیەی بتوانرێت کەشت شاژنی لێدروست بکرێت بەدەست نەدەکەوت بییە لەخۆرئاوای سوریاوە تەختەیان هێنان ودەیانگوت گوایە ئەوتەختەیە بۆ دروستکردنی کەشتی ئەوەندە باشە ئەگەردوو سەدە لەئاودابێت نارزێت.
سەرەتا دەستیانکرد بەدروستکردنی لاشەی کەشتییەکە دوای ئەوەی پەیکەرەکەی تەواوبوو، کرێکاری زیاتریـان هێنـان بۆدروسـتکردنی ناوەکـەی، کۆمـەڵێك کرێکـاریش بەشـی دەرەوەی کەشـتییەکەیان جوانـدەکرد، بەشـێوەیەك دیـوی دەرەوەی ئەوکەشـتییە مەزنـە جـوان ورازاوەبـوو کەهەرچـەندە تەماشاتکردبا هـەرلێی تێرنـەدەبووی. ماوەیـەك بیریـان لـەوەکردەوە چ ناوێك لەکەشتییەکە بنێن، دوو دڵبوون لەوەی ناوی شاژنی میسر کلیۆپاترای لێبنێن یان- نا؟ ئەوەی کەبووەجێگای دوودڵی ئەمانە ئـەوەبوو پـێش خاتوونەکـەی مـن شـەش شـازادەیتر لەمیـسردا هـەبوون، هـەرکاتێ نـاوی کلیۆپـاترا لەوکەشتییە بنێن، لەوانەیە لەگەڵ ناوەکانیتردا تێکەڵاوببێت، سەرئەنجام گەیشتینە ئەو رایەی ناوی بنێین کەشتی کلیۆپاترای حەوتەم، بەمەش لەناوی شازادەکانیتر جیادەکرایەوە.
لەلای راست وچەپی ناوەوەی کەشتییەکەدا سێ ریزی یەك لەسەریەك پێرکیان دروستکردبوون، بۆ ئەوەی سێ ریز سەڵبەلێدەر لەلای راست وسێ ریز سەڵبەلێدەر لەلای چەپ هەبن، بۆئەوەی سێ سەد سەڵبەلێیدرێت وسێ سەد سەڵبەیتر بەدوایدا لێبدرێت، چونکە ریزی سەرەوەی سەڵبە لێدەرەکان بەرزبوو، دارسەلبەکانی ئەوانیان درێژتر دروستکردبوو لەبەرئەوەی لەهەردوولای کەشتیسەکە سێ ریز سەڵبەلێدەر هەبوو، سێسەد سەڵبە لەلای راست دەچووە ناوەکەوە دواتر سێسەدەکەیتر دەکەوتە ناوەکەوەو ئەوی چەپ بەرزدەبۆوەو بەوشێوەیە، کەشتی کلیۆپاترای حەوتەم بەسێسەد جووت سەڵبە کەوتـە رۆیـشتن، جێگـای سـەڵبەلێدەرەکانیان بەشـێوەیەك دروسـتکردبوو، هەرچـەندە ریزەکـان لەسەریەکتری بوون، بەڵام هەموویان لەگۆشە نیگایەکەوە شوێنی فەرماندەکەیان ئەبینی، ئەوناوەندەی فەرماندەیەتیش وەك هەموو کەشتییەکانیتری کەبەسەڵبە دەرۆن بەرێگای لێدانی تەپڵی وفیکەوە دەست لەکارهەڵدەگرن ودەست دەکەنەوە بەسەڵبەلێدان، لەهەر یەك لەوسێ ریزە قاتقاتە هەشتسەد سەڵبەلێدەر لەپشت سەڵبەکانیانەوە دانیشتوون وهەرسەڵبەیەکیش هەشت کەسی لەسەرە، کەشتی گەشت وگوزاری کلیۆپاترا بەهێزی چوارهەزارو هەشتسەد سەڵبەلێدەر دەرۆیشت، ئەم چوارهەزارو هەشتسەد کەسە، ئەوەندە بەرێکی سەڵبەکانیان لێدەدا، کاتێ مرۆڤ لەدەرەوە سەڵبەکانی دەبیی وابەرێکی تێکرا لێدەدرێن باوەری نەدەکرد کەشەستسەد سەڵبەکە یەك دەست نییە، کلیۆپاترا لەوبروایەدابوو بۆ سەرنجراکێشان و راکێشکردنی گەشتیاران بۆئەسکەندەریە پێویستە دەست بەپروپاگەندەکردن بکرێت، دروستکردنی ئەوکەشتییە بەرازاندنەوەو جوانکاری رووکەشەکەی، دەبێتەهۆیەك بۆ راکێشکردنی گەشتیارانی بیانی، شاژنی میسر پێشنەوەی ئەو نایلۆنەی(کارت) کەسەبارەت بەشوێنە گەشتیارییەکانی ئەسکەندەریە بوو سـازبکات، ئەمانـەی نـاردبوو بـۆ وڵاتـانیتر تاخـەڵکی ئـەوێ ئەوشـوێنانە ببیـنن وبـێن بۆسـەردانی ئەسکەندەریە، دوای ئەوەی کەشـتییەکەی کلیۆپـاتراش تـەواوبوو دووبـارە کۆمـەڵێ وێنەکێشی هێنان بۆئـەوەی شـێوەی ئەوکەشـتییە بکێـشن.تائـەو تابلۆیـەی کەسـەبارەت بەشانـشینی ئەسـکەندەریەیە

بۆولاتانی تریش بنێردرێت، یەکێك لەوڕۆژانەی کەلەژیانی خۆم دایێرم ناچێتەوە، ئەو ڕۆژەبوو کەلەگەڵ کلیۆپـاترادا سـواری کەشـتییەکە بـوبین وڕۆیـشتین بۆگـەڕان، ماوەیـەکبوو کەشـتییەکەی کلیۆپـاترای حەوتـەم خرابـووە ئـاوەوەو ڕازاندنـەوەی تـەواوببوو کەیـەك لای بەنـدەرگای ئەسـکەندەریەیان بۆئـەو تەرخانکربوو، بۆئەوەی ببیبنن وبزانن مەزنی و جوانی ئەوکەشتییە بەبەراورد لەگەڵ کەشتییەکانی تردا چۆنەو چەندە، بۆیەش کەشتییەکی عادی تریـان لەتەك کەشـتییەکەی کلیۆپـاترادا ڕاگرتبـوو، کەزیاتر لەبەلەمێکی بچوك دەچوو بەبەراورد لەگەڵ کەشتییەکی ئاساییتردا.

لەو ڕۆژەدا بۆ یەکەمینجار شاژنی میسر سـواری کەشـتییەکەی بـوو، بەنـدەرو سـەکۆکەیان ڕازانـدبۆوەو هـەموو کەشـتی وبەلەمـەکان بەیـداغی ڕەنگاوڕەنگیـان هەڵـدابوو، مـن لەبەلەمێکـدابووم کـەکلیۆپاتراش لـەناوی بـوو، کاتێ لەکەشـتی کلیۆپـاترای حەوتـەم نزیکبوومـەوەو خـۆم لەتـەك ئـەودا دیبـەوە ویـستم سـەیری پێشەوەو دواوەی کەشـتییەکە بکەم، بـەڵام کەشـتییەکە ئەوەنـدە زل ودرێژبوو نـەمتوانی سـەرو کۆتـایی ببیـنم، دوایـی کەسـواری کەشـتییەکە بـووین، وەك ئـەوەوابوو پێمـان نابێتـە دنیایـەکی تـرەوە، فەرماندەی کەشتییەکە سەرەتا کلیۆپاترای بۆشوێنی سەڵبەلێدەرەکان برد، ئێمە لەوێدا کـەمێ وەسـتاین بۆئـەوەی سـەیری شـێوازی دروسـتکردنی ئەوسـێ قـاتی یـەك لەسـەریەکەی سـەڵبەلێدەرەکان بکـەین، سەڵبەلێدەرەکان هەموویان لەبەردەم سەڵبەکانیاندا وەستابوون وهـەموویان جلێکی سوورو پشتێنێکی سپیان لەبەربوو وسەریشیان تاشرابوو.

چوار هەزارو هەشت سەد سەڵبەلێدەر لەشەش ڕیزی پێرکیدا وەستابوون کەزیاتر لەلەشکرێك دەچوون، مـن پێموابـوو خـەرجی ئەوسـەڵبەلێدەرانە سـەبارەت بـەکلیۆپاترا گـران دەکـەوێت، بـەڵام دواتـر سـبەرم لەساویلکەیی خۆم سوڕما، چونکە کلیۆپاترا شاژنی میسربوو، بۆشاژن وپاشای میسر پارە نرخی نییە، هەرچەندی خەرج بکەن پارەی ئەمانە تـەواونابێت، وەك چۆن چـەم وجۆگاکانیتر دەچنەوەسەر ڕووباری نیل ونایـەڵن نیل بەتاڵبێتـەوە، ئاواش داهاتی شوێنی ڕابواردنی گشتی وبەنـدەری ئەسـکەندەریەو باج وەرگرتن، نایەڵێت خەزنەی پاشای میسر بەتاڵبێتەوە، کلیۆپاترا چەند ساتێك سەیری سەڵبەلێدەرەکانی کـرد- ئـەوانیش هـەر ڕاوەسـتابوون وخـەریکی تەماشـاکردنی شـاژنی میـسربوون، دواتـر تەپلییـەك بـەدەنگێکی تایبـەت لێدراو سـەڵبەلێدەرەکان تێکڕا بەیەکـەوە دانیشتن، ئەمـە وەك ئـەوەوابوو ئەوچـوار هـەزارو هەشتـسەد کەسـە، یـەك بوونـەوەرن وتـەنها دوودەسـت وقاچـیان هەیـە، دیـاربوو فەرمانـدەی کەشتییەکە دەیویست بەکلیۆپاترا بڵێت لـەم کەشـتییەدا ڕێك وپێکی هەیە، دواتـر شـاژنی بۆبەشـەکانی تربرد، ئەو ژوورانەی بۆ کلیۆپاترا دروستکرابوون وڕازاندبوونەوە، نیشانی ئەویاندان، مـن تێبینـیم کـرد هەریـەك لەوژوورانـە بەشـێوەیەکی جیاجیـاو تایبـەتی ڕازاندبوونـەوە، یـەکێك لـەژوورەکان لەپەرسـتگای میـسری قـەدیم دەچـوو، ژوورێکـیتر لەشـێوەی هـۆڵی میوانـان دروسـتکرابوو، کاتـێ مـرۆڤ دەچـوو بۆئـەو ژوورانە، وایدەزانی لەولاتی ڕۆمە، تەلارەکانی تریـان لەسەرشـێوەی یۆنـانی دروسـتکردبوو وڕازانـدبۆوە، لەوکەشـتییەدا حـەوزی مەلەشـی تێـدابوو بۆئـەوەی کلیۆپـاترا هـەرکاتێ حـەزیکرد بچێتەناو ئـەوئاوەوەو مەلەبکات وخۆی فێنك بکاتەوە، دوای ئەوەی شاژنی میسر هـەموو بەشـەکانی کەشتییەکە گـەڕا، لەسـەر تەختی کەشتییەکە دانیشت ومنیش لەپشتییەوە وەستاوم، لەلایـەن شـاژنەوە فەرماندەرکرا کەشـتییەکە بەڕێ بکەوێت، فەرماندەی کەشتییەکە هەرلەگەڵ شاژندابوو وفەرمانی ئـەوی بەیـەکێك لەدەرەجـەدارەکان

گوت، ئینجا دەنگی تەپڵ لێدانێکی گەورە کەلەدەنگی دەهۆڵ دەچوو بەرزبۆوە، کەشتییە مەزنەکەی کلیۆپاترای حەوتەم، کەبەهێزی شەشسەد سەڵبە ئەویان دەجولاند، بەڕێگا کەوت.

دەنگی دەهۆڵەکە هەرجارەی دوو کەڕەت لێدەدرا بۆڕێکخستننی سەڵبەکان، لێدانی شەشسەد سەڵبە بەجارێك دەنگێکی مەترسیداری لێدەهات، من کەتائەو کاتیش بەودەنگە ئاشنانەبووم، دەترسام، بەڵام شاژن نەدەترساو دەمبینی جارجار سەری بەسەر لایەکی کەشتییەکەدا شۆڕدەکردەوە بۆئەوەی ئەو سێ ڕیزە یەك لەسەریەکەی سەڵبەکان ببینێت، هەرچەندە چوارهەزارو هەشتسەد کەس سەڵبەیان لێدەدا، بەڵام من تێبینمکرد کەشتییەکەی کلیۆپاترا خێرایی کەمە، سەرم لەزەبەلاحی ئەو کەشتییە سوڕنەمابوو، چونکە بەجوڵەخستن وبەڕێکەوتنی ئەوکەشتییە وەك ئەوەوایە هەرەمی گەورە بجولێنێت، ئەوکەشتییە ئەوەندە زەبەلاحبوو، ئەگەرمن بەتەنیا لەناویا گەڕابام ئەوا نەمدەزانی سەری خۆمی لێدەرکەم وبگەڕێمەوە شوێنەکەی خۆم.

دوای ئەوەی کەشتییەکە کەمێ لەناوڕووباردا گەڕا، کلیۆپاترا فەرمانیدا لەبەندەرەکە بچێتەدەرێ و بڕوات بۆناو دەریا، شاژن دەیویست بزانێ داخوا ڕۆیشتنی ئەوکەشتییە لەدەریادا چۆنە، کاتێ لەڕووبارەکە تێپەڕین وگەیشتینە دەریا، خێرایی کەشتییەکە زیادیکرد.

– فەرمانەدەی کەشتییەکە گوتی: من ناوێرم لەڕووبارەکەدا فەرمانەدەم کەشتییەکە بەخێرایی بڕوات، چونکە نیل بۆکەشتییێکی ئاواگەورە بچوکە، ئەگەر بەخێرایی بڕوات لەگەڵ کەشتیتردا لێکدەدات، بەڵام لەدەریادا دەتوانێت بەبێ ترس لەپێکداکێشان تائەوشوێنە سەڵبەلێدەرەکان توانایان هەیە خێرای بکەن.

لەوکاتەی کلیۆپاترا لەدەریادا خەریکی گەشتبوو، دەمێك بەلای ڕاستداو دەمێك بەلای چەپدا بەئاراستەیەکی دیاریکراو کەشتییەکە دەڕۆیشت وکلیۆپاترا جارجار سەیری سەڵبەکانی دەکرد، چەند کەشتییەك دەیانویست بێنەبەندەری ئەسکەندەریە، بەڵام سەیرمکرد هەموو سەرنشینەکانی لەسەر کەشتییەکانیان کۆبوونەوەو بەچاوی سەرسوڕمانەوە سەیری کەشتییەکەی شاژنیان دەکرد.

ئێمە دەمانزانی ئەوەی زیاتر بۆتەجێگای سەرسامبوونی ئەوانە سێ ڕیزی سەڵبەکانە کەلەیەك کاتدا دەجولێن، دوهەفتە دوای ئەوەی شاژن بۆیەکەمجار سواری کەشتیکەی خۆی ببوو، فەرمانەدەی کەشتییەکە داوای لەشاو شاژنی میسرکرد لەکاتی شەودا سوار کەشتییەکەبن بۆئەوەی بتوانن ڕۆیشتنی کەشتییەکە لەبەر ڕۆشنایی فانۆسی دەریاییدا ببینن، ئەوشەوە وەك هەمیشە لەگەڵ شاژن وپاشای میسردا چووم، پێشئەوەی کلیۆپاتراو مێردەکەی ومن سواری کەشتییەکی عادی بین، بەئێمەیان گوت بڕۆن بۆئەو دورگەیەی کەفانۆسی دەریایی بەندەری ئەسکەندەریەی لەسەردامەزراوە، ئێمە گەیشتینە ئەوێ و لەقاتی خوارەوەی دورگەی فانۆسی دەریاکەدا وەستاین،

شەوقی فانۆسەکە لەسەرسەری ئێمەوە پانتایی بەندەری ئەسکەندەریەی ڕووناککردبۆوە، ئێمە دەمانتوانی هەموو شوێنێك ببینین، بەڵام کەس ئێمەی نەدەدی، لەوکاتەدا کەشتی کلیۆپاترای حەوتەم لەبەندەرەوە کەوتەجولەو ڕووناکی فانۆسی دەریایی ڕاستەوخۆ لێیدەدا.

کاتێ سەڵبەکان لەهەردوو لایەوە ئاوەکەیان شەقدەکردو ئەوکەشتییە کەوتەجولە، من لەسەر سوڕماویدا خەریکبوو هاواربکەم، ئەوکەشتییە بەشەشسەد سەڵبەی بەیەکەوە دەجولان، لەجانەوەرێکی سەیر دەچوو کەخاوەنی شەشسەد پێبێت وپێکانی خۆی یەك تەکانی بجولێنێت.

چەندجارێك کەشتی کلیۆپاترای حەوتەم بەدەری فانۆسی دەریاییدا وەرچەرخا تاهەموو شوێنەکانی کەشتییەکە لەبەر رووناکیی فانۆسەکەدا دەرکەوێت، دواتر کەشتییەکە وەستاو پاشاوشاژن وخزمەتکارەکان لەمانەش من، سواری بەلەم بووین وبەرەو کەشتییەکە رۆیشتین وچوینەسەری.

ئەوشەوە پاشاو شاژنی میسر ماوەیەك لەبەندەرو دەریادا گەڕان وشەوقی فانۆسەکە دەوروبەری کەشتییەکەی رووناککردبۆوە.

من گەشتی ئەو شەوەم پێخۆشتربوو لەگەشتی پازدە رۆژ لەمەوبەر کەبەرۆژ کردمان، چونکە کەشتییەکەی کلیۆپاترای حەوتەم لەبەر رووناکی فانۆسی دەریاییدا جوانتردیاربوو، ئەوکەشتییە لەسالانی دواتردا وەك یەکێك لەشوێنی رابواردنەکانی گشتی، بووبە سەرچاوەیەکی داهات، چونکە ئەوگەشتیارانەی بۆئەسکەندەریە دەهاتن، حەزیاندەکرد ئەوکەشتییە ببینن، هەرگەشتیارەش بۆ بینینی ئەوکەشتییە دەبا هەندێ پارەی دابا. ئەمڕۆش ئەوکەسانەی کەئێستا ئەوکەشتییە گەورەیە لەبەندەری ئەسکەندەریەدا دەبینن، تێدەگەن بۆدروستکردنی ئەو، چەند زەحمەتیان کێشاوەو کلیۆپاترا چەندی خەرجکردووە تابتوانێت کەشتی کلیۆپاترا دروستبکات، هەتاوو باوباران نەخشەو جوانی رووی کەشتییەکەیان لەبەین بردووە، بەلام تەختەی لاشەی کەشتییەکە کەناڕزێت یەك سامانی گران بەهایەو پێموانییە هەرگیز لەمیسرو ولاتانیتردا کەشتییەك دروستبکرێت، لەڕووی جوانی ومەزنی شان لەشانی کەشتی کلیۆپاترای حەوتەم بدات.

ئەو رۆژانەی کلیۆپاترا بەوکەشتییە گەشتی دەکردو لەسەرگۆڕایی تەختی کەشتییەکە لەسێبەری باوەشێنی گەورە- یان کەپری لەپەڕی تاوس دروستکراودا دادەنیشت ومنیش بەهێواشی باوەشێنم دەکرد، بەڕاستی بەگەورەترین شای دنیا دەهاتەبەرچاو ومەزنی ئەو هەموو کەسی دەخستەژێر ڕکێفی تیشکی خۆی وهەموو بەڕێزەوە لەبەردەمیا رادەوەستان.

کەشتی کلیۆپاترای حەوتەم بۆیە دروستکرا تاشاژن پێی بگەڕێت، دوای کۆچکردنی کلیۆپاترا کەس نەیویست کەلك لەوکەشتییە وەرگرێت، چونکە دەیانزانی لێوەشاوەیی سواربوونی ئەو کەشتییەیان نییە، ئەگەر رۆژێك لەمیسردا شاژن پەیدابن وەك کلیۆپاترابن ئەوکەشتییە گەورە دووبارە دەبێتەوەجێگای سەرنج ومەزنی وجوانی رابردووی بەبەردا دێتەوە، من پێموانییە مەملەکەتی میسر ئیتر ئەوهەرزانی وتێرییە ببینێتەوە، کەلەسالانی دروستکردنی کەشتی کلیۆپاترای حەوتەمدا هەبوو، داهاتی ئەو وشوێنی رابواردنی گشتی ئەسکەندەریە، بەئاستێك زۆر بوو کەپاشاو شاژنی میسر نەیاندەزانی ئەوهەموو پارەیە چ لێبکەن، دارخورمامان ئەوەندە بەریان زۆربوو زۆر زیاتربوو لەپێداویستی، خەلك خورمایان وەك دان بۆپەلەوەرەکان دەڕشت- یان دەیانخستە رووباری نیلەوە.

دانەوێلەش بەهەمان شێوە زۆربوو، بەشێوەیەك نرخی دانەوێڵە هەرزانبوو کەمن دەمدیت مالات بەخێوکەرەکان گەنمیان دەدا بەمەڕو مالاتەکانیان و ورگی مالاتەکانیان بەگەنم تێردەکرد.

سێ سال لەسەریەك دانەوێڵەو میوە لەمیسردا بەشێوەیەك زۆربوو نرخی گەنم لەنرخی دیاریکراوی دانەدەبەزی، تاگەیشتە نیوە قیمەت، بەلام جوتیارەکان زەرەریان نەکرد، چونکە بەروبوومی زۆریان هەلدەگرتەوە، لەپڕا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بەلایەك هات، بەلای ناوبراو بریتیبوو لەهاتنی کوللە.

ڕۆژێکیان من لەناوکۆشکی پاشایەتیدا سەرقاڵی کاری ئاسایی ڕۆژانەبووم، هەستمکرد هەتاو ڕووناکیی کەمبۆوە، دواتر وردەوردە ڕووناکی هەتاو کەمبۆوە، خۆمگەیاندەناو باغەکەو بۆم دەرکەوت هۆی کەمبوونەوەی ڕووناکی هەتاوەکە ئەوەیە لێشاوێك کوللە لەئاسماندا دەفڕن، ئینجا لێشاوی کوللە بەشێوەیەك زیادیکرد، دنیای تاریککردوو ئێمە ناچاربووین بەڕۆژی ڕووناك چرا هەڵکەین.
بەدرێژایی مێژووی میسر کەس بەبیری نایەت ئەوەندە کولله هاتبێت کەڕۆژ وەك شەو تاریکبکات، ئێمە لەئەسکەندەریەدا دەژیاین نەماندەتوانی لەشوێنەکانی تر چ ڕوویداوەو چ ڕوودەدات، لەئێوارەی ئەوڕۆژەدا هەواڵی سامناك لەملاولاوە گەیشتن وەعلومبوو کەلێشاوی کوللان کەوتۆتەسەر باغ وکشتوکاڵ وهەموو سەوزاییەکان پەل وگەڵای درەختەکان دەخۆن.
من پێموابوو مەترسی کولله کاتییەو ئەوکوللانە دوای ئەوەی تێربوون دەفڕن ودەڕۆن وناگەڕێنەوە، بەڵام دوای ڕۆژی یەکەم ڕۆژەکانی تریش، ئاسمان بەهۆی فڕینی کوللەکانەوە بۆچەند سەعاتێك تاریکدەبوو ئەوەتەنها ئەوکوللانە نەبوون کەبەئەسکەندەریەدا تێدەپەڕین وبەرەو دەریا دەڕۆیشتن، ماوەی پازدەڕۆژ لافاوی کولله درێژەی کێشا، دوای ئەوپازدە ڕۆژە لەسەرانسەری میسردا باغێك- یان کێڵگەیەکی سەوز بۆنموونەش نەمابوو.
پاشای میسرو کلیۆپاترا سواری کەشتی بوون لەڕووباری نیلەوە بەروسەرەوە ڕۆیشتن، بۆئەوەی بزانن تاچەند لێشاوی کولله زیانی بەباغ ودرەخت وکشتوکاڵ گەیاندووە، منیش وەك هەمیشە لەگەڵ خاتوونەکەی خۆمدابووم وتوانیم بارودۆخی دەشت وبیابان ببینم، لەکاتی ئاساییدا جۆگاکانی ئەم بەراوبەری نیل تاچاو تەتەری دەکرد سەوزایی وباغبوو، بەڵام ئەوکاتە من چەند چاوم دەگێڕا تالەمبەراوبەری نیلدا سەوزاییەك ببینم، هیچم بەرچاو نەکەوت، لەسەرتاسەری دۆڵی نیلدا کەسەرچاوەی ڕووباری نیلە، تەنانەت گەلایەکی سەوزم بەدرەختێکەوە نەبینی، هەرچی سەوزبوو خورابوو، دارەکان تەنها پەلولقەکانیان بەڕووتی مابوونەوە، جوتیاران وخاوەن باغەکانی میسر لەدەم ڕووباردا دەستەو ئەژنۆ وەملول دانیشتبوون ونەیاندەزانی چیبکەن.
پاشای میسرو شاژن نەیاندەزانی چۆن دڵنەوایی ئەوخەڵکە بدەنەوە، لەوسەفەرەدا کەپاشاو شاژن بەرەو میسری سەروو دەڕۆیشتن، من لەجوتیاران وخاوەن باغەکانم بیست، دەیانگوت: لەساڵانی داهاتوودا وەزعی خەڵك لەڕووی نەبوونی خۆراك وقاتوقڕی دەگاتە ئاستێك، کەکرێکارو وەستاکارانی خانەی مردوان دەبێ شەو وڕۆژ دەرگاکە دابخەن ونەهێڵن خەڵك بچێتە ئەوێ، چونکە خەڵك لەتاوی برسیەتی شاڵاو دەبەنەسەر خانەی مردوان و ئەوتەرمانەی کەمۆمیاییکراون ولەوێن دەیانخۆن.
- من لەلادێییەکانم پرسی بۆچی ئەوەندە نیگەرانن ولەئاینده دەترسن؟
- ئەوانە لەوەڵامدا دەیانگوت: کولله سیفەتێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێ دێ هەموو شتێك دەخوات ولەناودەبات، لەهەمان کاتیشدا گەرادادەنێت وگەراکەی پاش ماوەیەك دەبن بەکوللەو دەفڕن، ئەوکاتە هەرچی لەسەرزەوی ڕوابێت وسەوزبوبێت ئەوکولله تازە گەورەبووانە دەیخۆن، ئەمانە دەبن بەدوو بەش بەشێکیان دەفڕن ودەڕۆن بەشێکیشیان دەمێننەوە، ئەوبەشەی دواییشیان گەرا دادەنێنەوە، بۆیە کاتێ بەڵایەکی ئاوا دێتەخوار، تاماوەی دە ساڵ قاتوقڕی وگرانی باڵی دەکێشێت وبەهیچ شتێك ناتوانرێت ڕێگا لەوقاتوقڕیە بگیردرێت، کلیۆپاتراو مێردەکەی بەتلیمۆسی چواردەهەم، بۆئەوەی بەرەنگاری

ئەوگرانییە ببنەوە، بڕیاریاندا لەسوریاو مەملەکەتیتری ئاسیایی بچوکەوە، دانەوێڵە بهێنن، بەڵام کەشتییەکانی میسر دوای ئەوە کەچوون بۆسوریاو ئاسیای بچوك بەبەتاڵی گەڕانەوە، چونکە لەووڵاتانەدا لەفرۆشتنی گەنم پاریزیانکردبوو، مەعلومە کەڕەوە کوللە دوای ئەوەی لەمیسردا هەڵفڕی ولەدەریا تێپەڕی وخۆی گەیاندە سوریاو ئاسیای بچوك، هەرچی کشتوکاڵ و باغ هەیە لەوێ لەناوی دەبات، دانیشتوانی سوریەو ئاسایی بچوك، دەیانزانی ئەگەری ڕوو بەڕووبوونەوەی کوللەیان لەپێشەوەیە، لەفرۆشتنی گەنم بەمیسر داوای لێبوردنیانکردبوو وگوتبوویان ئەگەرئێمە ئەوگەنمەی هەمانە بەمیسری بفرۆشین، بەبرسیەتی دەمێنینەوە، ساڵی یەکەم دوای ئەوەی کوللەهات، چونکە لەعەمبارەکاندا دانەوێڵە هەبوو، خەڵك لەڕووی کەمی خۆراکەوە زۆر هەراسان نەبوون، بەڵام ساڵی دووەم برسیەتی دەستی پێکردو ئەوکەسانەی دانەوێڵەیان هەبوو نەیاندەفرۆشت، چونکە دەیانزانی برسی دەبن، سوریا کەهەمیشە سەرچاوەی هێنانی گەنمبوو بۆمیسر، دانەوێڵەیان نەدەفرۆشت دارخورماکانیش گەڵاکانیان نەمابوون، بۆیەش بەریان نەبوو، هەرکەگەڵای خورماکانیش سەوزبان کوللەکان دەیانخوارد.

ئاژەڵە ماڵییەکان، وەك مەڕومالاتی خەڵکی میسر ساڵێك دوای هاتنی کوللە لەبەین چوون، چونکە لەوەڕگا نەمابوون تامەڕومالات لەوێدا بلەوەڕێن، خاوەن ماڵاتەکان کەدەیانبینی ئاژەڵەکانیان لەبرساندا ناتوانن بجوڵێن، ئەوانیان سەردەبڕین بۆئەوەی کەڵك لەگۆشت وپێستەکەی وەرگرن، ئەو خەڵکانەی نەیاندەتوانی سکی خۆیان لەدانەوێڵەو گۆشتی ئاژەڵانی خۆماڵی تێر بکەن، لەبەیانییەوە تائێوارە لەسەر ڕۆخی نیلدا کۆدەبوونەوە تابتوانن ماسییەك- یان مارماسییەك- یان تیمساحێك- یان ئەسپێکی ئاوی بگرن، دەیانگوت جگەلە خواکان هیچ کەس ناتوانێت ڕووباری نیل لەتیمساح پاکبکاتەوە، بەڵام لەساڵانی قاتوقڕییەکەدا هەرچی تیمساح لەڕووباری نیلدا هەیە کوشتیانن وخواردیانن وئەسپی ئاویش لەڕووباری نیلدا نەما.

لەساڵی دووەمی قاتوقڕی وگرانییەکەدا ڕۆژێکیان دەگەڕامەوە بۆکۆشکی پاشایەتی، بینیم چەند کەس لەسەرمردوویێك شەڕدەکەن، بەسەرسامییەوە بۆم مەعلومبوو کەشەڕی ئەمانە لەسەرتەرمی منداڵێکە.

من نەمزانی ئەومنداڵەیان لەخانەی مردووان دزیوە- یان ئەومنداڵە مردووەیان لەشوێنیتر دەستکەوتووە، نەوێرام لەئەوان بپرسم داخۆ لاشەی ئەومنداڵەیان چۆن دەستکەوتووە، چونکە دەترسام ئەوپرسیارەیان لێبکەم وبمکوژن، ئەوکاتە قسەی جوتیارەکانی میسرم بیرکەوتەوە کەدەیانگوت: گرانی بەئاستێك تین دەهێنێت، خەڵك ناچاردەبن لەبرسان تەرمی مردووەکان لەوشوێنەی کەمۆمیایی تێدا دەکەن، بدزن.

کەچوومە کۆشکەوە ئەو ڕووداوەم بۆکلیۆپاترا گێڕایەوە، ئەو گوتی: من ومێردەکەم کاتێ دەتوانین بەخەڵك بڵێین لاشەی مردووان مەدزن ومەیخۆن، کەخۆراك بۆئەوان دابین بکەین، بەڵام چون ئێمە دەرەقەتی قاتوقڕی نایەین، ئەوانمان پێتێر ناکرێت، ناتوانین بڵێین دەست مەبەن بۆ مردووخانەکە.

گرانی سێ ساڵ درێژەی کێشا، دوو لەسەرسێی خەڵکی میسر لەبرساندا مردن، هەتا دەوڵەمەندەکانیش لەسەختی گرانییەکە لەبرساندا دەمردن، زێڕو زیویان هەبوو، بەڵام خۆراك دەست نەدەکەوت تابیکڕن،

ئـەوگورزەی کـەگرانی لەمیـسریدا زۆر لەهێرشـی ڕەشپێـستەکان کاریگـەری زیـاتربوو، چـونکە ڕەشپێستەکان ئەوشوێنانەی پێیداتێدەپەڕین
هـەموو شـتێکیان وێـران دەکـرد، بـەڵام بەوشـێوەیە هـەموو سـەوزایی ودانەوێڵـەیان نەدەچـنییەوەو نەدەخوارد.

پێشئەوەی گرانی ڕوو لەمیسر بکات، من ژنێك بووم خواردنم کەمدەخوارد، بەچەند پاروێك تێردەبووم، هەنـدێ ڕۆژ چـونکە حـەزم لـەخواردن نـەبوو، چێـشتم نـەدەخوارد، لـەکاتێکا لەمەتبـەخی کۆشـکی پاشایەتیدا باشترین خـواردن لێدەنرا، بەڵام دوای ئەوەی گرانی هـات، من توشی چێڵسی وبرسییەتی بـەردەوام بوومـەوە، هەرچـەندم دەخـوارد هەرهەسـتم بەبرسـییەتی دەکـرد، لەبەیانییـەوە تائەوکاتـەی دەمویست بخەوم هەرلەبیری ئەوەدابووم خەریکی ئەوەبووم خواردن بەدەست بهێنم وبیخۆم، من گومانم لەوەنییـە هـەموو ئەوانەی لـەناو کۆشـکی پاشـایەتیدا دەژیـان وخـەڵکی ئەسکەندەریەش وەك مـن بوون، ئەوانـەش لەبەیانییـەوە تـائێوارە تـەنها لـەبیری ئـەوەدابوون شـتێکیان دەسـتبکەوێ وبتـوانن ئـاگری برسییەتی پێ دابمرکێننەوە.

بەساڵاچووەکان دەیانگوت یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی گرانی ئەوەیە مرۆڤ هەرچەندە بخوات تێرنابێت، چونکە ترس لەبرسییەتی ڕێگا لەوەدەگرێت هەست بەتێری بکەیت.

پێموایـە ئەگـەر لەسـاڵی سێیەمدا کلیۆپـاترا بەدەریاوانـەکانی نـەگوتبا بـڕۆن لـەدەریادا ماسـی گـەورەو بێتامی نەهەنگ ڕاوبکەن، ئەواهەموو دانیشتوانی ئەسکەندەریەو ناوچەی دلتای ڕووباری نیل لەبرساندا دەمردن، هەرچی کەشتی لەئەسـکەندەریەو بەندەرەکانی تردابوو لەلایەن کلیۆپـاتراوە فـەرمانیان پێدرا خەریکی ڕاوکردنی ماسی نەهەنگبن، نەهـەنگ چونکە ماسییەکی بێهێزەو گۆشتکەی بێتامـە، لـەدەریای ڕۆمدا(70) ڕاوی ناکەن، بۆیە ڕاوچییەکان ڕقیان لەوماسییە دەبێتەوە، ئەوجۆرە ماسییە لەدەریای ڕۆمدا زۆربوو، دەتوانین بڵێین هیچ جۆرە ماسییەکیتر لەودەریایـەدا بەقەدئەو نەهەنگانە ژمارەیان زۆر نـەبوو. نەهەنگ ماسییەکی گەورەو ئەستورە کەقورسایی ئەو بەشێوەیەکی گشتی بەقەت یەك فیل دەبێت، بۆیە یەك نەهەنگ دووسەدو پەنجا تاپێنج سەد کەسی تێر دەکرد، دیـارە ئەمـەش زیـاتر وابەسـتە بەگـەورەیی وبچوکی نەهەنگەکەیە، کلیۆپاترا فەرمانیدا کەلەبیابانی میسردا خوێبهێنن وبیدەنە خاوەن کەشتییەکان بۆئەوەی کەئەو نەهەنگانەیان ڕاوکرد خوێی پێدابکـەن تاماسییەکە بۆگـەن نـەکات وبتوانرێت بۆخـواردن کەڵکی لێوەربگیرێت.

ڕاوکردی ماسی نەهـەنگ ئاسـانەو زوو دەکەوێتـە تـۆڕەوە، بەڵام دوای ئـەوەی کەوتـە تۆڕەکەوە بۆئـەوەی بتوانن لەئاوەکەی دەربهێنن وبیخەنەسەر کەشتییەکە پێویستی بەسلێنگ(71) دەبوو، چونکە لـەهێزی کەسـێك ودووانـدا نـەبوو، هـەروەها کلیۆپـاترا خـاوەن کەشـتییەکانی ڕاسـپارد کەئـەوان چـاوەڕوانی ئەوەنەکـەن تاعـەمبارەکانی خۆیـان پڕنەکـەن نەگەڕێنـەوە، بـەڵکو بەعـەمباری نیوەپڕیـشەوە بگەڕێنـەوەو خۆیـان بگەیەننـەوە ئەسـکەندەریە، تائـەو ماسـیانە بەسـەرخەڵکی برسـیدا دابـەش بکرێـت، فەرمانـدەی کەشـتییەکان دەیـانزانی ئەگـەر ڕۆژێـك زووتـر خۆیـان بگەیەننـەوە ئەسـکەندەریە، ژمارەیـەك خـەڵك کەلەگیانەڵای برسیەتیدا خەریکبوو بمرن ڕزگاردەکرد، دوای بەوەی ڕاوکردنی ماسی نەهـەنگ زۆربوو وکەشتییەکان هەموو ڕۆژێ بەعەمباری پڕو نیوەوە پڕ دەهاتنەوە بۆ ئەسکەنەدەریە،

70- دەریای ڕۆم: مەبەست لەدەریای سپی ناوەڕاستە،(و-کوردی)
71- سڵینگ: مەبەست لەسڵینگی لەنگەری کۆنە.

گۆشتی ماسی سوێر لەزیادی دابوو، هەندێ ماسی سوێریان بەڕێگای بەلەم بۆمیسری سەروو نادرن، تالەنێوان خەڵکی برسیدا دابەشبکرێت، من سەرەتا ماسی نەهەنگی سوێرم بەچێژەوە دەخوارد، هەرچەندە دوای خواردنی لەتینویەتیدا هەراسان دەبووم وئاوم زۆر دەخواردەوە، بەڵام بیرم لەوەدەکردەوە باشترە لەبرسیەتی، ئیتر دوای چەند ڕۆژێك قێزم لەوماسە سوێرە دەبۆوە، کاتێ بۆنی ماسی ناوبرام بەبەرلوتدا دەهات، توشی ئۆڵنج هاتنەوە دەبووم، دوای ئەوەی ئەوماسییە زۆربوو مەترسی لەبرسان مردن نەما، من ئیتر ماسی سوێرم کەمتردەخوارد، خەڵکی ئەسکەندەریەش بەناچاری گۆشتی ئەوماسیەیان دەخوارد، تەنها بەقەت ئەوەندەیان دەخوارد کەنەمرن، دواتر شارەزایی وسەلیقەیان لەخواردنی ئەوماسییە پەیداکرد، پێشئەوەی ئەو ماسییە سوێرە بێ وردە ئێسقانە بخۆن، ئەو گۆشتەیان دەخستە ئاوی شیرینەوە، بۆ ئەوەی سوێریەکەی کەم بێتەوەو دواتر گۆشتی ماسییەکەیان دەخستەسەر ئاگرو دەیانبرژاند، بەوشێوەیە ئەوگۆشتی نەهەنگە کەمێ بەلەزەتتر دەبوو ومرۆڤ دەیتوانی بیخوات وکەمتر ئازاری پێوە بکێشێت.
ڕاوچییەکان کەدەچوون بۆدەریا کاتی خۆیان بەگرتنی ماسی بەلەزەت بەفیڕۆ نەدەدا، چونکە ئەوماسییانە بەشی برسییەکانی نەدەکردن.
من دەتوانم بڵێم دوایین مانگەکانی ساڵی سێیەمی گرانییەکەی میسر، گۆشتی نەهەنگەکان خەڵکی ئەسکەندەریەو دلتای سەروویان لەمەرگ ڕزگارکرد، بەڵام دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ ئیتر کوللە نەمان وجوتیارانی میسر توانیان بەروبوومەکانیان هەڵگرنەوەو درەختەکان وردەوردە بەریان دەرکردنەوە، دوای ئەو گرانییە دووجاریتر لەسەردەمی کلیۆپاترادا قاتوقڕی توشی وڵاتی میسر بۆوە، بەڵام بەئەندازەی ئەم گرانییە گەورەیە مەترسیدارنەبوو کەدوو لەسەر سێی خەڵکی میسری لەناوبرد.
لەگرانییەکانی دواتردا مشورخواردن وپێشبینیەکانی کلیۆپاترا مەترسییەکانی گرانی کەمتردەکردەوە، چونکە کلیۆپاترا لەسەر تاسەری میسری سەروو میسری خوارووا عەمباری دانەوێڵەی دروستکردن و ئەوعەمبارنە بەرادەوام پڕبوون، هەروەها دانیشتوانی میسریش دانەوێڵەیان لەماڵەکانیاندا عەمبارکرد، تائەو کاتەی دانەوێڵەی ساڵی تازە پێدەگەیشت ئینجا هی عەمبارەکانیان دەردەهێنا دەیانخوارد، دانیشتوانی میسر بەردەوام دانەوێڵەی ساڵی ڕابردوویان دەخوارد، کەڵکی ئەمەش ئەوەبوو ئەگەر وشکە ساڵی هاتباو ئاوی نیل بەرزنەبووبایەوە- یان کوللە هاتباو کشتوکاڵیان خواردبا، خەڵکی میسر لەبرساندا نەدەمردن.

## گەنجێکی مۆزایککاری سوری لەکۆشکی پاشایەتیدا

ڕۆژێکیان هەواڵی ئەوەبڵاوبۆوە بڕیاردراوە بەشێك لەمۆزایکی بینای کۆشکی پاشایەتی گۆڕانکاری تێدابکرێت، چەند ڕۆژ دوای ئەوە، کۆمەڵێك کرێکارو وەستای مۆزایك (72) هاتنەناو کۆشکی پاشایەتی ودەستیانکرد بەکارکردن، من کەبێکار دەبووم، دەچووم سەیری دەستی وەستایانی مۆزایکەکەم دەکرد، چونکە هونەری ئەمانە جوانترو سەرنجڕاکیشەرتربوو لەدروستکردنی بینایتر، ڕۆژێکیان خەریکی سەیرکردنی کاری وەستاکان بووم، چاوم بەکرێکارێکی لاوکەوت کەئەویش سەیری منی دەکرد، کاتێ زانی منیش سەیری ئەودەکەم بزەیەکی هاتێ،

72- مۆزایك: لەبری وشەکانی، وەستای کاشی، سیرامیك کار، کاشی کار.. و هێتر، کەلە کوردیدا پراوپڕ هەمان مانای مۆزایك نادەن بەدەستەوەو ئەو وشەیەش بەخوێنەر نامۆنییە. بۆیە هەرمۆزایکمان دانایەوە (و-کوری)

خەندەکەی ئەو ددانە سپی وجوانەکانی نیشاندا، من لەوکاتەدا ئەوکوڕە گەنجەم زۆر بەجوان وبەنمەك دیت، پێموانەبوو لەدوای کاڵ جوانی هیچ پیاوێك کارم تێبکات، چونکە کەسێك ئاشنایی لەگەڵ جوانترین گەنجدا هەبێت، ناتوانێت حەزی بەلای گەنجی ناشیریندا بچێت، ئەوکوڕە مۆزایك کارە بەئەندازەی کاڵ جوان نەبوو، بەڵام جوانی ئەو جۆرێکیتربوو، یەکەم ڕۆژ تەنها چەند ساتێك لەوکوڕەم ڕوانی ودواتر بیرم لەوەکردەوە پێویستە سبەی لەوگەنجە نزیکببمەوە، بەڵام ڕۆژی دواتر کاتێ هاتم بۆتەماشاکردنی وەستاکارەکان، بێئیرادەی خۆم بەرەولای ئەوکوڕە ڕۆیشتم، وەك ئەوەوابوو ئەوکوڕە گەنجە مۆزایککارە، چاوەڕوانی من بکات، چونکە هەرکە منی بینی جارێکیتر خەندەی هاتەسەر لێوەکانی و ددانە سپییەکانی دیارکەوتنەوە، من بەوەی ڕۆژی پێشتر خۆم لەسەر ئەوە ساغکردبۆوە لەئەو نزیکببمەوە، بۆئەوەی لەنزیکەوە ببینم، لێی نزیکبوومەوە، ئەوکوڕە گەنجە سەیری منی دەکردوو بزەی دەهاتنێ، من لەڕۆژانی دواتردا بۆم مەعلومبوو کەخەندەکردن عادەتییەتی، بەردەوام بزەی لەسەر لێوانە، لەوڕۆژەدا توانیم مۆزایککارەکە باش ببینم، مووی خورمایی بوون مووەکانی سەری ئەو، کەوتبوونەسەر شانەکانی وچەند لولێکیان خواردبوو، ئەوگەنجە دەموچاوێکی باریك ودرێژی هەبوو، چاوەکانی گەورەو برژانگەکانی درێژو ڕووخساری سپی بوو، کاتێ لەئەو نزیکبوومەوەو چاوەکانیم بینی، نەمدەتوانی چاوم لەسەیرکردنی چاوەکانی ئەو لابەم وتەماشای شوێنێکیتر بکەم، ئەگەر بۆچەند ساتێك ڕووم لەو وەرگێڕابا دووبارە سەیری ئەوەم دەکردەوە، بۆئەوەی لەچاوەکانی بڕوانم.
لەبەسەرهات وچیرۆکەکانی یۆنانیدا هەندێك لەمانەم لەسەردەمی خوێندن لەژوورەکەی کلیۆپاترادا گوێ لێببوو، هەمیشە باس لەجوانی کچانی جوانبوو، دیارە هۆکاری ئەمە ئەوەیە کەهەموو نووسەری ئەم داستان وسەرگوزەشتانە پیاوبوون، بۆیە بەردەوام باسیان لەجوانی کچانی یۆنانی کردووە، ئەگەر یەکێك لەوسەرگوزەشتە گێڕەرەوانە ژن بان، لەبری ئەوەی بەجوانی کچان هەڵابڵێت، باسی لەجوانی کوڕان دەکرد، من لەوبڕوایەدام پێهەڵاگوتن بەجوانی کوڕانی قەشەنگ زیاتر لەباسکردنی جوانی کچان پێهەڵاگوتن وستایشی باشتربوو، هەروەها من پێموایە کەئەزمون- یان قۆزی کوڕان زیاترە لەهی کچان، بەوەی حەزمدەکرد دەورو خولی ئەوکوڕە گەنجەبدەم، وردەوردە لێی نزیکبوومەوە.

– ئەو گوتی: ئایا تۆ بۆسەیرکردنی ئیشەکەی من بۆئێرە هاتووی؟

– گوتم: بەڵێ، هاتوم سەیری مۆزایککاری تۆبکەم.

– ئەو کورە گەنجە گوتی: مۆزایککاری ئێمە تەماشا بکە، منیش سەیری تۆدەکەم.

– گوتم: بۆچی سەیری من دەکەیت؟

– ئەو گوتی: چونکە تۆ لەمۆزایککەکانی من جوانتری.

کاڵ هەرگیز پێی نەگوتبووم جوانی، ئەوتەنها کلیۆپاترای بەجوان دەزانی، بەدرێژایی ئەوماوەیەی لەگەڵ کاڵدا ئاشنابووم، یەك قسەی خۆشم سەبارەت بەخۆشەویستی لەئەونەبیست، ئەم کورە گەنجە لەساتەوەختی یەکەم کەمنی دیت، جوانییەکەمی پەسەندکرد، کاڵ بەردەوام بەشێوەیەك لەگەڵمدا دەدوا، وەك ئەوەوابوو لێمبێزاربێت، بەڵام زەردەخەنەکانی ئەوکورە گەنجە، سەیرکردنەکانی ئەو کەلەژێر برژانگە درێژەکانییەوە ئاراستەی منیان دەکات، نیشانەی خۆشەویستی لێوەدیارن.

– ئەوەندە لەئەو نزیکبوومەوە کەنێوانی من وئەو کەمتر لەنیو هەنگاوبوو ولەئەوم پرسی: تۆ خەڵکی کوێیت؟

– گوتی: خەڵکی سوریام.

– گوتم: دەزانم خەڵکی سوریا کاری مۆزایك ناکەن، ئەم هونەرە لەسوریادا نییە.

– کورە گەنجەکە گوتی: ڕاستدەکەی لەسوریادا مۆزایك کاری نییە، من ئەم پیشەیەی خۆم لەڕۆم فێربووم.

– لەئەوم پرسی: ماوەی چەند لەڕۆمدا ژیاوی؟

– وەڵامی دایەوەو گوتی: ماوەی پێنج ساڵ لەیۆنان بووم ولەوێ فێری پەیکەرسازی بووم، دواتر چووم بۆ ڕۆم وماوەی پێنج ساڵیش لەوێدا مامەوە.

ئەوکاتە زانیم ئەوکورە گەنجە زمانی یۆنانی(73) لەیۆناندا فێربووە.

– لەئەوم پرسی: ناوت چییە؟

– وەڵامی دایەوە: ناوم (تیە)یە.

– لێم پرسی: ئایا باوکت ماوە– یان نا؟

– وەڵامدا گوتی: باوکم کۆچی دوایی کردووە.

– پرسیارم لێکرد: ئایا دایکت لەژیاندا ماوە؟

– تیە گوتی: بەڵێ دایکم ماوە.

– ئینجا لێم پرسی: تیە، ئایا تۆ ژنت هەیە– یان نا؟

– تیە، بەبزەیەکەوە گوتی: نەخێر.

– دواتر گوتی تۆ هەموو شتێکت لەمن پرسی، ئێستاش نۆرەی منە لەتۆ بپرسم، دواتر گوتی: تۆ خەڵکی کوێی؟

– گوتم: خەڵکی ئێرەم.

– ئەو کورە گەنجە لێی پرسیم: ئایا تۆ لەئەسکەندەریەدا لەدایکبووی؟

– گوتم: بەڵێ.

– تیە گوتی: تۆ لەم کۆشکەدا چی دەکەیت؟

– گوتم: من کارەکەرم ویەکێکم لەخزمەتکارەکانی شاژنی میسر.

– لێی پرسیم: ئایا دایك وباوکت زیندوون؟

– گوتم: نا.

ئیتر نەمتوانی پرسیاری تر لەوکورە گەنجە بکەم، چونکە کلیۆپاترا یەکێکی ناردبوو بەدوامدا، کاتێ ڕۆیشتم تاڕۆژی دواتر هەر لەبیری ئەوکورە گەنجەدابووم وهەردەم بەژن وبالای ئەوکورەم لەبەرچاوبوو، خەریکی هەرکارێك بام، بەردەوام بەژن و بالاو زەردەخەو بەتایبەت چاوەکانی ئەوم لەپێش چاوبوون.

کاتێ ویستم بخەوم، دووچاری دڵەڕاوکێ هاتم، بەوەی کاری ئەومۆزایککارەو کرێکارەکانی تریش زووکۆتایی پێبێت و ئەوانە لەکۆشکی پاشایەتی دەڕۆن ومن ئەو نابینمەوە، لەبەرخۆمەوە گوتم سبەی لە(تیە) دەپرسم، ئایا کارکردنەکەی لەکۆشکی پاشایەتیدا چەند دەخایەنێت؟ ئایا بەم زووانە دەڕۆن- یان من تاماوەیەکی دوورو درێژ ئەو دەبینم؟

ڕۆژی دواتر هەرکەکرێکارەکان هاتن، من خۆم گەیاندە ئەوکورە گەنجە، ئەویش وەك ڕۆژانیتر بەخەندەوە پێشوازی لێکردم وگوتی: نزیکببەوە لێم، وەرە تەنیشم تامن بتوانم باشتر تۆببینم.

– منیش لەوگەنجە نزیکبوومەوەو لێم پرسی: ئیشی تۆ لێرە تاچەندیتر درێژە دەکێشێت؟

– تیە، گوتی: کاری خودی من لێرە تا دە ڕۆژی ترە، بەڵام کرێکارەکانیتر تامانگێکی کە، لێرەدا کاردەکەن، من دوای ئەو دە ڕۆژە، لەوانەیە لێرەوە بچمەوە بۆسوریاو لەوێ خەریکی کارکردنبم.

بەم قسەیە غەمگین بووم، ئەگەر تیە دوای ئەو دە ڕۆژە لەئەسکەندەریەدا مابایەوە، ئەوا ئومێدەواردەبووم بەوەی ئەوم بدیبا، بەڵام ئەودەچێتەوە بۆ سوریا، ئیتر نایبینمەوە.

– لێم پرسی: ئایا دوای ئەوەی گەڕایتەوە سوریا، دێیتەوە بۆ ئێرە- یان نا؟

73- زمانی میسریش لەوسەردەمەدا هەر زمانی یۆنانی بووە، واتا زمانی ڕەسمی.(و- کوردی)

– گەنجەکە گوتی: پێموانیە دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆسوریا جارێکیتر بێمەوە بۆ میسر، چونکە ئەوێ نیشتمانی منەو لەنیشتمانەکەمدا دەمێنمەوە.

– گوتم: تیە، من داخی ئەوەمە کەلە دە ڕۆژ زیاتر تۆنابینم، چونکە دوای ئەم دە ڕۆژە دەگەڕێیتەوە سوریا.

– کورە مۆزایککارەکە گوتی: ڕۆیشتنم سەد لەسەد نییە، لەوانەیە نەڕۆم، ئایا حەزدەکەیت ئێمە ببینی؟

– گوتم: بەڵێ حەزدەکەم بتبینم و ڕووبەڕووت دانیشم وتۆ بۆمنی بگێڕیتەوە کەلەسەردەمی منداڵیتدا لەکوێ وچۆن ژیاوی ودوای ئەوە بۆکوێ چوویی وباری ژیانت لەیۆنان وڕۆمدا چۆنبووە؟

– تیە گوتی: تۆ چەندت پێخۆشبێت ئەوا بۆتدەگێڕمەوە، چونکە قسەکردنی من ڕێگا لەکاری مۆزایك دانانەکەم ناگرێت، من بەدرێژی ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵی خۆمت بۆدەگێڕمەوە، دواتر پێتدەڵێم

چۆن چووم بۆیۆنان وپێنج ساڵ لەوێدا بووم ولەوێ فێری زمانی یۆنانی کەزمانی قسەکردنی ئێوەشە، بووم، دواتر باسی ئەوپێنج ساڵەشت بۆدەگێرمەوە کەلەرۆمدا ژیاوم.

– گوتم تیە : قسەکردنی تۆ لێرەو لەکاتی کارکردندا، جێگای ڕەزامەندیم نییە.

– تیە لێی پرسیم: بۆچی؟

– گوتم: لەبەرئەوەی هەموو ساتەوەختێك لەوانەیە کلیۆپاترا بانگی من بکات وقسەکانمان پێببڕێت، وەك چۆن دوێنێ کەخەریکی قسەکردن بووین، بانگی کردم وقسەکانی ئێمەی پساند، دواتر ئەوشوێنەی کەئێمە قسەی تێدادەکەین جێگایەکە هەموو سەیرمان دەکەن، کاتێ کۆمەڵێ خەڵك سەیرمان بکەن بەوشێوەیەی حەزم لێیە چێژ لەقسەکانت وەرناگرم، حەزدەکەم لەجێگایەکی چۆڵدا بتبینم ولەوشوێنەدا جگەلە من وتۆ کەسی تری لێنەبێت وکلیۆپاترا بانگم نەکات وبتوانم ماوەیەکی دورو درێژ گوێ لەقسەکانت بگرم وزەردەخەنەکانی تۆببینم وسەیری چاوەکانت وبرژانگەکانت بکەم ولەو دە ڕۆژەدا کەتۆ لەئەسکەندەریەی دەستەبەرکردنی ئەم ئارەزووە مومکین نییە.

– تیە گوتی: منیش حەزدەکەم دیداری تۆببینم، بەڵامماڵەکەم جێگایەك نییە کەتۆ بۆئەوێ بێیت ولەوشوێنەدا کەسیتری تێدا نەبێت، بۆئەوەی قسانت بۆبکەم، چونکە من لەگەڵ کۆمەڵێك کرێکاری گەنجدا لەژوورێکدا دەخەوین، ئەگەر بەتۆ بڵێم وەرە بۆئەوێ ئەوا نارەحەت دەبیت، ئایا تۆ شوێنێکت پێشکنایەت کەمن بێم بۆئەوێ وسەرگوزەشتەی خۆمت بۆبگێڕمەوە؟

– گوتم: شوێنی من ئێرەیەو جێگاکەم ژوورێکە لەنزیك ژووری شاژن وهەر کەسێك بۆلای ژوورەکەی من بێت- یان لەوێ بێتەدەرێ دەیبینین، بەتایبەتی لەکاتی شەودا هیچ کەس ناتوانێت بەبێ ئاگاداری کەسانیتر بێتەژوورەکەی منەوە، چونکە تادەگاتە ژوورەکەی من، پێویستە بەچەند شوێنێکدا تێپەڕێت لەهەموو ئەو ڕێڕەوانەشدا ئەودەبینن.

دواتر گوتم تیە، ئایا ناتوانیت لەئەوانیتر جیاببیەوەو شەوانە لەشوێنێکیتر بخەویت؟

– تیە گوتی: ئەگەر خانوێك بۆمن پەیدابێت وبتوانم شەوانە لەشوێنێکیتردا بخەوم، باشبوو، بەڵام من جێگایەکم نییە.

– گوتم: ئەگەر تۆ حەزبکەیت من جێگات بۆپەیدا دەکەم.

– ئەو گەنجە گوتی: ئایا لێرەدا جێگام بۆدابین دەکەیت؟

– گوتم: نێرەنا، وەك پێم گوتی، ناتوانی بێی بۆ ژوورەکەی من، بەڵام لەدەرەوەی ئەم شوێنە، واتا لەمیوانخانەیەکدا هۆدەیەکت بۆ پەیدادەکەم ومنیش شەوانە دێم بۆلات، تایەکتری ببینین.

– تیە گوتی: ئەوە بزانە من دەرەقەتی دانی کرێی ئەوژوورە نایەم.

– بەئەوم گوت: کرێی کارکردنی میوانخانەکە مەدە، من ماوەی ئەو دە ڕۆژەی کەلەئەسکەندەریەدای پارەکەت بۆدەدەم، بەڵام پێمبڵێ تۆدەڵێیت ناتوانی پارەی ئوتێلەکە بدەیت، کرێی خۆت چی لێدەکەیت؟ چونکە من دەبینم ڕۆژانە دوای تەواوبوونی کار کرێکەت وردەگری.

– تیە گوتی: کرێکەی خۆم خەرج ناکەم، بەڵکو ئەو پاشەکەوت دەکەم، تائەگەر چوومەوە بۆسوریا بەوپارەی کەپاشەکەوتم کردووە، کارخانەیەکی پێدامەزرێنم ودەست بەکاربکەم، ئەگەر لەمیسریشدا مامەوە ئەوا ئەوکارگەیە لێرە دادەمەزرێنم.- گوتم تیە: من خۆشحاڵم بەوەی کەزانیم تۆپیاوێکی

بەمشوری وبەپێچەوانەی کرێکارەکانیتر ناچی ئەوپارەیە لەشوێنی ڕابواردنی گشتی ئەمشارەدا خەرج بکەیت، هەستت بەوەکردووە دەبێ هەموو کرێکارێك پاشەکەوتی هەبێت، تاوەکو بۆ بەرەوپێشبردنی کارەکەی کەڵکی لێوەربگرێت،

ڕۆژی دواتر لەمیوانخانەی سوردا، کەجێگای کاڵیش بوو، ژوورێکم بۆ تیە بەکرێگرت، خاوەنی میوانخانەکە چونکە منی دەناسی پێی سەیرنەبوو، بەئەوم گوت یەکێك لەخزمەکانم لەخاریجەوە هاتووەو لەئەسکەندەریەدا کەس ناناسێت ومن بۆ ئەو ژوورێك بەکرێ دەگرم، بۆئەوەی شەوانە لەوێدا بخەوێت تائەوکاتەی لەئەسکەندەریەدا بمێنێتەوە، منیش هەندێ شەو دێم بۆئێرەو لەگەڵ ئەو قسەدەکەم، دوای ئەوەی ژوورێکم لەمیوانخانەکەدا بۆ تیە بەکرێگرت، چوومەوە بۆکۆشکی پاشایەتی وبەوگەنجە وەستا مۆزایککارەکەم گوت، ئەمڕۆ کاتێ کارەکەت تەواوبوو بچۆ بۆشەقامی ئەرستۆ ولەوێدا میوانخانەیەك بەناوی سوور هەیە، من ناوونیشانی تۆم بەخاوەنی ئوتێلەکەداوە، بۆ ئەوەی گومان لەکەسایەتی تۆنەکات و تۆش ناونیشانی منی بدەیە، بۆ ئەوەی دڵنیابێت، منیش ئەمشەو مۆڵەت لەخاتوونی خۆم وەردەگرم ودێم بۆلات

- تیە گوتی: زۆر باشە.

مۆڵەت وەرگرتن لەکلیۆپاترا لەکاتی شەودا ئاسان نەبوو، لەبەرئەوەش دەبوایە من بۆدەرچوونم لەکۆشکی پاشایەتی بەهانەو پاساوێکی بەجێم هەبوایە، دڵنیابووم ئەگەر بمتوانیبا ڕاستییەکەم پێبڵێم ئەوا مۆڵەتی پێدەدام وبەئەفسەرە پاسەوانەکەی دەروازەی کۆشکی دەگوت، ڕێگام لێنەگرێت، ئەومۆڵەتەی من دەمویست لەخاتوونەکەی خۆمی وەربگرم دەبوا بەشێوەیەك با کەشەوانی تریش بتوانم لەکۆشك بچمەدەرێ (واتا ئەو دە ڕۆژەی تیە لەئەسکەندەریەدایە)

لەپڕ بەبیرم داهات لەم ڕۆژانەدا بۆنەی سەردانی خوای شکارە(کەلەمەوبەر ئامارەم پێدا هەریسەی هونەرمەند لە بەرجەستە کردنی ڕۆڵی ئەودا چەند لێوەشاوەبوو) خەڵکی ئەسکندەریەو هەموو شارەکانیتری میسر دەچن بۆپەرستگای دیان ومۆم دادەگیرسێنن ودوعا دەکەن، ئەوەبوو چووم بۆلای خاتوونەکەم وبەئەوم گوت: من بەتەمام ماوەی دە ڕۆژ لەپەرستگای دیاندا مۆم داگیرسێنم، داوادەکەم بۆماوەی دە شەو مۆڵەتم بدەی، لەکۆشك بچمەدەرێ.

- کلیۆپاترا گوتی: شرمیون چ نیازێکت لەدڵ گرتووە؟

- من دەمزانی کلیۆپاترا ئەو پرسیارە دەکات و وەڵامەکەم ئامادە کردبوو وگوتم: ئەوەم لەدڵ گرتووە تاتۆ کوڕێکت ببێت. - هەستمکرد نیازی ئێمەی بەدڵەو گوتی: من مۆڵەت بەتۆدەدەم کەلەمشەوەوە تا دە شەویتر لەکۆشك بچیتەدەرێ و بڕۆی بۆپەرستگای دیان ومۆم داگیرسێنیت،.بەڵام چونکە پەرستگای دیان تانیوەشەو کراوەیە، دەتوانی دوای ئەوەی کارەکانی منت جێبەجێکردو من خەوتم، لەکۆشك بچیتەدەرێ، منیش نەمدەتوانی بڵێم دەمەوێت زووتر بچم بۆپەرسستگای دیان و مۆم داگیرسێنم، چونکە پاساوێکم بۆ ئەوە نەبوو.

خاتوونەکەی من ڕاستی دەکرد، پەرستگای دیان تانیوەشەو کراوەبوو، خەڵك تائەوکاتە بۆئەوێ دەچوون ومۆمیان هەڵدەکردن وشتێکیشیاندەدا بەخزمەتکاری پەرستگاکە، ئەوشەوە ناچار ئەوەندە چاوەڕوانبووم تاکلیۆپاترا چووە ژووری خەوتنەکەی خۆی، واتر بەڕێ کەوتم.

ئەفسەری پاسەوان دەیزانی شاژنی میسر مۆڵەتی چوونەدەرەوەی بەمنداوە، هیچی نەگوت، من دوای چوونەدەرەوەم لەکۆشکی پاشایەتی، لەبری ئەوەی بەرەوپەرستگای دیان خوای شکار بچم، ڕێگای میوانخانەی سوورم گرتەبەر کەکەوتبۆ شەقامی ئەرستۆ.

دەروازەی میوانخانەی سوور وەك هەمیشە شەوانە نیوەتاریك بوو، کاتێ چوومەناو ئوتێلەکە، خاوەنی میوانخانەکە ئێمەی بینی وبەئیشارەت تێی گەیاندم ئەوگەنجەی من ژوورێکم بۆبەکرێ گرتووە، لەقاتی سەرەوەیە.

کاتێ پەقاڵدرمەکان هەڵگەڕام ئەوشەوەم بیرکەوتەوە کەلەهەمان شوێندابوو کەدەچووم بۆلای کاڵ، لەوشەوەدا دڵم دەلەرزی توشی دڵەتۆتکەو پەشێوەی دەبومەوە، بەڵام کەبۆگەیشتن بەتیە دەڕۆیشتم توشی ئەوەنەبوومەوە، بەپێچەوانەوە هەستم بەشادمانی دەکرد، چونکە دەمزانی ئەمشەو بەمرادی خۆم دەگەم ولەهۆدێکی چۆڵدا لەگەڵ تیەدا بەسەری دەبەم، کاتێ گەیشتمە ژووری گەنجە مۆزایککارەکە، چراکە ڕۆشنبوو، بەڵام تیە خەوتبوو، لەکاتێکا وام وێنادەکرد تامن دەگەمەلای ئەو بەخەبەربێت وبەوشێوەیەی من تامەزرۆی دیداری ئەوم، ئەویش هەروا تامەزرۆبێت، چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد ئەو خەوتبێت.

هەرچەندە تیە بەڕۆژ کاری کردبوو، هەموو کەسێکیش دوای تەواوبوونی کاری ڕۆژانەی هەست بەماندووبوون دەکات و حەزدەکات پشووبدات، تیە دوای خۆرئاوابوون دەستی لەکارهەڵدەگرت وکرێی خۆی وەردەگرت ولەکۆشك دەچۆدەرێ، بەڵام من دەبوایە بەخەبەربام تاکلیۆپاترا دەخەوت، یەك کورسیم هێنایە تەك تەختە خەوەکەی تیەو لەسەری دانیشتم وخەریکی سەیرکردنی ئەوکوڕ گەنجەبووم، دوای ئەوەی هاتمە ژوورەکەو زانیم تیە خەوتووە، پێموابوو دەنگی پێکانم ئەو بەخەبەر بهێنێتەوە، بەڵام مەعلومبوو خەوی ئەوکوڕە گەنجە ئەوەندە گرانە کەبەدەنگی پێکانم بەئاگا نایاتەوە.

بەسەر تیەدا چەمامەوە، برژانگەکانی ئەو لەکاتی خەودا درێژتریان دەنواند، سەیری دەموچاوە سپییەکەم کردو داتر دەستم خستەناو مووەکانی سەری، قژی سەری ئەو وەك حاڵەتی بەئاگایی لەسەرشانەکانی پەرتببون، پێموابوو هەرکاتێ دەست بخەمەناو مووەکانی سەریەوە بەخەبەردێتەوە، بەڵام تیە هەرخەوتبوو هەناسە هێواش وبارگرتووەکانی ئەوەیان نیشاندەدا ئامادەی بێداربوونەوە نییە، دواتر پەنجەکانم خستەسەر لێوەکانی ئەو، من هەر لەیەکەم ڕۆژەوە ئەوگەنجەم بینی حەزم دەکرد پەنجەکانی خۆم بخەمەسەر لێوەکانی ولەپی دەستم لەسەرسینگی بگێڕم، بەڵام کاتێ گەنجێك لەخەودابێت وژنێك پەنجەکانی لەلێوی ئەو بخشێنێت، زۆر بەخت چاکی نییە، بەئومێدی ئەوەبووم دوای ئەوەی پەنجەکانم خستنەسەر لێوەکانی، ئەوکوڕە بەخەبەربێتەوە، بەڵام بەئاگا نەهاتەوە، دواتر لەپی دەستم خستەسەر سینگی ئەو وهێواش هێواش لەسەرسینگیم دەگێڕا.

- ئەم کارەی من بووەهۆی بەخەبەر هاتنەوەی تیەو منی ناسییەوەو زەردەخەندەیەکی هاتێ وگوتی: شرمیون تۆی؟

گوتم: حەزتدەکرد کێ بێت؟ مەگەر من بەتۆم نەگوت ئەمشەو دێم بۆلای تۆ، تاماوەیەك پێکەوە لەژوورێکی چۆڵدابین؟

- گەنجەکە گوتی: بەڵێ تۆ ئەمەت بەمن گوت.

– گوتم: ئەی بۆچی خەوتویی وچاوەڕوانی هاتنی منت نەکردووە؟

– تیە گوتی: پێموانەبوو هاتنی تۆ ئەوەندە درێژە بکێشێت.

– گوتم تیە: ئێستا ئەوا من هاتووم وتۆش بەخەبەر هاتویتەوە، بۆچی هەڵناستی؟

– تیە گوتی: ئایا حەزدەکەی هەڵسم ولەگەڵ تۆ قسەبکەم؟

– گوتم: ڕۆژانە تۆ لەکۆشکی پاشایەتیدا خەریکی کاری، دەتوانین قسەبکەین، ئێستا ئێمە لەم ژوورەدا بەتەنهاین باخۆمان بەشتیترەوە خەریك بکەین.

– تیە گوتی: تۆ خۆت گوتت حەزدەکەم لەگەڵ تۆدا لەشوێنێکی چۆڵدابین، هەتا گوێ لەسەرگوزەشتەی ژیانم بگریت ومن بەباشی ببینی وهەرماوەو شازنی میسر بانگی تۆنەکات بۆکارێك.

– گوتم تیە: ئەوەی لەکۆشکدا بەسەر زمانمانداهات ڕاستەوخۆ حەزدەکەم لەژوورێکی چۆڵی وەك ئێرە چەند سەعاتێك گوێ لەقسەکانی تۆبگرم، بەمەرجێ شتی تریشمان هەبێت، هەتا لێرەشدا کاتی من سنووردارە، چونکە دەبێ بگەڕێمەوە بۆکۆشکی پاشایەتی، خاتوونەکەی من نازانێت کەبۆ ئێرەهاتووم، ئەگەر بزانێ دێم بۆلای تۆ مۆڵەتی نەدەدام، ئەم پێیوایە من بۆکارێکیتر کەتایبەت بەخودی ئەوە، لەکۆشکی پاشایەتی هاتوومەتە دەرێ، هەرچەندە ئێستا خاتوونەکەی من خەوتووە، بەڵام لەوانەیە پاش دوو سێ سەعاتی تر بەخەبەربێت وبزانێت تا ئێستا نەگەڕاومەوە.

ئەگەر کلیۆپاترا تابەیانی بەخەبەریش نەیەتەوە، دووبارە تاخیربوونی من باش نییە، چونکە ئەفسەرە پاسەوانەکە بەیانی بەخاتوونەکەی من دەڵێت ئەمشەو شرمیون تادرەنگ لەدەرێ بووە، ئەوئەفسەرەش وەك کلیۆپاترا دەزانێت من بۆ چ مەبەستێك لەکۆشك هاتوومەتە دەرێ و پێیانگوتووە نابێ دواکەوتنی ئەو زۆر درێژە بکێشێت.

– تیە هەر لەسەرجێگاکەی ڕاکشابوو وسەیری منی دەکرد، دواتر گوتی: شرمیون ئەگەر ناتەوێت من قسە بۆتۆ بکەم ئەوا لێر بڕۆ وبخەوە، منیش دەخەومەوە.

– گوتم تیە: ئایا خەو لای تۆ، ئەوەندە گرنگە کەنەتوانی وازی لێبهێنی و لەجێگاکەت هەڵسی وپەنجەکانت بخەیتە سەر لێوەکانم و دەست لەسەر سینگم بگێڕی؟ ئایا تۆ ناتوانی کەڵك لەم هەلە وەربگریت وبیسەلمێنی کەمنت خۆشدەوێت؟

– تیە گوتی: شرمیون من بۆچی پەنجەکانم بخەمەسەر لێوەکانت ودەستم لەسەر سینگت بگێڕم؟

– گوتم چونکە تۆ وات لەمن گەیاندووە کەخۆشتدەوێم، ئایا لەبیرتچۆوە بەمنت گوت تۆ لەمۆزایکەکانی من جوانتری؟ ئایا لەبیرت چۆوە هەرجارەی منت دەبینی زەردەخەنەت دەهاتێ؟ ئەی بۆچی کەوا ئێستا لەم ژوورەدا بەتەنهاین، لەجێگاکەت هەڵناستیت و سەبارەت بەمن کوڵی خۆشەویستی دەرنابڕی؟

– ئەو گەنجە گوتی: من بەو مەبەستە بەتۆم گوت لەمۆزایکەکانی من جوانتری و هەرجارەی کەتۆم دەبینی زەردەم دەهاتێ، چونکە تۆ لەدایکم دەچیت.

– من بەسەرسامییەوە لێمپرسی، ئایا من لەدایکت دەچم؟

– تیە، گوتی: دە ساڵ دەبێت من دایکم نەبینیوە، چونکە پێنج ساڵ لەیۆنان بووم و پێنج ساڵیش لەڕۆم، بەڵام دڵنیام کەدایکم مابێت ئێستا گەیشتۆتە تەمەنی تۆ.

کاتێ ئەو کوڕە مۆزایك کارە ئەوقسەیەی بەمن گوت، وەك ئەوەوابوو بمرم.

من تا ئەو کاتە ئاگام لەبەسەرچوونی ڕۆژگارنەبوو وپێموابوو چۆن من لەبینینی ئەو کوڕە چێژ وەردەگرم، ئەویش هەروا لەبینینی من لەزەت وەردەگرێت وئێمەی بەدڵە، من بێئاگابووم لەوەی ئەوکاتەی کەبەهۆی بینینی کاڵەوە ئارەزوو وخۆشەویستی پیاوان لەناو مندا بەخرۆشکەوت، تائەوکاتەی (تیە)م بینی ماوەیەکی دووورودرێژی بەسەردا تێپەڕیبوو بەسەرچوونی ئەو ساڵانە جوانی لە سیمام دا کەمکردبۆوە، من کاتێ گەنجێکی وەك تیە دەبینم حەزم دەچێتە سەری بەڵام ئەو من وەك دایکی سەیر دەکات بۆیە ناتوانرێت لەگەڵ مندا حەزو ئارەزووی بجوڵێت.

لەوشەوەدا بۆ یەکەمجار تێگەیشتم کەمەسەلەی پیری شتێکە لای هەمووان ڕۆژێك لەڕۆژان دەبێتە واقیعێکی تاڵ، تا ئەو شەوەش من لەخەڵکانم دەبیست کەدەیانگوت فلانەکەس پیربووە- یان پیرەژنم دەدیتن کەدەیانگوت لەسەردەمی گەنجیەتیاندا جوان بوون، بەڵام پێمانەبوو خودی من شمولی ڕۆژگاری بەسەرچوونی کات بم وڕۆژێکبێت ئیتر گەنج و جوان نەمێنم، بەوەی کەگوێم لێدەبوو، خەڵکانیتر گەنج بوون ودواتر پیربوون، من خۆم بەجیاواز لەوانە دەزانی و وام بیردەکردەوە من پیرنابم، کاتێ سەیری ئاوێنەم دەکرد هەستم دەکرد هەرگیز جوانی ونایابی من لەبەین ناچێت و نافەوتێ.

ئەوشەوە لەپەژارێکی زۆرەوە لەمیوانخانەی سوور گەڕامەوەو چوومە کۆشك وخەوتم، بەرەبەیان پێش ئەوەی کلیۆپاترا لەخەو هەڵسێت، چومە بەرئاوێنەو سەیری خۆمکرد، تابزانم چ گۆڕانکارییەك لەمندا ڕوویداوە، کەتیە ئێمە وەك دایکی سەیر بکات وبزانێ.

مووەکانی سەرم سپی ببوون، چاو وبرۆو لوت ودەم و چەنەگەو ڕوخسارم هەمووی بەبەراورد لەگەڵ ڕابردوودا گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتبوو، من دڵنیابووم ڕووخساری من هەمان ڕووخساری ئەو ڕۆژەیە کەکاڵم بۆ یەکەمجار لەڕکەبەرێی سێرکەکەدا بینی، ئەی بۆچی دەبێ تیە، ئێمە وەك دایکی خۆی ببینێ، نەك وەك کچێکی گەنج وجوان نا، ئەوکاتە بۆ یەکەمجار تێگەیشتم، مرۆڤ خۆی پەی بەپیری خۆی نابات، چونکە ڕۆژانە خۆی لەئاوێنەدا دەبینێت وپێموایە کەهەمان ژنی ڕۆژی پێشترە، دواتر درکم بەوڕاستییەکردو زانیم هەموو کەس پیری خەڵك دەبینێ، بەڵام هی خۆی نا، ئەو ڕۆژە کەبۆ یەکەمجار پەیم بەمەبرد، پێموابوو شتێکم دۆزیوەتەوە، خەڵکانیتر نەیانکردووە.

بەیادم هاتەوە کاتی خۆی کەبەشەقامەکانی ئەسکەندەریەدا تێدەپەڕیم کوڕانی گەنج تێیان دەڕوانیم، کەبە تەنیشتیاندا تێدەپەڕیم، دەمزانی ڕوویان بەلای مندا وەردەگێڕاو دیقەتیان لێدەگرتم، بەڵام ماوەیەك بوو کوڕانی گەنج سەرنجی منیان نەدەدا، من نەمدەزانی هۆی ئەمە لەچییەوە بوو، بەبڵێ من بەساڵاچووم.

گوتەی تیە، ئەوشەوە ئێمەی لەخەو بەئاگا هێنایەوەو تێگەیشتم وەختێ من پیاوێکی گەنجم خۆشدەوێت، نابێ چاوەڕوانی ئەوەبم ئەویش منی خۆشبوێت، ئەوەی ئەوشەوە تیە، بەمنی گوت: بە شێوەیەك کاری کردەسەر من و گۆڕیمی، کەبڕیارمدا ئیتر نەچم بۆ میوانخانەی سورو نەچم بۆ دیداری تیە، بەڵام بەبیرم هاتەوە کەمن بەکلیۆپاترام گوتبوو دە شەو لەکۆشکی پاشایەتی دەچمە دەرێ و دەڕۆم بۆ پەرستگای دیان و مۆم هەڵدەکەم. هەتا خاتوونەکەی من ببێتە خاوەن کوڕ.

ئەگەر شەوانە لەکۆشکی پاشایەتی نەچوبامایە دەرێ، خاتوونەکەم وای بیردەکردەوە، من گرنگی بەنیازی خۆم نادەم وزۆر توڕەدەبێت. نەمەبوو کەشەوی دووەمیش، دوای ئەوەی کلیۆپاترا خەوت،

لەکۆشکی پاشایەتی بەدەرکەوتم و بەخۆمم گوت لەجیاتی ئەوەی بچم بۆ ئوتێلی سوور، باشتروایە بچم بۆ پەرستگای دیان، خوای شکار، ماوەیە لەوێدا بمێنمەوەو دواتر بگەڕێمەوە کۆشکی پاشایەتی، بەڵام دواتر ئەو ڕاستییەم بۆ ڕوونبۆوە کەساڵانی تەمەنی من زۆر بوون و ئەگەر تیە، من وەك دایکی خۆی سەیربکات، گوناهبار نییە.

منیش کەکچێکی ناسکۆڵە نیم، گوناهم نییە، چونکە نەمدەویست پیربیم، بەڵام بەسەرچوونی ڕۆژگار، ئێمەی پیر کرد، بۆیە ئەگەر بچم بۆ لای تیە، باشترە لەوەی ڕێگای دیان خوای شکار بگرمەبەر.

بۆیە بەرەو میوانخانەی سوور ڕۆیشتم و چوومە ژوورەکەی تیە.

ئەو گەنجە مۆزایك کارە، بەپێچەوانەی شەوی پێشتر بێداربوو وگوتی شرمیۆن من دڵنیانەبووم کەتۆ بۆئێرە دێیت چونکە وامزانی دوێنێ شەو دڵت لەمن ڕەنجاوە.

گوتم: تیە، من دوێنێ شەو بەمە لەتۆ دڵگران بووم کەیەك ڕاستی تاڵت پێگوتم، مرۆڤ نابێ ڕاستی تاڵ بەبێ ڕێبۆخۆشکردن بەدۆستەکانی خۆی بڵێت، لەبەر ئەوەی دەبێتەهۆی ڕەنجان ونائومێدی ئەوان، من تادوێنێ شەویش خۆم بەکچێکی گەنج وجوان دەزانی، بەڵام تۆ دوێنێ شەو ئەوەت لەمن گەیاند کەلەڕووی تەمەنەوە وەك دایکت، واتا یەك ژنی بەساڵاچووم.

تۆ بەگوتنی ئەم قەسەیەت، ئەوەت تێگەیاندم کەمن پیرو ناشیرینم، بۆیە بەپەژارەوە لەتۆ جیابوومەوەو دوای گەڕانەوەم بۆکۆشکی پاشایەتی، نەمتوانی وەك شەوانیتر ئیسراحەت بکەم.

تیە گوتی: شرمیون من بەتۆم نەگوت پیری، هەروەها نەشم گوت ناشیرینی! من گوتم لەدایکم دەچی، سەرم سوڕماوە بۆدەبێ ئەو قەسەیە ببێتەهۆی دروستکردنی پەژارەو گرژی لای تۆ؟

دە ساڵە دایکم نەدیوە، گوتم ئەگەر ئەو زیندوبێت بەپێی مەزەندەکردن لەڕووی سیماو ساڵەوە، بەقەت تۆیە؟

ئەگەرمن گوتبام دایکم پیرەو ناشیرینە، تۆ حەقتبوو گلەیی بکەیت، بەڵام من ئەم قسەیەم لەدەم نەهاتەدەرێ، کەدایکم بەپیرو ناشیرین بزانیبا، بەتۆم نەدەگوت لەمۆزایکەکانی من جوانتری، ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت من دایکم بەجوان دەزانم.

دوانەکەی تیە، کەمێ لەپەژارەکانی کەمکردەوەو ئەو کوڕە گەنجە مۆزایککارە گوتی، شرمیون وەرە تەنیشتم دانیشە تاسەبارەت بەوشوێنانەی دیتومن قسەت بۆبکەم، منیش هەستام ولەتەنیشت ئەودا دانیشتم، تیە گوتی شرمیون حەز دەکەیت قسەت بۆبکەم- یان پەنجەکانم بخەمەسەر لێوەکانت؟

- گوتم: قسەکردن لەکاتی کارکردنت لەکۆشکی پاشایەتیدا دەکرێت، تۆ پەنجەکانت لەسەر لێوەکانم دانێ.

- تیە پەنجەکانی لەسەر لێوم دانان، منیش لەئەوم پرسی، تۆ چۆنزانیت من حەزدەکەم پەنجەت بخەیتەسەر لێوم؟

- تیە گوتی: من دوای ئەوەی هاتم بۆمیسر، بیستم لەم وڵاتەدا، ژن وپیاوەکان، کاتی دەربڕینی خۆشەویستی پەنجەکانیان دەخەنەسەر لێوی یەکتری، بەڵام لەڕۆمدا ئەو نەریتە نییە، لەکاتی یەکتر خۆشەویستیدا ژن وپیاوەکە یەکتر ماچ دەکەن.

- گوتم چۆن یەکتر ماچ دەکەن؟

- تیە گوتی: ماچکردن یەعنی لەبری ئەوەی پەنجە بخەنەسەر لێوی یەکتری، لێوەکانیان بەیەکتر دەگەیەنن و بەمەش دەڵێن ماچکردن.

- گوتم تیە: ئایا لەڕۆمدا هەر ژن وپیاوێك حەز لەیەکتری بکەن، لێوەکانیان بەیەکترەوە دەنوسێنن؟

- ئەو گوتی: بەڵێ شرمیون.

- لێمپرسی: ئایا تۆ لەڕۆمدا هیچ ژنێکت خۆشویست؟

- تیە گوتی: نەخێر!

- لەوشەوەدا من وتیە ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ یەکتریدا دواین، ئەوسەبارەت بەسەفەرەکانی خۆی بۆ یۆنان و ڕۆم قسەی کردو دەربارەی داب ونەریتی ڕۆمییەکان وشانۆکانی ئەوێ، قسەی سەرنجڕاکێشی بۆکردم، منیش بەخۆشەویستی ئەو، بەتامەزرۆوە گوێم بۆقسەکانی گرتبوو، ئاگام لەبەسەرچوونی کات نەمابوو تائەوکاتەی لەدەرگای ژوورەکەیاندا.

- تیە لەجێگاکەی خۆی هەستاو دەرگاکەی کردەوەو خاوەنی ئوتێلەکە هاتەژوورێ وگوتی ئێمە دەمانەوێت بخەوین و دەرگای میوانخانەکە داخەین، ئەگەر ئەم ژنە ئەمشەو لێرە دەخەوێت، ئەوا پێمان بڵێ تادەرگاکەی ئوتێلەکە دابخەین و پشوو بدەین، کەبەتەماشە بڕوات، بائێستا بڕوات تائێمەش ئیسراحەت بکەین، چونکە ئەگەر ئێمە خەوتین ناتوانین هەستین و دەرگاکەی بۆ بکەینەوە.

- گوتم من پێویستە بڕۆم ناتوانم شەو لێرە بمێنمەوە لەبەرئەوەی چاوەڕوانی من دەکەن، لەجێگاکەم هەستام و بە تیەم گوت: سبەی شەو سەرت لێهەڵدێنمەوە، لەژوورەکە چوومەدەرێ وخاوەنی میوانخانەکە تانزیك دەروازەکە لەگەڵمداهات، پێشئەوەی لەئوتێلەکە بچمەدەرێ خاوەنی ئوتێلەکە بەهێواشی بەمنی گوت، حەیفت نەکرد ئەو گەنجە بەتەنها جێدەهێڵیت ودەڕۆی؟

- گوتم من ئەو دەبینمەوە، لەئوتێلەکە چوومەدەرێ و ئەو پیاوەش دەرگاکەی پێوەخست وگەڵەیدا، ماوەیەك لەسەر شەقامەکە بەڕێگادا ڕۆیشتم، تێبینیمکرد جگەلە من، ڕێرەوێکیتر نییە، شەقامەکە لەبەر ڕووناکی چراکان ڕۆشن بوو، بەڵام من لەتەنهاییاندا دەترسام، لەوەنەدەترسام درەنگ دەگەڕێمەوە کۆشکی پاشایەتی، چونکە دەمتوانی بڵێم لەپەرستگاکەدا سەرقاڵی پاڕانەوەبووم وسکاڵام لەخوای دیان وخواکانیتر دەکرد، کەکوڕێك بدات بەخاتوونەکەی من، بەڵکو لەڕۆیشتنم بەشەقامە چۆڵەکاندا دەترسام.

لەپڕ لەلای ڕاستەمەوە بانگیانکردم، پیاوێك هاواریکرد ئەی ژنەکە ڕاوەستە.

من لەجیگای ئەوەی بوەستم خێراتر هەنگاوم نان، بەڵام ئەو بەدوو لۆق خۆی گەیاندە من و دەستی گرتم ومنی بردە بەرڕووناکی یەکێك لەچراکانی شەقامەکە، بۆئەوەی سیمام ببینێ، من لەبەر ڕووناکایی چراکە ئەوم بینی وزانیم یەکێك لەپاسەوانەکانە، ئەو لەمنی پرسی تۆ کێی وبەم شەوە لێرە چ دەکەیت؟

- گوتم من ئەمشەو چووم بۆ پەرستگای دیان بۆئەوەی لەوێ مۆم داگیرسێنم، بەوەش سەرگەرمی پاڕانەوەبووم، ئاگام لەکشانی شەو نەمابوو.

- پاسەوانەکە گوتی: درۆدەکەیت، چونکە ئەگەر تۆ چووبی بۆ پەرستگای دیان، بەم شەقامەدا نەدەهاتیتەوە، ئەم شەقامە تاپەرستگای دیان زۆری نێوان هەیە.

ئینجا لەمنی پرسی تۆ لەکام یەك لەشوێنی ڕاْبواردنی گشتیدا کاردەکەیت؟

- گوتم ئەی پاسەوان ئەوقسەیە مەکە، من لەو ژنانەنیم کەلەشوێنی ڕابواردنی گشتیدان.

– پاسەوانکە گوتی ئەگەر تۆ لەوژنانە نیت بەمشەوە لەشەقامەکانی شاردا چی دەکەیت؟ ئایا دەزانی سزای ئەو ژنانەی لەدەرەوەی شوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریە، لەشفرۆشی دەکەن چییە؟

– گوتم من لەشفرۆشنیم، لێمگەڕێ، شوێنی من کۆشکی پاشایەتییە.

– پاسەوانەکە کاتێ گوێی لەم قسەیەبوو پێکەنی وگوتی ئاھ...... کەواتە تۆ کلیۆپاترای کەلەکۆشکی پاشایەتیدای؟

– گوتم: نا، کارەکەری کلیۆپاترام، بۆیە لەکۆشکی پاشایەتیدا نیشتەجێم.

– پاسەوانەکە پرسی: کارەکەری کلیۆپاترا لەمکاتانەدا لێرە چی دەکات؟

– گوتم بۆ گوێت لێنەبوو کەگوتم بۆهەڵگیرسانی مۆم چووم بۆ پەرستگای دیان ولەوێ سەرگەرمی پاڕانەوەبووم و ئاگام لەبەسەرچوونی کات نەماوەو نەمزانیوە درەنگبووە، بۆیە ئێستا بەپەلە ڕێگای شەقامەکانم گرتووەو دەمەوێت بچمەوە بۆکۆشکی پاشایەتی.

– پاسەوانەکە گوتی: ئێستا تۆ بۆلای مەسئولەکەم دەبەم و ئەوبڕیاردەدات چیت لێبکات، هەندێ بەڕێگادا ڕۆیشتین تاگەیشتینە جێگای لێپرسراوی پاسەوانەکان.

ئەفسەرەکە پیاوێکی نەگەنج نەپیربوو، تەمەنی کامڵبوو، لەپاسەوانەکەی پرسی ئەو ژنەت بۆچی هێناوە؟

– پاسەوانەکە بەسەرهاتەکەی بۆ ئەو گێڕایەوە.

– ئەفسەری پاسەوانەکان لەمنی پرسی ناوت چییە؟

– گوتم: ناوم شرمیونە.

– لێی پرسیم: ماڵت لەکوێیە؟

– گوتم: لەکۆشکی پاشایەتیدا نیشتەجێم وکارەکەری کلیۆپاترام.

– ئەفسەرەکە تائەوکاتەش بەگرژییەوە قسەی دەکرد، کەمێ لەشێوەی قسەکردن وتوڕەییەکەی کەمکردەوەو گوتی: تۆ درۆدەکەیت، تۆ یەکێکی لەژنەکانی شوێنی ڕابواردنی گشتی ولەوێ هاتویتەدەرێ وبیرت لەوەکردۆتەوە لەشەقامەکاندا لەشفرۆشی بکەیت، لەمشارەدا لەشفرۆشی ئازادە، بەڵام تەنها لەدوو شوێنی ڕابواردنی گشتی تازەو کۆندا، نەك لەشەقامەکانی شاردا، هەرژنێك لەشەقامەکانی شاردا دەستببات بۆلەشفرۆشی، زیندانی دەکرێت و سەری دەتاشرێت و دواتر ئەوبۆ پەرستگای پارێزیکەرەکان(ئەوانەی دەست لەدنیا هەڵدەگرن) دەنێردرێت وتاکۆتایی تەمەنی دەبێ لەوپەستگایەدا بمێنێتەوە.

بۆخۆپەڕاندنەوەی خۆم نەك لای ئەوئەفسەرەی پاسەوانەکان، بەڵکو لای کلیۆپاتراش، بەهانێکی باشم دەستکەوت، ئەویش ونکردنی ڕێگابوو، دەمتوانی بەخاتوونەکەی خۆم بڵێم ڕێگام لێونبووە، بۆیە بەئەفسەرەکەم گوت ئەوقسانەی تۆدەیکەیت زۆرت لەسەردەکەوێت، ئەگەر کلیۆپاترا شاژنی میسر بزانێت تۆمنت بەژنێکی لەشفرۆش داناوەو بەمنت گوتووە سەرت دەتراشم وتۆ دەنێرم بۆپەرستگای پارێزیکەران، لەوانەیە فەرمانی لەخاچدانی تۆدەربکات.

ئەگەرتۆ باوەڕت بەقسەی ئێمە نییەو درۆدەکەم، دەتوانی یەکێك لەپاسەوانەکان لەگەڵ مندا بۆکۆشکی پاشایەتی بنێری وپاسەوانەکەت لەئەفسەری دەرگاوان بپرسێت، ئایا شرمیون کارەکەری شاژنی میسرە- یان نا؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان دوای ئەوەی گوێی لەم قسەیەبوو کەمێ بێدەنگبوو وئینجا گوتی: خۆم لەگەڵ تۆدا دێم، ئینجا یەکێك لەوپاسەوانانەی کەلەژوورەکەیدابوون لەجێگای خۆی داناو پێکەوە بەڕێ کەوتین، دوای ئەوەی هەندێك لەمەرکەزەکە دوورکەوتینەوە، گوتی: ئەی شرمیون من ئێستا بەڕاستی دەزانم تۆکارەکەری شاژنی میسری، چونکە بەبیرم هاتەوە تۆم چەندجارێك لەگەڵ شاژندا لەشوێنی جیاجیای شاردا بینیومی، من لەڕاستی قسەکەی تۆ گومانم نییەو بەهۆی دووشتەوە لەگەڵت هاتم، یەکێکیان ئەوەیە پاسەوانەکان لەڕێگادا پێشت پێنەگرن ولێتبکۆڵنەوە کەتۆ کێی ولەکوێ بوویی و بۆکوێ دەچیت، دووەمیش ئەوەیە دواکارییەك لەتۆبکەم ئەویش ئەوەیە، ئەم هەڵسوکەوتەی ئێمە بەشاژن نەڵێیت وئەوەی کەگوتم چاوپۆشی لێبکەیت، منیش لەبەرامبەردا ئەوەی دەیزانم باسی ناکەم!

– لەئەوم پرسی تۆ چی دەزانیت؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە کوڕێکی جوان لەیەکێك لەمیوانخانەکاندا ژوورێکی بەکرێ گرتووە، دوێنێ شەو ژنێکی گەنج سەردانی کردووە، ئەگەری زۆر هەیە ئەوژنە ئەمشەویش سەردانی ئەو کوڕە گەنجەی کردبێت.

– گوتم ئەه... تۆ ئاگات لەم مەسەلەیە هەیە؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: بەڵێ.

– لێمپرسی تۆ چۆن ئاگات لەمەیە؟

– گوتی: هەموو خاوەن ئوتێلەکان لەمشارەدا ئەرکی ئەوەیان لەسەرشانە ئەوکەسانەی لەئوتێلەکاندا دەخەون بەپۆلیس بڵێن، خاوەنی میوانخانەی سوریش ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێکردووەو ئەوەی بەپاسەوانەکان گوتووەو ئەوانیش بەمنیان گەیاندووە.

– گوتم ئایا خاوەن ئوتێلەکان ناوی هەموو ئەوانەی کەلەمیوانخانەکاندا دەمێننەوە بەپۆلیس دەڵێن؟

– لێپرسراوەکە گوتی: بەڵێ دەبێ ئەوانە ناونیشانی هەموو میوانەکانی خۆیان بەپۆلیس بڵێن، تائەوانیش بەئێمەی بڵێن، هەندێ لەوانە نابنەجێگای سەرنجی ئێمەو ناوەکانیان بیردەکەین، بەڵام هەندێکیان لەبەرچەند هۆیەك دەبنەجێگای تێبینیکردنی ئێمەو ناوەکانیان لای خۆمان دەنووسین.

– گوتم: کەواتە ناوی منیشت لەدەفتەرەکەی خۆتدا نووسیوە؟

– گوتی: من لەدەفتەرەکەی خۆمدا نووسیومە ژنێکی گەنج بەناوی شرمیون چوو بۆمیوانخانەی سوورو ژوورێکی بۆکوڕێکی گەنج لەوئوتێلەدا بەکرێ گرت، هەروەها نووسیومە ئەو کوڕە گەنجە ناوی تیەیەو شرمیون ئەمشەو بۆ سەردانی ئەوچووە بۆ ئەو میوانخانەیە، ئێستاش پێم بڵێ شەوی تریش بۆدیداری ئەوکوڕە گەنجە دەچیت، بۆ میوانخانەی سوور؟

– گوتم: بەڵێ من تاچەند شەوێکیتر دەچم بۆئەوێ، بەڵام بەپێچەوانەی ئەمشەو درەنگ ناگەڕێمەوە بۆئەوەی بەدەستی پاسەوانەکان گرفتار نەبمەوە، وەك ئەمشەو.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: من بەپاسەوانەکان دەڵێم لەکاتی گەڕانەوەت بۆکۆشکی پاشایەتی هەراسانت نەکەن، بۆئەوەی یەکسەر بۆکۆشك بگەڕێیتەوە، ئێستا بەمن بڵێ ئایا لێمڕازی– یان نا؟

– گوتم: بەڵێ لەتۆ ڕازیم.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: شرمیون چون تۆ کارەکەری شاژنی دەتوانی زۆریارمەتی من بدەیت لەکاتی پێویستدا ناوی من لای شاژن بهێنەو پێم هەڵا بڵێ.

– گوتم باشە ئەوکارەت بۆدەکەم.

لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: منیش بەهەموو پاسەوانەکان دەڵێم لەکاتی تێپەڕبوونت بەناو شەقامەکاندا هەراسانت نەکەن و هەموو یارمەتییەکیشت بدەن، هەرجۆرە یاردەدانێکت بوێت بۆیت جێبەجێبکەن.

بەمشێوەیە ئەوڕووداوەی کەخەریکبوو کێشەم بۆ دروستبکات، نەبووەهۆی تەشەنەکردن و ئەوشەوە چوومەوەناو کۆشکی پاشایەتی.

## خەونە سەیرەکەی کلیۆپاترا

لەبەردەم دەروازەی کۆکشی پاشایەتیدا، چونکە شەوانیتر خامۆش وئارامبوو، وەك ئەوەوابوو لەچاوەڕوانی مندابوبێت، لێم هاتەپێشێ وبەسەرسوڕماوییەوە خێسێکی لێکردم وپرسی: شرمیون تائەم کاتەی شەو لەکوێ بووی؟ ئەمشەو بۆچی درەنگ هاتییەوە؟

– گوتم: لەپەرستگاکەدا خەریکی پاڕانەوەبووم ودرەنگم لێهاتووە، کاتێ بەئاگاهاتمەوە زانیم زۆر درەنگەو بەخێرایی خۆم گەیاندەوە ئێرە.

– ئەفسەرە پاسەوانەکەی دەروازەی کۆشك گوتی: پۆلیس لەڕێگادا پێشیان بەتۆ نەگرت؟

– گوتم: ئەی چۆن، بەڵام من بەئەوانم گوت کارەکەری شاژنم و بۆ ڕێزلێنان لەئەو منیان بەردا.

– ئەفسەری پاسەوانی کۆشك گوتی: شرمیون ئەمشەو شاژن دووجار بانگی منی کردو سەبارەت بەتۆ لێیپرسیم.

– گوتم بۆ ئەو نەیدەزانی من بۆ هەڵلایسانی مۆم چووم بۆپەرستگای دیان؟

– ئەوگوتی: شاژن گوتی شرمیون نەدەبا ئەوەندە درەنگی کردبا لەنیوەشەودا دەرگای پەرستگای دیان دادەخرێت و ئەوکەسانەی لەناو پەرستگاکەدان بەدەر دەکرێن.

لەوکاتەی بەرەو ژوورەکەی خۆم دەڕۆیشتم لەبیری ئەوەدابووم چۆن قەناعەت بەکلیۆپاترا بکەم کەمن لەپەرستگای دیان بووم؟ ئەگەر گوتبام لەڕێگادا پاسەوانەکان منیان گرتووەو بۆلای لێپرسراوەکەیان بردووم وبەمەش دواکەوتووم، شاژنی میسر یەکسەر لێپرسراوی پاسەوانەکانی بانگدەکردو داوای ڕوونکردنەوەی لێدەکردو توشی لێپێچینەوە دەبوو، بەوەی بۆچی کارەکەری ئەویان کەلەپەرستگا گەڕاوەتەوە، تاخیرکردووە، لێپرسراوی پاسەوانەکانیش بۆ ئەوەی بڵێ کارەکەری کلیۆپاترای

دوانەخستووە، هیچ ڕێگا چارەیەکی تری نییە جگەلەوەی ڕاستیەکە بەیانبکات و بڵێت، شرمیون چووە بۆ ئوتێلی سوورو ئەمەش بۆمن دەبووەجێگای یەك ڕیسوایی گەورە.
سەرئەنجام کەوتمە بیری ئەوەی بەشاژن بڵێم دوای ئەوەی دەرگای پەرستگای (دیان)یان داخست، من لەپشت دیوارەکەی دەرەوەیدا هەرخەریکی پاڕانەوەبووم، تاخواکان زووتر کوڕێك بەکلیۆپاترا ببەخشن. پاڕانــەوەی خــەڵکانی خــاوەن بــاوەڕ لــەودیو دیوارەکــانی پەرســتگاکەوە شــتێکی بێپێــشینەنەبوو، خزمەتکارانی پەرستگای دیـان بۆئەوەی بخـەون وئیسراحەت بکـەن، دوای نیـوەی شـەو خەڵکەکـەیان بەدەردەناو دەرگاکەیان دادەخست، ئەوکاتە هەندێك لەوکەسانەی کەنەیاندەتوانی دەست لـەدوعاکردن هەڵگرن، لەپشت دیواری پەرستگاکەدا دادەیشتن وڕازو نیازی خۆیان دەردەبڕی، تەنانەت هەندێ لەمانە تابەیانی لەپشت ئـەو دیوارانـەدا دەمانـەوەو دریـژەیان پێدەدا، خۆشبەختانە کاتێ من چوومە ژوورەکەی خۆمـەوە، کلیۆپـاترا خـەوتبوو، مـن لەوەدەترسـام بـانگم بکـات ولێپرسـینەوەم لەگەڵدابکات وبڵـێ بـۆچ دواکەوتی وئاوا بەدرەنگانی هاتیەوە، دەمزانی کلیۆپاترا بیزانیبا ئەوشـەوە لەمیوانخانـەی سوور لەگـەڵ کـوڕێکی گەنجـدابووم، تـوڕە نـەدەبوو، بۆخـۆی بـەمنی گوتبـوو بـەمجۆرە مەسـەلانە توڕەنابێـت، بـەڵام لەدرۆکردنەکەی من دەهری دەبوو، چونکە شاژنی میسر زۆر ڕقی لـەدرۆو دەلەسە دەبۆوە، هەرکەسێك لەخزمـەتکاران درۆی کردبـا- یـان فرتـوفێڵی کردبـا، سـزای دەدان ودواتـر لەکۆشـکی پاشایەتیـشی دەریدەکردن ونەیدەهێشت بۆئەوێ بێنەوە، منیش نەمدەویست خاتوونەکەم من بەژنێکی درۆزن بزانێت.
بـەیانی ڕۆژی دواتـر دوای ئـەوەی کلیۆپـاترا لەخـەو هەڵـسا، دەرگـای ژوورەکـەی منـی کـردەوە، مـن بەخەبـەربووم وبـەمنی گـوت شـرمیون بۆچـی دوێنـێ شـەوێ درەنـگ هاتیـەوە؟ مـن دووجـار سـەرم لەژوورەکەی تۆ هەڵهێنا لەوێ نەبووی؟
من ئەوپاساوەی کەئامادەم کردبوو بەخاتوونەکەی خۆم گـوت وئـەویش بـەبێ ئـەوەی گومـانم لێبکـات قـەبوڵیکرد، چـونکە تائەوکاتـەی درۆو تەفرەدانـەکانی مـرۆڤ ئاشـکرانەبێت، هەرچـی بیڵێیـت بەڕاسـتی وەردەگرن، چونکە پێیانوایە ڕاست دەکەیت، بەڵام کەجارێك گوێیان لەدرۆیـەکبێت، ئیتر هەرچی بڵێیت بەگومانەوە وەریدەگرن وبیر لەوەدەکەنەوە لەوانەیە زۆر درۆبکەیت.
– گوتم خاتوونەکەم ئایا ئیشێکت بەمن هەبوو؟
– کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ شرمیون؟
– گوتم کارەکەت چی بوو؟
– شـاژنی میسر گـوتی: لـەنێوان کارەکـەرەکانی منـدا تـەنها تـۆی کەخوێنـدەواریت هـەبێت وکتێبـت خوێندبنەوە عـەقڵی تۆ بـەهێزترە لەئـەوانیترو هـیچ یـەك لەوژنانـەی خزمەتکاریـەتی منیـان لەئەستۆدایە، خوێندەوارییان نییەو من ناتوانم هیچ شتێ لای ئەوان بدرکێنم وبڵێم، بەڵام لەگـەڵ تـۆدا دەتـوانم گفتوگۆ بکەم وڕای تۆ سەبارەت بەهەندێك شت گوێ لێدەگرم.
– گوتم خاتوونەکەم دەتەوێ سەبارەت بەچی قسە بکەیت؟
– گوتی من دوێنێ شەو خەونێکم بینی دوای ئەوەی لەخەو بەئاگاهاتمەوە، هاتم دەرگای ژوورەکەی تۆم کردەوە، بۆئەوەی خەونەکەت بۆبگێڕمەوە، بەڵام تۆ تائەوکاتەش نەهاتبوویەوە، ئینجا خەوتمەوە، بـەڵام

دوای یەك- یان دوو سەعات بەخەبەر هاتمەوە، دووبارە هاتم دەرگاکەی ژووری تۆم کردەوەو بینیم هەر نەگەڕابویەوە.

- گوتم خاتوونەکەم: خەونەکەی تۆ چۆن بوو، ئێستا حەزدەکەیت بۆم بگێڕیتەوە؟

- کلیۆپاترا گوتی: بەڵێ وەرە بۆ ژوورەکەی من تاخەونەکەی خۆمت بۆبەیان بکەم، تۆ بۆخۆت دەزانی من ڕۆژانە لەبانوەکەی خۆمدا خۆم دەشۆم، هەندێ ڕۆژ بۆئەوەی پێستی لەشم نەرم وسپی بێت، فەرماندەدەم بانوەکەی من پڕبکەن لەشیری ولاغ، ئێمە لەئەسکەندەریەدا سواڵکەرمان نییە تادوای خۆشتنەکەم شیری بانوەکەی من بەسەر سواڵکەرەکاندا دابەشنەوە، بۆیە ئەوشیرە دەبەن بۆباغی ئاژەڵان بۆئەوەی بیدەن بەوئاژەڵانەی پێویستیان بەخواردنی شیرهەیە.

- گوتم خاتوونەکەم من ئەمە دەزانم.

- کلیۆپاترا گوتی: دوێنێ شەو لەخەومدا لەناو بانوەکەی خۆمدابووم کەپڕبوو لەشیری ولاغ وخەریکی ششتنی لەشم بووم، بانوەکەی من ئەوەندە گەورەیە کەبەقەت حەوزێ دەبێت و من لەناو ئەوحەوزەدا بەئاسودەیی مەلە دەکەم وجارجارەش لەبەرخۆمەوە دەڵێم، ئایا لە ئەسکەندەریەدا ئەوەندە ولاخی مێ هەیە کەبەشیری ئەوانە بتوانرێت حەوزێکی ئاوا پڕبکرێت؟

- دواتر بەخۆم دەڵێم، نەخێر ئەگەر شیری تەواوی ولاخەکانی میسر کۆبکەنەوە ناتوانرێت حەوزێکی ئاواگەورەو فراوان پڕبکرێت لەشیر، بۆیەك ولاخی مێ لەرۆژێکدا چەند شیردەدات؟ ئایا شیری یەك ولاخی مێ لەدوو قاپ زیاتری تێدایە؟ لەو کاتەی ئەم بیرانەم دەکردنەوەو لەحەوزە پڕ لەشیرەکەدا مەلەم دەکرد، سەیرم کردسەر حەوزەکە پڕبوو بەلاولاو ولاولاوەکان لەساتێکدا گوڵیانکردن.

ڕوانی لاولاو وگوڵدەکردنی لەحەوزێك کەئاوی تێدانەبێت وپڕ لەشیربێت منی توشی سەرسوڕمان کرد، چونکە دەمزانی لەناو شیردا هیچ گیایەك ناڕوێ، ئینجا چاوم بەدەورووبەری حەوزەکە کەوت وبینیم خزمەتکارەکانم لەچواردەوری حەوزەکەدا بەڕیز وەستاون ودەستیان بۆلای من ڕاداشتووەو هاواردەکەن ئاگام لەخۆمبێت، چونکە لاولاوەکان لەپێی من دەئاڵێن ودەمخنکێنن، بەڵام من گوێم نەدەدایە هاوارەکانی ئەوان و هەرمەلەم دەکرد، کاتێ کەمن مەلەم دەکرد، بەبێ ترس لەلاولاوەکان لەولای حەوزەکەوە بۆلایەکەی تری دەچووم، لەپڕ سوارێکی جەنگی هات وگەیشتەلام ولەئەسپەکەی هاتەخوارێ و هاتەلێوار حەوزەکەو ئەو نووسراوەی لەدەستی دابوو بۆلای منی ڕاداشت، منیش نووسراوەکەم لەدەستی وەرگرت وخوێندمەوەو لەخوێندنەوەی ئەو زۆر دڵخۆشبووم، من نەمدەزانی چی لەونامەیەدا نووسراوە کەواخوێندنەوەی منی خۆشحاڵکرد، بەڵام دەمزانی ئەوەی لەونامەیەدا نووسراوە وابەستە بەخۆشی ولەزەتێکی گەورەیەو من لەبیری ئەو بەختیارییەدا دڵخۆشببوم، لەخۆشیاندا ئاگام لەوتەتەرەی کەنووسراوەکەی هێنابوو نەما، هەروەها خزمەتکارەکانی خۆشم نەدەبینی ولەدنیای خۆشیدا بەسەرم دەبرد، تابینیم شرمیون تۆ تیمساحێکت پێبوو ولەمن نزیك دەبوویەوە، من سەرم لەوەسوڕمابوو چۆن ژنێکی وەك تۆ دەتوانێت تیمساحێك بەدەستەوە بگرێت وبەرێ بکەویت؟ چونکە تۆ تیمساحەکەت بەلاکەلەکەتەوە هەڵگرتبوو وئەو گیانلەبەرە ئەوەندە بەلاتەوە سوکەڵەبوو، وەك ئەوەدەچوو یەك منداڵی شیرەخۆرەت بەلاکەلەکەتەوە گرتبێت، لەکاتێکا دوو پیاوی بەهێز ناتوانن تیمساحێك هەلگرن، من تائەوکاتەش لەحەوزە پڕشیرەکە نەهاتبوومەدەرێ ونووسراوکەم لەدەستمدابوو، وەك

ئەوەوابوو شێی شیرەکە کارنەکاتەسەر تەڕبوونی نامەکە، کاتێ تۆ بەخۆت و ئەو تیمساحەی کەپێتبوو هاتیە لێوارحەوزەکەو منیش لەحەوزەکە هاتمەدەرێ، من نازانم بۆچ لەحەوزەکە هاتمەدەرێ، لەوانەیە لەبەر ئەوەبوو بێت کەخۆشتنەکەم تەواوببوو، هەرکە لەحەوزەکە هاتمەدەرێ، تۆ شرمیون ئەو تیمساحەی پێتبوو بۆلای منت هاویشت، کاتێ ئەوەت بۆلای من فڕێدا تیمساحەکە دەمی خۆی کردبۆوەو هێرشی بۆمن هێناو قەپاڵتەی لێگرتم، منیش لەترساندا هاوارمکردو لەخەوەکە ڕاپەڕیم.

ئەمەبوو خەونەکەم، ئێستاش تۆ شرمیون ژنێکی خوێندەواری وخاوەنی زانیاری، دەمەوێت خەونەکەم بۆ لێکبدەیتەوە.

– من ماوەیەك بێدەنگبووم بۆئەوەی بیر لەوەبکەمەوە لێکدانەوەیەکی شیاو وگونجاو بۆ خەونەکەی دابڕێژم.

– کلیۆپاترا لێی پرسیم بۆچی بێدەنگبووی و وەڵامی من نادەیتەوە؟

– گوتم: خاتوونەکەم، بیردەکەمەوە، چونکە هەرخەونێك چەند لێکدانەوەیەکی هەیەو پێویستە لەناوئەمانەدا باشترینیان هەڵبژێردرێت و بەیان بکرێت.

– کلیۆپاترا گوتی: باشترین لێکدانەوەی خەونەکەی من چییە؟

– گوتم: مەلەکردنی تۆ لەحەوزێکی پڕلەشیردا بێ دوودڵی ئەوە دەگەیەنێت وڵاتەکەی تۆ لەڕووی بژێوییەوە زۆر باشە.

ئەو لاولاوانەش کەلەسەر حەوزەکەت بینیوتن، هەندێ گرفتی زۆر بچوکن کەڕووبەڕووت دەبنەوە، بەڵام ئەوکێشانە ناتوانن بوژانەوەو درەوشاوەیی وڵاتەکەی تۆ لەناوبەرن، ئەو تەتەرەی کەگەیشتۆتەلات ونامەیەکی داوەتە دەست تۆو لەخوێندنەوەی ئەونامەیە زۆر دڵخۆشبووی بەبێ ئەوەی بزانی ناوەڕۆکەکەی چییە، نیشانەی شوکردنەکەتە بەبراکەت، چونکە بەو مێردکردنەت دڵشادبووی.

– کلیۆپاترا گوتی: شرمیون من شوم کرد، بەڵام مێردەکەم براکەی خۆمە.

– گوتم: خاتوونەکەم تۆ بۆخۆت گوتت حەزت نەدەکرد شوو بەبراکەت بکەیت، شوکردنی تۆ بەبراکەت ناچاری بوو بۆئەوەی ویستی باوکت بێنیەدی، دوای ئەوە بەحەزی خۆت دەبێت وئەو پیاوەی کەخۆشتدەوێت پێی دەگەیت، لەبەرئەوە ئەوشتە دەبێتە سەرچاوەی خۆشی بۆشازنێکی وەکو تۆ، جگەلە هاوسەریەتی هیچی تر نییە.

– کلیۆپاترا گوتی: زۆرباشە ئیتر بەشی کۆتایی خەونەکەم کەوابەستەیە بەخودی تۆ بۆم لێکبدەرەوە، ئەو تیمساحەی تۆ بەلاکەلەکەتەوە بوو چ مانایەك دەگەیەنێت، بەوەی بۆلای منت فڕێدا؟

– گوتم خاتوونەکەم: بۆ خۆت دەزانی لەکتێبی لێکدانەوەی خەونەکاندا تیمساح ببیندرێت، دەبێ بەخەونێکی باش بزاندرێت، من کەتیمساحەکەم بۆلای تۆ هاویشت، ئەوە دەگەیەنێت شتێك بەتۆ دەدەن خۆشبەخت دەبیت و لەوانەیە دیان نیازی منی قەبوڵکردبێت و تۆ ببیتە خاوەنی کوڕ.

هەموو بەشەکانی خەونەکەی کلیۆپاترام ڕاست لێکدایەوە، ئەوەی بەئەوم گوت بەپێی تەعبیری خەون ڕاستبوو، تەنها بەشی کۆتایی خەونەکەی ئەوم دروست لێکنەدایەوە، لەوەترسام ڕاستییەکە بڵێم، چونکە هاویشتنی تیمساح لەلایەن منەوە بۆلای شازنی میسر، شتێکی ترسناکی دەگەیاند، ئەوەی

دەگەیاند ڕۆژێ دێت من کێشەیەکی گەورە بۆشاژنی میسر دروستدەکەم و ئەو مەترسییە دەبێتەهۆی لەناوبردنی ئەو.

دڵم خۆشبوو بەوەی شاژنی میسر پێش من خەونەکەی بۆ کەسیتر نەگێڕابۆوەو لێکدانەوەی خەونەکەی لەدەمێکی ترەوە نەبیستبوو، چونکە ئەگەر لێکدەرەوەیەکیتر خەونەکەی بۆلێکدابایەوە بەئەوی دەگوت هاویشتنی تیمساح لەلایەن شرمیونەوە مانای ئەوەیە ڕۆژێك دێت شرمیون بەلەناوبردنی دەبات، هەرساتەی بیرم لەوەدەکردەوە ڕۆژێك دێت خاتوونەکەی خۆم بەکوشت بدەم، لەترساندا دەلەرزیم وبەخۆم دەگوت مەحاڵە من بتوانم کلیۆپاترا شاژنی میسر بەکوشت بدەم، کاتێ کاڵ ئاشنایی لەگەڵ خاتوونەکەی مندا پەیداکرد، ئیرەیی بەسەرمدا زاڵبوو، بۆچی گەنجێکی جوان کەبۆتەجێگای سەرنجی من وخۆشمدەوێت، عاشقی کلیۆپاترا بێت، بۆچی شاژنی میسر سەرنجی ئەوی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە؟ بەڵام لەوکاتانەشدا بیرم لەوە نەدەکردەوە خاتوونەکەی خۆم بەکوشتبدەم، تابتوانم ئەوگەنجەی من خۆشمدەوێت دەستگیرم بێت، ئەی چۆن دەتوانم بەدەستی خۆم خەریکی کوشتنی کلیۆپاترابم؟

بەشێوەیەك ترس باڵی بەسەرمندا کێشا نەمدەتوانی تۆتکەبگرم، دڵنیابووم بەڵایەك لەوێدایە ئەو ڕۆژەدێت خاتوونەکەی خۆم بەکوشتبدەم، تەنها یەك ڕێگامابوو کەپەنای بۆببەم بۆئەوەی من لەوبەڵایە پەنابدات، ئەویش ئەوەبوو بچم بۆپەرستگای دلف وماوەی پێنج ڕۆژ خەریکی پاڕانەوەبم وداوا لەخواکان بکەم ئەو بەڵایە لەمن و کلیۆپاترا لابدەن.

بەشێوەیەك ترس دایگرتم شەوی دواتر کەچووم بۆمیوانخانەی سوور هێندەلای تیە نەمامەوەو دوای سەعاتێك گەڕامەوە بۆکۆشك، ئەو کوڕە گەنجە پێی سەیربوو بۆچی ئاوازوو دەڕۆمەوە، بەڵام من بەتیەم گوت شاژن چاوەڕوانی گەڕانەوەی منەو کاری پێمەو ناتوانم ئەو بەچاوەڕوانییەوە ڕاگرم، ئەگەر دەسەڵات لەدەست خۆمدابوایە ئەوا بەزووترین کات ڕێگای پەرستگای دلفم دەگرتەبەر، بەڵام نەمدەتوانی بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لەخاتوونەکەم بچم بۆ پەرستگای دلف، ناچاربووم دە شەو چاوەڕوانبم هەتا شاژنی میسر وابزانێت من بەردەوام سەردانی پەرستگای (دیان) دەکەم بۆئەوەی سکپڕبێت، مۆم دادەگیرسێنم دەپاڕێمەوە.

دە شەو بەبەهانەی چوونم بۆ پەرستگای دیان لەکۆشك دەچوومەدەرێ وخۆم دەگەیاندە میوانخانەی سوورو دوو سەعاتم لەگەڵ تیەدا بەسەر دەبردوو دواتر دەگەڕامەوە بۆکۆشك.

دوایین شەو بەتیەم گوت شەوێکیتر نایەم بۆئێرە، چونکە ئەوماوەیەی کەبەمنیان دابوو کۆتایی پێهات وکلیۆپاترا ڕێگام نادات شەو لەکۆشك بچمەدەرێ.

– تیە گوتی: سبەی کارەکەی من لەکۆشکی پاشایەتیدا تەواودەبێت، ئیتر منیش ناتوانم بۆ کۆشك بێم، ئێستاش پێم بڵێ ئێمە لەکوێ دەتوانین یەکتری ببینین؟

– گوتم تیە ئەوەندەی من حەزدەکەم تۆببینم تۆ ئەوەندە ئارەزووی دیداری منت نییە، چونکە تۆ منت وەك دایکی خۆت دەبینی، ئەو کوڕە گەنجەی کەوەك دایکی لەژنێکیتر بڕوانێت شەیدای ئەو نییە.

– تیە گوتی: بەڵام من خووم بەتۆوە گرتووە، تۆ یەکەم ژنی کەمنت خۆشویستبێ، بۆیەش حەزدەکەم تۆ ببینمەوەو سەعاتەکانی شەو لەگەڵ تۆدا بەسەربەرم.

– گوتم تیە: خاتوونەکەی من سەفەرێکی لەبەرە چونکە بۆ ئەوسەفەرەش من لەگەڵ خۆیدا دەبات، لێت دوور دەکەومەوە، ئەگەر تۆ نەگەڕایەوە سوریا، نیشتمانەکەی خۆت ولەمیسردا مایەوە، دوای گەڕانەوە لەسەفەرەکە لەئەسکەندەریەدا دەتبینم، ئەگەر ڕۆیشتیشی وگەڕایەوە نیشتمانەکەی خۆت، بەیەککەیشتنی من وتۆ دەکەوێتە دەست پێشهات ورێکەوت.

ئەگەر تۆ لەئەسکەندەریەدا مایەوە هەر لەم ژوورەدا نیشتەجێ بە، من کرێی ئەو ژوورە تاکاتی گەڕانەوەی خۆم بەخاوەنی ئوتێلەکە دەدەم، مەبەستم ئەوەیە دوای گەڕانەوەم لەسەفەرەکە تۆ لەم میوانخانەیەدا بدۆزمەوە، چونکە ئەنسکەندەریە گەورەترین شاری دنیایە، لەمشارەدا ئەگەر ناونیشانی ماڵەکانت لانەبێت وشارەزانەبیت ناتوانیت کەس بدۆزیتەوە، لەوانەیە کەسانێك لەگەڵ یەکتریدا دۆست وئاشنابن و بۆماوەی چەند ساڵێك لەمشارەزابن ویەکتر بدۆزنەوەو بەیەك دەگەن، من دوای گەڕانەوەم دێم بۆئەم میوانخانەیە، ئەگەر زانیم تۆهەر لێرەیت، دووبارە دێم و نیوەی شەوگار پێکەوە بەسەردەبەین، هەرکاتێکیش تۆم لێرەنەدۆزییەوە ئەوا هەموو شەوێ پێش ئەوەی خەو بمباتەوە یادی تۆدەکەمەوە.

ئایا تۆش بەڵێن بەمن دەدەیت دوای گەڕانەوەت بۆسوریا شەوانە پێش ئەوەی بخەویت ولەبیرە خەوەکانتا بکەویە یادی منەوە؟

ئایا تۆ دەزانیت پێش تۆ هیچ پیاوێك پەنجەکانی نەخستبووەسەر لێوەکانی من؟ ئایا دەزانی تۆ یەکەم گەنجی کەلەپی دەستی خۆت لەسەر سینگ وبەرۆکی من گێرا؟

– تیە گوتی: شرمیون تۆش یەکەم ژن بووی کەلەگەڵ مندا ئاشناییت پەیداکرد.

– گوتم: تیە من داوای ئەوەت لێناکەم تۆبەردەوام لەبیری مندابیت، چونکە تۆ زۆر لەمن گەنجتری ودوای ئەوەی گەڕایتەوە سوریا کچە جوانەکانی ئەووڵاتە دەوروخولی تۆدەدەن ودوای ئەوەی تۆ ئەوانت بینی منت بیردەچێتەوە، بەڵام چونکە تۆ یەکەم پیاوبووی کەلەگەڵمابووی بەدۆست، منیش بەپێی قسەکەی خۆت یەکەم ژن بووم کەلەگەڵ تۆدا بووم بەئاشنا، تۆ من بەیەکجاری لەیادمەکە.

بەوشێوەیە من لەتیە جیابوومەوەو گەڕامەوە کۆشك، من دڵنیابووم ئەگەر تیە نەبینمەوەو ئەو بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی، ئەوا من هەرگیز لەبیری ناکەم، تائەمڕۆش کەتەمەنی من گەیشتۆتە ئاستێك لەوانەیە بەم زووانە خواکان ڕۆحم لێسبتێنن و بمرم، هەر تیەم لەبیر نەچۆتەوەو لەیادنەکردووە.

سبەی بەیانی خۆم ئامادەکرد بچم بۆپەرستگای دلف وماوەی پێنج ڕۆژ لەوێدا خەریکی پاڕانەوەبم هەتاخواکان ئەو بەڵایە لاببەن وشتێکی وابکەن من ناچارنەبم خاتوونەکەی خۆم کلیۆپاترا بەکوشت بدەم.

## پاڕانەوە لەپەرستگای دلف ونهێنی سەیری ژیانی من

لەئەسکەندەریەوە بۆپەرستگای دلف شەش ڕۆژ ڕێگابوو، ماوەی سێ ڕۆژ بەکەشتی وسێ ڕۆژیتر بەڕێگای کەژاوە

-یان بەوەڵاخ، دوای دابەزین لەکەشتی، من بەخاتوونەکەی خۆم گوت: لەدوایین شەوی کەلەپەرستگای دیاندا خەریکی دوعاکردن بووم، خەو بردمیەوەو لەخەونمدا (دلف)م بینی وبەمنی گوت ئەگەر دەتەوێت خاتوونەکەت سکی پڕبێت وببێتەخاوەن کوڕ، ئەواوەرە بۆپەرستگای من، بۆیە شاژن دەبێ مۆڵەتم بدەیت بچم پێنج ڕۆژ لەپەرستگای دلفدابم، بۆ ئەوەی خاتوونەکەم سکپڕبێت، بەڵام کلیۆپاترا چونکە ڕاهاتبوو لەسەرئەوەی بەردەوام من لەدەوری خۆیدا ببینێت وخزمەتی بکەم، ڕازی نەدەبوو من بچم بۆپەرستگای دلف.

من کەبەهۆی خەونە ترسناکەکەی کلیۆپاتراوە ئارامم لێهەڵگیرابوو، زەروریەتی ڕۆیشتنم بۆپەرستگای دلف تۆتکەی لێبڕیبووم.

سەرئەنجام کلیۆپاترا لەسووربوونی بەردەوامی من هەراسانبوو وبێئەوەی لەدڵەوە ڕازیبێت مۆڵەتی دام بۆئەو سەفەرەبچم وپارەی دامێ ونامەیەکی بۆنووسیم وپێی گوتم لەڕێگادا بیدەبە دەسەڵاتدارانی ئەوناوچانەی کەپێیدا تێدەپەڕیم هەتائەوانە کاروبارەکانم بۆجێبەجێبکەن ولەخودی پەرستگای دلفیشدا ڕێزم لێبگرن وبزانن من کارەکەری تایبەتی شاژنی میسرم ولەگەڵ سەردانیکەرەکانی تری پەرستگادا جیاوازیم پێبکەن.

من لەئەسکەندەریەوە بەکەشتی کەوتمەڕێ وڕێگای خوارووم گرتەبەر، لەڕێگادا هیچ شتێکی کەشایانی باسکردنبێت ڕووی نەدا، دوای سێ ڕۆژ کەشتییەکەمان لەلێوار بیاباندا ڕاوەستاو منیش لەکەشتییەکە دابەزیم و لەیەکێك لەدانیشوانی ئەوناوچەیەم پرسی، ماڵی لێپرسراوی ئەمشارە لەکوێیە؟

ئەویش ماڵی لێپرسراوەکەی نیشاندام وچووم بۆلای ئەو وئەو نامەی شاژنی میسر بەمنی دابوو نیشانمدا.

ئەوکەزانی شرمیونی کارەکەری نزیکی کلیۆپاترام تکای لێکردم ئەمشەو لەماڵەکەیدا بمێنمەوە، ڕۆژی دواتر دوو وەڵاخی ڕەنگ سپی وبەهێزو هەیکەلیان هێنان، یەکێکیان تایبەت بۆسواربوونی من بوو وئەوی تریشیان نۆکەری لێپرسراوەکە لێی سواربوو، لێپرسراوەکە بەخزمەتکارەکەی گوت، من بگەیەنێتە پەرستگای دلف ولەوێ بمێنێتەوە تازیارەتەکەی من کۆتاییدێت وئینجا بەهەمان وەڵاخ لەگەڵیدا وەرەوە، پێش ئەوەی بەڕێ بکەوین لەمنی پرسی ئایا پێویستت بەپارە نییە بۆڕێگا؟

– گوتم نەخێر چونکە من لەئەسکەندەریەوە پارەی تەواوم لەگەڵخۆمدا هێناوەو پێویستم بەپارە نییە، ئینجا کەوتینەڕێ، خزمەتکاری حوکمڕانی ناوچەکە کەلەگەڵ مندابوو، ڕەش پێستبوو وخەڵکی سودان بوو، حوکمڕانەکە لەسەردەمی مێردمنداڵییەوە ئەوی لەسودانەوە بۆمیسر هێنابوو وکردبوویە خزمەتکاری خۆی، خزمەتکارە سودانیەکە زمانی یۆنانی دەزانی ومن بەبێ گرفت قسەم لەگەڵدا دەکرد: لێم پرسی: ئایا ئەوساڵەت لەبیرماوە کەڕەشپێستەکان هێرشیان هێنایەسەر میسرو خۆیان گەیاندە ئەسکەندەریە؟

– خزمەتکارە ڕەشپێستەکە گوتی: بەڵێ من لەوساڵەشدا هەرخزمەتکاری ئەم ئاغایەمبووم ودوای ئەوەی ڕەشپێستەکان هێرشیانهێنا، ئاغاکەم هەڵات وخۆی گیاندە سەرووی میسرو منیشی لەگەڵدابووم.

– گوتم: ئایا لەژیانی خۆت ڕازی لای ئەوحوکمڕانە؟

– پیاوە ڕەشپێستەکە گوتی: ئەی خاتوونەکەم من کەیەك خزمەتکارم چۆن لەژیانی خۆم ڕازیبم؟

– گوتم من خاتوون نیم، بەڵکو کارەکەرم.

– خزمەتکارەکە گوتی: ئاغاکەم پێی گوتم کەتۆ کارەکەری تایبەتی شاژنی میسری، لەنێوان کارەکەری تۆ ونۆکەری مندا جیاوازییەکی زۆرهەیە، چونکە تۆ کارەکەری ژنێکی دەڵێن لەدنیادا هیچ ژنێك وەك ئەو جوان و سەخی نییە، هەرچییەکت بوێ بۆت دابین دەکات، بەڵگەش بۆئەمە ئەوەیە کەشاژنی میسر تۆی بۆ زیارەتی پەرستگای دلف ناردووە، بەڵام من خزمەتکاری پیاوێکی بەخیل وچاوچنۆکم وهەرگیز ئەوەندەم خواردن ناداتێ پێی تێربیم، بۆیە بەناچاری دەچم بۆدەم ڕووبارو ماسی دەگرم وسکی خۆم بەگۆشتی ماسی تێردەکەم، لەکاتی گەیشتنی خورماشدا بەخورما ورگی خۆم تێردەکەم، بەڵام لەزۆربەی کاتەکانیتردا هەربەبرسییەتی دەمێنمەوە.

– گوتم تۆ کەبەردەوام برسی بۆبیر لەڕێگا چارەیەك ناکەیتەوە؟

– خزمەتکارە ڕەشەکە گوتی: هیچ ڕێگا چارەیەکم نییە؟

ئەگەر هەڵێم ئێمە دەستگیردەکەن ودەمکوژن، ئەگەر بشمەوێت خۆم ئازادبکەم دەبێ پارەم هەبێت، منیش لەماڵی ئەو حوکمڕانەدا هەرگیز ناتوانم ئەوەندە پارەپاشەکەوت بکەم کەخۆمی پێبکڕمەوە، کەسیش دەست ناکەوێت ئێمە لەوئاغایە بکڕێتەوە، تالەماڵی ئاغایەکی تردا، هەرنەبێ تێربخۆم وبەبرسییەتی نەمێنمەوە.

– گوتم چونکە من کارەکەرێکم ناتوانم تۆبکڕمەوە، بەڵام دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆئەسکەندریە، لای هەندێ دەوڵەمەند باسی تۆدەکەم وبەئەوانە دەڵێم بکڕنەوە، تابیبە خاوەنی ئەربابێکی باشتر، دوای ڕۆیشتنمان ماوەی سێ ڕۆژ گەیشتینە پەرستگای دلف.

کاهینی گەورە، کەلەمەوبەر گوتم هات بۆ ئەسکەندەریەو شەوێك لەژوورەکەی مندا مایەوە تاگوێی لەقسەکانی نێوان کلیۆپاتراو مێردەکەی بێت، مردبوو ویەك کاهینی گەنج لەجێگای ئەودا سەرافەتی پەرستگای دلفی دەکرد.

پەرستگای دلف ئەوەندە گەورەبوو، کاتێ من چووم‌ەناو ئەوپەرستگایە کەس ئاگای لێنەبوو، تەنها کاهینی ئەوبەشە نەبێت، هەربەشەی ئەو پەرستگایە یەك سەرپەرشتیاری خۆی هەیە، سەرپەرشتیاری ئەوبەشە لەمنی پرسی بۆچی هاتووی وچەند رۆژ لەپەرستگاکەدا دەمێنمەوە؟

– گوتم بۆ ئەوە هاتووم لەبەرخاوەنی ئەسڵی ئێرە بپاڕێمەوە لەبەڵایەکی گەورەم لادات، من خەونێکم بینیوە کەتێیدا بەڵایەکی گەورەم بەسەردێت، هەرچەندە ئەومەترسییە ڕووبەڕووی خودی من نابێتەوە بەڵام توشی ئەوکەسە دەبێت کەلای من زۆر ئازیزو بەڕێزە، بۆیە درکم بەوەکرد ناتوانم بەهیچ شێوەیەك ئەومەترسییە لەئەو دووربخەمەوە، تەنها ئەوەنەبێت بۆئێرەبێم ولەبەرخوای دلف بپاڕێمەوە ئەوبەڵایە لاببات لەسەر ئەوکەسە، لێپرسراوی ئەوبەشە هیچی تری لێنەپرسیم وژوورێکی نیشاندام، بۆئەوەی ئەوماوەی دەمێنمەوە لەوێدا بەسەری بەرم، دواتر کەزانی خزمەتکارێکم لەگەڵدایە فەرمانیدا لەدەرەوەی پەرستگاکە شوێنێك بۆئەو دابین بکەن و وەڵاخەکانی ئێمەش لەسەرئاخوڕی پەرستگا ببەستنەوەو تێریان بکەن.

پەرستگای دلف یەك هۆڵی گەورەی هەیە کەدووسەد پایەی بەردی لەبەردایە، تائەم ڕۆژگارەشمان هۆڵی واگەورە لەدنیادا دروست نەکراوە، پەیکەری دلف لەوهۆڵەدایە ئەوکەسانەی کەنیازیان لەدڵدایە لەوشوێنەدا ڕۆژ دەکەنەوە، دەبوا ماوەی پێنج ڕۆژ لەسەرەتای شەوەوە تابەیانی ئەوخەڵکانە لەوهۆڵەدا مابانەوەو چاویان بڕیبا خوای دلف (کە یەکێکە لەخواکانی ئێمە) تابەیانی لەبیری ئەودابان، ئەو ژن وپیاوانەی کەلەپەرستگای دلفدا بەیەکدەگەیشتن بەئومێدی قەبوڵبوونی نیازەکانیان، نەدەبا لەوێ بیریان لەهیچیتر بکردبایەوە.

بیرکردنەوە لەهەندێ پێداویستی گرنگی ژیان، وەك بیرکردنەوە لەخواردن لەوەختی جەمێ دا، ڕێگای پێدراوە، بەڵام نابێ بیرۆکەیتر بهێتەناو کلێشەی سەری ئەوکەسە، ئەگەر ئەوکەسەی دەچێت بۆزیارەتی پەرستگای دلف نابێ بیر لەوشتانە بکاتەوە کەپەیوەندییان بەماڵەکەیەوە هەیەو دەبێ لەوپەرستگایەدا بمێنێتەوە، تاخواستەکەی دێتەدی، ئینجا لەوپەرستگایە بڕوات.

لەمیسردا ئەوەباوە ئەوەی لەپەرستگای دلف هەرچی داوابکات دێتەدی، بەمەرجێك دوای ئەوەی گەیشتە پەرستگاکە بەردەوام لەهۆڵی خواوەند دلفدا بمێنێتەوەو جگەلە دلف بیر لەهیچیتر نەکاتەوە، ئەمە سەبارەت بەمن کێشەنەبوو، من دەمتوانی بەردەوام لەبیری خەونەکەی کلیۆپاترادابم، بۆیەهاتووم تادلف ئەوبەڵایە لەمن لابدات ونەبمە بکوژی کلیۆپاترا، هەرکە دڵنیابووم ئەوخزمەتکارە ڕەشە لەدەرەوەی پەرستگاکەدا بەبرسییەتی نامێنێتەوەو وەڵاخەکانی ئێمە لەئاخوڕی پەرستگادا ئالیك دەخۆن، ڕێگای هۆڵی دلفم گرتەبەر، من تائەو شەوە ڕێنەکەوتبوو خوای دلف ببینم بۆیەکەمجار چاوم بەخوای ناوبراوکەوت.

من پەیکەری کەسێکم بینی کەباڵای لەهی هەمووکەس بەرزتربوو تائەوڕۆژە شتی وام نەبینیبوو، لەپشتییەوە ڕووناکایی لەئەوی دەدا، وەك ئەوەوابوو خۆر لەپشتی بدات، ئەوی بەنوور نیشاندەدا، من

هیچ یەك لەخواكانیتر شكۆمەندی ومەزنی وەك دلفم نەدیبوو، لەبەرخۆمەوە گوتم بێ دوودڵی ئەمە ئەوخوایەیە كەدەتوانێت داواكانی میللەت بەدی بێنێت، لەمانەش ئەوبەڵایە گەورەیە لەمن لابدات.

دوای ئەوەی چوومەناو هۆڵەكە لەبەرامبەر خوای دلفدا دانیشتم، هەندێ لەخەڵكیتر لەوێدابوون خەریكی پاڕانەوە بوون، هەندێ لەوانە نەخۆش بوون وداوای چاكبوونەوەیان دەكرد، هەندێكیتر قەرزاربوون وپەیانویست قەرزەكەیان بۆ بدرێتەوەو لەخوای دلف دەپاڕانەوە ئەو قەرزانەیان بۆ بدرێتەوە تاتوشی كۆیلەیەتی نەبن، ئەوانەی لەوپەرستگایەدا بوون لەگەڵ یەكتری قسەیان نەدەكردو ئەوخواستەی لەخوای دلفیان دەكرد، مەعلوم دەبوو چییە، چونكە زۆربەی ئەوانە بەدەنگی بەرز خواستەكانی خۆیان بەیان دەكرد، یەكێك لەقازانجەكانی بەدەنگ پاڕانەوە ئەوەیە، هۆشی مرۆڤ پەرت نابێت وبەردەوام لەبیری دلفدا دەبن وناوی ئەودەهێنن، لەبەر ئەوەبوو توانیم تێبگەم ئەوانەی لەدەوروبەری من دانیشتون بۆ چ خواستێك هاتوون، جارجارە كاهینەكان بەسەری تاشراوەوە لەناو هۆڵەكەدا دەبینران، ئەوانە كەسانێك بوون بۆ ئەنجامدانی ئەركەكانیان لەناو ئەوێدا یەكتریان دەبینی، تراشینی سەر ڕەسمییە لەكاهینەكانی میسرییەوە كاریگەری لەسەر كاهینەكانی ئێمە جێهێشتووە، لەكۆندا كاهینەكانی پەرستگاكانی یۆنانی سەریان نەدەتاشی، دوای ئەوەی ئەسكەندەر میسری داگیركرد یۆنانییەكان هاتن بۆمیسرو زنجیرەی لەتالیسەكان كەیۆنانی بوون لەمیسردا فەرمانڕەواییان گرتەدەست و وردەوردە بەشێك لەنەریت ودابی میسری هاتەناو پەرستگاكانی یۆنانی، لەمانەش: كاهینەكان ڕاهاتن لەسەرئەوەی سەریان بتراشن وعەتر لەسەریان هەڵسوون، كاهین كەسێكە تەركی دنیا دەكات، واتا پەیماندەدات لەگەڵ ئافرەتدا نەژیەت وبەلایدا نەچێت، بەڵام لەمرۆژانەدا لەمیسر، كاهین بەومانایەی تەركی دنیای كردبێت نییە، هەموو ئەوشتانەی لەژیاندا ئاساییە وەك خۆراك وپۆشاك، ئەوان دەیكەن، كاهینەكانی ئێمە بەتایبەتی لەپەرستگای دلفدا، بەوشێوەی من بینیم، باشتر لەوكەسانەیتری ناو پەرستگاكە دەیگوزەرێنن، خواردنی خۆش دەخۆن وپۆشاكی بەنرخ لەبەردەكەن، بۆیەئەمانە دنیایان تەرك نەكردووە، بەڕوكەش ئافرەت لەژیانی ئەوانەدا نییە، بەڵام بەكردەوە وانییە، بۆخۆم لەسەرزمانی كاهینی گەورەی پەرستگای دلف بیستووە كەلەگەڵ ژناندا ڕادەبوێرێت، بەڵام ڕابواردنی كاهینەكانی پەرستگای دلف لەگەڵ ژناندا لەمەزنی خوای دلف كەم ناكاتەوەو گوناهی بەندەكان پەیوەندی بەخواكانەوە نییە.

دوای ئەوەی كەمێ شەوكشا ئەوكەسانەی بەدەنگی بەرز دەپاڕانەوە دەنگیان كزبوو، چونكە خەو بەسەریاندا زاڵبوو، بۆیە جارجارە یەكێك لەڕەهبانی پەرستگاكە هاواری دەكردوو دەیگوت بێچارەكان بەئاگاوەرنەوە، باخەو نەتانباتەوە، چونكە ئەگەربخەون پاداشتی خۆتان لەدەستدەدەن، ئەوكەسەی كەبۆنیازێك هاتبێ بۆئێرە نابێ لەكاتی شەونخونیدا بخەوێت، دوای ئەو بانگە، ئەو خەڵكانە بەدەنگی بەرز دەستیان دەكردەوە بەپاڕانەوە بۆئەوەی خەوەكەیان بڕەوێتەوە، زۆرجاریش كەدەكەوتنە بیرەخەوان پێی دەگوتن بەدەنگی بەرز بپاڕێنەوە تاخەوەكەتان بزرێت، بەڵام من خەو نەیدەبردمەوە، هەتا وێژینگیشم نەدەهاتێ، چونكە لەكۆشكی پاشایەتیدا بەكەم خەوی ڕاهاتبووم، من ناڵێم شەوانە لەكۆشكدا نەدەخەوتم، بەڵام كەپێویستیان بەخزمەتی من بایە، هەندێ شەو بەبێداری بمێنمەوە، ناڕەحەت نەدەبووم و دەمتوانی تابەیانی بەخەبەربم، هەندێ شەو كلیۆپاتراش منی بەبێداری دەهێشتەوەو فەرمانیدەدا نەخەوم- یان لەبەر ئەوەی خەریكی مەی خواردنەوە دەبوو، لەبەرئەوەبوو ئەم

شەوانەش نەدەخەوتم و وەنەوزم نەدەهاتنێ، کاتێ پرشنگی بەیانیدا، ئەو ڕووناکییەی لەپشتەوە لەخوای دلفی دەدا، ئەماو لەوکاتانەدا بەدادانەوەی پەردەکان خوای دلفیان لەبەرچاوی ئێمە ونکرد، ئێمە دەمانزانی ئیتر شەونخونی کۆتاییهات، پێویستە هۆڵەکە جێبێلین، من چوومەوە ژوورەکەی خۆم وخەوتم، چونکە دەمزانی بەڕۆژ ئیشم نییە، بەلام کەشەو داهاتەوە دووبارە دەبێ شەونخونی دەستپێبکەمەوە، لەوبەرەبەیانەدا کاتێ بەرەوژوورەکەی خۆم دەچووم، خۆم موژدەم بەخۆمدەدا کەخوای دلف نیازەکەی منی قبوڵکردووەو ئەوبەلایە لادەدات ودەستەکانی من بەخوێنی خاتوونەکەم کلیۆپاترا شەلاڵ نابێت، مەزنی خوای دلف کاریگەری خستبۆسەرم و ئەو ڕووناکییەی کەلەپشتییەوە لەئەویدەدا. ئەوی لەبەرچاوی من گەورەتر نیشاندەداو دڵنیابووم کەخوایەك ئەوەندە گەورەو نوورانی بێت، مەحاڵە خواستی یەك بێدەرەتان کەبەڕاستگۆیانەو دڵسۆزییانەوە پەنای بۆئەوهێناوە قبوڵ نەکات، شەوی یەکەم هیچ لەبیری خوای دلف غافڵنەبووم، بڕیارمدابوو لەشەوێکیتردا بەهەمان شێوە بکەم وبێپچڕان لەبیری خەونەکەی کلیۆپاترادابم، بۆئەوەی بتوانم بەردەوام خوای دلف بە بەرجەستەیی ببینم.

کاتێ لەخەو هەڵسام، خۆر گەیشتبۆ نیوەی ئاسمان، منیش لەژوورەکەی خۆم هاتمەدەرێ وسەیری پەرستگاکەم دەکرد، لەپەرستگاکەدا کاهینی زۆرهەبوون، بەلام کەمیان بەدیار دەکەوتن، بۆم ڕوونبۆوە بۆیە ئەوانە بەرچاوناکەون چونکە زۆربەیان ماڵیان لەدەرەوەی پەرستگاکەدابوو وشەوانە دەهاتنەوەناو پەرستگاکەو بەڕۆژ دەچوونە ماڵەکانیان.

پەرستگای دلف تەنها میوانی بەڕێزی ڕادەگرتن وجێگای دەکردنەوە، ڕێگای نەدەدا خەڵکانی ئاسایی لەوێدا بمێننەوە، بۆیەش ڕێگای منیاندا کەلەناو پەرستگاکەدا بمێنمەوە، چونکە دەیانزانی کارەکەری شاژنی میسرم.

من بۆدڵنیایی باری گوزەرانی ئەوخزمەتکارە ڕەشەی کەلەگەڵمدابوو، چوومەدەرێ و ئەوم بینی لەبەر سفرەیەکی پاندا دانیشتووەو خەریکی نانخواردنە، کاتێ منی بینی لەشامانیاندا هاواریکردو هەڵسایەسەر پێ وخۆراکی سەر سفرەکەی نیشانی من داو گوتی: سەیرکە چەند خواردنیان پێداوم، من یەکەمجارە لەوەتەی بووم بەخزمەتکار تێر خواردن بخۆم، دەزانم ئەگەر تۆ پێتنەگوتبان خواردنی باش وزۆریان نەدەدامێ.

بەخزمەتکارە ڕەشەکەم گوت: تائەوکاتەی ئێمە لەم پەرسگایەداین، هەموو کاتێ تۆ لەمخواردنە دەخۆیت، ئەگەر گەڕاشیتەوە من تۆ تێردەکەم تادەتگەیەنمەوە ئاغاکەت، دواتریش چونکە لەتۆ جیادەبمەوەو بەکەشتی دەگەڕێمەوە بۆ ئەسکەندەریە، ناتوانم قەولی ئەوەت پێبدەم کەئاغاکەت تێرت دەکات- یان نا؟

- خزمەتکارە ڕەشپێستەکە گوتی: دڵنیابە ئاغاکەم مـن تێرناکـات، ئەگەرتۆ دوای گەڕانەوەت بۆئەسکەندەری شتێکم بۆنەکەی بۆئەوەی لەو ئاغا بەخیلەم بکرنەوە، ئەوا من تادوایین ڕۆژی ژیانم بەبرسییەتی دەمێنمەوە، ئینجا گەڕامەوە پەرستگاو بۆمنیش خواردنیان هێنا، چونکە کاتی جەمبوو، بەلام دوای ئەوەی لەتەنیشت سفرەکە دانیشتم نەمتوانی خواردن بخۆم، لەکاتێکا تائەو ڕۆژەش ئیشتیای من باشبوو، پێموانەبوو کەخواردنم پێ ناخورێت وخۆم بەبێ ئیشتیاببینم، هیچ شوێنێکی من نەدەهێشا لەوەنەدەچوو نەخۆشبم هیچ هەستم بەلەشداهێزان نەدەکرد، بۆیە هەستمکرد کەحەزنەکردنم

بەخواردن شتێکی ئاسایی نییە، پارووێکم لەخواردنەکە هەڵگرت وخستمە دەممەوە، بەڵام هەرکەتامی خواردنەکەمکرد، دەستمکرد بەوڵنجدانەوە، پاش سەعاتێك خزمەتکاری پەرستگاکەهات تاسفرەکە هەڵگرێتەوە، سەیری کرد من خواردنەکەم نەخواردووە، خزمەتکارەکە بەمنی گوت شەرمیون بۆ نەتخواردووە، ئایا ئەم خواردنەت پێخۆش نییە؟

– گوتم من ئەمخواردنەم پێخۆشبوو تائەمڕۆ لەمخواردنەم خواردووە، بەڵام ئەمڕۆ حاڵەتێکی نائاسایی لەخۆمدا بەدی دەکەم، کاتێ کەپارووێك بۆدەمم دەبەم وڵنجم دێنێ.

– خزمەتکارەکە گوتی: ئایا حەزدەکەیت پزیشکی پەرستگا بۆلای تۆ بنێرم؟

– گوتم بۆپەرستگا پزیشکی هەیە؟

– خزمەتکارەکە گوتی: پەرستگای ئێمە پزیشکێکی هەیە لەمیسردا بێ نەزیرە، لەهەموو میسردا دکتۆرێکی هاوشانی ئەونییە، تۆش چونکە میوانی پەرستگایی وکارەکەری شاژنی میسری، پێی دەڵێم بێت بۆلات وچارەتبکات.

– گوتم: من نەخۆش نیم تائەوبێت چارەسەرم بکات.

– خزمەتکاری پەرستگاکە گوتی: نەخواردنی خۆراك خراپترین نەخۆشییە پێویستە چارەسەری بکرێت، بێگومان تۆ نەخۆشیت بۆیە ناتوانیت خۆراك بخۆی، بەڵام ئاگات لەنەخۆشی خۆت نییە.

– گوتم ئایا پێویستە بچم بۆلای پزیشك– یان ئەوەتا دکتۆر دێت بۆلای من؟

– خزمەتکارەکە گوتی: من ئەوئاگادار دەکەمەوە کەبۆلای تۆبێت، واش باشە هەرلێرەبێت تاچارەتبکات.

– حەزم نەدەکرد پزیشکی پەرستگاکە چارەسەرم بکات، چونکە خۆم بەنەخۆش نەدەزانی، بۆئەوەی دڵی خزمەتکارەکە نەیشێت لەوەی حەزی دەکرد خزمەتم بکات، ڕازیبووم پزیشکەکەبێت.

– ئەو ڕۆیی ولەگەڵ پزیشکێکی پیاوی کاهینی بەساڵاچوو ودەم بەخەندەدا هاتەوە، کاتێ پزیشکە هاتەژوورەوە سەیرێکی من وسەیرێکی سفرەکەی کردو بەپێکەنینەوە گوتی: ئەی ژنەکە لەڕێگایەکی دوورەوە بۆ زیارەتی خوای دلف هاتووی، چیتە کوێی گیانت ئازاردەکات؟

– گوتم: هیچ شوێنێکم نایەشێت.

– پزیشکەکە گوتی: ئایا تات هەیە؟

– گوتم: نە.

– پزیشکەکە گوتی: دەستتم بدەیێ تابزانم تات هەیە– یان نا؟

– منیش دەستی خۆم بۆلای ئەوکاهینە درێژکردو ئەویش گوتی تۆ تات نییەو هیچ شوێنێکت نایەشێت، ئەی بۆچی ئەوخواردنە خۆشانەی کەلەسەر ئەوسفرەیە دەیبینم، ناخۆیت؟

– گوتم کاتێ پاروێ دەخەمە دەممەوەو تامی خۆراکەکە دەکەم، توشی وڵنج هاتنەوەدەبم.

– پزیشکەکە پارچێك نانی کەهەنگوینی پێوەبوو، دایە دەستم وگوتی بخۆ؟

– منیش نانەکەم نایە دەممەوەو هەرکەجویم وتامی شیرینی نانەکەم کرد، بەشێوەیەك وڵنجم هاتێ پاروکە لەزارمەوە پەڕیەسەر سفرەکە، ئینجا پزیشکەکە پارچێك گۆشتی لەسەرسفرەکە هەڵگرت و دایەدەستم تابیخۆم، منیش گۆشتەکەم خستەزارمەوەو دووبارە هەرکەتامی ئەوم کرد، توشی وڵنج هاتنەوەبوومەوەو کوتە گۆشتەکەم لەدەمم دەرهێنا.

- پزیشکەکە گوتی: وەرە باسەیری چاوەکانت بکەم؟
منیش لەئەو نزیکبوومـەوە، ئـەو بـەوردی سـەیری چـاوەکانمی کـردو گـوتی، ئەی ژنکـە تۆنەخۆشنیت، بەڵکو سکپڕی وبێزهاتنەوەی تۆ لەخواردن بەهۆی ئەوەوەیـە، بـەڵام ئەمـە کاتییەو پاش چەند ڕۆژێکیتر ئاسایی دەبییەوە.
- من بەسەرسوڕماویەوە لەپزیشکەکەم پرسی: ئایە من سکپڕم؟
- پزیشکەکە گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەمڕۆ هەست بەوەناکەیت کەسکپڕی، دوای ئەوەی سکت گەورەبوو، هەست بەئاوسیت دەکەیت.
- بەپزیشکەکەم گوت: ناکرێ سکپڕبم.
- کاتێ پزیشکەکە بـەمنی گـوت سـکپڕی، خزمەتکارەکـەی پەرسـتگا لـەوێ نـەبوو، مـن وئـەو پزیشکە باسی سکپڕبوون دەکەین، باوەڕم نەدەکرد کەسکپڕبووم تائەوکاتەی دکتۆرەکە بەمنی گوت هـەموو ژنێک مانگانـە لەلەشـی ئـەودا سـوڕی مانگانـە دووبـارە دەبێتـەوە، هـەرکاتێ ئەمـە لەمانگێکدا دووبـارە نـەبۆوە ئەوانەوە دەگەیەنێت کەپکربووە، ئایا ئەم مانگە لەلەشی تۆدا ڕووی داوەتەوە- یان نا؟
- گوتم: نا، کەواتە تۆچۆن دەڵێیت سکپڕنیم؟ من پێموایە خـوای دلف خواسـتکەی تـۆی بـەدی هێنـاوەو هەرکاتێک لێرە گەڕایتـەوە دەتـوانی مـوژدە بـدەی بەمێردەکـەت وپـێی بڵـێی سـکپڕبووم، مـن دڵنیـام ئـەم نۆبەرەت کوڕدەبێت، چـونکە ئەگـەر کـوڕ نەبایـە ئـەواتۆ دەتزانـی کەسـکتپڕەو پێویـستی بەچـوونەلای پزیشك نەدەکرد.
- گوتم من دوای گەڕانەوەم لێرە، ناتوانم بەمێردەکەم موژدەبدەم، چونکە مێردم نییە.
- پزیشکەکە گوتی: کەواتە تۆ بێ ئەوەی مێردت هەبێ سکپڕبووی؟
- گوتم: بەڵێ.
- پزیشکەکە گوتی: کەواتە تۆ لەوەدەترسی خەڵك بزانێت منداڵەکەی تۆ بێ باوکەو ڕقیان لەتۆ بێتەوە؟
- گوتم: من لەخەڵك ناترسم، تەنها لەکەسێ دەترسم.
- پزیشکەکە گوتی: کاتێ خزمەتکاری پەرستگاهات بۆلای من وگوتی تۆکارەکەری شـاژنی میـسری وبـۆ نیازێـك هـاتووی بـۆ ئـەم پەرسـتگایە، مـن ئەمـەم لەبیرچـۆوە، کەواتـە ئەوکەسـەی کـەتۆ لێـی دەترسـێی شاژنی میسرە.
- گوتم بەڵێ: بەڵام ئەم ترسەم لـەڕووی خەجاڵەتییەوەیە ترسـی شـەرمکردنمە، چونکە پەیوەندییـەکانی من و شاژنی میسر بەشێوەیەکە، ئەگەر بزانێت بـێ شـوکردن سـکپڕبووم سـزام نـادات، بـەڵام چـاوەڕوانی ئەوە لەمن ناکات ئەمە بەسەرمبێت، بۆیە من دەترسم شاژنی میسر ئـەم ڕاستییە بزانێت، مـن بـۆلابردنی بەڵایـەم بـۆئێرە هـاتبووم، دەمویـست لەبـەرخوای دلف بپاڕێمەوە ئەوبەڵایـەی کەبەسـەرمدێت لێملابدات، بەڵام دوای گەیشتنم بۆئێرە بەڵایەکی ترم بەسەرهات، ئێستاش مـن نـاتوانم بۆئەسکەندەریە بگەڕێمـەوە، چونکە ئەگـەر بگەڕێمـەوە ناچـارم لەکۆشـکی پاشـایەتیدابم وسکپڕیەکەشـم لێـرەودوا ئەوەنیـشاندەدات کەئاوسم وئەمەش بەمن ناکرێت وناتوانم.
- پزیشکەکە گوتی: ئایا ئەومنداڵەی کەلەسکی تۆدا، باوکی ئامادەیە بەکوڕەی خۆی بزانێت؟

– گوتم باوکی ئەومنداڵە لەئەسکەندەریە بوو، بەڵام بەمنی گوت لەوانەیە لەوێ بڕوات، من نازانم ئایا تائێستاش لەئەسکەندەریەدایە– یان نا؟ بەڵام ئەوئاگای لەسکپڕبوونی من نییە.

– پزیشکەکە گوتی: تۆ دەتوانیت بچیتەوە ئەسکەندەریەو باوکی ئەومنداڵە بدۆزیتەوەو پێی بڵێیت، سکم پڕەو هەرکە ئەویش ئامادەبوو ئەوبەمنداڵی خۆی بزانێت، کێشە دروستنابێت وتۆ دەبیتەخاوەن مێردو منداڵەکەت شەرعی دەبێت.

– گوتم گریمان باوکی ئەم منداڵە لەئەسکەندەریەدابوو، بەڵام ئامادەبوو خۆی بەباوکی ئەومنداڵە بزانێت، کەلەسکمدایە، دووبارە من سەنگەساردەبم، چون ئامەوێ وناتوانم بەشاژنی میسر بڵێم مێردم هەیە، چونکە من کارەکەری ئەوم وبەبێ ڕەزامەندی کلیۆپاترا ناتوانم شووبکەم.

– پزیشکەکە گوتی: ڕاستە، کارەکەرێك بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی ناتوانێت شووبکات، بەڵام چونکە تۆ لەشاژنی میسر نزیکی لەوانەیە لێتببورێ.

– گوتم من کارەکەری کەسێکی ئاسایی– یان کارەکەری شاژنی میسر نەبام ولەئەو نزیك نەبووبام، دەمتوانی واز لەو بهێنم وبڕۆم ولەگۆشەو کەنارێکدا منداڵەکەی خۆم ببێت ودوای لەدایکبوونی بڕیارم دەدا، ئایا ئەوگەورە بکەم – یان بیپێچمەوەو بەئاوی نیلی دادەم وچارەنووسی ئەوخواکان دیاری بکەن– یان تیمساحەکانی ڕووباری نیل قوتی دەدەن– یان خێرخوایەك پەیدابێت ومنداڵەکەی من لەڕووباری نیلدا بگرێتەوەو بۆماڵی خۆی بباتەوەو گەورەی بکات، بەڵام چون کارەکەری نزیکی کلیۆپاترام شەرمی لێدەکەم ونامەوێت ئەو وابزانێت بەبێ ڕەزامەندی ئەوە شومکردووە، ئینجا ڕوومکردە پزیشکەکەو گوتم، ئایا ناتوانیت من لەم مەترسییە ڕزگاربکەیت؟

– ئەو پزیشکە ڕاهیبە گوتی: من چیم لەدەستدێت، چیت لەمن دەوێت؟ لەبەر خۆتی دەچوێنیت، ناتوانم لەوانەیە بمریت، بۆیە داواکارییەکەی تۆقبوڵناکەم ومنداڵەکەت لەبەر ناچوێنم، چونکە لەوانەیە دوای لەباربردنی منداڵەکە تۆ بمری، ئەوکاتە من ناتوانم بەرگەی توڕەیی شاژنی میسربگرم.

– گوتم شاژنی میسر لەکوێ دەزانێت کە من بۆ لەناو بردنی منداڵ هاتووم بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی لەبەرم بچوێنی.

– کاهینەکە گوتی: ئەمە مەسەلەیەك نییە بتوانرێت بشاردرێتەوە، چونکە دوای ئەوەی خزمەتکاری پەرستگا هاتەلای من وگوتی کارەکەری شاژنی میسر نەخۆشەو پێویستە تۆبچیت بۆلای ئەو وچارەسەری بکەیت، ئەوکاتە لەژوورەکەمدا چەند کەسێك دانیشتبوون وهەموویان گوێیان لەوقسەیەبووەو دەزانن من هاتووم بۆلای تۆ بۆچارەسەرکردنت، هەروەها لەباربردنی منداڵ بەردەوام خوێنڕێژی ژنانەی دەبێت، ئەو ژنەی منداڵی لەبەرخۆی دەچوێنێت، ئاکامی خراپە.

– گوتم تۆ پیاوێکی پزیشکی، پزیشکەکان لەمیسردا دەتوانن زۆرکار ئەنجامدەن، لەمانەش دەتوانن منداڵ لەبار ببەن، ئێوە پزیشکەکان بەشێوەیەك لەکارەکەی خۆتاندا وردن، دەتوانن وەك خواکان ئەندامە گەندەڵەکانی لەشی مرۆڤ دەربهێنن، دەتوانن کاسەی سەر بکەنەوە، بۆئەوەی هەڵمی زیانبەخش کەلەمێشکدا کۆدەبێتەوە، بەدەری بنێن وئینجا کاسەی سەرەکە دابنێنەوە، ئێوەدەتوانن کاری ئاواگەورە ئەنجامبدەن، بەئاسانی دەتوانی منداڵەکەم لەبار ببەیت تامن بتوانم بەبێ دڵەڕاوکێ بگەڕێمەوە ئەسکەندەرییە.

– پزیشکەکە گوتی: لەباربردنی منداڵ شتێکی مەترسیدارە زۆرجار دایکەکە لەبەرسەختی ئازار مردووە، لەوانەیە من ئامادەبم بێ بەرامبەر بۆلای نەخۆشێك بچم بۆچارەسەرکردنی، بەهەمان شێوەی کەزانیم تۆکارەکەری کلیۆپاترای بێبەرامبەر چارەسەرت دەکەم، بەڵام بەخۆڕایی منداڵێك لەبەرنابەم. سەرەتا کرێی پزیشکی خۆم وەردەگرم، ئینجا دەستدەکەم بەکاری لەباربردنەکە، دواتر من گرێنتی ئەوەنادەم ئەوبەهۆی خوێنڕێژی و تاوە بمرێت، ئەگەرتۆ بمری، هەموو دەزانن بەهۆی لەباربردنی منداڵەکەوە مردووی، چونکە ئاگادارن بۆلای تۆ هاتووم تێدەگەن من منداڵەکەم لەبەرچواندووی. بەهەرحاڵ من ئەوکارە ناکەم وخۆم گیرۆدەی تورەیی شاژنی میسر ناکەم وئامۆژگاری تۆش دەکەم ئەوکارە نەکەیت، گرتنەبەری ڕێگای ئاقڵانە ئەوەیە کاتێ لەم پەستگایە گەڕایتەوە، ئەو پیاوەی باوکی منداڵەکەیە بدۆزیەوەو بەئەو بڵێیت دەبێ خۆی بەباوکی منداڵەکەت بزانێ، بەڵام پێی نەڵێیت بووی بەباوك، دواتر بچۆ بۆلای شاژن و ڕەزامەندی ئەو وەربگرەو بەئاشکرا شووبەو پیاوە بکە، ئیتر ترست لەسەر نامێنێت ودەتوانی بێترس منداڵەکەت ببێت، چونکە خەڵك لەبیریان نامێنێت تۆلە چ مێژوویێکدا شووتکرد تابەوردی کاتی سکپڕبوونەکەت لێکبدەنەوە، هەتا کەسانێك هەبن بەمەش بزانن کاریگەری بۆسەر تۆنابێت و بەدناوت ناکات، چونکە خەڵك دەیبینن و دەزانن کەتۆ مێردت هەیە.

– هەستمکرد ئەو ڕاستدەکات، گرتنەبەری ڕێگای عەقڵانی ئەوەیە بگەڕێمەوە ئەسکەندەریەو ڕەزامەندی شاژنی میسر وەربگرم بەشووکردنم.

درێژەدان لەمانەوەم لەوپەرستگایەدا بێکەڵکبوو، چونکە ئەوکەسەی شەونخونی لەبەرامبەر خوای دلفدا دەکات، بۆ ئەوەی نیازەکەی قەبوڵبێت، چاو وبیریان لەسەر دلف لانابەن، بەڵام من نەمدەتوانی ساتێك بیری خۆم لەسکپڕییەکەم لابەم ولەبیری خوای دلفدابم، لەبەرئەوە بڕیارمدا ڕۆژی دواتر بگەڕێمەوە ئەسکەندەریە، ئەوشەوە نەچووم بۆخزمەت خوای دلف، چونکە چوون بۆئەوێ نیازێکی لەپشتەوەنەبوو... ڕۆژی دواتر بۆماڵئاوایی چوومەلای لێپرسراوی ئەو بەشەی کەمنی تێدابووم وبەئەوم گوت بۆماڵئاوایی هاتووم ودەمەوێت بگەڕێمەوە.

– ئەو گوتی نیازەکەت هاتەدی وئیتر پێویستت بەخوای دلف نییە؟ چاکەکار تۆهیچت بۆناکرێت، بەڵام یەك تکام لەتۆ هەیە،

– گوتم نیازەکەی من نەهاتەدی، بەڵکو بەدبەختییەکی گەورەیترم بۆزیادبوو. لێپرسراوی ئەوبەشەی پەرستگا گوتی: ئەگەر وایە بۆ دەتەوێت بڕۆی، بۆداوا لەخوای ئەم پەرستگایە ناکەیت ئەو دوو بەدبەختیەی تۆ لابەرێت؟

– گوتم ئەوکەسەی لەم پەرستگایەدا شەونخونی دەکات، پێویستە جگەلەخوای دلف بیر لەهیچیتر نەکاتەوە، ئەو بەدبەختییەی دووەم کەتوشی من بووە، ڕێگرە لەبەردەم ئەمەدان بۆیە لێرەدەڕۆم.

– لێپرسراوی ئەوبەشەی پەرستگای دلف گوتی: ئایا لەلایەن منەوە بۆلابردنی بەدبەختییەکانت هیچ دەکرێت؟

– گوتم: نا، تەنها داواکارییەکم هەیە.

– ئەوپیاوە لێیپرسیم: ئەو داواکاریەت چییە؟

– گوتم: دوای ڕۆیشتنی من لەم پەرستگایە ئەگەر كەس لەتۆی پرسی چەند شەو لێرەماوەتەوە، بڵێ پێنج شەو، مەبەستم ئەوەیە بەخاتوونەكەی من نەگاتەوە كەمن پێنج شەو لێرەنەبووم.

– ئەوپیاوە گوتی دڵنیابە هەركەسێك لەمن بپرسێت ئەوچەند شەو لەپەرستگادابووە، دەڵێم پێنج شەو لێرەبووە، دوای ماڵئاوایی كردنم لێپرسراوی ئەوبەشەی پەرستگاكە، لەپەرستگاكە چوومەدەرێ تابەخزمەتكارەكە بڵێم خۆی ئامادەبكات بۆ ڕۆیشتن، كاتێ خزمەتكارەكە زانی دەبێ ئەمرۆ بەڕێ بكەوین، لەمەراقاندا كەوتەگریان وگوتی: من پێموابوو چەند ڕۆژێك لێرەدا دەمێنینەوەو هەموو ڕۆژو شەوێك تێرخواردن دەخۆم، بەڵام ئێستا زۆر بەداخەوە گوێبیستی ئەوەبووم كەدەبێ بگەڕێمەوە،

– گوتم: مەترسە هەركە گەیشتمەوە ئەسكەندەریە، لەیەكەم بۆ ڕەخساندا سەبارەت بەتۆ لەگەڵ گەورەكاندا قسە دەكەم، تاتۆ لەئاغاكەت بكڕنەوەو بتهێنن بۆ ئەسكەندەریە– یان لەشوێنێكیتردابیت وبەردەوام تێرت بكەن.

– ئەم گوتەیەی من بووەهۆی ئەوەی خزمەتكارەكە فرمێسكەكانی وشك بكاتەوەو واز لەگریان بهێنێت، ئینجا دوو ولاخەكەی ئامادەكردن وئێمە سواربووین وڕۆیشتین، ئێمە ماوی نیو ڕۆژ ڕۆیشتین، هەستم بەماندووبوون و برسیەتی نەدەكرد، چونكە بیری من ئەوەندە ئاڵۆزو جەنجاڵبوو بواری هەستكردن بەماندووبوون وبرسیەتی نەهێشتبۆوە.

لەوكاتانەدا خزمەتكارەكە گوتی: ئەی كارەكەری شاژنی میسر، ئایا دەزانی ڕۆژ چەندی بەسەرچووەو ولاخەكان ماندوو وبرسین وناتوانن لەمەزیاتربڕۆن، جگەلەمە یەكێكی تریش هەیە ئەویش ناتوانێ لەمەزیاتر ڕێبكات.

من داوام لەخوای دلف كرد لەبری پێنج شەو پەنجا شەو تۆلێرەدا بێڵێتەوە، هەتا بتوانم ڕۆژانەو شەوانە تێر خواردن بخۆم وقەڵەوبیم و ورگم زلبێت، بۆئەوەی لەلەشی خۆمدا زنجیرە عەمباربكەم بۆ ڕۆژگاری برسییەتی، بەڵام ئێستا وابزانم ئەو ئومێدەی من بێ بناغەبوو، دەبێ لەم پەرستگایە پڕلە نیعمەتە كەخەڵك لێرەدا تێرخواردن دەخۆن بڕۆم، ئەمرۆم بەناخۆشترین ڕۆژانی ژیانم زانی.

– گوتم: ئەی خزمەتكاری ڕەشپێست، مەگری چونكە دوای ئەوەی ئێمە لەم پەرستگایە بەڕێكەوتین، هەموو شەوان و ڕۆژان تائەوكاتەی تۆ لەگەڵ مندابیت، ئەوەندە خۆراك دەرخواردی تۆدەدەم كەبۆخۆشت باوەڕبكەی كەتێربووی، دوای ئەوەی لەتۆش جیابوومەوە كەس بەزەیی بەخزمەتكارەكاندا نایاتەوە!

– دوای ئەوەی گوێم لەسكاڵاكەی ئەوبوو، فەرمانی وەستانمداو ئێمە لەئاواییەكی بچوكدا كەكەوتبۆسەر ڕێگاكەمان لاماندا، لەوئاواییەدا نان وهێلكەو هەنگوین هەبوو، بۆ خزمەتكارەكە پێنج نردوو نان وبیست دانە هێلكەو نیوكیلۆ هەنگیونم كڕی، ئەویش هێلكەكانی كولاندو بەدوو نردوونان وهەندێك هەنگوینەوە خواردی، سێ نردوو نان ونیوەی هەنگوینەكە مابۆوە.

– پێمگوت: بۆ ئەونان وهەنگوینەش ناخۆیت؟

– خزمەتكارە ڕەشپێستەكە لەوەڵامدا گوتی: ئەم شەو ئەونان وهەنگوینە لەگەڵ ئەوشتانەی تری كەتۆ بۆم دەكڕی دەخۆم.

– من خۆراکم نەخوارد، چونکە حەزم لێنەبوو، لەوئاوەدانیەشدا جگەلە نان وهێلکەو هەنگوین، هیچیتر دەستنەدەکەوت، کەشەوداهات نان وهەنگوینیترم بۆخزمەتکارەکە کڕی وئەویش بەئیشتیاوە خواردی.
ڕۆژی دواتر گەیشتینە ناوچەیەکیتر کەئاوەدانیتربوو، چونکە ئەوئاوەی کەبەجۆگا لەنیلەوە کێشرابوون، پڕئاو بوون، لەوشوێنەدا بۆخزمەتکارەکە خۆراکی هەمەجۆرم کڕی، دەمویست ئەوەندە خواردنی بۆبکڕم نەتوانێت بیخوات، لەکاتی نانخواردندا ئەو بەچاوی چاولەدەستییەوە سەیرم نەکات، من ئیرەیم بەبەختی باشی ئەودەبرد، چونکە دەمزانی لەژیانی ئەوخزمەتکارەدا، هیچ ئارەزوێك نییە جگەلەخواردن، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەوەندەش خواردن بخوات تێربێت، خۆی بەخۆشبەختترین پیاوی دنیا دەانێت، خۆر لەبەرەبەری ئاوابووندابوو گەیشتینە ناوچەیەك زۆر سەوزایی بوو ودەنگی خوێندنی کەناریم دەهاتەبەرگوێ، زانیم کاتی هەڵچوونی ڕووباری نیل نزیکبۆتەوە، چونکە کەنارییەکان کاتێك دێن کەڕووباری نیل هەڵدەچێت ومۆژدەی هەڵچوونەکەی بەئێمە دەدەن، ئەوشەوە لەماڵی لادێییەکی ئەوێدا ماینەوەو دوایین خواردنی زۆرو زەوەندم دەرخواردی خزمەتکارەکەدا، من وئەو دەمانزانی ڕۆژی دواتر دەووبارە لەیەکتری جیابینەوە، ئەو دەگەڕێتەوەلای ئاغاکەیی ومنیش بەکەشتی ڕێگای ئەسکەندەریە دەگرمەبەر.
بەیانی ڕۆژی دواتر کاتێ لەخەوهەڵساین، ڕووباری نیل بەشێوەیەك هەڵچووبوو وپانتایی زەوییەکانی داگیرکردبوو ئاو تانزیکی ماڵەکەهاتبوو، ئەوخزمەتکارە کەبەردەوام لەنزیك ڕووباری نیلەوە دەژیاو ئەزموونی سەبارەت بەسێڵاوی نیل هەبوو، زۆر دڵی خۆش بوو وگوتی: ئێمە ناتوانین خۆمان بگەیەنینە ماڵی ئاغام، پێویستە سەبربگرین تاسێڵاوی نیل دەنیشێتەوە، ئینجا بچین بۆماڵی ئاغاکەم، بەڵام من نەمدەتوانی ئەوەندە چاوەڕوانبم هەتائاوی نیل دەسرێتەوە، چونکە سێڵاوی نیل کاتی زۆری دەوێت تائاوەکە دەسرێتەوە، خزمەتکارەکە بەمە دڵخۆشبوو ودەیزانی دەبێ ماوەیەکی تریش هەر لەگەڵ مندابێت و شەو وڕۆژ خواردنی زۆربخوات، بەڵام من نەمدەتوانی گەڕانەوەی خۆم بۆ ئەسکەندەریە دوابخەم، بەخزمەتکارەکەم گوت: دەبێ بەلەمێك بەکرێ بگری وولاخەکانیش هەربەو بەلەمە دەپەڕێنینەوەو خۆمان دەگەیەنینە ماڵی فەرمانڕەواکە، خزمەتکارەکە دەیزانی لەکاتی هەڵچوونی نیلدا دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بەبەلەم هاموشۆ دەکەن، بەڵام ئەو ئەم مەسەلەیەی بەمن نەگوت، بۆئەوەی ناچارمبکات لەوماڵە دێهاتییەدا بمێنمەوە، پێیوابوو ئەو مەسەلەیە نازانم، بەڵام کاتێ زانی من شارەزاییم لەباری ژیانی دانیشتوانی ئێرە هەیە، ناچار بوو بڕوات وبەلەمێك بەکرێ بگرێت تاپێی بپەڕینەوە.
خزمەتکارەکە دوای ئەوەی بەلەمێکی کرێی هێنا، چوار پێکانی هێنانەناو بەلەمەکەوەو دواتر ئێمەش سواربووین، خاوەنی بەلەمەکە دوو داری درێژی پێبوون ودەستیکرد بەبەکارهێنانیان وئێمە بەڕێ کەوتین، شێوازی ڕۆیاندنی بەلەمەکە وابوو کەسەری دارەکان لەتەختایی زەوی ژێرئاوەکە هەڵچەقێنێت وفشار لەدارەکەبکات وبەلەمەکە بەرەوپێش بچێت، ئێمە کاتێ گەیشتینە ناوەڕاستی ئاوەکە، ئیتر پێویستی نەکرد بەدارەکان بەلەمەکە بڕۆێنێت، بەڵکو خوڕی ئاراستەی ئاوەکە ئێمەی بەرەو سەروو دەبردەوە، کاتێ گەیشتینە ماڵی فەرمانڕەواکە بینیمان بەئاو گەمارۆی دراوە، ماڵی فەرمانڕەواکە وەك

هەموو خانوەکانیتری لێوار نیل لەسەرپایە دروستیانکردبوو، بۆئەوەی لەکاتی سێڵاودا ئاوی نیل وێرانی نەکات.

- حومڕانی ئەو ناوچەیە بەمنی گوت: سەبریکە تائاوی نیل دەنیشێتەوەو دوایی بڕۆوە بۆ ئەسکەندەریە.

- گوتم پێویستە من هەرچی زووترە خۆم بگەیەنمەوە ئەسکەندەریە، چونکە بەکەشتیش دەڕۆم هەڵچونی ئاوی نیل توشی کێشەم ناکاتەوە.

- کاتێ سواری کەشتی بووم، خزمەتکارە ڕەشەکە لێمی دەڕوانی ودەیگوت دەترسم منت لەبیربچێتەوە، منیش پێمگوت مەترسە بیرت ناکەم ودوای گەڕانەوەم بۆئەسکەندەریە سەبارەت بەتۆ لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا دەدوێم تاتۆ بکڕن، ئینجا کەوتینەڕێ وبەبێ هیچ گرفتێك کەشتییەکە بەئاراستەی ئاوی نیل دەڕۆیی ومنی بەرەو سەروو دەبردەوە، ئەگەر دارخورماو باغ ومالّی دروستکراو لەسەر تیرەگەکانم نەبینیبا، ئەوا وامدەزانی بەدەریادا دەڕۆم، چونکە سەیری هەرلایەکم دەکرد هەرئاو دیاربوو، بەلام بوونی خوێندنی کەناری ودارخورماو باغ وئەو خانوانەو کەشتییەکانیتر کەلەسەر نیلدا هاموشۆیان دەکرد، ئەوەیان نیشاندەدا من لەڕووبارێکدام.

## گەڕانەوەم لەئەسکەندەریەو مانەوەم لەمردووخانەدا

کەشتییەکەی ئێمە دوای دوو ڕۆژونیو گەیشتە ئەسکەندەریە، چونکە ئەوکەسانەی کەبەئاراستەی ڕۆیشتنی ئاوەکە سەفەرەدەکەن، زووتر لەوانەی دژە ئاراستەی ئاوەکە دەڕۆن، دەگەنەجێ، دوای ئەوەی لەکەشتییەکە دابەزیم، پێش ئەوەی بچم بۆکۆشکی پاشایەتی وگەڕانەوەم بەکلیۆپاترا بلێم چووم بۆمیوانخانەی سوور، بۆ ئەوەی بزانم ئایا ئەوگەنجەی وەستای مۆزایکبوو لەوێیە- یان نە؟ کاتێ گەیشتمە میوانخانەکە دیتم یەکێك لەپاسەوانەکانی شەو لەگەڵ خاوەن ئوتێلەکەدا خەریکی قسەکردنە، من دەستبەجێ ئەوپیاوەم ناسییەوەو زانیم هەمان ئەوپیاوەیە کەئەو شەوەی لەمیوانخانەی سوور دەگەڕامەوە، منی لەشەقامەکاندا گرت وبردمی بۆلای لێپرسراوەکەی، پاسەوانەکەش منی ناسییەوە، زەردەیەکی هاتێ ومنیش زەردەیەکم بۆردەوە، دوای ئەوەی پاسەوانەکە ڕۆیی، لەخاوەنی میوانخانەکەم پرسی وگوتم: ئایا بەبیرت دێت کەمن لێرە ژوورێکم بۆکوڕێك گرت و پارەکەشم بۆدەدا؟ ئەویش گوتی بەلێ بەبیرم ماوە.

- گوتم من هاتووم ئەوکوڕە ببینم، چونکە کاری زەرورم پێیەتی.

- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: بەداخەوە ئەوگەنجە لێرەنییە بۆئەوەی تۆبیبینێ، ڕۆیشتووە.

- گوتم: ئایا بەتۆی نەگوت بۆکوێ دەچێت؟

- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: چۆن... ئەوبەمنی گوت خەڵکی سوریام وماوەیەکە لەنیشتمانەکەم دوور کەوتومەتەوەو دەچمەوە بۆئەوەی تابەکەسوکاری خۆم شادببمەوە.

- گوتم ئایا پێشئەوەی بڕوات، هیچ وەڵامێکی بۆمن جێنەهێشت؟
- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: نەخێر.
- گوتی ئایا لەرێگای تۆوە خواحافیزی لەمن نەکرد؟
- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: نەخێر.
- گوتم حەزدەکەم چەند ڕۆژێك لێرەدا بمێنمەوە، ئایا دەکرێت ژوورێك بەمن بدەیت؟
- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: ئایا حەزدەکەیت ئەو ژوورە بەتۆ بدەم کەتیەی تێدابوو؟
- دەمویست بڵێم بەڵێ: بەڵام یەکسەر ئەوەم بەبیرهاتەوە کەلەو ژوورەدابم بەردەوام تاریمایی تیەم لەبەرچاو دەبێت، گوتم نەخێر من ئەوژوورەم ناوێت وژوورێکی ترم بۆدانێ.
- خاوەنی میوانخانەکە ژوورێکیتری نیشانی من داو گوتی بەدڵتە؟
- گوتم: بەڵێ ئەم ژوورە باشە.

من چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد خاوەنی میوانخانەکە دوای ئەوەی ژوورەکەی نیشانی مندا بڕوات، بەڵام ئەو راوەسابوو سەیرم کرد بزەی دەهاتنێ وگوتی: ئەی خاتوون چونکە تۆ مەعمیلی منی وژوورت لەمن بەکرێ گرتووە وپێش بەکرێ گرتنی ژووریش ماوەیەك بۆئێرە دەهاتی حەزدەکەم خزمەتێکت بکەم.

- گوتم ئەوخزمەتەی کەتۆ دەتەوێت بەمنی بکەیت چییە؟
- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: من دەزانم هەرکاتێك تۆ بۆئەم میوانخانەیە دەهاتی، بۆ ئەوەبوو لەگەڵ پیاوە جوانەکاندا بەیەك بگەی، بەڵام ئێستا هاودەمێکت نییە ئەگەر ویستت هاودەمێکت لەگەڵدابێت، من دەتوانم پیاوێکی گەنج بەتۆ ئاشنابکەم تا لەتەنهاییدا بێتاقەت نەبیت.
- گوتم لەوخزمەتەی کەدەتەوێت بۆمن بیکەیت سوپاست دەکەم، من پێوستم بەهاوەڵ وهاودەم نییەو بۆیەش بۆئێرە هاتووم تاپشووبدەم.
- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: من گوێرایەڵی ئارەزووی تۆم وچۆنت حەزلێیە وابکە، ئەگەر لەڕۆژانی داهاتوودا بێتاقەتبووی بەمن بڵێ تاهاودەمێکت بۆپەیدابکەم.

دوای ئەوەی خاوەنی میوانخانەکە ڕۆیشت، ئیتر بەردەوام تاریمایی وبالای تیەم دەهاتەبەرچاو، خۆم بەخۆم گوت، ئایا ئەوکوڕە گەنجە کەلەئەسکەندەریەدا ڕۆیشت وهیچ وەڵامێکی بۆ جێنەهێشتم گوناهبارە- یان نا؟

دوای ماوەیەك ئەوەم لاڕوونبۆوە کەتیە گوناهای نییە، لەبەرئەوەی ئەوگەنجە بەمنی گوتبوو مانەوەی وی لەئەسکەندەریەدا لەوانەیە لە دە ڕۆژ زیاترنەبێت، دوای ئەوماوەیە بۆدیداری کەس وکارەکەی دەچێتەوە بۆسوریاو لەوانەیە ئیتر بۆئێرە نەگەڕێتەوە، تیە درۆی لەگەڵمدا نەکرد، تامن گلەیم لەئەو هەبێت، نەئەو دەیزانی کەمن سکم پڕدەبێت ونەخۆشم وێنای ئەوەم دەکرد، من نەمدەتوانی تیە سەرزەنشت بکەم، نەشم دەتوانی ئەوە لەبیربکەم کەئەو باوکی ئەو منداڵەیە کەلەسکمدایە، ئەگەر ئەوکوڕە گەنجە لەئەسکەندەریەدا با، من ئەوم بەمێردی خۆم دەناساند، هەرچەندە کلیۆپاترا تووڕەدەبوو ودەیگوت، بۆ چ بێڕەزامەندی من، شووتکردووە، بەڵام چون ژنێکبوو واقیعی لەبەرچاودەگرت، بڕیاری ئەشکەنجەدانی منی نەدەدا، ئەو لەوەدەگەیشت ژنێك تەنانەت کەکارەکەریشبێت، پێویستە شووبکات، بۆیە ئەگەر ژنێك پیاوێ هەڵبژێرێت بەمێری خۆی، ئەوا گوناهکار نییە.

کلیۆپاترا تەنها رەخنەی لەیەك شت دەگرت، ئەویش ئەوەبوو، بۆبەبێ ئاگاداری ئەو بوومەتە ژنی پیاوێك، لەوکاتەشدا منی سزا نەدەدا، بەڵام چون من مێردم نەبوو، نەمدەتوانی منداڵەکەی سکم بەشەرعی بزانم وئاشکرای بکەم، ئەگەر گوتباشم مێردم هەیە، کلیۆپاترا دەیگوت مێردەکەت کێیەو بۆمن ئەوم نەدیتووە، من ئەگەر کارەکەر نەبام وژنێك بام لەچینی ئەرستۆکرات، دەمتوانی عاشیقەیەکی وەك کاڵ لەماڵەکەی خۆمدا بهێڵمەوەو دواتر بڵێم منداڵەکەی من لەپشتی مێردەکەمە، بەڵام چونکە بەکارەکەر هەژماردەکرام، نەمدەتوانی منداڵی نامەشروعم هەبێت، گەورەکان رێگایان پێدراوە حەزیان لەهەر کەسێکبێت، راکێشی بکەن ومنداڵی نامەشروعیان لێببێت، بەڵام ئەم رێگادانە بەکۆیلەکان نەدراوە، لەوکاتەی کەلەژوورەکەمدا دانیشتبووم وسەیری گڕی چراکەم دەکردو بیرم لەوەدەکردەوە چۆن چۆنی بەکلیۆپاترا بڵێم من سکپڕم، گوێم لەدەنگی پێ بوو کەبەقاڵدرمەکاندا سەردەکەوت وزانیم ئەوکەسە بەرەو ژووری من دێت، دەنگی پێکان لەدەنگی پێی خاوەنی میوانخانەکە نەدەچوو، زانیم پیاوێکیتر بەپلیکانەکاندادێت، لەپشتەوە چەند قاتێکیتر هەبوون، لەبەرخۆمەوە گوتم، دەبێ ئەوە یەکێکبێت لەمیوانەکان وبیەوێت بچێتە ژوورەکەی خۆی، ئەمما دەنگی پێکان گەیشتە بەردەم ژوورەکەی من وپیاوێك گوتی، ئەی شرمیون ئایا دەتوانم بێمە ژوورەوە؟ ئەودەنگە بەلامەوە ئاشنابوو، بەڵام نەمدەتوانی بەبیرم بێتەوە کێیە؟ گوتم بەڵێ دەتوانیت بێیتە ژوورەوە پاش ساتێك لێپرسراوی پاسەوانەکان هاتەژوورەوە، من لەهاتنەژوورەوەی لێپرسراوی پاسەوانەکان زۆر سەرم نەسوڕما، چونکە بۆخۆی پێی راگەیاندبووم کەلێکۆڵینەوە لەناسنامەی ئەوکەسانە دەکرێت کەلەمیوانخانەکاندا دەمێننەوەو خاوەنی میوانخانەکان ئەو زانیاریانە دەدەن بەئەوانە، بۆیە بەلامەوە سەیرنەبوو، دوای ئەوەی لێپرسراوی پاسەوانەکان دانیشت، گوتی: شرمیون چیبووە کەواتە تۆلێرە نیشتەجێ بووی؟ من پێموابوو بۆسەردانی عاشیقەکەت بۆئێرە دێیت؟ بەڵام ئێستا عاشقی تۆ لێرەنییە، تۆکارەکەری شاژنی میسری، بۆ لێرەدای؟

– گوتم ئەمە هۆکاری هەیە کەپەیوەندی بەخۆمەوەیەو تۆ بۆت نییە لەمن بپرسی بۆچی لەم میوانخانەیەدام، ئەگەر لەدوای نیوەشەوەوە منت لەشەقامدا بینی دەستگیرم بکە، سەیری منیش وەك بۆخۆت دەتگوت، بتاشەو ئێمە بنێرە بۆپەرستگای ئەوانەی تەرکی دنیایانکردووە، بەڵام ئێستا ناتوانیت لێکۆڵینەوە لەگەڵمندا بکەی، بەوەی بۆ لەم میوانخانەیەدا نیشتەجێبووم.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان پێکەنی وگوتی: ناتوانم لێکۆڵینەوە لەگەڵ تۆدا بکەم، بەوەی بۆ لەم میوانخانەیەدا نیشتەجێبووی، بەڵام دەتوانم بەشاژن بڵێم کارەکەرەکەی لەیەکێك لەمیوانخانەکاندا نیشتەجێبووە، بۆچی شاژنی میسر تۆی ئازادکردووە، تابتوانی ئاوا بەئازادی هەر شوێنێکت بەوێ بچیت؟ ئایا شاژنی میسر تۆی ئازاد کردووە؟

– گوتم: نا، ئێستاش کارەکەری ئەوم!

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئایا حەزدەکەیت من بەشاژن بڵێم تۆ لەوئوتێلەدا جێنشێبووی– یان نا؟

– گوتم ئەگەر ئەمە بەئەو نەڵێیت باشترە. چونکە خاتوونەکەم نازانێت من لێرەم.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئایا تۆ لێرەدا چاوەڕوانی ئەوکوڕە دەکەیت بگەڕێتەوە؟

– گوتم لەچاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەودانیم، من بۆنیازێك چووبووم بۆپەرستگای دلف وپێش کاتی دیاریکراو گەڕاومەوەو شاژن لەم کاتانەدا چاوەڕوانی هاتنەوەی من نییە، لەبەرئەمەبوو بڕیارمدا چەند ڕۆژێك لەم میوانخانەیەدا بمێنمەوە، تاکاتی خۆی دێ، لێرەدەبم ودواتر دەچمەوە کۆشکی پاشایەتی ولای شاژن.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: هەستدەکەم تۆ بۆشتێکیتر جگەلەوەی گوتت، لێرەی، ئەویش پەیوەندی بەهەمان ئەو گەنجەوەیە کەتۆی تەفرەداوەو درۆی لەگەڵداکردووی– یان ئەوەتا قەولی بەتۆداوە بگەڕێتەوەو تۆش چاوەڕوانی دەکەیت؟ ئەگەر ئەوەی لەدڵتدایە بەمنی بڵێی، من ئامادەم یارمەتی تۆبدەم، چونکە دەتوانم یاریدەی تۆبدەم ولەدەستمدێت، لەبەرئەوەی کەسێکی سادەنیم، من لێپرسرای پاسەوانانم، دەتوانم کاری وابکەم کەزۆرکەس ناتوانێت ئەنجامی بدات.

– من لەپەژارەییدا کەوتمەگریان، لێپرسراوی پاسەوانەکانیش گوتی شرمیون، بۆدەگریت؟ ئەگەر نەخۆشیت بەمن بڵێ تاپزیشکت بۆبێنم، ئەگەر هەڵەیەکتکردوەو لەکۆشکی پاشایەتی هەڵاتووی، هەر بەمن بڵێ، تارێنوێنی تۆبکەم، چونکە ئەگەر تۆ خەتایەکت کردبێت وشاژنی میسر فەرمانی دەستگیرکردنی تۆبدات، من جگەلەوەی دەبێ تۆدەستگیربکەم هیچ چارەیەکی ترم نییە، بەڵام ئەگەر بەمن بڵێیت هەڵەکەی تۆچییە لەوانەیە ڕێنوێنی تۆ بکەم چۆنچۆنی شاژن لێتببورێت؟

– گوتم ئەی لێپرسراوی پاسەوانەکان تۆ بەهەڵەداچووی، من لەکۆشکی پاشایەتی هەڵنەهاتووم من لێرە نەبووم تالەکۆشك ڕاکەم، بەڵام پێویستە بڵێم من خەتایەکم کردووە کەشاژن ئەوە بزانێت...بەڵام پێم بڵێ ئایا ئامادەی یاریدەی من بدەی– یان نا؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: من یاریدەی تۆدەدەم، بەمەرجێك ئەوخەتایەی تۆ ڕێی تێبچێت– یان قابیلی لێبوردنبێت.

– گوتم: ئەوگەنجەی تۆ لەم میوانخانەیەدا دیتت، خۆشەویستی من بوو وخەڵکی سوریابوو، چۆتەوە بۆ سوریا تابەدیداری دایك وباوکی شادبێتەوە، منیش لەوگەنجە سکپڕبووم، بەڵام نەئەو ئاگاداری ئەمەبوو نەخۆشم، تەنانەت لەپەرستگای دلف بەمەمزانی کەسکپڕم، خێرخوایان بەمنیانگوت بگەڕێوە ئەسکەندەریەو ئەوگەنجە بدۆزەرەوەو بەئەوبڵێ ببێتە مێردی تۆ، تابتوانم منداڵەکەم ببێت، بەڵام ئەوکوڕە گەنجە گەڕاوەتەوە نیشتمانەکەی خۆی ولێرەنییە، ئێستاش من نازانم چی بکەم؟ ئەگەر بچمەوە کۆشکی پاشایەتی کلیۆپاترا زوودەزانێت من سکپڕم وتووڕەدەبێت وسزام دەدات، ئەگەر نەشچمەوە بۆکۆشك بەکارەکەرێکی هەڵاتوو ئەژماردەکرێم وکلیۆپاترا بەدوای مندا دەگەڕێت ودەستگیرم دەکات وسزام باردەبم، بۆیە خۆم لەدۆخێکی زۆر دیژواردا دەبینمەوە، ئایا تۆ دەتوانیت لەم تێگیرانەم ڕزگاربکەیت؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئەمکارە بەلای منەوە زۆر ئاسانە، دەتوانم کارێك بکەم منداڵەکەت لەبەرخۆت بچوێنی، ئایا ئامادەی منداڵەکەی خۆت لەباربەری؟

گوتم: بەڵێ ئامادەم.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئەگەرتۆ حەزبکەی، ئەوا هەرئێستا دەتوانم تۆ بۆ لەبەربردنی منداڵەکەت ببەم.

– گوتم ئایا بەمشەوە من بۆ لەباربردنی منداڵەکەم دەبەیت؟

– گوتی: بەڵێ.

– گوتم: لەکوێدا دەتوانرێت بەوخێراییە منداڵەکەم لەباربەری، کام پزیشك بەمشەوە ئامادەیە منداڵەکەم لەبەر بچوێنێ؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: بەمشەوە هیچ پزیشکێك ئامادەنییە منداڵی ژنێکی سکپڕ لەبەربەرێت، جگەلەمەش پزیشکەکانی میسر منداڵ لەبەر ژنان ناچوێنن، لەکۆندا پزیشکەکانی میسر منداڵیان لەبەردەچواند، بەڵام ئەمڕۆ نایکەن، یۆنانییەکان دوای ئەوەی هاتنە ئەم وڵاتەی ئێمە، زۆر لەداب ونەریتەکانی ئێمەیان گۆڕی، یەکێك لەمانە نەریتی منداڵ لەبەرچواندن بوو، ئەمڕۆ ئەو پزیشکەی کەقوتابخانە تەواودەکات ودەست بەپزیشکی دەکات، دەبێ لەسەر ئەو ڕەوشەی کە(ئێبیکرات)ی یۆنانی دانیاوە، سوێندبخوات کەمنداڵ لەبەر ژنان نەچوێنێت ونهێنی نەخۆشەکانی خۆی ئاشکرانەکات، لەبەرئەوەیە کەلەمیسردا دکتۆرێك دەستناکەوێت منداڵ لەبەر بچوێنێت، بەڵام خۆشبەختانە مامۆستایان هەن کەئەوکارە دەکەن وئامادەن منداڵی یەك ژنی سکپڕ لەبەربچوێنن، ئایا تۆپارەی حەقدەستی ئەوانەت پێیە؟

– پرسیم دەبێ چەندیان بدەمێ؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: بەلانی کەمەوە دە بەتڵیمۆس.

– گوتم: ئێستا لەپێنج بەتڵیمۆس زیاترم پێ نییە.

– گوتی: من هەوڵدەدەم بەوپارەیە ئەوان ڕازیبکەم، هەستە بابڕۆین.

– لێم پرسی: ئایا ناتوانین بەیانی بچین؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: تۆ دەتوانیت سبەی بچی، بەڵام من بەیانی دەخەوم، چونکە ئەوکەسەی شەو تابەیانی بەخەبەربێت بەڕۆژ دەبێ بخەوێت، بۆئەوەی بتوانێت لەشەودا بەکارەکانی خۆی ڕابگات.

– گوتم: زۆر باشە... بابڕۆین، بەڵام پێشئەوەی لەمیوانخانەکە بچینەدەرێ، لەتۆ دەپرسم ئایا کەسێکیتر جگەلەپزیشك هەیە کەکاری لەبەرچواندنی منداڵ بکات؟

– گوتی: بەڵێ هەیەو زۆر باشتریش لەپزیشکەکان دەتوانن منداڵ لەبەر بچوێنن.

– گوتم: ئەی بۆچی تائێسا من ناوی ئەوانەم نەبیستووە؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: لەمیسردا زۆرشت هەیە کەتۆ ناوی ئەوانەت نەبیستووە، هەڵسە بابڕۆین.

– من هەستام ولەگەڵ لێپرسراوی پاسەوانەکاندا لەئوتێلەکە چووینەدەرێ، دوای ماوەیەك ڕێ بڕین، لەپڕ چاوم بەدیوارێك کەوت کەهەرجارەی دەمدی دەترسام، ئەوشەوەش لەبینینی دیواری ناوبراو کەدیواری مردووخانەکەبوو، لەرزم گرت وڕاوەستام.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: بۆچی وەستای؟

– گوتم بۆچی منت بۆئێرە هێناوە؟

– گوتی: من تۆم بۆئەوە هێناوەتە ئێرە، تامنداڵەکەت لەبەر بچوێنن.

– گوتم: ئێرە مردووخانەیە.

– گوتی: لەناو ئەوشوێنەدا منداڵی ژنی سکپڕ لەناودەبەن، پزیشکی ڕاستەقینە ئەووەستاکارانەن کەلێرەدا کاردەکەن، ئەگەر ئەوانە خوێندەواریان هەبوایەو ماوەیەك لەبەشی پزیشکی بیانخوێندبایە، شارەزاییان لەخواسی گیاکاندا هەبوایە، دەبوونە پێشەنگی پزیشکەکانی دنیا، بەڵام چوون وەستاکارەکانی ئەم خانەیە خوێندەواریان نییە، داناو پزیشکەکانی ئێمە نرخ بۆئەوانە دانانێن.

– گوتم: ئەی لێپرسراوی پاسەوانەکان، دەست لەمن بەردەو لێمگەڕێ بگەڕێمەوە میوانخانەکەو بخەوم، لەوانەیە سبەی بەیانی ڕێگاچارەیەك بۆ ڕزگاربوونی من پەیدابێت.

– ئەوگوتی: هیچ ڕێگا چارەیەك بۆ ڕزگاربوونی تۆ نییە، تاکە ڕێگای سەرفرازبوون ئەوەیە بچیتەناو مردووخانەکەو خۆت بدەیتەدەستی یەکێ لەمامۆستایانی مۆمیایی کارانی ئەم خانەیە، تابەخێرایی و وردبینییەوە منداڵەکەت لەبەربچوێنێت، ئەوەش بزانە لەمردخانەکەدا ڕێگانادەن ژن بۆ لەبەرچووی منداڵەکانیان بچنە ژوورەوە، مەگەر بەپارەی زۆر ئەووەستا مۆمیاکارانە ناچاربکەن- یان ئەوەتا لێپرسراوێکی گەورەی دەوڵەت بێت وبەو مۆمیاکارانەبڵێت ئەومنداڵە لەبەرئەو ژنە بچوێنن، لەبەرئەوە ئەمشەو بەختت هەبوو کەمن هاتم ویارمەتی تۆ دەدەم، ئەگەر ناتەوێت لەتەنگانەو وبەدبەختی وسەرشۆڕی ڕزگارتبێت، ئەوادەتبەمەوە بۆمیوانخانەکە.

– گوتم: من لەم شوێنە زۆر دەترسم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بزانم بەدڵنیاییەوە ئاسودەدەبم وڕزگارم دەبێت، ئامادەم بچمەناو ئەوخانەیە.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: بەڵێ خەمت نەبێ، ئینجا عەڵقەی دەرگای مردووخانەکەی گرت ودەستیکرد بەلێدانی، دەرگاکە کرایەوەو پیاوێك گوتی کێیە؟

کاتێ دەرگاکە کرایەوە، بەشێوەیەك بۆگەنیوو بەلوتم هەڵاهات، خەریکبوو لەتاوا لەهۆشخۆم بچم، لێپرسراوی پاسەوانەکان، خۆی پێ ناساندو ئێمە چووینەناو مردووخانەکەو دەروازەکەیان داخستەوە.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان پرسی: ئایا (ئەرتب) لێرەیە- یان نا؟

– ئەو پیاوەی کەدەرگاکەی لێرکردبووینەوە، گوتی بەڵێ ئەو لێرەیە.

– گوتی پێی بڵێ بۆلای من بێت، کارم پێیەتی.

– ئەو ڕۆیشت وپاش چەند خولەکێك لەگەڵ پیاوێکی بەساڵاچوودا گەڕایەوەو گوتی ئەوە وەستا ئەرتبە، منیش کەسەیرمکرد ئەرتب یەکێکە لەومۆمیایی کەرانەی کەبۆکۆشکی پاشایەتی هاتبوو تامنداڵەکەی کلیۆپاترا مۆمیایی بکات، من لەوکاتەدا ناوی ئەوم نەپرسیبوو، بۆیە نەمدەزانی ئەرتب هەمان ئەوکەسەیە.

– ئەرتب منی ناسییەو گوتی: من ئەو ژنەم لەکۆشکی پاشایەتیدا بینیوە، بەڵام نازانم ناوی چییە؟

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: کارت بەناوی ئەونەبێت، من ئەوژنەم بۆیە هێناوە بۆلای تۆ هەتا منداڵەکەی لەبەر بچوێنی.

– ئەرتب، گوتی: بۆخۆتدەزانی ئێمە ڕێگامان پێ نادرێت ئەوکارەبکەین، تەنها پزیشکەکان بۆیان هەیە منداڵ لەباربچوێنن، ئێستا ئەوانیش ئەوکارە ناکەن.

- لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: تۆ پێویستە ئەوکارە ئەنجامبدەیت ومنداڵی ئەوژنە لەباربەریت، چونکە باوکی منداڵەکە مردووەو ئەو ژنە ناتوانێت منداڵەکەی گەورەبکات.

- ئەرتب گوتی: پێموانییە کەسێك لەکۆشکدا بژیت، نەتوانێت منداڵێك گەورەبکات.

- لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: هەموو ئەوانەی لەکۆشکی پاشایەتیدا دەژین، دەوڵەمەندنین، لەنێوان ئەوانەدا کەسانی دەستکورتیش هەن، بەهەر شێوەیەکبێت من داوا لەتۆ دەکەم منداڵی ئەو ژنە لەباربەری، باشاسودەبێت؟

- ئەرتب گوتی: بەڕێز تۆ دەلاشە بێنە تابەخۆڕایی بۆت مۆمیابکەم، بەڵام ئەمکارە بەمن ناکرێت، چونکە قەدەغەکراوە ئێمە کاری نەشتەرگەری بکەین، منیش پیاوێکم ملکەچی بڕیارەکانم.

- لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: تۆ ملکەچی بڕیارەکانی، بۆچی شەوانە مردووخانەکە دەکەیتە شوێنی ڕابواردنی گشتی ژنی لەشفرۆش دێنییە ئێرە؟ من ئەگەر ئێستا ئەم خانەیە بپشکنم بەلانی کەمەوە پێنج ژن لەوانەم دەست دەکەوێت، کەدوای تاریکبوون هاتوون بۆئێرەو سەعاتێکیتر- یان بەرەبەیانی لێرەدەڕۆن، ئایا یاسا ڕێگادەدات ئێرە، کەبەهۆی مردووەکانەوە بۆتەجێگایەکی موقەدەس، بیکەیتە شوێنی ڕابواردن، ئایا تۆ پێتوایە دەتوانی کارە ناپەسەندەکانی خۆت لەمن بشاریتەوە؟ شەوانە لەمشارەدا هەرکەسێك بیەوێت بەدەر لەهەردوو شوێنی ڕابواردنی گشتی، کەڕێگای پێدراوە لەگەڵ ژناندا ڕابوێرێت، ئەوا ئەوژنە لەشفرۆشانە بۆمردووخانەکە دەهێنن وتۆش دەرگایان لێدەکەیتەوە، من دڵنیام ئەمشەویش دەرگاوانەکەی ئێرە، کاتێ منی لەگەڵ ژنێکدا بینی وناوی منی گوێ لێبوو، پێیوابوو منیش بۆهەمان مەبەست لەگەڵ ژنێکدا بۆئێرەهاتووم، بۆیە دەرگاکەی کردەوەو ئێمە هاتینە ژوورێ.

- ئەرتب گوتی: بەڕێز پێویست بەوقسانەناکات، تۆچی بڵێی من بۆت بەئەنجام دەگەیەنم.

- لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئەو ژنەی کەدەیبینی سکپڕەو دەستکورتیشەو ناشتوانێت پارەی زۆربدات بەتۆ، من دەمەوێت منداڵەکەی لەبەربچوێنی وئەویش لەبەرامبەردا تەنها پێنج بەتلیمۆس دەداتە تۆ، ئاگات لێبێ ئەو ژنە توشی ئازاری زۆرنەبێت، جگەلەوە دەبێ بەزیندوویی بمێنێتەوە.

- ئەرتب گوتی: دوای ئەوەی من منداڵەکەم لەبەر ئەو ژنە چواند، دەبێ چەند ڕۆژێك لێرەبخەوێت، بۆئەوەی چاکبێتەوە، لەماوەی ئەوچەند ڕۆژانەی کەلێرە دەمێنێتەوە کێ خۆراکی ئەودەدات؟

- لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: سەبارەت بەخۆراکی ئەو ژنە نیگەران مەبە، من ڕۆژانە یەکێك لەپۆلیسەکان دەنێرم بۆ ئێرە، تاخواردن وخواردنەوەی بۆبێنێت، پێم بڵێ کەی منداڵەکەی لەبەردەچوێنی؟

- ئەرتب گوتی: ئەو پێنج بەتلیمۆسەی کەئەوژنە دەیدا بەمن زۆرکەمە، ئایە تۆدەزانی دەبێ من چەند خەڵوز بسوتێنم، تابتوانم کەرەستەکانی نەشتەرگەری گەرم بکەم؟ منیش بەسەر سوڕماویەوە گوتم: بۆ تۆنەشتەرگەریم دەکەیت؟

- ئەرتب گوتی: ئایا تۆ چاوەڕوانی ئەوەی بەڕێگای غەیرە نەشتەرگەری منداڵەکەت لەبەربچوێت؟

- گوتم: من بەرگەی نەشتەرگەری بگرم.

- لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: ئەو پێشنئەوەی دەستبکات بەکار نەشتەرگەری شتێکی وادەکات تۆهەست بەئێش وئازار نەکەیت.

– گوتم: ئەو چۆن دەتوانێت کارێك بکات، من ئازارم نەبێت؟

– ئەرتب گوتی: پێشئەوەی دەستبکەم بەکاری نەشتەرگەری، دەرمانێکت دەرخواردەدەم کەهەست بەئازار نەکەیت.

– گوتم: ئایا ئەودەرمانە بوونی هەیە؟

– ئەرتب گوتی: بەڵێ.

– گوتم ئەی بۆ کەکاتێ کلیۆپاترا دەزا، ئەو دەرمانەیان نەدایە؟ تابەبێ ئازار منداڵەکەی ببێت؟

– ئەرتب گوتی: ئازاری منداڵبوون جیاوازە لەئازاری نەشتەرگەری، ئەگەر ئێشی منداڵبوون نەهێڵدرێت منداڵەکە نابێت، هەرکاتێ ئازاری ئەو ژنەی کەدەزێت بەهۆی دەرمانەوە نەهێڵدرێت، ئەوا منداڵەکە لەسکی دایکیدا دەمرێت وئینجا دایکەکەش تێدادەچێت، بەڵام سەبارەت بەنەشتەرگەریەکەی تۆ، دەتوانرێت دەرمان بەتۆ بدرێت وبێهۆشبی وبەبێ ئەوەی هەست بەئازاربکەیت، کاری نەشتەرگەریەکە ئەنجام بدرێت.

– گوتم ئەرتب، تۆ گوتت دەبێ کەرەستەی نەشتەرگەری گەرم بکەم، مەبەستت لەمەچییە؟

– ئەرتب گوتی: ئەوکەرەستانەی کەئێمە بۆ مۆمیاکردنی لاشەی مردووەکان بەکاری دەهێنین، نابێ بۆخەڵکانی زیندوو بکارببرێت، مەگەر ئەوانە بخەیتەسەر ئاگری پۆڵانەوەو باش گەرمیان بکەیت، چونکە رۆحی مردووەکان لەرێگای ئەو کەرەستانەوە دەچێتەبەر زیندووەکان وئەوان لەناودەبات، بەڵام دوای ئەوەی کەرەستەکانت خستە ناو ئاگری پشکۆکانەوە، رۆحی مردووەکان، لەسەر ئەوکەرەستانە لادەچێت ولەکاتی نەشتەرگەریەکەدا ئەوکەسە زیندووانە نامرن.

– گوتم: ئایا دەتوای پێم بڵێیت چۆن من نەشتەرگەری دەکەیت؟

– ئەرتب گوتی: من دوای ئەوەی بێهۆشمکردی و ورگی تۆ دەدرم ومنداڵەکە لەوێوە دەهێنمەدەرێ.

– لەئەرتبم پرسی کەی دەستدەکەیت بەکاری نەشتەرگەریەکە؟

– ئەرتب گوتی: دووسەعات پێشئەوەی من دەستبکەم بەنەشتەرگەریەکەت، دەرمانێکت دەرخواردەدەم بۆئەوەی بێهۆشبیت، چونکە کاریگەری ئەودەرمانە پاش دووسەعاتەو ئەوکاتە نەشتەرگەریت دەکەم.

– گوتم: ئایا دەکرێت بزانم ئەودەرمانەی کەدەرخواردی من دەدرێت چییە؟

– ئەرتب لەلێپرسراوی پاسەوانەکانی پرسی: ئایا ئەو ژنە خوێندەواری هەیە؟... چونکە ئەوپرسیارانەی کەدەیکات ئەوەنیشان دەدات کەنەخوێندەوار نییە.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: پێم وابێ خوێندەواری هەیە.

– ئەرتب گوتی: ئەودەرمانەی دەرخواردی تۆی دەدەم، کوکاینەو لەخۆرهەڵاتەوە بۆمیسری دێنن ویەکێکە لەبەهێزترین دەرمانی بێهۆشکەری، تۆ دوای دوو سەعات وابێهۆشدەبیت کەلەکاتی نەشتەرگەریەکەدا هەست بەهیچ ناکەیت.

– کاتێ لێپرسراوی پاسەوانەکان ویستی بڕوات، من وەك ئەومنداڵەی کەلەدایکی جیادەکرێتەوە، ترسام وکەوتمە بیری ئەوەی ناتوانم بەتەنها لەمردووخانەکەدابم، دەمویست لەگەڵ ئەودا بچمەدەرێ.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان لەمنی پرسی بۆدەترسێیت؟ بۆ مردوو لەزیندووەکان جیان، ئەو ئامۆژگارییە لەمن وەربگرە، پێویستە لەکەسانی زیندوو بترسیت، نەك لەمردووەکان.

– گوتم دوای ئەوەی نەشتەرگەری منیانکرد لەکوێدا بخەوم، چونکە ئێرە مردووخانەیە، شوێنێکی نییە بۆزیندوان.

– لێپرسراوی پاسەوانەکان گوتی: لەم خانەیەدا هەم زیندوو وەردەگیرێن وهەم مردووش، لەشوێنێك لەم جێگایە کەعاشقەکان تێیدا یەکدەگرنەوە، تۆی تێدا دادەنێن ودوای ئەوی چاکبوونەوە، لێرەت بەدەرێ دەنێن ودەچیتەوە بۆکۆشکی پاشایەتی وبەکلیۆپاترا بڵێ لەپەرستگای دلف هاتوومەتەوە.

دیارە مردووخانەکان لەکۆندا تەنها جێگای مۆمیاییکردنی تەمری مردووەکان بوو، بەڵام ئەمڕۆ جگەلە مۆمیاییکردن بۆتەجێگای پێکگەیاندنی مەعشوقەکان ونەخۆشخانەشە، لەڕۆژگارانی کۆندا ئەوکاتەی کەیۆنانییەکان نەهاتبوون بۆ میسر، مردوخانە یەك شوێنی پیرۆزبوو، لەوێدا کارێك نەدەکرا پێچەوانەی بیروباوەڕی دانیشتوانی میسربێت، من چونکە لەگەڵ کلیۆپاترادا گەورەبووم، وەك گوتم ئاگام لەمێژوو هەبوو ودەمزانی لەسەردەمی فرعەونەکاندا، مردووخانەکان لەهەموو شوێنێکی ئەم وڵاتەدا پیرۆزبوون وئەمجۆرە شتانەی تێدانەبوون، ئیتر لێپرسراوی پاسەوانەکان ڕۆیشت ومنی تەنها لەوێدا جێهێشت.

– ئەرتب بەمنی گوت: لەگەڵ مندا وەرەو منی بەنێوان چەند خانووچکێکدا بردوو گەیاندمیە خانوێ کەکەمێ دووربوو، بەڵام بۆگەنیوەکەی هەردەهات.

– ئەرتب بەمنی گوت: برسیت نییە؟

– گوتم: برسیم نییە، هەرکاتێ کەسێکی برسی بێت بۆئێرە، ئیشتیای نامێنێت وئەم بۆنە توندو بۆگەنە، ڕێگا لەوەدەگرێت مرۆڤ خواردنبخوات.

– ئەرتب گوتی: ئەگەر برسیتە ئەواخۆراکت بۆدێنم، بەڵام خواردنی ئێمە بەباشی خواردنی کۆشکی پاشایەتی نییە.

– گوتم: نا، برسیم نییە.

– ئەرتب گوتی: کەواتە بخەوە، کاتێ ویستم دەرمانەکەت بدەمێ بەئاگات دێنمەوە.

– ئەو ژوورەی من تێیدابووم، یەك تەختەی خەوی تێدابوو، لەگەڵ گۆزەیەك ئاو کەلەگۆشەیەکیدا دانرابوو، جگەلەمە هیچیتری تێدانەبوو، ویستم قومێك ئاو بخۆمەوە، دوای ئەوی ئاوەکە گەیشتە دەمم، هەستمکرد ئەویش بۆنی مردووخانەکەی لێدێت، ئاوەکەم دەرهاویشتەوەو ئینجا لەسەرتەختە خەوەکە ڕاکشام، بەوەی بۆنەکە زۆربوو، نەمتوانی زۆربخەوم، بەڵام بەهۆی ماندووبوونی زۆرم، خەوم لێکەوتبوو، کاتێ ئەرتب منی لەخەوهەڵساند، سەیرمکرد دنیا ڕووناکبووە، ئەرتب دووقاپی لەدەستدابوون وبەمنی گوت لەیەکێك لەم قاپانەدا دەرمانی تێدایە، دوای ئەوەی خواردتەوە بێهۆشدەبیت، بەڵام ئەودەرمانە زۆرتاڵە بۆیەش لەمقاپەیتردا هەنگوینم بۆ هێناوی، بۆئەوەی دوای خواردنەوەی دەرمانەکە ئەمەیان بخۆی وتامی تاڵی دەرمانەکە لەدەمتدا نەمێنێت.

– لە ئەرتبم پرسی: دوای ئەوەی دەرمانەکەم خواردەوە چی دەبێت؟

– مۆمیاکارەکە گوتی: حەزت دەچێتە خەو و بەزوویی دەکەویتە خەوێکی خۆش، منیش لەکاتی نووستنی تۆدا نەشتەرگەریەکەت بۆدەکەم.

– لەئەرتبم پرسی: هەر کەتۆ دەستتکرد بەنەشتەرگەریەکە، من بەئاگا دێمەوە– یان نا؟

– ئەرتب لەوەڵامدا گوتی: تا کاتێ تۆ بەخەبەردێیتەوە کەنەشتەرگەریەکە کۆتاییهاتووەو منبرینەکەم بەستۆتەوە.

– گوتم: ئەگەروایە کەواتە دەرمانی بێهۆشییەکەم بدەیە تابیخۆمەوە.

– ئەرتب گوتی: دەبێ تۆ ئەم دەرمانە بەیەکەجار هەڵقۆڕێنی، چونکە ئەگەر بەقومی کەمکەم خەریکی خواردنەوەی بیت، تاڵییەکەی دەبێتەهۆی ئەوەی نەتوانی هەمووی بخۆیتەوە، چاوەکانت داخە بۆئەوەی بۆنی دەرمانەکە نەکەیت وبەیەکجار بیخۆرەوەو دواییش من ئەم هەنگوینە شلە بەتۆدەدەم، بۆئەوەی دوای ئەودەرمانە بیخۆیتەوە، من قاپی دەرمانەکەم لەدەستی ئەرتب وەرگرت وبێئەوەی بۆنی بکەم، بەیەکجار خواردمەوە، بەلاّم دوایە بەشێوەیەك دەمم تاڵبوو، وامزانی دەمم سوتاوە، بەدرێژایی تەمەنی خۆم شتی واتاڵم نەخواردبوو، کاتێ ئەرتب زانی لەتاڵی دەرمانەکە هەراسانبووم، قاپی دووەمی دایەدەستم وگوتی قومقوم بیخۆوە، بۆئەوەی تامی تاڵیەکەی دەمت لاببات، منیش هەنگوینە شلەکەم لێوەرگرتوو قومقوم خواردمەوە، هەرچەندە بەهێواشیش دەمخواردەوە دوای تەواوبوونی هەنگوینەکەش هەستم دەکرد تاڵاّییم لەدەمداماوە.

– ئەرتب گوتی: لەسەر ئەم تەختی خەوە ڕاکشێ، زۆرنابات خەوت لێدەکەوێت.

– منیش ڕاکشام وهێندەی پێنەچوو هەستمکرد خەوم دێت، حەزم لەوەنەبوو بخەوم، هەرچیم دەکرد تاپێڵوی چاوەکانم بەکراوەیی ڕاگرم، نەمدەتوانی، ئیتر ئاگام لەخۆم نەما تابزانم چیم لێبەسەرهات تائەوکاتەی لەتاوی ئازار بەخەبەرهاتمەوە سەیرمکرد دووکەس لامەوەن، یەکێکیان ئەرتب بوو وئەوی تریانم نەدەناسی، بەشێوەیەك ئێش وئازار تینی بۆهێنابووم، کەوتبوومە ئەوبڕوایەی لەمردن بەهێزترە، ئەگەر مردبام ئەوەندە گرفتاری ئازار نەدەبوومەوە، ویستم دەست وپێکانم ڕاپسکێوم وهەڵێم، بەلاّم نەمتوانی بجوڵێم، چونکە بەستبوومیانەوە من بەجۆرێك هاوارمدەکرد، ئەگەر لەوشوێنەدا جگەلەمردووەکان کەسیتری لێبا، ئەوا لەترساندا ڕایدەکرد، لەوحاڵەتی بێتۆتکەیی وئازارەدا بیرم هاتەوە کەئەرتب درۆی کرد، دەرمانەکە تەنها منی خەواند ئازارەکەی لانەبرد، چونکە هەر کەدەستیانکرد بەنەشتەرگەیەکە من بەخەبەرهاتمەوە، دوای ئەو ئەزموونە زانیم هەموو نەشتەرگەران درۆ لەگەڵ نەخۆشەکاندا دەکەن، پێش دەستپێکردنی نەشتەرگەریەکە نەخۆشەکانیان دڵنیادەکەن کەهەست بەئازار نەکەن، بەلاّم کەنەشتەرگەریەکە دەستپێکرد نەخۆشەکە دەزانێت تەفرەیانداوە.

من پێموایە نەشتەرگەری گەورە، واتا لەمردن ناخۆشتر، نەشتەرگەرەکە پێیوایە نەخۆشێك لەمردن ڕزگاردەکات، ئاگای لەوەنییە ئەوکارەی ئەودەیکات لەمردنی نەخۆشەکە خراپترە، کەدەیەوێت لەمەرگ دووری بخاتەوە، باشتروایە نەخۆشەکە بمرێت وگرفتاری نەشتەرگەریەکەی ئەونەبێت.

– ئەرتب، دوای ئەوەی من هێواشبوومەوە، گوتی: ماوەی نەشتەرگەیەکەی تۆتەنها سێ دەقیقەی خایاندووە، ماوەکەیتر خەریکی دوورینەوەی برینەکەبووم، ئەرتب وای دەردەخست گوایا لەسەرەتای کردنەوەی سکم وهێنانەدەری کۆرپەکە، سێ دەقیقەی خایاندووە، گوایە لەسەرەتای نەشتەرگەریەکەدا من هەرخەوتبووم ودواتر لەبەرتوندی ئازار بەخەبەر هاتوومەوە، بەلاّم ئەو ڕۆژە پێموابوو نەشتەرگەریەکەی من لەسەرەتای دنیاوە دەستی پێکردووە تاکۆتایی دنیا درێژ دەبێتەوە.

– مـن لەوحاڵـە بێتۆتکـەیی وئـازارەدا نەمـدەزانی کۆرپەکـەیان چ لێکـردووە، دوای چـەند ڕۆژێـك کەهێوربوومەوە لەکۆرپەکەم پرسی.

– ئەرتب گوتی فڕێمداوەتە بیرەکەوە.

لەمردووخانەکـەدا چـەند بیرێکـی قـوڵ هـەبوون، لـەکاتی مۆمیـایی کردنـی تەرمەکانـدا ناوسـكوهەناو وشتەکانی ئەوانیان دەخستنە ئەویرانەوە، کۆرپەکەی منیش فڕێ درابۆ یەکێك لەویرانە.

دوای کۆتاییهاتنی نەشتەرگەیەکە پێموانەبوو ئازارەکـەم کۆتـایی پێـدێت، کەبرینەکەشیان دووریمەوە هەئازاری سەختم کێشاو لەبەهێزیدا توشی تابووم.

ئەرتب، هاتە ژوورەکەوەو بینیم دووبارە قاپی بەدەستەوەن.

– گوتم: ئەرتب، دووبارە هاتووی تەفرەم بدەیتەوە؟ دەرمانە تاڵەکەم دەرخوارد بدەیەوە؟

– گوتی: شرمیون من تۆم فریونەدا، کاتێ دەستمکرد بەنەشتەرگەریەکە تۆخەوتبووی، وەك ئەوەوابوو بێهۆش بووبی، بەڵام دواتر لەتوندی ئازار لەخەو ڕاپەڕی، بەڵام هەرچی بوو ڕۆیی وئێستاش ئەم دەرمانە بخۆ تاتایەکەت نەمێنێ وبخەویت.

– لێم پرسی: دەرمانەکەی تۆچییە؟

– گوتی: گیراوەیەکە لەگوڵی تەمباکۆ وکۆکاینە.

– ئـەرتب گـوتی: مـن دڵنیـات دەکەمەومـە ئەمدەرمانـە سـودی هەیـەو دەبێتـە هۆئـەوەی تۆبخەویت ولەخەویشدا هەست بەئازار ناکەیت وتاکەشت نامێنێت.

هەرچەندە دەمزانی ئەرتب ڕاستگۆنییە، بەڵام جاری پێشتر کەدەرمانەکەی دامێ خەوم پێلێکەوت، قاپی دەرمانەکەم لێوەرگرت وبەیـەك تـەکان لـەقوڕگم ئـاوامکردو دواتر قاپولکەی هەنگوینە شلەکەشم نۆشی، دووبارە کۆکاینەکە کاریگەری خۆی هەبوو وپێڵوی چاوەکانم گرانبـوون وخـەوم لێکەوت، کاتێ لەخـەو هەڵساوم بینـیم شـەوداهاتووەو چرایەك لەژوورەکـەی منـدا دەهایسێ، گوێم ڕاگرت دەنگی قسەکردنی دووکەس دەهـات وزانـیم یـەکێك لەمدووانە ژنـەو ئـەوی تریـان پیـاو، لەشێوەی قسەکردنەکەیان دیـاربوو باسـی شـتی جـددی ناکـەن وزانـیم ئەمانـە لەوکەسـانەن کـەدوای تـاریکبوونی دنیـا دێنەمردووخانەکـە، شەوی ڕابردووش لێپرسراوی پاسەوانەکان ئەمەی بەئەرتب، گوت.

لەکۆنـدا مەملەکەتەکـەی ئێمـە ئەوانـەی مۆمیـایی کـاربوون، داهاتیـان زۆربـوو وبـێ هاوتـابوو، ئـەمڕۆش مۆمیاییکـارانی میـسری داهـاتی باشـیان هەیـە، کەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەرتب وهاوکارەکـانی ئـەو، قەناعـەت بەوەناکـەن ومردووخانەکـەیان کردبـووە ژوانگـای ئەوکەسـانەی نەیاندەویـست لەشـوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریەدا دوو سەعات بگوزەرێنن، پێیانباشتربوو لەشوێنێکیتردا ڕابوێرن.

– من دوای ئەوەی بەخەبەرهاتمەوە هەستمکرد کەئازارەکەم کەمبۆتەوە، ماوەیـەکی پێچوو ئـەرتب هـات وگوتی: ئایا برسیتە– یان نا؟

– گوتم: نا، بەڵام تونیمەو حەزدەکەم کەمێ ئاوبخۆمەوە.

– ئـەرتب گـوتی: مـن ئـاو وخواردنـت بـۆدەنێرم، باشـترواية چـەند پـارو ونانبخۆیـت تـابتوانی دوبـارە بخەویەوە، ئەو ڕۆیشت ویـەکێك لەبەردەستەکانی ئاو وخـواردن وشـەرابی بۆهێنام وگوتی: ئەم شەراب وخواردنە لێپرسراوی پاسەوانەکان بۆی ناردووی، من پێموابـوو لەدوو سـێ ڕۆژ زیـاتر لەمردووخانەکەدا

نامێنمەوەو دواتر دەچمەوە بۆ کۆشکی پاشایەتی، بێئاگابووم لەوەی، دەبێ پازدە ڕۆژ لێرەبمێنمەوە تابرینەکەم چاکبێتەوە، ئەرتب ئەوەی دەزانی، لەوانەیە لێپرسراوی پاسەوانەکانیش ئەمەی زانیبێ کەمن دەبێ پازدە ڕۆژ لێرە بمێنمەوە، تابرینەکەم چاکدەبێتەوە، لێپرسراوی پاسەوانەکان پەیمانەکەی خۆی بەجێهێناو خواردنی بۆمن دەنارد (ئەرتب)یش ڕۆژی جارێك دەهات مەرهەمی لەبرینەکەم دەدا، لەدوایین ڕۆژەکاندا دەمتوانی بڕۆم، بەڵام لەدوایین ڕۆژدا وەك یەکەم ڕۆژ نەوبۆنە ناخۆشەی مردووخانەکە ناڕەحەتی کردم، لەڕۆژانی دواییدا دەمتوانی لەژوورەکەم بچمەدەرێ ولەبەشەکانی مردووخانەکەدا بگەڕێم، بەڵام ئەرتب بەمنی گوت، لەژوورەکەم نەیەمەدەرێ، چونکە کۆمەڵێ شاگرد لەمردووخانەکە کاردەکەن، کەسانی بێتەربیەتن ولەوانەیە بوخاتنت بۆبکەن، هەروەها گوتیشی ئەوانە کەسانی پیس وپۆخڵن، منیش دەمزانی وایە، ئەوانە پۆخڵن، پیس وپۆخڵیش ئەودیاریەن کەیۆنانییەکان بۆمیسرییەکانیان هێناوە، لەوکاتەوەی ئەسکەندەر پێی ناوەیتە میسر، میسرییەکان چڵکن وپۆخڵن، میللەتی میسر لەکۆندا خاوێنترین میللەتی دنیابوون، هەموو میسرییەك لەسەردەمی فیرعەونییەکاندا ڕۆژی دووجار خۆی دەشت، ئەو ڕۆژانەی کەکەژ ساردی دەکردو هەموو ڕۆژێ خۆشتن نەدەکرا، دەست وپێ ودەموچاوی خۆیان بەسابون دەشت، سابون میسرییەکان دۆزیویانەتەوەو خەڵکی دنیا ناوی سابون بەکاردەهێنن، کاتێ یۆنانییەکان هاتنە میسرەوە، عادەتە دزێوەکانی خۆیان بۆمیسر هێناو میسرییەکانیان لەڕووی لەش وڕۆحییەوە پیسکردن.

لەکۆندا ئەوانەی لەمردووخانەکەدا شاگردبوون هەموویان دەرچووی دانیشتگاو بەشی پزیشکی ونەشتەرگەری بوون وبۆوەرگرتنی ئەزموون بەشیوەی پراکتیکی دەرسیان لەمامۆستایانی مۆمیایی کار وەردەگرت، بەڵام ئەمڕۆ ئەوکەسانەی لەمردووخانەکەدا کاردەکەن وشاگردن، ئەو بێگانانەن کەدوای هاتنیان بۆمیسر سەرمایەی خۆیان لەدەستداوە- یان هەر کەگەیشتونەتە ئەم وڵاتە، هیچیان پێنەبووە. ئەوانە دوای ئەوەی هاتوونەتە میسر زانیویانە ناتوانن لەهیچ شوێنێکدا کاریان دەستبکەوێت، مەگەر لەمردووخانەکەدا بەکرێیەکی کەم شاگردی بکەن وببوون بەشاگردی ئەوێدا، مردووخانەکە لەکۆندا شوێنێکی پیرۆزبوو، ئێستا کردوویانە بەجێگای کاری ناشەرعی ونابەجێ.

## شوکردن بە تیە، گەنجە سوریەکە

– سەرئەنجام ئەو ڕۆژەهات کەئەرتب بەمن بڵێت، چاکبوویتەوەو دەتوانی لەمردووخانەکە بچیتەدەرێ، بەمەرجێك باقی ماندووبوونەکەی ئەوبدەم.

– منیش بەئەوم گوت: حەقی تۆم بیرناچێتەوەو دەتدەمێ.

– دوای دەرچوونم لەمردووخانەکە تاماوەیەکیش هەستم بەبۆگەنی مردووخانەکە دەکرد، وەك ئەوەوابوو بۆنی مۆمیاخانەکە بەجلەکانمەوە نوسابێ ولێنەبێتەوە، پێشئەوەی بچم بۆکۆشکی پاشایەتی، چووم بۆشوێنەکەی لێپرسراوی پاسەوانەکان تابەئەو بڵێم من لەمۆمیاخانەکە ڕۆیشتووم وئیتر خواردن وشەراب بۆئەویّ مەنێرە، بەڵام ئەو لەشوێنی کارەکەی خۆیدانەبوو، بەمنیان گوت: چونکە ئەوشەو تابەیانی بێدارە، ڕۆژانە دەچێتەوە ماڵەکەی خۆی دەخەوێت.

– من بەڕێگای یەکێك لەوکەسانەی لەوێدا کاریان دەکرد، پەیامێکم بۆلێپرسراوی پاسەوانەکان جێهێشت وگوتم ئیتر خواردن بۆئەویّ نەنێرێت، ئینجا بەرەو ئوتێلی سوور کەوتمەڕێ تاکرێی ئەوهۆدەیەی کەگرتبووم بیدەم، دوای دانی کرێی میوانخانەکە، ڕێگای کۆشکم گرتەبەرو خۆم گەیاندەوەلای شاژن.

– کلیۆپاترا لەبینینی من زۆر خۆشحاڵبوو وگوتی: ئەی شرمیون نیازی تۆ لەپەرستگای دیاندا قەبوڵبوو.

– منیش بەهۆی ئەوپێشهاتانەی کەبەسەرمهاتبوو، ئەوەم لەبیر چووبۆوەو نەمزانی شاژنی میسر چی گوت ولێمپرسی مەبەستت چییە؟

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا لەبیرت چۆتەوە تۆهەموو شەویّ بۆپەرستگای دیان دەچووی ولەوێدا مۆمت دادەگیرساندن، بۆئەوەی سکم پڕبێت؟

– گوتم: نا، ئەمەم بیرنەچۆتەوە.

– شاژن گوتی: دیانی شکارچی نیازی تۆی قەبوڵکردووەو سکپڕبووم وئەگەر تۆ کەمێك دواکەوتبای لەڕۆیشتنت بۆ پەرستگای دلف، دەمتوانی بەتۆ بڵێم سکپڕبووم.

– گوتم: ئەی خاتوونەکەم، من زۆر خۆشحاڵم بەوەی نیازەکەم قبوڵبووەو تۆ بەئارەزووەکەی خۆت گەیشتی.

– شاژن هەندێك لەمن خورد بۆوەو گوتی: سەفەرەکەی تۆ بۆپەرستگای دلف زۆرلاوازی کردووی وهەرکەسێك بتبینێ هەستدەکات تۆماوەیەك نەخۆشبووی.

– گوتم لاوازی من بەهۆی شەونخونییەوەیە، چونکە ئەوکەسەی دەچێت بۆپەرستگای دلف، دەبێ شەو تابەیانی لەهۆڵی سکاڵاکردنەکەی ئەودا بەخەبەربێت وجگەلە خوای دلف بیر لەهیچیتر نەکاتەوە، بۆیە من لەوماوەیەی کەلەپەرستگای دلفدابووم، لاوازبووم.

– کلیۆپاترا گوتی: شرمیون دەزانی دوای ئەوەی زانیم نیازگرتنەوەی تۆ لەلایەن دیانەوە قەبوڵبووە، ئەوکات من سکمپڕبوو، بیرم لەچی کردەوە؟

– گوتم: نا، ئەی خاتوونەکەم.

– کلیۆپاترا گوتی: من بیرم لەوەکردەوە لەپای خزمەتەکانی ڕابردووی تۆ وقەبوڵبوونی دوعاکەت لای خوای دیان، تۆ بەشوویدەم، من دەمویست زووتر تۆ بەشوو بدەم، بەڵام بیرم لەوەدەکردەوە هەرکاتێك تۆ شوویکەیت ئیتر منت بیردەچێتەوە، چونکە مرۆڤ لەدڵێکی زیاتر نییەو کاتێ ئەوی دایە مێردەکەی، ناتوانێت بیداتە خاتوونەکەی خۆی، بەڵام ئێستا ئەوڕاستییەم بۆ ڕوونبۆتەوە، ئەگەر شوکردنی تۆ لەمەزیاتر درێژەبکێشێت دەبیتە کچێکی قەیرە، بۆ ئەوەی بزانی من نامەوێت شوکردنەکەت بەزۆربێت،

بۆیە سەربەستت دەکەم لەوەی چ کەسێکت دەوێت بۆخۆت هەڵیبژێرە، بەمەرجێك ئەو هاوسەرەت تۆی خۆشبوێت.

– گوتم خاتوونەکەم من بەشێوەیەك تۆم خۆدەوێت، پێموایە ناتوانم دەستبەردارتبم.

– کلیۆپاترا گوتی: ژن دەبێ شووبکات، خۆئەگەر تۆ ئەمڕۆ شوونەکەیت، کاتی بەسەردەچێت، ئایا بۆخۆت هیچ پیاوێکت لەدڵگرتووە– یان من کەسێکت بۆدیاری بکەم؟

– گوتم: ئەی خاتوونەکەم، ماوەیەك لەمەوبەر کۆمەڵێك کرێکاری مۆزایککار لەمکۆشکەدا خەریکی کارکردن بوون، گەنجێك لەگەڵ ئەوانەدابوو کەخەڵکی سوریابوو، ئەوحەزی دەکرد ببێتە هاوسەرم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا تۆش ئەوت خۆشدەویست– یان نا؟

– گوتم: بەڵێ ئەی خاتوونەکەم، من ئەوم خۆشدەویست، بەڵام ئەوچۆتەوە بۆ سوریا.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا دەگەڕێتەوە بۆ ئەسکەندەریە– یان نە؟

– گوتم: نازانم داخوا دەگەڕێتەوە– یان نا؟ بەڵام دەکرێ بەهۆی ناردنی نامەیەکەوە ئەمە لەئەوبپرسم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا دەزانی ماڵی ئەو لەکوێیە؟

– گوتم: ئەو خەڵکی شاری سەیدایە لەسوریاو لەوێ هەموو خەڵك بنەماڵەکەیان دەناسن، باوکی مردووەو دایکیشی ماوە.

– کلیۆپاترا گوتی: تەمەنی چەندە؟

– ترسام لەوەی بڵێم زۆر لەمن بچوکترە، گوتم: هاوتەمەنی خۆمە.

– کلیۆپاترا گوتی: نامەیەك بۆ ئەو بنووسەو بیدە بەمن تالەڕێگای پۆستەوە کەسەبەی بەکەشتی بۆسوریا دەچێت، بۆی بنێرم وبەپۆستەچییەکەش دەڵێم ڕاوەستێت تاوەڵامەکەی وەردەگرێتەوە.

– من لەو واقیعەدا هەم دڵخۆشبووم وهەم مەلولیش، جگەلەمانەش من بەتەمەنتربووم لەتیە، پیاو ئەوژنانە بەهاوسەر هەڵدەبژێرن کەلەخۆیان کەم تەمەنترین.

– بەم شێوەیە نامەکەم بۆ تیە نووسی، بۆئەوەی بەقەڵەم مەبەستەکەی خۆم یەکلایی بکەمەوە، چونکە من ئەوگەنجە سوریەم خۆشدەویست ونەمدەتوانی هاوسەرێکیتر هەڵبژێرم، تەنها لەوکاتەدا نەبێت بۆم ساغبێتەوە کەتیە ڕازینییە ببێتە هاوسەرم، ئەوکاتەش دەمتوانی شوو بەپیاوێکیتر بکەم، بەمەرجێ جوانبا، چونکە کاڵ وتیە بۆ هەڵبژاردنی پیاو منیان سەختگیرکردبوو، ڕۆژی دواتر نامەکەی من بەهۆی پۆستی دەوڵەتەوە بەرەو سوریا براو لەکۆشکی پاشایەتیدا وەك جاران سەرقاڵی کارەکانی وێ بوومەوە، کلیۆپاتراش وەك جاران لەژووری تەنیشت ژوورەکەی خۆیدا دانیامەوە، بۆئەوەی هەرکاتێ بیەوێت بانگم بکات.

– چەند ڕۆژێك بەسەرچوو لەنامەکە، من مەسەلەی نامەکەم بیرچووبۆوە، نەك لەبەرئەوەی تیەم خۆشنەدەویست، بەڵکو لەوەدڵنیابووم کەتیە وەڵامێکی خراپ دەداتەوەو ڕازی نابێت ودەست لەکەس وکارو نیشتمانەکەی هەڵناگرێت وبێت بۆ میسر، تالەگەڵ ژنێکی وەك مندا کەلەوگەورەترم ببێت بەهاوسەر، بەڵام کاتێ پۆستەچییەکەی دەوڵەت لەسوریا گەڕایەوە، کلیۆپاترا بانگی منی کردوو گوتی: ئەو پیاوەی کەتۆ دەتویست شووی پێ بکەیت، وەڵامی داویتەوە.

– من خیرەتم نەدەهێنا ئەو وەڵامەی کەکلیۆپاترا بەرەو منی ڕاداشتبوو، لەدەستی وەربگرم.

- شاژنی میسر گوتی: نامەکەم لێوەرگرە بیخوێنەوەو پێم بڵێ چی گووتووە؟

- منیش نووسراوە بچوکەکەم لەدەست شاژنی میسر وەرگرت وکردمەوە، تیە نووسیبووی من دوای گەڕانەوەم لەمیسر بۆ سوریا پێیانگوتم دایکم مردووە، ئەمە زۆر ناڕەحەتی کردبووم، بەڵام کەنامەکەی منی خوێندۆتەوەو باسی شوکردنی منی تێدابووە، بۆئەو بۆتەمایەی خۆشحاڵی، لەکۆتاییدا نووسبووی من دوای سێ ڕۆژیتر بەکەشتی لە سەیداوە دێم بۆئەسکەندەرییەو دەتکەم بەهاوسەری خۆم، ناوەڕۆکی نامەکەی تیە منی دڵشادکرد چونکە لەنامەکەیدا باسی پەیوەندییەکانی نێوان من وخۆی نەکردبوو کەماوەیەك لەئوتێلی سووردا پێکەوە بەسەرمانبرد، وەك ئەوەوابوو پێشبینی ئەوەی کردبێت، ئەونامەی بۆم دەنوسێت، دەگاتە دەستی شاژن ونابێ ناوەڕۆکی نامەکە ببێتە مایەی هەراسانبوونی من.

- شاژنی میسر لەمنی پرسی: نامەکەت خوێندەوە؟ لەوەڵام دانەوەی ئەوپیاوە گەیشتی؟

- منیش نامەکەم دایە دەستی کلیۆپاتراو ئەو گوتی: دوای ئەوەی ئەوگەنجەهات وبوو بەهاوسەرت، من ئیشێك بەئەو دەدەم، تانیشتەجێی ئەسکەندەریەبێت ولێرە نەڕوات، تاتۆ بەردەوام لەخزمەت مندابیت.

- گوتم: بەڵێ خاتوونەکەم، ئەو زمانی ئێمە دەزانێت.

- لەوکاتەی کەبیرم لەخۆم دەکردەوەو سەرقاڵی ئایندەی خۆم بووم، هۆشم لای ئەوکوڕە ڕەشە سودانییەی کەلەڕێگای پەرستگای دلفدا لەخزمەتمدابوو ولەبرسەتیدا دەیناڵاند، چاوەڕوانی هەلێکبووم ئەو بهێنم بۆئەسکەندەریەو یەکێك لەدەوڵەمەندەکان ڕازی بکەم ئەویکڕێت بۆ ئەسکەندەریەی بێنێ و ئەونۆکەرە سودانییە، کەلەدنیادا تاکە ئارەزووی تێرخواردنە، خواردنی تێر بخوات.

- ڕۆژێکیان لەناو کۆشکدا گوێبیستبووم ئەرسینۆهە خوشکی کلیۆپاترا، یەکێك لەخزمەتکارەکانی مردووەو دەیەوێت نۆکەرێك بکڕێت، منیش یەکسەر چووم بۆلای ئەو وگوتم: ئەی خاتوونەکەم ئەگەر تۆدەتەوێت یەك خزمەتکاربگڕیت من دەتوانم نۆکەرێکت بۆبکڕم کەلەبازاڕی ئەم شارەدا، دەست نەکەوێت.

- ئەرسینۆهە پرسی: خەڵکی کوێیە؟

- گوتم: خەڵکی سودانەو گەنجێکی باڵابەرزی ڕەنگ خورمایی تێرە، هەرکاتێ تۆ ویستت بیکڕیت پاش شەش ڕۆژ دەگاتە لای تۆ.

- ئەرسینۆهە گوتی: بۆ ئەو نۆکەرە لەئەسکەندەریە نییە؟

- گوتم: نا، خاتوونەکەم ئەو لەشوێنێکدایە کەزێکانی نیل لەوێدا بەچەند بەشێکدا دابەش دەبن ودلتای نیل لەوێوە سەرچاوە دەگرێت.

- ئەرسینۆهە گوتی: نرخی ئەو نۆکەرە چەندە؟

- پێش ئەوەی لەوکوڕە خزمەتکارە جیاببمەوە، لێم پرسی بوو خاوەنەکەی بەدووسەد بەتلیمۆس دەیفرۆشێ.

- ئەرسینۆهە گوتی: ئەگەر نرخی ئەو نۆکەرە سودانییە دووسەد بەتلیمۆس بێت ،ئەوا باشە.

- گوتم خاتوونەکەم، نرخی خزمەتکاران لەشوێنەکانی تری میسردا زۆر کەمە، بەبەراورد لەگەڵ ئەسکەندەریەدا، بەتایبەت کەئەو نۆکەرە زۆر خۆربێت.

- ئەرسینۆهە گوتی: بۆ ئەونۆکەرەی تۆ دەتەوێت بۆمنی بکڕیت، زۆرخۆرە؟

– گوتم: ئەوە لەبەرچاوی یەك دەسەلاتداری ناوچەیەك کەبەخیلیشبێت زۆرخۆرە، ئاغاکەی پێیوایە ئەوبەلایەکی ئاسمانییە، بەلام هەمان خزمەتکار لەکۆشکی تۆ وخوشکەکەتدا بەزۆر خواردنەکەی خزمەتێکی گەورەدەکات، چونکە هەموو ڕۆژێ لێرەوە چەند بەرماو فڕێ دەدەنەدەرێ ودەیخەنە ڕووباری نیلەوە، ئەمەش ئەرك وزەحمەتی هەیە، بەلام هەرکاتێ تۆ ئەوخزمەتکارە سودانییە بکڕیت، جگەلەوەی دەبێ کاروباری خزمەتکاریبکات بەشێکیش لەبەرماوەی کۆشکی پاشایەتی دەخوات وزەحمەتی ڕشتنی ئەو بەرماوەیە کەمدەبێتەوە.

– ئەرسینۆهە: پێکەنی وگوتی: ئەگەر ئەو نۆکەرەی تۆ دەیلێیت باشبێت، کەس لەزۆر خۆری ئەو ناترسێت، ئینجا دووسەد بەتلیمۆسی لەدەستی من کرد، تائەو کوڕە خزمەتکارە سودانییەی بۆبکڕم.

– سەرەتا بیرم لەوەکردەوە پارەکە بۆحوکمڕانەکە بنێرم وداوای لێبکەم نۆکەرەکە بنێرێت بۆئەسکەندەریە، بەلام دواتر گومانی ئەوەمکرد لەناردنی خزمەتکارەکە خاوەخاوبکات، چونکە بۆخۆشم نەمدەتوانی لەئەسکەندەریە بڕۆم، بەڕەزامەندی کلیۆپاتراو خوشکەکەی ئەرسینۆهە، یەکێك لەنۆکەرەکانی کۆشکی پاشایەتی بۆئەو مەبەستە نێردرا بۆماڵی حوکمڕانەکەو نامەیەکیشم پێداناردو داوام لێکردبوو کەخزمەتکارەکەی بفرۆشێت ولەگەڵ هەڵگری نامەکەدا بۆئەسکەندەریەی بنێرێت، ئەو تەتەرە ڕۆیشتوو دوای حەوت ڕۆژ گەڕایەوەو خزمەتکارە سودانییەکەی لەگەڵخۆیدا هێنا.

– ئەرسینۆهە دوای ئەوەی خزمەتکارە سودانییەکەی دیت، ئەوی پەسەندکرد، پاش چەند ڕۆژێك بەمنی گوت بەپێچەوانەی ئەوەی گوتت، ئەوخزمەتکارە زۆرخۆر نییە.

– گوتم: زۆرخۆری ئەو لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کەلەماڵی ئاغاکەی پێشوویدا بەردەوام برسی بووەو هەمیشە لەبیری ئەوەدابووە چۆن سکی خۆی تێربکات، بۆیە بەردەوام هەستی بەبرسیەتی کردووە، چونکە کاتێ مرۆڤ لەشتێك بێبەشبکەن بەردەوام خەریکی بەدەستهێنانی ئەودەبێت، بەلام لێرە هەمووجۆرە خواردنێك هەیەو چەندی بوێت دەتوانێ بیخوات وکەسیش ڕێگای لێناگرێت، بۆیە ئیشتیای شکاوە، باشترین ڕێگاچارە بۆکەسانی چڵێس ئەوەیە لێیانگەڕێن چیانبوێ بیخۆن، هەرکە هەستیانکرد کەس بەریانپێناگرێت نەوسی ئەوان بۆخواردن کەمدەبێتەوە.

دە ڕۆژ پاشئەوەی نامەکەی تیە بەمن گەیشت، خۆیشی گەیشتە ئەسکەندەریە، بەلام نەهات بۆکۆشکی پاشایەتی ولەئوتێلی سوردا ژوورێکی گرت وشاگردێکی نارد بۆکۆشك، بۆئەوەی گەیشتنی خۆی بەمن ڕابگەیەنێت.

من وامزانی تیە شەرمی کردووەبێت بۆکۆشك – یان لەوەترساوە ڕێگای پێنەدەن بێتەکۆشکی پاشایەتییەوە.

هەستمکرد باش نییە بچم بۆمیوانخانەی سور، باشتروایە تیە بێت بۆکۆشکی پاشایەتی – یان ئەوەتا من لەشوێنێکیتردا ئەوبیبینم، ئەوەبوو نامەیەکم بۆ نووسی وبەیەکێك لەخزمەتکارەکانی کۆشکدا بۆم ناردو لەونامەیەدا گوتبووم، تۆ لەمیوانخانەی سوور مەمێنەو بچۆ لەشوێنێکی شاردا خانوێ بەکرێ بگرە، ئەگەر ناشتوانیت کرێکەی بدەیت ئەوا کرێکەی لەئەستۆی من، هەروەها من بەپەسەندی نازانم تۆ لەمیوانخانەی سووردا ببینم.

تیەش بەهەمان ئەوخزمەتکارەی کەمن ناردبووم، بەسەر زارەکی پێی گوتبوو بەپێی قسەکەی ئەودەکەم، خانوویەك بەكرێ دەگرم، پاش دوو ڕۆژ لەلایەن تیەوە پەیامێك بۆمن هات وتێیدا نووسیبوو، من خانوویکم بەکرێگرتووە، ئەو خزمەتکاەی کۆشك کەنامەکەی بۆهێنام، گوتی من بەخانووەکەی دەزانم، هەرکاتێك بتەوێت نیشانت دەدەم، داوام لەکلیۆپاتراکرد دووسەعات مۆڵەتم بدات، لەگەڵ ئەوخزمەتکارەدا بۆلای تیە بچم، دواتر بەرێگاکەوتین وکاتێ سەیرم کرد ئێمە بەشەقامێکدا دەڕۆین کەمن ئاشناییم لەگەڵیدا هەیە، دواتر چووینە کۆڵانێك وخزمەتکارە ڕێنماییکەرەکە لەبەردەم دەرگایەکدا ڕاوەستا، کاتێ دەرگای خانووەکە کرایەوە، زانیم ئەوماڵە هەمان ئەوخانووەیە کەڕۆژگارێ ماڵی کاڵ بوو، چونکە خانووی نابراو گەورەنەبوو، تەنها سەڵتە- یان تەنها دووکەسبان ئەوێیان بەکرێدەگرت، بۆیە هەربە بەتاڵی مابۆوە، کاتێ گەیشتمە ماڵەکە تیەم بینی، دیتم ئەو وەکجاران جوانەو ڕەنگوڕووی نەگۆڕاوە، لەوکاتەدا نەدەکرا بۆی بگێڕمەوە، دوای ئەوی ئەوم جێهێشتبوو، چووم بۆپەرستگای دلف، چیم لێبەسەرهات ومن لەئەو سکپڕبووم، تەنها ئەوەم گوت، خاتوونەکەی من کلیۆپاترا ڕازییە من وتۆ ببین بەهاوسەر، بۆئەوەی لەشازنیش دوورنەکەومەوە، کارێك بەتۆ دەدات لەئەسکەندەریە- یان لەکۆشکی پاشایەتیدا بیکەیت، تۆلێرە بمێنەوە هەتا من وەڵامت لێدەگێڕمەوە.

– دوای ئەوەی لەلای تیە گەڕامەوە، بەکلیۆپاترام گوت: ئەوپیاوەی کەدەبێتە مێردی من، گەیشتۆتە ئەسکەندەرییە.

– کلیۆپاترا گوتی: من دەمەوێت کارێکی پێبسپێرم، وەڵامی بۆبنێرە باسەی بێت ببینم.

ڕۆژی دواتر تیە هات بۆکۆشکی پاشایەتی ومن ئەوم بۆلای کلیۆپاترا بردو ئەو لەتیە خوردبۆوەو بەمنی گوت: شرمیون لەوباوەڕەدا نەبووم مێردەکەت ئەوەندە گەنجبێت، من حەزدەکەم لەم کۆشکەدا کارێکی پێبدەم، دواتر لەتیەی پرسی تۆ دەتوانیت چ کارێك بکەیت وحەزت لە چ ئیشێکە؟

– مێردەکەم گوتی: من موزایککارم وشارەزاییم لەوئیشەدا هەیە.

– کلیۆپاترا گوتی: من تۆ بەمۆزایککاری کۆشکی پاشایەتی دادەنێم، هەرکاتێ مۆزایکەکانی کۆشك پێویستییان بەچاککردنەوە- یان گۆڕین بوو، تۆ چاکیان بکەرەوە، دەنا ڕۆژەکانیتر کاتەکانی خۆت بەبێ کاری بەسەربەرە.

– تیە گوتی: ئەی خاتوونی مەزن، من لەسەرکارکردن ڕاهاتووم ناتوانم بەبێ کاری دانیشم، لەو ڕۆژانەی کەخەریکی مۆزایك دانان نیم، کارێکم پێبدە تابێکارنەبم.

– کلیۆپاترا گوتی: جگەلە مۆزایك دانان چ کارێکیتر دەزانیت؟

– تیە گوتی: ماوەی پێنج ساڵ لەڕۆمدابووم و زمانی ڕۆمی بەباشی دەزانم.

– کلیۆپاترا گوتی: ئایا دەتوانی بەزمانی ڕۆمی قسەبکەیت وبنووسی وبخوێنیتەوە؟

– تیە گوتی: ئەی خاتوونەکەم دەتوانم، زمانی ڕۆمی بەباشی قسەپێبکەم ودەشتوانم بیخوێنمەوەش- لەنووسیندا زۆر باشنیم، ناتوانم چۆن قسەی پێدەکەم ئاواش بنووسم.

– کلیۆپاترا کەزمانی ڕۆمی دەزانی هەندێ لەگەڵ تیەدا قسەی کردن وگوتی تۆ زمانی ڕۆمی باش دەزانی، ئەوەندەش بەسە بۆفێرکردنی منداڵەکانی ناوکۆشك، چونکە منداڵەکان تەنها پێویستە

سەرەتایەك لەزمانی رۆمی فێربن وبتوانن بەئەلف وبێی ئەوزمانە فێربکرێن، تۆش بەوشارەزاییەی کەلەزمانی رۆمیدا هەتە، دەتوانی خزمەت بەومندالأنە بکەیت؟

رۆژی دواتر تیە بووبە مێردی من، شاژنی میسر فەرمانی دەرکرد لەناو کۆشکی پاشایەتیدا شوێنێکی تایبەت بەئێمە بدەن، بەمەرجێ لەکاتی رۆژدا من لەمێردەکەم جیاببمەوەو بچمەلای شاژن، بەرۆژیش ئەومالەی ئێمە کەلەهۆدەیەکدا بوو دەبوو بەقوتابخانە.

دوای بەهاوسەربوونمان، من بەسەرهاتەکەی رابردووم بۆ تیە گێرایەوەو بەئەوم گوت چۆنچۆنی دوای رۆیشتنی ئەو ناچاربووم کۆرپەکە لەبەرخۆم بچوێنم، بەلاّم نەمگوت منداڵەکەم لەمردووخانەکەدا لەبارخۆم بردووە، چونکە ئەگەر ئەوەم گوتبا تیە رقی لێمدەبۆوە.

– کاتێ تیە زانی ئەومنداڵەی کەلەپشتی خۆی بووە لەبەرچوێندراوە، غەمگین بوو وگوتی: ئەگەر بەمنت گوتبا توشی ئەم رووداوە نەدەبوویتەوە.

– پێم گوت: چۆنچۆنی دەمتوانی بەتۆ بڵێم لەتۆ سکمپربووە؟

– تیە گوتی: تۆ دەتزانی دانیشتوی شاری سەیدام، دەتتوانی نامەیەکم بۆبنووسی وبڵێیت من لەتۆ سکپربووم، بێ دواکەوتن لەسوریاوە بەرێ دەکەوتم ودەهاتم بۆ ئێرەو دەمگواستییەوە، ئەوکاتە تۆناچارنەدەبووی منداڵەکەت لەبەرخۆت بچوێنی.

– گوتم: تیە من کەنامەم بۆ تۆ ناردبا بێیت بۆئەسکەندەریەو گوتبام لەتۆ سکپربووم، نەدەهاتی، چونکە تاقیکراوەتەوە کاتێ پیاوێکی گەنج ژنێك سکپردەکات ودواتر دەچێتەوە بۆنیشتمانەکەی، ئەگەر بزانێت ئەو ژنە لەئەو وەبەرهاتووە، گوێی پێنادات، هەتا لەشارەکەی ئێمەشدا کاتێ پیاوێك ژنێك کەمێردی ئەونییە، سکپردەکات، ئامادە نییە بەرپرسیارێتی باوکایەتی لەئەستۆبگرێت، چونکە دەبێ نانی منداڵەکە بدات وگەورەی بکات، ئەمەش کارێکە هەتا ئەوانەی منداڵی شەرعیشیان هەیە، خۆیان ناخەنەژێر ئەوبارەوە، لەبەرئەوە دەترسام بەتۆ بڵێم ونامەت بۆبنووسم، وامدەزانی تۆ بەرپرسیارێتی منداڵەکەت لەئەستۆ ناگریت، هەروەها کلیۆپاتراش لەنامەکەی من ئاگاداردەبۆوە.

– تیە بەسورسورماوییەوە پرسی: چۆن کلیۆپاترا بەنامەکەی تۆی دەزانی؟

– گوتم: ئەگەر بەکەس نەڵێیت ئەوا پێتدەڵێم، ئەونامانەی لەئەسکەندەریەوە بۆ دەرەوە دەنێردرێن، لەلایەن پۆلیسەوە سەیر دەکرێن ودەخوێندرێنەوە– یان لێپرسراوەکانی کەشتییەکان ئەوکارە دەکەن کەمیسریین.

– تیە گوتی: ئەوەم نەدەزانی، ئایا لەم ولأتەدا بەردەوام ئەونامانەی لەئەسکەندەریەوە دەنێردران، دەخوێندرانەوە؟

– گوتم: تەنها لەوکاتەی کەکلیۆپاترا بووبەشاژنی میسر، فەرمانی دەرکرد ئەونامانەی لەخاریجەوەدێت ولەئەسکەندەریەوە دەنێردرێن، بخوێندرێنەوە.

– تیە گوتی: کەواتە ئاگای لەنهێنی ژیانی هەر هەموو خەڵکە.

– خاتوونەکەی من گرنگی بەنهێنی ژیانی خەڵك نادات، حەزناکات بزانێت فلأن بازرگان چەندی قازانجکردووە– یان فلأن عاشق چی بۆ دوولبەرەکەی نووسیوە، ئەوتەنها دەیەوێت بزانێت ئەوکەسانەی لەئەسکەندەریەدان چ پەیوەندییەکیان بەولأتانی ترەوە هەیەو چۆنێتی پەیوەندییەکانیان چۆنە؟

– تیە گوتی: ئەگەرتۆ نامەکەت بۆ من نووسیباو گوتبات من لەتۆ سکپڕبووم و وەرە بۆئەسکەندەریەو ببە بەمێردی ڕەسمی من، تابەئاشکرا منداڵەکەم ببێت، ئەمە نەدەبووە ڕێگای سەرنجی کلیۆپاترا، چونکە ئەمە مەوزوعێکی تایبەتی بوو.

– گوتم تیە: ئەم مەسەلە تایبەتییە وەك مەسەلە تایبەتمەندییەکانیتر نییە، کاتێ کلیۆپاترا زانیبای بەبێ ڕەزامەندی ئەو لەگەڵ تۆدا دەستم تێکەڵاوکردووەو سکمپڕبووە، لێم تورەدەبوو، ئەگەر لەکۆشك دەری نەکردبام ،ئەوا نەمدەتوانی جارێکیتر ببمەوە کارەکەری نزیکی ئەو، بەڵام ئەمڕۆ وەك دەیبینی من کارەکەرێکی خۆشەویست ونزیکی ئەوم نەك هەر ڕازیبوو من شوو بکەم، بەڵکو ئیشیشی دایە تۆ تاکو لەئەسکەندەریە نەچیتەدەرێ ومنیش هەموو ڕۆژێ بچمەلای شاژن.

– جگەلە مەسەلەی دابینکردنی بژێوی، من لەمنداڵییەوە لەگەڵ کلیۆپاترادا گەورەبووەو ناتوانم لێی دووربکەومەوە، مەگەر بۆماوەیەکی دیاریکراو، کاتێ بیر لەوەدەکەمەوە، ڕۆژێ دێت لەکلیۆپاترا جیادەبمەوە، هەست بەبێ تۆتکەیی دەکەم، حەزدەکەم بەردەوام لەگەڵ ئەودابم، لەوڕۆژە بەدواوە ژیانی من وئەو، واتە من وتیە لەکۆشکی پاشایەتیدا بەرنامەیەکی داڕێژراوی وەرگرت، هەموو بەیانییەك من لەتیە جیادەبوومەوەو دەچووم بۆلای شاژنی میسر، دوای ئەوەی شەودادەهات کلیۆپاترا ئیزنی دەدام ودەیگوت شرمیون تۆ مێردت هەیە شەوانە دەبێ بچیتەوە لای مێردەکەت.

– تیە بەڕۆژ لەژووری ماڵەکەماندا، وانەی زمانی ڕۆمی بەمنداڵان دەگوتەوە، من گوێم لێدەبوو کەهەندێ لەمنداڵەکان دەیانتوانی چەند وشەیەك بەڕۆمی بڵێن.

– ڕۆژێکیان کلیۆپاترا بانگی ئیەی کردو پێی گوت هەندێ لەمۆزایکی کۆشك خراپبوون تۆ لەبەیانییەوە وەرە بەشەکەی من وەمەڕمەڕکاری بکە، تائەوکاتەی تۆخەریکی مەڕمەڕکردنی، گوتنەوەی وانەی زمانی ڕۆمی ڕاگرە، ڕۆژی دواتر تیە بەدڵخۆشییەوە چوو بۆ مۆزایك دانانەکە.

– من لەمەوبەر گوتم: تیە گەنجێکبوو قەدباریك ومووی خورمایی کەوتبوونەسەر شانەکانی وسەروچاوێکی باریك و درێژو سپی وچاوی گەورەو برژانگی درێژو زەردەخەنەی بەردەوامی ئەوگەنجە خۆشەویستی نیشاندەدا.

ئەو شوێنەی کەدەبوا مێردەکەی من کاری تێدابکات، جێگایەکی بەلاوەبوو ومن کارم نەدەکەوتە ئەوشوێنە، مەگەر شاژنی میسر گوتبای بچۆ بۆئەوێ.

– ڕۆژی دواتر کلیۆپاترا بانگی منی کردوو گوتی: هەرئێستا ئەونامەیە ببەبۆ لێپرسراوی بەندەرو یەکێك لەخزمەتکارەکانیش لەگەڵ خۆتدا ببە تالەخزمەتتدابێت وببێتە جەڵەوگری وەڵاخەکەت، ئینجا بگەڕێرەوە، پێویستە ئەوە بڵێم من چەندجارێك نامەی کلیۆپاترام بۆ لێپرسراوی بەندەر بردووە، هەرکاتێ شاژنی میسر ویستبای سواری کەشتییەکەی خۆی بێت، من نامەیەکم لەئەوەوە بۆ لێپرسراوی بەندەر دەبرد، بۆیە بردنی نامە بەلای منەوە شتێکی تازەنەبوو، بەڵام لەو ڕۆژەدا هەستمکرد شاژنی میسر دەیەوێت من لەکۆشکی پاشایەتی دوور بخاتەوە، نامەکەم بردوو دامە لێپرسراوی بەندەرو وەڵامەکەشم وەرگرتەوەو گەڕامەوە. کەگەڕامەوە تیە هەرخەریکی کارکردنبوو، من ئەوم نەبینی تەنها ئەوکاتەنەبێت کەشەوداهات وکلیۆپاترا ئیزنیدام، هەرکە گەیشتمە ماڵەکەمان، پێشئەوەی تیە ورتەبکات لەوەزعی ئەو گەیشتم کەشتێك ڕوویداوە.

– لێم پرسی چییە کەوتویتە بیرکردنەوە؟

– تیە گوتی: لەبەرئەوەی ئەمڕۆ دوای ئەوەی چوومە بەشەکەی کۆشکی کلیۆپاتراو دەستمکرد بەکارکردن، بینیم شاژنی میسر خۆی لەمن نزیک دەکاتەوەو ماوەیەك سەبارەت بەکاری وابەستە بەمۆزایك پرسیاری لێکردم، دواتر چووەناو باسی ترەوەو لەمنی پرسی پەیوەندی من لەگەڵ تۆدا چۆنە؟

– من لە تیەم پرسی: چیت وەڵام دایەوە؟

– تیە گوتی: من گوتم پەیوەندی من لەگەڵ شرمیوندا باشە، دواتر ئەو (کلیۆپاترا) گوتی تۆ بۆشرمیون بچوکیت چونکە تەمەنی تۆ لەهی شرمیون کەمترە، منیش گوتم خاتوونەکەم ڕاستە لەشرمیون بچوکترم، کلیۆپاتراش گوتی جگەلەوەی کەتۆ لەشرمیون بچوکتری، تۆ بۆئەو زۆرجوانی ئەودەبوا شووی بەپیاوێك کردبا بەقەت تۆجوان نەبوایە.

– من دوای ئەوەی ئەوقسانەم لەتیە گوێلێبوو، زۆر نارەحەت بووم ولە تیەم پرسی: مەبەستی کلیۆپاترا لەم پرسیارانە چی بوو؟ ئایا بەتۆی گوت پێویستە لەمن جیاببیتەوە؟

– تیە گوتی: نەخێر ئەو نەیدەویست من لەتۆ جیاببمەوە بەپێچەوانەوە گوتی: واچاکە پێکەوە بژین تائەوبتوانێت من ببینێت.

– لێم پرسی: دواتر چی گوت؟

– تیە لەوەڵامدا گوتی: کلیۆپاترا پێی گوتم حەزدەکات هەموو ڕۆژێ لەبەشی کۆشکەکەی خۆیدا من ببینێت بەمەرجێ شرمیون لەوێ نەبێت، باش دەبوو کەشرمیون جارێکیتر چووبایەوە بۆپەرستگای دلف ونیازی گرتبایەوەو نیومانگ- یان مانگێك لێرە نەبا، ئەوکاتە هیچ بەربەستێك بۆبینینی تۆ نەدەما.

– چەند ساڵێك لەمەوبەر شاژنی میسر لەوەگەیشتبوو کەمن کاڵم خۆشدەوێت، بەڵام بێ ئەوەی حساب بۆهەستی من بکات کاڵی بۆکۆشکی پاشایەتی ڕاکێشکردو لەئەو سکپڕبوو، بەڵام ئەمجارەیان بۆئەوەی تیە بۆخۆی ڕاکێشبکات پارێزی دەکرد، چونکە دەیزانی تیە مێردی منە، بەڵام کاڵ مێردم نەبوو، من مافی ئەوەم نەبوو ڕێگریم لەبەردەم ئەو کارەی شاژنی میسر کەدۆستایەتی لەگەڵ کاڵدا پەیداکردوو دەستی لەگەڵ تێکەڵاوکرد، بەڵام سەبارەت بەتیە حەقم بەدەستبوو، نەمدەویست ئەوبکەوێتەداوی شاژنی میسرەوە، لەبەر ئەوەبوو کلیۆپاترا ئیحتیاتی دەکردوو دەیویست لەئەسکەندەریەم دووربخاتەوە.

– بەتیەم گوت: کلیۆپاترا ژنێکی بەئیرادەیە بڕیاری هەرشتێك بدات جێبەجێیدەکات، ئەگەر بیەوێت من لێرە دوور بخاتەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە- یان بۆ پەرستگای دلفم دەنێرێت- یان بۆ شوێنێکیتر.

– تیە گوتی: ئەگەر شاژنی میسر بەتۆ بڵێت بچۆ بۆپەرستگای دلف دەچیت- یان نا؟

– گوتم: من چارەم نییە کەبەڕووکەش فەرمانەکەی ئەو جێبەجێ بکەم، بەڵام بەکردەوە لەمشارە ناچمەدەرێ.

– تیە پرسی: ئەی بۆکوێ دەچیت؟

– گوتم: تۆ خانووێکت بەکرێ نەگرتبوو، من دەچم بۆئەوێ ولەوێدا دادەنیشم، ئەوکاتە کلیۆپاترا وادەزانێت لەمشارەدا نەماوم، تۆ مەڵێ کەمن لەئەسکەندەریەدام.

- تیە گوتی: زۆرباشە من بەئەو نالێم لەکوێی، ئەی ئەگەر کلیۆپاترا داوای لەمن کرد دەست لەتۆ شلکەم چی بکەم؟ لەبەرئەوەی ئەو ژنێکی سادەنییە، تابتوانم لەقسەی دەربچم، ئەوشاژنی میسرە ئەگەر لەمن ناڕازیبێت نەك هەرتەنها من، بەڵکو تۆش لەکۆشکی پاشایەتی دەردەکات.
- لەم قسەیە ترسام، چونکە زانیم تیە ڕاستدەکات، ئەو دەتوانێت تیە زیندانی بکات- یان فەرمانبدات بیکوژن.
- ئەگەر کلیۆپاترا مێردەکەمی زیندانی کردبام- یان کوشتبای، ئەویەکەمین شاژنی میسر نەبوو ئەمکارەی کردبێت، لەڕابردووشدا کۆمەڵێك لەشاژنەکانی میسر ئەمکارەیان کردبوو وهەرپیاوێکی منەی لەگەڵداکردبان- یان زیندانیان دەکرد- یان دەیانکوشت.
- من لەچارەنووسی خۆم زۆر ناڕازیبووم، چونکە هەرپیاوەی بوبایە جێگای سەرنجم، لەلایەن کلیۆپاتراوە قۆرخدەدرا، جاری یەکەم کالی لەمن برد، جاری دووەم دەیەوێت مێردەکەم ببات، لەوڕۆژەدا بەشێوەیەك هەستم بەڕق وکینە دەکرد لەبەرامبەر کلیۆپاترادا کەخەونەکەی ئەوم بەبیرهاتەوە، لێکدانەوەی ئەوخەونە ناوبراوە ئەوەبوو کلیۆپاترا بەدەستی من دەکوژرێت، من بیرم لەوەدەکردەوە ئەگەر ئەوژنە مێردەکەم لەدەستبدات، دوورنییە دەست بۆ کوشتنی ببەم.
ڕۆژی دواتر دوای ئەوەی چووم بۆلای شاژن، چاوەڕوانی ئەوەمدەکرد کارێکم پێبسپێرێت بۆئەوەی لەئەسکەندەریەم دووربخاتەوە، ئەگەری ئەوەهەبوو شاژن بەمن بڵێت، لەبەرئەوەی بەهۆی نیازگرتنەوەی تۆ لەپەرستگای دیان سکپڕبووم، ئێستاش نیازێکیتر بکەو بچۆبۆ پەرستگای دلف وماوەی پێنج شەو لەهۆڵی پارانەوەی ئەوپەرستگایەدا بپاڕێوە، تامن بەئیسراحەت منداڵەکەم ببێت، من بۆگەیشتنم بەپەرستگای دلف، دەبێ شەش ڕۆژ لەڕێگادابم تادەگەمێ، پێنج ڕۆژیش لەوپەرستگایەدا بمێنمەوەو شەش ڕۆژیش بۆگەڕانەوەم لەماوەی ئەم حەڤدە ڕۆژەدا کلیۆپاترا کاتی تەواوی دەبێت کەتیە هۆگری خۆی بکات ودوای ئەوەی من لەوسەفەرە گەڕامەوە، تیە تیەی من نامێنێت، بەڵام کلیۆپاترا ئەوفەرمانەی بەمن نەداو لەڕۆژی دواتریشدا هیچ ڕووینەدا، من لەوەگەیشتم شاژنی میسر لەبیرکردنەوەی ئەوەدایە.
هەموو شەوێ کەکلیۆپاترا ئیزنی دەدام ودەچوومەوەلای مێردەکەم، سەبارەت بەکلیۆپاترا لێمدەپرسی دەمویست بزانم ئایا شاژنی میسر خواستێکی لەمێردەکەم کردووە؟ بەڵام تیە دەیگوت ئەمڕۆ شاژنی میسر تەنها چەند ساتێك لەگەڵمدادوا- یان دەیگوت قسەی لەگەڵداکردم، بەڵام دەستی خۆم نەخستەسەر لێوەکانی، من زانیم ئەوەی بۆتەهۆی ئەوەی کلیۆپاترا لەمێردەکەی من دووربکاتەوە ئەوپێشهاتانەی دەرەکین، بەتایبەتی ڕووداوەکانی ڕۆم.
کلیۆپاترا زمانی ڕۆمی دەزانی، حەزی لەزانیاری وەرگرتن بوو لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆم، مێژووی ڕۆمی باش دەزانی، ئەو هەموو ناودارەکانی ڕۆمی دەناسی، دەیزانی دەسەڵاتداری دەوڵەت وشاعیران ونووسەران وڕاوێژکارانی ئێستای ڕۆم چ کەسانێکن، نەمدەزانی بەهۆی ئەوەوەبوو کەکلیۆپاترا زمانی ڕۆمی دەزانی- یان لەکانگای دڵییەوە میللەتی ئەو وڵاتەی خۆشدەویست، زۆرجار گوێم لەئەوبوو دەیگوت، میسر پێویستی بەیەك چاکسازی گەورەهەیە، ئەو چاکسازیەش سەرناگرێت کەقانونەکانی ڕۆمی لەمیسردا جێبەجێ نەکرێن، هەرکەسێك بڵێت ڕۆم، واتا قانون.

من نەمدەزانی بۆچی کلیۆپاترا یاساکانی ڕۆمی پێ لەھی میسر باشتربوون، بۆ میللەتی ڕۆم بەمیللەتێکی دیارو باڵا لەقەڵەمدەدات، من دەزانم ڕۆمییەکان بۆخۆیان ھیچیان نەبووە، ھەرچی دانایی ھەیە لەیۆنانییەکانیان وەرگرتووەو فێربوون، ئەژدادی کلیۆپاترا کەیۆنانی بوون، مەعریفەیان بەرەوپێشبردووەو ڕۆمییەکانیان کردۆتەخاوەن سەروەری و کەماڵ.

من خۆم نەفرەتم لەیاساکانی ڕۆمی بوو کەسەبارەت بەخزمەتکاران زۆر لەقانونەکانی میسری دیژوارتربوون، لەمیسردا خزمەتکارەکان بەناسۆری ومەینەتەوە دەژیان، بەڵام وەك مرۆڤ سەیریاندەکرا، کەچی لەڕۆمدا نۆکەرو کارەکەر وەك مرۆڤییان حساب بۆنەکردن ولەئاژەڵان لەخوارتر تێیان دەڕوانین.

لەمیسردا نۆکەرو خزمەتکار دەیانتوانی خۆیان بکڕنەوەو ئازادبن، من لەمیسردا زۆر لەمانەم دەناسی تەنانەت بۆ خۆشم کەببوونە خاوەن سامان، بەڵام قانونی ڕۆمی بەشێوەیەکبوو کۆیلەکان نەیاندەتوانی خۆیان بکڕنەوەو ئازادبن، تائەوڕۆژەی زیندووبان دەبوا ڕەنجیان بۆئاغاکانیان بردبا، ئەگەر سەرپێچی وھەڵەشیانکردبا سزای ئەوانیاندەدا– کەباسکردنی ئەوسزایانە موی لەشی مرۆڤ گرژدەکات، لەڕۆمدا نۆکەرەکانیان ناچاردەکرد لەسێرك وشانۆدا یەکتری بکوژن وناوی ئەوانەیان نابوو گلادیاتور، بەڵام لەمیسردا نۆکەرێکیان ناچارنەدەکرد لەسێرك وشانۆدا بەدەستی نۆکەرێکیتر بکوژرێت– یان کۆیلێکیتر بکوژرێت، ئەگەرچی لەسێرکی ئەسکەندەریەدا ئەو عەرەبانانەی کەچوار شێری پێوە دەبەسترایەوەو ڕکەبەریی دەکرد، جارجار عەرەبانچییەکان لەلایەن شێرەکانەوە پارچە پارچەدەکران ودەمردن، بەڵام ھیچ یەك لەمانە خزمەتکارنەبوون، وەك کاڵ خەڵکانی ئازادبوون.

لەڕۆمدا میللەت دوو چین بوون، یەکێکیان ڕۆمییەکان، واتا ئەرستۆکراتەکان وئەوی تریش خزمەتکاروکۆیلەکان بوون کەبەدرێژایی تەمەنی خۆیان زەحمەت ورەنجیاندەدا تائاغاکانیان بەخۆشی بژین، بەڵام لەمیسردا لەنێوان ئەرستۆکراتەکان وخزمەتکارو کۆیلەکاندا، چەند چینێکیتر ھەبوون، وەك جوتیاران وکرێکاران وکاسبکاران، باری کۆمەڵایەتی میسر لەھی ڕۆم باشتربوو، بەڵام من وای بۆدەچووم کلیۆپاترا کەبەشای میسر حسابدەکرا، بەتێڕوانینی ئەو قانونەکانی ڕۆم باشترین قانونی دنیایە، پەیوەندی بەخودی خۆوەیەتی نەك بەبەتلیموسی چواردەھەمەوە، ئەوشتەی ئێستا من بەیانمکرد شێوازی دەسەڵاتداریتی بەتلیموسی مێردی کلیۆپاتراو پاشای میسرە، گوتم بەتلیموس براومێردی کلیۆپاترابوو، بەڵام سەبارەت بەکاروبارەکانی میسر، بەقەت کلیۆپاترا دەسەڵاتی نەبوو، ھاوتای ئیرادەو لێوشاوەیی خوشکەکەی نەبوو، کلیۆپاترا خێرا بڕیاردەداو جێبەجێی دەکرد، لەکاروباری کۆمەڵایەتیدا زیاتر درکی بەشتەکان دەکرد، کاتێ کۆمەڵێك خەڵك توشی گرفتێك دەبوونەوەو دەھاتن بۆکۆشکی پاشایەتی وشکایەتیان دەکرد، بەتلیموس نەیدەتوانی باش تێبگات کەمیللەت چی دەڵێن، لەکاتێکا کلیۆپاترا دەیزانی دەردی ئەسلی خەڵکەکە چییە، بەوەی کەشاژن بوو وزۆرجار لەگەڵ خەڵك تێکەڵاوەتی دەکردوو لەکاروبارو کێشەکانی ئەوانی دەپرسی، بۆیەش میللەت کلیۆپاترایان لەبەتلیموس زیاتر دەناسی.

## چۆن ڕۆمییەکان ھاتن بۆ ئەسکەندەریە

بەتلیمۆس لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا تەمبەڵبوو کاری ئەمڕۆی بۆسبەی دوادەخست، بەڵام کلیۆپاترا هەرکارێك هاتبایەپێش لەهەمان ڕۆژدا ئەنجامیدەدا، پاشای میسر کاتێ کەدەیدیت کلیۆپاترا بەهەموو کارەکان ڕادەگات کاتەکانی خۆی بەڕاووشکارو کۆتربازی بەسەردەبرد، ئەوەندەی کۆتر هەبوون کەمن لەیادمە کۆشکی پاشایەتی ببوو بەکۆترخانەیەکی گەورەو هەموو ڕۆژێ بۆدانوودانی ئەوکۆترانە جەواڵێك هەرزن وگەنمیان دەهێنا بۆکۆشکی پاشایەتی وڕۆژی دواتر یەك دەنکی لێنەدەما.

من بەوی ئاگام لەنەخشە سیاسییەکانی کلیۆپاترا نەبوو، دەمزانی دەستێوەردانەکانی شاژن لەهەموو کاروبارەکان سەرەکی بوو وکلیۆپاترا لەبەرئەوە کاری پاشایەتی دەکرد بۆئەوەی خۆی بێنێتەپێش ومێردەکەی بخاتەلاوەو پەراوێزی بکات وجێگای ئەوبگرێتەوە، هەر واشبوو، هەرچەندە بەتلیمۆس پاشای میسربوو، بەڵام کلیۆپاترا دەسەڵاتداری ڕاستەقینە بوو.

لەنێوان خزمەتکارەکانی پاشادا یەکێك هەبوو بەناوی (پوتن) من لەوپیاوە دەترسام، چونکە هەستمدەکرد دڕندەترو بەدڕەوشتتر لەوپیاوە نییە، پوتن پیاوێکی باڵابەرزو چوارشانەبوو کۆسەبوو وکەمێ پشت کۆمابۆوە، بەوەی پیاوێکی سادەنەبوو، کاتێ منی دەبینی لێمخورد دەبۆوە، وەك ئەوەی عاشیقەی من بێت، هەرکاتێ بۆی دەرەخسا منی لەشوێنێکی چۆڵ بۆهەڵکەوێت، لێم نزیکدەبۆوەو بەپێکەنینەوە پەنجەکانی دەخستەسەر لێوەکانم ودەیگوت شرمیون بۆچی تۆ لەگەڵ مندا ڕێکناکەوی؟

منیش بەئەوم دەگوت دۆستایەتی کردنی من وتۆ کەڵکی نییە، تۆ ناتوانیت ببیە مێردی من، ئەوکات شوم بەتیە نەکردبوو، چونکە تۆ لێپرسراوی کاروبار کۆشکی، پوتن: لەوەڵامدا دەیگوت ئەگەر نەتوانم ببمە مێردی تۆ ئەواهەرنەبێ بایەك هاوپەیمانی بەهێزبم، تۆ نزیکترین کارەکەری شاژنی میسری، منیش نزیکترین ڕاوێژکاری مێردەکەی ئەوم، ئەگەر من وتۆ یەکبگرین، دەتوانین زۆرکار ئەنجامبدەین، بەڵام من دڵنیابووم ناوبراو کابرایەکی بێکەڵك وبوختانکەربوو وخۆم لەئەو دەپاراست، بەڵام ئەو زۆرکەڵکی لەوسەرافەتیکەریەی کۆشك وەردەگرت، لەمن نزیکدەبۆوە خۆی تێهەڵدەسویم دەستی بۆ دەهێنام وخۆی پێوەدەنام و...،

لەکۆشکی پاشایەتیدا، ئەوانە ئازادبوون لەقسەکردن لەگەڵ ژنانداو ڕۆیشتن بۆماڵەکانیان، پوتن کەڵکی لەوئازادییە وەردەگرت و لەژنان نزیکدەبۆوە، لەوانەش من.

ڕۆژێکیان پوتن بەپێیگوتم شرمیون ئەگەر تۆ لەگەڵمندا ڕێکبکەویت، من تۆ دەگەیەنمە پلەوپایەی بەرز، هەتا لەوانەیە بتکەم بەشاژنی میسریش، ئەو گوتی تۆکارەکەرێکی سادەنیت وزۆر جیاوازیت لەگەڵ کارەکەرەکانیترداهەیە، جگەلەوەی جوانی، خوێندەواریشت هەیە، ئەگەر ڕۆژێك کلیۆپاترا بمرێت من کەلای پاشای میسر زۆر ئیعتبارم هەیە، دەتوانم تۆبکەم بەهاوسەری ئەو و ببیت بەشاژنی میسر.

– گوتم: گریمان ڕۆژێ هات کلیۆپاترامرد، ئەرسینۆهە خوشکەکەی کلیۆپاترا دەبێتە ژنی پاشا.

– پوتن گوتی: پاشای میسر وەك چۆن حەزی لەچارەی کلیۆپاترا نییە ئاواش خوشکەکەی ئەرسینۆهەی خۆشناوێت وزەوقی پێنایەت، بەڵام ژنێکی بێگانە دەبێتەجێگا سەرنجی ئەو ومن تۆ بەشایستەی هاوسەرێتی ئەو دەزانم.

من دڵنیابووم ئەو پیاوە (پوتن) کەچاوشین بوون ولوتی وەك قەڵانگبوو، درۆی دەکرد، من دەمزانی لەمێژووی بەتالیسەکاندا زۆر ڕووداوی سەیروسەمەرە ڕوویداوە، بەڵام هەرگیز کارەکەرێك نەگەیشتۆتە پلەی شاژنی، چونکە ئەگەر پاشای میسر بیەوێت لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرێت کەکارەکەرە، ئەو لەخاوەنەکەی دەکڕێت، پێویست بەوەناکات بۆگەیشتن بەئەو بیکات بەشاژن.

پوتن بەوپەیمانە درۆو خەیاڵییە دەیویست من فریوبدات وملکەچمبکات بەوەی نەخشەکانی ئەو جێبەجێبکەم.

منیش بە قسەکانی ئەو هەڵنەدەخەڵەتام،

ئەگەر پوتن نەبایە ئەوا کلیۆپاترا بەبێ دەردەسەری دەبووە پاشای واقیعی میسر، بەڵام پوتن نەیدەهێشت بەتلیمۆسی چواردەهەم تۆتکە بگرێت وبەردەوام هانی ئەویدەدا دژی کلیۆپاترابێت، تائەوکاتەی بەتلیموسی چواردەهەم گەنجبوو ودوورزمانی وهاندانەکانی پۆتن کاری لەپاشا نەکرد، بەڵام دوای ئەوەی گەورەبوو کەوتەژێر کاریگەری قسەکانی پوتن، تاگەیشتە ئەوەی کلیۆپاترا گومانی ئەوەی پەیداکرد براکەی کەمێردیشی بوو، دەست بۆ کوشتنی ببات.

لەزنجیرەی شانشینی بەتالیسەکان لەمیسر، کوشتنی خوشك بەدەستی براو کوشتنی برا بەدەستی خوشك ورۆڵە بەدەستی باوك، شتێکی بێپێشینە نەبوو. بەتلیمۆسی سێزدەهەم ناسراو بەشمشاڵ ژەن-باوکی کلیۆپاترا، فەرمانیدا لەبەرچاوی خۆی سەری کچەکەی کەناوی (برنزی) بوو بڕن ولەلەشی جیابکەنەوە، چونکە ئەوکاتەی بەتلیمۆسی سێزدەهەم بۆ ڕۆم سەفەری کردبوو وئەو سەفەرە درێژەی کێشابوو وئەوکچە تاجی پاشایەتی لەسەرنابوو وخۆی بەپاشای میسر ناساندبوو.

من زانیم لەم ڕۆژانەدا کلیۆپاترا سەرقاڵی لەشکرەکەی خۆی بوو، وەك لەمەوبەر گوتم کلیۆپاترا فەرماندەی بەهێزترین لەشکربوو بەناوی ئەسکەندەر، خەریکی پۆشاککردن ودابینکردنی کەموکوڕی سەربازەکانی بوو، لەهەمان ئەوکاتانەی کەسەرقاڵی ڕێکخستنەوەی لەشکرەکەی بوو، هەواڵەکانی ڕۆمیشی وەردەگرتن، هەموو ڕۆژێ لەڕۆمەوە کەشتی دەهاتن بۆ ئەسکەندەریەو کلیۆپاتراش لەڕێگای لێپرسراوانی کەشتییەکانی میسری کەئەو هەواڵەیان بەلێپرسراوی بەندەر دەگوت ودەگەیشتنە کلیۆپاترا، من دەمزانی ڕۆمییەکان بەردەوام دەیانویست میسر داگیربکەن وبیکەنە یەکێك لەولایەتەکانی ڕۆم، زۆرجار وڵاتی میسر لەژێر چاودێری وڵاتی ڕۆمدابووە، لەسەردەمی پاشایەتی بەتلیمۆسی سێزدەهەم، کەکاری ئەسڵی شمشاڵ لێدانبوو، ئەو بەیاریدەی ڕۆمییەکان توانی بگەڕێتەوە میسرو تاجی پاشایەتی لەسەری کچەکەی (برنزی) داگرێت ولەبەرچاوی خۆی سەری لەلەشی جیابکرێتەوە، ئەوەشم دەزانی لەڕۆمدا کۆمەڵێ پیاوی سیاسی وسەربازی لەژێر ناوی بەرژەوەندی باڵای ڕۆم دەیانویست میسر لەگەڵ وڵاتی ڕۆمدا یەکبگرێت، بەڵام لەناوەڕۆکدا دەیانویست باخەڵەکانی خۆیان پڕبکەن، چونکە دەیانزانی میسر دەوڵەمەندترین وڵاتی دنیایە، تەنها داهاتی بەندەری ئەسکەندەریەو دووشوێنی ڕابواردنی گشتی پایتەختی میسر، بەرامبەرە بەپازدە- یان بیست ساڵ خەرجی ڕۆم، لەنێوان پیاوانی سیاسی وسەربازی ڕۆم لەوکاتەی ناکۆکی کەوتبووە نێوان کلیۆپاتراو مێردەکەی، ناوی دووکەس زۆردەهات وباسیان لێدەکرا، کەیەکێك لەوناوانە پومپە بوو وئەوی تریشیان سیزار بوو، پێش ئەو مێژووەش من ناوی تری هەندێکیانم بیستبوو، بەڵام ئەگەربمەوێت ناوی هەموو پیاوانی سیاسی

وسەربازی ڕۆم بێنم کەلەمیسردا ناسراون، ئەوا کاتی زۆردەوێت ولەباسکردنی خۆم وکلیۆپاترا دەچینەدەرێ ولادەدەین، چونکە ئەم سەرگوزەشتەیە بۆیە دەگێڕمەوە کەڕووداو پێشهاتەکانی ژیانی من وهەروەها ژیانی خاتوونەکەم کلیۆپاترا بمێنێتەوەو لەئایندەدا خەڵك بتوانێت لەڕێگای ئەم سەرگوزەشتەوە پەی بەڕاستییەکان ببات وبەسەر گوزەشتەی تری ئەفسانەیی فریونەخوات، چونکە من پێشبینی ئەوەدەکەم هەروەك چۆن بەسەرهاتی کۆنیان تێکەڵ بەئەفسانە کردوون، بەسەرهاتی کلیۆپاتراش تێکەڵ بەئەفسانە دەکەن، بەڵام ئەگەر ئەم سەرگوزەشتەیە بمێنێتەوە ئەواهیچ هەڵەیەکی مێژوویی وئەفسانەی تێدانییە، پومپەو سیزار پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکتریدا باشبوو، لەسەرئەوە ڕێککەوتبوون پێکەوە ولاتی ڕۆم بەڕێوەببەن، بەڵام لەهەمان ساڵدا ناکۆکی توندتر کەوتە نێوان کلیۆپاتراو براکەی واتە لەساڵی دوو سەدو هەشتاو سێ، دوای دروستبوونی شاری ئەسکەندەریە.

لەناوچەیەکدا کەپێیاندەگوت (فارسال) شەڕ لەنێوان سیزارو پومپەدا بەرپابوو وسیزار سەرکەوت، هۆی شەڕی نێوان سیزارو پومپە ئەوەبوو بەردەوام پیاوە سیاسی وسەربازییەکان بەیەك هەڵدەپژان ولەجەنگدابوون، واتا پێویستی بەیەکلایی کردنەوەی دەسەڵاتبوو، سیزار دەیویست دەسەڵاتی ڕەهای هەبێت، پومپەش هەمان ئامانجی هەبوو وسەرئەنجام ناکۆکی کەوتەنێوان ئەودووانە، ئەگەر مێژوو نووسێك بیەوێت هۆکارەکانی ئەوناکۆکییە بنووسێت دەبێت سەد لاپەڕەی وەك ئەوەی ئێستا من دەینووییسم بنووسێت، دەبێ باس لەپەرلەمانی ڕۆم وئەنجومەنی پیران و ئەشرافەکان بکات، بەڵام سەرئەنجامی ئەو ڕووداوانەی ڕۆم هەر ئەمەیە کەمن لەسەرزاری کلیۆپاتراوە بیستوومەو کلیۆپاتراش لەزاری سیزاریەوە گوێلێبووە کەگوتویەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بۆمن وپومپە بچوکبوو، ئێمە هەردووکمان نەماندەتوانی لەگەورەترین ئیمپراتۆریەتی دنیادا بژین، دەبوا- یان پومپە بکوژرێت- یان من، ئەوەبوو پومپە تێداچوو.

لەوکاتەی هەواڵی تێشکانی پومپە لەسەردەستی سیزار گەیشتە میسر، بەتلیمۆسی چواردەهەم بەپێی ڕێنماییەکانی دەمڕاستەکەی خۆی پوتن، بڕیاریدا خوشکەکەی کلیۆپاترا بکوژێت، بەهانەی پاشای میسر ئەوەبوو کەدەیگوت من تەنها ساڵێك لەگەڵ کلیۆپاترادا ئەرکی ژن ومێردایەتیم کردووە، بۆیە ئەومنداڵەی لەسکی ئەودایە منداڵی من نییە بیژوویە، بەڵام هۆکاری ئەسڵی نەخشەکێشان بۆکوشتنی کلیۆپاترا ئەوەبوو شای میسر بەهۆی چونە بنکلێشەو دەندە دەندەکانی پوتن، ئرەرەیی بەکلیۆپاترا دەبرد، چونکە کلیۆپاترا ببووە شای ڕاستەقینەی میسرو خەڵك ئەوەندەی وئەویان دەناسی وپەنایان بۆ دەهێناو دەهاتنەلای، ئەوەندە شایان نەدەناسی ونەدەهاتنەلای بۆچارەسەرکردنی کێشەکانیان، ئەوشەوەی پاشای میسر بڕیاریدا خوشکەکەی بکوژێت، کلیۆپاترا لەکۆشکی پاشایەتیدا نەبوو، سێ ڕۆژیش پێشئەو مێژووە پاشای میسر بەتلیمۆسی چواردەهەم بەمەبەستی ڕاوکردن لەپایتەخت چۆدەرێ، ڕۆژی سێهەم کلیۆپاترا خۆی ئامادەکرد بچێت بۆسەردانی لەشکرەکەی کەلەناوچەی دەمەنهوردابوو، پێشئەوەی بڕوات بەمنی گوت: شرمیون لەم ڕۆژانەدا باروئۆخی گشتی شەپرێو ونالەبارە، لەڕۆمدا پومپە تێشکاوەو سیزار بێ ڕکەبەر، بۆتە فەرمانڕەوایی ڕۆم، دوورنییە ئەم ڕووداوە لەسەر ولاتەکەی ئێمەش کاریگەریان نەبێت. من ئێستا دەچم بۆ دەمەنهور تابزانم لەشکرەکەم ئامادەیە بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی پێشهاتی چاوەڕواننەکراو- یان نا؟

لێرە هەندێك کەس هەن مـن لەهەموو ڕووداوەکـان ئاگادارەدەکەنـەوە، بـەڵام لەوانەیـە ئەگـەر ڕووداوی گـەورەو چـاوەڕواننەکراو بێنـەپێش نـەتوانن بەهـەموو هەواڵـەکان ڕابگـەن- یـان لەوانەیـە خیانـەت لەگەڵمندابکـەن، داوام لەتۆیـە کـەلێرە بینیـت ڕووداو وکـاری نائاسـایی و شـتی گـرنگ ڕوویـدا، ئـەوا مێردەکەت بۆسەربازخانەی دەمەنهور بۆلای من بنێرەو خەبەرەکەی پێدا ڕەوانە بکە، ئەگەر مێردەکەت نەیتوانی بێت ئەواخۆت وەرە ئەوهەواڵانەم پێبڵێ، لێرەکەس نازانێت من دەمەوێت بچم بۆسـەربازخانەی دەمەنهور، تۆش ئەمە بەکەس مەڵێ، من لێرە گوتوومـە دەچم بۆشـوێنی ڕاوکردنـی پاشاو لای ئەودەبم. تەنها تۆدەزانیت من لەوێم.

من پێمواببوو کلیۆپاترا پێشبینی ئەوەی کردبوو خەریکی کوشتننی، بۆیە لەئەسکەندەریە ڕۆیی وخۆی گەیانـدە لەشـکرەکەی کـەخۆی فەرمانـدەیان بـوو، بۆئـەوەی ئەگـەر ویـستیان دەسـتی لێبوەشـێنن سـەربازەکان بـەرگری لەشـازنی میـسربکەن، ئـەوەی بووەهـۆی ئـەوەی ئـەم بیرۆکەیـە بێتەمێـشکمەوە ئەوەبوو، ڕۆژێك پێشئەوەی کلیۆپـاترا بۆدەمـەنهور بچێت، بەمنی گوت: شـرمیون ئەگـەر بەتـەنیابم ئـەوا بێتوانادەبم کاتێ خۆم بەبەهێزدەزانم کەبیبنم سەربازانی لەشکرەکەم لەچواردەرمدان وبەرگریم لێدەکەن. کلیۆپاترا ڕۆیی وئەوڕۆژە ئاوابوو وشەوداهات ومن وتیە لەژوورەکەی خۆماندا خـەوتین، نیوەشـەو لـەنێو پارکی کۆشکدا دەنگێکی نائاساییم گوێلێبوو وتیەم بەخەبەرهێنایەوەو گوتم گوێت لەودەنگەیە؟

– تیە گوتی: وەك زرەی شمشێران دەچێت.

– گوتم تیە تۆ لێرەدا بمێنەوەو لەژوورەکە نەهێیتەدەرێ، تامن دەچم بزانم چییە.

دەنگەکە لـەلای ژوورەکـانی کلیۆپـاتراوە دەهـات، منـیش بەپەلـە جلـەکانم لەبەرکردەوەو بـەرەو ئـەوێ ڕامکـردو لەبـەر ڕۆشـنایی مەشـخەڵەکاندا بینـیم چـەند کـەس لەپاسـەوانانی کۆشـك کـوژراون وچـەند کەسێکی تریان خەریکی شەڕکردنن، بەلام چوون هێرش کەرەکان ژمارەیان زیاتربوو ئەوانیشیان کوشتن ئەوچـەند کەسـەی کەبەرگریانـدەکرد لەماوەیـەکی کەمـدا کـوژراون وهێـرش کـەرەکان چـوونەناو ژووری کلیۆپــاتراوە، منــیش لەتەنیــشت کوژراوەکانــەوە ڕۆیــشتم وچــوومە ژوورەکــەی کلیۆپــاتراو نۆکــەرو کارەکەرەکان منیان بینی وگوتیان ئەمە شرمیونەو کارەکەری نزیکی کلیۆپاترایە؟

– گوتم: بەڵێ وایە.

– پرسیان کلیۆپاترا لەکوێیە؟

– گوتم: ئەمڕۆ ڕۆیشت وگوتی بۆشکارکار دەڕۆم، تابچم بۆلای مێردەکەم.

– خزمەتکارەکان بێ وەڵام مابوونـەوە، کاتێ گوێیان لەوەڵامەکەی من بـوو، بەئەفسـەرەکەیان گوت ئیتر خۆباوەڕ دەکەیت ئەوەی کەئێمە پێمانگوتی ڕاست بوو، شازن لێرە نییە.

– ئەفـسەرەکە گـوتی: ئەگـەر کلیۆپـاترا ئـەمڕۆ هاتبـا بۆشـکارگاکە ئێمـە نـەدەهاتین بـۆئێرەو لـەوێ دەمانکوشت، بۆیەش ناچاربووین بۆئێرە بێین- وەی بەحاڵتان ئەگەر درۆبکەن، ئێمە ئەمشەو تابەیانی لەناوکۆشـکدا دەگـەڕێین وئەگـەر شـازنمان دۆزیـەوە ئـەوابۆمان مـەعلوم دەبێـت ئێـوە شـاردووتانەتەوەو هەمووتان دەکوژین، بەلام ئەوانە نـەیانتوانی کلیۆپاترا بدۆزنەوە، چونکە کلیۆپـاترا لێرەنـەبوو، سبەی بـەیانی نامەیـەکم نووسـی ودامـە دەسـتی تیـەو گـوتم پێویـستە بـەزووترین کـات ئەونامەیـە بگەیـەنیت

وبەدەمیش پێی بڵێ، ئەمشەو ئەفسەرو سەربازەکانی مێردەکەت هەڵیانکوتاوەتە سەر شوێنەکەی تۆ لەکۆشکدا، بۆ ئەوەی بتکوژن.

سبەی بەیانی سەربازەکان ڕۆیشتن، بەڵام لەدەوروبەری کۆشکدا پاسەوانیان جێهێشت وتیەش بۆگەیاندنی نامەکە ڕێگای دەمەنهوری گرتەبەر، دڵنیابووم ئەوئەفسەرو سەربازانە هاتبوون بۆکوشتنی کلیۆپاتراو لەلایەن پاشا بەتلیمۆسی چوارده، مێردو برای کلیۆپاتراوە نێردرابوون، بەڵام چانس یاریدەی کلیۆپاترایدا بەوەی ئەوەشەوە لەکۆشکی پاشایەتیدانەبوو، کاتێ مێردەکەم بۆ دەمەنهور نارد، یەك سات بیرم لەوەنەکردەوە لەوانەیە کلیۆپاترا تیە لای خۆی بهێڵێتەوە، ئەگەر شاژنی میسر بڕیاری دابا مێردە جوانەکەی من گلبداتەوە خۆ لەکۆشکی پاشایەتیشدا دەیتوانی بەمەبەستی خۆی بگات، منیش نەمدەتوانی ڕێگاگربم لەبڕیارەکەی ئەو، یەك شاژنی میسرو یەك خواوەند ئاسایە منیش کارەکەرێك بووم ونەمدەتوانی لەبەرامبەر ئەودا چەندوچوون بکەم.

لەوانەیە لەکاتێکیتردا دڵم ڕێگای ئەوەی پێنەدابام مێردەکەم بنێرم بۆلای کلیۆپاترا، بەڵام لەوساتەوەختانەدا کەگیانی کلیۆپاترا کەوتۆتە مەترسییەوەو لەوانەیە بیکوژن، بەسەرئێرەیی ژنانەی خۆمدا زاڵبووم ومێردەکەم بۆلای کلیۆپاترا نارد، بەڵام پێشئەوەی مێردەکەی من بگاتەلای کلیۆپاترا، شاژنی میسر زانیاری لەسەر ئەورووداوەی کۆکشی پێگەیشتبوو ودەیزانی مێردەکەی دەیەوێت بیکوژێت، دوای ئەوەی تیەی بینیبوو پێی گوتبوو تۆ بۆئەسکەندەریە بگەڕێرەوەو چاودێری باروودۆخەکە بکەو هەرشتێکی تازە ڕوویدا وەرە بەمنی بڵێ.

– مێردەکەم گەڕایەوەو بەمنی گوت: کلیۆپاترا خەریکی پەرداخکردنی لەشکرەکەیەتی وپێشبینی ئەوەدەکات لەنێوان خۆی وبراکەیدا شەڕ هەڵایسێ، دەمزانی کلیۆپاترا بەم زووانە لەسەربازخانەی دەمەنهور ناگەڕێتەوە، ئەوەندە لەوێ دەمێنێتەوە تابتوانێ لەشکرەکەی خۆی تەیارو ئامادەی شەڕێکی گەورەبکات، جائەوکات ڕێگای پایتەخت دەگرێتەبەر، بەڵام پێشئەوەی شەڕ لەنێوان کلیۆپاتراو شادا ڕووبدات، شتێکی سەرسوڕهێنەر ڕوویدا، بەیانێکیان لەکۆشکی پاشایەتیدا مقۆمقۆی ئەوەپەیدابووکە پومپە سەرکردەی ناوداری ڕۆم، بەکەشتی هاتووەو کەشتییەکەی ئەو لەنزیك بەندەری ئەسکەندەریەدا لەنگەری گرتووە، دواتر مەعلوم بوو پومپە بۆیەهاتووە تاداوا لەبەتلیمۆسی چواردەهەم بکات پەنای بدات ولەژێر پارێزگاریکردنی ئەودابێت، ئەوداواکاریەی پومپە لەپاشای میسری دەکرد، وەك ئەوەوابوو یەکێك لەخواکانمان لەبەندەکەی خۆی داوابکات، چونکە پومپە یەکێکبوو لەسەردارو پیاوە سیاسییە بەناوبانگەکانی ڕۆم، بەبەراورد لەگەڵ پاشای میسردا وەك خواوابوو لەبەرامبەر عەبدەکەیدا.

پومپە پیاوێکبوو شکۆمەند، حەوتەمین پاشای ئاشکانی تێکشکاند، ئەو پیاوەبوو، کاتێ بەتلیمۆسی چواردەهەم لەمیسر چوو بۆڕۆم ونەیتوانی بگەڕێتەوەو لەڕۆمدا نیشتەجێ بوو، پومپە گەڕاندیەوەسەر تەختی پاشایەتی، بێگومان پوپمە چاکەی ئەوەی بەسەر پاشای میسرەوە هەبوو کەهێنایەوە سەرتەختی پاشایەتی لەمیسر، هات داوا لەبەتلیمۆسی چواردەهەم بکات پەنای بدات ولەژێر چاودێری ئەودابێت.

من دڵنیابووم ئەگەر خاتوونەکەم لەئەسکەندەریەبا بەبێ دوودڵی پومپە کە ئەوکاتە لەبەرامبەر سیزاردا تێکشکابوو، وەخۆی دەگرت وپارێزگاری لێدەکرد، بەڵام بەتلیمۆسی چواردەهەم کەگەڕانەوەی تەختی

پاشایەتی خۆی لەپای چاکەی پومپەوە دەستکەوتەوەو قەرزاری ئەوبوو، دووچاری گومان ودوودڵی بۆوە، بەوەی ئایا ئەوپیاوە مەزنە ڕێگا بدات بۆپایتەختەکەی بێت- یان نا؟

بۆئەوەی بتوانێت بڕیار لەسەرئەمەبدات لیژنەی ڕاوێژکاری دروستکرد، ئاشکرایە کە (پوتن)یش لەوکۆبوونەوەیەدا بەشداربوو، بەتلیمۆسی چواردەهەم گوتی: پومپە لەڕابردوودا یارمەتی منیداوە، من بەهاوکاری ئەوتوانیم بگەڕێمەوە میسر.

- پوتن دەمی کردەوەو گوتی: ئەوپارەی کەتۆدات بەپومپە، بەهەر کەسێکی ترتدابا هاوکاری دەکردی، ئایا لەیادت چۆتەوە پومپە بۆئەوەی تۆ بۆمیسر بگێڕێتەوەو لەسەرتەختی پاشایەتیت دانێتەوە، چەند بەرتیلی لەتۆ وەردەگرت؟

- پاشای میسر گوتی: ئەوهەزار سکەی زێڕی لەمن وەرگرت تامن بگێڕێتەوە میسر، بەڵام ئەوپارەیە تەنها بۆخۆی نەیخوارد، بەڵکو هەندێ لەوەیدا بەکەسانی تریش.

- پوتن گوتی: پومپە پیاوێکی پارەپەرستەو بێگومان نیوەی ئەوپارەیەی بۆخۆی هەڵگرتووەو نیوەکەی ترشی بەسەر کەسانیتردا دابەشکردووە، بەهەرحاڵ ئەوچاکەی گەڕانەوەی تۆی بۆمیسرو سەرتەختی پاشایەتی لەگەڵ تۆدا نییە، تۆ ئەوپارەت بەهەر کەسێکیتر دابا، ئەوەی بۆدەکردیت.

- بەتلیمۆسی چواردەهەم گوتی: لەڕۆمدا کەس لەوبەتواناترو بەهێزترنەبوو، جگەلە پومپە کەسیتر نەیدەتوانی من بگەڕێنێتەوە میسرو تەختی پاشایەتی.

- پوتن گوتی: گریمان واشبوو دووبارە ئەوچاکەکاری بەسەر تۆوەنییە، چونکە کرێی خۆی وەرگرتووە.

- پاشای میسر گوتی: ئایا ئێستا پومپە هاتووە بۆمیسرو داوای پەنادان وپارێزگاریکردن دەکات، من داواکاریەکەی ڕەتبکەمەوە؟

- پوتن گوتی: ئەگەر ناتەوێت داواکاریەکەی ئەو ڕەتبکەیتەوە، ئەوابیر لەوپیاوە بکەرەوە کەدوای پومپە دێتە ئەسکەندەریە، ئەویش سیزارە، پومپە لەڕابردوودا پیاوێکی بەهێزو بەتوانابوو، بەڵام ئەمڕۆ سیزار پیاوی ڕۆژگارەو بەتوانایەو ئەگەرتۆ پومپە بگریتەخۆت، ئەواسیزار دەکەیتە دوژمنی خۆت، سیزاریش ئەمڕۆ فەرمانڕەوای ڕۆمە، واتا فەرمانڕەوای دنیایە، قسەکانی پوتن بەردەوام کاریان لەپاشادەکرد، ئەم قسەیەش کاریگەری کردەسەر پاشای میسر.

بەتلیمۆس گوتی: پومپە لەڕابردوودا دۆستمبوو، ئەگەر ئەمڕۆش خۆم لەپێشوازیکردنی ئەو ببوێرم، بەپێچەوانەی دۆستایەتی ڕەفتاردەکەم، هەرکاتێکیش ئەو وەخۆم بگرم، ئەوا سیزارم لێدەڕەنجێت؟ ئایا دەتوانن ڕێگاچارەیەك بدۆزنەوە کەنەپومپە لەمن بڕەنجێ ونەسیزار؟

- پوتن گوتی: ڕێگا چارەیەك هەیە دەتوانرێت نەپومپە لێتبڕەنجێت ونەسیزاریش ببێت دوژمن.

- پاشای میسر لێی پرسی: ئەو ڕێگاچارەیە چییە؟

- پوتن گوتی: چارە ئەوەیە داوا لەپومپە بکە بێتەناو ئەسکەندەریەو بچۆ بۆپێشوازی بەشکۆمەندییەوە بیهێنە سەر لێوار دەریا، بەڵام هەرکە پێی ناسەرخاکی میسر ئیشارەتی پیاەکانت بکە بابیکوژن، بەم شێوەیە پومپە لەتۆ ناڕەنجێت، چونکە دەبینێت تۆ بەشکۆمەندی پێشوازی لەئەودەکەیت وسیزاریش لێتنابێت بەدوژمن، چونکە دەیبیستێتەوە پومپەت کوشتووە، بەڵام دوای ئەوەی پومپەت کوشت

باسەری لەلاشەی جیابکەنەوەو بڵێ لاشەکەی ژێرخاك بکەن وسەرەکەشی بۆمردووخانەکە بنێرە تامۆمیایی بکەن، تائەو ڕۆژەی سیزار دێت بۆئەسکەندەریەو تۆش سەری پومپە وەك دیاری پێشکەش بەئەوبکە، من دڵنیاتدەکەمەوە ئەگەر هەزار سکەی زێڕ بەوبدەیت بەقەت سەری براوی پومپەی پێخۆشنابێت، چونکە سیزار پومپە بەگەورەترین دوژمنی خۆی دەزانێت وهیچ شەوێك لەترسی ئەوپیاوە ئاسودە ناخەوێت، تەنها ئەوکاتە نەبێت سەری براوی ئەوببینێت، ئینجا ئاسودە دەخەوێت، بەوەی تۆ ئەوت لەدڵەتۆتکەو دوودڵی ڕزگارکردووە، مەمنون وقەردزارت دەبێت ودۆستایەتی سیزار بۆتۆ زۆرقازانجی هەیە.

- پاشای میسر گوتی: بەچی دیارە کەسیزار بۆ ئەسکەندەریەدێت تامن سەری براوی پومپە وەك دیاری بەئەو بدەم؟

- پوتن گوتی: جگەلەوەی کەسیزار لەئەسکەندەریەدا جاسوسی هەن، ئەمڕۆ بەلانی کەمەوە دە کەشتی لێرەوە بۆ لای ڕۆم دەڕۆن وهەموو ئەو کەشتیانە هەواڵی هاتنی پومپە بۆئەسکەندەریە دەگەیەننە ڕۆم وسیزاریش دەزانێت کاتێ ئەوهەواڵە بەئەوگەیشت، گورج بۆکوشتن- یان دەستگیرکردنی پومپەدێت بۆمیسر، ئەگەر لەفارسالدا بەدوای پومپە نەکەوتبێت ئەوا دوای چەند ڕۆژێکیتر دەگاتە ئێرە.

- پاشای میسر لەدڵی خۆیدا قسەکانی پوتینی بەڕاست دەزانین، زانی کەسیزار- یان بەدوای پومپەوەیەو بەم زووانە دەگاتە میسر- یان ئەوەتا لەمەیدانی جەنگەوە ڕۆیشتۆتەوە بۆ ڕۆم کەلەوێش هەواڵی گەیشتنی پومپەی بۆمیسر بیست، بێ دواکەوتن دەکەوێتەڕێ بۆئەوەی پومپە بکوژێت- یان دەستگیری بکات، چون سیزار بەپیاوێکی بێتواناو ترسنۆك هەژماردەکرا، بڕیاریدابوو بۆپارێزگاری کردن لەدەسەڵاتدارێتی خۆی، پومپە بکات بە قوربانی.

- پاشای میسر بەتلیمۆیسی چواردەهەم سەبارەت بەپومپە بڕیاری خۆیدا، لەوانەیە خوێڕیترین کەسی وڵاتی میسر ئەو نامەردیەی نەکردبا، چونکە بڕیاریدا بەشکۆمەندی پێشوازی لەپومپە بکات وهەرکەپێی نایەسەر خاکی بەندەرەکەش، دوو کەسی پیاوکوژ هێرشی بکەنەسەرو بیکوژن وسەری لەلاشەی جیابکەنەوەو بۆ مردووخانەکەی بنێرن ومۆمیای بکرێت، کاتێ سیزار گەیشتە میسر وەك دیاری پێشکەش بەئەوی بکەن، هەمان ڕۆژ بۆهاتنی پومپە بەرنامەی ساختەیان داڕشت کەلەپێشوازیکردنی یەك پاشادەچوو، بڕیاردرا بەتەنهایی لەکەشتییەکە دابەزێت وسواری بەلەمی زێڕینی پاشایەتی بکرێت وڕێگای لێواری بەندەر بگرێتەبەرو پاشا لەلێوار دەریادا چاوەڕوانی ئەوبکات وهەرکە بەلەمەکە گەیشتە وشکانی پاشا دەستی درێژبکات ودەستی پومپە بگرێت و ئەو لەبەلەمەکە بێتەدەرێ وسواری کەژاوەی بکەن وبیگەیەننە کۆشکی پاشایەتی وبیست وپێنج ڕۆژ پومپە لەکۆشکی پاشایەتیدا میوانی پاشابێت ودوای ئەوەی لەهەر شوێنێکی ئەسکەندەریەدا کەئەو پێی باشبێت نیشتەجێ بێت، ئەم بەرنامەی پێشوازی کردنە ساختەیان بەپومپە ڕاگەیاندو پومپە ڕازیبوو وڕۆژی دواتر هەموو دانیشتوانی ئەسکەندەریە لەمانەش من چووین بۆبەندەر تاهاتنی پومپە سەیربکەین، من تائەو ڕۆژەی زیندووم ئەو ڕۆژەی پومپە پێی نایەخاکی میسرەوە فەرامۆش ناکەم.

کەشتی پومپە نزیکبوو لەڕۆخی بەندەرەکە بەجۆرێك من ئەو وهاوسەرەکەیم بەباشی دەبینین، ئەولەشکرەی میسر کەلەئەسکەندەریەدا بوون، لەسەر رۆخی بەندەرەکەدا بەریز وەستابوون وخودی پاشای میسریش لەریزی پێشەوەی سەربازەکاندا وەستابوو وچاوەڕوانی هاتنی پومپەی دەکرد.

کاتێ پومپە لەدوورەوە چاوی بەوپێشوازییە پرشکۆیە کەوت کەپاشای میسرو لێپرسراوەکانی بۆئەوی دەکەن، لەخۆشیاندا پێکەنی، چونکە زانی هەرچەندە تێکشکاوە، بەلام ئێستاش وای لێنەهاتووە گومناوبێت، بەلکو پاشای میسرو سوپاکەی بۆپێشوازی کردنی دێن بۆئەوەی ئەوبگەیەننە پایتەختی میسر.

پومپە زانی ئێستاش یەك ئیمپراتۆرە، واتا یەك ژنرالی پلەیەکە، چونکە لەولاتی رۆمدا بەژنرالەکانی پلەیەکیان دەگوت ئیمپراتۆر، لەبەری بەندەری ئەسکەندەریەوە بەلەمێکی زێرین ورازاوە بەرەو ئەوکەشتییەچوو کەپومپەی تێدابوو، بۆ ئەوەی بیهێنێت بۆڕۆخی بەندەرەکە، پلانەکە وادانرابوو دەبوا پومپە بەتەنهایی لەکەشتییەکەی دابەزێت وسواری بەلەم بێت وبێتەسەر کەناری بەندەرەکە، ژن ومندالەکانی وخێزانەکەشی دوای سەعاتێك لەگەیشتنی پومپە بەخاکی میسر- کەمەراسیمی پێشوازیکردنەکە کۆتاییهات، ئینجا ئەوان دابەزێن، لەوبەلەمەدا کەکۆمەلێ لەپیاوانی میسری تێدابوون، سێ پیاوکوژیش دەبوا دوای گەیاندنی پومپە بەڕۆخی بەندەرەکە، بیکوژن، لەوبەلەمە دابوون، یەکێك لەوسێ کەسانە ئاشیلا، فەرماندەی گشتی سوپای بەتلیمۆسی چواردەهەم بوو، کەبەرووکەش بۆ ئەوەهاتبوو پێشوازی لەپومپە بکات وبەخێری بێنێت، بەوەی پێدەنێتە خاکی نیشتمانی ئێمە، ئەوی تریان پیاوێك بوو ناوی (سپ تی میوس) کەیەکێکبوو لەئەفسەرەکانی پۆمپەو داخ لەدلبوو بەرامبەری وبەرەچەلەك رۆمی بوو، ئەویشیان دانابوو بۆکوشتنی پومپە.

سێیەمیشیان یەك سەرهەنگ بوو، بەلێنی هەندێ پارەیان پێدابوو کەپومپە بکوژێت، کاتێ بەلەمە زێرین ورەنگالەکە گەیشتلای کەشتی پومپە (سپ تی میوس) سەری بەرزکردەوەو گوتی سلاو لەتۆ ئەی ئیمپراتۆر، چونکە ئەو رۆمی بوو بەزمانی رۆمی سەلامی لەپومپە کرد. ئەشیلا، فەرماندەی سوپای میسر بەزمانی یۆنانی هاواریکرد، سلاو لەتۆ ئەی ئیمپراتۆر، من لەلایەن پاشای میسرو سوپای ئەو ولاتەوە بەخێرهاتنی تۆدەکەم ودەلێم لەوکەشتییە وەرەخوارێ و سواری بەلەم بە هەتابچین بۆوشکانی، کاتێ پومپە ویستی لەکەشتییەکە دابەزێت وسواری بەلەمەکەبێت، هاوسەرەکەی پێی گوت بەتەنهایی مەڕۆ دووسێ کەس لەوئەفسەرانەت کەلەگەلخۆتدابیە، پومپە گوتی ناتوانم ئەمانە لەگەل خۆمدا ببەم، چونکە بەپێی ئەوبەرنامەو رێورەسمەی بۆمن کراوە، دەبێ من بەتەنها بچمە بەلەمەکەوە، پاش سەعاتێکیتر ئێوەش دەهێنن.

لەدوایین ساتەوەختدا پێشئەوەی پومپە بگاتەناو بەلەمەکە بەپێکەنینەوە بەژنەکەی گوت: ئێستا بەرەو مالی پاشای میسر دەڕۆم وهەرکەسێك پێ بنێتە مالی پاشاکانەوە دەبێتە دیلی ئەوانە، ئەگەر پیاوێ ئازادیشبێت، ئەوبەلەمەی پومپەی لەسەربوو، خەریکبوو نزیکی وشکانی دەبوّوە، بێ دەنگی بالی کێشابوو، من یەکێکبووم لەسەیرکەران وبێدەنگبووم و چاوم لەسەرپومپە لانەدەبرد، پومپە پێش تێشکانی لەگەل سیزاردا، گەورەترین ژنرالی رۆم بووەو خاوەنی لەقەبی ئیمپراتۆر بوو، لەورۆژەدا یەك

جلی ئەرخەوانی لەبەردابوو کەنیشانەی سەرەپیاوی یەکەمی ڕۆمی دەگەیەنێت، لەژێریشەوە سەڵتەیەکی شینی لەبەربوو کەئەویش نیشانەی سەرەپیاوی یەکەمی ڕۆمی دەگەیەنێت.

لەسەرشانی چەپی شانیلێك هەبوو کەلەبەر ڕووناکی هەتاوەکەدا دەدرەوشایەوەو من لەدوورەوە بینیم پومپە ڕووی بەلای (سپ تی میوس)دا وەرگێڕاو ئەوئەفسەرە ڕۆمییەی کەلەڕابردوودا لەژێرفەرمانی ئەودابوو، شتێکی گوت و (سپ تی میوس) سەری بۆلەقاند، من گوێم لەدەنگی ئەودووانە نەبوو، بەڵام دواتر بۆیانگێڕامەوە کەپومپە لەوی پرسیوە ئایا ئێمە وەك جاران دۆستین- یان نا؟

(سپ تی میوس)یش تەنها بەسەرلەقاندن وەڵامی بەڵێی داوەتەوە، دواتر بینیم پومپە کاغەزێکی بەدەستەوەگرتووە، مەعلوم بوو ناوبراو ئەو وتەیەی بەدەستەوەبوو کەدەبوایە دوای گەیشتنی بەخاکی میسر خوێندبایەوە.

سەرئەنجام بەلەمەکە گەیشتە وشکانی بەندەرەکەو (سپ تی میوس) لەبەلەمەکە دابەزی ودەستی درێژکرد تادەستی پومپە بگرێت ولەبەلەمەکەی دابەزێنێت، پومپە دەستی (سپ تی میوس)ی گرت وپێی نایە خاکی میسرو هەنگاوینان هەتابۆلای بەتلیمۆسی چواردەهەم بچێت، پاشای میسریش کەوتەڕێ تالەپومپە نزیکبێتەوە، لەوکاتەدا من بینیم کە(سپ تی میوس) لەپشت پومپەوە کێردەکەی لەکیفەکەی دەرهێناو ئەوەندە بەبەهێزی لەدواوە لەپشتی پومپەی چەقاند کەپومپە بەسەر ڕووداکەوت، ئینجا لەتاوئازار کەوتەسەر کەلەکەیەکی، خەڵکەکە لەمانەش من، هەتا سەربازەکانی سوپاش کاتێ ئەودیمەنە ترسناکەیاندیت، هاواریانکرد هەرلەوکاتەی پومپە کەوتەسەر لاکەلەکەیەکی (ئەشیلا) فەرمانەدەی سوپا میسرو ئەوئەفسەرەیتر کەسەرهەنگبوو لەبەلەمەکە دابەزین وشمشێرەکانیان لەکیفەکانیان هێنایەدەرێ وهەڵمەتیان بردەسەر پومپە کەلەزەوییەکەدا کەوتبوو، هەریەك لەمدووانە دووجار شمشێرەکەیان لەلەشی ئەوژنراڵە تێکشکاوەی ڕۆمی ڕۆکرد، پومپە هاواری کردو ناڵاندی، من وئەوانی تریش بینیان کەشانێڵەکەی خۆی خستەسەر ڕووی خۆی وهەر ئەوکاتە ڕۆحی دەرچوو، لەدەریاوە زریکەی ژن وشیوەن وگریان بەرزبۆوە، چونکە ژن ومنداڵەکانی پومپەو هەموو ئەوانەی کەلەکەشتییەکەدابوون دیمەنی کوشتنی پومپەیان بینی وبەچاوی خۆیان بینیان لەهەمان ئەو جێگایەی کەپومپەی تێدا کەوتبوو سەری ئەویان لەلاشەی جیاکردەوە، تالەمیوانداری کردنی سیزاردا، پاشای میسر پێشکەش بەپیاوی ڕۆژگارو فەرمانڕەوای ڕۆمی بکات، کەکاتێهات بۆئەسکەندەریە، بۆئەوەی دۆستایەتی خۆی بۆ سیزار نیشانبدات، کاتێ سەرەکەیان لەلاشەکەی جیاکردەوە، خەڵك شاڵاوی برد تالاشەی ئەوپیاوە ببینن کەڕۆژگارێك بەناوبانگترین پیاوی ناوداری ڕۆم بوو، واتا پیاوی دنیا، بەڵام سەربازەکانی میسر چواردەوری تەرمی بێ سەری پومپەیان گرت ونەیانهێشت خەڵك لێی نزیکبێتەوە.

من لەبەرئەوەی ئافرەت بووم، لەومایەپوچییە شەرمەزاربووم، دڵنیابووم ئەگەر کلیۆپاترا لەئەسکەندەریەدابا ئەوکارە دزێوەی کەنازانم چۆن باسی بکەم، نەدەکرد.

دواتر پاشای میسر فەرمانیدا لەداری چەند بەلەمێکی کۆن وشکاو لێژنێکدار کۆبکەنەوەو ئاگری تێبەردەن ولاشەی بێ سەری پومپەی بخەنەناو، بۆتەی ئەوئاگرە بۆئەوەی شوێنەواری نەمێنێت.

کاتێ بۆنی گۆشتی سوتاو بڵاوبۆوە، ئیتر من نەمتوانی تۆتکەبگرم وبەڕێ کەوتم وخۆم گەیاندەوە کۆشکی پاشایەتی، بەڵام بیستم کەخۆڵەمێشە ڕەنگ ڕەشەکەی پومپەیان خستۆتە سندوقەوە.

چوار ڕۆژ دوای کوشتنی پومپە، سیزار گەیشتە ئەسکەندەریە، هیچ کەس وێناوی ئەوی نەدەکرد سیزار بەوخێراییە بگاتە ئەسکەندەریە، بۆچوونی ئەوکەسانەی کەدەیانگوت سیزار دوای پومپە دەکەوێ تابیکوژێت- یان دەستگیری بکات، ڕاست دەچوو.

پومپە پیاوێکی هەڵاتووبوو وبەبێ هێزی چەکدار گەیشتە ئەسکەندەریە، چونکە هێزی نەبوو لەگەڵ خۆیدا بیهێنێت، بەڵام سیزار بەپیاوێکی سەرکەوتوو هەژماردەکراو بەهێزێکی گەورەی دەریاییەوە گەیشتە ئەسکەندەریەو هەواڵی هاتنی ئەو بەخێرایی لەپایتەختی میسردا بڵاوبۆوە، پاشای ئێە لیژنەیەکی دروستکرد بەلێپرسراوێتی (ئاشیلا) فەرمانـدەی سوپای میسر، کەئەو یەکێکبوو لەسێ بکوژەکەی پومپە، ناردنی بۆلای سیزار تاتکای لێبکەن کەڕۆژێك لەکەشتییەکەیدا بمێنێتەوە، هەتاکەرەستەی پێشوازیکردن ئامادەدەکەن وبەڕێزو شکۆمەندیەوە کەشایستەی یەك ئیمپراتۆری وەك ئەوبێت، بکەن.

سیزار زانیبووی پومپەیان کوشتووە، داواکاریەکەی پاشای میسری قبوڵکرد، بەپێی بڕیاری بەتلیمۆسی چواردەهەم ڕێڕەوی سیزار لەبەندەرەوە تاکۆشکی پاشایەتی بەخێرایی ڕازاندەوە، ڕۆژی دواتر دانیشتوانی ئەسکەندەریە لەمانەش من بۆبینینی هاتنی سیزار سەرداری گەورەی ڕۆم، چووین بۆسەر بەندەرەکە.

لەوڕۆژەی کەسەری پومپەیان بۆمردووخانەکە ناردبوو تامۆمیایی بکەن، لەوێیان هێنایەوەو ئەوسەرەیان خستەسەر سینییەك وئەشیلا فەرماندەی سوپای میسر ئەوسینیەی بەدەستەوە گرتبوو، خودی پاشای میسر سواری بەلەمبوو وبەرەو ئەو کەشتییەی کەسیزاری تێدابوو ڕۆیشت ودەستی ڕاداشت وئەوی لەپێشڕەوی کەشتییەکەوە هێنایەخوارێ و هێنایەناو بەلەمەکە، من لەبەلەمەکەدا نەبووم، تابزانم سیزار چی گوت وشای میسر چی وەڵام دایەوە، بەڵام دواتر گوتیان بەتلیمۆسی چواردەهەم بەسیزاری گوتووە من دیاریەکم بۆتۆ داناوەو دڵنیام زۆر دڵت پێی خۆشدەبێت

سیزار گوتویەتی من لەتۆ چاوەڕوانی دیاری ناکەم، پاشای میسر گوتبووی بەڵام ئەم دیارییە دیارییەکی سادەنییەو تۆ دڵخۆشدەکات، کاتێ بەلەمەکە گەیشتە وشکانی، سەرەتا پاشای میسر لەبەلەمەکە دابەزی ودەستی درێژکرد بۆ یاریدەدانی سیزار تالەبەلەمەکە دابەزێت، لەوکاتەدا ئاشیلا فەرماندەی سوپای میسر کەسەری پومپەی خستبۆسەر سینی وبەدەستیەوەبوو، نیشانی سیزاریداو پاشای میسر گوتی ئەمە ئەودیاریەیە کەمن بۆ پێشکەشکردن بەتۆ ئامادەم کردووە، ئەوەسەری پومپەی دوژمنی تۆیە، چون حەزم لەدۆستایەتی کردنی تۆیە، فەرمانم دەرکرد کەهەرپێ نایەخاکی میسر بیکوژن وسەری لەلاشەی جیابکەنەوە.

من کەچاوم لەسیزار بڕیبوو داخوا دوای دیتنی سەری پومپە چی دەڵێت، بینیم چاوەکانی فرمێسکی تێچزان وکەوتە گریان، دواتر خاتوونەکەی من کلیۆپاترا بەمنی گوت گریانی سیزار لەوڕۆژەدا بەرامبەر سەرە براوەکەی پومپە بۆخاتری پاراستنی بەرژەوەندی بوو، ئەوپیاوە (سیزار) لەبینینی سەری براوی پومپە ئەوەندە دڵخۆشبووە ئەگەر گرتنەبەرچاوی بەرژەوەندی نەبوایە، ئەوا لەخۆشیاندا سەمای دەکرد.

سیزار، وەك دواتر کلیۆپاترا بۆمنی گێڕایەوە، لەو ڕۆژەدا بۆیەگریا تادڵی دۆستەکانی پومپە بۆلای خۆی ڕابکێشێت، ئەو دەیزانی کەهەواڵی گریانەکەی دەگاتەوە ڕۆم ودۆستەکانی پومپە ڕازیدەکات بەوەی سیزار لەکوشتنی پومپەدا دەستی نەبووە.

من لەخاتوونەکەی خۆم پرسی: ئایا ئەگەر سیزار پومپەی گرتبا دەیکوشت؟

کلیۆپاترا پێی گوتم: چۆن سیزار ئەوەندە لەکەسایەتی ولێوەشاوەیی پومپە دەترسا کەدەستگیری کردبا نەیدەهێشت بەزیندوویی بمێنێتەوە، بەڵام بەوشێوە دڕندانەیە نەیدەکوشت، بەڵکو ئەوی دەنارده تاراوگێکی دوورەدەست ودواتر دەیکوشت.

کاتێ سیزار ویستی لەکەشتییەکەی دابەزێت وەك پومپەی نەکردو بەتەنهایی دانەبەزی، بەڵکو پێشئەوەی پێ بنێتەسەر خاکی میسر کۆمەڵێ لەسەربازەکانی خۆی نارد بۆوشکانیەکەی دەم بەندەرەکە، ئەوانە چواردەوری پاشای میسرو ئەشیلاو فەرماندەی سوپای میسرو چەند کەسێکیتر کەلەگەڵ پاشای میسردابوون گرت وئابلۆقەیان دابوون، بەشێوەیەك کەس لەمیسرییەکان نەتوانێت دژبە سیزار نیازی خراپی هەبێت، ئەگەر شتێکی ئاوا ڕوویدابا ئەواسەربازەکانی ڕۆمی میسرییەکانیان لەمانەش پاشای میسریان دەکوشت.

سیزار دوای ئەوەی کەمێ سەیری سەرە بڕاوەکەی پومپەی کرد، پرسی لاشەی پومپە لەکوێیەو چی لێهاتووە،

پاشای میسر گوتی: لاشەی ئەو سوتێنراوەو خۆڵەمێشەکەی خراوەتە سندوقەوە.

سیزار گوتی: سەری ئەو بنێژەو لاشەکەشی بدە بەمن تا بۆژن وکوڕەکەی بنێرمەوە، پاشای میسر فەرمانەکەی جێبەجێکردوو خۆڵی لاشەکەی پومپەیان بۆژن و منداڵەکانی ناردەوە.

لەو ڕۆژەدا کاتێ سیزار گەیشتە ئەسکەندەریە، چونکە پیاوی پلەیەکی ڕۆم بوو، یەکەم کاری کەسیزارکردی ئەوەبوو چوو بۆسەر گۆڕی ئەسکەندەر بنیاتنەری ئەوشارەو لەبەرامبەر گۆڕی ئەوپیاوەی کەڕۆژگارێك سەرداری دنیابوو سەری ڕێزی بۆداگرت، دووەم کاریشی ئەوەبوو سەردانی پەرستگای دیان، خوای شکاری کردوو مۆمی لەوپەرستگایەی خوای ئێمەدا داگیرساند، دواتر ڕێگای کتێبخانەی گرتەبەر، سیزار لەگەورەیی کتێبخانەکە سەری سوڕمابوو ولەوێدا بەهەندێ کەسی گوتبوو کەخەریکی خوێندنەوەبوون، بێن بۆکۆشکی پاشایەتی ومیوانی ئەوبن وسەبارەت بەفەلسەفەو مێژوو قسەی بۆبکەن، چونکە سیزار حەزی لەوەبوو لەگەڵ هەندێك بیرمەندەدا دەربارەی فەلسەفەو تاریخ گفتوگۆبکات، هەمان ئەو ڕۆژەی کەپومپەیان کوشت، من تیەی مێردم نارد بۆسەربازخانەی دەمەنهور تاکلیۆپاترا لەکوشتنی پومپە ئاگاداربکاتەوە، ئەو ڕۆژەی سیزار گەیشتە ئەسکەندەریەش هەربەتیەدا کلیۆپاترام ئاگادارکردەوە، من دەمزانی کلیۆپاترا بەڕێگای خەڵکانیتر ئاگاداردەکرێتەوەو ئەو هەواڵانەی پێدەگەن، بەڵام چون بەمێردەکەم گوتبوو ئەوهەواڵانە بگەیەنە بەکلیۆپاترا، خۆم بەبەرپرس دەزانی کەتیە بنێرم بۆسەربازخانەی دەمەنهور تاکلیۆپاترا لەڕووداوەکانی ئەسکەندەرییە ئاگاداربکاتەوە.

ئەمڕۆ ئەوەتا من بەساڵاچووم، گوێم لێدەبێ دەڵێن سیزار بۆیە بۆئەسکەندەریە هاتبوو تاکلیۆپاترا ببینێت ووەسفی جوانی شاژنی میسر ئەوی ڕاکێشکردبوو، من پێموانییە سیزار تائەوکاتەش ناوی کلیۆپاترای بیستبێ جاچجای ئەوەی بەیەك لەشکری دەریایی گەورەوە کەسوپایەك بوو، بێتە

ئەسـكەندەریە، ئـەم مەسـەلەیە هەڵبەسـتراوەو وئەفـسانە نووسـەكان بـەژیانی سـیزارو كلیۆپـاترای دەبەستنەوەو تێكەڵی دەكەن، كاتێ سیزار گەیشتە ئەسكەندەریە، تەمەنی لەچل ساڵی دابوو، پیاوێكی چاڵ ساڵە بۆعەشقی ژنێك كەنەیبینیوە، بەسوپایەكەوە دەچێتە وڵاتێكیتر؟ ئەوكەسـەش پیاوێكی وەك سیزار كەبۆ ئەو ژنـی جـوان كـەم نـەبوون، لەڕۆمـداو لـەدەرەوەی ڕۆمیشدا زۆر لـەژنان ئامـادەبوون ببنە عاشـیقەی ئـەو، دەڵـێن دوای ئەسـكەندەر سـەرداری وەك سـیزار دروسـت نـەبووە كـەبتوانێت ئەوەنـدە پانتـایی وڵاتـان بخاتـەژێر ڕكێفـی خـۆی، یـەكێك لەوشـوێنانەی كەسـیزار بۆڕۆمی گـرت، سـەر زەمینـی (گیل)(74)بوو

دوای ئەوەی سیزار گەیشتە ئەسكەندەریەو ناوی كلیۆپاترای بیست، كەوتە بیری ئـەوەی ببینێت، ئەو ڕۆژەی سـیزار هاتەئەسـكەندەریە، بەتلیمۆسـی چـواردەهەم ئـەوی لەكۆشـكدادانـاو خۆشـی لـەدەرەوەی كۆشكدا نیشتەجێبوو، هەركاتێكیش ویستبای بچێت بۆكۆشكەكەی خۆی، ئەوا دەبوا ئیجازەی لەسیزار وەرگرتبا.

من كەلەخزمەتكارەكانی كۆشكبووم، لەكۆشك نەچوومەدەرێ، بـەڵام پاشـای میسر بۆئـەوەی میوانەكەی خۆی بەئازادو سەربەست بهێڵێتەوە، لەكۆشك چۆدەرێ وبەخزمەتكارەكانی ڕاگەیاند فەرمانەكانی سیزار جێبەجێبكەن.

مـن لـەش ولاری سـیزار بـەوەی كـەدەیانگوت گـەورەترین سـەرداری جیهانـە دوای ئەسـكەندەر، بـەجوان وسەرنجڕاكێشم نەهاتەبەرچاو، لەم سەرگوزەشتەمدا سەبارەت بەجوانی پیاوانیش ڕای خۆم دەربڕی.

شەوی یەكەم پاشای میسر بۆئەوەی بەشكۆمەندییەوە خزمەت بەسیزاربكات، شێوازی خـواردنی ڕۆمـی سـازكرد، واتـا میوانـەكان لەپـشت مێـزەوە لەسـەرتەختێكی درێـژ بەنیوەڕاكـشاوی نانیـان دەخـوارد لەحاڵەتی شێوە ئیسراحەتكردندا پاڵیاندابۆوەو بەیارمەتی خزمەتكارەكان خواردنیاندەخوارد، ئەشرافە میسرییەكانی ئێمە لەكاتی نانخواردندا دادەنیشن و بـەخێرایی نانـدەخۆن، بـەڵام گـەورە پیاوەكانی ڕۆم عادەتیـان وایـە لەپـشت مێـزی نانخواردنـەوە لەسـەرتەختێ بـەنیوە ڕاكشاوی درێـژبن وخزمـەتكارەكان بەپاروی بچوك خۆراك بخەنەدەمی ئەوانەوە، نەریتی نـانخواردنی ڕۆمـی سـەبارەت بەوكەسانەی كـەپێی ڕانـەهاتوون گرفتـە، ئەوانە (ڕۆمییـەكان) بەهێواشـی نانـدەخۆن ولەكاتی پاروجویندا دەمیان ناكەنـەوە، بۆیـە نـانخواردنی ئەمانـە چـەند سـەعاتێك دەخایـەنێت، زۆرجـاریش لەپـشت مێزەكـانی نانخواردنـەوە گفتوگۆدەكەن، لەوشەوەدا سیزار لەگەڵ پاشاكەی ئێمەدا دەربارەی كاروباری دەوڵەت گفتوگۆی دەكرد، كاتێ بیستی كلیۆپاترا شاژنی میسر لەپایتەخت نییە، سەری سوڕماو هۆی ڕۆیشتنی ئەوی پرسی:

– پاشـای ئێمـە لەوەڵامـدا گـوتی: ڕۆیـشتنی شـاژن ناكۆكییەكە كەوتۆتـە نێـوان مـن وكلیۆپـاترا، شـاژنی میسر بۆیە لەئەسكەندەریە چۆتەدەرێ هەتالەشكرێك تەیاربكات وبێت لەگەڵئەودا شەڕبكات.

74- دەكاتـە هۆڵەنـداو بـەلجیكاو هەنـدێ خـاكی دانیمـارك وئـەڵمانیاو هەنـدێ لـەخاكی ئـەوروپای خۆرهەڵات(و- فارسی)

– سیزار پرسی: ئێستا شاژن لەكوێیە؟

– شـای میـسر وەڵامـی دایـەوە: ئـەو لەسـەربازخانەی دەمـەنهورە لـەوێ خـەریكی ئامـادەكردنی لەشكرەكەیەتی.

- سیزار پرسی: بۆشاژنی میسر لەشکری هەیە؟
- پاشای ئێمە گوتی: فەرماندەی گەورەترین وباشترین لەشکری میسرە، بەناوی لەشکری ئەسکەندەر.
- سیزار لەبەتلیمۆسی چواردەهەمی پرسی: تۆ دەتویست چی بکەیت؟
- پاشای میسر گوتی: منیش خەریکی ئاکادەکردنی سوپای خۆم بووم ودەمویست بۆشەڕی کلیۆپاترا بچم.
- سیزار گوتی: ئەمکارە مەکە ئێوە هەردووکتان نەلەبەرژەوەندی خۆتاندایە نەلەبەرژەوەندی میسریش، چونکە ئەم شەڕە هەردوولاتان لاوازدەکات، من بۆکلیۆپاترا پەیامێك دەنێرم کەدەست لەخۆسازکردن بۆشەڕ هەبگرێت و بێتە ئەسکەندەریەو لەگەڵ تۆدا ئاشتی بکات.
- پاشای میسر گوتی: باوەرناکەم کلیۆپاترا داواکەی تۆ قبوڵبکات وبێت بۆئەسکەندەریە، چونکە ژنێکە رای خۆی دەسەپێنێت.
- پاشای میسر ڕاستی دەکرد، خاتوونەکەی من ژنێکبوو بەئیرادەو خۆڕاگر، کاتێ بڕیاریدەدا کارێکبکات ئیستەرەم ئەنجامیدەدا.
- سیزار گوتی: من نامەیەك بۆ ئەو دەنێرم وداوای لێدەکەم بۆئەسکەندەریەبێت، ئومێدەوارم داواکارییەکەی من قبوڵبکات.
- بەتلیمۆسی چواردەهەم گوتی: نامەکە بنووسەو داواکارییەکەی خۆتی لێبکە کەبێت بۆ ئەسکەندەریە، بەدڵنیاییەوە بەلەشکرەکەیەوەدێت بۆ ئەسکەندەریە.
- لەهەمان شەودا من بەهۆی ئەوخزمەتکارانەی کەخەریکی خزمەتکردنی سیزاربوون لەگفتوگۆکەی نێوان ئەوان تێگەیشتم وبەرەبەیانی تیەم بۆسەربازخانەی دەمەنهور نارد، بۆئەوەی کلیۆپاترا لەگفتوگۆکردنی نێوان سیزارو پاشای میسر ئاگاداربێت.

کاتێ تیە گەیشتە سەربازخانەی دەمەنهور، ئێستا تەتەرەکەی سیزار نامەکەی بۆکلیۆپاترا نەهێنابوو، بۆیە ئەو هەواڵەی کەمێردەکەم گەیاندییە کلیۆپاترا تازەبوو وبەتیەی گوتبوو لەزمان منەوە بەشەرمیون بلێ وریابێت ئەوشتانەی جێگای سەرنج وگرنگن دەستبەجێ بەمنیان ڕابگەیەنێت.

دوای ئەوداوەتەی پاشای میسر لەکۆشکەکەی خۆیدا بۆمیوانەکانی کردی، لەکۆشك چۆدەرێ، بەلام ئێمە خزمەتکارانی کۆشك، وەك گوتم لەوێدا ماینەوەو ئیتر بەتلیمۆسی چواردەهەم نەهاتەوە کۆشکی پاشایەتی هەرکاتێ شتێکی ویستبا خزمەتکارەکەی خۆی بۆکۆشك دەناردو ئەوشتەی پێویستی پێبوو لەکۆشکەوە دەیهێنا.

ئەو ڕۆژەی مێردەکەم بۆلای کلیۆپاترا نارد بۆسەربازخانەی دەمەنهور، زانیم سیزار ئەونامەی کەدەبوا بۆ کلیۆپاترای بنێرێت، نووسیبووی، لەبری ئەوەی بەتەتەرێکدا بینێرێت نامەکەی بەیەك فەرماندەی لەشکرێکی ڕۆمیدا ناردبوو کەلەگەڵ ئەو ئەفسەرەی خۆیدا سەد سەربازی پارێزەری خۆی ناردبوو بۆسەربازخانەی دەمەنهور.

سیزار بەناردنی ئەم سەربازانەی خۆی وڕێورەسمەکە، دەیویست هەستی غروری کلیۆپاترا ڕاگرێت وتێبیگەیەنێت ڕۆم گرنگی بەشازنی میسر دەدات. بەشێوەیەك یەك سەرلەشکرێکی ناردووە بۆئەوەی نامەکە بگەیەنێتە کلیۆپاترا. هەروەها ئەوەش لەکلیۆپاترا بگەیەنێت ئەونامەی کەبۆی هاتووە ساختە

نییە، چونکە ئەگەری ئەوەهەبوو کلیۆپاترا وابیربکاتەوە مێردەکەی دەیەوێت فریوبدات ویەك نامەی ساختەی بەناوی سیزارەوە بۆبنێرێت هەتا ئەوبێت بۆ ئەسکەندەریەو بیکوژێت، بەڵام چونی یەك سەرلەشکری ڕۆمی بۆ سەربازخانەی دەمەنهور بۆ گەیاندنی نامەیەك، ئەو گومان و دوودڵییەی نەدەهێشت وشاژن دەیزانی ئەونامەیەی کەبۆی نێردراوە لەلایەن سیزارەوە نووسراوە.

بەوشێوەی کەمن بیستمەوە، کلیۆپاترا ئەوئەفسەرە پلەبەرزەی ڕۆمی لەسەربازخانەی دەمەنهوردا بەشێوەیەکی باش پێشوازیکردووەو دەربارەی بارودۆخی ئەسکەندەریە لەگەڵ ئەودا دواوەو دوای ئەوەی زانیویەتی سیزار لەکۆشکی پاشایەتیدا جێنشینبووەو پاشای میسر لەکۆشك چۆتەدەرێ ولەشوێنێکیتردا بەشێوەی کاتی جێنشینبووە، وەڵامی نامەکەی سیزاری داەتەوەو نووسیویەتی پاش چەند ڕۆژێکیتر دەگەمەوە ئەسکەندەریەو سەردانی سیزار دەکەم.

– سیزار: پاشای میسری لەوەڵامەکەی کلیۆپاترا ئاگادارکردەوەو گوتی ئەو بۆمنی نووسیوە پاش چەند ڕۆژێکیتر دێمەوە ئەسکەندەریەو چاوی بەمن دەکەوێت.

– پاشای میسر گوتی: بەهێزەکەیەوە دێت بۆئەسکەندەریە، دوورنییە لەشەقامەکاندا شەڕ لەنێوان سەربازەکانی من ولەشکرەکەی ئەودا ڕووبدات.

– سیزار گوتی: ئەگەر وایلێهات من بەهێزی سەربازی خۆم ناوبژیوانی دەکەم ونایەڵم لەنێوان سوپای تۆو لەشکری کلیۆپاترا شەڕ ڕووبدات.

بەوەی کەسیزار پەیمانیدا ناوبژیوانی بکات ونەهێڵێت شەڕ لەنێوان براوخوشکدا ڕووبدات، پاشای میسر فەرمانی بەفەرماندەی گشتی سوپای ئاشیلاندا کەسوپاکەی بخاتەحاڵەتی ئامادەباشی، هەتا فەرمانیدا بەو ئەگەر کلیۆپاترا بەلەشکرەکەیەوەهات وئەویان لەکاتی شەڕدا دەستگیرکرد بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئەو بەدەستی خۆی بیکوژێت، چونکە ئەگەر لەکوشتنی کلیۆپاترا پەلەنەکرێت، لەبەرئەوەی سیزار لەئەسکەندەریەیە نێوبژیوانی دەکات وڕێگردەبێت لەبەردەم کوشتنی کلیۆپاترادا، بەڵام کەشاژنی میسر بکوژن ئەوا سیزار لەبەردەم ئەمری واقیعدا دەبێت وناتوانێت نارەزایی دەرببڕێت وبڵێ بۆچی کلیۆپاتراتان کوشت؟ منیش پێوابوو کلیۆپاترا بەلەشکرەکەی خۆیەوەدێت، تابەدەست ڕێ بەستراوی خۆی نەداتەوە چنگ براکەی، بەڵام چەند ڕۆژ تێپەڕین وهەواڵی کلیۆپاترا هەر نەبوو.

(1) کارتاژ– بە تونسی ئەمڕۆ دەگوترا.

(2) ڕۆم– ئیتالیای ئەمڕۆ– بەڵام جیا لەڕووی جوگرافی

(وەرگێڕی فارسی)

(1) واتە دەکاتەساڵی (46)ی پێش میلادی

# بکوژانی سیزارو مەسەلەی جێنشینی ئەو

کاتێ سیزار لەڕۆمدا کوژرا تەمەنی گەیشتبۆ پەنجاو هەشت ساڵ, چەند جار خاتونەکەی من بەسیزاری گوت جێنشینی خۆی دیاری بکات, بەڵام لەترسی ئەوەی ئەو کەسە جێنشینە بەخراپی نەڕەنجێنێت وکینەی لێدانەگرێت سیزار خۆی لەمە دەبوارد, چونکە دانانی جێنشین واتە پێشبینیکردنی مردنی کەسی یەکەم دەگەیەنێت, بە تایبەت ئەگەر بەساڵداچووبێت سیزار بەوەی تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵبوو, وەك لەمەوبەر باسمکرد دەستەکانی دەلەرزین, نەیدەویست پەی بەوراستیەببات کەپیربووە، سەرداری ڕۆمی پێشئەوەی خاتوونەکەی من ببینێت وعاشقیبێت، وەسێتنامەیەکی نوسیبوو بەپێی ئەو نوسراوە دوای خۆی کوڕی خوشکەکەی کەناوی ( ئوکتاو) بوو بەجێنشینی خۆی دانابوو, بەڵام لەهەمان وەسێتنامەشدا نوسرابوو ئەگەر ببێتە خاوەنی کوڕ ئەوا ڕۆڵەکەی دەبێتە میراتگرەوەی خۆی نەك خوشکە زاکەی، من لەمەوبەر گوتم سیزار کوڕەکەی کلیۆپاترای بەڕەسمی بەکوڕی خۆی ناساندو ئەوی بە میراتگرەوەی خۆی دەزانی, بەڵام قانونەکانی میراتگرەوەی کوڕێکیان بەمەشروع دەزانی کە لەژن و مێردایەتیەکی شەرعییەوە بوبێت نەك لەدەستێکەڵاوکردنێکی ناشەرعی ئەو کوڕە بوبێت.

پێش ئەوەی سیزار بکوژرێت, دەیویست کلیۆپاترا بکات بەژنی شەرعی خۆی بەڵام دەبوا ژنەکە خۆی تەڵاق دابا, چونکە قانونەکانی ڕۆم ڕێگای پیاوێك دوو ژن- یان چەند ژنێکی هەبێت نادات, ئەگەر سیزار ئەمەشی کردبا ئەواحکومەتی ڕۆم هەرنەیدەتوانی کوڕی کلیۆپاترا بەڕۆڵەی شەرعی سیزاربزانێت مەگەر یەك قانونی تایبەتی لەپەلەماندا دەنگی بۆدراباو ئەمە بوبایە هۆی ئەوەی سیزاریون بەڕۆڵەی شەرعی سیزار بزانرایە, سەرداری گەورەی ڕۆمی دەیتوانی بەئاسانی سیزاریونی لەڕووی قانونیەوە بکات بە کوڕی شەرعی خۆی, بەڵام دەبوو بەلەکەیك وبەنێوچاوانی سیزاریونەوە دەنوساو بە درێژایی تەمەنی پێیەوە دەمایەوە.

خاتونەکەی من دەیزانی بەبەشەرعیکردنی سیزاریۆن پێویستی بەبەهاوسەربونی ڕەسمی نێوان خۆی وسیزار هەیە، بۆیە ئەو مەسەلەیەی بەئەنقەست دوادەخست, ئەمەش بەهۆی ئەوەی سیزار دەیزانی ئەومنداڵە لەپشتی خۆی نییەو سەرەتا بەڕۆڵەی بەتلیموسی چواردەهەم ناسراوە, سەرداری گەورەی ڕۆمی لەوە دەترسا سیزاریون لە خوێنی ئەونییەو دەبێتە میراتگرەوەو جێنشینی ئەو.

بەهەر شێوەیەکبێت سیزار حەزی نەدەکرد سیزاریۆن بکاتە میراتگرەوەی شەرعی خۆی, سیزار لەلایەك دەیگوت هەمووماں ڕۆژێ‌دێت دەمرین لەلایەکیش خۆی بە پیاوێکی بەهێز دەزانی وئومێدەواربوو تاتەمەنی هەشتاو نەوەت ساڵی بژی. ئەو نەیدەزانی کەنەخشەی کوشتنی کێشراوەو کۆمەڵی لەدۆستە نزیکەکانی ئەو بەشداری پلانی کوشتنی دەکەن, سیزار ئەوەندە بەهێزو دەسەڵاتداربوو لەگەورەیی خۆیدا کەسانی تری وەك مێروولە لەبەرێکانی خۆیدا دەدیتن- بەبیری دانەدەهات ئەو مێرولانە خەریکی پلاندانان ونەخشەی کوشتنی ئەویان کێشاوە. ئەو کەسانەی دەیانەویست دیکتاتۆری ڕۆمی بکوژن لەبەرئەوە دەیانکوشت چونکە زۆر بەبەهێزو توانایان دەزانی و پێیانوابوو سیزار لەڕۆمدا ئازادی وحکومەتی دیموکراسی نەهێشتووە.

ئەو دۆستە نزیکانەی سیزار کەنەخشەی کوشتنی ئەویان کێشابوو بەناوی بەرگری کردن لەئازادی ودیموکراسی دەستیان بۆکوشتنی دەبرد, دوای مردنی سیزار ئەوانە ڕایانگەیاند کەئێمە دۆستی سیزار بووین- بەلأم ئێمە ئازادی ودیموکراسیمان لەئەو زیاتر خۆشدەویست ولەسەر ئەو بنەمایە ئەومان کوشت.

کاتێ خاتونەکەی من ئەمەی بیستەوە گوتی ئەوانە درۆدەکەن ودەیانەوێ هاوولأتیان فریوبدەن ئەوانە لەگەڵ ئازادی ودیموکراسیەتدا نین بەڵکو بۆیە سیزاریان کوشت چونکە ئیرەییان بەئەو دەبرد چاویان بەرینایی نەدەدا شانازی وشکۆمەندی ئەو ببینن.

ئەشرافەکانی ڕۆم کەپێش دەسەلأتدارێتی سیزاریش هەر لەکۆنەوە نەریتوابووە ئەوانە دەبوونە سیناتۆرو هەریەکەیان حکومیان بەسەر بەشێکی ولأتدادەکرد, دوای ئەوەی سیزار دەسەلأتی گرتەدەست, ئەوانە واتە سیناتۆرەکان وەك خزمەتکاری ئەویان لێهات و هەرچی سیزار گوتبای بێ چەندوچون قبوڵیاندەکرد, ئیتر وایلێهات پەرلەمانی ولأتی ڕۆم نەیدەتوانی سەبارەت بەمەسەلەیەك بڕیاربدات, هەموو بڕیارەکان لەلایەن کەسێکەوە دەدران ئەویش سیزاربوو ئەو بڕیارەکانی خۆی وەك قانونێك بۆ پەرلەمان دەناردن وپەرلەمانیش بێ ئەوەی وشەیەك لەدەقی ئەو بڕیارە بگۆڕن دەنگیان لەسەر دەدا, بەدرێژایی ڕۆژگارەکان هۆکاری دروستبوونی داخ لەدڵی وکینە لای ئەو مرۆڤانە دروستبووە کەخۆیان بەکەم زانیوە, ئێرەیی لەزۆرکاتدا ڕوپۆشی تەفرەدانی خەڵك لە خۆی دەگرێت ولەیۆنان و ڕۆمیشدا بەڕووکەشی بەرگریکردن لەئازادی ودیموکراسی دەخرێتە ڕوو.

ئەو کەسانەی کەبەخیلی بەپلەو پایەو دەوڵەمەندی وبەتوانایی کەسانی تر دەبەن ناتوانن هۆی داخ لەدڵی خۆیان بەیانبکەن و بۆ شاردنەوەی ئەمەش پەنابۆ دەمکوتان لە بنەماو بەهانەی درۆی تر دەبەن, ئەو ڕۆژەی قانونی بوون بەدیکتاتۆری سیزار بۆ هەمیشە دەنگی بۆدرا- هیچ یەك لەسیناتۆرەکان نەدەوێران لەگەڵ دەرچوونی ئەو قانونەدا ناڕەزایی دەرببڕن- مەگەر کەسێکی وەك ( کاسیوس ), کەلەو ڕۆژەدا هاتە سەر ممبەری پەرلەمان ڕەخنەی لەو بڕیارە گرت وگوتی سیزار بەکێکە لەنزیکترین دۆستانی من و من بڕوای تەواوم هەیە ئەو شایە بەلأم شایەتی ئەو نابێ ببێ بەهۆی ئەوەی بنەماکانی کۆماری ودیموکراسی بنێتە ژێرپا, حکومەتی کۆماری بۆیە لەڕۆمدا دانراوە دەسەلأتدار بۆ ماوەیەك بەسەرۆکی بمێنێتەوەو دواتر لابرێت وئەو کەسە موشە خۆرانەی کەلەسایەی ئەوەوە پلەو پایەیان وەرگرتووە لەسەرکار لابرێن ودەستەیەکی تر بێنە سەرکار, چونکە بەدەگمەن دەسەلأتدارێکی ئاوا دەتوانێت میللەت توشی بەدبەختی بکاتەوە, بەڵکو لەزۆربەی کاتەکاندا تەنانەت دەتوانم بڵێم هەمشە لایەنگرانی یەك سەرۆك کەبوونەتە موشەخۆرو خاوەن پلەو پایە بۆ بەرژەوەندی خۆیان میللەت بەرەو هەڵدێر دەبەنەوەو لەنێوان سەرۆك ومیللەتدا نێوانێك دروستدەکەن تادەستی خەڵك بەدەسەلأتدران نەگات, ئەوانەی لەدەوری کەسی سەرۆکدا کۆدەبنەوە بەردەوام وای دەردەخەن کەبڕیارو پرۆسەکانی ئەمانە لەژێر فەرمانی سەرۆکدا دراون وهەر کەسێك ناکوکبێت لەگەڵ ئەو نەخشانەدا ئەوا دژایەتی خودی سەرۆك دەکات- لە کاتێکا زۆرکات سەرۆك ئاگای لەونەخشەو بڕیارانەنییە- یان نازانێت کێ ئەم بڕیارەی دەرکردووە, لەهەموو حکومەتێکدا ئەگەر باشیشبێت ئەوانەی لەدەوروبەری سەرۆکدان بەهۆی ئەوەوە بوونە خاوەنی کارو پلەو پایە بەخراپ کەڵك لەپێگەکەیان وەردەگرن و زۆر لەبەرژەوەندی

ودەستگیرۆیی وشتە باشەکان بۆخۆیان قۆرخ دەدەن, لەحکومەتی کۆماریدا چونکە ماوەماوە سەرۆك دەگۆڕدرێت ولەگەڵ ئەودا ئەوانەی دەوروبەریشی دەگۆڕدرێن میللەت تاماوەیەك ئاسودە دەبێت لەدەست ئەو کەسانەی بەخراپی پلەو پایەی خۆیان بەکاردەهێناو بۆ بەرژەوەندی خۆیانبووە, تائەمەی دوایش زاڵدەبێت ئیتر سەرۆکەکەی دەگۆڕدرێت وبەو شێوەیە, ئێستا قانونێك خراوەتە پێش پەرلەمان کە دەنگی لەسەربدات ئەویش ئەوەیە سیزار بۆهەمیشە ببێتە دیکتاتۆر- واتە تائەو ڕۆژەی زیندووبێت بەڕەهایی حکومەت بکات, خودی سیزار تەنها جێگای شانازی ڕۆم نییە [1] بەڵکو ئەو یەکێکە لەڕیفۆرمخوازە گەورەکان وئەو کارانەی ئەو لەڕۆمدا کردوونی و ئێستا خەریکی جێبەجێکردنیانن ئەوە نیشاندەدەن کەمیللەتی ڕۆم هەرخێرو خۆشی و چاکسازیان لەئەو دیوە بەڵام بوونی حکومەتی دیکتاتۆری هەمیشەیی سیزار، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو دارو دەستەی دەوروبەری ئەو کەتا ئەمڕۆ بونەتە خاوەنی پلەپایەو ئەوانەی لێرەو دواش لەسایەی سیزاردا دەبنە خاوەنی پلەوپایە ئیتر دەتوانن ئازادانە لەوڵاتی ڕۆمدا بەرژەوەندی خۆیان بپارێزن, لێرەودوا چونکە حکومەتی دیکتاتۆری سیزار بۆ هەمیشەیی دەبێت ئیتر پەرلەمان ناتوانێت سەبارەت بەکاروبارەکانی وڵات و ئیمپراتۆریەتی ڕۆم هیچ بڕیارێك دەربکات, هەروەها لایەنگران وئەوانەی لەدەوروبەری سیزاردان هەرجۆرە بڕیارێکی کەبۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان کاری بۆ دەکەن بەناوی سیزارەوە ڕایدەگەیەنن دیارە ڕێزو شانازیکردن بەسیزار لەڕۆمدا ئەوەندە زۆرە هیچ کەس ناتوانێت نارەزایی وسکاڵا دەربڕێت, سەر ئەنجام یەك حکومەتی سەرکوتکەر لەڕۆمدا فەرمانڕەوایی دەکات وهەریەك لەوکەسانەی لەدەوروبەری سیزاردا دەبن دەبنە یەك دیکتاتۆری بچوك, لەوکاتەی دیکتاتۆری گەورەی ڕۆم هەرخەریکی بەر فراوانکردن و زیاتر چەسپاندنی چاکسازیەکان دەکات، دیکتاتۆرە لاوەکییەکانی تری ناوئەو حکومەتە هەرخەریکی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەبن بۆیە من (هەر کاسیوس قسەدەکات) بەوەی باوەڕم بەپاشایەتی سیزار هەیە لەگەڵ بڕیاری دیکتاتۆر بوونی ئەو بۆهەمیشەیی ناکۆکم, ئەو ڕۆژە هیچ یەك لەسیناتۆرەکان نەوێران پشتگیری قسەکەی کاسیوس بکەن پەرلەمانی ڕۆم‌دەنگی بۆئەو قانونەدا.

ئەو ڕۆژەی لەناو پەرلەماندا هێرشیان کردەسەر سیزار وکوشتیان یەکێك لەو کەسانەی کێردی لەسیزار دابوو کاسیوس بوو, دوای ئەوەی خاتونەکەی من لەلایەن سیزارەوە وتەکەی کاسیوسی بۆشیکرایەوە بەسیزاری گوت هەتا ئەو کوڕەش کەلە بنەماڵەکەیاندا پشتاو پشت ئازادی خوازبوون ئیرەیی بەمەزنی وسەرکەوتویی تۆ دەبات وکینەی خۆی بەشێوازی بەرگریکردن لەئازادی میللەتی ڕۆم دەردەبڕێت, سیزار ئەو شەوەی کە وتەکەی کاسیوسی بۆکلیۆپاترا شیدەکردەوە ئەو ڕایەی ناوبراوی بەڕاست زانی و گوتی: کاسیوس ڕاستدەکات تەنانەت لەحکومەتێکی باشیشدا خەڵکانی دەوروبەرو لایەنگرانی سەرۆك بۆبەرژەوەندی خۆیان کاردەکەن, ناتوانرێت حکومەتێك دروستبکرێت کەکەسانی دەوروبەری سەرۆك ولێپرسراوانی حکومەت بۆ بەرژەوەندی خۆیان کارنەکەن, بەڵام ئەگەر سەرۆك باش و وردبینبێت دەتوانێت تائاستێکی باش بۆ لێپرسراوانی خۆی سنوردابنێت و نەیەڵێت ئەوانە شوڵی لێهەڵماڵن و بۆ بەرژەوەندی خۆیان میللەت بروتێنەوە.

یەکێکیتر لەوکەسانەی ناکۆکبوو لەگەڵ سیزاردا بەناوی ئازادی ودیموکراسییەوە دەدوا ناوی( بروتوس) بوو, بروتوس دایکێکی زۆر جوانی هەبوو بەناوی( سرویلیا )و پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ

سیزاردا هەبووە, بۆیە هەندێك دەڵێن بروتوس کوڕی حەرامزادەی سیزاربووە, خاتونەکەی من ئەم پروپاگەندەیەی ڕەتدەکردەوەو دەیگوت ئەگەرچی بروتوس بیست وچوار ساڵ لەسیزار بچوکتربوو بەڕوکەش دەتوانرا بگوترێت ڕۆڵەی سیزارە, بەلام بەدڵنیاییەوە بروتوس لەپشتی سیزار نەبووە چونکە ئەگەر بروتوس لەپشتی سیزاربا ئەوا سیزار ڕاستەوخۆ پارێزگاری لێدەکردو بەڕۆڵەی خۆی دەناساند, ئەو خۆشەویستیەی سیزار لەبەرامبەر بروتوسدا هەیبوو, خۆشەویستیەك بوو کەهەر عاشقێك لەبەرامبەر بەڕۆڵەی مەعشوقەکەی خۆی هەیەتی.

کاتێ سیزار عاشقی سرویلیابوو بروتوس منداڵبوو، چونکە سیزار زۆری ئەو دەبینی, ڕاهاتبوو ئەووەك ڕۆڵەی خۆی سەیربکات، دەیانگوت بروتوس لەو کەسانەیە کەئازادی بۆ ئازادی دەوێت نەك بۆ وەرگرتنی بەرژەوەندی سیاسی.

دەیانگوت بروتوس ئامادەیە گیانی لەڕێگای ئازادیدا بەختبکات ئەگەر بشزانرێت بۆ نەوەکانی بچوکترین کەڵکی نابێت. بەلام خاتونەکەی من باوەڕی بەو قسانە نەدەکردو دەیگوت بروتوس وەك ئەوانیتر, ئازادیخوازی بۆفریودانی هاولاتیان کردۆتە دروشمی ئەو کەسانەی ڕقیان لەبروتوس دەبۆوە، دەیانگوت ئەگەر لایەنگری حکومەتی دیموکراسییە بۆچی سود دەخوات؟ چونکە بروتوس سود خۆربوو وپارەی بەسودی زۆردەدا بەو کەسانەی کەموحتاجبوون, من [1] ئەمە بەکەموکوڕی نازانم چونکە مەسەلەی ئازادی خوازی بروتوس ولایەنگری ڕژێمی دیموکراسی یەك بیروباوەڕی سیاسییەو سود خۆریش یەککاری بازرگانییە, دوژمنەکانی بروتوس دەیانگوت پیاوێکی ئازادیخوازو لایەنگری ڕژێمی دیموکراسی نابێ سود خۆری بکات, چونکە ئامانجی کۆتایی ئازادی خوازی ودیموکراتی ئەوەیە چینە بێبەشەکانی کۆمەڵگا ببنە خاوەنی ماف, سودو قازانج وەرگرتنی ئەو کەسانە ناکۆکە لەگەڵ ئازادی و دیموکراسیدا, بروتوس بەوەی هەرلە منداڵییەوە سیزاری دەناسی وبەکەڵك وەرگرتن لە پارێزگاریکردنی سیزار بووبە خاوەنی پلەوپایەی باش چونکە یەکێکبوو لەلایەنگرانی ئازادی- یان هەر نەبێ بەڕووکەش واینیشاندەدا, ئەو لەوباوەڕەدابوو سیزار دەیەوێت یەك ڕژێمی سەرکوتکەری دیکتاتۆری هەمیشەیی لەڕۆمدا دامەزرێنێت, بڕیاری کوشتنی سیزاریدا ئەو وکاسیوس توانیان هەشتا کەس کۆبکەنەوەو ببنە هاوپەیمان بۆ کوشتنی سیزار.

کاسیوس چونکە سیناتۆربوو دەیتوانی لەکۆبونەوەکانی پەرلەمانی ڕۆمدا بەشداری بکات, بروتوس ئەندام پەرلەمان نەبوو بەلام بەهۆی ئەوەی لێپرسراوی یەك بەڕێوەبەرایەتی بێلایەنبوو دەیتوانی لەکۆبونەوەکانی پەرلەماندا بەشداربیکات, بروتوس هەرجارەی دەچوو بۆپەرلەمان ولەسەر کورسیەکەی دادەنیشت دەیبینی پارچە کاغەزێ بەمێزەکەیەوە نراوەو لەسەری نوسراوە( بروتوس لەخەو هەڵسە ) یان دەنوسرا ( بروتوس ئیتر تۆ پیاوی جاران نەماوی ) تائەو ڕۆژەی کاسیوس وبروتوس یەکیان نەگرت بۆلەناو بردنی سیزار کودەتاچییەکان (ئەو هەشتا کەسەی دوژمنی سیزاربوون) هێزیان نەبوو, بەلام دوای ئەوە ئەمانە ئومێدەواربوون لەوەی دەتوانن لە کوشتنی سیزاردا سەرکەوتووبن, هەرچەندە ئێمە [1] ئەوکاتە لەڕۆمدا دەژیاین, بەلام ئاگامان لەوناکۆکی وگرژیانەی نێوان سیناتۆرو ئەندامەکانی ڕۆمی وسیزار نەبوو هۆکەشی ئەوەبوو ئێمە لەدەرەوەی شاری ڕۆم لەوکۆشکەی سیزار بۆخاتونەکەی منی دروستکردبوو دەژیاین, ئەو ڕۆمییانەی لەوکۆشکەدا بۆسەردانی کلیۆپاترا دەهاتن, بە شاژنی میسریان

نەدەگوت ئەشرافەکانی ڕۆم چەند ڕق وکینەیان لەسیزار داگردووە, ئەو هەواڵانەی خاتونەکەی من بیستی دوای گەڕانەوەی ئێمەبوو بۆمیسر بەتایبەت ئەو باسانە لەلایەن ئەنتوانەوە دران بەخاتونەکەی من, بەئەندازەیەك ئەشرافەکانی ڕۆم کینەیان لەسیزار داگرتبوو بیریان لەهیچیتر نەدەکردەوە. ڕۆژێکیان بروتوس دەچێت بۆماڵی یەکێك لەئەشرافەکان وسەیردەکات ئەوپیاوە نەخۆشەو ڕاکشاوە, ناوبراو گوتی بە داخەوە نەخۆشی, بەڵام هەرکە ئەو نەخۆشە ئەشرافە گوێی لەو قسەیەبوو هەڵستابوو ودانیشتبوو وگوتبووی: بروتوس ئەگەر تۆ بیرۆکەیەکت لایە من دەتوانم بەسەر نەخۆشیەکەی خۆمدا زاڵبم ولێرەبڕۆم, لەکاتی گفتوگۆکردن لەسەر شێوەی دانانی پلانی کوشتنی سیزار کەس ناوی سیزاری نەدەهێنا, بەڵام هەموو تاوتوێکردنەکان وباسەکان لەسەرئەو بوون هەرکە یەکێکیان بەئاماژە دەدوا ئەوانیتر دەیانزانی مەبەستی لەکێیە.

زۆربەی ئەو کەسانەی پلانی کوشتنی سیزاریان دادەڕشت دۆستی نزیکی ئەوبوون بەڵام دەیانگوت خزمەتکردن بەبنەماکان باشترە لەدۆستایەتیکردنی سیزار, ڕێزگرتن لە ئازادی ودیموکراسی ئەرکێکی گەورەترە لەڕێزگرتن لەسیزار.

سیزار نەیدەزانی نەخشەی کوشتنی ئەو کێشراوە, هەرچەندە بەردەوام کۆمەڵی پارێزەری لەگەڵدابوون بەڵام خۆی ئەوەندە بەگەورەو کەسانیتری بەبچوك دەبینی, پێموا نەبوو کەس دەتوانێت زیان بەئەو بگەیەنێت.

کاسیوس وبروتوس ودوژمنەکانی تری سیزار, دەیانزانی سەرداری ڕۆمی بەتەمایە بچێت بۆ مەکەدۆنیاو لەوێوە ڕێگای خۆرهەڵات دەگرێتەبەر تالەگەڵ ئێرانییەکاندا بجەنگێت, سیزار دەیویست خاتونەکەی منیش لەگەڵ خۆیدا ببات چونکە دەیگوت دوور لەکلیۆپاترا ناتوانێت بژی, کودەتاچیەکان دەیانویست پێشئەوەی سیزار بەرەو خۆرهەڵات بڕوات بیکوژرن, چونکە ئەگەر بەرەوخۆرهەڵات بڕوات ئەوالەشەڕێکی تردا سەردەکەوێت وکەلەکاتی گەڕانەوەی بۆ ڕۆم ئەو بکوژن ئەوا میللەتی ڕۆم بکوژانی سیزار کوتکوت دەکەن, چەند شوێنێکیان بۆکوشتنی ئەو دیاریکردبوو سەرئەنجام بینای پەرلەمانیان پێ لەهەموو شوێنەکانیتر باشتربوو.

کۆبونەوەی پەرلەمان لەڕۆژی پازدەهەمی مانگی مارسدا بەستراو ئەو کەسانەی کودەتاکەیان دەکرد زانیان ئەم کۆبونەوەیە دواین کۆبونەوەی پەرلەمان دەبێت پێش ڕۆیشتنی سیزار بەرەوخۆرهەڵات, دەیانزانی سیزار بۆخواحافیزی دێت بۆپەرلەمان, دوای ئەوەی سیزار کوژرا, ڕۆمییەکان گوتیان پێشئەوەی ناوبراو بکوژرێت شتی وا ڕووی دابوو کەنیشانەی لەناوچوونی ئیمپراتۆری پێوە دیاربوو, ڕۆمییەکان زۆر حەزیان لەفاڵگرتنەوەو جادوگەری بوو تەنانەت لەپێش میسریەکانیشەوە باوەڕیان بە فاڵوجادوو هەبووە.

من نازانم ئەو پێشهاتانەی کەڕۆمیەکان باسی دەکەن پێش کوژرانی سیزار ڕوویداوە -یان نا, بەڵام بەهەر شێوەیەکبێت ئەو پێشبینیانەی فاڵگرەکان دەڵێن ئەگەر دوای ڕوودانیبێت ئەوا دەبێ بەوریاییەوە وەربگیرێت. من هەندێ لەو ڕاستیانە باس دەکەم بەڵام نازانم پێش کوژرانی سیزاربوون- یان دوای کوژرانی: دەڵێن چەند ڕۆژێك پێشئەوەی سیزار بکوژرێت ئەو ئەسپانەی کەسەرداری ڕۆمی

دابونیە پەرستگای خواکانی ڕۆم لەخواردنی ئالیك وەستابوون وتاڕۆژی کوژرانی سیزار فرمێسکیان ڕشتووە.

نیشانێکی تر ئەوەیە: سیزار هەریەك لەو سەربازانەی کەماوەیەکی دوورو درێژ خزمەتی سەربازیان کردووە پارچەیەك زەوی داونەتێ بۆئەوەی بیکەن بەخانوو- ئەو سەربازانەش بۆدروستکردنی خانوەکانیان دەستیانکردووە بەهەڵکەندنی بناغەکانیان و لەوبناغانەدا ئێسقانی مردوێکیان دۆزیوەتەوەو لەتەك ئەو پەیکەرە ئێسکانەدا لەوحەیەك دانراوەو لەسەری نوسراوە، ئەو ڕۆژەی ئێسکەکانی من دەدۆزنەوە ئەوا گەورەترین دیکتاتۆری ڕۆم دەکوژرێت, یەکێکی تر لەو ڕووداوانەی کەوابەستە بە مەرگی سیزاربوو: گوایە ڕۆژێك پێش کوژرانی سیزار، واتە ڕۆژی چواردەهەمی مانگی مارس، بینیویانە چەند باڵندەی گۆشتخۆر ڕاوەدووی کۆترێکی ئەشکەوتیان ناوەو ئەو باڵندە بێ ئازارە لەسەربانی یەکێك لەماڵەکان نیشتۆتەوەو ویستویەتی خۆی بشارێتەوە بەڵام نەیتوانیوەو ئەو باڵندە گۆشتخۆرانە کۆترەکەیان کوشتووە.

هەروەها ڕۆمییەکان دەڵێن لەشەوی پازدەهەمی مانگی مارسی ساڵی ( 287 )ی دوای دروستکردنی شاری ئەسکەندەریە, ڕووناکیەك لەئاسماندا پەیدابووەو ئەو شەوقە بە دەنگێکی ترسناکەوە کەوتۆتە سەرگردی کاپی تول.

من باوەڕم بەهیچ یەك لەمانە نییە جگە لەوەیان کەخاتونەکەی من لەخەودا بینیبووی پومپە سەرەبڕاوەکەی خۆی بەدەستەکانی گرتبوو ولەدامەن گردی کاپی تول داوەستاوەو بە سیزاری گوتووە تۆمنت بەخیانەت کوشت ئێستاش نۆرەی تۆیە بکوژرێیت.

خاتونەکەی من پێشئەوەی سیزار بکوژرێت ئەم خەونەی بۆگێڕامەوە بۆیە گومانم نییەلەوەی پێش کوژرانی سیزار لەڕێگای خەونەوە بەخاتونەکەی من گوتراوە سیزار دەکوژرێت, کاتێ بەرەبەیانی ڕۆژی پازدەی مانگی مارس هات ئەو کەسانەی کەدەبوا لەوڕۆژەدا سیزار لەپەرلەماندا بکوژن، کێردو خەنجەرەکانی خۆیان خستەژێر جلەکانی خۆیانەوەو دوای ئەوەی کەمێ خۆرکشا ڕێگای پەرلەمانیان گرتەبەر, ئەو کەسانەی سیزاریان کوشت مافی ئەوەیان هەبوو بچنەناو پەرلەمانەوە ئەمانە بریتیبوون لەئەندام پەرلەمان وپرتورەکان ولگاتەکان و کنسوڵەکانی پێشوو, پێشئەوەی سیزار بچێتە ناو بینای پەرلەمانەوە- کورسییە زێڕەکەی تایبەت بەئەویان بردبۆ هۆڵەکە, کودەتاچییەکان خۆیان ئامادەکردبوو هەرکە سیزار هاتەناو هۆڵی پەرلەمانەوە دەورەی بگرن وبیکوژن بەڵام هاتنی سیزار دواکەوت, هۆی ئەو دواکەوتنەش ئەوەبوو کۆمەڵی فاڵگرەوە باڵندەیان سەربڕیون وسەیری دڵ وڕیخۆڵەکانیان کردوون وبەسیزاریان گوتووە بۆ دانیشتنی ئەم جارەی پەرلەمان مەچۆ, بەڵام دیکتاتۆری ڕۆم کەدەیگوت باوەڕم بەئەفسانەو جادوگەری نییە، گوێی بەوە نەداوە بەتایبەت دوای ئەوەی لەلایەن سەرۆکی پەرلەمانەوە وەلامێك بۆسیزار نێردراوە کەئەندامانی پەرلەمان ئامادەی کۆبونەوەن وچاوەڕوانی بەڕێزی دەکەن, دەڵێن پێشئەوەی سیزار بگاتە پەرلەمان لە ڕێگادا نوسراوێکیان بەئەوداوە کەتێیدا ناوی کودەتاکەرەکانی تێدا نوسراوە ئەمە لە پروپاگەندە دەچێت وناتوانرێت بڕوا بەمە بکرێت، کاتێ سیزار گەیشتە پەرلەمان- وەك هەموو جارانی پێشوو بێپارێزەربوو تەنها ئەنتوان لەگەڵ ئەوداچووە هۆڵی پەرلەمانەوە.

یەکێك لەکودەتاچیەکان خۆی گەیاندۆتە ئەنتوان وەك ئەوەی کارێکی نهێنی پێبێت سیزاری دوور خستۆتەوەو دەستی کردووە بەقسەکردنێکی دوور درێژ تابیخافڵێنێت.
کاتێ سیزار بەتەنها ماوەتەوە کودەتاچیەکان چوار دەورەیان گرتووەو یەکێك لەوانە بەناوی ( سیم بر ) داوای لەسیزارکردووە براکەی کەبەفەرمانی ئەو دوورخراوەتەوە بۆ تاراوگە، ببەخشێت وئەو بگەڕێتەوە ڕۆم, سیزاریش لەوەڵامدا گوتویەتی ناتوانم ئەو کارەبکەم, دوبارە سیم بر داواکاریەکەی خۆی دووبارە کردۆتەوەو سیزار بەسەر سوڕماویەوە تەماشای کردووە چونکە کاتێ سیزار وەڵامی شتێکی دابایەوە کەس نەدەوێرا گوتەکەی خۆی دوبارە بکاتەوەو سووربێت لەسەر قسەکەی، سیم بر سەر سوڕمانی سیزاری پێ سەیر نەبووەو جبەکەی سەرشانی کەئەشراف لەبەریان دەکرد لاداوە تاشانەکانی دەرکەون ئەمەش نهێنی ئەوەبووە کودەتاچیەکان هێرش بکەنە سەر سیزار, دەڵێن یەکەم کەس کەچەقۆکەی لەسیزار وەشاندوە کابرایەکبووە بەناوی (کاسکا )و ویستویەتی لەپشتەوە چەقۆکەی لەملی سیزاربدات بەڵام سیزار وەرسوڕاوەتەوەو چەقوەکە لەدەموچاوی دراوەو دواتر توانیویەتی دەستی کاسکا بگرێت، بەڵام براکەی کاسکا هێرشی کردۆتەسەر سیزارو چەقوەکەی خۆی لەبەر موسڵدانی سیزار داوەو دواتر کاسیوس زەبرێکی بەهێزی لەڕووخساری سیزار داوەو بروتوسیش خەنجەرەکەی خۆی لەسیزار وەشاندوە، کاسیوس خەنجەرەکەی خۆی لە ڕووخساری سیزارداوە ئیتر هەموو ئەو کەسانەی لەدەوروبەری سیزاردابوون هێرشیان کردۆتەسەرو بەجۆرێك داخ لەدڵبوون لەبەرامبەر سیزاردا تاچەند کەس لەمانە لەبری ئەوەی چەقۆکانیان لە سیزار بدەن دۆستەکانی خۆیانیان پێبریندارکردوون.
ئەوانە لەوە ترساون سیزار بەزیندویی بمێنێتەوە، چونکە پێیانوابوو ئەوەندە هێز لەناو ئەو پیاوەدا کۆبۆتەوە بەزەبرێك ودووان وسێ لەبەین ناچێت, سیزار لە ساتەوەختەکانی سەرەتادا زانیبووی ناتوانێت بەرەنگاری ئەمانە بێتەوە, دۆستەکانی جگە لەئەنتوان کەسی تر لەناو پەرلەماندانەبوون ئەنتوانیش نەیتوانی بەرگری لە سیزاربکات چونکە کودەتاکەرەکان لەئەنتوانیان گەیاندبوو ئەگەر بیەوێت پشتگیری سزاربکات ئەوا ئەویش دەکوژن تەنانەت ڕێگاشیان نەدابوو لەناو بینای پەرلەمان بچێتە دەرێ نەکا بچێت بەدۆستەکانی سیزار بڵێت فریای دیکتاتۆری ڕۆم بکەون, سەربازانی سوپای سیزار کەخۆرهەڵات و خۆرئاوای دنیا لەژێر پێکانیاندا دەلەرزی لەوێ نەبوون تابەرگری لەئەوبکەن, ئەو دۆستانەی کەلە سایەی ئەودا ببونە خاوەنی پلەوپایەو دراو ولەپەرلەماندا بون، هیچ هەنگاوێکیان نەنا تانەهێڵن سیزاربکوژن چونکە ئەمانەش ئیرەییان بەسیزار دەبردو چاویان بەرینایی نەدەدا ببینن ئەوپیاوەی ڕۆژگارێ هاوشانی ئەوانبووە, بگاتە پلەی خوایی ومیللەتی ڕۆم ئەو وەك خواکان تەنانەت وەك ژوپیتری خوای خواکان سەیربکەین، من سەرم لەوەنەسوڕماوە دۆستە کۆنەکانی سیزار لە پەرلەماندا هەوڵیان نەداوە بەرگری لەسیزاربکەن ونەهێڵن بکوژرێت, چونکە تاقی کراوەتەوە دۆستان کاتێ بەرگری لەبەهێزەکان دەکەن و بۆ پارێزگاریکردن لەوانە خۆیان ڕووبەڕووی مەترسی دەکەنەوە کەبزانن ئەو کەسە لەحاڵەتی بەرزبونەوەدایە بۆ گرتنەدەستی دەسەڵاتی زیاتر, هیچ کەسێك بەرگری لەکەسێك ناکات کەهێزو توانای ئەو لەلوتکەدابێت, ئەوانەی کەدۆستەکانی سیزاربوون ولەناو پەرلەماندابوون دەیانزانی سیزار گەیشتۆتە پلەی خوایی وجێنشینیشی نییە, کاتێ کوژرا کەس ناتوانێت ببێتە جێگرەوەی ئەو تابۆ زیادکردنی خۆشەویستی خۆی لای خەڵك خۆی ڕووبەڕووی

مەترسی نەکاتەوە, هەر لێدانی کێردێك لەلەشی سیزار دڵی یەکێك لەمانەی فەرامۆشی پێدەهێنا چونکە ئەوکەسە دەیزانی ئیتر خۆی لەبەرامبەر سیزاردا بەبچوك نابینێت وناچارنابێت لەبەرامبەر دیکتاتۆری هەمیشەیی ڕۆمدا سەری کرنوژ دانەوێنێت, دەڵێن بیست وسێ چەقۆو خەنجەر لەجەستەی سیزاردرابوو, بەڵام خاتونەکەی من دەیگوت ئەوەندەیان چەقۆو خەنجەر لەلەشی سیزارداوە هەنجنهەنجن بووەو دواتر نەتوانراوە پارچەکانی کۆبکەنەوە, کاتێ سیزار زانیویەتی بەرگری کردن کەڵکی نییە, بەشەهامەتی پیاوانە شاقەلە ڕەنگ ئەرخەوانیەکەی خۆی( کەنیشانەی مەزنی وفەرماندەیی دیکتاتۆری خۆیبوو) بەسەر سەریخۆیدا هەڵکێشاوەو گیانی سپاردووە, لەوکاتەدا کاسیوس هاواریکردووە ئازادی ودیموکراسی ڕزگاری بوو،

لەو ڕۆژەدا سیسرۆنی نوسەری ناوداری ڕۆمی لەپەرلەمان نەبووەو چەقۆی لەسیزار نەداون، بەڵام خاتونەکەی من ئەویشی بەبکوژانی سیزار لەقەڵەمدەداو دەیگوت لەوانەیە سیسرۆن لەکوشتنی سیزاردا دەستی لەهەموان زیاتر هەبوبێت چونکە ئەو بە نوسینەکانی خەڵکی تری هاندەدا تاسیزار بکوژن.

ڕۆژێکیان کلیۆپاترا بەمنی گوت شرمیون ئەگەر ڕۆژێبێت سیزار نەمێنێت وڵاتی ڕۆم وەك یەك لاشەی زیندوی بێسەری لێدێت, هەرواشبوو بەهۆی نەمانی سیزار لەپڕ ئاشکرابوو وڵاتی ڕۆم کەسی نییەو کەس نییە بەرێوەی ببات, تائەو کاتەی سیزار مابوو لەڕۆمدا هەموو شتێك لەلای ئەوەوە بەرێوە دەچوو وکەس ئیرادەی سەربەخۆی نەبوو, هەموو سیناتۆرەکانی ڕۆم لەبەرامبەر حکومەتی ڕۆمدا ڕاهاتبوون فەرمان لە سیزارەوە وەربگرن وجێبەجێیبکەن, کاروباری سەربازی بەشێوەیەك وابەستە بەسیزار بوو کەس نەیدەتوانی بچوکترین ڕاوبۆچون سەبارەت بەکاروباری سەربازی دەربڕێت, دەربارەی کاروباری وڵاتیش سیناتۆرەکان- یان ڕای خۆیان دەرنەدەبڕی- یان کە دەریشیان بڕیبا بەوردی بیریان لەوەدەکردەوە شتێك بڵێن لەگەڵ ڕاکانی سیزاردا هاو تەریب وگونجاوبێت, کاتێ سیزار کوژرا هەموو کاروبارەکانی سەربازی لەناوخۆی وڵات و دەرەوەی وڵاتدا ڕاوەستا, سیزار ئەو ئاوەبوو کەئاشی دەگێڕا هەرکە ئاوەکە بڕا ئاشەکەش لەکارکەوت, ئەو کاتە خەڵك سەریان سوڕمابوو ولەخۆیان دەپرسی, بۆچی دنیا وایلێهات چ ڕوویداوە بۆ وامان لێبەسەرهات؟

لەنزیك پەرلەمانەوە سێرکێك هەبوو بروتوس یەکێك لەوپیاوانەی سیزاری کوشت جگە لەکاری سیاسی کاری بازرگانیشی دەکرد, گلادیاتۆرەکانی مەشق دادەدا تالەکاتی پێویستدا پشتگیریان بکەن, کۆیلەکان لەناو سیرکەکەدا بەجل وبەرگی ئاسایی دەهاتنە ناو سیرکەکەو لەپشتەوەی سەرێی شانۆکە دادەنیشتن, کاتێ بینەرانی سێرکەکە بینیان هەندێ کەس لەدەروازەی سیرکەکە هاتنە ژوورەوەو هەموویان جل وبەرگیان خوێناوی ببو وچەقۆو خەنجەریان بەدەستەوەیە, ئەوانە بکوژانی سیزاربوون- کەدوای کوشتنی ئەو لەپەرلەمان هاتونەتە دەرێ وخۆیان گەیاندۆتە تەلاری سێرکەکە, تا هەواڵی کوشتنی سزار بەهاوڵاتیان بڵێن و ئەوانە هاواریان دەکرد سیزار کوژرا ئیتر سەرکوتکردن نەماو لێرەدا دیموکراسی وئازادی لەم وڵاتەدا حکومدەکات, کاتێ خەڵك گوێی لەم قسەیەبوو لەگابۆڕیاندا لەسیرکەکە هەڵاتن, پێش ئەوەی هەواڵی کوشتنی سیزار بگاتە سیرکەکە، سیناتۆرەکانیش لەبینینی لاشەی هەنجنهەنجنکراوی سیزار ترساون وتەلاری پەرلەمانیان چۆڵکردووە, دوای کوشتنی سیزار بروتوس ویستویەتی وتەیەك پێشکەش بکات بەڵام کەسەیری کردووە چۆڵبووەو کورسییە بەتاڵەکانی

پەرلەمان کەسیان لەدەورە نییەو هەموو سیناتۆرەکان ڕۆیشتوون تەنانەت دوو سەر لەشکریش داردەستەکانی دەستیان کەلە عاج دروستکراون لێجێماوە, لەو ڕۆژەدا ئەو کەسانەی سیزاریان کوشت دەیانویست ئەنتوانیش بکوژن بەڵام بروتوس گیانی ئەنتوانی ڕزگارکردو گوتی ڕەگوریشەی سەرکوتکردن سیزاربوو ئەنتوان و ئەوانی هاوشێوەی ئەو پەلی لاوەکین وکاتێ ڕەگوریشە سەرەکیەکان هەڵکێشران پەلەکان خۆیان وشکدەبن, کوشتنی ئەنتوان خوێنڕێژیەکی زیادەیەو لەئێمە ناوەشێتەوە دەستی خۆمان بەخوێنی ئەنتوان شەلاڵبکەین, لەگەڵ ئەوەشدا ئەنتوان بۆئەوەی بچێتەوەماڵەکەی خۆی جلوبەرگی یەکێك لەدەستوپێوەندەکانی خۆی لەبەرکرد چونکە لەوە دەترسا لەڕێگادا بیکوژن.

کات هەواڵی کوژرانی سیزار لەناو شاردا دەنگی دایەوە, پاش ماوەیەك شەقام و ڕێڕەوەکانی شار چۆڵبوون: خەڵك پەنایان بۆ ماڵەکانی خۆیان بردوو بانگیان رادەهێشت دەرگاکان دابخەن دەرگاکان دابخەن ...

کەس نەیدەزانی لەچەند کاتژمێری داهاتوودا چ ڕوودەدات, هەموو کەس تەنانەت کۆیلەو خزمەتکارەکانیش لەگیانی خۆیان دەترسان, کودەتا چییەکان دوای ئەوەی سیزاریان کوشت تەرمەکەیان لەهەمان شوێندا جێهێشت و بۆ خۆشیان لەتەلاری پەرلەمان هاتنە دەرێ و چون بۆ سیرکەکەو دواتر ڕێگای( قورووم ) [1] یان گرتەبەر واتە ئەو گۆڕەپانەی کەلەسەردەمی ئازادی ودیموکراسیدا ناوەندی وتاربێژی سیاسیبوو, لەوێدا چەند کەسێك وتەیان پێشکەشکرد لەمانەش بروتوس، بەڵام ئەو وتانە لەلای خەڵك نەبوونە جێگای سەرنج, چونکە ڕۆمیەکان دەیانزانی دوای مەرگی سیزار هەرچەندە ڕژێمی دیکتاتۆری لەبەینچووە بەڵام ئەگەری ئەوەهەیە نائارامی وشەڕی ناوخۆ بێتەئاراو میللەت لەسەر دەمانی دیکتاتۆری خراپتری لێبێت.

کوژرانی سیزار زۆر خاتونەکەی منی هەراساننەکرد فرمێسکی بۆ لەچاوان نەهات, تەنها کەسێك بۆ مەرگی سیزار گریابێ هاوسەرە نەزۆکەکەی بوو.

لەهەمان ڕۆژدا ئەنتوان توانی بەجل وبەرگی خزمەتکاریەوە خۆی بگەیەنێتەوە ماڵەکەیی وبەخێرایی دەستوپێوەندەکانی کۆبکاتەوەو پرچەکیان بکات وبەمەش کەمێ دڵی ئاسودەبوو کەناکوژرێت, دوای ئەمە بەهاوسەرەکەی سیزاری گوت: هەموو سامانی مێرەکەی کەدووسەد( کرور سس ترزیود ) بوو بهێنێت بۆ ماڵەکەی ئەو, هاوسەرەکەی سیزاریش بەو بڕوایەی ئەگەر سامانی مێردەکەی لەماڵی ئەنتوان دابنێت, ئەوا پارێزراو دەبێت بۆیە ئەو سامانەی بۆماڵی ئەنتوان گواستەوە.

تەرمی سیزار تانزیکی خۆرئاوابوون هەرلەو شوێنەی کەتێیدا کوژرابوو، بێئەوەی کەس بوێرێت تەرمەکەی هەڵگرێتەوە, نزیکی خۆرئاوابوون، چەند کەس لە خزمەتکارەکانی سیزار غیرەتیان وەبەرخۆیان هێناو چوون تەرمی دیکتاتۆری ڕۆمیان لەناو پەرلەماندا هێنادەرێ و لەناو کەژاوەیەکیاندا داناو خستیانە سەر شانیان وبەرەو ماڵی سیزاریان برد, ئەوانەی سیزاریان کوشت, ترسیان لەخۆیان پەیداکردو بەخۆیان و دەستوپێوەندو گلادیاتورەکانیانەوە چوونەسەر گردی کاپی تول وشەو لەوێ مانەوە, بۆیەش ئەو شوێنەیان هەڵبژارد بۆئەوەی ئەگەر هێرشیان کرایەسەر بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن.

بەیانی ڕۆژی دواتر چەند کەس لەکودەتا چیەکان لەگردی کاپی تول هاتنە خوارێ و بەرەو فوروم چوون, چونکە پێشبینی ئەوەیان دەکرد خەڵك لەوێدا کۆببێتەوەو ئەوان وتەیان پێشکەش بکەن کلیۆپاترا بەمنی گوت ئەو وتەیەی ئەو ڕۆژە بروتوس بۆ ڕۆمیەکانی خوێندەوە لەڕووی لۆژیکیەوە زۆر باشبوو, بەڵام بروتوس وای وتەکە خوێندەوە کەبۆ سیناتۆرەکانبێت نەك بۆهاوڵاتیان, واتە پێی وابوو خەڵکیش وەك سیناتۆرەکان تێدەگەن ئەودەڵێ چی, ئاگای لەوەنەبوو زۆرینەی خەڵك لەڕاکانی ئەو تێناگەن وپەی بەبنەماکانی دیموکراسی نابەن, ئەگەر بروتوس لەو ڕۆژەدا بیتوانیبا هەست وسۆزی خەڵك بجوڵێنێت وسەرنجی ئەوانە بەلای خۆیدا ڕابکێشێت, نەك هەر تەنها دەبوو بەفەرمانڕەوای ڕۆم بەڵکو دەبوو بەئیمپراتۆری ڕۆمیش, بەڵام ئەو وتارە باشەی ئەو کاری لەزۆربەی هاوڵاتیان نەکردو نەبووە جێگای سەرنجیان, دوای ئەو کاسیوس دەستیکرد بەخوێندنەوەی وتەکەی بەڵام خەڵك تاقەتی گوێگرتنی داواکاریە سیاسیەکانیان نەبوو وبڵاوەیان پێکردو بکوژانی سیزار لەوێوە ڕێگای گری کاپی تولیان گرتەوەبەر, کاتێ سیزار کوژرا لەشکری تایبەت بەپاراستنی سیزار لەناو شاری ڕۆمدابوو وفەرماندەی ئەو لەشکرەش پیاوێکبوو بەناوی لپید.

لەکوژرانی سیزار ئەوەندە دەهری‌و هاربوو کەوتە بیری ئەوەی تۆڵەی سیزار بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەوکارەش ئەنجامبدات دەبوا مۆڵەتی لەئەنتوان کەدوای سیزار کەسی دووەمی ڕۆمیوو وەرگتبا, بەبێ ڕازیبوونی ئەنتوان نەدوێرا ئەوکارەبکات, ئەنتوانیش دوای ئەوەی گەیشتەوە ماڵی خۆیی وبینی هەموو سامانی سیزار لەڕێگای ژنەکەیەوە هێنراوە بۆماڵەکەی ودەتوانێت لەکوژرانی سیزار قازانج وبەرژەوەندی خۆی بپارێزێت, واتە دەتوانێ جێگای سیزار بگرێتەوە ئەگەر شەڕبکات, بەڵام کەئەمەی کردبا ئەوا شەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسا, چونکە بکوژانی سیزار لەگردی کاپی تولدا وردەوردە بەهێز دەبون وئەنتوان دەیزانی زاڵبون بەسەر ئەوانەدا ئاسان نییە جگە لەمانەش نەیدەویست ئەوانە بکات بەدوژمنی خۆی, دواتر ئەنتوان ئەوەشی بەبیرداهات لپید دوای ئەوەی لەکەفوکوڵی کوژرانی سیزار هێواش دەبێتەوەو ئەو پەرۆشیەی بۆئەو نەما، دەکەوێتە بیری ئەوەی بۆخۆی جێگای سیزار بگرێتەوە, هەرچەندە لپید لەوە بچوکتربوو بتوانێت لەجێگای پیاوێکی وەك سیزاردا دانیشێت, بەڵام ئەو کاتە ناوبراو بەهێزبوو و فەرماندەی لەشکری ناوشاربوو ودەیتوانی بەناوی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی سیزار کودەتایەك بکات ودەسەڵات بگرێتەدەست و وردەوردە خۆی بەهێزبکات, لەبەرئەم هۆیانەبوو ئەنتوان نەیدەویست تۆڵە لەبکوژانی سیزار بکاتەوە, بکوژانی سزار کاتێ زانیان ئەنتوان کۆمەڵێ لەدۆستەکانی خۆی لەدەوروبەری خۆیدا کۆکردوونەوەو لپید فەرماندەی لەشکری ناو ڕۆم لەژێر فەرمانی ئەودایە, بڕیاریاندا لەگەڵ ئەنتواندا دانوسانبکەن وچارەسەرێك بۆئاشتی بدۆزنەوە، ئەنتوان ئامادەنەبوو لەگردی کاپی تولدا گفتوگۆ لەگەڵ بکوژانی سیزاردابکات- داوایکرد سیناتۆرەکان لەناو تەلاری پەرلەماندا بۆئەو گفتوگۆیە بێن ولەوێ ڕێکبکەون, لەڕۆژی کۆبونەوەکەدا لپید سەربازانی لەشکرەکەی خۆی بەشێوەیەك لەدەوروبەری تەلاری پەرلەماندا دانابوون تا بکوژانی سیزار نەتوانن بچن بۆ تەلاری پەرلەمان وبەشداری لەوکۆبونەوەیەدا بکەن, بەڵام کاتێ کۆبونەوەکە دەستی پێکرد هەموو ئەوانەی لەوکۆبونەوەیەدا بوون ڕایانگەیاند کەسیزار کەسێکی سەرکوتکەربوو وبنەمای حکومەتی دیموکراسی خستبۆ ژێر پێکانی, ئەنتوان هەستیکرد پەرلەمانتارەکان نیازی بێتاوانکردنی بکوژانی سیزاریان هەیە

چونکە ئەوانە کەڵك لەبنەماکانی دەستوری مافپەروەری کۆماری ڕۆم وەردەگرن کەدەڵێت , کاتێ بنەماکانی ئازادی ودیموکراسی پێشێلکران- ئەرکی سەرەکی میللەت ئەوەیە دژی ئەمە بوەستنەوەو ڕاپەڕن و ئەوانەی پێشێلی ئەو مافەدەکەن بکوژن، بۆیە ئەو وتەیەکی پێشکەشکرد کەناوەڕۆکەکەی ئەمەبوو, هەر کاتێك پەرلەمان بڕیاری خیانەت بداتە پاڵ سیزار ئەوا دەبێ هەموو ئەو قانونانەی کە ئەو بەپەرلەمانی داون ودەنگیان لەسەر دراوە, لەڕووی ئیعتبارەوە نەمێنن وهەموو ئەو کارانەی کەئەو دەستی پێکردوون و هەندێکیشیان تەواو نەکراون هەڵبوەشێنێدرێنەوە, ئەنتوان دوای خوێندنەوەی ئەم وتەیەی پێشنیاری ئەوەیکرد چونکە سیزار خزمەتی ڕۆمیشی کردووەو کارەکانی کەڵکیان بۆ ڕۆم هەبووە پێویستە پەرلەمان سیزار بە خائین نەناسێت وبکوژانی ئەویش بەبێتاوان بزانێ, ئەم پێشنیارە دەنگی لەسەر دراو قانون وکارە خزمەتگوزاریەکانی سیزار ڕانەگیران وبکوژانی سیزاریش لەسزادان بەخشران.

ئینجا باوکی ژنەکەی سیزار کەیەکێکبوو لەسیناتۆرەکان دەستیکرد بەقسەکردن و گوتی: ئێستا پەرلەمانی ڕۆم دانی بەوەدانا کەسیزار خزمەتی ئەو وڵاتەو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی کردووە, شەرمەزارییە ناڕەوایە تەرمی ئەو بەمەراسیمی ڕەسمی بەڕێنەکرێت وەسێتنامەکەی کەماوەیەك لەمەوبەر نوسیویەتی بیخوێننەوەو بەپێی ناوەڕۆکی ئەو وەسێتنامەیە کاربکەن, وەسێتنامەکەی سیزاریان کردەوەو خوێندیانەوە, کاتێ خەڵك گوێیان لەوەسێتنامەکەی بوو لەژێرکاریگەری ئەو وەسێتنامەیەدا کەوتنەگریان, چونکە سیزار نوسیبووی، من میللەتی ڕۆمم زۆر خۆشدەویست وهەموو کاتێك تێکۆشاوم تامیللەتی ڕۆم سەربەرزترو بەهێزتربێت, ئێستاش کەمن دنیا جێدێڵم وەسێتدەکەم لەسەروەتی من هەموو کەسایەتی وئەشرافێکی ڕۆمی- سێسەد سس ترز سکە دراو بەکاشی بدرێتە ئەمانە، هەموو ئەو مڵکوباغ و تەلارانەی هەمە بەمیللەتی ڕۆمی دەبەخشم, لەبەشێکی تری ئەو وەسێتنامەیە کەکاریکردەسەر خەڵك ئەوەبوو، سیزار مانگانە لەپارەی خۆی موچەی بۆ چەند لەوکەسانەی کەکوشتیان دەدا لەمانەش بروتوس مانگانە بڕێ پارەی باشی لای سیزار بۆ بڕابۆوە, خەڵك مەزنی سیزارو پوچی بکوژەکانی ئەویان بەراورد دەکردو بیریان لەوە دەکردەوە بکوژەکانی سیزار کەهەموویان دۆستی نزیکی ئەوبوون ناجوانمێریان لەبەرامبەر ئەو پیاوەدا کردووە ئەو وەسێتنامەیە تێڕوانینی خەڵکیان لە بەرامبەر سیزاردا گۆڕی، پێشان ئەو بکوژانە کەسانێکبوون کەوڵاتی ڕۆمیان لە دیکتاتۆرێك ڕزگارکرد، بەڵام دوای ئەوەی وەسێتنامەکە خوێندرایەوە, خەڵك بکوژەکانی سیزاریان بەپیاو کوژ زانی و وایان لێکدەدایەوە ئەوانە کەسێکی جوانمێری ڕۆمیان کوشتوە.

شتێکیتر کەڕای خەڵکی لەبەرامبەر سیزاردا گۆڕی, مەسەلەی مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەی بوو بەشێوەیەکی ڕەسمی, خەڵك دەیانگوت ئەگەر سیزار خیانەتکاربووبێت, بۆچی تەرمی ئەو بەڕێوڕەسمی پرشکۆ بەڕێدەکەن, ئەگەر خیانتکاریش نەبوبێت و خزمەتی ڕۆمی کردبێ بۆچی بکوژەکانی ئەو سزانادەن؟

لەڕۆمدا وەك وڵاتەکەی ئێمە [1] تەرمەکان مۆمیایی ناکەن و دواتر بیاننێژن, بەڵکو تەرمی پیاوە گەورەکان دەسوتێنن، بڕیاردا تەرمی سیزاریش لەمەیدانی فورومدا بسوتێندرێت.

–واتە هارد پارکی ڕۆم کەتایبەت بەوتە بێژی گشتی بوو شوێنێکیان دروستکرد بۆ ئەوەی تابوتی سیزاری لەسەردابنێن، لەڕۆژی دیاریکراودا ئەو تابوتەی کەلە عاج بۆ تەرمی سیزار دروستکرابوو وشانێڵە ڕەنگ ئەرخەوانیەکەی دیکتاتۆریشیان بەسەر تابوتەکەی دادابوو, هێنایانە لەوشوێنەی کەتایبەت بۆ تابوتەکەی ئەو دروستکرابوو دایاننا, دواتر هەندێ لەهونەرمەندان نمایشێکی شانۆییان پێشکەشکرد ناوەڕۆکی شانۆکە باسی لەیەکێك لەکارەساتە ئەفسانەییەکان دەکرد سەبارەت بەژیانی یەکێك لەخواکان بوو کەبەدەستی یەکێك لەخزمەتکارەکانی دەکوژرێت، ناوەرۆکی نمایشەکە زۆر لە شێوازی کوژرانی سیزار دەچوو بەدەستی کودەتاچییەکان, دوای کۆتایهاتنی ئەو نمایشە, ئەنتوان لەتەك تابوتەکەدا وەستاو دەستیکرد بەخوێندنەوەی وتەیەك, ئەنتوان ناتیقێکی دیارو بەتوانانەبوو, بەڵام دەیتوانی بەزمانی خەڵك بدوێت وهەستی ئەوان بجوڵێنێت وهاوڵاتیان بهرۆژێنێت.

ئەنتوان لەسەرەتای وتەکەیدا هێرشی نەکردەسەر بکوژانی سیزار وتەنها باسی خزمەتە گەورەکانی سیزاریٰ کرد بۆ ڕۆم وگوتی: ئەو ئەوەندە میللەتی ڕۆمی خۆشدەویست وەسێتیکرد لەسامانی خۆی هەموو ڕۆمییەك بڕە پارەیەکی بدرێتیٰ, کاتێ سیزار هەموو سامانی خۆی بەهاونیشتمانیەکانی خۆی بەخشی ئیتر پێویستی بە خۆشەویستی ئەوان نییە چونکە ئەو دەیزانی وەسێتنامەکەی بۆ ئەوە نووسیوە، خۆ ئەگەر کەسێك مرد ئیتر پێویستی بەخۆشەویستی خەڵك نییە بۆی, تاکار بۆ زیادکردن و سەرنج ڕاکێشانی خۆشەویستی خەڵك بکات (ئەنتوان لەم خاڵەدا بەهەڵەداچوو چونکە ڕۆمیەکان بۆ وەرگرتنی ئەو موچەیە بەردەوام دەچوون، بەڵام سیزار موچەیٰ خەڵکانی دەوڵەمەندی بڕیبوو بۆیە نەدەهاتن بۆ وەرگرتنی ئەو موچە بڕاوەیەیە) ئەنتوان گوتی تاکەڕەخنە لەسیزار ئەوەبوو دەیانگوت پێشێلی ئازادی کردووە, من لە ئێوە دەپرسم هەمووتان خاوەن کەسایەتی وئەشرافی ڕۆمن، کەی کارێك بەپێی قانون کراوەو سیزار ڕێگای لێگرتووە؟ ئایا ئێوە کاتی خەریکی خانوو دروستکردن بوون ئەو ڕێگری لێکردوون؟ ئایا ئەو کاتانەی خەریکی کێڵان وڕەنێوهێنانی زەوی باغەکانتان بوون سیزار ڕێگری لێکردوون ؟

یان کەس بەئێوەی گوتووە ڕۆنی زەیتون ودانەوێڵە وشەرابی خۆتان نابێ بنێرنە دەرەوە بۆ فرۆشتن؟ ئایە کەس لەسەفەرەکانی ئێوە ڕێگریکردووە؟ هەڵبەتا نەخێر لەو جۆرە ئیشانەدا سیزار ئازادی ژێر پێ نەخستبوو؟

خەڵك ئاگایان لەوەنەبوو ئەنتوان زەمینە بۆ خۆی خەشدەکات کاری بەوەنییە کەسیزار بەنەمری بهێڵێتەوەو ستایشی بکات, بۆ جارێکی تر خەڵك فریویان خواردەوە هەرچەندە بەگشتی هەردەم خەڵك بەهەڵەدا دەچن, ئەو هاوڵاتیانە باوەڕیان بەوەهێنا سیزار گەورەترین کەس بووە کەخزمەتی بەڕۆم کردووەو ئەوانەی ئەویانکوشت گەورەترین تاوانبارو خیانەتکارن, لەوکاتەدا ئەگەر بکوژەکانی سیزار لەوێبان ئەوا خەڵك دەیکوشتن, یەك هیچ لەوانە لەوێنەبوون ولەگردی کاپی تولدابوون, دواتر خەڵکەکە هاواریانکرد بالەپەرستگای ژوپیتردا بسوتێندرێت, بەلام ئەو پاسەوانانەی لەدەوری تابوتەکەی سیزاردا بوون ڕێگایاننەدا خەڵك بیبات بۆ پەرستگای ژوپیترو ئاگریان بەردا تابوتەکەی سیزار, دواتر

هونەرمەنــدەکانی کەنمایــشێکی شــانۆییان پێــشکەشکرد ئــەو جلانــەی بۆنوانــدنی ئــەو شــانۆیە لەبەریانکردبوو دایانکەندن و هاویشتیاننە ناو ئاگرەکە, تاگڕی ئاگرەکە زیاتربێت, تەنانەت هەندێ لەکوڕە هەرزەکارەکان کولەجەکانی [1] خۆشیان دانان و هەڵیاندانە ناو ئاگرەکە، ئینجا خەڵك هەرشتێکی کەبیتوانیبا دەستبەرداری بێت دایدەکەندو هەڵیدەدایە ناو ئاگرەکەو گڕی ئەو ئاگرە کڵپەی دەهات وزیاتر بەرەو ئاسمان بەرزدەبۆوە.

ئاشـکرانییە ئـەو وروژانـەی خـەڵك لـەو ڕۆژەدا لـەناخی خەڵکـەوە هـەڵقوڵابوو- یـان ئـەنتوان هەنـدێ لەلایـەنگرانی خـۆی نـارد بۆنـاو ئەوخەڵکە بۆئەوەی هانیانبدات, لـەو کاتـەی تـەرمی سیزار لـەناو گڕی ئاگرێکی زۆردا دەسوتا هەندێ لەوهاوڵاتیانە هاواریانکرد با بچین بروتوس وکاسیوس بکوژرێن هەموو لایەك دەیانزانی ئەودوانە سەردەستەی کوشتنی سیزاربوون و ئـەو دوانـە -واتە بروتـوس و کاسیوس ئەوانی تریان تەفرەدابوو تاسیزار بکوژن.

خەڵك تـەرمی سیزاریان جێهێشت وبەرەو ماڵی بروتـوس وکاسیوس بـەرێ کـەوتن, ئاگایـان لەوەنـەبوو ئەودوانە لـەگردی کـاتی پولـدان نـەك لەماڵـەکانیان ، جگـە لەمـەش مـاڵی ئەمانـە لەلایـەن گلادیاتورەکان پارێزگـاری لێـدەکرا, کاتـێ ئـەو خەڵکـە بینیـان گلادیاتورەکـان پارێزگـاری لەماڵـەکانیان دەکـەن پاشەکشەیانکرد چونکە دەیانزانی شەڕکردن لەگەڵ ئەمانەدا ناکرێ وئەوان بەهێزن.

کاتێ خەڵکەکە بەنائومێدی گەڕانەوە کەسێکی بێ گوناهیـان کوشـت, ئێـستاش هـەر کاتێ لافاوێکبێت کۆمەڵێ بێگوناه تێدادەچن و زۆرینەی کات تاوانباران ڕزگاریـان دەبێـت, لەشـاری ڕۆمـدا دووکوڕە مام هـەبوون هـەردوکیان بەسینا بـەناوبانگبوون و نـاوی یەکـەمیان ( هلوبـوس سـینا) بـوو ئـەوی تریـان ( کونلیـوس سینا) بـوو هلوبـوس لـە لایـەنگرانی سیزاربوو بـەڵام کونلیـوس ناحـەزو دژمنـی سیزاربوو, خەڵکەکـە بیـستبویانەوە کەسـینا یەکێکـە لەدوژمنـەکانی سیـزار, ئاگایـان لـەوە نـەبوو کەسـینا نـاوی بنەماڵەییانە, یەکێك لەودوو کوڕە مامانەی کەلایەنگری سیزاربوو و نـاوی هلوبـوس بـوو لەبازاردابوو, هـەر کەخەڵکەکـە چـاویان پێیکـەوت شـاڵاویان کردەسـەرو بـواری ئـەوەیان پێنـەدا خـۆی بناسـێنێت وتێیانبگەیەنێت ئەوان بەهەڵەداچوون.

هلوبوسـی بەدبـەخت لـەماوەی چـەند دەقیقەیەکـدا بەدەسـتی خەلکـەوە کەلوپاچـەکرا, دوای ئـەوەی ناوبراویـان کوشـت ئینجـا زانیـان ئـەو بێگوناهـەو هەوڵیانـدا کـوڕە مامەکـەی تـری کـەدوژمنی سـیزارە بدۆزنەوەو بیکـوژن بـەڵام ئـەو هـەڵاتبوو, ڕۆمیـەکان لـەو شوێنـەی تـەرمی سیزاری تێـدا سـوتێندرا یـەك پایەی مەرمەڕیان لەوێدا دروستکردو لەسەریان نووسی( بەیادی باوکی نیشتمان ).

جگەلـە دۆسـتان و لایـەنگرانی سـیزار خـەڵکانی نەتـەوەی تـریش کەلەڕۆمـدا دەژیـان بـە مردنـی ئـەو غـەمباربوون, چـونکە سـیزار کەسـانی بیـانی کەلەڕۆمـدا دەژیـان لەسـایەی حکومـەتی ڕۆمیـدابوون و پارێزراوبوون و سیزار دەیگوت ئەو بیانیانەی لەڕۆمدا دەژین دۆستی ڕۆمیەکانن جێنشینبوونی ئەمانە لەم وڵاتەدا ئەوە دەگەیەنێت ئەوانە باوەڕیان بە ڕۆمەو نابێ کارێك بکرێت ئەوانە برەنجێن.

پێش گرتنەدەسەڵات لەلایەن سیزارەوە بیانیەکان بەتایبەت جولەکەکان لەرۆمدا ئاسایشیان پارێزراو نەبوو, هەر کاتێ شتێ رووی داباو ئاشوبێك دەهاتە ئارا, رۆمیەکان هێرشیان دەکردەسەر جولەکەکان و دەیانکوشتن, دوای ئەوەی تەرمی سیزاریان لەگۆرەپانی فورومدا سوتاند, رۆژانە جولەکەکان دەچوونە ئەو شوێنەو لە بەرامبەریدا رادەوەستان ولەو شوێنە رادەمان, رۆمیەکان ناوی ئەو شوێنەیان نا دووەمێ ( دیواری نەدیە) [1].

وەك لەمەوبەر گوتم سیزار لەگەڵ ئەوەیدا منداڵەکەی کلیۆپاترای بەرۆڵەی خۆی ناساند بەڵام ئەمەی بەرەسمی لەدادگاو قانونیانە تۆمارنەکرد, پێشئەوەی منداڵەکەی کلیۆپاترا بەرۆڵەی خۆی بناسێنێت. کوری براکەی خۆی کەناوی ( ئوکتاو )بوو بەزر کوری خۆی ناساندبوو, کاتێ سیزار کوژرا ئوکتاو لەدەرەوەی وڵاتدابوو دوای ئەوەی هەواڵی کوژرانی سیزاری بیست هاتەوە بۆ رۆم, ئەگەر کلیۆپاترا هەڵنەهاتبا ئەوا ئوکتاو (کلیۆپاتراو سیزاریۆن )ی دەکوشتن چونکە کلیۆپاتراو منداڵەکەی لای ئوکتاو کەخۆی بە زرکور ومیراتگرەوەی سیزار دەزانی بەمەترسییەکی گەورە لێکدەدرایەوە, ئوکتاو ناچاردەبوو کلیۆپاتراو کورەکەی بکوژێت بۆئەوەی نەبنە میراتگرو جێنشینی سیزار.

لەبەرئەوەی ئوکتاو دەستی نەگەیشتە کلۆپاتراو سیزاریونی کوری، مێردی کلیۆپاترا بەتلیموسی پازدەهەمی کوشت، کەبەتلیموسی پازدەهەمیان داوەتە دەست جەلاد تاسەری لەلاشەی جیابکاتەوە. تەمەنی ئەو تەنها پازدە ساڵنبوو, گوایە کاتێ ویستویانە بیکوژن گریاوەو گوتویەتی بۆچی من دەکوژن من هیچ گوناهێکم نەکردوە.

–جەلادە رۆمیەکەش گوتویەتی بۆیە تۆ دەکوژێن چونکە مێردو برای کلیۆپاترای,

–بەتلیموس پازدەهەم گوتویەتی براکەی من سیزار کوشتی منیش کورەکەی سیزار دەمکوژێت.

–جەلادەکەش گوتویەتی بەهەڵەداچووی براکەی تۆ کلیۆپاترا کوشتی تۆش بەهۆی خوشکەکەتەوە بەکوشتدەچیت ئەگەر براو مێردی ئەو نەبای نەدەکوژرای.

کاتێ هەواڵی کوژرانی بەتلیموسی پازدەهەم بەکلیۆپاترا گەیشت گوتی ئەگەر من ئوکتاوم بینیبا ئەوا پاداشتم دەدایە، چونکە منی لەناسۆری رزگارکرد, کلیۆپاترا بیری لەوەکردبۆوە ئوکتاو بەهۆی براکەی دەیتوانی ئەو لەسەر تەختی دەسەڵاتدارێتی میسر لاببات, دەوڵەتی رۆم دەوڵەتێکی بەهێزبوو ئەگەر بریاری دابا کلیۆپاترا لەسەر تەختی پاشایەتی لاببات وبراکەی لەجێگایدادانێت ئەوا دەیتوانی, مانی براکەی بەتلیموسی پازدەهەم هەموو کاتێ بەهانەو دەستەواژەیەکی باشبوو بۆ هەرەشەپێکردن لە کلیۆپاتراو دەیانتوانی بەردەوام ئەو بەوە بترسێنن و ناچاریبکەن ملکەچی فەرمانەکانی رۆمبێت، بەڵام ئوکتاو لەداخ وکینەدا بەتلیموسی پازدەهەمی کوشت ویەك کەرەستەی کاریگەری لەدەستدا کەدەیتوانی هەرەشەی پێ لەکلیۆپاترا بکات، کاتێ هەواڵی مەرگی براکەی کلیۆپاترا گەیشتە خاتونەکەی من غەمگین نەبوو بەپێچەوانەوە خۆشحاڵبوو

# سەرهەڵدانی ئیدعاچیەك بۆ تەختی پاشایەتی میسر

کاتێ ئێمە گەڕاینەوە بۆمیسر وەك گوتم میسریەکان لەژێر کاریگەری مەرگی سیزاردا بوون وباوەڕیان نەدەکرد پیاوێك بەوهەموو هێزو مەزنییەوە بەو خێراییە لەناوبچێت بەوەی منداڵی خاتونەکەی من بەڕۆڵەی سیزار لەقەڵەمدرابوو میسریەکان کلیۆپاترایان بەبەهێز دەزانی هەتا کاتێ زانیشیان براکەی کلیۆپاترا لەڕۆمدا بەفەرمانی ئوکتاو کوژراوە, باوەڕی ئەمانە سەبارەت بەخاتونەکەی من لاوازنەبوو.

میسریەکان لەو باوەڕەدابون ئەوشاژنەی توانی پیاوێکی وەك سیزار لەبەرامبەر خۆیدا چۆك پێدابدات, ئەوەندە بە توانایەوە دەتوانێت بەسەرهەر هێزێکی تردا زاڵبێت, پاش ئەوەی ئێمە لەڕۆم گەڕاینەوە سەیرمانکرد ڕەوشتی میسریەکان گۆڕاوە, هاتنی سیزار بۆ میسرو نیشتەجێ بوونی کۆمەڵێ ئەفسەرو سەربازی ڕۆمی لەنیشتمانەکەی ئێمەدا ببوە هۆی زیادبوونی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و دواتر ڕۆمیەکان داب ونەریتە ناشیرین و نەفرەتیەکەی خۆیان سەبارەت بەعشقی [1] ناسروشتی کەئەوانیش لەیۆنانیەکانەوە فێریبوون لەمیسردا ڕەواجی پەیداکردبوو.

پێش ئەوەی لەمیسرەوە بۆ ڕۆم سەفەربکەین لەئەسکەندەریەدا تەنها دوو شوێنی ڕابواردنی گشتی تێدابوو, ئەگەر کەسێك ماڵێکی شاری کردبایە شوێنی ڕابواردنی خەڵك ئەواخاوەن ماڵەکەو ئەو کەسانەی لەوماڵەدا کاریانەدەکرد دەیانگرتن, بەڵام دوای ئەوەی گەڕاینەوە میسر دیاربوو لەئەسکەندەریەدا چەندین ماڵ هەبوون تایبەت بە پێشوازیکردنی ڕۆمیەکان وگەشتیارانی بیانی, خاوەنی ئەو ماڵانە ڕۆمی بوون بۆ ئەوەی بتوانن سەرنجی موشتەریەکانی خۆیان ڕاکێشن ئافرەتیان لە ڕۆمەوە بۆ میسر هێنابوون و لەوماڵانەدا دایاننابوون.

کاتێ کلیۆپاترا ئەمەی زانی زۆری پێناخۆشبوو بەڵام نەیدەتوانی فەرماندەربکات ئەو خانوانە دابخرێن چونکە دەیزانی ئەمەدەبێتە هۆی تورەیی ڕۆمیەکان, ڕۆمیەکان بە ئاشکرا بەرگریان لەوخانوانە دەکردو ئەفسەرو بازرگانەکانی ڕۆمی بۆڕابواردن دەچوون بۆئەو ماڵانە، چەند جارێکیش بەهۆی مەستییەوە لەوماڵاتەدا شەر دوستدەبوو و چەند کەس کوژراو بریندار دەبوون، هەرچەندە کلیوپاترا بەنەژاد یۆنانی بوو بەڵام نەفرەتی لەعشقی ناسروشتی دەکردو دەیگوت یۆنان و ڕۆم کانگای عشقی ناسروشتین و بوونەتە مایەی فەسادکردنی نەتەوەی تریش, دوای گەڕانەوەی کلیوپاترا وەك چۆن ناچاربوو بەرگەی بوونی هەندێ ئەفسەرو سەربازی ڕۆم بگرێت لە وڵاتەکەماندا ئاواش بەناچاری بێدەنگەی لەبەرامبەر بوونی ئەو ماڵانەی ڕابواردنی تێدا دەکرا کرد تانەبێتە جێگای تورەیی ڕۆمیەکان, لەدووەم ساڵی گەڕانەوەی ئێمە بۆ میسر ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو وسەیر ڕوویدا ئەویش ئەوەبوو پیاوێك لەسوریادا ئیدعای دەکرد کەئەو بەتلیموسی چواردەهەمەو مێردی کلیوپاترایەو کاتی خۆی لە دەریاوە خۆی ڕزگارکردووە لەدەست سیزارو خۆی گەیاندۆتە سوریاو بەوەی ئێستا ئەو زیندوویە ئەواتەختی پاشایەتی میسر ئەو خاوەنیەتی, سیزار براکەی کلیۆپاترای کوشت بەڵام بۆئەوەی میسریەکان سیزار

بەتاوانبار نەزانن بەکوشتنی پاشاکەیان، پروپاگەندەی ئەوەیان بڵاوکردەوە گوایە پاشا لەدەریادا خنکاوە، کاتێ میسریەکان بیستیان بەتلیموسی چواردەهەم بەزیندویی ماوەو لەسوریایە، ووڤان وحەزیاندەکرد ئەو بێتەوە میسر، هەتا خاتوەکەی منیش کەوتە گومان لەوانەیە مێردەکەی یەکەمی زیندوبێت، بۆئەوەی دڵنیابێتەوە لەوەی داخوا ئەوپیاوە بەتلیموسی چواردەهەمە-یان نا، بۆیە بریاریدا من بۆسوریا بنێرێت.

بە منی گوت: شیرمون ئەوانەی لەدەوروبەری مندان هیچیان بەئەندازەی تۆ بەتلیموسی چوارەهەم ناناسن، چونکە تائەو بچوکبوو وازیمان لەگەڵدادەکرد دوای ئەوەی بووبە مێردی منیش تۆ بەردەوام لەگەڵ ئێمەدابووی، لەوانەیە لەم چەندساڵەدا کەمێ روخساری گۆرابێت، بەڵام تۆ بەدڵنیاییەوە ئەودەناسیتەوە، دوایئەوەی ئەوت بینی ئەگەرزانیت براکەی منە بەخێرایی بگەرێرەوەو پێمبڵێ تابیرلە چارەیەك بکەمەوە، بەڵام ئەگەر براکەم نەبوو ئەوائەو پروپاگەندەیەی ئەوگرنگی نامێنێت، چونکە ئەو ناوێرێ بێت بۆمیسرو لەگەڵ مندا بکەوێتە ملە، خاتونەکەم بەکەشیتەکی تایبەتی منی بۆ سوریا بەرێکردو دوای گەیشتنم بەسوریا دەستمکرد بەگەران لەشوێنی ئەوکابرایەی ئیدعای بەتلیموسی چواردەهەم دەکات، گوتیان ئەولە ( بەعلبەگ )دا دەژیت، کاتێ لە کەشتی دابەزیم لەگەڵ کورێکی خەڵکی بەعلەبەگدا رێگای ئەوشارەم گرتەبەر پێش ئەوەی بەرێبکەوم خاتونەکەی من نامەیەکی نوسی ودایە دەستی من وگوتی ئەگەر لە سوریادا توشی کێشەوگرفت بویتەوە ئەونامەیە بەئەفسەرانی رۆمی- یان سەر لەشکرەکانی رۆمی نیشانبدە ئەوان کێشەکەی تۆ چارەسەردەکەن، چونکە سوریا لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی رۆمدابوو لێپرسراوانی سەربازی رۆم لەو وڵاتەدا حوکمان دەکرد.

لەرێگادا توشی هیچ گرفتێك نەبوومەوە تاناچاربم ئەو نامەیە دەربێنم، جادەکانی سوریا وەك هەموو جادەی ئەو وڵاتانەی کەرۆم فەرمانرەوایی دەکات ئاسایشبوون، ئێمە دەمانتوانی شەوانەش بەئەمینی لەسەر جادەکانی سوریادا بگەرێین، من بەپەلە بووم تازووتر بگەمە شاری بەعلبەگ و ئەو پیاوەببینم کەئیدعای پاشای پێشووی میسر دەکات، بۆیە بەشەویش لەرێگادابووم، ئەو خزمەتکارەی لەگەڵمدابوو بەمنی گوت ئێرە غەریبایەتیە بابەشەو بەرێگادا نەرۆین، بەڵام من دڵنەوایی ئەوم دایەوەو گوتم مەترسە ئازارمان نادات چونکە ئەوەی لەسەر شارێکاندا دەست بۆکاری نابەجێ ببات بەتوندی سزادەدرێت چونکە قانونەکانی رۆم لێرەشدا جیبەجێدەکرێن، من لەهەر میوانخانەیەکدا لامدابا خۆم بەشیرمونی معامەلەچی دەناساندو ئەوانیش باوەریان دەکرد چونکە زۆر لەئافرەتانی میسری ئالووێری بازرگانیان لەگەڵ سوریەکاندا هەبوو.

رۆژێکیان نیوەرۆبوو لەچایخانەیەکی نزیك جادە لاماندا بۆئەوەی نانی نیوەرۆ بخۆین، چۆمێکی گەورەی زوڵاڵ بەتەك ئەو شوێنەدا تێدەپەری وخاوەنی میوانخانەکە کوندەی پرلە شەراب ودۆی خستبونە ناو چۆمەکە بۆئەوەی ساردبن وبەرێبوارانی بفرۆشێت، -- خاوەنی میوانخانەکە لێی پرسی: بۆکوێ دەچیت؟

- گوتم من میسریم ولەمیسرەوە هاتووم دەمەوێت بچم شت بکرم، چونکە کاری من بازرگانییە،

- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: منیش پێشبینی ئەوەمدەکرد کاری تۆ بازرگانیکردن بێت، ئایا دەکرێ لێتبپرسم تۆ چ دەکڕی ودەفرۆشی؟

- من بیرم لەم پرسیارە نەکردبۆوەو نەمدەزانی ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبمەوە بۆیە گوتم من لەمیسردا دووکانی عەترو ئارایشتم هەیەو هەرکاتێ بازاڕی قوماشی میسری لەسوریادا ڕەواجی زیادیکرد من قوماش بۆئێرەدێنم بۆفرۆشتن،

- میوانخانە چیەکە گوتی: قوماشی میسری لەسوریادا بەرەواجە خەڵکی دەوڵەمەند جل وبەرگی خۆیان لەقوماشی میسری دروستدەکەن، دواتر لەپڕ ئەوکابرایە وەك ئەوەی شتێکی بەبیر هاتبێتەوە گوتی دەزانی پاشاکەی ئێوە لەم وڵاتەیە؟

- منیش خۆم هەڵەکردو گوتم پاشای ئێمە ژنێکە بەناوی کلیوپاترا کەیەکێکە لە جوانترین ژنی دنیا، کاتێ من لەمیسرەوە هاتم ئەو لەوێبوو- باوەڕناکەم هاتبێ بۆ سوریا،

- خاوەنی موانخانەکە گوتی: من ناوی کلیوپاترام بیستوە مەبەستم لەئەو نییە ئەوەی لەئێرەیە پیاوەو خۆی بەبەتلمیوسی چواردەهەم لەقەڵەمدەدات ودەڵێت کلیوپاترا دەستی بەسەر تەختی پاشایەتی ئەوداگرتووە، ئایا ئێوە پاشایەکتان هەبووە بەناوی بەتلمیوسی چواردەهەم؟

- گوتم بەڵێ: بەتلمیوسی چواردەهەم براو میردی کلیوپاترابوو،

- خاوەنی میوانخانەکە سەرسامبوو وگوتی ئایا من بەهەڵە تێگەیشتم، تۆ گوتت بەتلمیوسی چواردەهەم برای کلیوپاترابووە ومێردیشی؟

- گوتم بەڵێ: چونکە لەمیسردا دابوایە کوڕەکان ئەگەر خوشکیان هەبێت ئەوا لەگەڵ ئەواندا دەبنە هاوسەر ئەم نەریتەش بەتایبەت لەبنەماڵەی پاشادا ڕەواجی زۆرە،

- خاوەنی میوانخانەکە گوتی: بۆچی ئەم کارەدەکەن؟

-گوتم بۆ ئەوەی یەککرتویی بنەماڵەی پاشایەتی بپارێزن لەلەناوچوون و سامانی ئەو بنەماڵەیە پەرتنەبێت، چونکە ئەگەر کچەکان شووبە پیاوی دەرەوەی بنەماڵەکەبکەن سامانی خۆی بۆ بنەماڵەیەکیتر دەبات، تەنانەت هەندێ لەپاشاکانی میسر لەگەڵ کچەکانی خۆشیاندابوون بەهاوسەر چونکە کوڕ-یان برازای کوڕیان نەبوون تاکچەکەی خۆیان بدەن بەئەوانە، بۆیە هاوسەرییان لەگەڵ کچەکانی خۆیانداکردووە تاسامانی پاشایەتی بۆبنەماڵەیەکیتر نەچێت، من چونکە میسریم- بیستومە بەتلمیوسی سێزدەهەم ناسراو بەشمشاڵژەن کاتێ زانیویەتی دەمرێت وەسێتی کردووە دوای مەرگی خۆی کلیوپاترا شووبە یەکێك لەبراکانی خۆی بکات و دوای مەرگی ئەو کلیوپاترا شوی بەبرا بچوکەکەی کردووە کەناوی بەتلمیوسی چواردەهەمبوو بەڵام کاتێ شەڕ لەنێوان پاشای میسرو سیزاردا روویدا بەتلمیوسی چواردەهەم گوایە لەئاودا خنکاوە،

-خاوەنی میوانخانەکە گوتی: بەڵام ئەو پیاوەی کەلە بەعلبەگدا دەژیت پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات ئەو بەتلمیوسی چواردەهەمەو پاشای میسر،

- دەمویست بڵێم درۆدەکات بەڵام دواتر بیرم لەوەکردەوە ئەو قسەیەی من لەوانەیە لای ئەو ببێتە جێگای گومان پەیداکردن،

-لێمپرسی ڕۆمیەکان سەبارەت بەپڕوپاگەندەی ئەو کابرایە دەڵێن چی؟

-خاوەنی میوانخانەکە گوتی: تائەو کاتەی سیزار زیندوو بوو ئەوپیاوە نەیدەوێرا خۆی بەپاشای میسر بناسێنێت، چونکە دەیزانی پەیوەندیەکانی سیزار لەگەڵ کلیوپاترادا بەهێزەو هەرکاتێ خۆی بەپاشای میسر بناسێنێت ئەوا سیزار تورە دەبێت، دەڵێن ئەو پاشای میسرەو ڕۆمیەکانیش کاریان پێی نیە چونکە تائێستاش نازانن دۆخی پەیوەندیەکانی کلیوپاترا لەگەڵ ڕۆمدا چۆنە؟

خاوەنی میوانخانەکە وەك چۆن نەیدەزانی لەمیسردا خوشك شوو بەبرا دەکات ئاواش ئاگای لەپەیوەندیەکانی نێوان میسر و ڕۆم نەبوو، لەمیسردا هەموو هاولاتیان لە حاڵەتی چاوەڕوانیدابوون هەتا ڕۆمەکانیش لەمیسردا لەچاوەڕوانی ئەوەدابوون داخوا شێوەی پەیوەندیەکانی خاتونەکەی من لەگەڵ حکومەتی ڕۆمدا چۆن دەبێت،

-ویستم لەوپیاوە بپرسم ئەوپیاوەی ئیدعای ئەوە دەکات پاشای میسرە چ شێوەیەکی هەیە؟ بەلآم ئەم پرسیارەش دەبووە هۆی بەدگومانبوونی ئەولەمن بەوەی بۆلەمە دەگۆڵمەوە؟ تەنها پرسیم ئەو پیاوەی خۆی بەپاشای میسر ناساندووە لەناو خودی شاری بەعلبەگدا نیشتەجێیە- یان لەدەوروبەری ئەو شارەدا دەژیت؟

-خاوەنی میوانخانەکە گوتی: ئەو لەناو شاردا دەژیت ومالەکەی لەسەر شەقامی (بەعل)دایەو لەناو خانوێکی دوقاتی رەنگ سپیدا، ئەم قسەیە ئەوەی دەگەیاند ئەو پیاوەی خۆی بەپاشای میسر دەزانێت لەوشارەدا بەجۆرێك ناسراوە تامالەکەی ئەویش دەزانن، دوای ئەوەی نانمانخوارد کەوتینە ڕێگاو هەرئەو ڕۆژە گەیشتینە بەعلبەگ، کاتێ ئێمە گەیشتینە ئەو شارە تاریکداهاتبوو ومن دەمتوانی بۆسەردانی ئەوپیاوە بچم بەلام نەچووم، ئەوەبوو بەڕێنمایی یەکێك لەهاولآتیە خێرخواکانی ئەوشارە بەرەو یەك میوانخانەی خۆش چووین, ئەو میوانخانەیە کەوتبۆ شەقامی بەعل، ئەو شەوە لەوێ ماینەوەو بەیانی بەخزمەتکارەکەم گوت لێرە مەچۆ دەرێ تامن دوای کاتژمێرێکیتر دەگەڕێمەوە، کاتێ لەومیوانخانەیە چوومە دەرێ-پەرچەیەکم بەدەموچاومدادا، پەرچە دادانەوە لەوشارە شتێکی ئاساییە چونکە ژنە جولەکەکان لەسوریادا بەردەوام لە دەرەوەی مالەکانیان پەرچە دادەدەنەوە، بەشەقامی بەعلدا بەردوام بووم لەڕۆیشتن تالە دورەوە خانوێکی سپیم بینی - کەمێ لەپێی خۆم گرتەوە تابزانم ئەو خانووە دوقاتە- یان نا، ئەو کەسانەی دانیشتوی ئەوگەڕەکەبوون کەسانی ئەشرافی شاربوون، بۆیە ئەوەم بە بیرداهات ئەو پیاوەی ئیدعای پاشایەتی میسردەکات دەبێ کەسێکی بەتواناو دەولەمەندبێت بۆیە لەوگەڕەکە خۆشەدا نیشتەجێبووە، لەدوورەوە ئەومالە ڕەنگ سپیە دوو قاتە دەرکەوت کاتێ نزیك دەرگاکە بوومەوە دیتم پیاوێك لەوێ هاتە دەرێ من ئەو کەسەم ناسی بەلآم ئەو بچوکترین تێبینی منی نەکرد ئەوپیاوەش کاڵ بوو، کاڵ لەچاو جارانی زۆر قەلەوببوو ئەوجوانیە ئەفسوناویەی پێشوی نەمابوو، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا بەپیاوێکی قۆز دەهاتەبەرچاو تێبینیمکرد جل وبەرگی جوانی لەبەردابوو وشمشێرێکی بەکەمەریەوە بوو، لەرابردودا کاڵ گەنجێکبوو جوان ودڵبەرو ناسکولەبەر دلأنبوو، کاتێ بەتەکما تێپەڕی من ڕوم بۆی وەرگێڕاو سەیرم کرد تادوورکەوتەوە، لەوکاتەدا بەخۆمگوت دەبێ بەدوای بکەوم وبزانم بۆکوێ دەچێت ولەگەڵکێدا ئاشنایی هەیە، کاتێ بینیم کاڵ لەوخانووە هاتە دەرێ پێشبینی ئەوەمکرد دەبێ بەتلمیوس چواردەهەمیش لەوێبێت هەتا لەمەش زیاتر گومانی ئەوەمکرد پاشای میسر بەیارمەتی کاڵ دەیەوێت بگەڕێتەوە میسر وبچێتەوە سەرتەختی پاشایەتی، چونی من

بۆلای ئەو خانووە سپیەی کەگوایە مێردەکەی کلیوپاترای تێدادەژی شتێکی نەگونجاوبوو، بۆیە باشتروابوو دوای کالْ بکەوم، چونکە من نەمدەزانی لەناوئەو خانووە سپیەدا کێی تێدایە لەوانەیە دوای چوونی من لەناو ئەوخانووەدا کەسانی وای تێدابن من بناسن وبمکوژن, بەلأم کالْ نەیدەتوانی من بناسێتەوە چونکە من پەرچەم پۆشیبوو, بەخێرایی هەنگاوەکانم نان بۆئەوەی بگەمەوە کال تاگیشتمە نزیکی نزیك کەمتر لەدە هەنگاومان نێوان بوو, ئەو لەپێشەوەو من بەدوایەوە لەشەقامی بەعل تێپەڕین وگەیشتینە گەڕەکێکی هەژار نشین، من زۆر بە وردی سەرنجمدەدا بۆئەوەی کالْم لێوننەبێت بەلأم دەمبینی هەندێ لەوخەڵکانەی تێدەپەڕین لەبەرامبەر کالْدا سەریان کەمێ دادەنەواند.

-لەو ڕێزگرتنەی خەڵك بۆکال سەرم نەسوڕمابوو چونکە قەدو بالأی پرشکۆی ئەوترسی دەخستە دڵی خەڵکانی هەژارەوە، بۆیە ڕێزلەئەو دەگرن, تائەو کاتەی تێبینیمکرد هەندێ لەوکەسانەی لەبەرامبەر کالْدا سەردادەوێنن شتێکیش دەڵێن, منیش لەو بەینەی نێوان خۆم وکالْم کەمکردەوەو زیاتر لەئەو نزیکبوومەوە تابزانم کاتێ بەتەك کالْدا تێدەپەڕن چی دەڵێن، دواتر گوێم لەیەکێك لەوکەسانەبوو کەبەتەنیشت کالْدا تێپەڕی وگوتی سەلام ئەی( پاشای میسر)

یەکێکیتر بەتەکیا تێپەڕی و گوتی: سلأو لەتۆ ئەی بەتلیموسی گەورە, ئیتر ئەوەی بەتەك کالْدا تێدەپەڕین دەیانگوت سلأو(پاشای میسر )یان ( پاشای سەرزەمینی نیل) و(بەتلیموسی مەزن ).

کال بەردەوامبوو لەڕۆیشتن تاگەیشتە شوێنێکی چۆڵ ومنیش هەر بەدوایەوە بووم بۆئەوەی بزانم بۆکوێ دەچێت تاکال گەیشتە بەردەم دەرگای ماڵێك ولەدەرگای داو ژنێکی گەنج دەرگاکەی کردەوەو ئەو چووە ژورێ ودەرگاکەیان داخستەوە, تێبینی ئەوەم کرد ئەو خانووە هی کال نییە بەڵکو ئەو خانووە سپیە دوو قاتە هی ئەوە ئەو خانووەی کەکالی بۆچوو دوورنەبوو ماڵی مەعشوقەکەی بێت منیش حەزم نەدەکرد بزانم مەعشوقەکەی ئەوکێیە.

دەمویست هەمان ڕۆژ بگەڕێمەوە بۆمیسرو بەخاتونەکەی خۆم بڵێم ئەوەی پروپاگەندەی پاشایەتی میسر دەکات کالە, بەلأم دواتر بیرم کردەوە باشتر وایە تەواو دڵنیابم, ڕۆژی دواتر بەیانی زوو چووم چاودێری دەرگاکەی مالی کالْم کرد تابزانم لەوێ دێتە دەرێ- یان نا- ئەو مالە لەچۆڵدەچوو بۆیە بیرم لەوەدەکردەوە خزمەتکارەکەی خۆم بنێرم( ئەو خزمەتکارەی کەبەفەرمانی کلیوپاترا لەگەڵمندااهات بۆسوریا) تابە بەهانەیەك لەکال بکۆڵێتەوەو بزانێت لەومالەدا هەرخۆی تەنها دەژیت- یان کەسانی تریشی لەگەڵدان؟

دواتر بەبیرم هاتەوە خۆ خزمەتکارەکەی من زمانی سریانی نازانێت, دواتر بزەیەکم هانێ چونکە بەبیرم کەوتەوە ئەو کاتەی لەئەسکەندەریەدا چوم بۆلای کال لە میوانخانەی سور ئەو بەمنی گوت زمانی سریانی ویۆنانی وئێرانی دەزانێت, خزمەتکارەکەی منیش زمانی یۆنانی دەزانێت, دواتر گەڕامەوە میوانخانەکەی خۆمان وبەخزمەتکارەکەم گوت بڕۆ لەدەرگای مالی کالبدەن.

ئەمەی لێرەدا باسی دەکەم من لەخزمەتکارەکەمەوە گوێم لێبووە, خزمەتکارەکەی من لەدەرگاکەیدا- کوڕێکی منداڵکار دەرگاکەی کردەوە بەزمانی لوکالی واتە زمانی سریانی پرسیوەتی چ ئیشێکت هەیە؟ خزمەتکارەکەی من زمانی سریانی نەدەزانی بەلأم بەمەزەندان زانیویەتی دەڵێ چی, گوتویەتی بەتلیموسی چواردەهەمم دەوێت دەمەوێ ئەو ببینم.

خزمەتکارە مێردمنداڵەکە بەوەی ناوی بەتلیموسی چواردەهەم هاتووە زانیویەتی مەبەستی لەخاوەنی ئەو ماڵەیە, ئەو بەخزمەتکارەکەی منی گوتبوو لەوێ بوەستێت تا دەچێت ئاغاکەی ئاگاداردەکاتەوە پاش چەند ساتێك گەڕایەوەو بەدەستی ئاماژەی بۆ خزمەتکارەکەی من کرد کەبێتە ژورێ, دوای ئەوەی خزمەتکارەکەی من گەیشتبۆ ژورێ چاوی گێڕابوو بۆئەوەی هەموو شتەکانی ناوماڵەکە ببینێت, دواتر مەعلومببوو لەو ماڵەدا تەنها کال وخزمەتکارە مێرد منداڵەکەی دەژین, خزمەتکارەکەی من چووبۆ ژورێك کەکال لەوێدا دانیشتبوو کال لەجۆری جل وبەرگی خزمەتکارەکەی من زانیبووی میسرییەو لەئەوی پرسیبوو چ کارێکت بەمنە؟

خزمەتکارەکەی منیش گوتبووی لەمیسرەوە بۆئەم ولاتە هاتووم بۆئەوەی لێرەدا بمێنمەوە بیستومە پاشای پێشووی میسر لێرەدەژیت بۆیە خۆم بەخۆمم گوت چونکە پەروەردگاری ئێمە لێرەیە واباشە بچم بۆلای ئەو خزمەتی ئەوبکەم, ئێستا ئەوا هاتووم تۆمن بەیەکێك لەخزمەتکارەکانی خۆت قبوڵبکەیت, کاڵیش سەرتاپا سەیری خزمەتکارەکەی منی کردووەو پێی گوتووە تۆ خزمەتکارنیت؟

ئەویش گوتویەتی چۆن, من کەسێکی هەڵاتووم لەمیسرەو بۆئێرە هاتووم وباشترین پەنای منیش ماڵەکەی تۆیە ئایە تۆ ئامادەی بەخزمەتکاری خۆتم قبوڵبکەیت؟ کال گوتویەتی من حەزدەکەم تۆبکەمە خزمەتکاری خۆم بەڵام من ناتوانم ڕاتگرم, خزمەتکارەکەی منیش لێی پرسیوە بۆچی ناتوانێت لای خۆت گلمبدەیتەوە؟ تۆ پاشای میسری وسامانی تۆ لەهەموو پاشاکانی دنیا زیاترە, من بیستومە هیچ پاشایەك سەروەتی شای میسری نییە, کالیش گوتویەتی بەڵێ وایە, بەڵام من لە وڵاتەکەی خۆم دوورم ژنێك خوشکمە لەجێگای مندا پاشایەتی دەکات وسامانی میسر لەدەستی ئەودایەو چەندی بیەوێت دەتوانێت خەرجی بکات, بەڵام من چونکە لە تەختی پاشایەتیم وسامانەکەم دوورم- لەم ماڵەدا جگە لەم خزمەتکارە مێردمنداڵە خزمەتکاری ترم نین وئێستا ناتوانم خزمەتکاریتر ڕاگرم، بەڵام کاتێ گەڕامەوە بۆمیسر تۆبۆ خزمەتکردنی خۆم ڕادەگرم ولەخاوەنەکەت دەکڕمەوە, خزمەتکارەکەی منیش گوتویەتی من بەئومێدێکی زۆرەوە بۆئێرە هاتم, پێموابوو پیاوێکی وەکو تۆ کەپاشای میسری ئەوەندە خزمەتکارت هەن دەتوانیت دەخزمەتکاری تازەی وەك من بەجارێ ڕاگریت,

کاتێ کال گوێی لەم قسەیە بووە پێکەنیوەو گوتویەتی ئەگەر ڕۆمیەکان موچە بەمن نەدەن ئەوا بەبرسیەتی دەمێنمەوە تائەو ڕۆژەی دەگەڕێمەوە میسر دەبێ هەرموچە لە ڕۆمیەکان وەربگرم ئەوموچەیەش ئەوەندە نییە تامن بتوانم تۆ-یان خزمەتکارێکیتر لای خۆم ڕابگرم.

دواتر خزمەتکارەکەی من گوتویەتی کەواتە بابە نائومێدی بگەڕێمەوە؟ کال گوتویەتی بەڵێ بڕۆوە, ئەگەر کەحەزدەکەت, ڕاتسپێرم بۆلای یەکێك لەڕۆمیەکان- تاتۆبە خزمەتکار ڕاگرن, چونکە من زۆر لەخاوەن پلەوپاکانی لەشکری ڕۆمی لەم وڵاتەدا دەناسم ودۆستایەتیم لەگەڵیاندا هەیە, خزمەتکارەکەی من گوتبووی: من بەو ئومێدە هاتبوم لای پاشای میسر کارمدەستبکەوێت ئەگەر بمەوێت پەنا بۆکەسانیتر بەرم ئەوا دەچمەلای ئەومیسریانەی کەلەم وڵاتەدا ئەشرافن، ئایا تۆ ناتوانیت بەڕۆمیەکان بڵێت موچەی زیاترت بدەنێ تابتوانیت من لایخۆت بەخزمەتکار ڕاگریت؟

پێش ئەوەی تۆش بێیت من داوام لەڕۆمیەکان کردووە موچەکەم بۆ زیادبکەن بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون, خزمەتکارەکەی من ویستبوی لەوەبکۆڵێتەوە بۆچی ڕۆمیەکان ڕازی نین موچەکەی بۆزیادبکەن, بەڵام

کال تورەبووەو گوتویەتی ئەی خزمەتکار تۆ زۆر لەشت دەکۆڵیتەوە پرسیاری وادەکەیت کەپەیوەندی بە تۆوەنییە, ئەگەر میسری نەبای تەمبێم دەکردی بەڵام قەیناکا برۆ, خزمەتکارەکە گەڕایەوەو ئەوەی بیستبوییو دیتبوی بۆی گێرامەوە, من دەمزانی بۆچی ڕۆمیەکان ڕازی نین موچەکەی بۆزیاد بکەن, چونکە ئەوان دڵنیانەبوون داخوا کال لەسەر تەختی پاشایەتی میسردا دادەنیشێت یان نا.

پێشئەوەی خزمەتکارەکەم لەماڵی کال بێتە دەرێ بیرم لەوەکردەوە هەموو پروپاگەندەکردنێت نهێنیەکی لەپشتەوەیە سیاسەتێکی شاراوەی تێدایە, بەتایبەت ئیدعاکردن بۆتەختی پاشایەتی پێویستی بەکەرەستەو هۆکاری بەهێزهەیە, دواتر بیرم لەوەکردەوە تۆبڵێ بەتلیموسی چواردەهەم زیندوونەبێت وکالیش یەکێك بێت لە خزمەتکارەکانی ئەو؟ بەڵام دوای ئەوەی خزمەتکارەکەم گەڕایەوەو هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە بۆم دەرکەوت کال تەنها ئامرازێکە بەدەست ڕۆمیەکانەوە, مەسەلەی پروپاگەندەکردنی پاشایەتیش لەلایەن ڕۆمیەکانی سوریاوە بڵاوکراوەتەوەو کەوتۆتە دەمی خەڵکی سوریاش ودواتر گەیشتۆتەوە میسر, چونکە کەسێکی ئاوا کەهەژارەو تەنها خۆیی وخزمەتکارێکی هەیە ناتوانێت ئەو ئیدعایەی کەدەیکات بەوەی پاشای میسرە ئاوابەخێرایی بڵاویکاتەوە دەبێ دۆست ولایەنگرو کەسانی زۆری هەبن تائەمە بڵاودەبێتەوە, تێگەیشتم ڕۆمیەکان کالیان کردۆتە داردەستی خۆیان, ئەویان ناچار کردووە پروپاگەندەی تەختی پاشایەتی میسربکات تابەوڕێگایە خاتونەکەی من لەسەر تەختی پاشایەتی لاببەن-یان ئەوەتا لەو ڕێگایەوە فشاربخەنەسەر کلیۆپاتراو تەنازولی زیاتری پێبکەن لەوەی هەیە, ئەگەر بەتلیموس چواردەهەمیش زیندووبا ئەوا ناچاریان دەکرد داوای تەختی پاشایەتی بکاتەوە، بەلام سەبارەت بەئارسینوهە نەدەشیاکە دوورخرابۆوە بۆ یۆنان و خۆیان حوکمی پاسایان بەسەردادابوو وبەناچیزەیی لە پەرستگایەکی یۆنانیدا بژیت- نەدەکرا ئەویش بەکاربهێنن بۆیە بڕیاریاندابوو کال ئەو ڕۆڵەببینێت و داوای تەختی پاشایەتی میسربکات, لەوانەیە ئەوەت بەخەیاڵدابێت ئایە ڕۆمیەکان کەسێکی تریان دەستنەکەوت باشتربێت لەکال و بیکەنە داردەستی خۆیان وبەبەتلیموسی چواردەهەمی بناسێنن؟ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە کەس بەقەد کال ئاگاداری ژیانی تایبەتی کلیۆپاترا نییەو دەزانێت خاڵە لاوازەکانی شاژنی میسر چیە, کال وەك من دەیزانی سیزاریۆنی کوڕی کلیۆپاترا کەشاژنی میسر ئەوی بە ڕۆڵەی سیزار ناساند, منداڵی خۆیەتی [1] نەهی دیکتاتۆری ڕۆمەو نەهی پاشای میسرش, کال ئەو ئەفسەرەبوو کەکلیۆپاترای لەناو فەرشێك پێچابوو وهێنای بۆلای سیزار لەئەسکەندەریەدا, یەکەم منداڵی کلیۆپاتراش کەهەموو لایەك وایاندەزانی لە پشتی بەتلیموسی چواردەهەمە لەپشتی کالبوو, هیچ کەس تەنانەت سیزاریش بەقەت کال نهێنیەکانی کلیۆپاترای نەدەزانی, کال هەموو خزم ودۆستەکانی کلیۆپاترای دەناسین وخاڵە لاوازەکانی ژیانی ئەوانەشی دەزانی, ئەگەر کال سوربا لەسەر ئەوەی بەتلیموسی چواردەهەمەو گوتبای تەختی پاشایەتی میسر مافی خۆیەتی، تەنها ئەو کەسانەی خۆیان بەمیراتگرەوەی تەختی پاشایەتی میسر دەزانی دژایەتیان دەکردو دەیانگوت ئەو بەتلیموسی چواردەهەم نییە, بەڵام ئەوکەسانەش میراتگرەوەی ڕاستەوخۆنەبوون- کاتێ کال لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتباو دەسەڵای گرتبا دەست ئەمانەش بۆ پاراستنی بەرژەوەندەی خۆیان دژی ئەو نەدەوەستانەوە, هەرکە کال کەمێ دەمی چەوربکردبان ئەوانە بێ دەنگدەبوون وخۆیان توشی کێشەوبێشە نەدەکردەوە, بەگشتی خەڵك بەسەردوو چیندا دابەشبوون

بەشێکیان بەتلیموسی چواردەهەمیان بینیبوو بەشەکەی تر نەیانبینیبوو, ئەمانەی دوایی بێدوودڵی باوەڕیان بەکال دەکرد کەبەتلیموسی چواردەهەمە, ئەوانەی بینیبوشیان چونکە ماوەیەکی زۆر بەسەرنادیاری بەتلیموسدا تێپەڕیبوو وایان بیردەکردەوە بەهۆی بەسەر چوونی تەمەن شێوەو ئاکاری پاشای میسر گۆڕاوە, بەژن وبالاو لێوەشاوەیی کال بۆ تەختی پاشایەتی میسر زۆر لەقەدو بالآی بەتلیموسی چواردەهەم شیاوتربوو بەلآم لەگەڵ ئەمانەشدا لەوانەیە ناحەزی هەر هەبووبان بەلآم بەهۆی پشبەستنی کال بە ڕۆمیەکان ئەمانە نەیاندەتوانی فزەبکەن.

من زانیم پێویستە هەرچی زوترە بگەڕێمەوە بۆ میسرو خاتونەکەی خۆم لەمە ئاگادار بکەمەوە تابیرلە چارەسەرێك بۆئەمە بکاتەوە, دەمێکبوو ئێمە لەهەواڵەکانی ڕۆم بێ ئاگابووین تەنها بازرگان وگەشتیاران کەمتاکورتێ هەندێ هەواڵیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەسکەندەریە دەهێنا دیاربوو ڕۆمیەکان حەزیان نەدەکرد کلیۆپاترا لەسەر تەختی پاشایەتی میسردا بمێنێتەوە, کلیۆپاتراش دەیزانی تێڕوانینی حکومەتی تازەی ڕۆم گۆڕاوەو دەیانەوێت لەسەرتەختی پاشایەتی لاببەن و یەکێکی تر لەجێگاکەیدا دابنێن, من دەمزانی تازوتر خۆم بگەیەنمەوە میسرو ئەو ڕاستیانە بەخاتونەکەی خۆم بڵێم شاژنی میسر کەژنێکی بەئیرادەو ژیرە بیرلەچارەسەر دەکاتەوەو پلانەکانی حکومەتی ڕۆمی هەڵدەوەشێنێتەوەو نایەڵێت زەفەر بەتەختی پاشایەتی میسربەن, ئەوەبوو لەگەڵ خزمەتکارەکەمدا گەڕامەوە میسرو هەموو ئەو ڕاستیانەی بینیبومان بۆ خاتونەکەی خۆم گێڕایەوە.

## ئەنتوان بوو بەفەرمانڕەوای ڕۆم

خاتونەکەی من زانی ڕۆمیەکان پیلانێکیان داڕشتووەو دەیانەوێت جێبەجێی بکەن, کلیۆپاترا بە منی گوت شیرمون بۆئەوەی حکومەتی ڕۆم ملکەچی من بێت و ئەوپلانەش شکستبخوات پێویستە من کەسی یەکەمی ڕۆم بۆلایخۆم ڕاکێشم ئەوەی ئەمڕۆش سەرۆکی ڕۆمە ئەنتوانە، دەبێ ئەو بۆلایخۆم ڕاکێشبکەم ئیتر کەئەوم بوزپێخوارد ئەوانیتر ناتوانن دەست بۆ نەخشەو پلان ببەن، کاتێ گوێم لەوقسەیەی خاتونەکەی خۆمبوو کەدەیەوێت ئەنتوانی بکات بەعاشقی خۆی، من کەمێ دڵگرانبووم چونکە ئەوکاتەی ئێمە لەڕۆمبووین بیستبوم بەرزبونەوەو زیادبونی پلەوپایەی ئەو پەیوەندی بەلێوەشاوەیی خۆیەوە نەبووە، کاتێ سیزار کوژرا ئەنتوان ڕاوێژکاربوو نزیکترین کەسبوو لەسیزار، ئاشکرایە کاتێ کەسێك دەبێتە جێگای سەرنجی پیاوێکی وەك سیزار هەموو باسی دەکەن، ئەنتوان کوڕی بنەماڵەیەکی دێرینی بەڕێزی ڕۆمی بوو لەدایکییەوە بەخزمایەتی دەگەیشتەوە سیزار، لەسەردەمی لاویەتیدا لەزۆر شەڕی ناوداردا بەشداری کردبوو و بەکەسێکی ئازاو چاپۆك ناسرابوو، ئەنتوان ببوە جێگای سەرنجی پیاوە گەورەکانی ڕۆم لە مانەش پۆمپەو سیزار، من ئەم ڕاستیانەم لەڕۆمدا بیست وهەموو دەیانگوت ئەنتوان بەحەقی خۆی پلەوپایەی وەرنەگرتوەو شایانی ئەو لێپرسراویەتیەنییە بەرزبونەوەی ئەنتوانیش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆسیزار کەبەرگری لێدەکرد، ئەو پارێزگاریکردنەی سیزاریش لەئەنتوان هۆکاری هەبوو وناتوانین لێرەدا باسی بکەم چونکە شتێکی بێ ئەدەبی وشورەییە، خودی شازنی میسریش ئەم ڕاستیەی دەزانی بەڵام چونکە سیاسەتمەداربوو ئەم مەسەلەیەی بەشتێکی گرنگ نەدەزانی و من تێگەیشتم خاتونەکەی من لەوکەسانەیە لەژیانیدا گرنگی بەئامانج دەدات نەك هۆکار، پێشبینی ئەوەم دەکرد خاتونەکەی من لەوپیلانەیدا سەرکەوتووبێت، چونکە بیستبووم ئەنتوان لەڕۆمدا بۆتە پیاوێکی خۆبەزلزان و لەخۆڕازیەو زۆربەی کاتەکانی بەبێهودەیی وهیچەوە بەسەردەبات و ئامادەیی خۆی بەکاری گەورە لەدەستداوە، باشترین ڕێگا چارەش بۆئەوەی رابردووی ناخۆش ودزێوی خۆی ڕوپۆشبکات وبەبیرچونەوەی بسپێرێت ئەوەبوو دۆستایەتی کەسێکی گەورەو دیاری وەك کلیوپاترابکات وبەرەو خۆی ڕابکێشێ، دوای ئەوەی ئەنتوان لە کلیوپاترا نزیکدەبۆوە لەلایەك رابردوی دزێوی ئەو بەفەرامۆشی دەسپێردرا و لەلایەکیش ئەو خۆبەزلزانی ولەخۆڕازیبونەی سەبووری دەدات چونکە توانیویەتی دۆستایەتی دیارترین و دەوڵەمەنترین ژنی دنیا بۆخۆی ڕاکێشبکات، بەڵام نەدەبوا ئەنتوان بزانێت کەخاتونەکەی من دەیەوێت پەیوەندی لەنێوان خۆی وئەودا دروستبکات، چونکە ئەگەر ئەنتوان زانیبای کلیوپاترا دەیەوێت فەرمانرەوایی تازەی ڕۆم- واتە بیکات بەعاشیقەی خۆی، ئەوا کلیوپاترا لەبەرچاوی ئەنتوان سوك دەهاتە بەرچاو ولەبەرچاوی شیرین نەدەبوو، ئەگەر کلیوپاترا دەستپێشخەری بکردبا وەك کرووزانەوەو کلکەسوتە دەچوو، چونکە ڕۆمیەکان بەئاشکرا دەیانویست وبەتەمابوون تەختی پاشایەتی میسر لەناوبەرن، لەو ڕۆژە بەدواوە شازنی میسر کەوتە بیرکردنەوە لەوەی هۆکارێك پەیدابکات بۆئەوەی سەرنجی ئەنتوان بۆلایخۆی ڕاکێشێت بێئەوەی ئەو بزانێت کلیوپاترا حەزی لەوەیە، «سیزار حەزی

لەکاری هونەری وسیاسەتبوو بەلام ئەنتوان حەزی لە شەرابخواردنەوەو هەوەسبازیبوو- هەرچەنە حەزیشی لەشەڕبوو، بەلای ڕۆمیەکانەوە شەڕ شتێکی سروشتییەو هەرکەسێکی ڕۆمی بێت حەزی لەجەنگە، بەهۆی ئەوەی ئەنتوان بەرگری لە سیزار دەکرد ئەوەندە بەرزبۆوەو پلەوپایەی وەرگرت، کاتێ سیزار ویستی بچێ بۆ جەنگی پومپە ئەنتوانی لەجێگای خۆیدا دانا تاکاروباری دەولەتی ڕۆم بەڕێوەبەرێت، ئەنتوان لەوکاتانەی سیزار لەڕۆمدا نەبوو هەموو کاتەکانی خۆی بەرابواردن وقومارو دەکردو لەشەقامەکانی ڕۆمدا کاروانی بەزم ورەزمی دروستدەکردو وئەوانەی لەوحەیش ونەیشەدا بەشداربوون، ئەنتوان بۆخۆیی و مەعشوقەکانی وهەندێ ژنی ئاترۆو کۆمەڵێ مۆسیقاژەن وگۆرانی بێژ کەلەعارەبانەکاندا دادەنیشتن وبەسەر شەقامەکاندا تێدەپەڕین، کاتێ یەك پارکی نزیك شەقامیان دەبینی، لە عارەبانەکان بازیان دەدایە خوارێ و دەستیان دەکرد بەخواردن وخواردنەوەو لێدانی مۆسیقاو گۆرانی، وەختێ ڕێبوارن دەیانبینی کۆمەڵێ ژن وپیاو خەریکی رابواردن وگۆرانی وخواردنەوەن واقیان دەوڕما، چونکە لەمەوبەر نەیانبینیبوو ئەشرافەکانی ڕۆم بەبەرچاوی ڕێبوار ولادێییەکانەوە خەریکی دەستبازی ورابواردن وشەرابخواردنەوەبن، دەولەمەندەکانی ڕۆم باغی گەورەیان هەبوون کەویستبایان هەندێ لەکاتی خۆیان بەرابواردنەوە بەسەربەرن دەچوون بۆباغەکانی خۆیان، باغەکانی ڕۆم بەپێچەوانەی باغەکانی میسر دیواریان هەبوو کاتێ ڕێبوار وڕێبوان بەنزیکیدا تێدەپەڕین ناوەوەی باخەکانیان نەدەبینی، بەلام بێئابڕویی ئەنتوان وهاوەلەکانی کەبەردەوام لە دەشتەکاندا بەئاشکرا خێمەو تاولیان هەلدەداو خەریکی مەیبازی وخواردنەوەبوون، ببوەجێگای سەرسوڕمانی خەلك ودەیانگوت چۆن ئەو پیاوە کاتێ سیزار لەڕۆم نابێت ئەو دەبێتە فەرمانڕەوا وکاروباری ولات بەڕێوەدەبات ئەوەندە بێ دەربەست ولامسەللایی دەکات، لەمەوبەر گوتم لەڕۆمدا دوازدە جادەی دەگمەن دروستکرابوون وهەمووشیان دەچوونەوە شاری ڕۆم، خەلك سەرسامبون لەعەیش ونەیشی بەردەوامی ئەنتوان- لایان سەیربوو بۆئەو پیاوە لەرابواردن وخۆشگوزەرانی وەڕەس نابێت؟ لەخۆیان دەپرسی ئایە ئەوپارەیەی لەکوێ دەبێت؟ ڕاستیەکە ئەوەیە کەسیزار لە ڕۆم نەبوا ئەنتوان نەدەوێرا دەستبێبات بۆ بۆ رابواردن وعەیش ونەیشکردن ولەخەزنەی دەولەت پارە دەربێنێت، ئەوکاتانە دەچوو قەرزی دەکرد، کاتێ سیزار لەئەسکەندەریەوە بۆ ڕۆم گەڕایەوە ئەنتوان لەئەنجامی ئەو خۆشگوزەرانی ورابواردن وئاهەنگانەی کەسازیدەکردن دوازدە ملیون سس ترز، قەرزداربیۆوە، بەوەی سیزاریش پاریزگاری لەئەنتوان دەکرد، بۆیە خاوەن قەرزەکان نەدەوێران زەبروزەنگ لەگەل ئەنتواندا بەکاربهێنن، کاتێ سیزار زانی ئەنتوان دوازدە ملیون سس ترز قەرزدارە، ویستی هاوکاری بکات ورازیبوو کۆشك ومولکی پومپە کەبێ خاوەن مابۆوە بە ئەنتوان بفرۆشێت وئەو بەقیست پارەکەی بداتەوە سیزار، مەبەستی سیزار ئەوەبوو دوای ئەوەی ئەنتوان بووبە خاوەنی کوشك ومولکەکانی پومپە لەوملکانەدا کاربکات ولەبەروبومی ئەو قەرزەکانی خۆی بداتەوەو ئەو کوشك وملکانەش هەرخۆی بەخاوەنیان بمێنێتەوە، ڕاستیەکی تر هەیە ئەویش ئەوەیە سیزار دەیزانی لەهەموو ڕۆمدا کەسێك پەیدانابێت کۆشك ومولکەکانی پومپە بکرێت، چونکە خەلك پومپەیان بەشەهید دەزانی وپێیانوابوو ئەو بەبێ گوناهی کوژراوەو وایاندەزانی سیزار کۆشك ومولکەکانی پومپەی دەستبەسەردا گرتووەو بۆکڕین ناشێ، چونکە دیکتاتۆری ڕۆمی دەیزانی کەس کۆشك ومولکەکانی پومپە ناکرێت، بۆیە بەئەنتوانی

فرۆشت و رازیبوو قیمەتەکەی بەقست بدات، پێشتر ئەنتوان لەخانوی کرێدا دەژیاو خانوی خۆی نەبوو, دوای ئەوەی ملکومالٚ وکۆشکی پۆمپەی لەسیزار کڕی بووبە خاوەنی مالٚێکی پاشایانە, کۆشکەکەی پۆمپە هەموو کەلوپەلێکی تێدابوو فەرش وقەنەفەو کەلوپەلی مەتبەخ .و( شوفار سانترال)و هتد ... , ئەو ڕۆژەی ئەنتوان چووە ناوکۆشکی پۆمپەو لەوێدا نیشتەجێبوو یەك کەچکیشی لەگەلٚ خۆیدانەبرد تەنها خزمەتکارەکانی خۆی لەگەلٚ خۆیدا بردو ویەکەم شەویشی لەکۆشکی پۆمپەدا بەڕابواردن وخواردنەوە بەسەربردو ژنی لەشفرۆش وپیاوی دەویت و بەد ڕەفتارو ژنانی لەدەوری خۆی کۆکردنەوە.

بەهۆی ئەوەی سیزار لەڕۆمدابوو ئەنتوان نەدەوێرا کاروانی بەزموڕەزم لەجادەکاندا بەڕیابکات, بەلاٚم دەیتوانی لەوکۆشکەی تازە چووبووە ناوی بەزموڕەزمبکات سیزار دەیزانی ئەنتوان کاتەکانی خۆی چۆن بەسەردەبات بەلاٚم سەر زەنشتی ئەوی نەدەکرد, سیزار پیاوێکی سیاسی بوو دەیزانی ئەو پیاوە سیاسیانەی خەریکی ڕابواردن وخواردنەوەن بیر لەگرتنەدەستی دەسەلاٚتداریەتی ولاٚت ناکەنەوە, خۆئەگەر بشیانەوێت فەرمانڕەوایی بگرنەدەست هۆکارو کەرەستەی تەواویاننییە بۆئەوەی پشتی پێببەستن ولەوێوە بگەنە ئەو ئارەزوەیان, بۆیە سیزار ڕێگری لەداوێنپیسی وعەیش ونەیشی ئەنتوان نەدەگرت, بەم شێوەیە درێژەی کێشا تاکاتی دانی قستی یەکەم هات، سیزار وەلاٚمی بۆ ئەنتوان نارد کەقستی یەکەمی کۆشکەکەی پۆمپە بدات، بەلاٚم ئەنتوان بەبەردەوامبونی لەسەر ڕابواردن نەیدەتوانی ئەو قستەبدات, سیزاریش ئەمەی دەزانی بەلاٚم دەیویست ئەنتوان بترسێنێت وئەویش دەست بەپارەوە بگرێت، دواتر ئەنتوان ماوەی شەش مانگ مۆلەتی لەسیزار وەرگرت بۆدانی قستەکەی, من لەخاتونەکەی خۆمم بیست کەگوتی: چونکە ئەنتوان لەسیزار دەترسا و دەیزانی دوای ئەو شەشی مانگە تینی بۆ دێنێت بە دانی قستەکەی ودواتر کۆشك و ملکومالٚی پۆمپەی لێدەستێنێتەوە، بۆیە دەکرێ بلٚێین ئەویش بەشداربووە لەکوشتنی سیزاردا, هەروەها گوتی ئەنتوان بۆخۆی بەشدارنەبوو لەکوشتنی سیزار بەلاٚم بێدەنگبوونەکەی ئەوەنیشاندەدات کەحەزی کردووە سیزار نەمێنێت, چونکە پێشئەوەی سیزار لەپەرلەماندا بکوژرێت یەکێك لەکودەتا چیەکان بەئەنتوانی گوتبوو ئایە حەزدەکەیت لە کوشتنی سیزاردا بەشداری بکەیت یان نا؟

ئەنتوانیش لەوەلاٚمدا گوتبووی من ڕقم لەسیزارە, بەلاٚم حەزبە مەرگی ناکەم وبەشداری لەکوشتنیدا ناکەم, ئەگەر ئەنتوان ڕاستی کردبا، بەوەی سیزار زۆر چاکەی لەگەلٚ ئەوداکردبوو, دەبوایە بەسیزاری گوتبا خەریکی لەناو بردنتن تائەویش لەخۆی وریابا, بەلاٚم ئەنتوان بێدەنگ بوو- بەو بێدەنگیەشی ئەوەی نیشاندا کەحەزدەکات سیزار بکوژرێت تاناچارنەبێت قیستەکانی کۆشك وملکومالٚی پۆمپە بدات.

ئەنتوان هەر بەردەوامبو لەعەیشونەیش وڕابواردن بەوهیوایەی دوای تەواوبوونی ئەوشەش مانگە بۆجارێکیتر مۆلەت لەسیزار وەردەگرێتەوە، بەلاٚم پێش تەواوبوونی ئەوشەش مانگە – سیزار بەکوشتچوو وئەنتوان ژنەکەی سیزاری بەکودەتاچیەکان ترساندو ناچاریکرد هەموو سەنەدو پارەوخشلەکانی سیزار بگوازێتەوە مالەکەی ئەو, تائەوکاتەی تەرمی سیزاریان نەسووتاندبوو ئەنتوان دەترسا مەرامی خۆی ئاشکرابکات, بەلاٚم دوای ئەوەی تەرمی سیزاریان سوتاند بەدیارکەوت ئەنتوان دەیەوێت جێگای سیزار بگرێتەوە, چونکە جارانیش کاتێ سیزار لە ڕۆمدا نەبا ئەنتوان جێگری بوو بۆهەلسوڕاندنی کاروبارەکانی دەولەت, پەرلەمانی ڕۆم ڕازیبوو ئەنتوان کاروباری ولاٚت بەڕێوەبەرێت,

هەر كەئەنتوان لەمە دڵنیابۆوە- ئیتر دەستیكردەوە بە عەیش ونەیش وڕابواردن, بەرتیل خۆری لەسەردەمی سیزاردا هەبوو بەڵام بەشێوەی ئاشكرانا، كارمەندو لێپرسراوانی دەوڵەت چونكە لەسیزار دەترسان نەدەوێران بەئاشكرا بەرتیل وەربگرن بەڵام ئەنتوان هەموو بەڕێوەبەرایەتی وفەرمانگەكانی دەوڵەت وسوپاشی توشی گەندەڵی ئیداری‌و بەرتیل دەكردەوە, ئەستەمبوو كەسێك بەبێ بەرتیلدان كارێكی دەوڵەتی دەستبكەوێت, چونكە سیزار مردبوو وكاروباری وڵات ئەنتوان بەڕێوەی دەبرد، كەس نەدەوێرا باسی دانی قیستی كۆشك ومڵكوماڵی ڕۆمیە بكات, بەڵام فەرمانڕەوایی تازەی ڕۆم لەترسی ئەوەی لای هاوڵاتیان بەدناونەبێت قەرزەكانی تری خۆی بەقیست دەدانەوە, لەڕێگای وەرگرتنی بەرتیل ئەوەندە پارە بەدەست ئەنتوان دەكەوت تەنانەت بۆهەڵگرتن و ژماردنی ئەوچەند ژمێریارێكی تایبەتی لای خۆی دامەزراندن, بۆئەوەی بەمەرەد سیزاریش نەچێت گاردێكی تایبەتی لە سوپای سوریایی بۆ پاراستنی خۆی دروستكرد, سەرەتا ژمارەی ئەوسەربازانەی پارێزگاریان لەئەنتوان دەكرد دوو هەزار كەس بوون, دواتر ژمارەیان گەیشتە شەش هەزار كەس, ئەمانە بەبڕیاری پەرلەمان ولەسەر خەرجی میللەت بوون, ڕۆژێكیان ئەنتوان حەزیكرد بچێت بۆ كتێبخانەو لەگەڵ دۆستەكانی خۆیدا لەوێ شەراب بخۆنەوە, فەرمانڕەوای ڕۆم لەگەڵ هەندێ دۆستی خۆیدا كەژنی بەرەڵاو پیاوی خوێڕی بوون سواری كەژاوەبوو وچەند كەژاوەیەكی تریش لەپشتیەوە بوون و ڕێگای كتێبخانەكەیان گرتەبەر.

كاتێ گەیشتە كتێبخانەكە , كۆمەڵی لە بیرمەندو فەیلەسوفەكانی ڕۆم لەوێدا خەریكی خوێندنەوە بوون , ئەنتوانیش بەو ژن و پیاوە چروكانەی كە لەگەڵ خۆیدا بوون گوتوە دانیشن دەستبكەن بە ڕابواردن و خواردن و خوادرنەوە , كاتێ ئەو فەیلەسوف و بیرمەندانە دەبینن ئەوانە خەریكی ئەم بەزمەن , ئەو كتێبانەی سەر گەرمی خوێندنەوەی بوون داویانەتەوە دەست فەرمانبەری كتێبخانەكەو لەو شوێنە ڕۆیشتوون , دوای ئەوەی ئەنتوان و هاوەڵەكانی شەرابیان خواردۆتەوەو سەرخۆشبون دەستیانكردوە بە هاتو هاوارو نەڕەنەڕ , چونكە هەموو ئەوانە كەسانی كەللە پوچ بوون ناو كتێبخانەكەیان كردۆتە شوێنی ڕمبازی‌و ڕابواردن و پێكداپسین , بە شێوەیەك ئەنتوان مەستبووە تەنانەت نەیتوانیوە بە پێی خۆی بچێتە دەرێ و دوو سێ كەس لە خزمەتكارەكانی هەڵیانگرتووەو بردویانەتەوە ناو كەژاوەكەی بۆ ئەوەی ببیبەنەوە ماڵەكەی خۆی .

دوای ئەو ڕووداوە بۆماوەی چەند ڕۆژێك كتێبخانەكە داخرا كەس لەفەیلەسوف وبیرمەندەكانی ڕۆم نەدەوێران بچن لەوێدا كتێب بخوێننەوە چونكە لەوەدەترسان جارێكیتر ئەنتوان بێتەوە كتێبخانەكەو دەستبكاتەوە بەبەزمو ڕەزم, بەپێی قانونی ڕۆمی, ئەگەر سەربازێكی ڕۆمی بەگاڵتە خەڵكی نارەحەت كردبا ئەوا سزادەدرا, كەچی فەرمانڕەوای ڕۆمی لەتەلاری كتێبخانەكەدا بەزموڕەزمیكرد بەڵام كەس نەیتوانی لێپرسینەوەی لەگەڵدابكات چونكە ئەو فەرمانڕەوای ڕۆم بوو هەندێ جار ئەنتوان بۆسەردانی هەندێ شاری ڕۆم دەچوو, بەڵام كاتێ دەگەیشتە ئەوێ بە شێوەیەك مەستبوو نەیدەزانی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت وئەویان لەناو كەژاوەكەیدا دەهێشتەوەو پەردەی كەژاوەكەشیان بەشێوەیەك دادەدایەوە تاخەڵك نەتوانێت ناوەوەی كەژاوەكە ببینن وبەخەڵكیان دەگوت ئەنتوان لەڕێگا نەخۆشبووە بۆیە نابێ پێتان سەیربێت بۆ دانابەزێت و لەگەڵ ئەشرافەكانی شاردا ناكەوێتە قسەكردن, لەڕۆمدا تەنها

کەسێك هەبوو کەڕەخنەی لە ئەنتوان دەگرت وکەموکوڕیەکانی ئەوی بەیاندەکردن ئەویش سیسرۆن نوسەری گەورەی ڕۆمی بوو.

ڕۆژێکیان سیسرۆن چوو بۆ هارد پارکی شارو دژبە ئەنتوان وتەیەکی پێشکەشکرد, سیسرۆن لە ڕۆمدا زۆرلەوە بەناوبانگتربوو بچێت لەهارد پارکدا(1) (لە وڵاتی ڕۆمدا هەر کەسێ لە هارد پارکدا قسەی بۆ خەڵك کردبان پارێزراو بوو, چونکە ئەو کەسەی لەسەر سەکۆی هارد پارکدا دواوە لێکۆڵینەوەی قانونی لەگەڵدا نەدەکرا,و فارسی)

قسەبکات بۆیە خەڵك زۆر کۆبونەوەو بەتامەزرۆییەوە گوێیان لەقسەکانی ئەوگرت و ئەو گوتی: ئەی خەڵکی ڕۆم ئەوپیاوە بەدەمەست و مودمینە ئەوەندە هیچ ونالێوەشاوەیە تەنانەت لێوەشاوەیی بەقەد هیچ کەسێکی ئەم وڵاتەنییە، — ئەو لێوەشاوەیی کەسێکی ئاسایی نیە جاچجای ئەوەی ببێت بەفەرمانڕەوای ئیمپراتۆریە گەورەکەی ڕۆم ولەجێگای پیاوێکی وەك سیزاردا دانیشێت, میللەتی ڕۆم لەوکاتانەی دەبێتە جێگای سەرنجی خواکان دەبێتە خاوەنی کەسانی فەرمانڕەوای مەزن و ئەوانە شوێنەواری وەك جاددە دەگمەنەکانی ڕۆم ولولەی ئاوو ئاوەڕۆ ... دروستدەکەن وپانتایی خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم ئەوەندە زیاد دەکەن کەپەنجا بەرامبەر بەخودی خاکی ڕۆمی لێدێت, بەڵام لەو سەردەمانەی کەمیللەتی ڕۆم نابێتە جێگای سەرنجی خواکان فەرمانڕەوای وەك ئەنتوانیان لێپەیدادەبێت, ئەی میللەتی ڕۆم هەموو ئەو فەرمانڕەوایانەی لەم وڵاتەدا هاتونەتە سەرکار بەرنامەیان هەبووە, پرۆسەی هەندێ لەمانە چاکسازی ناوخۆ بووەو بەرنامەی هەندێکی تریشیان شەڕکردن بووە لە دەرەوەی ڕۆمدا بۆ بەرفراوانکردنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم, بەڵام ئەنتوان هەرلە تافی لاویەوە پیاوێکی سوك وریسوابووە, جگە لەو بەرنامەی کەهەموو پیاوە گەنجەکان وەك خۆی ڕیسوابکات وژنەکانی ئەم وڵاتەش بکاتە گومراو بەدڕەوشت, ڕۆڵەکانی ڕۆم من بەئێوە دەڵێم ئەگەر ئەو ئەمڕۆ لەسەرکار لابرێت لەسبەی باشترە پێویستە بەزوترینکات بونەوەرێکی ئاواپیس لەسەرکار لابرێت کەسیزاریش دیکتاتۆری ڕۆم بوو, هەندێ کەس لەهارد پارکدا دژبە سیزار قسەیان بۆخەڵکدەکرد لەمانەش سیسرۆن کەسیزاری بەوە تاوانبار دەکرد بنەماکانی دیمکوکراسی پێشێلکردوون, دوای ئەوەی سیزار بەهێزتربوو ئیتر کەس نەدەوێرا لەهارد پارکدا دژ بەئەو قسەبکات, لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی دژی بەئەوبوون لەم لاولا بەخراپ باسیان دەکردو سیزاریش دەیزانی نەیارەکانی چی دەڵێن بەڵام چونکە ئەو پیاوێکی بەهێزو سینگفراوانبوو, بەربەرەکانی وسەرکوتکردنێ نەبارەکانی نەدەکرد, کەچی ئەنتوان ئەو تێڕوانینەی سیزاری نەبوو, نەیدەتوانێ بەرگەی ڕەخنەکانی سیسرۆن بگرێت وبڕیاریدا بیکوژێت, دەڵێن ئەنتوان بۆکوشتنی سیسرۆن پارێزەرە سوریەکانی خۆی ڕاسپاردبوون وچەند کەسێکی لەمانە ئەمادەکردبوو بۆکوشتنی ناوبراو, هەروەها دەڵێن کاتێ سیسرۆن شەوێ لەباغەکەی دەرەوەی شاری گەڕاوەتەوە بۆ ڕۆم کوشتویانە, باخەکەی سیسرۆن کەوتبۆ دەرەوەی شارو کەمێ دووربوو لەشارێکان لەنێوان باخەکەیی و شارێکدا بۆسەیان بۆئەو نابۆوەو لەپشتەوە هێرشیان کردبۆسەرو یەکێکیان دەمی سیسرۆنی گرتوەو دواتر بردویانە بۆ بێشەیەکی نزیك لەوشوێنەو لەوێ سەریان لەلاشەی جیاکردۆتەوەو سەری ناوبراویان خستۆتە ناو کیسێکەوەو هێناویانەتەوە ڕۆم.

ڕۆژی دواتر کاتێ خەڵك لەبەردەم سەکۆی هارد پارکدا کۆدەبنەوە دەبینن مێزێك لەسەر سەکۆکە دانراوەو سەرەبڕاوەکەی سیسرۆنیشیان لەسەردانـاوە, لەومەیدانەدا داب نەبوو مێزی وتاربێژی هەبێت وناتیقەکان لەپشت ئەومێزەوە قسەبکەن, تەنها لەو ڕۆژانەدا نەبێت کەنائاسایی بوون, وەك ڕۆژی سوتاندنی تەرمی سیزار, زۆرجار هەرکەسێ ویستبای وتەیەك پێشکەش بکات دەچۆ سەر ڕەمپایەك کەبۆ دانیشتنی خەڵك دروستکرابون و وتەکەی خۆی دەگوت, بۆیە سەرە بڕاوەکەی سیسرۆنیان لەسەر سەکۆی هارد پارکدا دانابوو بۆئەوەی خەڵك بزانێت ئەنتوان زۆر لەوەبەهێزترە کەئەوان وێنای دەکەن, هەر کەسێ نەیاری ئەوبکات ئەوا توشی چارەنوسی سیسرۆن دەبێتەوە،

-من لەخاتوەکەی خۆم پرسی: چۆن پیاوێکی شەرابخۆرو بێدەربەستی وەك ئەنتوان توانی ئاوساری فەرمانڕەوایی لەدەستخۆیدا بهێڵێتەوە؟

-خاتونەکەی من گوتی: هۆی مانەوەی ئەوپیاوە ئەوەیە کەڕەفتارو هەڵسوکەوتی لەگەڵ سەربازەکاندا زۆرباشەو هەرگیز لەگەڵ سەربازەکانیدا ڕۆح زلی نەدەکرد، نەك هەرلە دەرەوەی ڕۆمدا جارجار نانی لەگەڵ سەربازەکانیدا دەخوارد، بەڵکو لەخودی ڕۆمیشدا سەردانی سەربازگاکانی دەکردو لەگەڵ ئەواندا نانیدەخواردو داوای لێدەکردن باسی ڕابواردن ومێبازیەکانی خۆیانیان بۆ ئەو بگێڕنەوە, ڕابواردنی سەربازانی ڕۆمی لەگەڵ ژنە گەڕۆك وقەرەجەکاندا شتێکی ئەوتۆنەبوو, بەڵام بەوردی گوێی لەقسەی ئەوانە دەگرت ولەزەتی لەگێڕانەوەی بەسەرهاتی گانکردنەکانی ئەو سەربازانە وەردەگرت وپێدەکەنی, لەوڵاتێکی وەك ڕۆمدا کەدەوڵەتی سەربازییەو سەرچاوەی هێز سوپایە, ڕەفتار باشی لەگەڵ سەربازاندا زۆر لەبەرژەوەندی ئەنتواندابوو.

-من لەخاتونەکەی خۆم پرسی: ئایە ئەنتوان خۆی ناچاردەکرد لەگەڵ سەربازەکاندا دۆستایەتی بکات- یان بەڕاستی حەزی لەدۆستایەتیکردنی ئەوان بوو؟

-کلیۆپاترا گوتی: ئەو لەدۆستایەتیکردنی سەربازەکان چێژی وەردەگرت, هۆکەشی ئەوەبوو زانیاری ولەسلیقەی ئەو زۆر لەهی سەربازەکان زیاتربوو, ئەنتوان کەلەگەڵ سەربازانی لەشکرێکدا دادەنیشت و ئەوان قسەیان بۆدەکرد پێدەکەنی وشادمان دەبوو، چونکە تێدەگەیشت ئەوانە چی دەڵێن وئەوانیش لەقسەکانی ئەنتوان دەگەیشتن, بەڵام کاتێ ئەنتوان لەگەڵ کۆمەڵێ سیناتۆرو ئەشرافی ڕۆمیدا دادەنیشت, ئاسودە نەدەبوو چونکە ئاستی زانیاری ئەمانە لەهی ئەو زیاتربوو, کاتێ ئەنتوان لەکۆڕو کۆبونەوەی ئەشرافەکاندا پێدەکەنی لەکانگای دڵیەوە نەبوو, بەپێچەوانەی ئەو کاتانەی لەناو سەربازەکاندا دادەنیشت وقسەی دەکردن, ئەنتوان بەقەدو باڵایەوە دیاربوو کە پیاوێکە هەرگنگی بەڕوکەش وخۆشگوزەرانی جەستەیی دەدات نەك چێژ وەرگرتنی مەعنەوی و هزری, من کاتێ بۆ یەکەمجار ئەنتوانم بینی ئەوم لەگەڵ سیزاردا بەراورد کردو بۆم دەرکەوت ئەم دوانە بەتەواوی لێکترجیاوازن, سیزار پیاوێکبوو مەیلەو لاوازو تەوێڵێکی بەرزی هەبوو وباڵایەکی بەرزو چاوەکانیشی کەزۆرجار بەرەو ئاسۆ دەیڕوانی ئەوەی دەردەخست ئەوپیاوە حەزەکانی خۆی لەناو ئەوشوێنانەدا بۆیان دەگەڕێت کەلەودیو دنیای مادییەوەن, بەڵام قەدو باڵای ئەنتوان بە ڕوخسارێکی پانکەڵەو قەڵەو ونێو چاوانێکی بچوك وپشتە ملێکی قەڵەوو سینگێکی پان و دووچاوی بچوك کەبەردەوام وریایی کەسانی دەکرد و ئەمەش ئەوەی دەگەیاند ئەو خۆشی ژیان تەنها لەوەدا دەبینێتەوە چێژی جەستەیی و

ماددی وەربگرێت، دوای ئەوەی ئەنتوان لەگەڵ خاتونەکەی مندا ئاشنایی پەیداکرد، من شتی وام لەئەودیت وبیست کەبەپێچەوانەی ناسینەکانی ئێمەبوو من پێموابوو ئەنتوان کەسێکی دڵرەق وسەختبێت، چونکە ئەزمونی ئەوەم هەبوو ئەوجۆرە پیاوانە تەنها لەکاتێکدا مهرەبانن کەدەیانەوێت سەبوری مەنی جەستەی خۆیان بەپارە دەستەبەربکەن، بێجگە لەمە هەرگیز ئامادەنین یارمەتی کەسانی موعتاجبدەن ئەگەر لەنزیکترین دۆستەکانی خۆشیانبن، ئەو جۆرە کەسانە، کاتێ کەسێکیان پەنایان بۆدەهێنن تادەستگیرۆییان بکات، دەست بەڕوویانەوە دەنێن و لەو نائومێدکردن و شکاندنانەشیان لەزەت وەردەگرن وشانازی بەخۆیانەوە دەکەن بەوەی ئەوان کەسێکی بەتوانان و دەستبەڕووی ئەو کەسانەوە دەنێن کە موعتاجن ودێن بۆلای ئەو.

ڕۆژێکیان یەکێك لەدۆستەکانی ئەنتوان چوو بۆ ماڵەکەیی و داوای لێکرد یەك ملیۆن سس ترزی بەقەرز بداتێ، ئەم بڕە پارەیە زۆرەو بازرگانەکانی ڕۆمیس ئەو بڕە پارەیە بەکەس نادەن مەگەر لە بەرامبەر وەرگرتن و دانانی قەباڵەی ملکێکدا.

ئەنتوان لەبیستنی ئەو بڕە پارەیە سەرسام نەبوو وداوای ژمێریاریە تایبەتیەکەی خۆی کردو گوتی ئەم دۆستەی من داوای یەك ملیۆن سس ترزی لێکردووم وبڕۆ بۆی بهێنە.

-ژمێریاریەکە لەبیستنی ئەوبڕە پارەیە سەری سوڕماو گوتی: ئایە بچم یەك ملیۆن سس ترز بێنم؟

-ئەنتوان گوتی بەڵێ.

-ژمێریارەکە پێیوابوو ئەنتوان نازانێت یەك ملیۆن سس ترز چەند پارە دەکات دەنا ڕازی نەدەبوو ئەو پارەیە بەبێ سەنەد بەقەرزبدات بەدۆستەکەی، چوو کیسەکانی بەکۆڵی چەند خزمەتکارێکداداو هێنای لەبەردەم ئەنتواندا لەسەریەکی دانان وتەپۆلکەیەکی پێ دروستکردن و گوتی ئەمە یەك ملیۆن سس ترزە.

-ئەنتوانیش وای نیشاندا مەبەستی ژمێریاریەکەی خۆی تێناگات وگوتی من پێموانەبوو یەك ملیۆن سس ترز ئەوەندە کەمبێت، دوو ملیۆن سس ترز بدەبە دۆستەکەی من. بروتوس کەیەکێك بوو لەبکوژە بەناوبانگەکانی سیزار، ناوبراو برادەرێکی هەبوو کوشتبویان، چونکە یەکێکبوو لە دۆستەکانی ئەنتوان بۆیە وبڕیاریدا خەرجی مەراسیمی بەخاکسپاردنی برادەرەکەی بروتوس بکێشێت، بۆ ڕێزگرتن لەتەزمی ئەو شانێڵەکەی شانی کەنیشانەی کەسی یەکەمی ڕۆمی دەگەیاند لەشانی خۆی کردەوەو بەسەر جەنازەی برادەرەکەی بروتوسیدادا.

لەڕۆمدا شانێڵی سەرشانی تایبەتی پیاوە گەورەکانی وڵات وسەرلەشکرەکان زۆر بەگرانی تەواو دەبێت چونکە ئەو قوماشە کەتانە بەزێڕوزیو دەڕازاندرایەوەو پێیەوە دەچنرا- یان زۆرجار ئەو شانێڵە لەپێستی دەڵەك دروستدەکراو بەزێڕو زیو ڕیشاڵ و تەکەکەیان دەچنین، هەندێ لەوپیاوانە دووڕوو گەوهەریان پێوەدەخستن، ئەو پیاوەی کەلەلایەن ئەنتوانەوە بەرپرسیاریەتی مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەی پێسپێردرا، شانێڵەکەی ئەنتوان کەبەسەر جەنازەکەیدادا بۆخۆی هەڵگرتبوو و بڕێکیش لەو پارەی بۆ مەراسیمی بەخاکسپاردنەکە تەرخانکرابوو بۆخۆی وەلانابوو، کاتێ ئەنتوان بەمەی زانی ئەوپیاوەی لەسێدارەدا، بەلام بڕێك پارەی کاشی لەیەکێك لەبانکەکانی ڕۆمیدا دانا بەناوی خێزانی

لەسێدارە دراوەکە تامانگانە ماڵ ومنداڵەکەی بۆ بژێوی خۆیان وەری بگرن و بەمردنی کاسبکارەکەیان بەبرسیەتی نەمێننەوە.
من لەو بڕوایەدام واباشە سڵ لەوکەسانە بکرێتەوە کەسەخاوەتکردنەکەیان لەهەوەسەوە سەرچاوە دەگرێت، مرۆڤی سەخی دەبێ ژیربێت وبزانێت بۆچی وچەند دەبەخشێت، پێویستە باس لەوە بکەین چۆنچۆنی ئەنتوان بوو بەفەرمانڕەوای ڕۆم چونکە ئەو واقیعە شایستەی ئەوەیە بگێڕدرێتەوە، بۆئەوەی حکومەتێکی وەکو حکومەتی ڕۆم کەهەموو کارەکانی قانونی بوون نیشانبدەین چۆن وەك ئەژدادە پاشاکانی کلیۆپاترا ڕۆڵەکانی خۆیان دەکوشت براکان خوشکەکانیان دەکوشتن، وەکو گوتم ئوکتاو دوای نەمانی سیزاربوو بەمیراتگرەوەی سیزار هەروەها باسی ئەوەشمکرد کەفەرمانەدەی سوپای پایتەخت ئەفسەرێکبوو بەناوی (لپد) ئەو دوو کەسە هەوڵیاندەدا ببنە فەرمانڕەوای ڕۆم، ئەنتوان پێشئەوەی بگاتە ترۆپکی بەهێزی بەودوو کەسانەی گوت دارشتنی پلان وشەڕو ناکۆکی لەنێوان خۆماندا سەرئەنجامی خراپی دەبێت و هەرسێکمان لاوازدەکات، باشتر وایە ئێمە پێکەوە ڕێکبکەوین و یەك دەستەی هاوبەش پێکبهێنین وپێکەوە کاروبارەکانی وڵاتی ڕۆم بەڕێوەبەرین، سەرەتا وایان کرد ودەستەیەکی کارگێڕی وڵاتیان پێکهێنا لەهەر سێکیان- واتە ئەنتوان و ئوکتاو ولپید، یەکەم کاری کەئەو دەستەیە کردیان لیستێکیان لەناوی ئەوانە پڕکردەوە کەدەبوا بکوژرابان ودەست بەسەر ملك وماڵەکانیاندا گیرابا، ناوی دووسەد سیناتۆرو دووهەزار ئەشراف لەو لیستەدابوو، دواتی بۆ ئەوەی ئەولیستە بگەیەننە سێ هەزار کەس بەڕاوێژکارەکانی خۆیان سپارد هەرناوێك حەزدەکەن بیخەنە سەرئەو لیستەیە بە مەرجێ دەوڵەمەندبێت، ئینجا ناوی ئەو سێ هەزار کەسەی کەبڕیاربوو بکوژێن بەسەر سێدەستە لەئەفسەرو سەربازەکانی سوپایاندا دابەشکرد وهەریەك لەو دەستەیە ناوی قوربیانیەکانیان پێ درا، ئەگەر ئەم کارە لەوڵاتێکدابا میللەتەکەی دواکەوتووبا سەیرنەبوو بەڵام ئەم ڕەشەبکوژیە لە وڵاتێکدا ڕوویدەدا کەلەوێدا قانونی ( هیبا کورپوس ) پەیڕەو دەکرا، ئەو دەستە سێ کەسیەی لە ئەنتوان و لپیذ و ئوکتاو پێکهاتبوون – بۆ کوشتنی هەر سیناتۆرێك بیستوو پێنج هەزار( دنیە)یان دانابوو بەبکوژەکانیشیان ڕاگەیاندبوو دانی ئەوپارەیە پێشئەوەی ملکو ماڵی ئەوانە دەستبەرسەردا بگیرێت لەلایەن حکومەتەوە دەدرێت بەبکوژەکان ولەهیچ بانك وسەنەدێکی ڕەسمیشدا نانوسرێت بۆئەوەی لەئایندەدا ئەو بکوژانە بناسرێن وتۆڵەیان لێبکرێتەوە، هەر کەسێك یەکێك لەوئەشرافانەی کەناویان بڵاوکراوەتەوەو سیناتۆرێن بکوژرێت ئەوا پازدە هەزار دنیە خەڵات وەردەگرێت، بەڵام خەڵاتی ئەوکەسانەی ئەوانیتر دەکوژن دەهەزار دنیەیە.
ئەگەر خزمەتکارێك ئاغاکەی کەناوی لەگەڵ ئەو سێهەزار کەسەدا هەبێت بکوژێت ئەوا پێنج هەزار دنیە وەردەگرێت وئازادیش دەکرێت- واتە ئیتر کۆیلە نامێنێت وناسنامەی ڕۆمی پێدەدرێت. هەرکەسێك یەکێك لەوسێهەزار کەسەی ناویان لەو لیستەیەدا هەیە بکوژێت دەبێ سەرەکەیی و هەردوو دەستی لەئانیشکەوە بڕێت وبیبان بۆ ناوەندە تایبەتیەکانی کەبۆ ئەو مەبەستە دانراون، تالەوێدا خەڵاتەکەی خۆیان وەربگرن. بڕیاری بڕینی دەستەکانی ئەمانە بێ هۆنەبوو چونکە یەکەم دەستی ئەشرافەکانی ڕۆمی ناسکتربوو لەدەستی خەڵکانی تر -لەمیسریشدا ئەشرافەکانی ئێمە چونکە کارناکەن دەست وپەنجەکانیان نەرمونیانە، دووەم زۆر لەبنەماڵە ئەشرافەکانی ڕۆم نەریتێکیان هەبو ئەویش ئەوەبوو

عەلامەتی بنەماڵەکەی خۆیان لەسەر قۆڵیان هەڵدەکەندو بەو دەستە بڕاوانە دەیانزانی کوژراوەکە لە چ بنەماڵەکەیە.

پیاو کوژەکان پارەیان وەردەگرت بەڵام کارگێڕان و کارمەندانی کەکارەکانیان بەڕێوەدەبرد هیچ قازانیان دەستنەدەکەوت بۆیە ئەوانە کەوتنە بیری ئەوەی واباشە پێش ئەوەی دەست بەکوشتنی ئەو سێ هەزار کەسە بکرێت چاکێکی گەورە لەگەڵ هەندێك لەوانەدا بکەن وئەوانە لەوەئاگادار بکەنەوە کەپلانی کوشتنیان دەرکراوەو بەمەش بەخشیشی باش وەردەگرن, ئەوانە زۆر بە وریاییەوە دەجوڵانەوە چونکە دەیانزانی ئەگەر ئەنتوان وئوکتاو ولپید بزانن نهێنیەکەیان درکاندووە دەیانکوژن, ڕاوێژکارەکان نەدەوێران وباوەڕیان بەزۆر لەوانە نەبوو چونکە هەموو ئەوانەی ناویان لەولیستەیەدا نوسرابوو ئەشراف وسیناتۆربوون ولەوە دەترسان ئەوانە بچنەلای ئەنتوان وئوکتاو وباسی ئەوەیان لەگەڵدابکەن چونکە ئەمانە بۆیانەبوو ڕاستەوخۆ بچن بۆلای ئەنتوان وئوکتاو لەبەرئەوەی ئەشراف وسیناتۆربوون.

دوای ئەوەی ڕاوێژکارەکان بەنهێنی هەندێ لەوسیناتۆرو ئەشرافانەیان ئاگادارکردەوە کە مەترسیەکی کوشندە لەپێشیانەوەیە, ئەشرافەکان بەخشیشیان دانێ وخۆیان شاردەوە, بەڵام هەندێ لەئەشرافەکان باوەڕیان نەکردو ئەوەیان بەواقیعی نەدەزانی, دوای ئەوەی ڕەشەبکوژی دەستپێکرد پەشیمانبوونەوە, کاتێ دەستە سێ کەسیەکە زانیان هەندێ لەسیناتۆرە وئەشرافەکانی کەدەبوا بکوژرابان دیارنەماون خەزێنەی حکومەتیش پێویستی بەپارەبوو وناوی هەندێ کەسی تریان بۆ لیستەکە زیادکرد ئەوانەی دەوڵەمەندبوون ناویان خرایە لیستی ئەوانەی بکوژرێن بۆئەوەی دەستبەسەر مڵك وماڵەکەیاندا بگرن, کاتێ جەللادەکان کەسێکیان بەرچنگ دەکەوت لەوانەی ناویان لەلیستەکەدا هەبوو زووبەزو سەرودەستیان دەبرین وبەرەو ئەو ناوەندانە دەڕۆیشتن کەتایبەت بۆ ئەم مەبەستە دروستکرابون تاخەڵاتەکەیان وەربگرن.

هەندێ لەئەشرافەکانی ڕۆم بۆئەوەی لەدەست مردن خۆیان ڕزگاربکەن دەچوونە ناو زێرابەکان و لەوێدا خۆیان دەشاردەوە, بەڵام تەماعی ئەوبڕە پارەیەی بۆ هێنانی سەری ئەوانە دانرابوو ئەو بکوژانەی ئەوەندە بەغیرەتکردبوو دەچوون لەناو ئەو شوێنانەشدا دەیاندۆزینەوە, دوو گەنج کە کوڕی دوو سیناتۆربوون شوێنی خۆشاردنەوەی باوکەکانی خۆیان ئاشکراکردن تابتوانن ببنە خاوەنی میراتیەکەیان, ئەوانە ئاگایان لەوەنەبوو دوای کوشتنی ئەمانە حکومەت دەستبەسەر مڵك وماڵەکانیاندا دەگرێت وهیچ بۆ ڕۆڵەکانیان ناهێڵێتەوە, ئەو دوو سیناتۆرەی کەکوڕەکانیان خەبەریان لێدابوون کوژران وئەنتوان و ئوکتاو هەریەك لەوانە پەنجا هەزار (دنیە )یان دانێ, بەمەش حکومەتی ڕۆمی ئەوەی نیشاندا ئەو کەسانەی دەستکورتبن پاداشتی باشتریان دەدرێتێ بەڵام کوڕی جوامێریش هەبوون کەگیانی باوکەکانی خۆیان ڕزگارکرد یەکێك لەکوڕە ئەشرافەکان وای نیشاندا باوکی مردووەو خستیە ناو تابوتێکەوەو بەبەردەم خەڵك و پیاوکوژەکاندا لەماڵی وەدەرناو بردیە دەرێ, دوور لەدەرەوەی شاردا حەشاریدا, دواتر پیاوکوژەکان یەکێك لە خزمەتکارەکانی ئەو ئەشرافەیان گرتوو سێ شەو وسێ ڕۆژ ئەشکەنجەیاندا تاشوێنی ناوبراویان پێبڵێت بەڵام ئەو خزمەتکارە نەیدرکاند, پیاوکوژەکان نەیانتوانی شوێنی ئەو ئەشرافە بە خزمەتکارەکەی ئاشکرابکەن, ئەو خزمەتکارەیان ئازادکرد بەڵام ئەو لەبەر سەختی برینەکانی دوای سێ ڕۆژ مرد, یەکێك لەبازرگانەکانی ڕۆم بەردێکی کارتزی هەبوو کەبەقەد

چنگی دەست دەبوو وئەو بەردە وەك خۆر دەدرەوشایەوە [1], لیپید كەیەكێكبوو لەوسێ كەسانەی فەرمانڕەوایی ڕۆمیان دەكرد تەماعی لەوكوارتزە كردبوو وبازرگانەكەش نەیدەفرۆشت بۆیە بەفەرمانی لیپید ناوی ئەو بازرگانەش خرایە لیستی ئەوانەی دەبوابكوژرێن, ئەو بازرگانەیان دەستگیركردوو پێشئەوەی بیكوژن زۆر ئەشكەنجەیاندا بۆئەوەی پێیانبڵێت ئەو كوارتزەی لەكوێ شاردۆتەوە سەرئەنجام شوێنی ئەو كوارتزەیان پێئاشكراكردو ئینجا كوشتیان.

چەند كەسێك كەناویان لەلیستی ئەوانەدابوو دەبوابكوژرێن خۆیانكوشت, یەكێك لەوئەشرافانە ئاگری بەردا ماڵەكەیی وخۆشی خستەناو ئاگرەكەو دامركا, سێ فەرمانڕەواكانی ڕۆم– واتە ئەنتوان ولیپید و ئوكتاو, فەرمانیان دەركردبوو قەدەغەیە كەس بۆئەوانە بگرێت, بەڵام خەڵك نەیاندەتوانی لەمەرگی كەسوكارەكانیان ئۆقنەبكرن چونكە ئەوانە بێ تاوانبوون, بەڵام دەستەی سێ قۆڵییە فەرمانڕەواكەی ڕۆم سێ كەسیان لەوكەسانە لەسێدارەدا كەبۆ مردووەكان گریابوون بۆیە ئیتر خەڵك نەدەوێرا بەئاشكرا فرمێسك بڕێژن, لەوكاتەی لەڕۆمدا كوشت وكوشتار بەردەوامبوو لەوڵاتە ئاساییەكانی ژێر ڕكێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیشدا كۆمەڵێ میرنشین وپاشای لۆكاڵی كەتا ئەوكاتەش لەسێزار دەترسان دەستیانكرد بەهەڵشلاخانەوەو ڕاپەڕین دژبە ڕۆم, ئەو وڵاتە ژێر دەستانەی ڕۆم لەئاسیادا بریتیبون لەسوریاو هەندێ لەئاسیای بچوك, ئەنتوان لەڕۆمدا, سوپای ئامادەی هەبوو كەبریتیبوو لە دە لەشكر, ئەمانەی سازكردن ولەگەڵخۆیدا بردنی وبەرەو وڵاتانی ژێر ڕكێفی ڕۆم كەوتە ڕێ, ئەنتوان لەڕۆمدا شوێنەكەی خۆی چۆڵكرد بەڵام سوپای ڕۆمی لەگەڵ خۆیدابرد, ئەو دەیزانی تاسوپای ڕۆمی لەگەڵبێت ئوكتاو ولیپید ناتوانن ئەو لەسەركار لابەن هەركاتێ بیەوێت دەتوانێت بۆڕۆم بگەڕێتەوەو نەك تەنها بۆئەوەی بچێتەوە سەرجێگاكەی خۆی بەڵكو شوێنی ئەودووكەسەی تریش بگرێت, ئەنتوان لەنێوان سەربازەكاندا خۆشەویستبوو لەبەئەمەكی ئەوان دڵنیابوون, بەڵام ئوكتاو لیپید وەك ئەو لای سەربازەكان خۆشەویست نەبوون, ئەنتوان بەسوپاكەیەوە ڕێگای ئاسیای گرتەبەر, چونكە گەڕانەوەی سەردارانی ڕۆمی لە جەنگەكانی دەرەوەی ڕۆمدا زیاتر لەكەسایەتی وچۆنیایەتی ئەوانی زیاددەكردو بەهێزدەبوون, تا ئەو ڕۆژەی ئەنتوان لەڕۆمدابوو نەیدەتوانی ئەودوو كەسەی تری فەرمانڕەوایی ڕۆم لەسەركار لاببات وخۆی بەتەنها ببێتە دیكتاتۆری ڕۆم, چونكە ئوكتاو لیپیدیش بەئەندازەی ئەنتوان بەهێزبوون ودەیانتوانی فەرمان بەسەرسوپادا دەركەن وڕێگرببن لەبەردەم پلانەكانی ئەنتواندا, بەڵام دوای ئەوەی ئەنتوان سوپای ڕۆمی لەوڵات بردەدەرو بەرەو وڵاتانی ئاسیایی چوو سوپای ڕۆم دەكەوتە ژێر فەرمانی خۆی و ئوكتاو لیپید نەیاندەتوانی دەست لەكاروباری سەربازی وەربدەن بەهانەی بردنی سوپای ڕۆم بەهانێكی مەعقولبوو، چونكە میرنشینەكانی وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم شۆڕشیان دژی ڕۆم كردبوو ودەبوایە ئەنتوان بچێت ئەوانە سەركوتبكات و دۆخەكە ئاسایی بكاتەوەو نەهێڵێت لەژێر دەسەڵاتداریێتی ڕۆم بچنەدەرێ, ئەنتوان دەیزانی میرنشینەكانی ئاسیایی لەگەڵ یەكتریدا ناكۆكن وئەگەری یەككگرتنیان نییەو ناتوانن بەرەنگاری ڕۆم ببنەوەو بەسەرفرازی و سەركەوتویی دەگەڕێتەوە ڕۆم، بەوەی سوپاش ڕاستەوخۆ دەكەوێتە ژێر فەرمانی ئەو, ئەوكات دەتوانێت بەئاسانی ئوكتاو ولیپید لەسەركار لابدات وخۆی ببێتە تاكە فەرمانڕەوای ڕۆم, ئەنتوان ئومێدی ئەوەشی هەبوو كۆمەڵی زێڕو

خشڵ لەگەڵ خۆیدا بێنێتەوە، چونکە میرنشینەکانی ژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دەوڵەمەندبوون وئەنتوان پێشبینی ئەوەی دەکرد لەوپاشاو میرنشینانە گەنجینەی زۆری دەستبکەوێت.

من نامەوێت مێژووی ئەنتوان بنوسم بەڵکو مەبەستم ئەوەیە بڵێم چۆن چۆنی بۆهات وڕێکەوت بوو بەهۆی ئەوەی خاتونەکەی من بێئەوەی دەستپێشخەری بکات بۆهێنانە پێشی دۆستایەتی کردنی ئەنتوان ئەمە خۆی ڕۆژگار سوڕاندی وهاتەپێش، خاتونەکەی من حەزی دەکرد هەلومەرجێك بێتە پێش بەئەنتوان ئاشنابێت بەمەرجێ ئەوپیاوە هەستنەکات کلیۆپاترا ئارەزوومەندی ئەم ئاشنایەتیەیە, ڕووداوەکانی ڕۆم وڕۆیشتنی ئەنتوان بۆ وڵاتانی ئاسیایی ژێر دەستی ڕۆم ،ئەو زەمینەیەی بۆ خاتونەکەی من فەراهەمکرد, ئەنتوان لەسەرەتای سەفەرەکەیدا ڕێگای مەکەدۆنیای گرتەبەر ولەوێوە چوو بۆ یۆنان, لەشاری ئەسینادا بۆ پێشوازیکردنی ئەنتوان کۆڕێکی فەلسەفیان گرت ئەنتوان کەبچوکترین زانیاری لەسەر فەلسەفە نەبوو حەزی لەئەدەب و هونەرنەبوو لەوکۆڕەدا دانیشت, کاتێ فەیلەسوفەکان دەدوان ئەو سەری بۆدەلەقاندن تاوای نیشانبدات گوایە تێدەگات.

هەموو فەیلەسوفەکان لەو کۆڕەدا ئامادەبوون و سەرئەنجام هەموویان ڕەزامەندی خۆیان لە بەرامبەر ئەنتواندا دەربڕی چونکە هەرکەسێك قسەی بکردبا ئەنتوان سەری قەناعەتکردنی بۆ دەلەقاند. لەیۆناندا شارێك هەبوو ناوی ( مجار)بوو بەوەی خەڵکی ئەوشارە بینیبویان ئەنتوان مهرەبانی لەگەڵ شاری ئەسیناداکردووە, بڕیاریاندا ئەنتوان دەعوەتبکەن بۆئەوەی بێت بۆ شارەکەیان ودانیشتوانی ئەم شارەشی خۆشبوێت, شاری مجار تەلارێکی شارەوانی هەبوو هەموو خەڵکی شارەکە شانازیان پێوە دەکردو بەباشترین تەلاری یۆنانیان دەزانی, بڕیاریاندا لەو تەلارەدا پێشوازی لەئەنتوان بکەن بەلام کاتێ ئەنتوان لەبەردەرگای ئەوتەلارەدا لەکەژاوەکەی دابەزی, سەیرێکی تەلاری شارەوانیەکەی کردو گوتی: چەند تەلارێکی شڕودزێوە بەبێ ئەوەی بچێتەناو تەلاری شارەوانیەکە گەڕایەوە ناوکەژاوەکەو ڕۆیی. دواتر ئەنتوان لەیۆنانەوە بۆئاسیای بچوك کەوتەڕێ وچووبۆ شارێکی بەناوبانگ بەناوی (ئافس )[1].(یەکێکە لەشارە دێرینە جوانەکانی کۆن وئێستاش شوێنەوارەکانی لەتورکیادا ماون، و فارسی)

من بۆ خۆم شاری ئافسیسم بینیوە ئەگەر بمەوێت سەبارەت بەمە بدوێم- لەوانەیە نوسینی ئەم کاغەزانە کۆتاییان نەیەت, شاری ئافس شارێکە کەوتۆتە ئاسیای بچوك وڕێڕەوی کاروانەکانی خۆرهەلاتەو هەموو ئەو کاروانانەی کەدەچن بۆ بابل وئاشورو ئێران بەڕێگای ئافسدا تێدەپەڕن, شاری ئافس چوارسەد ساڵ پێش دروستبونی شاری ئەسکەندەریە خاوەنی ناوەندی بازرگانی بووەو بەشوێنێکی گەورەی گەشتوگوزاری لەقەڵەمدەدرێت وخەڵکان بەتایبەت ئەو ژنانەی حەزیان لەخۆشگوزەرانی وگەشتبوو دەچوون بۆشاری ئافس, لەئەسکەندەریە پایتەختی وڵاتەکەی ئێمە شوێنێکی تایبەتی بۆپێشوازیکردنی خێزان بەتایبەت ئافرەتان نەبوو, بۆیە تەنها ئەو پیاوانەی ویستبایان ڕابوێرن دەهاتن بۆ پایتەختەکەی ئێمە, بەلام شاری ئافس بۆ پێشوازیکردن لە گەشتیارانی هەمەجۆر لەمانەش ژن خاوەنی شوێنی لێوەشاوەو باشبوو, بۆیە هەموو خێزانە دەوڵەمەندەکان بەتایبەت زیاتر ئەو ژنە دەوڵەمەندانەی میسری و سوری ویۆنانی وڕۆمی دەچوون بۆئەوەی نابەئاسودەیی پشوبدەن و ڕۆژانی خۆش بەسەربەرن, لەئافسدا گورستانی عاشقان نیە, لەئەسکەندەریەدا سالنیە ژمارەیەك لەخەڵکی دەوڵەمەند بەهۆی ئەوەی لەشوێنی ڕابواردنی گشتیدا

سامانی خۆیان لەدەستدەدەن وپارەیان پێنامێنێت پێی بگەڕێنەوە وڵاتەکانیان خۆیان دەکوژن، بەڵام تائێستا لەشاری ئافسدا ڕووی نەداوە ژنێك- یان پیاوێك بەهۆی ڕابواردن و خۆشگوزەرانیکردنی لەشوێنە جیاجیاکانی ئەوشارەدا، گرفتاربن وخۆیان بکوژن، چونکە شاری ئافس بەپێی ئەفسانەکانی کۆن لەلایەن دەستەیەك ژنی یۆنانیەوە دروستکراوە، شوێنەکانی ڕابواردن [1] جیان لەشوێنە گەشتیارەکانی تر بۆیە زۆربەی گەشتیاران ژن ومێردو ومنداڵن- واتە خێزانن وئەمانە بەپێی پێویست پارە خەرج دەکەن ودەستپێوەدەگرن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەژنان ژیرانەتر لەپیاوان لەکاتی گەشتوگوزاردا پارە خەرجدەکەن، لەشاری ئافسدا پەرستگایەك هەیە بەناوی ئارتمیس وخوای شار چونکە سەرەتا دانیشتوانی ئەم شارە ژن بوون وئارتمیسیان پەرستووە، پەرستگای خوای ئارتمیس لەشاری ئافسدا دوو شوێنی سەرەکی هەبوون، یەکێکیان پەناگاو ئەویتر شوێنی داهاتیبوو- جێی بەناگای ئەو پەرستگایە شوێنێکە تاوانبارو کەتنکەران دەچنەناوی چونکە ئەو شوێنە ناتوانرێت قانون وسزای تێداجێبەجێبکرێت وهیچ کەس ناتوانێت خەتابارێك کەلەو شوێنەی پەرستگاکەدابێت بەدەرێ بنێت، تەنها بەمەیلی ئەوکەسە خۆی نەبێت، شوێنی داهاتیشی- سەرەتا بۆ ئەمە دروستکرا ئەو دیاری وپارانەی خەڵکی خاوەن باوەڕ بۆ پەرستگایان دەهێنا کۆی بکەنەوەو بیخەنە ئاڵوێری بازرگانیەوە، بەڵام وردەوردە ئەوەندە زیادی کردو بەرفراوانبوو تالەگەڵ هەموو دنیادابوویە خاوەنی ئاڵوێری بازرگانی، هەر بازرگانەکانی دنیا ئاڵوێر-یان پارەکانی خۆیان لەو شوێنەدا دانەنا بەڵکو هەندێ لەپاشکانیش پارەکەی خۆیان [1] لەوێ دادەنا تالەکاری بازرگانیدا بگێڕدرێت وسودیان لێوەدەستبکەوێت، ئەو ڕۆژەی ئەنتوان گەیشتە شاری ئافس کوڕوکچ تاجیان لەگەڵای درەختی ئەشکەوت دروستکردبوو و خستبویانە سەریان و بەپێشوازی ئەنتوانەوە چوون بۆئەوەی بەڕێزەوە بیهێننە ناوشار، لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەوەش باس بکەم ، دوای ئەوەی کوشتاری سیناتۆرو ئەشرافەکان لەڕۆمدا دەستپێکردو ئەنتوان سوربوو لەسەرئەوەی بکوژانی سیزار لەناوبەرێت هەندێ لەوانە زانیان لە هیچ شوێنێکی دنیادا پەنایەك نییە گیانی ئەوان بپارێزێت تەنها پەناگای پەرستگای ئارتمیس نەبێت، کاتێ ئەنتوان گەیشتە شاری ئافس ئەوسیناتۆرو ئەشرافانەی ڕۆمی کەلەترسی مەرگ هەڵاتبوون ولەوپەناگایەدابوون ئەنتوان دەری نەکێشانەدەرێ وبۆ ڕێزگرتن لەپەرستگای ئارتمیس وازی لێهێنان، چونکە بڕی لەوەکردبۆوە لەوانەیە ڕۆژێك بێ ئەویش ناچاربێت کەڵك لەو پەناگایەی خوای ئارتمیس وەربگرێت، ئەنتوان بڕیاریدا دەبێ شاری ئافس باجی دووساڵبدات و ساڵێکی کەش باجی ئاسایی بدات و ساڵی دواتر لەباجدان دەبەخشرێت، جوتیارانی ئەوشارە دەیانگوت ئەنتوان دەیەوێت باجی دووساڵمان لێبسێنێت، باشە باجەنابیشی کارێکی وابکات ئەمساڵ دوو بەهارو دوو پایزو دوو زستان و دوو هاوین بێت بۆئەوەی بتوانین بەروبونی دوساڵ کۆبکەینەوەو باجی دوو ساڵ بدەین، جوتیارانی ئافس ڕاستیاندەکرد، بەڵام ئەنتوان گوێی بە قسەکانی ئەوان نەداو مامورانی باج وەرگرتن بەبێ ڕەحمانە باجی دوو ساڵیان لەخەڵکی شارەکە وەردەگرت، ئەنتوان پیاوێك نەبوو خەرجی ئەو دەلەشکرەی لەگەڵیدابووبدات، حکومەتی ڕۆم خەرجی ئەو سەربازانەی لەدەرەوەی ڕۆمدابوون ودەچوون بۆ ئەو شوێنانەی لەژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیدا بوون لەخەزێنەی دەوڵەت دەیدا،

ئەنتوان جگەلە وەرگرتنی باج وسەرانەی سالآنەی حکومەتی ڕۆمی دەیویست دەستکەوتی بۆخۆشی هەبێت, چونکە سوپایەکی گەورەی لەگەڵدابوو، دانیشتوانی شارەکانی ئاسیایی ئەنتوان چی ویستبا لەترسان دەیاندا، تەنها بۆ ئەوەی سەروماڵیان پارێزراوبێت, هەندێ لەپاشاکانی ناوخۆیی و ئەو میرنشینانەی کەسەرکەشی وهەڵشلآخانەویان دژبە حکومەتی ڕۆم کردبوو هەرکە گوێبیستبوون ئەنتوان بەوهێزە گەورەیەوە لەرێدایە هەلآتن وهەندێکیان دەستیان وەکێواندواو هەندێکیشیان لەولآتانی ئاسیای بچوك ڕۆیشتن و هەندێکیش لەمانە توانیبویان خۆیان بگەیەننە پەناگای خوای ئایمیس, ئەنتوان دەستی بەسەر هەموو ملك وماڵی ئەو میرنشینانەداگرت کەدژبە ڕۆم هەڵسابوون، کاتێ ئەنتوان لەئاسیای بچوکدا شاربەشار دەڕۆیشت, شەو وڕۆژ کۆمەڵێ ژنی بەرەڵا لەدەوریدابوون و لەناو کەژاوەکەیدا هەر خەریکی ڕابواردن وخواردنەوەبوو وبچوکترین ڕێزی بۆهەستی دانیشتوانی ئەوشارانە دانەدەنا کە پێیاندا تێدەپەڕی- یان هەر نەبێ لەوشارانەی لادابا, جارجارە لەئاسیای بچوکدا سەخاوەتی دەکردو دەستگیرۆیی خەڵکی دەکرد, بەلآم بەردەوام بەخشندەیی وسەخیەکانی ئەو بەنابوتبونی چەند کەسێکیتر تەواودەبوو, ڕۆژێکیان کەبەشارێکی بچوکدا تێدەپەڕیوەو سەرخۆش بووەو بۆنی کەبابی بەبەرلوتی هەلآهاتوەو فەرمانیداوە بوەستن, کاتێ کەژاوەکە وەستا ئەنتوان بینی کەبابچیەکی هەژار قاوەچاغەکەی خۆی لەدەم شەقامەکە داناوەو خەریکی برژاندنی کەبابە, بانگی کابرای کەبابچی کردو داوای کەبابی لێکردو چەند شیش کەبابی خواردن و زۆر لەزەتی لێکردن بۆیە بۆ پاداشتدانەوەی ئەو فەرمانیدا دەستمایەی کەبابچیەکانی ئەم شارەبێنن وبیدەن بەو کەبابچیە, ڕۆژێکیتر شاعیرێکی ماستاوچی بەخوێندنەوەی چەند شعرێك بەزمانی ڕۆمی لەبەردەم ئەنتواندواو پیاهەڵدان بەشانوباڵی ئەو وئەنتوانی لەسەروی سیزار تەنانەت جوپیتریش [1] لە قەڵەم داوە, ئەنتوان کەمەستبوو بغرۆبوو وبەخشیشێکی دابەو شاعیرە کەتائەو ڕۆژە کەس بەخشیشی وای بەشاعیرێك نەداوە، ئەمەش ئەوەبوو فەرمانیدا ڕۆحی دانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە بکەوێتە دەستی ئەو شاعیرەو ئەو دەتوانێت هەموویان بکوژێت وئەوەی بیشیەوێت بەزیندویی بمێنێتەوە دەبێ بەدانی بڕێك پارە ئەو شاعیرە ڕازیبکات.

# پێکگەیشتنی ئەنتوان وکلیۆپاترا

پێشئەوەی ئەنتوان بگاتە شاری تارس, نامەیەکی بۆ شاژنی میسر ناردو لەونامەیەدا داوای کردبوو کلیۆپاترا بچێت بۆشاری تارس تائەو دەگاتە ئەوێ, حکومەتی ڕۆم لەپانتایی ئیمپراتۆریەتیەکەی خۆیدا زۆر پاشاومیرنشینی هەبوون ودەیانتوانی هەریەك لەمانە لەسەرکار لابیات, هەموو ئەوانە باج وسەرانەیان دەدابە حکومەتی ڕۆم وهەندێ لەمانە تەنانەت نۆکەری ڕۆمیشیان دەکرد، تەنها پاشایەك

هەبوو کەلەژێر دەسەڵاتداریەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدانەبوو و خۆی بەکەم نەدەزانی، ئەویش خاتونەکەی من بوو، ڕۆمیشەکانیش دەیانزانی کلیۆپاترا کە ئەژدادی لەسەردەمی ئەسکەندەرەوە تائەمڕۆ پاشایەتیانکردووەو میراتگرەوەی ئیمپراتۆریەتی میسرن, جیاوازی لەگەڵ میرنشین وپاشاکانی تری ئیمپراتۆریەتەکەیاندا هەیەو لەوانەیە هەرلەبەر ئەوەشبێت نەتوانن بەئاسانی کلیۆپاترا لەسەرتەختی پاشایەتی لاببەن- بۆیە پیاوێکی وەك کال-یان قوتکردۆتەوەو کردویانەتە کەرەستەی خۆیان بۆئەوەی تەختی پاشایەتی میسری پێلەبار بەرن, ئەنتوان بۆ دوومەبەست داوای لەخاتونەکەی من کردبێت بۆشاری تارس، یەکەم: ئەوەبوو ئەو خاتونەکەی منی بینیبوو ودەیزانی ژنێکی شۆخ وشەنگە, دووەمیش ئەوەبوو دەیویست نیشانیبدات مەزنی ئەو نەك لەخوار بەڵکو لەسەروی مەزنی سیزارەوەیە, چونکە سیزار حەزی لە کلیۆپاتراکردو بۆخاتری ئەو چووبۆ میسر بەڵام خودی کلیۆپاترا بۆدیداری ئەنتوان دەچێت بۆ شاری تارس.

من لەسەرەتای ئەم بەسەرهاتەدا گوتم سیزار بۆبینینی کلیۆپاترا نەهات بۆئەسکەندەریە بەڵکو بۆ ڕاوەدونانی پومپەهات, بەڵام خەڵکی نەزان تائێستاش پێیانوایە سیزار بۆدیدەنی خاتونەکەی من هاتبوو بۆمیسر, جارێکیان یەکێك لەوکەسانەی جێگای متمانەی ئەنتوان بوو نامەیەکی بۆ کلیۆپاترا هێنا بۆئەسکەندەریە, دوای نامەی یەکەم دوونامەی تر لەسەرداری ڕۆمیەوە بۆ خاتونەکەی من هات وبە دیارکەوت ئەنتوان تۆتکەی لێهەڵگیراوە بۆبینینی کلیۆپاترا, دواتر کلیۆپاترا بریاریدا بکەوێتە ڕێ, ماوەی یەك مانگ هەموو جلدرووەکانی ئەسکەندەریە لەلایەن کلیۆپاتراوە بەکرێ گیران تاجلوبەرگی تایبەتی بۆئەو پیاو وژنانە بدرون کەدەبوا لەگەڵ خۆیدا بیانبات, کەشتیە بێهاوتاکەی کلیۆپاترا بۆبردنی شاژنی میسر بۆشاری تارس ئامادەکرا, من لەمەوبەر باسی مەزنی وجوانی ئەو کەشتیەم کردووەو پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات، بەڵام لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێم بۆدوو هەزارو چوارسەد سەڵبەلێدەرو هەموو ئەوانەی کاریان لەناو ئەو کەشتیەدادەکرد جلوبەرگی یەکجۆران دروستکرد, سەڵبەی تازەشیان لەزیو دروستکرد کەبەزیو ڕو پۆشکرابوون بۆئەوەی لەکاتی سەڵبەلێداندا کاتێ لەناو دێنەدەرێ لەبەردەم خۆردا بدریسکێنەوە, ئەو سەڵبانەیان هەڵگرتن و بەکاریان نەهێنان تائەو کاتەی نزیك شاری تارس دەبنەوە, لە میسرەوە تائاسیای بچوك سەڵبەلێدەرەکان بەسەڵبە کۆنەکان سەڵبەیان لێدەدان و جلوبەرگی ئاسیان لەبەردابوو.

هەموو ئەو کەشتیە جەنگییە چاڕۆکەدارانەی کەدەبوا لەگەڵ کلیۆپاترادا چووبان ڕەنگی چاڕۆکەکانیان گۆڕین بۆچاڕۆکەی ئەرخەوانی وئەو کەشتیانەیان بەشێوەیەك ڕەنگکردن هەر کەسێ بینیبانی وایدەزانی زێڕینن, پێشنەوەی شاژنی میسر لەئەسکەندەریە بچێتەدەر فەرمانیدا دەرگای خەزنە بکرێتەوەو هەندێ شتی گرانبەهای لێدەربهێندرێت بۆئەوەی کەگەیشتە شاری تارس بەدیاری بیدات بەئەنتوان, تائەنتوان پێیوانەبێ کلیۆپاترا بۆدەستگیرۆیی هاتوە بۆلای ئەو و مەبەستی کۆکردنەوەی زێڕوخشڵە.

ئەو ڕۆژەی ئێمە گەیشتینە شاری تارس, ئاسمان سامالبوو دەریاش ئارامبوو هەتاو دەدرەوشایەوە, بەرەبەری نیوەڕۆ گەیشتینە شاری تارس, شکۆمەندی هێزی دەریایی شاژنی میسر زۆربوو نەك هەر دانیشتوانی شاری تارس کارەکانی خۆیان جێهێشت بۆئەوەی بچن بۆ ڕۆخی دەریاو کاروانی پرشکۆی کلیۆپاترا ببینن، بەڵکو خودی ئەنتوانیش لەگەڵ هەندێ سەربازو دۆستەکانی دا هاتەدەم دەریا

تاسەیری کەشتیەکەی کلیۆپاترابکات, کەشتیە مەزنەکەی شاژنی میسر بەهێزی ئەشتسەد سەڵبە بەرەوکەناری شاری تارس دەچوو, دەستەیەك مۆسیقاژەن کەلەسەر تەختایی کەشتییەکەدا بوون ولە دەرەوە دیارنەبون بۆڕێکخستنی سەڵبەکان دەیانژەنی, سەڵبەکان بەیەکجار دەچوونە ناو ئاوەکەو تێکڕاش دەهاتنەوە دەرێ وئەو سەڵبانە لەبەرتیشکی خۆردا دەدرەوشانەوە، کەشتییە گەورەکەی کلیۆپاترا کەتائەو ڕۆژگارە پێشینەی نەبوو کەشتییە بچوکەکانیتر بەهێواشی لەدەوروبەری کەشتییە مەزنەکە دەڕۆیشتن, لەسەر کەشتییەکان داری عودیان دەسوتاندو دووکەڵی ئەوعودە بڵاودەبۆوەو بابەرەو شاری دەبردو ئەو بۆنە خۆشە دانیشتوانی شاری تارسی دڵخۆشدەکرد.

کلیۆپاترا بەجلوبەرگی خوای دەریاوە لەبن سێبەرێك کەبەقوماشێکی کەتانی ئەرخەوانی جوان دروستکرابوو لەسەر تەختێکی نایاب بەنیوە ڕاکشاوی ونیوە ڕوتی پاڵی دابۆوەو دەستەیەك کوڕی گەنج کەئەوانیش نیوەڕوت دەهاتنەبەرچاو بەباوەشێنی لەپەری نەعامە دروستکراو باوەشێنی کلیۆپاترایان دەکرد, شاری تارس لەدەم ڕووبارێکدا دروستکراوە بۆیە نەدەتوانرا کەشتی کلیۆپاترا پێیداتێپەڕێت وناچار لەدەم دەریادا لەنگەری گرت, کلیۆپاتراش ئەمەی دەزانی پێش ئەوەی بگەینە شوێنی لەنگەرگاکە وەستاو کەپروتەختی دانیشتنەکەیی وباوەشێنەکانیان بۆسەر کەشتییەکی بچوك گواستەوەو کلیۆپاتراو دەستوپێوەندەکانی چوونەسەر ئەوکەشتییە, بەهەمان شێوەی پێشوو کلیۆپاترا نیوەڕاکشاو ولەژێر سێبەری چارۆکە ئەرخەوانیەکان وباوەشێنکردنی بە پەری نەعامە لەسەرئەو کەشتییە دانیشتەوە، بەڵام ئەم جارەیان کلیۆپاترا لەشوێنێکدا پاڵی دایەوە تالەهەموو دانیشتوانی ئەو شارەوە دیاربێت, لەو ڕۆژگارەدا خاتونەکەی من کەوتبۆ تافی جوانی چونکە هەموو ژنێك بەڕۆژگارێکی تەمەنیدا تێدەپەڕێت کەجوانی ونازداریەکەی دەکاتە لوتکە, ئەوکات هەرکەسێ شاژنی میسری بدیبا وایدەزانی تەمەنی بیست وسێ- بیست وچوار ساڵە, بەڵام من دەمزانی تەمەنی ئەو کەیشتبۆ بیست وحەوت ساڵ, لەو ڕۆژەدا کاتێ کلیۆپاترا لەسەر کەشتییەکە پاڵی بەپشتییەکانەوەدابوو ولەسێبەری چەترە ئەرخەوانیەکەدا نیوەڕووت دیار بوو دەستەیەك کوڕی گەنج بەباوەشێنی لەپەڕی نەعامە دروستکراو باوەشێنیان دەکرد، ئێمە کەشەو وڕۆژ لەگەڵیدابووین عاشقی ئەوببوین جاچجای ئەو خەڵکانەی شاری تارس کەبۆ یەکەمجاربوو ئەو ژنە جوان ونەشمیلەیەیان دەبینی, ئەو موسیقاژەنانەی لەناو کەشییتە گەورەکەدا خەریکی ڕێکخستنی سەڵبەلێدەرەکانبوون هاتبونە ناو ئەوکەشتییە جەنگییە بچوکەی کەکلیۆپاترای لەسەر سواربوو دەستیانکرد بەمۆسیقاژەنین, شاری تارس بەهۆی هاتنی خوای دەریا بەیوبۆی گرتبوو وخەڵکی شاری تارس وایاندەزانی ئەم بۆنە خۆشە بۆنی لەشی کلیۆپاترایەو کەرەستەکانی ئارایشتی ئەون بۆنیاندێت, پێش ئەوەی تاریکدابێت, هەموو کەشتییەکانی میسری مەشخەڵیان هەڵکردن بۆئەوەی کەشتییەکان دیاربن, ئەنتوان بەدوو سەرلەشکری خۆیدا نامەیەکی بۆکلیۆپاترا ناردو تێیدا داوای کردبوو لەکەشتی دابەزێت وخوانی ئێوارەی لەگەڵدابخوات, شاژنی میسر ئەوەندە باوەڕی بەخۆی بوو ئەوداوای لەئەنتوانکردبێت بۆ سەرکەشتییەکەو خوانی ئێوارەی لەگەلدابخوات.

جوانی ونازداری خاتونەکەی من بەشێوەیەك کاری لەئەنتوانکردبوو خستبویە ژێر عشوەی خۆیەوە تائەنتوان بەداواکاریەکەی کلیۆپاترا ڕازیبوو هاتبۆلای وئەو شەوە لەوێدا لەگەڵ کلیۆپاترادا نانیخوارد,

ڕۆژی دواتر ئەنتوان داوای لەکلیۆپاتراکرد میوانداری بکاتەوەو ئەوبێتە سەر وشکانی ونانی ئێوارەی لەگەڵدابخوات, ئێمەش لەگەڵ خاتونەکەی خۆماندا چووین بۆئەو کۆشکەی کەئەنتوانی تێدانیشتەجێ ببوو وپێشوازیەکی گەرممانلێکرا, لەکاتی ناندانانندا من و چەند خزمەتکارێکی تری میسری لەپشت کلۆپاترا ڕاوەستابوین, چونکە خزمەتکارەکانی ڕۆمی خەریکی ناندانانبوون ئێمە کارمان نەبوو, هەوڕ وقاپەکانی نانخواردن خراپبوون وەك ئەوە دەچوو لادێیەك دەعوەتی شازادەیەك بکات, خودی ئەنتوانیش هەستی بەمەکردو گوتی ئەی شاژنی میسر, وەك دەبینی من لێرە میوانم ومالّی من لەڕۆمدایە لێرەنییە تابتوانم بەوئاستەی شایستەی پلەوپایەو جوانی تۆبێت خزمەتت بکرێت وهیوادارم لەم کەلوپەلەی ئێوارەخوانەمان دلّگران نەبیت, کلیۆپاترا کەلەو شەوەدا سینگ وبەرۆکی خۆی بەعەتری گولّی سوری وئێرانی ڕشاندبوو گوتی: ئەنتوان من بۆیە بۆئێرە هاتووم تاتۆببینم ولەدیتنی تۆ چێژ وەردەگرم, کەلوپەل وخوانداریەتی بەلای ژنێکی وەك منەوە گرنگنییە چونکە من واڕاهاتووم گرنگی بەوشتانە نەدەم کەلایەنی ماددییان هەیە، ئەوەی منی هێناوە بۆشاری تارس تامەزرۆیی دیداری تۆیە, کلیۆپاترا پێشئەوەی بێت بۆ تارس زانیاری تەواوی لەسەر ئەنتوان هەبوو ودەیزانی ئەو جیاوازی لەگەلّ سیزاردا هەیەو خاوەنی زەوق وسەنگینی و هورەی سیزارنییە.

سیزار حەزی لەباسکردنی ئەدەبی ومێژووی وهونەری بوو, کلیۆپاترا دەیزانی باسکردنی ئەمانە لەگەلّ ئەودا نابێتە جێگای سەرنجی ئەو، بۆیە دەبێ لەگەلّ ئەنتواندا قسەی سادەو ڕۆژانەبکات تاتێبگات خاتونەکەی من دەلّێت چی, دەبوا کلیۆپاترا قسەی گالّتەجاڕی وپێکەنیناوی کردبان بۆیە دەستیکرد بەقسەی خۆش تائەنتوان خۆی لەبەرامبەر کلیۆپاترادا بەکەم ونەزان نەزانێت و خەمبارنەبێت, ئەنتوان لەکانگای دلّیەوە بەقسە خۆشەکانی خاتونەکەی من پێدەکەنی ودەیگوت ئەی شازادەی میسر من دەمزانی تۆ زۆرجوانیت بەلاّم نەمدەزانی ئەوەندە قسەخۆشیت, هەمان ئەو شەوەی ئەنتوان بوو بەمیوانی خاتونەکەی من زانیم وەك سیزار کەوتەداوی عشقی خاتونەکەی من و ئەگەری ئەوەی نییە دەستبەرداربیێت, ئەنتوان وەك گوتم بەئەندازەی سیزار زانیاری و کەسایەتی نەبوو, سەبارەت بەژنانیش زیاتر حەزیان لەمجۆرە پیاوانەیە چونە دەتوانین بلّێین پەیوەندیەکانی نێوان ئەنتوان و ژنان هێزی و ڕەفتاری ئاژەلّی بەسەریاندا زالّبوو, ئیستا هەفتەیەك بەسەر مانەوەی کلیۆپاترا لەتارسدا تێنەپەڕیبوو کەئەنتوان نەك عاشقی کلیۆپاترابوو بەلّکو وەك خزمەتکاری ئەویلێهات وهەرچی کلیۆپاترا گوتبای ئەو گوێڕایەلّی دەکردو جێبەجێیدەکرد, دوای شەوی یەکەم کەکلیۆپاترا میواداریەتی ئەنتوانی کرد, هەرکاتێ ئەنتوان بۆنانخواردنی ئێوارە دەهات بۆلای کلیۆپاترا تەنها هەر ئەو دوانە لەسەر سفرەی نانخواردن بوون، جگە لەمن هیچ خزمەتکارێکیتر بۆی نەبوو بێتە ئەوژوورەی ئەنتوان وکلیۆپاترای تێدابوون بۆئەوەی گوێیان لە قسەکانی ئەوان نەبێت, شەوێکیان کاتێ ئەنتوان وخاتونەکەی من خەریکی نانخواردن بوون و منیش خزمەتم دەکردن, گوێملێبوو کلیۆپاترا گوتی ئەنتوان ئایا لەمەوپێش تۆ لەمن دلّنیگەران بووی؟

ئەنتوانیش بەسەرسوڕماوییەوە گوتی : ئەو پرسیارە چییە لەمنی دەکەیت؟ چۆن بیرلەوە دەکەیتەوە من لەتۆ تورە بوویم؟

-کلیۆپاترا گوتی: چونکە حکومەتی ڕۆم دژبە من یەك پروپاگەندەچی قوتکردۆتەوەو کەدەڵێت من خاوەنی تەختی پاشایەتی میسرم.

-ئەنتوان گوتی من ئاگاداری ئەوەنیم, ئەو دەیزانی بەڵام خۆی لەگێلیداو پرسی چۆنچۆنی حکومەتی ڕۆم دژبەتۆ ئیدعاچیەکی قوتکردۆتەوە؟

-کلیۆپاترا گوتی: ئایا تۆ نازانی حکومەتی ڕۆم لەسوریادا پیاوێکیان قوتکردۆتەوەو ئیدعای ئەوە دەکات ودەڵێت برای منەو خاوەنی تەختی پاشایەتی میسرە؟

-ئەنتوان وەك کەسێك لەمێشکی خۆیدا بیربکاتەوە، کەمێ بێدەنگبوو ودواتر گوتی: من هیچ شتێکم سەبارەت بەمە نەبیستووە،

-کلیۆپاترا گوتی: ئایا حکومەتی ڕۆم بەبێ ئاگاداری وەزامەندی تۆ یاریدەی ئەوپیاوە دەکات کە ئیدعای بەتلیموسی چواردەهەم دەکات؟

-ئەنتوان گوتی نا من ئاگاداری ئەمە هەم،

-کلیۆپاترا گوتی: کەواتە تۆ لەمەوبەر دژی من بووی چونکە ئەگەر دوژمنی من نەبوبیت هاوکاری ئەو پیاوەی ئیدعای پاشایەتی میسر دەکات نەدەکرد،

-ئەنتوان گوتی: من دڵنیاتدەکەمەوە یاریدەدەرانی ئەوپیاوە لەلایەن منەوە بۆ دژایەتیکردنی تۆ نەبووە بەڵکو من لەورووەوە یاریدەی ئەوپیاوەمداوە چونکە دەمزانی ئەو دژی خۆشەویستە کۆنەکەی سیزارە،

-کلیۆپاترا گوتی: مەگەر کلیۆپاترا شاژنی میسر جیایە لەگەڵ خۆشەویستەکەی جارانی سیزار؟

-ئەنتوان گوتی: بەڵێ- ئەم دوانە لێکجیاوازن, من دژی شاژنی میسر نەبووم بەڵام دژی ئەوی تریان بووم کەمەعشوقەکەی سیزاربوو, ئاساییە کاتێك ئەو بوو بەدۆستی من دژایەتی کردنی من گۆڕا بۆعشقێکی گەورەو سیزارم بەلەسەر حەقزانی بەوەی ژنێکی ئاواجوانی خۆشویستووە.

-کلیۆپاترا گوتی: ئایا ئێستا تۆشاژنی میسرت خۆشدەوێت؟

-ئەنتوان گوتی: بەڵێ من بەشێوەیەك تۆم خۆشدەوێت کەهیچ ئافرەتێکی ترم ئاواخۆنەویستووە.

-کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر تۆ منت خۆشدەوێت, بۆچی یاریدەی دوژمنەکەی من لەسوریا دەدەیت ؟

-ئەنتوان گوتی: من ئیتر یاریدەی دوژمنەکەی تۆنادەم،

-کلیۆپاترا گوتی: بەڵام ئەو لەسوریادایەو لەشاری بەعلبەگدا دەژیت وخەڵکی ئەوێش ئەو بەبرای من دەناسن وئیدعای ئەوەدەکەن تەختی پاشایەتی میسر هیئەوەو من بەستەمکار لەقەڵەمدەدەن, لەکاتێکا ئەو برای من نییەو براکەم بەتلیموسی چواردەهەم کەمێردی من بوو لەشەڕی ئەسکەندەریەدا کوژراو تەرمەکەشی نەدۆزرایەوەو گوتیان گوایە لەدەریادا خنکاوە،

-ئەنتوان گوتی: ئیتر من پارێزگاری لەودوژمنەت ناکەم.

-کلیۆپاترا گوتی: پارێزگاری نەکردن بەسنییە.

-ئەنتوان لێی پرسی: ئەی چی بکەم؟

-کلیۆپاترا گوتی: تاوانبار پێویستە سزابدرێت.

-ئەنتوان واینیشاندا لەمەبەستەکەی نەگەیشتوەو خۆی هەڵەکردو گوتی: ئایا بۆمن چ سزایەکت داناوە؟

-کلیۆپاترا گوتی: مەبەستم لەتاوانبار تۆنیت, بەڵکو مەبەستم لەوپیاوەیە کەلە سوریادایەو خۆی بەبرای من ناساندووەو ئیدعای تەختی پاشایەتی میسردەکات.

-ئەنتوان گوتی: هەر کەسێکیتر لەجێگای ئەو دابواوبزانێت حکومەتی ڕۆم لەپشتیەوەیەتی، ئەو ئیدعایەی دەکرد.

-کلیۆپاترا گوتی: لەوانەیە بشێ بۆهەموو کەسێك حکومەتی ڕۆمی پشتگیریبکات ئیدعای پاشایەتی میسربکات بەڵام ئەو پیاوەنا، چونکە ئەو کەسێکبوو هەژار وسەرگەردان بەهۆی ئەوەی بووە جێگای سەرنجی من بووبە ئەفسەری سوپای میسرو من پلەی سەرهەنگیم دایەئەو دواتر پلەوپایەکەی ئەوم بەرزترکردەوەو پارێزگاریم لێدەکرد, تابووبە پیاوێکی دیار, ئەو پیاوە قەرزداری چاکەکاریەکانی منە نەدەبا ئیدعای تەختی پاشایەتی میسربکات بۆیە دەبێ سزا بدرێت.

-ئەنتوان بەپێکەنینەوە پرسی: تۆ چ سزایەك بۆئەو دادەنێیت؟

-کلیۆپاترا گوتی: ئەو سزایەی بۆئەو پیاوەی دادەنێم ئەوەیە سەرەکەیم بۆبهێنن.

-ئەنتوان گوتی: دەتەوێت چ لەسەرکەی بکەیت؟

-کلیۆپاترا گوتی: من بۆیە دەمەوێت سەری بڕاوی ئەم بۆبێنن تادڵنیابم وکەس نەوێرێت دژبە من بێت وئیدعای تەختی پاشایەتی میسربکات.

-ئەنتوان گوتی: ئایا حەزدەکەیت خۆی بۆلای تۆبێنم؟

-کلیۆپاترا گوتی: من حەزناکەم ئەوپیاوە گومرایە ببینم تەنها خوازیاری سەری ئەوم بۆئەوەی دڵنیابم. من دەمزانی بۆچی شاژنی میسر حەزی نەدەکرد کاڵ- ببینێت ئەگەر کاڵیان دەستگیرکردباو هێنابایان بۆئاسیای بچوك- یان بۆمیسر, ئەوا کاڵ- هەموو نهێنیەکانی نێوان خۆیی و کلیۆپاترای ئەشکرادەکردن, چونکە بەقسەکانیدا دیاربوو لەمەدەترسا بۆیە بەئەنتوانی گوت من حەزدەکەم نێردراوێکی خۆت بنێری وهەر بەگەیشتنی ئەوپیاوە سەرببڕن.

-ئەنتوان گوتی: ناردنی کۆمەڵێك خەڵك بۆکوشتنی ئەوپیاوەی داوای پاشایەتی میسردەکات و ئێستا لەبەعلەگدا دەژیت زەروری نییە, من نامەیەك بۆحوکمڕانی سوریا دەنێرم وفەرمانی پێدەدەم ئەوپیاوە بکوژێت وسەرکەشی بۆتۆ بنێرێت.

-کلیۆپاترا گوتی: ئەمە بیرۆکەیەکی باشە بەڵام من حەزناکەم حوکمڕانی سوریا لێکۆڵینەوە لەگەڵ ناوبراودابکات - چونکە خیانەتکردنەکەی ئەو لەبەرامبەر مندا ئەوەندە گەورەیە پێویست بە لێکۆڵینەوەناکات باڕاستەوخۆ بیکوژن.

-ئەنتوان گوتی: بەپێی قسەکانی تۆدەکەم لەنامەکەمدا دەنوسم بیگرن ویەکسەرە سەری بڕن و سەرەکەشی بۆتۆ بنێرن.

-کلیۆپاترا پرسی: کەی ئەو نامەیە دەنوسیت؟

-ئەنتوان گوتی: سبەی بەیانی.

-کلیۆپاترا گوتی: کەی سەری بڕاوی ئەوبۆ ئێرەدێنن؟

-ئەنتوان گوتی: دەبێ ئەم نامەیەی من لەڕێگای دەریاوە بچێت بۆسوریاو دواتر بەڕێگای پۆست بنێردرێت بۆ دمشقی پایتەخت ودواتر حوکمڕانی سوریا چەند کەسێك بنێرێت بۆکوشتنی ناوبراو بۆ

شاری بەعلبەگ, من پێموایە ماوەی مانگێك دەخایەنێت تاسەری بڕاوی ئەوکابرایەی ئیدعای تەختی پاشایەتی میسری دەکرد دەگاتە لای تۆ.

ئەو ئێوارانەی ئەنتوان لەناو کەشتییە گەورەکەی کلیۆپاترادا نانی دەخوارد، خاتونەکەی من ئەنتوانی دەبردە ژورەکەی خۆیی ولەوێدا دەیخەواندو بەرەبەیانی زووش ئەنتوان دەگەڕایەوە کۆشکەکەی خۆی, ئەو شەوەش دوای نانخواردن شاژنی میسر ئەنتوانی بردە هۆدەکەی خۆی بەڵام پێشئەوەی بخەوێت هاتە ژورەکەی من وگوتی شرمیون تۆگوێت لەقسەکانی نێوان من و ئەنتوان بوو ودەزانی کەمن داوام لەئەنتوانکرد فەرمانبدات کال بکوژن و سەرەبڕاوەکەشی بۆمن بنێرن.

-گوتم بەڵێ خاتونەکەم من لەکاتی نانداناندا گوێم لەوقسانەبوو.

-کلیۆپاترا گوتی: جگە لەتۆ کەسی تر نازانێت من پلانی ئەوەم هەیە، ئەگەر کالْ ڕابکات ئەوا من وابیردەکەمەوە تۆپێتگوتووە هەڵبێت چونکە دەیانەوێت بتکوژن.

-گوتم: ئەی خاتونەکەی من, ئایە تۆ پێتوایە ئەوکارەکەرە بەوەفایە دێرینەی کەلە منداڵییەوە لەگەڵ تۆدا گەورەبووە خیانەت بەتۆبکات؟

-کلیۆپاترا گوتی: نەخێر ئەمەکی تۆ لەبەرامبەرمندا زۆرە, من هەرگیز بەبەوەفایی تۆ لەبەرامبەر خۆمدا دوودڵنەبووم ونابم، بەڵام مەسەلەی کالْ لایەنێکی گرنگوتایبەتی لەخۆگرتووە.

-گوتم: لە چ ڕووێکەوە مەسەلەی کالْ لایەنێکی تایبەتی لەخۆگرتووە؟

-کلیۆپاترا گوتی: لەو ڕووەوە تۆ لەڕابردودا کالْت خۆشتویستووەو لەوانەیە تائێستاش کاریگەری ئەو خۆشەویستییە لای تۆ هەرمابێت- چونکە گوێتلێبوو من دەمەوێت لەناوی بەرم لەوانەیە بڕیارێکی نهێنی بدەیت وهەوڵی ڕزگاربوونی بدەیت.

-گوتم: ئەی خاتونەکەم من ناتوانم درۆ لەگەڵ تۆدا بکەم، ڕاستە لەڕابردوودا من کالْم خۆشدەویست بەڵام ئەوپیاوە ئەوەندەی ناجوامێری وبێدەربەستیکرد تەنانەت خۆشەویستی منی بۆ ڕقلێبونەوە گۆڕی ئەمڕۆش لەدڵیخۆمدا هیچ هەستێکی خۆشەویستیم لەبەرامبەر ئەودانییە، بە پێچەوانەوە زۆر ڕقم لەکاڵە. من ئەگەر ئەوم خۆشویستبا دوای ئەوەی لەشاری بەعلبەگدا ئەوم بینی خۆم پیشاندەداو تۆلە بەعلبەگدا نەبووی تابزانی من لەگەڵیدابووم, بەڵام چونکە من ڕقم لەئەو دەبۆوە خۆم پیشاننەدا.

-کلیۆپاترا گوتی: پێم باشتربوو بزانیت, ئەگەر هەوڵبدەیت کالْ ڕزگاربێت ئەوا تەواولەبەر چاوم دەکەویت،

-گوتم ئەی خاتونەکەی من سوێند دەخۆم هەوڵی ڕزگارکردن وخەبەردان بەئەو نادەم. دواتر بیرۆکەیەك بەمێشکمدا هاتوگوتم ئەی کەخەڵکانی تر خەبەریان بۆکالْ نارد تاهەڵبێت چی؟

-کلیۆپاترا گوتی: مەبەستی تۆ لەخەڵکانیتر کێیە؟

-گوتم: خودی ئەنتوان چونکە لەوانەیە ئەو لەنامەکەیدا کەبۆ حوکمڕانی سوریای دەنێرێت بنوسێت کالْ ونبکەن- یان باهەڵبێت وخۆی بشارێتەوە- یان کاتێ حوکمڕانی سوریا نامەکەی ئەنتوانی خوێندەوە بڕیاری ئەوەبدات بەکالْ بڵێت خۆت بشارەوە- یان بڕۆ, لەوکاتەدا تۆ وادەزانی من ئەو کارەمکردووە.

-کلیۆ پاترا گوتی: ئەمشەو ئەنتوان تابەیانی لای منەو من پەیمان لەئەو وەردەگرم نەنوسێت کالْ هەڵبێت- یان ئەگەر حوکمڕانی سوریا ویستی یاریدەی کالْبدات بۆهەڵاتن ئەنتوان ئەولەسێدارەبدات

شاژنی میسر سەبارەت بەکاروباری عشق ژنێکی کامڵبوو وتەواوی هونەری دڵبردنی دەزانی وزانیاری لەسەر ئەوەهەبوو چۆن پیاوان لەخشتەببات وهەڵیان فریوێنێت, بەڵام لە کاروباری سیاسیدا ببوبەیەك فەرمانڕەوای بێبەزەیی وحسابی لەسەر هەموو شتێك دەکردو خەریکی کۆکردنەوەی سامانبوو بۆ ئەوەی بتوانێت تەختی پاشایەتی خۆی بپارێزێت, خەمی بە قوربانیدانی نزیکترین دۆستی خۆی نەبوو جاچجای ئەوەی کەسێك دوژمنی ئەوبێت وئیدعای تەختی پاشایەتیەکەی بکات, کلیۆپاترا هەردوو براکەی خۆی بەتلیموسی چواردەهەم و بەتلیموسی پازدەهەمی کوشتن بۆئەوەی تەختی پاشایەتی لەدەستخۆیدابێت, بۆیە کاتێ گوێم لە کلیۆپاترابوو داوا لەئەنتوان دەکات سەری کاڵی بۆبێنێت پێم سەیرنەبوو.

کال لەڕابردوودا عاشقی کلیۆپاترابوو وخاتونەکەی من لەئەو دوو کوڕی حەرامزادەی بوو, بەڵام ئەم ڕابردووەی خۆشەویستی ئەو لەوگوناهەی کەکاڵ کردبووی کەمنەدەکردەوە, من پێموایە هەتا ئەگەر سیزاریۆنی کوڕیشی لەگەل دایکیدا ناکۆك باو دژی تەختی پاشایەتی ئەوبێ ئەوا کلیۆپاترا بەدەستی خۆی دەیکوژێت, کلیۆپاترا لەمن کەوتبۆ گومان پێیوابوو من کاڵ ئاگاداردەکەمەوەو پێی دەڵێم ڕاکە دەتکوژن, ئەگەر خەتای کاڵ جگە لەئیدعاکردنی بۆتەختی پاشایەتی میسر شتێکی تربا لەوانەبوو هەوڵی ڕزگارکردنیم بدابا- بەڵام ئەگەر کلیۆپاترا لەسەرتەختی پاشایەتی لادرابا ئەوا بێگومان منیش هەڵوەدادەبووم, لەبەرئەمە مانەوەی کلیۆپاترا لەسەرتەختی پاشایەتی لە بەرژەوەندی منیشبوو, ئەنتوان نەك هەر فەرمانی کوشتنی کاڵی بۆحوکمڕانی سوریا دەرکرد, بەڵکو لەشەوانی دواتردا فەرمانیدا تائەو ڕۆژەی ئەو زیندووبێت نایەڵێت کەس دوژمنکارانە پێ بێنێتە میسرو دژی کلیۆپاترا بوەستێتەوە, هەرکاتێ هەرلایەك بیەوێ کلیۆپاترا لەسەرتەختی پاشایەتی میسر لاببات ئەوا ئەنتوان ڕاستەوخۆ بەرگری لێدەکات, مانەوەی ئەنتوان لەشاری تارس درێژەی کێشاو کلۆپاتراش بەهۆی مانەوەی ئەنتوان لەم شارە حەزی نەدەکرد بگەڕێتەوە میسر من دەمزانی وەك ئەوکاتەی کەسیزار هاتەئەسکەندەریەو نەیتوانی دەستبەرداری کلیۆپاترابێت و بگەڕێتەوە ڕۆم, ئەنتوانیش بەهەمان شێوە ناتوانێت لەشاری تارس بڕوات ولەکلیۆپاترا دووربکەوێتەوە, ئەوکاتانە پایزبوو وبەرەو زستان دەڕۆیشتین دەبوایە ئەنتوان لەشاری تارس بڕۆیشتبا, شەوێکیان کاتێ ئەنتوان لای خاتونەکەی من بوو, بەکلیۆپاترای گوت من حەزەکەم لەگەڵ تۆدا بژیم وناتوانم لێرەبڕۆم ئایا ئامادەی من لەگەڵخۆتدابەیت بۆئەسکەندەریە؟

-کلیۆپاترا گوتی: هەر کاتێ بێیت بۆئەسکەندەریە ئەوا من بەوپەڕی شانازییەوە پێشوازیت لێدەکەم بەڵام ئایا تۆ منت خۆشدەوێت- یان ئەسکەندەریەو میسر؟

-ئەنتوان گوتی: تۆم خۆشدەوێت.

-کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر منت خۆشدەوێت سوپاکەی خۆت مەهێنە بۆئەسکەندەریەو میسر, چونکە تۆخاوەنی دە لەشکری و من ناتوانم خەرجی سەربازەکانی تۆبکێشم, جگە لەمەش ئەگەر تۆ بەوسوپایە زۆرەتەوە بێیت بۆ ئەسکەندەریە هەموو وابیردەکەنەوە تۆدەتەوێت وڵاتەکە داگیر بکەیت چونکە عەقڵ قەبوڵی ناکات پیاوێك ژنێکی خۆشبوێت بەسوپایەکەوە بچێت بۆماڵەکەی

-ئەنتوان پێکەنی:

-کلیۆپاترا گوتی: نەریتی خۆشەویستی ئەوەنییە کەسێك سوپایەك لەگەڵخۆیدا بهێنێت بۆماڵی خۆشەویستەکەی وکێشانی خەرجی ئەمانە بخاتە ئەستۆی خۆشەویستەکەی.

-ئەنتوان گوتی: بەڵام من بەبێ سەربازەکانم ناتوانم بێمەناو میسرەوە.

-کلیۆپاترا پرسی: بۆچی؟

-ئەنتوان گوتی: لەبەرئەوەی لەوانەیە من لەمیسردا بکوژن.

-کلیۆپاترا بەسەرسامیەوە پرسی: ئایا تۆ پێتوایە من لەمیسردا تۆ دەکوژم؟

-ئەنتوان گوتی: نا کلیۆپاترا, دەزانم تۆ ئەوکارە ناکەیت, بەڵام کاتێ دوژمنەکانی من زانیان بە تەنها لەمیسردام وسوپاکەم لەگەڵدانییە, بیرلە کوشتنی من دەکەنەوە بۆبیرت چۆتەوە کاتێ سیزار لەمیسردابوو لەگەڵ ئەوەشدا دەیانزانی سیزار سوپایەکی تەواوی لەگەڵدایە بەڵام لەسەروی ئەفریقادا لەشکریان کۆکردەوەو دەیانویست هێرش بکەنەسەر میسرو سیزار بکوژن, ئەگەر سیزار لەمیسر مابایەوەو ئەوانەی لەبەین نەبردبا ئەوا سیزاریان لەناودەبرد.

-خاتونەکەی من ئەو قسیەی پێ ڕاست بوو سەری بۆ لەقاند.

-ئەنتوان گوتی: من بۆئەوەی تۆدڵنیگەران نەبیت سوپاکەی خۆم لەئاسیای بچوك وسوریادا دادەنێم وخۆم بەدوو لەشکرەوە دێم بۆمیسر ئایا تۆ بەمەڕازیت- یان نا ؟

-کلیۆپاترا گوتی: من دەتوانم خەرجی دوو لەشکری تۆبدەم بەڵام هەموو سوپاکەت نا,دواتر لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کلیۆپاترا بەکەشتییەکەی خۆی بگەڕێتەوە میسرو لەئەسکەندەریەدا چاوەڕوانی ئەنتوان بێت. ئەنتوانیش هەندێ لەلەشکرەکەی خۆی لەئاسیای بچوك وسوریادا جێبێڵێت وبەدوو لەشکرەوە بچێت بۆ ئەسکەندەریەو میوانی کلیۆپاترابێت.

کلیۆپاترا فەرمانی گەڕانەوەی دەرکردو کەشتییەکان پێداویستیەکانیان ئامادەکردوو ئاویان داکرد, تالەکاتی دەرچوونیان لە شاری تارسەوە بێڕاوەستان بگەڕێنەوە ئەسکەندەریە.

ڕۆژێك پێش ئەوەی کەشتیەکانی شاژنی میسر بەڕێبکەون، کەشتییەکی خێرا کەبەچارۆکەی باو وسەوڵبەلێدان دەڕۆیشت گەیشتە بەندەری شاری تارس, لێپرسراوی ئەو کەشتییە نامەیەکی لە لای حوکمڕانی سوریاوە پێبوو بۆئەنتوان, ئەنتوانیش دوای ئەوەی نامەکەی حوکمڕانی سوریای خوێندەوە بۆکلۆپاترای نارد تالەناوەڕۆکی نامەکە ئاگاداربێت, ئەو نێردراوەی حوکمڕانی سوریا بەفەرمانی ئەنتوان نامەکەی بۆکلیۆپاترا هێنا, ئەوکاتە من لای شاژنی میسربووم وکلیۆپاترا دەقی نامەکەی بۆمن خوێندەوەو منیش بەداخەوە گوێم لەکوژرانی کاڵبوو.

فەرمانڕەوای سوریا بەدرێژی باسی کوژرانی کاڵی نوسیبوو ودەڵێت, دوای ئەوەی نامەکەی ئەنتوان بەحوکمڕانی سوریا گەیشت ئەویش زانیبووی کاڵ لەشاری بەعلبەگدا نیشتەجێیەو وایپێ باشتربووە بۆکوشتنی ئەو دەستەیەك پیاوی خۆی بۆبەعلبەگ بنێرێت،ئەوەبووە بیست کەسی بۆ ئەومەبەستە ناردبوو ونامەیەکی بەئەوانەدا بۆکاڵ ناردوەو تێیدا نووسیبوی پێویستە بێت بۆدمەشق, بەم فێڵە کاڵیان لەبەعلبەگ هێناوەتەوە دەرێ ودوای ئەوەی گەیشتونە چۆڵەوانێو بۆئەوەی لەسەرشارێگاکە نەمێنن و لەشوێنێکی تردا ئەویکوژن و وریابن سەرو ڕوخساری بریندارنەبێت، چونکە دەبێ دوای کوشتنەکەی کەللە سەرەکەی بەسەلامەتی بۆ حوکمڕانی سوریاببەن.

هۆی ئەوەش کەحوکمڕانی سوریە بەوپیاوانەی خۆی گوتبوو دوور لەشارێگاکان کاڵ بکوژن ئەوەبوو بەپێیّ قانونی ڕۆم ئەوانەی لەسەر شارێگاکان خەڵك بکوژن دەبێ سزابدرێن، بەپێی ئەو راپۆرتەی کەنێردراوەکانی حوکمڕانی سوریا دەیانگوت کاتێ کال نامەکەی حوکمڕانی سوریای خوێندۆتەوە زۆر دڵخۆشبووەو پێی وابووە حوکمڕانی سوریا بۆیە داوای ئەویکردووە تاپێی بڵی کاتی حوکمڕانی تەختی پاشایەتی میسری نزیك بۆتەوەو پێویستە بچێتە میسرو لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشێت، چونکە کاڵ وایزانیوە بۆسەرتەختی پاشایەتی دەچێت، ویستویەتی خزمەتکارە مێردمنداڵەکەی لەگەڵخۆیدابیبات بەڵام نێردراوەکانی حوکمڕانی سوریا بەئەویان گوتووە باشتروایە ئەو خزمەتکارەی لەبەعلبەگدا جێبێڵێت وخۆی بەتەنیا بکەوێتە ڕێ، کاڵ لە بیستنی ئەم قسەیە سەری سوڕماوە چونکە ئەو پێیوابووە ئیتر ناگەڕێتەوە بەعلبەگ.

نێردراوەکانی حوکمڕانی سوریە بەئەویان گوتبوو دوای گەیشتنت بەدمەشق ئەگەر پێویستیکرد دەتوانی بەدوای خزمەتکارەکەتدابنێریت، کاڵ هەندێ پارەی بەوکوڕەداوەو پێی گوتووە لە بەعلەبگدابە تالێتدەگێڕمەوە، دواتر شمشێرەکەی بەکەمەریەوە بەستووەو سواری ئەو ئەسپەبووە کەبۆیان هێناوەو لەشاری بەعلبەگ بەدەرکەوتووە، سوارەکان تاکاتی خۆرئاوابوون بەڕێگادا ڕۆیشتوون دوای ئەوەی شەوداهاتووە داوایان لەکال کردووە لەسەرشارێگاکە لابدات وبەرەو یەکێك لەوخانوانە بچن کەدۆستی حوکمڕانی سوریایە گوتویانە ئەمشەو لەوێدا دەمێنینەوە، کاڵیش بەوقسەیە نەکەوتۆتە گومان ولەگەڵ سوارەکاندا لەشارێگاکە لاداوەو ڕێگای بیابانی گرتۆتەبەر، دوای ئەوەی هەندێك ڕۆیشتوون کال لەسەر ئاوزنگی ئەسپەکەی هەستاوەتە سەرپێ وسەیری دەوروبەری خۆی کردووەو گوتویەتی من لەم نزیکانەدا خانوێك نابینم، ئایا دەبێ زۆر ڕێگابڕین تادەگەینە ماڵی دۆستەکەی حوکمڕانی سوریا؟ کاتێ سوارەکان گوێیان لەم قسەیە دەبێت چواردەوری کاڵ دەگرن وسەرەتا بەشمشێر لەلاقی ئەسپەکەی دەدەن بۆئەوەی نەتوانێت هەڵبێت دواتر هێرشیان کردۆتە سەری، کاڵیش زانیویەتی ئەسپەکەی ناتوانێت ڕاکات دابەزیوەو بەشمشێرەکەی بەرگری لەخۆیکردووەو ورگی چەند ئەسپێکیانی دڕیوەو دوو وسێ کەسیشی لێکوشتوون، بەڵام ئەوانیتر ورووژمیان کردۆتەسەرو زەبری گورچکبڕیان لەکال داوەو دواتر کوشتویانەو سەریان لەلاشەی جیاکردۆتەوەو خستویانەتە کیسێکەوەو بەرەو دمەشق کەوتونەتە ڕێ، دوای ئەوەی کلیۆپاترا لەخوێندنەوەی نامەکە بۆوە، گوتی سەرەکەیم بۆبێنن، خزمەتکارەکان ساکێکی گەورەیان هێنایە ژورەکەی کلیۆپاتراو لەناو ئەودا قوتوێکیان دەرهێناو سەرەکەیان لەسەرلابرد، کلیۆپاترا فەرمانیدا سەرەبڕاوەکە بێننە دەرێ وبیخەنە سەر سینیەك بۆئەوەی بتوانێت بەباشی ئەو سەرەبڕاوەببینێت، سەرەکەیان لەو قوتووە پڕلە ڕۆنە دەرهێناو خستیانە سەرسینیەك وکلیۆپاترا گوتی شرمیون نزیك بەرەوەو سەیرکە ئایا ئەم سەرە هی کاڵە- یان نا؟

مووی ڕەش وبرۆی کەوانەیی دەمی بچوکی کال گومانی لێتەدەکرا خۆیەتی، من دەمزانی کلیۆپاترا هەرلە سەرەتای دیتنیدا کەللەسەرەکەی ناسیبەوەو زانی هی کاڵە، بەڵام شاژنی میسر دەیویست گوێی لەڕای منیشبێت تاتەواو دڵنیابێتەوە، کاتێ من لەسەرە بڕاوەکە نزیکبوومەوەو تێمڕوانی کەوتمە یادی ئەو ڕۆژەی کاتێ کاڵ لەسێرکەکەی ئەسکەندەریەدا سواری عەرەبانێکی ڕەنگ زەردبوو وچوار شێری

تاودەدان ئەوڕۆژە کالْ لەتافی لاویدابوو لەکاتی لێخوڕینی شیرەکاندا وەك یەکێك لەخواکانی نیشاندەدا، بەشێوەیەك من وامبیردەکردەوە کەس وەك ئەو جوان نییەو دروستنەبووەو نابێتەوە.

کاتێ کاڵیان کوشت ئەو جوانی جارانی نەمابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرکەسێ ئەو سەرە بڕاوەی بدیبا دەیزانی خاوەنەکەی پیاوێکی قۆزبووە، ئەگەر من لەجێگای کلیۆپاترادابام و دوو کوڕم لەکالْ بوویان نەمدەتوانی فەرمانی کوشتنی ئەو دەربکەم، بەڵام کلیۆپاترا لەتوخمێکی تر دروستکرابوو ودەیتوانی بەبێ هیچ خەم وکارتێکردنێك سەری بڕاوی عاشقە کۆنەکەی خۆی سەیربکات، من تێبینیمکرد کلیۆپاترا بەبینینی سەری بڕاوی کالْ دڵخۆشبوو وەك ئەوەی دیاری گرانبەهایان بۆناردبێت، من پێموابوو خاتونەکەی من ئەوەی بەبیرهاتبێتەوە کالْ منداڵەکەی ئەوی فڕاندو دواتر بەمردویی دۆزیمانەوە- یان ئەوەی کەوتبێتەوەیاد کەکال لەسوریادا تەختی پاشایەتی میسری کردووە، من زانیم ئەوە سەری کاڵەو لەمە دڵنیابووم، کلیۆپاترا بانگی خزمەتکارەکانی کردو گوتی ئەوسەرە لاببەن وبیخەنەوە قوتوە پڕ ڕۆنەکەو سەرەکەی دابخەنەوە، دوای ئەوەی سەرەکەی کاڵیان لابرد کلیۆپاترا بەمنی گوت ئەوسەرە بڕاوە لەژورەکەی خۆتدا دابنێ تادەگەینە میسر لەوێش بیدەوە بەخۆم، من نەمدەتوانی بەخاتونەکەی خۆم بڵێم حەزناکەم سەرەبڕاوەکەی کال لەژورەکەی مندابێت، کلیۆپاترا شاژنێك نەبوو بتوانرێت فەرمانەکانی ئەو جێبەجێنەکرێن، هەر فەرمانێکی دابای دەبوا جێبەجێکرابان، من لەدانانی سەری بڕاوی کالْ لە ژوورەکەی خۆمدا دڵگرانبوم ودەترسام وەك ئەوە وابوو شەوێ لەکاتی خەوتندا ئەوسەرە ڕۆحی بێتەوەبەرو بەدەنگبێت وبانگمبکات.

ڕۆژی دواتر ئێمە لەتارسەوە بەرەو ئەسکەندەریە بەڕێ کەوتین، هەرکاتێ دەچومە ژورەکەی خۆمەوە یەکسەر سەیری ئەو قوتوەم دەکرد کەسەری کالْ تێدابوو بەتایبەت شەوانە زۆر نارەحەت دەبوم من نەمدەزانی مەبەستی کلیۆپاترا چیبوو ئەو سەرەی بەمن سپارد؟ ئایا دەیویست ئەوسەرە بڕاوەی کالْ لای خۆی بهێڵێتەوە خۆئەگەر مەبەستیشی ئەوەبێت ئەم کارە چ قازانجێکی هەیە؟ سەبارەت بەشاژنێکی وك کلیۆپاترا کەخاوەنی ئەوهەموو سامان وهێزەیە سەرێکی بڕاو چ نرخێکی هەیە تاپارێزگاری لێبکات؟

ئەگەر کالْ گەمژەیی نەکردبا وفریوخوادرووی ڕۆمییەکان نەبا بەوشێوەیە نەدەکوژرا، ئەو لە بەرامبەر خاتونەکەی مندا ئەوەندە بچوکبوو قەت بیری لەوە نەدەکردەوە بیکوژێت، بەڵام دوای ئەوەی ئیدعای تەختی پاشایەتی میسری کردو بەدرۆی خۆی خۆی بەبرای کلیۆپاترا ناساند، شاژنی میسر ناچاربوو لەناوی بەرێت.

دوای ئەوەی گەڕاینەوە ئەکسەندەریە، من کەللە سەرەکەم لەگەڵخۆمدا برد بۆ ژوورەکەی خۆم کە لەناو کۆشکی پاشایەتیدابوو، دوو ڕۆژ دوای گەیشتنەوەمان بەئەسکەندەریە، شاژن بانگی منی کردو گوتی شرمیون ئایا لەبیرتە کاتێ منداڵەکەی من مرد تەرمەکەی ئەومان لەم کۆشکەدا مۆمیایی کرد؟

-گوتم بەڵێ: خاتونەکەم.

-کلیۆپاترا گوتی: یەکێك بنێرە بامۆمیابکارێك لەخانەی مردوانەوە بۆ ئێرەبێت تالێرەدا سەری کالْ مۆمیایی بکەن وهەر شتێکی بۆمۆمیایی کردنەکە پێویستە بۆیان دابین بکە، لەو دوو وەستاکارانەی

مۆمیایی منداڵەکەی کلیۆپاترایان کردبوو یەکێکیان مردبوو وئەوی تریانم بۆ کۆشکی پاشایەتی بانگ کردو پێمگوت شاژن دەیەوێت سەرێکی بڕاو مۆمیایی بکەیت.

-مۆمیاکارەکە پرسی: ئایا لێرەدا ئەو سەرە مۆمیایی بکەم؟

-گوتم: بەڵێ لێرەدا مۆمیایی بکە چونکە ئێرە باشترە لەخانەی مۆمیاکردنەکە سەبارەت بەسەرێکی بڕاو

-مۆمیابکارەکە گوتی: هەرچی تۆ بیڵێیت ئەوەدەکەم، ئینجا ناوی چەند شتێکی بردو پێی گوتم ئەوانەم بۆ دابینبکە.

-منیش هەرچی مۆمیاکارەکە داوایکرد بۆم جێبەجێکردو دواتر قوتویەکم دایە دەستی وگوتم ئەمەسەرەکەیە.

پێشئەوەی مۆمیاکارەکە دەست بەکاربکات کلیۆپاترا بانگی منی کردو پێی گوتم بە مۆمیابکارەکە بڵێ بەشێوەیەك سەری کاڵ مۆمیایی بکات مووی برۆو برژانگ وسەری تێکنەچێت

-مۆمیاکارەکەش گوتی: من دەتوانم تەواو ئاگاداری پاراستنی مووی ئەو سەرەبم، بەڵام بە بەسەرچوونی کات ئەو موانە لەبەیندەچن چونکە مووی مرۆڤ وەك گیاوایە تاتەرایی لەژێریابێت ئەوا بەزیندویی دەمێنێتەوە بەڵام کاتێ ئەوگۆشتە وشکبۆوە ئەوانیش دەوەرن.

-گوتم: من نازانم ئەمە فەرمانی شاژنە دەبێ ئاگات لەمووی سەرو برۆو برژانگی بێت وهەوڵبدە گۆشتەکە بەتەواوەتی وشك نەبێتەوەو مووەکان بوەرن.

مۆمیاکارەکە پەیمانەکەی خۆی بردەسەرو بەجوانترین شێوە سەرەکەی مۆمیاکرد بێئەوەی ریتاڵپێچی بکات، چونکە شاژنی میسر گوتبوی نابێ سەرەکەی تیتۆڵپێچ بکرێت بۆئەوەی بەردەوام بیبینێت، دوای ئەوەی مۆمیاکردنەکە تەواوبوو وەستا کارەکە حەقدەستەکەی وەرگرتوو پێش ئەوەی بڕوات بەمنی گوت، بەشاژن بڵێ ئەگەر دەیەوێت ئەوسەرە وەك خۆی بمێنێتەوە دەبێ ئەو سەرە بخاتە شوشێکی بلوریەوە ولەشوێنێکی وایدابنێت هەتاو لێنەدات، چونکە وەك چۆن باوباران زیان بەتەرمی مۆمیابکراو دەگەیەنێت تیشکی خۆریش ئاوا زیانی پێدەگەیەنێت، ئەگەر شاژن ئەوسەرەی خستبایە شوشێکی بلوریەوە بۆماوەیەکی زیاتر دەمایەوە، بەڵام کەلەناو بلوریدا دانەنرابا ئەوا تێکدەچوو، کلیۆپاترا فەرمانی بەکارخانێکی شوشە دروستکردنی ئەسکەندەریەدا یەك شوشەی بلوری کەسەری هەبێت بۆئەو سەرەی کاڵ دروستبکەن، ئەو شوشەیان دروستکرد و سەریێ کاڵیان خستە ناوی ولەدەرەوە بەروونی دیاربوو وخستیانە شوێنێك کەهەتاوی لێنەدات، ئەوکاتە تێگەیشتم کلیۆپاترا ئەم سەرەی بۆچی هێنایەوە میسر، بۆئەوەبوو بەردەوام سەری عاشقەکەی خۆی ببینێت، بەوەی کلیۆپاترا داوای لەئەنتوانکرد سەری کاڵ لەلاشەی جیابکرێتەوە، دوای ئەوەی سەرە بڕاوەکەی گەیشتە دەست نەیتوانی لەخۆی دووربخاتەوەو بڕیاریدا بەمۆمیاکردنی ئەوسەرەی عاشقە کۆنەکەی لای خۆی بیڵێتەوە.

پێشئەوەی ئەنتوان بێت بۆمیسر، سەری مۆمیاکراوی کاڵ لەژورەکەی کلیۆپاترادابوو، بەڵام چەند رۆژێك پێشئەوەی ئەنتوان بگاتە میسر کلیۆپاترا ئەو سەرەی کاڵی بەمن سپاردو گوتی چونکە ئەنتوان دێت من حەزناکەم ئەوسەرە لەژورەکەی مندابێت، کەلەژورەکەی تۆابێت هەتا ئەگەر ئەنئتوانیش ببینێت نابێتە جێگای سەرنجی ولێی ناکۆڵێتەوەو وادەزانێت سەری یەکێك لەکەس و کارەکانی تۆ- یان

عاشیقەکەی خۆتە, بەم شێوەیە لەڕۆژگاری ژیانی کاڵدا نەمتوانی لەگەڵ ئەودا بژیم دوای مردنی لەگەڵ سەرە مۆمیایکراوەکەی ئەودا دەژیام, تائەو ڕۆژەی ئەنتوان لە ئەسکەندەریەدابوو سەری بڕاوی کاڵ لەژورەکەی مندابوو.

## ئەنتوان لەمیسرو گۆڕانکاری و ڕووداوی تازە لەڕۆمدا

ئەنتوان زووتر لەوەی کلیۆپاترا چاوەڕوانی دەکرد گەیشتە ئەسکەندەریەو بەپێی ئەو قەولەی بە کلیۆپاترای دابوو تەنها دوو لەشکری لەگەڵخۆیدا هێنابوون و زۆرینەی سوپاکەی خۆی لەئاسیای بچوك وسوریادا جێهێشتبوو بەگوێرەی ئەوقسانەی لەکاتی نانداناتی ئێواراندا گوێم لێدەبوو ئەنتوان لەبەر تاڵوکەییان زۆر لەکارەکانی خۆی لەسوریاو ئاسیای بچوك بەنیوەناچڵی جێهێشتوون تاهەرچی زووترە خۆی بەگەیەنێتە کلیۆپاترا, من ئەو تامەزرۆییەی ئەنتوان بۆ خاتونەکەمی پێسەیر نەبوو چونکە کلیۆپاترا بەشێوەیەکی وا شارەزاو هونەریانە دەیزانی دڵی پیاوان بۆلایخۆی ڕاکێشێت, خۆ ئەگەر ویستبای ژنانیش عاشقی خۆی بکات دەیتوانی جاچجای پیاوێکی تەمەن چل ودوو ساڵی وەك ئەنتوان, ئەنتوان دەیتوانی لەوەرزی زستاندا بەشێوەیەك سوپاکەی خۆی پەرداخ وبەهێزبکات ولەبەهاردا هەموو ئەو شاو میرنشینانەی دژی ڕۆم هەستابوون لەناوبەرێت, بەڵام ئەو لەبری ئەوەی لەئاسیای بچوك وسوریادا خەریکی بەهێزکردنی سوپاکەبێت, لەئەسکەندەریەدابوو وهەموو کاتەکانی خۆی لەگەڵ کلیۆپاترادا بەسەردەبردو دەیگوت یەکەمجارە لەژیانی خۆیدا بەواقیعی لەزەت لەژیانی ببینێت, من دەمزانی ئەوکات بەلای ئەنتوانەوە هیچ شتێك گرنگینییە جگەلەوەی لەگەڵ کلیۆپاترادا بژیت و لەوکەژو هەوا خۆشەی ئەسکەندەریەدابێت, ئەنتوان بۆیە لەڕۆم چووبووە دەرێ تالەئاسیای بچوك وسوریادا سەرکوتی ئەو میروشایانە بکات کەلەژێر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدابوون ودواتر بەشانازییەوە بگەڕێتەوە ڕۆم و جێگای سیزار بگرێتەوەو بۆهەمیشە ببێتە دیکتاتۆری ڕۆم، چونکە دەیزانی سەرکەوتن لەشەڕو زەوی خستنەژێر ڕکێفی ڕۆم وبەسەرکەوتوویی گەڕانەوەی بۆڕۆم باشترین ڕێگایە بۆ دەستەبەرکردنی فەرمانڕەوایەتی ڕەهای ڕۆم, بەڵام کاتێ خاتونەکەی منی بینی وعاشقی ئەوبوو مەزنی وگرتنە دەستی بەرزترین پلە لەحکومەتی ڕۆمی بیرچۆوە, خاتونەکەی من ئامادەباشی

سیاسی هەبوو بەڵام ئەنتوان بەپێچەوانەوە نەبوونی زانیاری لەسەر سیاسەت ببوە هۆی ئەوەی نەتوانێت پەی بەزۆرشت بەرێت, بۆ نومونە: ئەنتوان نەیدەزانی مانەوەی ئەو لەئەسکەندەریەدا چەند بەزیانی ئەو تەواودەبێت، لەهەمانکاتدا مانەوەی ئەو لەئەسکەندەریە لەبەرژەوەندی خاتوونەکەی مندابوو, کلۆپاترا دەیزانی ئەگەر بتوانێت ئەنتوان بخاتەکەمەندی عشقی خۆیەوە حکومەتی ڕۆم دەست بۆ هێرشکردنە سەری نابات- یان هەرنەبێ تائەنتوان فەرمانڕەوابێت ئەوا حکومەتی ڕۆم دەستی بۆنابات، کلیۆپاترا هەموو پێداویستییەکانی خۆشگوزەرانی بۆئەنتوان دابینکردبوو, من بەتاقیکردنەوە بۆمدەرکەوتووە ئەوکەسانەی لەڕووی ڕۆحیەوە بەرجەستەن حەزیان لەخۆتوسکلردن وئارایشتکردنی ژنان نییە, سیزار سەرداری گەورەو دیکتاتۆری ڕۆم حەزی لەئارایشبوو بەڵام بەوچاوەی کەبەهۆی ئارایشتکردنەوە هونەری جوانی ببینێت, بەڵام ئەنتوان ئارایشی بۆخۆشگوزەرانی وڕابواردن دەویست, نەك بۆهونەری جوانی, خاتونەکەی منیش دەیزانی ئەنتوان پیاوێکە حەزی لەڕابواردنەو هەوڵدەدات هەرڕۆژەی بەجۆرێك عەیش ونەیش بکات, خاتونەکەی من لەخەرجکردنی پارە بۆدابینکردنی پێداویستییەکانی ڕابواردنی ئەنتوان هەراسان نەدەبوو, ئەو دەوڵەمەندترین شای خۆرهەڵاتبوو وهیچ یەك لەپاشاکانی خۆرهەڵات بە ئەندازەی ئەو خاوەنی سامان وداهات نەبوون, کلیۆپاترا هەر ڕۆژەی لەیەکێك لەکۆشکەکانی پاشایەتی میسردا پێشوازی لەئەنتوان دەکردو باشترین چێشت لێنەری دەهێنان تابۆ ئەنتوان خواردنی تازەو جۆراوجۆر دروستبکەن وشەوانە ئەنتوان تانیوەشەو خەریکی ڕابواردن و خواردنەوەبوو وبەردەوام لەوکاتانەدا خواردنی ئامادە هەبوو، چونکە ئەنتوان لەماوەی شەوو ڕۆژێکدا شەش جار نانیدەخوارد بەڵام لەهەندێ جەمکردنیدا کەمی دەخوارد, جەمەکانی ئەنتوان بەیانی وچێشتەنگاو نیوەڕۆو ئێوارەو شێوان و شەو درەنگانبوون, من بەردەوام تێبینی ئەنتوانم دەکرد بەڵام بۆ تاکە جارێك نەمبینی جەمێك نان نەخوات, وەك من بزانم هەرجەمەی دە جۆر خۆراکیان بۆ ئەنتوان دەهێناو چێشتخانەکەی کۆشکی پاشایەتی لەشەو وڕۆژێکدا شەست جۆر خواردنیان دروستدەکرد، بۆئەوەی جەمێکی وەك جەمێکی تر نەچێت وخۆراکەکان جیابن, وەك لەمەوبەر گوتم ئەسکەندەریە مەڵبەندی بازرگانی جیهانە نەك هەر کەشتییەکانی خۆرئاوا بەڵکو کەشتییەکانی خۆرهەڵاتیش لەڕێگای دەریای سورەوە دێن بۆ ئەسکەندەریە, بۆیە هەموو جۆرە نەتەوەیەك لەئەسکەندەریەدا دەبیندرێت, چونکە ئەسکەندەریە شارێکە لەسەر تاسەری دنیاوە خەڵك بۆ بژێوی خۆیان- یان بەدەستهێنانی سامان ڕووی تێدەکەن و لەناو ئەوانەشدا کەسانی چێشتلێنەری شارەزا هەن, کلیۆپاترا فەرمانیدا چێشتلێنەرانی هەموو نەتەوەکانیتر کەلە ئەسکەندەریەدان بێن بۆکۆشکی پاشایەتی وچێشتیان پێلێبندرێت و ئەو خواردنانەی سازی دەکەن تاقی بکرێنەوەو دواتر باشەکانیان هەڵبژێردرێن وهەریەك لەمانە بەپێی داب ونەریتی نەتەوە جیاجیاکانی خۆیان خۆراك بۆئەنتوان دروستبکەن, هەندێك چێشت کەلەلایەن ئەوانەوە دروستکرابوون زۆر خۆشبوون، بۆیە خاتونەکەی منیش لێیدەخواردن وبەمنی دەگوت لەو خواردنانە بخۆم, زۆرجار ئەنتوان لەخواردنی ئەو خۆراکانە بەشێوەیەك چێژی وەردەگرت تاچەند ڕۆژێك داوای لێنانەوەی ئەوچێشتەی دەکردەوە، هەموو ڕۆژێ شوێنی نانخواردنەکە دەگۆڕدرا بەشێوەیەك ئەنتوان لەڕۆژێکا بۆ ڕۆژێکیتر لەشوێنی پێشویدا ئەدەمایەوەو ئەمەش خەرجی زۆری دەویست بەڵام کلیۆپاترا بەرگەی دەگرت هەر بۆئەوەی بتوانێت ئەنتوان لە ئەسکەندەریەدا

بهێڵێتەوە, خاتونەکەی من تازیاتر ببێتە جێگای پەسەندی ئەنتوان، زۆر کاری دەکردن کەخۆی بەئەسڵ حەزی لەوکارانە نەبوو, کلیۆپاترا ڕقی لەقوماردەبۆوە, بەڵام بۆئەوەی زیاتر ئەنتوان خۆشی بوێت یاری مۆر [1] هاویشتنی لەگەڵدا دەکرد, زۆرجار خاتونەکەی من خۆی غەشیم دەکردو ئەنتوانیش لەزەتی لەدۆڕانی ئەودەبرد، کلیوپاتراش دەیگوت هەڵەمکرد بۆیە دۆڕام ، شازادەی میسر لەخواردنەوەی شەراب تاتاستی مەستبوون حەزی نەدەکرد، بەڵام هەندێ ڕۆژ-یان شەوان بۆ ڕازیکردنی زیاتری ئەنتوان زۆری دەخواردەوە تاتاستی مەستبوون, ئەو شتانەی تری کەکلیۆپاترا بۆ زیاتر خستنەبەر ڕکێفی خۆی، کاتێ ئەنتوان خۆی دەگۆڕی ودەچۆدەرێ کلیۆپاتراش بەهەمان شت خۆی دەگۆڕی‌و لەگەڵ ئەودا دەچۆدەرێ, ئەنتوان حەزی دەکرد بەجل وبەرگی ئاسایی لەناوخەڵکدا بگەڕێت وبچێت بۆ شوێنی ڕابواردنی گشتی، بەڵام کلیۆپاترا چوونی ئەنتوانی بۆئەو شوێنە بەشایستە نەدەزانی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بۆخاتری دڵی ئەنتوان جل وبەرگی سادەی لەبەردەکردو دەچوو بۆشوێنی ڕابواردنی گشتی وتابەرە بەیان لەوێ دەمایەوەو ئینجا لەگەڵ ئەنتواندا دەگەڕایەوە بۆکۆشکی پاشایەتی, شتێکیتر کەئەنتوان حەزیلێبوو وخاتونەکەی من ڕقی لێدەبۆوە ئەویش خوی ماسیگرتنی ئەنتوان بوو, ئەنتوان کەلە ئەسکەندەریەدا هیچ کارێکی نەبوو بۆ بەسەربردنی کاتەکانی خۆی هەندێ ڕۆژ لەگەڵ خاتونەکەی مندا دەچوو بۆ ڕاوەماسی وهەردوکیان قولاپیان دەخستە ئاوەوە بۆ ماسی‌گرتن, کاتێ ئەو دوانەش دەچوون بۆماسی گرتن دەستوپێوەندەکانیان لەگەڵیاندا دەچوون, ئەنتوان وکلیۆپاترا لەئاوی سوێردا ڕاوی ماسیاندەکرد، هەرچەندە خانمەکەی من ڕقی لەماسی گرتن بوو، بەڵام لە ئەنتوان زیاتر ماسی بۆ پێوە دەبوون ودەگرتن, ئەنتوان سەری لەمە سوڕمابوو" بۆچی کلۆپاترا کەسلیقەی لەماسی گرتندانییە هەموو جارێك ماسیەکی بۆپێوە دەبێت کەچی ماسی بە قولاپەکەی ئەوەوەنابێت: بۆیە ئەنتوان بەدزی بەدوو ماسیگری گوتبوو ئێوە ماسیەك بخەنە ژێر جلەکانتانەوەو هەرکاتێ من قولاپەکەم هەڵدا ئێوە بەمەلەبنئاوە بچن ماسییەك بەقولاپەکەی منەوە بکەن, بۆئەوەی ئەنتوان هەموو جارێ کەقولاپەکەی ڕاکێشا ماسیەکی پێوەبێت, ڕاوچییەکان بە پێی فەرمانی ئەنتوانیان دەکرد هەرکە ئەنتوان قولاپەکەی هەڵدەدایە ناوئاوەکە ئەوان بەمەلە بنئاوە دەچوون ماسیەکیان بەقولاپەکەیەوە دەکردو ئەنتوانیش قولاپەکەی ڕادەکێشایەوەو بەلە خۆبایی وشادییەوە ماسیەکەی خۆی نیشانی ئەوانەی دەوروبەری دەداو ئەوانیش تیلیلیلیان لێدەداو دەستخۆشیان لەسەرداری ڕۆمی دەکرد, پێویستناکات بڵێم هەموو ئەو ماسیانەی دەیانگرتن لەجۆری ماسی ناوئاوی سوێربوون, کلیۆپاترا کەزانی ئەنتوان ئەو فێڵەدەکات ویستی گاڵتەی لەگەڵدابکات بەدوو ماسی گرەکەی گوت ئەگەر ئەمجارە لەگەڵ ئەنتواندا چووین بۆ ڕاوەماسی ئێوە ماسی ئاوی شیرین بەقولاپی ئەنتوانەوەبخەن, هەرواشبوو کاتێ ئەنتوان زانی قولاپەکەی گرانبووە ڕایکێشایە دەرێ و ئەو کەسانەی لەدەوروبەری بوون بەسەر سوڕماویەوە بینیان ماسی ئاوی شرین بەقولاپەکەی ئەنتوانەوەبووە, هەموویان دەیانزانی ماسی ئاوی شیرین لەئاوی سوێردا ناژیت، بەڵام بەسەرخۆیان نەهێناو وایان دەرخست کەئەو ماسیە بەڕێکەوت هاتۆتە ناوئەو ئاوەوە, جارێکیتر ئەنتوان قولاپەکەی هەڵدایەوە ناوئاوەکەو دووبارە ماسیەکی ئاوی شیرین پێوەبۆوە,

ئەمجارەیان هەموو ئەوانەی لەدەوروبەری ئەنتواندابوون ناڕەحەتبوون، چونکە زانیان ئەنتوان فرتوفێڵ دەکات.

ئەنتوانیش لەمە ناڕەحەتبوو چونکە زانی ئەوانەی دەوروبەری بەفێڵەکەیان زانیوەو نەیدەزانی چی بڵێت, لەوکاتەدا خاتونەکەی من بەپێکەنینەوە گوتی ئەی ئیمپراتۆر، کاری تۆ گرتنی وڵاتانە نەك ماسیگرتن, کاتێ پیاوێك بەمەزنی تۆخەریکی ماسی گرتن بێت, ماسی ئاوی سوێر لە ترساندا دەگۆڕێن بۆماسی ئاوی شیرین, بەم قسەیە کلیۆپاترا توانی نەیەڵێت ئەنتوان لێی بڕەنجێت و ئەویش ناچاربکات دەست لەفێڵکردن هەڵگرێت, کاتێ سیزار لەئەسکەندەریەبوو بەردەوام شانێلە ڕەنگ ئەورخەوانیەکەی خۆی لەبەردەکرد کەنیشانەی پیاوی پلەیەکی ڕۆم دەگەیەنێت, بەبێ شانیلی ئەرخەوانی خۆی نیشانی خەڵك نەدەدا, بەڵام ئەنتوان جگەلەوەی هەندێ شەو بەجلوبەرگی سادەوە لەگەڵ خاتونەکەی منداڵدەچوونە دەرەوەی کۆشك، ڕۆژانەش بە جلوبەرگی یۆنانییەوە دەگەڕا, مەبەستم لەلەبەرکردنی جلوبەرگی یۆنانی ئەوەیە ئەوانەی لە کۆشکدابوون ئەو جلانەیان لەبەردەکرد، ئەنتوانیش هەمان جلوبەرگی لەبەردەکرد چونکە ڕۆگاریێ ئەنتوان هات بۆمیسر جلوبەرگی میسریەکانی لەبەردەکرد, دیارە جارانیش کەڕۆمیەکان دەهاتن بۆ میسر جلوبەرگی یۆنانی کەلەمیسریشدا باوبوو لەبەردەکرد, بەڵام وەك ئەنتوان پلەوپایەیان نەبوو،

ئەنتوان پیاوی پلەیەکی ڕۆم وجنراڵیشبوو, ڕۆمیەکان میسریان بەمەملەکەتێك هەژماردەکرد کەلە ژێر دەسەڵاتدارێتی ڕۆمدایە, نەریت هەروابووە ئەوشوێنانەی دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی ڕۆم دەبوایە زمانی ڕۆمی فێرببان و جلوبەرگی ئەو وڵاتەشیان لەبەرکردبا, نەك سەرداری گەورەی ڕۆمی جلوبەرگی شانشینێکی ژێر دەستەی خۆی لەبەربکات, بەڵام ئەنتوان ئەمکارەی دەکردو جلو بەرگی یۆنانی لەبەردەکرد بەمەش ڕۆمەکان کەوتبوونە ئەوبڕوایەی ئەنتوان لەبەرچاوی میسریەکان خۆی بەکەم دادەنێت وئاستی باڵای میللەتی ڕۆم لەکەداردەکات, بەڵام ئەم قسانەی ڕۆمیەکان بەگوێی ئەنتواندا نەدەچوو، خۆئەگەر گوێبیستیشیبا پێموانەبوو ڕەوشی خۆی بگۆڕێت چونکە بەشێوەیەك سەرگەرمی عەیش ونەیش و ڕابواردنبوو تەنانەت ڕۆمیشی لەبیر نەمابوو, لەو ڕۆژەدا چەند کەسێك لەڕۆمەوە هاتن بۆ ئەسکەندەریە تائەنتوان ببینن و پێی بڵێن بە زووترین کات بگەڕێتەوە ڕۆم، بەڵام ئەنتوان بەقسەی ئەوانەی نەکردوو گوتی ئیستا وەرزی زستانەو ئەسکەندەریەش لەزستاندا خۆشترین ئاوهەوای هەیەو من لەمکەژە خۆشەدا ئەسکەندەریە جێناهێڵم وبگەڕێمەوە ڕۆم, لەوکاتەی ئەنتوان لەئەسکەندەریەدا کاتەکانی خۆی بە خۆشی دەگوزەراند, لەڕۆمدا شەڕی ناوخۆ دەستی پێکردبوو ولایەنێکانی شەڕی ناوخۆش دوو دەستەبوون، یەکێکیان ئوکتاو کوڕی سیزارو ئەوی تریان فلووی.

فلووی ژنی ئەنتوان بوو، من ئەوم لەڕۆمدا بینیبوو وبیستبووم کەزۆر بێبەزەییە, کاتێ یەکێك لە خزمەتکارەکان کەتنێ- یان هەڵەیەکی کلردبا، ئەو فەرمانیدەدا فەلاقە بکرێت وبۆ خۆی دەچووە سەر سکی ئەو خزمەتکارەو ئەوەندەی لێدەدا تاگیانی لەدەستدەدات و دواتر فلووی تەرمەکەی وەرگێڕو هەڵگێڕ دەکرد داخوا مردووە، کاتێ دڵنیا دەبوو مردووە ئینجا بەجێی دەهێشت, لە ڕۆمدا سزای خزمەتکاری هەڵاتوو وەك ئەوەوابوو کەسێك لەسەر شارێکانی ڕۆمدا دەستدرێژی بکاتە سەر خەڵك,

کاتێ فلووی یەکێك لەخزمەتکارە[1] هەڵاتووەکانی خۆی دەستگیردەکرد فەرمانیدەدا لەخاچی بدەن، بۆخۆشی بزمارکوتی دەست پێکانی دەکرد وهەڵیدەواسی.

خاتونەکەی من کلیۆپاترا وەك هەموو دەسەلاتدارەکانیت ر بێبەزەیی بوو بەڵام بەبەراورد لەگەڵ فلووی هاوسەری ئەنتواندا بەژنێکی بەبەزەیی ومهرەبان هەژماردەکرا, چونکە ئەنتوان ژنەکەی خۆی وا ڕاهێنابوو بەردەوام مەعشوقەی هەبێت, فلووی دوژمنایەتی ئەو ئافرەتانەی نەدەکرد کە دەبوونە عاشیقەی مێردەکەی, چونکە عاشیقەکانی ئەنتوان ئەوەندە زۆربوون فلووی بەلایەوە ببوە شتێکی ئاسایی, بەڵام شێوەیەکی زۆر سەرسەختانە دژی دوژمنە سیاسییەکانی بوو, فلووی بەحسابی خۆی بڕیاریدابوو دژی ئوکتاو ڕاپەڕێت و ئەو لەسەرفەرمانڕەوایی لابدات وهەندێ لە لایەنگرەکانیشی دەستگیرکردن ئوکتاویش بەپێنج سەد کەس کەسەربازی ڕۆمی بوون ولە مەکەدۆنیاوە گەڕابوونەوە ناردنی بۆسەر فلووی, فلوویش وەڵامی بۆئەو سەرابزانە نارد بەکوێدا هاتون بەوێدا بگەڕێنەوە- یان خۆیان بەدەستەوەبدەن, فەرماندەی ئەو لەشکرەش گوتی فەرمانیان بەمن داوە دەستگیرت بکەم منیش بەپێی ئەو فەرمانە بەوکارە هەڵدەستم.

فلوویش پەیامێکی تری بۆئەو سەربازانە ناردو گوتبووی ئێوە سەرپێچی لەو فەرمانەبکەن و بگەڕێنەوە- یان تەسلیمبن, بەڵام فەرماندەی لەشکرەکە لەوەڵامدا گوتبووی ئێمە ملکەچی فەرمانی گەورەکەمانین, فلووی وەڵامێکی تری ناردبوو وتێیدا گوتبووی ئەگەر ئێوە دەستگیربکەین ئەوا سەرتان دەبڕین, بەڵام ئەو ئەفسەرو سەربازانە پێکەنیبون، کەچی کەشەڕ دەستیپێکرد فلووی توانی بەسەریاندا سەرکەوێت وسەربازەکان ناچاربکات خۆیان بدەن بەدەستەوە, دوای ئەوەی ئەو سەربازانە دەستگیرکران, فلووی بڕیاریدا سزایان بدات وسەری ئەمانە لەلاشەیان جیابکرێتەوە, سەری ئەو پێنج سەد سەربازە بەبەرچاوی فلووی وهەزاران تەماشاچییەوە لەلاشەیان جیاکرایەوە, فلوویش بۆئەوەی لەسەربڕینی ئەو سەربازانەدا بەشداربێت, تەورێکی بەدەستەوە گرتووەو دوای ئەوەی ئەستۆی سەربازەکانیان لەسەر سندانێکی دار داناوە, ئەو بەوتەورە ملی قرتاندوون, ئەو ژنە بەشێوەیەك لەخوێندا شەڵاڵبووبوو وەك ئەوەوابوو هەموو گیانی برینداربووبێت، بێڕەحمانە هەموو ئەفسەرو سەربازەکانی کوشتبوون, فلووی لەنێوان ئەو ژنانەی عاشیقەی ئەنتوان بوون تەنها ڕقی لەخاتونەکەی من دەبۆوە چونکە دەیزانی ئەو ڕکەبەری مەترسیدارو سەرسەختی ئەو دەبێت.

فلووی هیچ نرخی بۆ ئەو ژنانە دانەدەنا کەدەبوونە عاشیقەی مێردەکەی، ئەمانەی وەك کارەکەرەکانی خۆی سەیردەکردن، بەڵام کلیۆپاترای شاژنی میسر جگە لەجوانیەکەی بە دەوڵەمەندترین شای خۆرهەڵاتیش لەقەڵەم دەدراو سامان وجوانیەکەی زۆری بەسەرجوانی و دەوڵەمەندی ئەمەوەهەبوو, فلووی هیچ لەو ژنانەی دەبوونە مەعشوقەی مێردەکەی بەشایستەی ئەوە نەدەزانین ئیرەییان پێبەرێت، بەڵام لەبەرامبەر کلیۆپاترادا ئیرەیی دەبردو یەکێك لەو هۆکارانەی کەدژی حکومەتی ڕۆم هەڵسابوو ئەوەبوو بۆئەوەی مێردەکەی ئەنتوان ناچاربکات بگەڕێتەوە ڕۆم ودەست لەکلیۆپاترا هەڵگرێت چونکە دوای ئەوەی شەڕی ناوخۆ لەڕۆمدا دەستی پێکرد, ئەنتوان ناچاردەبێت بگەڕێتەوە ڕۆم, بەڵام لەوکاتانەشدا ئەنتوان ئەوەندە بەخەستی کەوتبۆ گێژاوی عشقی کلیۆپاتراوە توانای گەڕانەوەی بۆ ڕۆم

نەمابوو، تائەو کاتەی ئاشکانیەکان هێرشیانکردە سەر ئاسیای بچوك وسوریاو دەیانویست لەژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی دەربهێنن، لەوکاتانەدا ئەنتوان تێبینیکرد ئەگەر لەمەزیاتر لەمیسردا بمێنێتەوە لەڕووی سیاسی و سەربازیەوە لەناودەچێت، شەوێکیان خاتونەکەی من بەزمو ڕەزمی بۆ ئەنتوان سازکردبوو، دوای ئەوەی سەرداری ڕۆمی خواردن وخواردنەوەی خواردو مەستبوو بەشاژنی میسری گوت خۆم بە دریغیکەر دەزانم بەجێت بهێڵم وبڕۆم، بەڵام من ڕێگاچارەیەکم نییە جگەلەوەی بۆ ماوەیەك بەجێتبێڵم وڕێگای سوریاو ئاسیای بچوك بگرمەبەر من بۆیە لەڕۆمەوە هاتبووم تاناوچەکانی ئاسیای بچوك وسوریا ئارام بکەمەوەو ئەوانەی سەرکێشیانکردبوو تەمبێیانبکەم، بەڵام دوای ئەوەی تۆم لەشاری تارسدابینی، بەشێوەیەك گیرۆدە بووم کەهەموو کاروئەرکەکانی خۆم لەبیر چوونەوەو بەپێی خواستی تۆسوپاکەی خۆم لەسوریاو ئاسیای بچوکدا جێهێشت وتەنها دوو لەشکرم لەگەڵ خۆمدا هێنا بۆ ئەسکەندەریە.

خۆشەویستی من بۆتۆ زۆر بوو وزۆرە، هەتاکە هاوسەرەکەشم لەڕۆمدا ئاژاوەگێڕیکردوو شەڕی ناوخۆی هەڵیساند من لای تۆ نەڕۆیشتم چونکە نەمدەتوانی لەتۆ دووربکەومەوە، بەڵام ئێستا ئاشکانیەکان هێرشیان بردۆتەسەر ئاسیای بچوك وسوریا ئەگەر من نەکەومە ڕێ وخۆم نەگەیەنمە سوریاو ئاسیای بچوك هەموو سەربازەکانی من لەودوو ناوچەیەدا تێدادەچن وسوریاو ئاسیای بچوك لەژێر دەسەڵاتداریێتی ڕۆم دەچنەدەرێ ودەکەونە ژێر ڕکێفی ئاشکانییەکان، ئەوکاتە من بۆ هەمیشە کەسایەتی وچۆنیایەتی خۆم لەدەستدەدەم، ڕۆمیەکانیش هیچ کاتێ چاوپۆشی لەو سەردارەیان ناکەن کەدوو وڵاتی گەورە لەدەست ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دەدات وسوپاکەشیان لەناو دەبات.

خاتونەکەی من تێبینیکرد ئەنتوان ڕاستدەکات ئەگەر سوریاو ئاسیای بچوك لەژێر دەسەڵاتداریێتی ڕۆم بچنەدەرێ وسوپای ڕۆم تێشکێت ئەوکاتە سەرداری ڕۆمی بەلای کلیۆپاتراوە ئەو بەهایەی نامێنێت، کلیۆپاترا نرخ بۆ ئەنتوان دادەنێت کەخاوەنی کەسایەتی وهێزبێت و بتوانێت لەبەهێزی ئەو پارێزگاری خۆیی وتەختی پاشایەتی پێبکات،

-بۆیە خاتونەکەی من گوتی: ئەنتوان بۆخۆت دەزانی چەندەم خۆشدەوێیت، لەو ڕۆژەی تۆم بینیوە حەزدەکەم هەرلەگەڵ تۆدابم ولەتەکتا بژیم، بەڵام ئێستا دەزانم ڕووداوێك هاتۆتە پێش و پێویستە تۆبەشێوەیەکی کاتی لەمن دووربکەویتەوە، هەرچەندە دووری تۆ بەلای منەوە زۆر دژوارەو من بەرگەی ئەو دووربونەت دەگرم چونکە دەزانم دەبێتە هۆی بەهێزبوون وسەربەرزی تۆ، ئەگەر من نەتوانم بەشێوەیەکی کاتی بەرگەی دووری تۆبگرم چونکە ئەمە دەبێتە هۆی لاواز بوونی هێزو کەسایەتی تۆ بۆیە مافی ئەوەم نییە بڵێم تۆم خۆشدەوێت، کەسێك مافی ئەوەی هەیە بڵێت کەسێکی ترم خۆشدەوێت کەبەردەوام حەزبکات خۆشەویستەکەی سەرکەوتوو وبەهێزبێت، لەسەر ئەم بنەمایە لەمن دووربکەوەوەو کارەکانی خۆت لەسوریاو ئاسیای بچوك ئەنجام بدەو دوای ئەوەی سەرکەوتی، بگەڕێرەوەو وەرەلای من پشووبدە.

ئەنتوانیش گوتی: من بۆ ئەوەی بتوانم بگەڕێمەوە بۆلای تۆ ڕۆژان دەژمێرم، چونکە لەهیچ شوێنێکی تری دنیادا وەك ئەسکەندەریە بۆمن خۆش نییە بەمەرجێ لەتەك تۆدابم و بەردەوام تۆ ببینم.

ئینجا ئەنتوان دوای ماڵئاواییەکی غەمگینانە لەکلیۆپاترا, سواری کەشتی بوو وبەرەو سوریا بەڕێ کەوت, چونکە سەرداری ڕۆمی دەیزانی دەبێ لەئاسیای بچوك وسوریادا شەڕبکات, هەموو ئەو سەربازە ڕۆمیانەی کەلەمیسردا بوون لەگەڵخۆیدابردن, بەشێوەیەك دوای ڕۆیشتنی ئەنتوان ئیتر سەربازێکی ڕۆمی بەبەرچاو نەدەکەوت ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی کەسایەتی کلیۆپاترا لەناوخۆی میسزدا, چونکە یەك سوپای بیانی لەناو میسردا ئەگەر ئاشتیانەش بێت زیان بە بەهێزی دەسەلاتداریەتی ئەو وڵاتە دەگەیەنێت, بەدرێژایی ئەو ماوەی سوپای ڕۆم لەمیسردابوو کلیۆپاترا نەیدەتوانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەست لەکاروباری سەربازانی ڕۆم وەربدات, هەرچەندە ئەفسەرەکانی ڕۆمی نەیاندەهێشت سەربازانی ڕۆمی سەرپێچی بکەن وئەنتوان لێی قەدەغە کردبوون سەربازەکانی بچن بۆهەردوو شوێنی ڕابواردنی گشتی ئەسکەندەریە ئەمە جگە لەوەی بوونی سەربازانی ڕۆمی لەئەسکەندەریەدا جۆرە بیرۆکەیەکی دروستکردبوو کەمیسر لە ژێر ڕکێفی ڕۆمدایە, بەلام دوای ئەوەی ئەنتوان بەخۆیی وسوپاکەیەوە ڕۆیشت ئەم بۆچوونە لای هاولاتیان نەما, دوای ڕۆیشتنی ئەنتوان لەمیسر, کلیوپاترا پشووێکیدا لەبەرئەوەی ڕزگاریبوو لەخزمەتکردنی بەردەوامی سەرداری ڕۆمی وئیتر دەیتوانی کاتەکانی خۆی بەئارەزووی خۆی بەسەر بەرێت، لەوکاتەی ئەنتوان بەسواری کەشتی بۆشەڕ لەگەڵ ئاشکانیەکاندا دەچوو بۆ سوریاو ئاسیای بچوك, ژنەکەی( فلووی ) لەڕۆمدا لەبەرامبەر ئوکتاودا تیکشکابوو وبەخۆیی و سێ هەزار کەسەوە هەلاتبووەو خۆی گەیاندبۆ یۆنان ولەشاری ئەسینادا نیشتەجێ ببوو.

ئەنتوان لەسوریاو ئاسیای بچوکدا ڕووبەڕووی گرفتی گەورەبۆوە, ئاشکانیەکان شارەکانی ئاسیای بچوك وسوریایان یەك لەدوای یەك دەخستەژێر دەسەلاتی خۆیانەوەو دانیشتوانی ئەو شارانە خۆیان تەسلیمی ئاشکانیەکان دەکرد, بۆئەوەی ئەنتوان بتوانێت هێزەکەی خۆی لە سوریاو ئاسیای بچوکدا جێگیربکات وبەهێزیبکات ئینجابکەونە شەڕ, بەلام شالاوی هێرشی ئاشکانیەکان زۆر لەگوڕ وبەربلاوبوو بۆیە ئەنتوان بڕیاریدا هێرشی بەرپەرچدانەوە دوابخات تائەو کاتەی هێزەکانی خۆی تەواو کۆدەکاتەوەو ئامادەدەکات, لەپڕ هەواڵێك لەئەسیناوە هات کە فلووی مردووە, فلووی دوای ئەوەی چووە بۆیۆنان نەخۆش کەوتووە، هەندێکیش دەڵێن گوایا دەرماندراویانکردووە, پزیشکەکانی یۆنان نەیانتوانیوە چارەسەری فلووی بکەن ودوای پازدە ڕۆژ مردووە, مردنی هاوسەرەکەی ئەنتوان ئەوەندە کاری لەئەو نەکرد، چونکە هەتا ئەو کاتانەی کەلە ڕۆمیشدابوو کەمتر بەلایەوە دەچوو, دەتوانین بڵێین مردنی فلووی ڕزگاربوونی ئەنتوان بوو لەدەست بێبەزەییترین ژنی دنیا, ئەنتوان وفلووی دوو هاوسەری ئاسایی نەبوون کەپێکەوە بژین ئەمانە هەریەك بەجیا دەژیان, ئەنتوان ڕۆژگارەکانی خۆی لەگەڵ دۆستەکانیدا کەزۆربەیان ژنی دامێن پیس وپیاوی سوکبوون بەسەردەبرد, فلوویش کاتەکانی خۆی بەقسەو قسەلۆك وئاژاوە گێڕی وفیتنەیی وزەبرو زەنگ ودڵڕەقی بەسەردەبرد, ئەو ڕەفتارانەی فلووی ببوەجێگای هەراسان وتوڕەیی ئەنتوان, چونکە ئەو ڕەفتارە دزێوانەی فلووی دەیکردن لەچاوی ئەنتوانیاندا دەدیت و دەیانگوت ئەگەر ئەنتوان بەوهەڵسوکەوتانەی هاوسەرەکەی ڕازینەبێت ئەوارێگای لێدەگرێت– یان ئەوەتا دەستی لێهەڵدەگرێت بۆئەوەی خەڵك بزانێت ئیتر فلووی هاوسەری ئەونەماوە, هەتا ئەو کاتەی کەفلووی شەڕی ناوخۆی لەگەڵ ئوکتاودا هەلایساند, هەموو خەڵك دەیگوت ئەنتوان هانی داوەو دەیەوێت ئوکتاو بەدەستی ژنەکەی بەکوشتبچێت بۆ ئەوەی کاتێ لەمیسر گەڕایەوە بۆخۆی تاکە

فەرمانڕەوای بێ ڕکەبەربێت, بەڵام من ئەوەندەی تێبینی ئەنتوانم دەکرد لەمیسردا ئەوهیچ دەستی لەشەڕی ناوخۆی ڕۆمدانەبوو, هاوسەرەکەی فلووی بەبێ ڕەزامەندی ئەو شەڕی لەڕۆمدا نابۆوە.

# ئەنتوان و ئۆکتاو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیان دابەشکرد

هێندە بەسەر مردنی فلووی هاوسەری ئەنتواندا تێنەپەڕی بوو کەئەنتوان و ئوکتاو ئاشتبوونەوە, چونکە ئەوەی ببوەجێگای گرژی وناکۆکی نێوان ئەم دوانە فلووی بوو, دوای ئەو ململانێیەی نێوان ئەو دوانە فەرمانڕەوایی ڕۆمیان دابەشکرد, ئەم دوانە لەسەرئەوە ڕێککەوتن ئوکتاو فەرمانڕەوایی هەموو خۆرئاوای ئیمپراتورییەتی روّم بکات وئەنتوانیش فەرمانڕەوایی ولاّتانی خۆرهەلاّتی بکات, ولاّتە ژێر دسەتەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیش لەئەفریقادا, دایان بە لپید, بۆئەوەی ڕازیبکەن، بەلاّم ناوی میسریان نەهێنابوو, واتە ئەنتوان وئوکتاو لەسەرئەوە ڕێککەوتن کەمیسر هەرەك خۆی بمێنێتەوەو هەر کلیۆپاتراش لەسەر تەختی پاشایەتی بێت, ئگەر ئەنتوان عاشقی خاتونەکەی من نەبوایە میسریشی وەك ولاّتەکانی تر دەخستە ژێر ڕکێفی خۆی، بەلاّم چونکە کلیۆپاترای ئێمەی خۆشدەویست نەیویست کارێکبکات کلیۆپاترای لێبرەنجێت, ئوکتاو یەکێك لەمەرجەکانی ئاشتیکردنی ئەوەبوو ئەنتوان لەگەڵ خوشکە بێوەژنەکەیدا ببێت بەهاوسەر, بەوەی فلووی هاوسەری ئەنتوان مرد ئیتر ئەنتوان کێی پێخۆشبا دەیتوانی بیکات بەهاوسەری خۆی, ئەگەر لەوکاتەدا ئەنتوان لەمیسربا بەتائکیدی کلیۆپاترای دەهێنا, بەلاّم چونکە لەمیسرنەبوو ولەڕۆم بوو ناچار مەرجەکەی ئوکتاوی قبوڵکرد, بەتایبەت چونکە ئەشراف وسیاسەتمەدارانی ڕۆمی حەزیان بەوهاوسەریەتیە دەکرد، چونکە پێشبینی ئەوەیان لەئەنتوان ئوکتاو دەکرد کەشەڕ لەنێوانیاندا ڕوودەدات، وەك هەموو جارێك کەشەڕی ناوخۆ هەڵدایسێ زۆر لەهاولاّتیان بەکوشت دەچن وشارەکان وێراندەبن, بەلاّم ئەگەر ئەنتوان خوشکە بێوەژنەکەی ئوکتاو، کەناوی ئوٚکتاوی بوو، بکات بەهاوسەری خۆی ئەوا لەنێوان ئەو دوو فەرمانڕەوایەی ڕۆمدا شەڕ ڕوونادات, ئوٚکتاوی ساڵێك لەکلیۆپاترا بچوکتربوو وجوانیشبوو بەلاّم تاجی وەك تاجی پاشیەتی میسری نەبوو, کاتێ لەڕۆمەوە هەواڵی ئەوە بەمیسر گەیشت کە ئەنتوان ئوٚکتاوی خوشکە بێوەژنەکەی ئوکتاو دەکات بەهاوسەری خۆی, خاتونەکەی من خەیاڵبردیەوەو دواتر بەمنی گوت شرمیون تۆ دەزانی بۆیە ئەنتوانمکرد بەدۆستی خۆم تاپارێزگاری تەختی پاشایەتی میسری پێبکەم ولەتەنگانەدا فریامبکەوێت ونەیەڵێت تەختی پاشایەتی میسرم لەدەست بێتەدەر, هەرچەندە تائیمپراتۆریەتی ڕۆم هەژمونی بەسەر ولاّتانی سەردەریای ڕۆمداهەبێت دەسەلاّتداریەتی من لەمیسردا هەڕەشەی لەسەردەبێت ومن ناتوانم لەگەڵ ڕۆمدا بجەنگم چونکە ڕۆم دەتوانێت بەهۆی کۆکردنەوەی سەرباز لەوشوێنانەی لەژێر

ڕکێفی ئیمپراتۆریەتەکەیدایە هەزار لەشکر کۆبکاتەوە, من تەنها بەڕێگای سیاسی دەتوانم سەربەخۆیی خۆم بپارێزم ونەیەڵم پاشایەتی کەنزیکەی سێسەد ساڵە حوکمی ئەم وڵاتە دەکات لەناو بچێت, بۆ ژنێکی وەك من باشترین ڕێگاچارە ئەوەیە بەڕێگای سیاسەت دیارترین پیاوی ڕۆم عاشقی خۆی بکات تادووریکەوێتەوە لەمەترسییەکانی ناحەزان.

بەڵام لێرەودوا کەئۆکتاوی بووبە هاوسەری ئەنتوان, گەمە سیاسیەکەی من توشی گرفت دەبێتەوە, هەرچەندە ئۆکتاوی خاوەنی سامان وپلەو پایەی من نییە، بەڵام ئەو جوانە جگە لەمەش ڕۆمییەو منیش میسریم, دەزانی لەناو دڵی پیاودا عشقی تازە بۆئافرەتێکیتر زوو گەشە دەکات ودەیوروژێنێ, ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەنتوان هاوسەرە کۆنەکەی لەبیربچێتەوەو دەترسم منیش بەلەبیرچونەوە بسپێرێت, ئەو ڕۆژەی ئەنتوان لەگەڵ مندا دڵسارد دەبێتەوە دەبێ چاوەڕوانی ئەوەبکەم ئوکتاو–ی میراتگرەوەی سیزارو خودی ئەنتوان هەڵمەت بهێننە سەرمیسرو من لەسەر تەختی پاشایەتی لاببەن ومیسریش وەك سوریاو یۆنان و ..تاد... بخەنەسەر دەسەڵاتداریەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم, بۆ خۆت دەزانی چونکە سیزار منی خۆشدەویست ئوکتاو ڕقی لەمن داگرتووەو تائێستاش لێمبەکینەیە, خوشکەکەی ( ئۆکتاوی )ش هەرقینی لەمن دەبۆوە لێرەودواش زیاتر دژایەتیم دەکات، چونکە مێردەکەشی خۆشی ویستوم وهیچ ژنێك بەرگەی ئەوە ناگرێت مێردەکەی دڵی بە ژنێکی ترەوەبێت وعاشقیبێت.

من لەبەرامبەر دوژمنایەتیکردنی ئوکتاو وئۆکتاویدا یەك ئامرازم بەدەستەوەیە ئەویش عشقی ئەنتوانە بۆمن خۆئەگەر خۆشەویستی ئەنتوان لەبەرامبەرمندا نەمێنێت ئەوا هەرسێکیان دژایەتیمدەکەن ولەسەرتەختی پاشیەتیم لادەبەن, بۆئەمەش من ڕێگاچارەیەکم نییە لەوەزیاتر کە وابکەم خۆشەویستی ئەنتوان بۆمن هەربمێنێت بۆئەوەی لەئایندەدا لەناوم نەبەن، دەبێ کارێکی وابکەم ئەنتوانیش هەستی پێنەکات هاوسەرەکەی لەناوبەرم، من دەزانم ئەنتوان عاشقی ئۆکتاوی نەبووە چونکە لەڕابردووشدا ئەوی دیتووەو عاشقی نەبووە، ئەوەی بۆتە هۆی ئەوەی ئەنتوان بەو هاوسەریەتیە ڕازیبێت بارودۆخی سیاسییە, ئەگەر ئەنتوان ئاشکانیەکانی تێکشکاندبا لەسوریاو ئاسیای بچوکداو بەسەربەرزی گەڕابایەوە ڕۆم دەیتوانی ئەومەرجەی ئوکتاو قبوڵنەکات و ئۆکتاوی خوشکی نەهێنێت, بەڵام چونکە دوای ئەوشەڕە ناوخۆییەی کەژنەکەی پێشووی هەڵیگیرساندبوو گەیشتەوە ڕۆم, بەوەی لەسوریاو ئاسیای بچوکیشدا هیچی لەدەست نەهاتبوو, ئەنتوان جگەلەوی لەگەڵ ئوکتاودا ڕێکبکەوێت چارێکی تری نەبوو بۆئەوەی بتوانێت نفوزی خۆی بپارێزێت ولەئایندەدا بەخۆیدا بچێتەوە.

ئەو ڕۆژەی ئەنتوان دەیویست لەئەسکەندەریە بڕوات, چەند میسریەکی وەك خزمەتکار لەگەڵخۆیدابرد بۆسوریاو ئاسیای بچوك لەمانەش یەکێکیان فاڵگرەوەبوو, میسریەکان لەوبوارەدا دەستڕەنگینن وئەنتوانیش باوەڕی بەو ئەستێرە [1] ناسانە هەبوو وبۆ هەموو کارێك لەوانەی دەپرسی پێشبینیەکانی خۆتانم بۆباسبکەن, کاتێ کلیۆپاترا زانی ئەنتوان زۆر باوەڕی بەو ئەستێرە ناسانەهەیە, ئەستێرە ناسێکی ڕاسپارد بەردەوام لەگەڵ ئەودابێت, بەڵام لەژێرەوە کاریان ئەوەبوو خاتونەکەی من لەڕووداو وپێشهاتەکان ئاگاداربکەنەوە, دوای ئەوەی ئەنتوان گەڕایەوە ڕۆم لەگەڵ ئۆکتاویدا بووبەهاوسەرو خزمەتکارە میسریەکانیشی هەرلابوون, کلیۆپاتراش بۆئەوەی بەئەمەکی ئەوان بۆخۆی بهێڵێتەوە

بێدرێغی پارەی بۆ خەرجەکردن و بەردەوام کلیۆپاتراش ئاگاداری هەلسوکەوتەکانی ئەنتوان وڕۆم بوو, ئەستێرەناسە میسریەکە بە ئەنتوانی گوتبوو ئەستێرەی تۆ لەگەڵ ئەستێرەی ئۆکتاویدا نییان نییەو تائەو ڕۆژەی تۆ لەگەڵ ئۆکتاویدابیت خێر لەبەخت وئیقباڵی خۆت ناکەیت, چونکە ئەستێرەی ئوکتاوی ڕێگردەبێت لە بەردەم ئەستێرەی تۆدا تابتوانێت بەشێوەیەکی تەواو بدرەخشێتەوە, ئەو ئەستێرە ناسە میسریە بەئۆکتاوی ژنی ئەنتوانیشی دەگوتبوو ئەستێرەی مێردەکەت سێبەری لەئەستێرەی تۆکردووەو ئەستێرەی تۆی مەیلەو تاریککردووە, ئەو کەسەی باوەڕی بەئەستێرە گرەوانبێت ئەم قسانە کاری تێدەکات, کلیۆپاترا کەبەئەسڵ باوەڕی بەئەفسانەو جادو وفاڵگرەوان نەبوو، بەم کارانەی دەیویست ئەنتوان لەڕۆم دووربخاتەوەو لەژنەکەی ئۆکتاوی دابڕێت, بەڵام ئەنتوان تاماوەی ساڵێك لەئیتالیا مایەوە- واتە بەهیچ لایەکدانەچوو هەموو ئەوماوەیەش کاتەکانی خۆی لەگەڵ کۆمەڵێ ژنی تاترۆو پیاوی سوك وخواردنەوە بەسەردەبرد, ئوکتاوی- ش دەیزانی مێردەکەی چیدەکات بەڵام ناڕەزایی دەرنەدەبڕی چونکە ژنێکی زۆر پشوودرێژبوو, کلیۆپاترا بەردەوام ئاگاداری بارودۆخی ڕۆم بوو, ئەنتوان وئوکتاو دوو دیکتاتۆربوون وهیچ یەك لەم دوانە ئۆین وپیلانی دژی ئەویتر دانەدەڕشت وهەوڵی یەکتر کوشتنیان نەدەدا, خاتونەکەی من دەیزانی لە ئاییندەدا دووبەرەکیێ دەکەوێتە نێوان ئەم دوانەو ناکۆکیەکی خوێناویش دەبێت, بەمنی گوت شرمیون لەوانەیە لەدنیادا پیاوێك هەبێت پیاوێکیتر لەژیانی تایبەتی خۆیدابکات بەهاوبەش بەڵام هەرگیز ناتوانێت کەسێکیتر لەگەڵ تواناو هێزی خۆیدا بکات بەشەریك، مەسەلەی هێز سەبارەت بەدیکتاتۆرێك پایەی بنچینەیی ژیانیەتی وهەموو شتێك لەبەرامبەر ئەودا دەکاتە قوربانی و ئامادەیە بەدەستی خۆی هەموو ڕۆڵەو کەسوکارەکانی لەناوبەرێت تاکەس نەبێتە شەریکی هێزو دەسەڵاتداریەتی ئەو, من کەتەنها شای یەك وڵاتم ناتوانم ببینم کەسێکیتر ببێتە شەریکی دەسەڵاتداریەتیم جاچزای دیکتاتۆرەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم کەحکومەتی دنیادەکەن, وەك خاتونەکەی من دەیگوت چونکە ئەنتوان وئوکتاو ڕکەبەڕیی یەکترن بچوکترین ناکۆکی لەنێوان ئەو دوانەدا دەبێتە مەسەلەیەکی گەورەو مەترسیدار, شتی زۆر بچوکیش تەنانەت بردنەوەو دۆڕانیش لەقومارکردنی نێوان ئەنتوان وئوکتاو دەبێتە مایەی ناخۆشی وکێشەوبێشە, لەڕۆمدا شەڕەکەڵەشێرو هەندێ باڵندەیتر باوەو گرنگی پێدەڵێن، دەوڵەمەندەکان خزمەتکاری تایبەتیان هەن کە خەریکی بەخێوکردن وئاگادریکردنی کەڵەشێری شەڕکردنن.

ئەنتوان وئوکتاویش لەوجۆرە خزمەتکارانەیان هەبوون, ڕۆژێکیان هەردوو دیکتاتۆر ئامادەی شەڕە کەڵەشێربوون کە کەڵەشێرەکان یەکێکیان هی ئەنتوان بووەو ئەویتریشیان هی ئوکتاو, کەڵەشێری ئەنتوان خۆی بۆکەڵەشێری ئوکتاو ڕاناگرێت وهەڵدێت, ئەنتوان بەشێوەیەك لەمە ناڕەحەتبووە تەنانەت دەستی لەسەر شمشێرەکەی داناوەو گوتوویەتی کەڵەشێرەکەم لەمەیدانی شەڕ هەڵات بەڵام خاوەنەکەی لەمەیدانی شەڕ هەڵنایەت, لەو ڕۆژەدا خوشکی ئوکتاو وژنی ئەنتوانیش لەوێبووە ئەگەر ئەو نەبوایە وناوبژیوانی نەکردبا لەنێوان ئەو دوو دیکتاتۆرەدا شەڕ ڕوویدەدا, خۆئەگەر یەکێك لەودوانە بەکوشت نەچووبا ئەواشەڕی ناوخۆ دروستدەبوو, لەو ڕۆژەدا کەئەنتوان دەستی بۆدەسکی شمشێرەکەی بردووەو شمشێرەکەی لەکالان دەرهێناوەو هەڵساوەتە سەرپێ، ئوکتاویش دەستی بۆشمشێرەکەی بردووەو لەکالان ڕایکێشا, بەڵام ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان هاتۆتە نێوانیان وبەدەستێکی دەمی

شمشێرەکەی ئۆکتاو-ی برای گرتووەو بە دەستەکەی تریشی نەیهێشتووە ئەنتوان لەئۆکتاو نزیک بێتەوە وگوتویەتی: ئەگەر دەتانەوێت شەڕبکەن پێشان من بکوژن ودواتر بەشمشێران وەرگەڕێنە یەکتری، هەرجارەی ئەنتوان قوماری لەگەڵ ئۆکتاودا کردبا دەدۆڕاو بەتوڕەیی هەڵدەستاو دەڕۆیی، ئەنتوان کەخاوەنی سامانێکی زۆر بوو باکی زەرەدی ماددی نەبوو، چونکە ئەوەی دەیدۆڕاند کاریگەری لەسەر زۆری سامانی ئەو جێنەدەهێشت, بەڵام ئەو لەوەهەراسانبووە بۆچی تاقومار لەگەڵ ژنبراکەیدا دەکات دەدۆڕێت؟ دوای ساڵێك ئۆکتاوی کچێکی بوو کەچەند ڕۆژێك پێشئەوە سەرداری ڕۆمی لەڕۆم ڕۆیشتبوو و بەرەو یۆنان چووبوو, خەڵکی ئەسینا بۆپێشوازیکردن لەئیمپراتۆری ڕۆم, بڕیاریاندا خوای شاری ئەسینا کەناوی ( ئاتینە)(1) (لەشاری ئەسینادا چەند گردێك هەن بەناوی( ئاکروپول )وچەند تەلارێکی جوان لەسەر ئەوگردانە دروستکراون، یەکێك لەوکۆشکە جوانانەی کەلەسەر ئەوگردانە دروستکراوە پەرستگای ( پارتەنون )ە کەئەویان بۆخوای شار ئاتینە تەرخانکردووە،(و- فارسی) بوو لەئەنتوان مارەبکەن, ئاتینە خوای شاری ئەسینا وەك خواکانی ئێمە میسریەکانبوو, واتە زیندوو نەبوو تابتوانن کەلوپەلی شوکردنی ئەو دابینبکەن, مارەکردنی ئاتینەی خوای شاری ئەسینا لەئەنتوان تەنها ڕێوڕەسم بوو وبەڕووکەشبوو و واقیعی نەبوو, بەڵام ئاتینە پێنج خزمەتکاری هەبوون, کەهەموو ساڵێ لەڕۆژێکی دیاریکراودا پێنج کچی پازدە ساڵیان لەجوانترین کچەکانی ئەسینا هەڵدەبژارد بۆخزمەتکردنی خوای شار بۆماوەی ساڵێك, دانیشتوانی شار گوتیان چونکە ئاتینەی خوای شار ژنێکی واقیعی نییە تابتوانێت مەراسیمی شەوی پەردە لەگەڵ ئەودابگرێت, ئەنتوان دەتوانێت یەکێك لەوپێنج کچانەی کەخزمەتی ئاتینە دەکەن هەڵبژێرێت وشەوی پەردەیان لەگەڵدابکات, ئەنتوان گوتی: کاتێ ژنێك بیەوێت شوبکات دەبێ تەداروکاتی خۆی لەگەڵخۆیدا بێنێت بۆماڵی مێردەکەی چونکە ئاتینەی خوای شاری ئێوەش دەیەوێت شوبەمن بکات ئەوادەبێ جیهازی لەگەڵخۆیدا بێنێت.

دانیشتوانی شار پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد- بیریان لەوەکردەوە ئەو مەراسیمە هەڵوەشێننەوە, بەڵام ئەنتوان گوتی دوای ئەوەی قسەلەسەر هاوسەریەتی کرا وبڕایەوە نابێ ژن پەشیمانبێتەوە دەنا ئەمە وەك سوکایەتی پێکردنە بەمن ئەگەر ئاتینە ئامادەنەبێت شوبەمن بکات, ئەوا من ئەو سزادەدەم.

دانیشتوانی شار سەرسامبوون و پرسیان دەبێ ئاتینە چەند جیهاز بۆتۆ بێنێت؟

-ئەنتوان گوتی یەك ملیۆن (دراخم)(2) (دراوی ئەوکاتی یونانە(و- فارسی) پارەی کاش بدات،

دانیشتوانی ئەسینا دوای ئەوەی یەك ملیون دراخمایان دابینکردو دایان بەئەنتوان داوایانلێکرد بێت بۆپەرستگای گەورەی ئاتینە تالەوێدا مەراسیمی زەماوەندی ئەولەگەڵ خوای شاردا بەئەنجام بگەیەندرێت, ئەنتوانیش بۆئەو پەرستگایە چوو بەڵام چون نەیدەتوانی شەوی پەردە لەگەڵ پەیکەرێکدابکات, پێنج کچە خزمەتکارەکەی خوای ئاتینەی بردنە پەردەی بوکێنیەوە.

لەو ڕۆژەی ئەنتوان گەیشتە ئەسینا شانێڵە ڕەنگ ئەرخەوانیەکەی خۆی داکەندو جلوبەرگی یۆنانی لەبەرکردن, دوای ئەوەی مەراسیمی زەماوەندی ئەنتوان تەواوبوو, ئەنتوان حەزیدەکرد ئۆلۆمپیادی یۆنان ببینێ, بەئەویان گوت ئیستا کاتی ئولۆمپیاد نییە چونکە ساڵانە یەکجار ئۆلۆمپیاد دەکرێت وپێویستە وەرزشکارانی یۆنانی خۆیان ئامادەبکەن, جگەلەمەش ڕێوڕەسمی ئۆلۆمپیاد ئەوەندە پیرۆزە

ناتوانرێت کاتەکەی بگۆڕدرێت، ئەنتوان گوتی دەتوانرێت لاوە وەرزشکارەکان بەناوێکی ترەوە ئامادەبکرێن وئۆلۆمپیادبکرێت؟ کاتێ یۆنانیەکان زانیان ئەنتوان سورەلەسەر ئەوە خەڵکانیان بەملاولادانارد تابەوەرزشکارەکان ڕابگەیەنن بێن بۆئەسینا.

یەکەم ڕۆژ کاتێ ئەنتوان گەنجە وەرزشکارەکانی یۆنانی لەوەرزشگای ئەسینادابینی، سەری سوڕماو گوتی من پێموانەبوو ئەوهەموو گەنجە جوان وچاو شینانە لەیۆناندا هەبن، کاتێ گەنجەکان دەستیانکرد بەوەرزش، ئەنتوان کەلەشوێنێکی تایبەتیدا دانیشتبوو وخەریکی سەیرکردنی ئەمانەبوو، نەیتوانی خۆی ڕاگرێت وجلەکانی لەبەرخۆی داکەندوو چووە گۆڕەپانەکەوەو ملانەی لەگەڵ گەنجە یۆنانیەکانداگرت، گەنجە وەرزشکارەکان دەیانتوانی ئەنتوان لە ئەرزی بدەن، بەڵام چونکە فەرمانڕەوای یۆنانبوو، ڕێزیاندەگرت ولەئەرزیان نەدەدا- واتە حەزیان نەدەکرد لەزۆرانبازیەکەدا بەبنخۆی بدەن و پشتی لەئەرزی بدەن، ئەنتوان لەئەسینادا بە شێوەیەك سەرقاڵی وەرزشکاریبوو ئاگای لەڕووداوەکانی ڕۆم و وڵاتانی ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم نەمابوو، لەئاسیای بچوکدا بارودۆخەکە بەرەو دژواری دەڕۆیشت سەرداری ڕۆمی ماوەیەکی زۆربوو لەشەڕو جەنگێن دورکەوتبوّوەو خەریکی خۆلێستنەوەو ڕابواردن و وەرزشبوو دەیزانی ناتوانێت بچێت بۆشەڕی ئاشکانیان بۆیە یەك سەرلەشکری بەناوی( ون دی تیوس )ی ڕاسپارد بچێت بۆئاسیای بچوك وشەڕ لەگەڵ ئاشکانیەکاندا بکات ( ون دی تیوس ) شەرابی نەدەخواردەوە قومارى نەدەکرد حەزی لەڕابواردن لەگەڵ ژناندانەبوو، دەیتوانی هەموو هێزەکەی خۆی سەرگەرمی شەرکردنبکات، ناوبراو لەتێکشکاندنی ئاشکانیەکان لەئاسیای بچوکدا سەرکەوتووبوو وتوانی بۆیەکەمین جار لەشەڕێکی گەورەدا بەسەر ئاشکانیەکاندا زاڵبێت، دوای ئەوسەرکەوتنە، ون دی تیوس ئەو شارەی گەمارۆدا، کاتێ ئەنتوان زانی ناوبراو بۆجارێکی تریش سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، لەناو وپلەوپایەکەی خۆی کەمێ ترسا، چونکە زانی ئەگەر( ون دی تیوس) بۆ جارێکیتر سەرکەوێت ئەم کەسایەتی لای ڕۆمیەکان دادەبەزێت وئەستێرەی بەختی (ون دی تیوس) زیاتر دەدرەوشێتەوە، بۆیە بەبەهانەی ئەوەی (ون دی تیوس) دەبێ بچێت بۆ ڕۆم بۆئەوەی لەوێ خەڵات بکرێت، ئەنتوان ناوبراوی گەڕاندەوە ڕۆم و بۆخۆی لەیۆنانەوە چوو درێژەی بەگەمارۆدانی ئەوشارەدا، پاشای ئەو شارە پێشنەوەی (ون دی تیوس) بچێتەوە بۆ ڕۆم ئامادەبوو بڕێك پارەی زۆربدات بەناوبراو لەبەرامبەر ئەوەدا پاشەکشە بەسوپاکەی بکاتەوەو گەمارۆی شارچیتر بەردەوام نەبێت، بەڵام کاتێ ئەنتوان لە جێگای (ون دی تیوس)دا گەمارۆی ئەوشارەی گرتەدەست پاشای ئەوشارە زۆر دڵخۆشبوو و ئەوبڕە پارەی پێشنیاری کردبوو بۆ (ون دی تیوس) نیوە تەنانەت چارەگێکی ئەو پارەی بۆ ئەنتوان پێشنیارکرد، بەڵام ئەنتوان هەڕەشەی ئەوەی کردو گوتی هەرکاتێ ئەوشارە بگرم ئەوا پاشاو ئەندامانی خێزانەکەی دەکوژم و دانیشتوانی ئەمشارەش سەردەبڕم، پاشای ئەوشارە گوتی ئەگەر تۆتوانیت ئەمشارە بگریت ئەوا هەموومان بەتیغی شمشێرەکەت سەربڕە.

ئەنتوان چەند ڕۆژێك درێژەی بەگەمارۆدانی ئەوشارەداو دواتر بێتاقەتبوو، چونکە لەوێدا ڕابواردن وخۆشگوزەرانی نەبووەو ئەوکەسانەی کەهۆگریان بوو لەدەوروبەری خۆیدا نەیدەدیتن، پاشای ئەوشارەش بەبێ ترس کاتەکانی خۆی بەسەردەبرد چونکە دەیزانی ئەنتوان پیاوی شەڕنیەو توانای ئەوەی نییە شاربگرێت، تەنها لەوانیەیە خەڵکی شارەکەی لەبرساندا بمرن، سەرئەنجام ئەنتوان ڕازیبوو

بەوەرگرتنی چارەکێکی ئەو پارەی پاشا دابوویە (ون دی تیوس) وخۆی وسەربازەکانی ڕۆیشتن و وازیان لەگەمارۆدانی ئەوشارە هێنا, بەدرێژایی ئەو کاتانەی ئەنتوان لەڕۆمدابوو ودواتر چووبۆ یۆنان و ئینجا گەمارۆی ئەوشارەیدا خاتونەکەی من بەوردی ئاگاداربوو ناوبراو چ دەکات, کلیۆپاترا نەك هەر ئاگای لەئەنتوان بوو بەڵکو ئاگاداری بارودۆخی ڕۆم و ئوکتاویش بوو, کلیۆپاترا بەمنی گوت وادیارە ئوکتاو وردەوردە خەریکە دەبێتە فەرمانڕەوای بێرکەبەرو بێگانە لەڕۆمدا ئەگەر نەکوژرێت ونەمرێت, چونکە هەموو پێشهاتەکان ئەوە نیشاندەدەن, خاتونەکەی من دەیگوت هەموو پیاوەکانی ڕۆم زۆروکەم کەسانی شەهوەت چێن وشەراب وقومارو جنس ئەوانەی ڕیسواکردووە، بەلاّم ئوکتاو بەوەی گەنجیشە کەچی لەناو پیاوە ناودارەکانی ڕۆمدا دەگمەنەو شەراب ناخواتەوەو قومارناکات وکەمیش حەزی لەڕابواردنە لەگەڵ ئافرەتاندا, سەبارەت بەپرۆسەیەکی سیاسی قسەناکات تاهەموو لایەنەکانی شرۆڤە نەکردبن ولێکینەدابنەوە, شاژنی میسر دەیگوت, من ناتوانم دۆست ودوژمنەکانی خۆم بخەمە ناو هاوکێشەکانی سیاسییەوە، بەلاّم ئوکتاو دەتاوانێت وپاراستنی بەرژەوەندی ولاّتەکەی خۆی لەبەرچاودەگرێت.

کەسێك بیەوێت بگاتە پلەوپایەی بەرز پێویستە وابێت ولەکاروباری سیاسیدا تەنها بەرژەوەندی خۆی لەبەرچاوبگرێت ودۆست وکەسەکانی بۆبەرەوپێشبردنی کاری خۆی‌و سەرکەوتنی لە بەرامبەر دوژنەکانیدا وەك کەرەستە بەکاربهێنێت, ئوکتاویش بەشێوەیەك لەکاروباری سیاسیدا خوێن ساردە بەهیچ شێوەیەك ناکەوێتە ژێرکاریگەری هەست وسۆزی خۆشەویستی ورق وکینەوە, شاژنی میسر ڕۆژێکی کەبەمنی گوت شرمیون ئەگەر من دەساڵ لەم تەمەنەی ئیستام بچوکتربام هەوڵمدەدا سەرنجی ئوکتاو بۆلای خۆم ڕابکێشم بەجۆرێك ئەو ویستبای بمکات بەژنی خۆی, ئەو ڕەنجەی ئەمڕۆ بۆعشقی ئەنتوان دەیکێشم بۆئوکتاوم دەکێشا, بەلاّم ئوکتاو گەنجە من لەچاو ئەو ژنێکی بەتەمەنم ونابمە جێگای سەرنجی ئەو، بەلاّم لەچاوی ئەنتوانەوە من ژنێکی جوانم, ئەنتوان ئەگەرچی پلەوپایە پەرستەو دەیەوێت فەرمانڕەوایی ڕەهای ڕۆمبێت، بەلاّم کەموکوڕیەکانی ڕێگا لەئەو دەگرن تابتوانێت ئەوئامانجەی دەستەبەربکات, خواردنەوەو ڕابوادرن لەگەڵ ئافرەتانداو قوماركردن بەشێوەیەك سەرقاڵی کردووە ناتوانێت هەموو هێزوتوانای خۆی بۆ گرتنەدەستی فەرمانڕەوایی ڕەهای ڕۆم بیخاتەگەڕ.

بۆجارێکیتر ئەنتوان لەشەڕوشۆڕ دوورکەوتەوەو چووبۆ سوریاو لەوێوە تەتەرێکی بۆ ئەسکەندەریە نارد تانامەیەك بداتە دەستی کلۆپاترا, ئەنتوان لەونامەیەدا نووسیبووی بەتەمایە وەرزی زستانی ئەمساڵ لەسوریادا بەسەربەرێت وداوای لەکلیۆپاترا کردبوو بێت بۆ سوریا تاپێکەوە ئەم زستانە بەسەربەرن, ئەوکاتە ساڵی (296)ی دوای دروستکردنی ئەسکەندەریەبوو، خاتونەکەی من کەچاوەڕوانی نامەیەکی ئاوای دەکردو ئامادەباشی تەواوی کردبوو، فەرمانی ڕۆیشتنی دەرکردو بۆجارێکی‌یتر کەشتییەکانی میسر کەوتنە ڕێ بۆبردنی شاژنی میسر بۆ ولاّتێکی ترو ئێمە پاش چەند ڕۆژێ گەیشتینە سوریا, کاتێ ئەنتوان خاتونەکەی منی بینی بە شێوەیەك قوشکەبوو وەك ئەوەوابوو یەکەمجاربێت ئەوی بینیبێت.

خاتونەکەی من لەمیسردا بەئارەزووی خۆی دەژیا, ناچاربۆوە جارێکی تر زەوق ورەوشی ژیانی خۆی وەلابنێت ولەگەڵ گاڵتەجاڕی وتریقانەوەی ڕیایی وشەرابخواردنەوەو قومارکردن ئەنتواندا بووز بخواتەوە, دوای ئەوەی ئەنتوان بەکلیۆپاترا شادبۆوە ژنەکەی خۆی ئوکتاوی بەتەواوەتی لە بیرچۆوەو

دووبارە گرفتاری جوانی وڕازاوەیی کلیۆپاترا بۆوە، پێشنەی کلیۆپاترا بگاتە سوریا ئەنتوان هاموشۆی پەرستگای سریانی دەکرد تالەوێدا خەریکی عەیش ونەیشبێت، بەپێی بیرو باوەڕی دانیشتوانی سوریا، پەرستگای خوای عەشتار، شوێنێکبوو لەوێدا ژنان خۆیاندەدایە دەست پیاوان و خۆیان بۆشل دەکردن ، بەلام دوای ئەوەی کلیۆپاترا گەیشتە سوریا ئەنتوان نەدەچوو بۆئەو پەرستگایەو هەموو کاتەکانی خۆی لەگەڵ خاتونەکەی مندا بەسەردەبرد، زۆر جار لەکاتی نانخواردندا خاتونەکەی من سەبارەت بەئایندەی ئەنتوان قسەی دەکردو گوێملیێبوو پێی دەگوت ئەگەر دەتەوێت ببیتە فەرمانڕەوای یەگانەو ڕەهای ڕۆم وگەورەیی وبەهێزی خۆت نیشانی ڕۆمیەکان بدەیت، ئەوا ئاشکانیەکان لەولاتانی خۆرهەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم وەدەربنێ، ئەگەر ئەوکارە بکەیت، ئەوەندە مەزن دەبیت ئیتر ئوکتاو ناتوانێت لەبەرامبەر تۆدا خۆی ڕاگرێت، تۆ ئەگەر منت خۆشدەوێت دەبێ ئاشکانیەکان لەخۆرهەلاتدا بەردەربنێیت، چونکە بوونی ئاشکانیەکان لەخۆرهەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا جگەلەوەی تۆلای ڕۆمیەکان بچوك دەکاتەوەو هەژمونت نامێنێ، مەترسیان بۆسەر منیش هەیە، لەوانەیە ئاشکانیەکان هێرش بکەنەسەر میسرو داگیری بکەن، ئەگەر تۆ کەمێ دەست لەشەراب خوادرن هەلگریت و ژنی تاترۆو سوك لە خۆت دوور بخەیتەوە، بەدڵنیاییەوە لەشەڕی ئاشکانیەکاندا سەردەکەویت. ئەوەندەی خاتونەکەی من کاریگەری لەسەر ئەنتوان هەبوو قسەکانی ئەو ڕاستەوخۆ کاری لەئەو کردوو ئەنتوان بڕیاریدا کەکەژی زستان بەسەرچوو هێرش بکاتەسەر ئاشکانیەکان، جگەلەوەی کلیۆپاترا توانی ئەنتوان ناچاربکات بۆشەڕ- ئاواش توانی هەرنەبێ بەشێوەیەکی کاتی دەستلەو هەڵسوکەوتە ناشیرینانەی هەلگرێت وکەمێ لەژنی سوك وخواردنەوە دووربکەوێتەوە، یەکێك لەوبەڵگانەی تر کەکاریگەری کلیۆپاترا لەسەر ئەنتوان زۆربوو ئەوەبوو ئەنتوان ڕازیبوو هەندێ لەوخاکەی کەلەژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدابوو بدات بەکلیۆپاترا- واتە بیخاتە ژێر دەسەلاتداریەتی حکومەتی میسر، خۆئەگەر بەبیری خۆتیدابێنیت حکومەتی ڕۆم چەند سەربازی بۆگرتنی ئەو خاکانە بە کوشتداوە ئینجا کاریگەری کلیۆپاترا لەسەر ئەنتوان بەدیاردەکەوێت.

ئەو خاکەی کەلەلایەن ئەنتوانەوە درانە ژێر دەسەلاتداریەتی حکومەتی میسری بریتیبوون لە هەندێ خاکی سەردەریای سوریا تاسنوری میسر، دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دابەشکراو ئەنتوان بووبە ئیمپراتۆری خۆرهەلات و هەموو دەسەلاتێکی هەبوو بەسەر ئەو ولاتانەداو چۆنی پێخۆشبا دەیتوانی وایلێبکات لەمانەش دەیتوانی بیانبەخشێت، لەڕابردوودا بەخشینی هێکتارێك زەوی ژێر دەسەلاتداریەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بەبێگانەکان ئەستەمبوو ئەوەشی ئەو کارەی کردبا لەسێدارەیاندەدا، بەلام ئەنتوان دوو ولاتی لەئیمپراتۆریەتی ڕۆم بەشاژنی میسر بەخشی بێئەوەی کەس ناڕازی بێت، دوای ئەوەی خاتونەکەی من سەرکەوتووبوو لەوەرگرتنی بەشێك لەخاکی سەردەریای سوریا کەبەناوی سیلیبس [1] بوو،( سیلیبس-ناوچەیەکە کەوتۆتە خاکی ئەمڕۆی تورکیاو ناوی ولایەتی ئانتاکیەیە (و- فارسی) ئەو شوێنە لێرەواری زۆربوو و ئەو درەختانە بۆ دروستکردنی کەشتی بەکار دەهێندران بۆیە خاتونەکەی من ڕازیبوو ئەو ناوچەیەی لێوەربگرێت، کلیۆپاترا زۆری حەزدەکرد هەموو خاکی فەلەستین بخاتە سەرولاتی میسر بەلام نەیتوانی ئەمە بەدەست بهێنێت هەرچەندە دورگەی

قوربرسیش لەلایەن ئەنتوانەوە درابە کلیۆپاتراوبوو بەخاکی میسرو خاتونەکەی من سەربازگەیەکی گەورەی تێدادانا ماوەیە دوای ئەمە ولاتی لیبیاشبوو بەبەشێك لەخاکی ولاتی میسر.

ئەگەر کلیۆپاترا سوپایەکی بەهێزی دروستکردباو هەموو سامانی خۆیی‌و داهاتی سالآنەی لەو سوپایەدا خەرج کردبا نەیدەتوانی ئەوەندە خاکی ولآتانی پێداگیربکات لەوەی بەجوانیەکەی خۆی ئەو زەویانەی خستەسەر خاکی میسرو ژێر دەسلآتداریەتی خۆی, لەو ڕۆژگارەدا میسربوو بەولآتێکی وابە درێژایی پاشانشینی میسر ئەوەندە بەهێز نەبوو تەنانەت میسر وەك سەردەمی فرعەونیەکان بەهێزبوو, کلیۆپاترا بێئەوەی سەربازێك بەکوشتبدات ئەو شوێنانەی ڕۆمیەکان چەندەها سەربازو چەندین پارەیان بۆ دابوو تابتوانن بیخەنە ژێر دەسەلآتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم کلیۆپاترا کردی بەهی خۆی, ئەنتوانیش وەك ئەوەی نەزانێت حکومەتی ڕۆم چەند سەرداری سەربازی وخەرجی کردووە بەقوربانی بۆگرتنی ئەوسەر زەمینانە بەئاسانی دەیبەخشین, من دەمزانی خاتونەکەی من ئەوخاکەی بەڕووکەش بەخۆڕایی دەستکەوتبوون, بەلآم بەدەستهێنانی ئەو خاکانە فداکاری دەویست ئەویش فداکاریەکی گەورەبوو لەلایەن کلیۆپاتراوە کەلەشی خۆی دەفرۆشێت تابتوانێت ئەو سەرزەوی ودورگانەی کەلەکۆندا بەشێکبوون لەخاکی میسر جارێکی تر بکڕێتەوەو مەزنی ولآتەکەی ئێمە جارێکی تر بگەڕێنێتەوە, خاتونەکەی من ئاگای لەوەنەبوو دوای ئەوەی پەرلەمانی ڕۆم دەزانێت ئەو زەویانە بەئەو بەخشراون چ ڕوودەدات ئەو پەرلەمانەی ڕۆژێ مەبەستی بوو دەوڵەتی میسر داگیربکات وبیخاتە سەرئیمپراتۆریەتی ڕۆم و وەك ولایەتێکی سەربە ڕۆمی لێبێت .

کلیۆپاترا بەکەڵك وەرگرتن لەژنیەتی وجوانی ولێزانی خۆی توانی نەهێڵێت ڕۆمیەکان میسر بکەنە ولایەتێکی سەربە ئیمپراتۆریەتی ڕۆم, ئەمڕۆ من گوێم لێدەبێت هەندێ خەڵك دەڵێن ئەنتوان بوو بەهاوسەری کلیۆپاترا, ئەمە ڕاستنییەو تەنها مەعشوقەی بووە, کلیۆپاترا حەزیدەکرد ببێتە ژنی ئەنتوان, بەلآم ئەنتوان نەیدەتوانی بەڕەسمی بیکات بەژنی خۆی چونکە هاوسەری هەبوو, ئەگەر ئەنتوان ژنی نەبایە, دەیتوانی لەگەڵ خاتونەکەی مندا ببێت بەهاوسەر بەلآم چونکە قانونەکانی ڕۆمی ڕێگای نەدەدا دوژن و سێ ژن هەبێت, ئەگەر ئەنتوان بووبا بەهاوسەری کلیۆپاترا ئەوا ئەو ژن و مێردایەتیە ڕەسمی وقانونی نەدەبوو ومنداڵەکانیشیان نەدەبوون بە میراتگرەوەی یەکتری هەرچەندە کلیۆپاترا ژنی ڕەسمی ئەنتوان نەبوو، بەلآم لەئەو سکی پربوو و جوتلانەیەکی بوو یەکێکیان کوربوو ویەکێکیشاین کچ, ئەودوو منالآنە کاتێ هاتنە دنیاوە ئەنتوان لەگەڵ خاتونەکەی مندانەبوو ولەڕۆمدا دەژیا, ناوی یەکێکیان نا( ئەسکەندەر هلیوس ) واتە ئەسکەندەری خۆر) و ئەوی تریان ناونا ( کلیۆپاترای سلنە- واتە کلیۆپاترای مانگ) ئەو کەسانەی کەدەڵێن خاتونەکەی من بە ڕەسمی بۆتە هاوسەری ئەنتوان ئەوا پشتبەدوونامەی ئەنتوان دەبەستن چونکە ئەنتوان لەودوو نامەیەدا خاتونەکەی منی بەژنی خۆی ناوبردووە, ئەو کەسانەی کەخاتونەکەی منیان بەژنی ئەنتوان دەزانی دەیانگوت ئەگەر کلیۆپاترا هاوسەری وی نەبووە. ئەوا بەژنی خۆی ناونەدەبرد, ئەوانە نەیاندەزانی لەزمانی ڕۆمی‌دا ژنی من دوو مانای هەیە یەکێکیان ژنەکەی من ئەوی تریشیان خۆشەویستەکەی من, دیارە مەبەستی ئەنتوان مانای دووەم بووە, ئەو کەسانەی کەپێیانوایە خاتونەکەی من ژنی ئەنتوان بووە, دەڵێن ئەو ولآتانەی ئەنتوان بەکلیۆپاترای بەخشین شیربەهای خۆی بووە.

من بەردەوام لەگەڵ کلیۆپاترادا ژیاوم, دەڵێم ئەم پروپاگەندانە ڕاست نین, خاتونەکەی من هەرگیز نەبوو بەژنی ڕەسمی ئەنتوان مارەبڕانەی وەربگرێت, ئەگەر کلیۆپاترا ژنی ڕەسمی ئەنتوان بوایە بەپێی داب ونەریتی میسری ئەویان ناودەنا پاشای میسر و وێنەکەیان دەخستە سەر دراوی میسری, بەڵام نەناوی ئەنتوان وەك پاشای میسر براوەو نەلەسەر سکەی پارەش وێنەکەی هەڵکەندراوە, لەمێژووی شانشینی میسریشدا ئەنتوان وەك ئیمپراتۆری گەورەی ڕۆم ناوبراوە, ئەگەر ئەنتوان کلۆپاترای کربا بەهاوسەری خۆی ئەوا چەکێکی کاریگەری دەدابە ڕکەبەرەکەی خۆی ونوکتاو ڕۆمیەکانی لەدژی ئەو هاندەداو کەسایەتی ئەو دادەبەزی و لەبەر چاوی ڕۆمیەکان دەکەوت.

هەڵەی خەڵك سەبارەت بەهاوسەریەتی کلیۆپاتراو ئەنتوان, لەدوو هۆوە سەرچاوەی گرتووە, یەکێکیان ئەوەیە ئەنتوان لەنامەکەی خۆیدا بۆکلیۆپاترا ئەوەی وەك ژنی خۆی ناوبردووە دووەمیشیان ئەوەیە کلیۆپاترا لەئەنتوان سکپڕبووەو دوو منداڵی دوانەی لێبوون کەئەمەیان ئاشکرایە, لەڕۆمدا ئەو دوو منداڵەی خاتونەکەی من لەئەنتوانی ببون بەحەرامزادەیان ناودەبردن, بەڵام لەخۆرهەڵاتدا وانەبوو، چونکە لەوڵاتەکانی خۆرهەڵاتدا بوونی چەند ژنی باوبوو, پیاوێك دەیتوانی چەند ژنێ بهێنێت وهەموو ئەو منداڵانەی لەوژنانە دەبوون منالی حەڵاڵزادەن ودەتوانن ببنە خاوەنی هەموو مافێکی یاسایی, ئێمە وەرزی زستانمان لەسوریادا بەسەربردو ئامۆژگاریەکانی خاتونەکەی من کاریگەریان لەسەر ئەنتوان مابوو ئەنتوان خۆی بۆشەڕ ئامادەکرد, لەکەژی زستاندا ئەتوان سوپایەکی گەورەی پەرداخکردبوو کەتائەو ڕۆژگارەش هاوتای نەبوو ڕۆم سوپایەکی ئاوا زۆرو بەهێزی هەبوبێت, ژمارەی ئەو سوپایە گەیشتە سەد هەزار کەس کەشەست هەزاریان ڕۆمی بوو وچل هەزاریشیان لەنەتەوەی تربوون وئەفسەرەکانی ڕۆمی مەشقیان دادابوون, کاتێ هەواڵی ئەوسوپا بەهێزە گەیشتە وڵاتانی خۆرهەڵات, تەنانەت دانیشتوانی وڵاتی ( کوشان )(2)( کوشان-واتە ولاتێکبووە بەشێکی کەوتۆتە پاکستان وبەشەکەی تریشی لەئێراندابووە -و فارسی)

)نیش ترسان، چونکە پێشبینی ئەوەیان دەکرد ڕۆمیەکان هێرش بکەنە سەر وڵاتەکەی ئەوانیش .

-من لەخاتونەکەی خۆم پرسی سوپای ڕۆم لەکوێ شەڕدەکات ؟

-کلیۆپاترا گوتی: ئەم سوپایە لەگەڵ ئاشکانیەکاندا دەجەنگێت کەکەوتۆتە ئەرمەنستان.

-من ناوی ئەرمەنستانم بیستبوو وحەزم نەدەکرد بزانم کەوتۆتە چ لایەك, بەڵام ئەو ڕۆژەی ئەو سوپایە گەورەیە بۆشەڕ دەچوو بۆئەرمەنستان لەخاتونەکەی خۆم پرسی ئەرمەنستان کەوتۆتە کوێ و چ نەتەوەیەکن،

-کلیۆپاترا گوتی: ئەرمەستان وڵاتێکی گەورەیەو کەوتۆتە خۆرئاوای ئێران و خۆرهەڵاتی ئاسیای بچوك ودانیشتوانەکەی ئەرمەنین, ئەرمەنیەکان بەدووشت دەنازن- واتە شانازی دەکەن، یەکەم ئەوەیە دەڵێن هەموو میللەتەکانی تری دنیا، نووسینیان لەئێمەوە وەرگرتووەو ئەوانە نوسین وخوێندنەوەیان فێری نەتەوەکانی تری جیهان کردووە, دوەمیش ئەوەیە دەڵێن ئافرەتەکانی ئێمە جوانترین ئافرەتی دنیان.

پروپاگەندەی یەکەمیان بیرمەندەکانی ئێمە بەڕاستی نازانن ودەڵێن میسریەکان نوسین و خوێندنەوەیان داهێناوە, خەتی وێنەیی کەدواتر لەدنیاد بوویەباو داهێنانی میسریەکانە, بەڵام سەبارەت بەپروپاگەندەی دووەمیان تائاستێك ڕاستە چونکە ئافرەتانی ئەرمەنی زۆر جوانن.

-لیمپرسی بۆچی ئەنتوان بۆشەڕ دەچێت بۆئەرمەنستان ؟

-خاتونەکەی من گوتی: ئاشکانیەکان دەڵێن دەبێ ئەرمەنستان ببێتە بەشێك لەخاکی پاشایەتی ولاتی خۆیان, ڕۆمیش دەڵێن ئەرمەنستان بەشێکە لەخاکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم, ئەرمەنستان جارێ دەکەوێتە ژێر ڕکێفی ئاشکانیەکان وجارێکیش ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم.

-گوتم بێ گومان لەئەرمەنستاندا زێڕو زیو زۆرە بۆیە ڕۆمیەکان وئەشکانیەکان هەوڵدەدەن بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان

-کلیۆپاترا گوتی: لەوێدا زێڕو گەوهەرنییە.

-گوتم جا کەولاتێك زێڕو گەوهەری تێدانەبێت داگیرکردنی چ کەڵکێکی هەیە, ئایە باشترنییە ڕۆمی وئاشکانیەکان لێگەڕێن ئەرمەنستان سەربەخۆ بێت ولەشکرەکانی خۆیان پاشەکشە پێبکەن؟

-کلیۆپاترا گوتی: بەلام ئەرمەنستان کەوتۆتە پێگەیەکی واگرنگ هەرکاتێ ئێران بیەوێت هێرش بکاتە سەر ڕۆم ناچارە لەڕێگای ئەرمەنستانەوە تێپەڕێت, هەرکاتێکیش ڕۆمیەکان بیانەوێت هێرش بکەنەسەر ئێران ولەشکرکێشی بکەن هەردەبێ لەڕێگای ئەرمەنستانەوە بچن, بۆیە ئەرمەنستان لەو ڕۆژەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم وئێران دروستبوون هەمیشە ئەرمەنستان بۆتە جێگای مشتومڕی نێوان ئەو دووانەو جارێك ڕۆم هێرش دەکاتە سەری وجارێکیش ئێران, کەمێ دوای ئەم قسانەی من لەگەڵ کلیۆپاترادا سوپای ڕۆم کەوتەڕێ بەرەو ئەرمەنستان, چونکە کلیۆپاترا حەزی دەکرد تاسەر ڕووباری فرات لەگەڵ ئەنتواندابچێت, ئێمەش کەوتینەڕێ تالەگەڵ ئەنتواندا تاسەر ڕووباری فرات بچین, لەدواین شەو کەخاتونەکەی من لەسەر لێواری ڕووباری فرات لەگەڵ ئەنتواندا بەسەری برد, سەرداری ڕۆمی پلانی شەڕەکەی خۆی بۆخاتونەکەی من شیکردەوەو گوتی، من تا زستان بەسەرچوو چاوەڕوانبووم ودوای ئەوەی ئەرمەنستانم گرت ڕێگای ئاتروپاتن [1] دەگرمەبەر و شاری ( فەرهاد ئەسپ ) [2] (-فەرهاد ئەسپ- پایتەختی ئیمبراتۆریەتی ئاشکانییەکان بووە (و- فارسی))داگیردەکەم

# ئەنجامی جەنگی سەرداری ڕۆمی لەگەڵ ئێرانییەکانداو ڕۆڵی کلیۆپاترا لەسەرکەوتنی ئەودا

ئەنتوان نەخشەی ئەوەی کێشابوو وەیگوت بۆیە سەرەتا ئەرمەنستان داگیردەکەم ودواتر هێرش دەکەمەسەر ئازربایجان بۆئەوەی لەپشتەوەی خۆم نەترسێم و دڵنیابم لەپشتەوە هێرشم ناکەنەسەرو دوایئەوە بەرەو شاری فەرهاد ئەسپ دەکەومە ڕێ,

-کلیۆپاتر گوتی: ئەگەر تۆشاری فەرهاد ئەسپ داگیربکەیت وبەسەرکەوتویی لەئازربایجان بگەڕێیتەوە ئەوا میللەتی ڕۆم تۆلە سیزار گەورەتر لەقەڵەمدەدەن وئیتر کەس لەڕۆمدا ناتوانێت ببێتە ڕکەبەرت, پێتدەڵێم کلیلی سەرکەوتنی تۆ لەجەنگدایە، بەڵام من ئەمشەو وەسێتت لێدەکەم لەشەرکردنت لەگەڵ ئێرانیەکاندا ئاگادار بە:ئایا تۆ زانیاریت لەسەر مێژوو هەیە ؟

-ئەنتوان گوتی نا،

-خاتونەکەی من لێی پرسی, ئایا ئاگات لەمێژووی شازدە ساڵی ڕابردووش نییە؟

-ئەنتوان گوتی: شازدە ساڵی ڕابردوو ئەوەندە دوورنییە تامن زانیاریم لەسەری نەبێت.

-کلیۆپاترا گوتی: من ئافرەتم ئافرەتیش شارەزایی لەهونەری شەڕدانییە، بەڵام چونکە شاژن و دەسەڵاتدارم پلەوپایەکەم ناچارمدەکات سەبارەت بەشەڕو نەخشەکانی شەڕ زانیاریم هەبێت.

-ئەنتوان گوتی مەستت چیە؟

-خاتونەکەی من گوتی: من دەمەوێت باسی شەڕی ( کراسوس )ت بۆبکەم لەئێراندا, کاتێ کراسوس ویستی هێرش بکاتەسەر ئێران پێیوابوو داگیرکردنی ئەو وڵاتە ئاسانە, شازدە ساڵ لەمەوبەر هێرشی کردەسەر ئێران بێئەوەی کەرەستەو پێداویستی تەواوی ئامادەکردبێت بۆ هێرشکردنەسەر ئاشکانیەکان.

-ئەنتوان گوتی: کراسوس سواری جەنگی کەمبوون بەڵام من جەنگاوەری سوارچاك و چاپوکم زۆرن , کراسوس تەنها هەشت هەزار سەربازی سواری هەبوون, لەکاتێکا من خاوەنی چل هەزار سواری جەنگیم.

-خاتونەکەی من گوت کراسوس بەمانۆڕی ئاشکانیەکان فریوی خوارد.

-ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا لێمگەڕێ بامن بۆت باسبکەم بۆچی کراسوس لەشەڕ لەگەڵ ئێرانیەکاندا تێشکاو خۆی و دوو کوڕەکەی بەکوشت چوون وپەیکەرەکانی ئێمە کەوتە دەست ئێرانیەکان .

کراسوس سەرەتا وڵاتی نێوان دوو ڕووباریگرت، دواتر کەبەرەو ئێران کشا, سوپای ئێران بە فەرماندەی سورنا ڕووبەڕووی سوپای کراسوس بۆوە, تۆ کلیۆپاترا ئەوکات مێرد منداڵبووی لەوانەیە بیرتنەیەت کەپاشای ئێرانی ئەوکات ناوی ( ئارود- ی دووەم بوو ) ئەو پاشایە سورنایای خۆشنەدەویست چونکە پیاوێکی دلێربوو ولێیدەترسا, ئاشکانیەکان مانۆڕێکی (1) سەربازیان سازکرد بەناوی قیقاج, سوارە جەنگییەکانی ئاشکانیەکان لەمەیدانی شەڕدا وایان نیشاندەدا دەترسن وئاوساری ئەسپەکانیان توند

دەکردوو بەرەو دواوە هەڵدەهاتن, بۆئەوەی دوژمن بەدوایان بکەوێت و هەرکە زانیان دوژمن بەدواوەیانەوەیە بێ ئەوەی زووی ئەسپەکانیان وەرگێڕنەوە لەحاڵەتی هەڵاتندا ڕوویان وەردەگێڕا وتیربارانی دوای خۆیان دەکردو دەیانکوشتن, کراسوسیش بێئاگابوو لەنەخشەو پلانی دوژمن و فەرمانیدا سوارەکانی خۆی بەدوایان بکەون, ئەوانیش لەکاتی ڕاکردندا لەسەر ئەسپەکانیان وەردەچەرخان و بەتیر سوارەکانی ڕۆمیان دەکوشتن, تائێرانیەکان دڵنیابوون لەوەی کراسوس سواری جەنگی نەماون, ئینجا هێرشیان کردەسەر سەربازە پیادەکانی ئێمەو هەندێکیان لێکوشتن وئەوانیتریان دەستگیرکردن وکراسوس و دوو کوڕەکەشیان کوشتن، سورنا فەرمانیدا سەرو دەستی ئەوانە بڕن و بۆ پاشای بنێرن, بەڵام کاتێ سورنا لەشەڕی دژبە کراسوس سەرکەوت، لەبری ئەوەی پاشای ئێران ( ئارود-ی دووەم ) خەڵاتی بکات, بەفەرمانی ئەو سورنایان کوشت, چونکە پاشا دوای سەرکەوتنی سورنا زیاتر لەئەو ترساو لەوەسڵیدەکردەوە سورنا لەسەرتەختی پاشایەتی لایببات. بەڵام من هەڵەی کراسوس ناکەم و فریوی سوارە سەربازیەکانی ئێرانی ناخۆم, من کاتێ بینیم سوارەکای ئێرانی ڕادەکەن لێیان دەگەڕێم چەند دەیانەوێت بابۆخۆیان ڕابکەن و دووربکەونەوە، کراسوس کەشازدە ساڵ لەمەوبەر هێرشی کردەسەر ئێران هیچ ئامانجێکی نەبوو ونەیدەزانی پێویستە کام شاری ئێران داگیربکات, بەڵام ئامانجی من لەوشەڕەی لەپێشمەوەیە ئاشکرایە دەمەوێت دوای داگیرکردنی ئەرمەسنتان شاری ( فەرهاد ئەسپ )ی ئازەربایجان داگیربکەم.

-خاتونەکەی من گوتی: ئەنتوان هیوای سەرکەوتنت بۆدەخوازم و ئومێدەوارم بەسەرکەوتویی بۆم بگەڕێییتەوە.

-ئەنتوان گوی: ئێران خەزنەی گەورەی دنیایە ئەو زێڕوخشڵەی لەئێراندا هەیە لەهی هەموو دنیا زیاترە, من چەند زێڕوخشڵم لەئێراندا دەستبکەوێت خاکی ئێران جێنایەڵم, بۆئەوەی تۆڵەی تێکشکانی کراسوس بکەمەوە هەزاران ئێرانی بەدیل دەگرم و زۆربەیان دەنێرم بۆڕۆم تاوەك کۆیلەکان کاربکەن و هەندێکیش لەوکۆیلانە بەتۆ دەبەخشم تالەمیسردا کاریانپێبکەیت .

-کلیۆپاترا گوتی: ئەنتوان ئەگەر تۆ بەشێك لەزێڕو زیوی ئێران بەمن بدەی باشترەلەوەی ئەو دیلانەم بدەیتێ، چونکە من لەمیسردا زۆرم خزمەتکارو دەستوپێوەندم هەن, من بۆیە حەزدەکەم وڵاتانی تر داگیربکرێن تابتوانم زێڕوزیو وپارەو سامانی ئەو وڵاتانەم دەستبکەوێت, نەك دانشتوانی ئەو ولتە ببەم بۆمیسر و وڵاتەکەی خۆم توشی کەمبونی خۆراك بکەم، چونکە لەمیسردا تەنها ئەو زەویانەی لەسەر ڕۆخی نیلن بۆ کشتوکاڵ دەشێت, ئەگەر دانیشتوانی وڵاتەکەی من زیادبکەن دووچاری کەمی خۆراك دەبنەوە.

-ئەنتوان گوتی: زۆر باشە کلیۆپاترا, من زێڕو زیوی ئێران بەتۆ دەدەم ودیلەکانی ئەو وڵاتەش بەسەر ئەشراف و دەوڵەمەندەکانی ڕۆمدا دابەشدەکەم بۆئەوەی کاریان بۆبکەن.

- بەیانی ڕۆژی دواتر ئەنتوان بەخۆیی وسوپایەکەیەوە ڕێگای ئەرمەنستانی گرتەبەرو خاتونەکەی منیش بەرەو میسر گەڕایەوە, ئیتر لێرەودوا هەفتەیەك بەسەرنەدەچوو کە پەیامێك لەلایەن ئەنتوانەوە بۆکلیۆپاترا نەنێردرێت, ئەنتوان بەوردی هەواڵەکانی شەڕو حاڵی خۆی بۆکلیۆپاترا دەنووسی,

کلۆپاتراش ئەوەی لەونامانەدا دەنووسرا بۆمنی دەخوێندەوەو زانیم ئەنتوان بەبێ کێشە ئەرمەنستانی داگیرکردووەو پاشای ئەرمەنستان ملکەچی ئەنتوان بووەو ڕازی بووە زێرو زیوی خۆی بەئەنتوان بدات بۆ ئەوەی لەسەرتەختی پاشایەتی لاینەبات, ئەنتوان لەنامەکانی خۆیدا, بەخاتونەکەی منی ڕاگەیاند، چونکە بۆگرتنی شاری فەرهاد ئەسپ پێویستی بەعەرەبانەی فەلاقە هاوێژ هەبووەو ئەو عەرەبانانەشی لەئەرمەنستاندا بەکردنداوە تابۆی دروستبکەن بۆ ئەوەی دوای ئەوەی گەیشتە ئازەربایجان پەکی لەسەر ئەوعارەبانە جەنگییانە نەکەوێت و ئەو عارەبانانەی بەدروستکردنێشی ئەداون نزیکەی (80) ئانیشك درێژن, نامەیەکی تر کەئەنتوان بۆخاتونەکەی منی ناردو تێیدا باسی ئەوەدەکات شارێکانی ئازەربایجان جیاوازی هەیە لەگەڵ شارێکانی ڕۆم, ناتوانرێت عارەبانەیەکی گەورەی جەنگی بەسەریاندا تێپەڕێت, بۆیە عەرەبانەکانی خۆم جێدەهێڵم وبەبێ ئەو عەزەبانە زلوگرانانە بەرەو شاری فەرهاد ئەسپ هێرش دەبەم, دوایین نامە کەئەنتوان بۆ خاتونەکەی منی نارد ئەوکاتەبوو گەمارۆی شاری ( فەرهاد ئەسپ )ی دابوو و لەو نامەیەدا نووسیبوی, ئیستا تەختی پاشایەتی ئازەربایجانم گەمارۆداوە,( فەرهاد-ی چوارەم ) پاشای ئاشکانی و خاو وخێزانەکەی لەناو فەرهاد ئەسپدان وبڕیارمداوە هەموو ئەندامانی خێزانەکەی دەستگیربکەم ولەگەڵخۆمدا بیانبەم بۆ ڕۆم بۆئەوەی سەرکەوتویی ومەزنی من لای دانیشتوانی ڕۆم دەرکەوێت و ڕۆمیەکان بزانن من تۆڵەی تێشکانی کراسوسم لەئێرانیەکان کردۆتەوە ,

- دوای ئەو نامەیە هیچ پەیامێکی تر لەئەنتوانەوە بۆخاتونەکەی من نەهات, کلیۆپاترا بە منی گوت شرمیون من پێشبینی ئەوە دەکەم پێشهاتێکی نالەبار توشی ئەنتوان بوبێت، بۆیە نامەم بۆنانوسێت, چونکە نوسینی نامە سەبارەت بەئەنتوان ئەوەندە ئەزیەتی نییە ئەو نامەکان بۆخۆی نانوسێت بەڵکو میزایەکی تایبەتی بەخۆی بۆی دەنوسێت, دیارە تاماوەیەك لەمەوبەریش هەلومەرجەکە بەکەیفی ئەنتوان بووەو ئەو بەباشکاتبەکەی خۆی گوتووە نامەم بۆکلیۆپاترا بۆبنووسەو بەپۆست بۆسوریای دەناردو لەوێوە بە ڕێگای کەشتی دەگەیشتە میسر, بەڵام نەهاتنی نامە ئەوەدەگەیەنێت ئەنتوان گرفتار بووە- یان بارودۆخی جەنگی ئەو بەشێوەیەك ناهەمواروخراپبووە بواری ئەوەی نییە بەباشکاتبەکەی بڵێت نامەیەکم بۆکلیۆپاترا بۆبنووسە, بەشێوەیەك خاتونەکەی من لە نەهاتنی نامە لەلایەن ئەنتوانەوە هەراسانبوو تانامەیەکی بۆحوکمڕانی سوریا ناردوو پێی ڕاگەیاند دەستبەجێ لەسەلامەتی ئەنتوان ئاگادارم بکاتەوە, خاتونەکەی من گوتی شرمیون,پێموابێ ئەنتوان تێکشکاوە چونکە ئەگەر شاری فەرهاد ئەسپی گرتبا بەدلنیاییەوە مژدەی سەرکەوتنی بەنامە بەمن ڕادەگەیاند, بەڵکەنەویستیشە دەبوا حکومەی ڕۆم لەسەرکەوتنی ئەو ئاگاداربا کەئەنتوان شاری فەرهاد ئەسپی گرتووەو فەرهادی پاشای چوارەم وخێزانەکەشی دەستگیرکردوون،

- بێ هەواڵبونی ئەنتوان ماوەیەك درێژەی کێشا سەرئەنجام خاتونەکەی من لەڕێگای ئەو جاسوسانەی کەلەڕۆمدا هەیبون زانی ئەنتوانیش وەك کراسوس لەبەرامبەر ئێرانیەکاندا شکستی خواردووە, بەو جیاوازیەی کراسوس پێی داگرتبووەو هەڵنەهاتبوو، بەڵام ئەنتوان بەڕێگای ناوەندی ئازەربایجاندا پاشەکشەی کردووەو زیاتر لەهەڵاتن چووە نەك پاشەکشەکردن, ئەنتوان کەدەیگوت وەك

کراسوس فریوی سوارە سەربازیەکان ناخۆم، بەشێوەیەکی تر فریودراوەو ناچاربووە پاشەکشەبکات، ئەو کەسەی کەلەلایەن کلیۆپاتراوە نێردرا بۆئەوەی بەدوای سۆراخی ئەنتوان بکەوێت هەواڵی ئەو بۆئەم بێنێتەوە، مێردەکەی من بوو (تیە) بۆیەش تیەی هەڵبژارد چونکە جێگای متمانەی ئەوبوو، پێشئەوەی مێردەکەم بکەوێتە ڕێ خاتونەکەی من پێی گوت من بۆیە تۆ دەنێرم تالەحاڵ وئەحواڵی ئەنتوان ئاگاداربیت وبزانیت ئەنتوان لە ئازەربایجاندا چی لێبەسەرهاتووە، من نامەوێت پروپاگەندەو هەواڵی گوماناویشم بۆ بێنی خۆلەمیسریشدا پروپاگەندە هەن، من حەزدەکەم تۆ بۆئەوە بچیت لەئازەربایجاندا لەو کەسانە بکۆڵیتەوە کەئاگایان لەڕووداوەکانی شەڕبووەو ئەو هەواڵە دروستانە بە زویی بۆمن بهێنەوە تابزانم ئەنتوان لەئازەربایجاندا چی بەسەرهاتووە؟ ئەگەر نەشتتوانی بچیت بۆ ئازەربایجان ئەوا لەئاسیای بچوکدا بەتایبەت لەئەرمەنستاندا بە دوای هەواڵی ئەنتواندا بگەڕێ، من پەیوەندی ڕاستەوخۆم لەگەڵ( ئاردواتز )ی پاشای ئەرمەنستاندانیەو ئەو من ناناسێت بەڵام فەرمانڕەوای سوریا پەیوەندی لەگەڵ پاشای ئەرمەنستاندا هەیەو من نامەیەك بۆئەو دەنوسم تائەویش بۆپاشای ئەرمەنستان وەڵامێك بنێرێت و تۆش هەواڵەکان یەك لەدوای یەك بەپۆستدا بنێرێت نەك چاوەڕوانبکەی تاهەموو هەواڵەکان کۆدەکەیتەوەو ئینجا بێیتەوە.

- تیەی مێردم، دوای تێگەیشتنی لەمەبەستەکانی کلیۆپاتراو وەرگرتنی نامەیەك لەلایەن شازادەی میسرەوە بۆفەرمانڕەوای سوریا بەکەشتیەکی تیژڕەو کەوتەڕێ، یەکەم نامەی تیە بەڕێگای پۆستی حکومی گەیشتە دەستی خاتونەکەی من و لەونامەیەدا- تیە گوتبووی من تائیستا نەمتوانیوە کەسانێك پەیدابکەم کەئاگایان لەڕووداوەکانی شەڕی ئازەربایجان بوبێت، ئەوەی ئاشکرایە ئەنتوان لەئازەربایجاندا تێکشکاوە، بەڵام لێرە کەس نازانێت ئیستا ئەنتوان لەکوێدایەو منیش بۆ زانینی ئەمە بەرەوئاسیای بچوك و ئەرمەنستان دەڕۆم، نامەی دووەمی تیەی مێردم بەماوەیەکی کەم دوای نامەی یەکەمی گەیشتە دەستی خاتونەکەم، لەونامەیەدا کەلە ئەرمەنستانەوە ناردبووی گوتبووی ئەنتوان لەشاری فەرهاد ئەسپدا تێشکاوەو پاشەکشەی کردووە، بەڵام بەرەو سەرو پاشەکشەی نەکردووە وەك لێرە باسدەکەن بەرەو ڕووباری ئاراس پاشەکشەی کردووە، منیش وەك خاتونەکەی خۆم جوگرافیام دەزانی و زانیاریم هەبوو کە ڕووباری ئاراس کەوتۆتە سەروی ئازەربایجان وسەرمان لەوەسوڕمابوو بۆچی ئەنتوان لەپاشەکشەکردنیدا بەرەو ڕووباری ئاراس کشاوەتەوە؟

- خاتونەکەی من گوتی بێ گومان دوای ئەوەی ئەنتوان لەشاری فەرهاد ئەسپدا تێشکاوە، نەیتوانیوە بەرەو خۆرئاوا پاشەکشەبکات و بەرەو ڕوباری دیجلە بپەڕێتەوەو خۆی بگەیەنێتەوە سوریاو ناچاربووە ڕێگای سەروو بگرێتەبەر، مێردەکەی من لەنامەکەیدا گوتبووی بۆ بەدواداچوون وزانینی هەواڵی ئەنتوان دەچمەسەر سنووری ئازەربایجان وئەگەر بۆمکرا دەچمە ئەو وڵاتەو لەهەواڵی ئەنتوان دەپرسم، سێیەمین نامەی تیەی مێردم، لەسەر سنووری ئازەربایجانەوە ناردبووی، زۆر دوورو درێژبوو ومن لێرەدا ناتوانم دەقەکەی بگێڕمەوە بەڵام تەنها خاڵەگرنگەکانی باسدەکەم، تیە ئاوا نامەکەی نوسیبوو: ئەی خوای جیهان ناوی ڕەسمی کلیۆپاترایە) لێرە ئەوەندە سەرمایە من لەو ڕۆژەوەی هاتومەتە ئەرمەنستان هیچ جۆرەگایەکم نەبینیوەو دەشتەکان پڕلە بەفرن وڕووبارو چۆم وجۆگاکان

بەستەڵەکن, کاتێ گەیشتمە سەر سنوری ئازەربایەنجان ئەنتوان لەوێبوو وکاتێ چاوم پێی کەوت ئەم ناسیەوە، ئەوەندە کزببوو دەتگوت جوتیارێکی میسرییە, زۆربەی ئەو سەربازانەی لەگەڵ ئەنتواندا گەیشتبوونە ئەرمەنستان نەخۆش کەوتبوون و ڕۆژانە هەندێك لەمانە دەمرن,من دەمتوانی بچمەلای ئەنتوان و پێی بڵێم لەلایەن خوای جیهانەوە هاتوم وئەوناردوومی بۆ هەواڵزانینی تۆ, بەلام وامپێباشتربوو خۆمی پێنەناسێنم, ئەو ئەنتوانەی کەمن بینیم زۆر جیاوازی لەگەڵ ئەنتوانەکەی میسردا هەبوو, من لەوە دەترسام خۆمی لائاشکرا بکەم وتوڕەبێت وفەرمانی کوشتنی من دەربکات، چونکە بارودۆخی ئەنتوان بە شێوەیەکە خراپە دڵنیام حەزناکات کەس بزانێت لە چ مەینەتیەکدایە ئەگەر حەزی کردبا کەسانیتربزانن حاڵی چۆنە- بۆ خۆی نامەی بۆنەدەناردن؟ من لەگەڵ ئەوسەربازو ئەفسەرانەی کەلە ئەرمەنستانەوە لەگەڵ ئەنتواندا گەڕاونەتەوە دواوم، بۆئەوەی بزانم لە ئازەربایجاندا چییان بەسەرهاتووە ئەمەی لەم نامەیەدا دەینوسم ئەو ڕاستیانەن کەلە ئازەربایەنجاندا ڕوویداوە.

- ئەنتوان پێشئەوەی شاری فەرهاد ئەسپ گەمارۆبدات, هەموو عارەبانە جەنگیەکانی و دە هەزار سەربازی لەپشتەوی خۆیدا جێهێشتبوون، چونکە نەیتوانیوە ئەو عەرەبانانە بەسەر ڕێگاکانی ئازەربایەنجاندا ببات وبیانگەیەنێتە شاری فەرهاد ئەسپ, کاتێ ئەنتوان گەیشتۆتە شاری فەرهاد ئەسپ کۆتایی هاوین بووەو وەرزی پایز هاتووە, لە ئازەربانیجاندا زوو سەرمای زستان دێت, ئەمساڵیش بەتایبەتی زووتر لەساڵانی ڕابردوو زستان هاتووەو زۆر ساڵێکی ساردو سایەقەبووە.
- کاتێ ڕۆمیەکان شاری فەرهاد ئەسپیان ئابلۆقەداوە تێبینیانکردووە پانتایی شار ئەوەندە بەرفراوانە تەنها بەعەرەبانە جەنگیەکان نەبێت ناتوانرێت ئابلۆقەی تەواوبدرێت , بۆیە ئەنتوان فەرمانیداوە ئەو عەرەبانە جەنگیانە بەهەر شێوەیەکبێت دەبێ بهێندرێن تەنانەت ئەگەر بەپارچەپارچە کراویشبێت, کاتێ ئەو سەربازانەی چون بۆهێنانی عەرەبانە جەنگیەکانی پشتخۆیان سەیریانکردووە جگە لەدارە سوتاو ئاسنی ڕەش هەڵگەڕاو هیچی تری لێنەماوەو تەرمی ڕۆمیەکانیش لەوناوەدا کەوتوون, دیارە ئێرانیەکان زانیویانە ئەنتوان عەرەبانە جەنگیەکانی خۆی بە دە هەزار سەربازەوە لە پشتخۆیەوە جێهێشتوون وهێرشیان کردۆتە سەریان و زۆر لەسەربازەکانی ڕۆمیان کوشتون وهەندێکیشیان بەدیل گرتون و عەرەبانەو کەرەستەکانی جەنگیشیان سوتاندون, لەو ڕۆژەوەی ئەنتوان شاری فەرهاد ئەسپی گەمارۆداوە بەردەوام ئێرانیەکن هێرشیان کردۆتەسەر دەستەی ئیداری سوپا، تاوایلێهاتووە بۆ بەدەستهێنانی خۆراك ئەنتوان دوو هەزار کەسی ناردوون بۆ لادێو شارۆچکەکان تاخۆراك بۆسوپای ڕۆم بهێنن, بەلام ئێرانییەکان هێرشیان کردۆتەسەر ئەودەستە دوو هەزار سەربازیانەش ونەیانهێشتووە ڕۆمیەکان خۆراك وئالیکی تەواویان دەستبکەوێت, پەیداکردنی خۆراك وتفاق بۆتە کێشەیەکی گەورە بەتایبەت چونکە ژمارەی سواران زۆربوون و ئەو سوپا مەزنەی ئەنتوان پێویستی بەخۆراك وئالیکی زۆر بووە, ئەنتوان پێیوابوو وەرزی پایزی ئازەربایەنجان وەك پایزی ڕۆم درێژە ناکێشێت, بەلام کەبەیانیەك لەخەو هەڵدەستێت تەماشا دەکات تازە سەرمای زستانێکی سەخت دەستپێدەکات, فەرماندەی سوپای ڕۆم پێشنیاری بۆپاشای فەرهاد ئەسپ کردووەو گوتویەتی چ زێڕو زیو هەیە بۆمبنێرە تامنیش لەبەرامبەردا پاشەکشە بەسوپاکەم بکەم, فەرهادی چوارەمیش پاشای

ئازەربایـنجان وەڵامی ئەنتوانی داوەتەوەو گوتویەتی ئێمە قەت باجمان نەداوە بەڕۆم و هیچ کاتێکیش باج نادەین، ئەنتوان پەیامێکیتری بۆپاشای ئازەربایـنجان ناردووەو گوتویەتی دوای ئەوەی ئەم شارەم داگیرکرد ئەوا وەك تاوانباران لەخاچت دەدەم، فەرهادی چوارەمیش لەوەڵامدا گوتویەتی ئەنتوان دەبێ تۆئاواتی گرتنی شاری فەرهاد ئەسپ ببەیتە گۆڕەوە، سەرئەنجام ئەنتوان لەبرسان ونەبونی ئالیك وخۆراك وسەرما کۆتایی بەگەمارۆدانی فەرهاد ئەسپ هێناوەو گەڕایەوەتەوە دواوە، ئەنتوان دەیویست خۆی بگەیەنێتە سوپای سوریا، بەڵام بۆی دەرکەوت کەلەشکرێکی سوپای ئێرانی لەسەر ڕێگایدان، بۆیە بڕیاریدا لەڕێگای سەرووەوە پاشەکشەبکات وخۆی بگەیێنێتە ئەرمەنستان، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ئێرانیـەکان شـەو و ڕۆژ هێرشـیان کردوتەسـەر سـوپای ڕۆم وبـەجۆرێك دنیایـان لەڕۆمیـەکان وێکهێناوەتـەوە تەنانـەت نـەیانتوانیوە بـۆ پەیـداکردنی خـۆراك وئـالیکی ئەسپەکانیان بچن بـۆ لادێ و ئاواییەکانیش، ئەمە جگە لەوەی هەموو لایەکیش بەفر دایپۆشیوە، سوپای گەورەی ئەنتوان بەبرسیەتی مابۆوەو ئیتر ڕۆمیەکان لەبرساندا ئەسپەکانی خۆیان دەکوشتن وگۆشتەکەیان دەخوارد، زۆر جار دوای ڕۆژێك ڕۆیشتن دەگەیشتنە لادێیـەك کەداروردەختی لێنـەبووەو سوپاکە ناچاربووە بەرگـەی سـەرمای شەوی زستانی ئەوێ بگرێت، هەر شەوەی سوپای ئەنتوان لەشوێنێکدا مابایەوە، چونکە داروردەختی لێنەبوە تابیسوتێنن، بەرەبەیانی کۆمەڵێ سەرباز لە سەرماندا ڕەقبوونـەوە، هەنـدێ لەسـەربازانی ڕۆمی دەسـتوپێیان بەسـەرما چـوبون و دوای ماوەیـەك بەشـێوەیەکی ڕەزیلـی ومـەلولی دەمـردن، جگـە لەمـە سـەربازەکانی ڕۆمـی توشـی دوو نخۆشـی بـوون، یـەکێکیان ڕەوانـی و ئـەوی تریـان تـابووە کەهەنـدێ لـە سەربازەکانی ڕۆمی بەم نەخۆشیە مردوون، تەنانەت خودی ئەنتوانیش توشی نەخۆشی ڕەوانی بووەو خـوێنی دادەنـا، پزیـشکەکانی سـوپای ڕۆمـی نەیانـدەتوانی نەخۆشـەکان چارەسـەربکەن چـونکە نـەدەرمانیان هـەبوو نـەخۆراك ونەشوێنێك کەتێیدا بتوانن نەخۆشـەکانی تێدا دابنێن، دوای گەڕانەوەی ئەنتوان لەشاری فەرهاد ئەسپ یەکەم شاری کەگەیشتێ ناوی میانە بوو وئەنتوان ویستی لەوشارەدا بوەستێت، بەڵام فشاری سوپای ئێرانی نەیهێشت ئەوان لەشاری میانەدا پشووبدەن، دواتر سوپای ڕۆم بەچەند شارێکی تردا تێپەڕی ونەخۆش پەککەوتەکانیان لەوێدا جێهێشتن.

- ئەو کەسانەی کەدەبوا لەوشـارانەدا جێبهێڵدرێن داوایـان لـەبرادەرە سـەربازەکانی خۆیـان دەکـرد بیـانکوژن تانەکەونەدەسـت دوژمـن، هەنـدێ لەوانـە خۆبـەخۆ یـەکتریان دەکوشـت بـۆ ئـەوەی بـەدیلی نەکەونەدەسـت ئاشـکانیەکان، کاتێـك ئـەنتوان گەیـشتە شـاری ( تـاپ رزی)(1) ( لـەوە دەچـێت شـاری تـەوریێی ئـەمڕۆ بوویێـت، و فارسـی)یـێ وابـوو ئـیتر دەتوانێـت لەوشـارەدا پـشووبدات بـەڵام دووبـارە ئێرانیـەکان هێرشـیان کردنەوەسـەر و نەیانهێـشت لەوێـشدا بگیرسـێنەوەو ناچـاریانکردوون هـەڵێن و سـەرئەنجام ئـەنتوان بـەخۆیی وپاشمـاوەی سـوپاکەیەوە خـۆی گەیاندۆتـەوە ئەرمەنـستان، ئیـستاش ئـەنتوان وسـوپاکەی بەشـێوەیەك شـەکەت ومانـدوون لەوانەیـە نـەتوانن بـەم زوانـە بگەڕێنـەوە، منـیش تائەنتوان لێرەبێت دەمێنمەوە تائیستا نازانم چەند سەرباز لە سوپاکەی ئەنتوان کوژراون- یـان بەهۆی نەخۆشی وسەرماو برسیەتییەوە مـردوون، بـەڵام بەمەزەندەکردن نزیکەی نیوەی سوپاکەی تێداچووەو جلوبەرگ و کەرەستەی سەربازیو چەکەکانی سەربازانی ڕۆمی تەواو شڕودڕو بێکەڵکبوون، ئەمە دوایـن

نامەی تیەی مێردم بوو کەبۆ کلیۆپاترای نارد چونکە دوای ئەمە ئەنتوان خۆی نامەی بۆ خاتونەکەی من ناردو داوای لێکردبوو بێت بۆلای، لێرەو دوا من(1) (من شرمیون مەبەستی لەخۆیەتی) ڕووداوەکان لەسەر زمانی ئەنتوان دەگێڕمەوە وەك بیستومن، ئەنتوان دەیویست لەئەرمەنستانەوە بێتەوە بۆسوریا، چونکە لەئەرمەنستانیشدا مەترسی لەسەربوو.

- پاشای ئەرمەنستان کەناوی ( ئارداوتز ) بوو بەچاوی بوغزەوە سەیری ئەنتوان و ڕۆمیەکانی دەکرد چونکە دەیزانی سەرداری ڕۆمی لەبەرامبەر ئێرانیەکاندا تێشکاوەو بەهەڵاتویی هاتۆتەوە ئەرمەنستان، ئەگەری ئەوەی هەبوو هەوڵی کوشتنی بدات و سەربازەکانیشی تەفروتونابکات، بۆیە ئەنتوان دەیویست هەرچی زووترە لە ئەرمەنستان بچێتەدەرێ و خۆی بگەیەنێتە سوریا، بەڵام بۆگەیشتن بەسوریا دەبوایە کێوەکانی توروس ببڕێت کەکەوتبوونە نێوان ئەرمەنستان وسوریا، زستانان تێپەڕین و بەکێوەکانی توروسدا دژواربوو، ئەنتوان کەلە سوریادا بۆخاتونەکەی منی دەگێڕایەوە، گوتی: کاتێ بەکەل ونشێوی ڕێگاکانی توروسدا تێدەپەڕین ئەوەندە ساردبوو هەر سەربازێکی ڕۆمی بکەوتبا هاوەڵەکانی نەیاندەتوانی ڕاستی بکەنەوەو دەمرد، چونکە پاش دوو دەقیقە ڕەقدەبۆوە.
- بەپێی قسەی ئەنتوان- بێت لەو ڕۆژەی سەربازانی ڕۆمی کەوتونەتە دامەنی کێوەکانی توروس

(1) (تورس ، زنجیرە چیایەکە دەکەوێتە نێوان سنووری ئەرمەنستان وتورکیا، و- فارسی)یەك دنکە گەنم وکەوچکە ڕۆنێکی زەیتونیان نەخواردووە تەنها گۆشتی ئەسپەکانیان خواردووە، کاتێ ئەنتوان گەیشتۆتە ئازەربایجان جگەلە ئەسپی عەرەبانەکان سوپاکەی چل هەزار سەربازی سواری تێدابوو، بەڵام کاتێ گەیشتەوە سوریا یەك سەربازی سوار لەناو سوپاکەیدا نەدەبینرا، ئەوناوچەی کەسوپای ئەنتوانی پێداتێدەپەڕی داروددرەختی تێدانەبوون تەنها ئەوکاتانە نەبێت کەتوشی ئاواییەك دەبوون و دارو درەختەکانیان دەسوتاند- یان دارەڕای بانی کۆخ و هەوارە کۆن و لادێکانیان دەردەهێنان وئاگریان تێبەردەدان تاخۆیانی پێگەرم بکەنەوە، لەهەندێك شوێندا دانیشتوانی ئەو ئاوەدانیانە هەڵدەهاتن وخۆیان دەگەیاندە شوێنێك کەسوپای ڕۆمیەکان دەستیان نەدەگەیشتێ، لەهەندێ ناوچەی تریشدا دانیشتوانی ئەودێیانە بەرەنگاری سوپای ڕۆم دەبونەوەو نەیاندەهێشت ڕۆمیەکان دەستبەسەر خواردنی ئەواندا بگرن وبانی خانوەکانیان بۆسوتاندن هەڵبوەشێنن، لەهەندێ لەو ناوچانەدا شەڕی دژوار لەنێوان سوپای ڕۆمی و دانیشتوانی ئەو گوندانەدا ڕووی دەداو بێبەزەییانە یەکتریان کشتوکوشتاردەکرد، کوشتنی ئەو دێ نشینانە بەلای سوپای ڕۆمەوە کێشەنەبوو بەڵکو ئەی گرفتی بۆسوپای ئەنتوان دروستکردبوو ئەوەبوو ئەو دێ نیشنانە بەدوای ڕۆمیەکان دەکەوتن تاتۆڵەیان لێبکەنەوە بۆیە دەبوا سوپای ڕۆم شەوو ڕۆژ لەحاڵەتی ئامادەباشی دابا، ئەنتوان بەخاتونەکەی منی گوت حاڵی من لەهی سەربازەکانم باشترنەبوو، دوای ئەوەی ئەسپەکان تۆپین منیش ناچاربووم بەپێ بکەومە ڕێ ولەسەرماندا هەڵبلەرزم، ئەوەندە سەرماو سۆڵەم بینی پێموانەبوو ڕزگارم دەبێت و دەمگوت دۆڵەکانی توروس دەبنەگۆڕی من، تائەوکاتەی بەستەڵەك وبەفربوو باشتربوو چونکە ژێر پێکانمان لەسەر بەفرو بەستەڵەکدا وشکبوو، بەڵام کاتێ وەرزی بەهارهات و بەفرەکە دەستیکرد بەتوانەوەو چۆم

وجۆگاکان ئاویان پێداتێپەڕیو بەفر بڵبوو، ئیتر پێی سەربازەکان تەڕدەبوو و دواتر دەیبەست، نزیکەی دە هەزار سەربازی ڕۆمی لە کێوەکانی توروسدا لەبرسان وسەرماندا مردن.

- ئەنتوان لەکەڕژی بەهاردا بەخۆیی وکۆمەڵی سەربازی جلوبەرگ شڕودڕو نەخۆش و شەکەت گەیشتەوە سوریا، دابی سەربازی وابو دوای گەڕانەوە لەهەر شەڕێك تالان و دەستکەوتەکان بەسەر سەربازەکاندا دابەش بکرێت وهەریەکەی کەمێکی بدرێتێ، بەلام ئەنتوان تەنانەت نەیدەتوانی موچەکەشیان کەماوەیەکی زۆری بەسەرداتێپەڕیبوو بداتێ، دوای ئەوەی ئەنتوان گەیشتەوە سوریا، یەکەم کاری کەئەنجامیدا ئەوەبوو نامەیەکی بۆخاتونەکەی من ناردو داوایلێکرد بێت بۆلای بۆسوریا، کلیۆپاترا ناوەڕۆکی نامەکەی بۆمن خوێندەوەو منیش بەپێی شێوازی نوسینی ئەونامەیە بۆم دەرکەوت کە ئەنتوان حاڵی پەرێشانە، ئەنتوان وەك لەمەوبەر باسمکرد کەسێکی خاوەن زانیاری نەبوو وچاکەکارو مهرەبان نەبوو، وەك خەڵکی ئاسایی کاتێ پلەوپایەی بەدەست هێنا لەخۆی بایی دەبوو ونازی بەسەر خەڵکانی تردادەکرد، ئەویش واتە ئەنتوان تەنانەت نازومنەتی بەسەر خاتونەکەی منیشدادەکرد، بەلام لەونامەیەدا هەرچەندە داوای لە کلیۆپاترا کردبوو بێت بۆلای، بەلام ناوەڕۆکی نامەکەو شێوازی نوسینەکەی ئەوەی ئاشکرادەکرد باری لاسەنگە، چونکە بەشێکی نامەکەی بەمشێوەیە نوسیبوو، ئەی شاژنی جوان وخوای دنیا، هیچ کاتێ وەك ئەمڕۆ خۆم بەمەجبورو پێویستبوون بەتۆ نەبینیوەو تەنها تۆدەتوانیت لەم ڕۆژە بەدبەختەم ڕزگاربکەی من لەمڕۆوە کەئەم نامەیەت بۆدەنووسم، چاو دەبڕمە دەریا تابزانم کەی کەشتیەکانی تۆ دەردەکەون و خۆری شادمانی من هەڵدێت، دوای ئەوەی کلیۆپاترا نامەکەی خوێندەوە، بڕیاریدا بچێت بۆسوریا، تاهەندێ خاکی تری لەئەنتوان دەستبکەوێت، ئەو دەیزانی عاشقەکەی خۆی پیاوێکی بەتواناو لەخۆبردوو نییەو ئەستێرەی بەختی ئەو کزبووەو دوورنییە بکوژێتەوە، بەلام ئەنتوان فەرمانڕەوای ڕەهای ولاتانی خۆرهەلاتی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بوو لەمانەش سوریاو فەلەستین، بۆیە خاتونەکەی من دەیتوانی جارێکی تریش هەندێ خاکی ولاتانی تری ژێر دەسەلاتداریەتی ئەو لەئەنتوان وەربگرێت و بیخاتەسەر خاکی میسر، ئەنتوان لەنامەکەی خۆیدا نوسیبووی، ڕۆژانە لەپرشنگی بەیانەوە تاخۆر ئاوابوون لەدەم دەریا لەچاوەڕوانی کەشتیەکانی تۆدام و کاتێ خۆر ئاوادەبێت بەرەو مالەکەم دەگەڕێمەوە ئەوەندە شەراب دەخۆمەوە کە لەمەستیاندا تاڕۆژی دواتر بەهۆش خۆم نایەمەوە، ئەنتوان گفتی بەسەربازەکانی خۆی دابوو دوای هاتنی کلیۆپاترا بۆسوریا موچەکانیان بداتێ، سەربازەکانیشی وەك فەرماندەکەیان چاویان بڕیبوو دەریا تابزانن کەی کەشتیەکانی کلیۆپاترا بەدیاردەکەون، لەوسەفەرەدا خاتونەکەی من، بۆئەوەی زوتر بگاتە سوریا بەکەشتیە گەورەکەی خۆی نەڕۆیی، بەڵکو بەکەشتی بچوکی تیژڕەوی جەنگی ڕێگای سوریای گرتەبەرو لە بەندەرێکی بچوکی( لوکوکوم )ی سەروی شاری سەیدادا بەئەنتوان گەیشت.

- کاتێ خاتونەکەی من لەکەشتیەکەی دابەزی ئەنتوان لەبەرامبەر خاتونەکەی مندا کەوتە سەرچۆکان، بەشێوەیەك ئەو ڕووداوە لەلایەن پیاوێکی وەك ئەنتوانەوە کلیۆپاترای ناڕەحەتکرد بەپەلە کلیۆپاترا هەڵی ساندەوە، لەڕۆژی یەکەمی گەیشتنی کلیۆپاترا بە بەندەری لوکولوم، ئەتوان لەسەر شەرەفی ئەو یەك خوانی گەورەی سازکردو لەو خوانەدا ئەنتوان ئەوەی لەدڵیدابوو نەیتوانی

بەخاتونەکەی منی بڵێ, چونکە دەورووبەریان قەڵەباڵغبوو, بەڵام شەوی دواتر ئەم دوانە بەتەنیا مانەوەو منیش وەك جاران خەریکی خواردن بووم, سەرداری ڕۆمی لەگەڵ خاتونەکەی مندا کەوتە گفتوگۆو گوتی, کلیۆپاترا من ئەمڕۆ پیاوێکی بەدبەختم وگەورەترین سوپا کەڕۆم دروستی کردووەو لەژێر فەرماندەی مندابەرەو ئازەربایجان ڕۆیشتم وبەشێوەیەك زەبرخواردوو بوو، تەنانەت دەتوانم بڵێم سوپام نەماوە مەگەر جارێکیتر سوپا دروستبکەمەوە, کەسایەتی وپێگەی من لەم لەشکرکێشیەدا زۆر زیانی پێگەیشت وبەئاشکراش دەبیندرێت, ئەوانەی کەتا دوێنێ کلکەسوتەو بەشان وباڵی منیاندا هەڵدەگوت ئەمڕۆ بەلامسەللایی وخێسەوە سەیرم دەکەن، چونکە دەزانن من پیاوە بەهێزو تواناکەی جاران نەماوم, تاکە کەسێك کەلەبەرامبەر مندا نەگۆڕاوەو ڕێزلە دۆستایەتی دەگرێت تۆی کەداواکاریەکەمنت قبوڵکردو لەمیسرەوە بۆئێرە هاتی, تۆش دەتتوانی من پتشگوێ بخەیت ونەیەیت بۆلام، بەڵام بەئەمەك بووی بۆئەم دۆستایەتیەمان, دۆستایەتی تۆش لەمڕۆدا بەهایەکەو گرنگە چونکە من گفتم بەسەربازەکانی خۆمداوە بەگەیشتنی تۆ موچەی مانگانەی خۆیان بدەمێ.

- —کلیۆپاترا گوتی: من پارەی زۆرم لەگەڵخۆمدا نەهێناوە، بەڵام ئەوەی پێمە دەتدەمێ تاموچەی چەند مانگی ڕابردووی سەربازەکانت بدەیت.
- —ئەنتوان گوتی: من لەم چەند ڕۆژی ڕابردوودا لەهاتنی تۆ نائومێدببوم و وامبیردەکردەوە تۆش وەك ئەوانیتر ڕووت لەمن وەرگێڕاوە, بۆیە فەرمانم بە فەرمانڕەوای سوریادا میرنشینەکانی ژێر دەسەڵاتداریتی خۆی بخاتە ژێر فشارەوە بۆ ئەوەی بڕێك پارەبدەن ومنیش موچەی سەربازەکانمی پێبدەم.
- —خاتونەکەی من گوتی: ئەو پارەیەی من لەگەڵخۆمدا هێناومە موچەی هەندێ سەربازی پێبدەو باقیەکەی تریش لەمیرنشینەکان بستێنە.
- —ئەنتوان گوتی: بەڵام من گفتم بەسەربازەکانی خۆمداوە هەرکە کلۆپاترا گەیشت هەمووتان موچەتان دەدەمێ و ناوی میرنشینەکانی سوریا نایەنم, چونکە من شانازی بەوەوە دەکەم شاژنێکی وەکوتۆ لەم ڕۆژگارە ناهەموارەی ژیانمدا وەك کەسانیتر ڕووت لێوەرنەگێڕام و بۆئێرە هاتی وسەربازەکانم موچەی خۆیان لەبەخشیشی تۆ وەربگرن.
- —کلیۆپاترا گوتی: ئەنتوان من نامەوێت سەرزەنیشتی تۆبکەم چونکە کاتێ مرۆڤ توشی ڕووداوی ناهەموار دەبێتەوەو هەست بەبەدبەختی دەکات, سەرکۆنەکردنی ئەو لەبێدەسەڵاتیەوەیە, ئەو کەسە ئەگەر بتوانێت دۆستە تێشکاوەکەی خۆی یاریدەبدات باشە دەنا سەرەنشتیکردنی کارێکی باش نییە, لەبەرئەمە من نامەوێت سەرت بخەمەسەرێ و بڵێم تۆ سەرەڕۆیتکردو نەدەبا هێرشتکردبایە سەرئازەربایجان- یان بەلانی کەمەوە لەوەرزی پایزدا نەدەبا لەشکرکێشیتکردبایە سەر شاری فەرهاد ئەسپ و گەماڕۆت دابا تاڕووبەڕووی سەرمانەبوبایەوە, تۆ ئەگەر لەشکرکێشیت نەکردبایەسەر ئازەربایجان وتەنها ئاشکانیەکانت لەسوریاو ئاسیای بچوك وەدەرنابان ئەمڕۆ دەبویت پیاوێکی ناودارترو خاەن هێزو توانا, بەڵام تۆ ویستت پاشای ئاشکان بکوژێت- یان دەستگیری بکەیت ولەگەڵخۆتدا بیبەی بۆ ڕۆم وسەرئەنجام بۆخۆت تێشکاو, ئەوهاوکاریەی لێرەدا دەتوانم بەتۆی بدەم

تەنها یارمەتی مادییە، مـن دەتـوانم پـارە بخەمـە بەردەسـتی تـۆ بۆئـەوەی بتـوانی یـەك سـوپای‌تر دروستبکەیتەوە, بەلأم ناتوانم سەربازت بۆدابینبکەم هەروەها ناشتوانم چۆنیایەتی وکەسایەتی سیاسی بۆتۆ فەراهەم بکەم, ئەمانە دەبێ خۆت بەرجەستەیان بکەیت, من پێموایە نابێ هەواڵی ئەم تێشکانەی تۆ بگاتەوە میللەتی ڕۆم, ئایا تۆ هەواڵی شەڕی فەرهاد ئەسپت بۆ پەرلەمانی ڕۆم ناردووە؟

- –ئەنتوان گـوتی: مـن بۆخـۆم تائیـستا ئـەم هەواڵـەم بۆپەرلـەمانی ڕۆم نـەناردووە, بـەلأم کەسـانیتر ناردویانەو پەرلەمانی ڕۆم دەزانێت من تێکشکاوم.
- –کلیۆپـاترا گـوتی: زانینـی ئەمـە لەلایـەن پەرلـەمانی ڕۆمـەوە گرنگنییـە, بـەڵکو ئـەوەی گرنگـە خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکەی تۆیە لەپەرلەماندا, ئەو هەواڵانەی نێردراون گرنگنین چونکە ڕەسمی نەبوون و دەتوانرێت بگوترێت ئەو ڕاپۆرتانە داخ لەدڵی پێوەیەو لە لایەن کەسانی ناحەزەوە نێردراوەو نابێ ببنە جێگای پشتپێبەستن ،
- ئەگـەر تـۆ لەڕاپۆرتـە ڕەسمیەکـەی خۆتـدا کەلـە پەرلـەمانی ڕۆمـدا دەخوێندرێتـەوە بنوسـی سـەرکەوتووم, پەرلـەمانی نـاوبراو ناچـارە تـۆ بەسـەرکەوتوو بناسـێنێت وفەرمانبـدات کـە جـەژنی سوپاسگوزاری بگێرن وخێرو قوربانی بکەن.
- –ئەنتوان گوتی: ئایە تۆ پێتوایە ئەو تێشکانە گەورەی من بگۆڕدرێت بۆسەرکەوتن ؟
- –کلیۆپـاترا گوتی: بـەڵێ دەکرێ وتـەنها ئـەوەی پێویستە تۆلە ڕاپـۆرتێکی دوورو درێژ و ڕەسمـی خۆتدا بۆپەرلەمانی ڕۆم بنوسی لەشەڕی ئازەربایجاندا سەرکەوتوو بووم.
- –ئەنتوان گوتی: سەرکەوتن نیشانەی خۆی هەن یەکێك لەونیشانانە تالأن و دەستکەوتی شەڕە, من نـەك هـەر تـالأنی شـەڕم دەسـتنەکەوتووە بـەڵکو جلوبـەرگ وئەسـپ وگیـانی زۆر لەسەربازەکانیـشم لەدەستداوە.
- –کلیۆپاترا گوتی: دابینکردنی تالأن ودەستکەوتنی شەڕەکەی تۆ من دەیدەم.
- –ئەنتوان بەسەر سوڕماویەوە گوتی: ئایە تۆ تالأن ودەستکەوتی شەڕم بۆ دابیندەکەیت؟
- –کلیۆپـاترا گـوتی: ئایـا باشـترین دەسـتکەوتی شـەڕ پـارە نییـە, ئایـا دوای کۆتـایی هـاتنی هـەموو شەڕێك کەلوپەلە تالأنیەکانی شەڕ بەمامەڵەچییان نافرۆشرێت تابیکەنەوە پارە؟
- –ئەنتوان گوتی ئەی چۆن،
- –خاتونەکـەی مـن گـوتی: مـن پـارە دەدەم بـەتۆ هـەتا ئەگـەر پەرلـەمانی ڕۆم بـەتۆی گـوت کـە تۆسـەرکەوتوو بویـت کوادەسـتکەوتەکانی شـەڕ تـۆ ئـەوپارەیان نیـشانبدەییت وبڵـێی ئەمـە دەسـتکەوتەکەمە, کاتێ پەرلـەمانی ڕۆمـیش بینـی تۆتالأنیـت هێناوەتـەوە سـەبارەت بەلـەناو چـوونی سەربازەکانت ڕەخنەت لێناگرن, چونکە کەس ڕەخنە لەسەردارێکی سەرکەوتوو ناگرێت بەوەی بۆچی زۆر لەسەربازەکانی بەکوشتداون, ڕەخنە لەسەرکردە دۆڕاوەکان دەگیردرێت.
- –ئەنتوان گوتی: قسەکانی تۆ ڕاستن من نازانم چۆن ئەم چاکەی تۆ بدەمەوە.
- –کلیۆپاترا گوتی: چاکەدانەوەی من زۆر ئاسانە تۆدەتوانی بۆمن دەست لەخاکی هەندێ ولأتی ژێر دەسەلأتداریەتی خۆت هەڵگریت.

- -ئەنتوان گوتی من پربەدڵ حەزدەکەم خاکی وڵاتەکانی ژێر دەستی خۆم بەتۆ بدەم بۆ ئەوەی تۆ ڕازیبیت و ئەو زیانەی لەیارمەتی دانی منەوە پێت دەکات تێی هەڵبێنێیتەوە , ئینجا ئەنتوان بەڕێگای باشکاتبەکەیەوە ڕاپۆرتێکی لەسەر سەرکەتویی خۆی بۆ پەرلەمانی ڕۆم ناردو تێیدا نوسیبوی, بەسەر پاشای ئاشکانیاندا سەرکەوتووبووم و مێشکی ئەو پاشایەمان لەکاسەی سەربدا پرژاندووەو ئیتر بۆهەتا هەتایە ئاشکانیەکان ناتوانن هێرش بکەنەوە سەر وڵاتانی ئاسیایی ژێر دەسەڵاتداریەتی ڕۆم، خۆئەگەر جارێکی تر بیرلەمەش بکەنەوە ئەوا بەمەرەد ئەم جارەیان دەبەینەوە, هەروەها زیانە گیانیەکانی سەربازانی ڕۆمیشی بەکەم لەقەڵەم دابوو, ئەو نامەی سەرکەوتنە لە پەرمانی ڕۆمدا خوێندرابۆوەو ئەو سەرکەوتنە درۆیەیان لەمێژووی ڕۆمدا نوسییەوەو کردیان بەجەژن وخێرو قوربانیان بۆکرد, بەڵام ئوکتاو کەئەوکات گەنجێکی( 27 ) ساڵە بوو بەڕێگای لایەنگرەکانی خۆی لەناو خەڵکدا پروپاگەندەی بڵاوکردەوە کەئەو سەرکەوتنەی ئەنتوان درۆیەو ئەو لەئازەربایجاندا بەسەختی تێشکاوەو سەد هەزار سەربازی ڕۆمیش تێداچوون, ئوکتاو بۆئەوەی چۆك بەرکەبەرێکەی خۆی دابدات پەنای بۆ چەکێك برد کەلەو ڕۆژگارەشدا وەك ئەمڕۆ کەمن ئەم یادایشتانە دەنوسم بەیەکێك لە بەهێزترین وکاریگەرترین چەك هەژماردەکرێت.
- بڵاوبونەوەی ئەو هەواڵەش لەدەمی یەکێکەوە بۆیەکێکی تر دەگوازرایەوە, ئوکتاو بەهۆی بەکرێگیراو ولایەنگرە تایبەتیەکانی خۆی کەلەوڵاتانی ژێر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا بوون پروپاگەندەی ئەوەی بڵاوکردەوە، چونکە ئەنتوان پیاوێکی شەڕابخۆرو شەللاتی ومێبازو هیچ لەبارانددا نەبووە، سەد هەزار سەربازی ڕۆمی لەئازەربایجاندا بەکوشت داوەو بەدرۆ سەرکەوتوونامەیەکی بۆپەرلەمانی ڕۆم نوسیوە تائەوان بەسەرکەوتویی بناسن, ئوکتاو بەڕێگای بەکرێگیراوەکانی خۆی بەهاوڵاتیانی دەگوت باشترین بەڵگە بۆ سەلماندنی تێکشکانی ئەنتوان ئەوەیە ئەولە ڕێگای ئێرانەوە بۆڕۆم نەگەڕاونەوەو لە بەردەم پەرلەمانی ڕۆمدا بەمەراسیمی سەربازی نەڕۆیشتون, پێش سیزار دەستور وابوو کاتێ سەرداری گەورەی ڕۆمی لەشەڕێکدا بەسەرکەوتویی دەگەڕایەوە ڕۆم، دەبوا سەربازەکانی نەهێنێتە ناو پایتەخت ولەدەم ڕووباردا دەوەستان و سەربازەکان مۆڵەتیان پێ دەدراو ئەوانەی کەکاتی خزمەتی سەربازیان تەواو دەبوو بەڕەسمی دەنێردرانەوە ماڵەکانی خۆیان وپارچە زەویەکی کشتوکاڵکردنیان پێدەدراو خەریکی جوتیاری دەبوون, سوپاش لەسەروی ڕۆمدا دەمایەوە, هەندێکیش لەمانە بۆ وڵاتانی تری ژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دەگەڕانەوە, ئەگەر ئەو فەرمانڕەوا سەرکەوتوەی ڕۆمی لەڕێگای خۆرئاوا- یان لەڕێگای وڵاتی ( ئایلیری )(1) ( واتە، یوگسلافیاو ئەلبانیای ئەمڕۆ دەگەیەنێت- و فارسی) یەوە بۆ ڕۆم هاتبانەوە ڕێگا بەو سەرداره نەدەدرا سەربازەکانی لەکەمەربەندی دەوری شار بێنێتە ناوێ، سیزار وەك گوتم ئەم دەستورەی شکاند دوای سەرکەوتنی وگەڕانەوەی بۆ ڕۆم لەگەڵ سەربازەکانیدا دەهاتە ناوشاری ڕۆمەوەو سەربازەکان بەمەراسیم وپۆلپۆل بەڕیز بە بەردەم سەرداری ڕۆمیدا تێدەپەڕین؟
- بۆیە ئوکتاو بەڕێگای لایەنگرەکانی پروپاگەندەی ئەوەی بڵاودەکردەوە ئەگەر ئەنتوان سەرکەوتوو بووە لەئازەربایجان بۆنایەت لەڕۆمدا ئەو ڕێوڕەسمە سەربازیە بکات؟

- زیان وشەڕێوی سەربازەکانی ئەنتوان ئەوەندە زۆربوو ئەنتوان نەوێرا سەربازەکانی ببات بۆ ڕۆم و ڕێوڕەسمی سەربازیان پێبکات، کاتێ خەڵك بیستیان ئەنتوان بەهۆی شەرابخواردنەوەو مێبازی وعەیش ونەیشی خۆی سوپای ڕۆمی بەرەو نەدامەتی و تێداچوون بردۆتەوە، باوەڕیان دەکرد چونکە ڕابواردن وخواردنەوەو دامەنپیسی ئەنتوان لەڕۆمدا دەنگی دابۆوە، وەك لەمەوبەر گوتم خەڵکی ڕۆم کەسانێکی مێبازو شەراب خۆرن بەدەگمەن ئەشراف ودەوڵەمەندێکی ڕۆمیت دەستدەکەوێت کەخەریکی شەراب و ڕابواردن نەبێت.
- بەڵام عەیش ونەیشی ئەنتوان ئەوەندە زۆرو نابەجێ وبێتامبوو تەنانەت ناوبانگی دەرکردبوو وخەڵك دەیانگوت بەهۆی ئەتواری نالەباری ئەنتوانەوە سوپای ڕۆم لە ئازەربایجاندا تێشکاوە، جگە لەم پروپاگەندانە هێزێکی تر لەناو کۆمەڵگاکاندا هەیە ئەویش هێزی پارەیە، مقۆمقۆی گشتی هاوڵاتیانی ڕۆم لەسەر ئەوەبوو ئەگەر ئەنتوان لە شەڕی ئازەربایجاندا تێشکاوەو ئەو پارەی بە تاڵانی بەدەستی هێناوە ئەوە دەسەلمێنێت ئەنتوان لەئازەربایجاندا سەرکەوتوو بووە، بەشێوەیەك کلیۆپاترا پارەی بۆ گەڕانەوەی کەسایەتی وهەژمونی ئەنتوان خەرجکرد، تەنانەت لەڕۆمدا ئوکتاویش کەوتە گومانەوەو پێی وابوو ئەنتوان ڕاستدەکات لەئازەربایجاندا سەرکەوتوو بووە، خاتونەکەی من پارەکەی خۆی بەخۆڕایی نەدەدا بەئەنتوان لەبری ئەو پارەیە خاکی وڵاتانی تری ژێر دەسەڵاتداریەتی ڕۆمی لێوەردەگرت، بەڵام لەڕۆمدا کەس ئاگای لەم ئاڵووێریە نەبوو وپێیانوابوو ئەو پارەیەی ئەنتوان بۆ ڕۆمی دەنێرێتەوە دەستکەوتی تاڵان و بڕۆی شەڕە سەرکەوتوەکەی ئەنتوانە لەئازەربایجاندا، ئەو پارە زۆرەی شاژنی میسر پروپاگەندەکانی لایەنگرانی ئوکتاوی نەهێشت وئەنتوان داوای لەحکومەتی ڕۆم کرد جلوبەرگ و وەلاخ و سەربازی بۆبنێرن و کەسیش پێی سەیرنەبوو ونەیدەپرسی ئایا ئەگەر ئەنتوان لەشەڕی ئازەربایجاندا سەرکەوتووبووە ئەو یاریدە سەربازیانەی بۆچیە.
- حکومەتی ڕۆم بۆناردنی سەربازو کەلوپەلی سەربازی کەشتی جەنگی ئامادەکردن و لە هەمان کاتیشدا ئۆکتاوی-ی ژنی ئەتوانیش بڕیاریدا بچێت بۆلای مێردەکەی، ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان ئاگای لەومامەڵەی نێوان مێردەکەیی وکلیۆپاترانەبوو، بەڵام نەگەڕانەوەی ئەنتوان بۆ ڕۆم بەببووە جێگای سەرسامی ئەو، چونکە دەیزانی ئەنتوان کەوتۆتە کەمەندی عشقی کلیۆپاتراوە، جگە لەمەش قازانجی ماددیش ئەنتوانی لەخۆرهەڵاتدا هێشتبۆوە، ئەنتوان دەیزانی ئەگەر بگەڕێتەوە ڕۆم ئەواکلیۆپاترا لەگەڵیدا ناچێت، هەرچەندە خاتونەکەی من لەسەردەمانی سیزاردا چوو بۆڕۆم بەڵام سەردەمی ئەنتوان جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوکاتدا، سیزار بۆیە کلیۆپاترای هێنا بۆڕۆم بۆئەوەی بەخەڵکی ڕۆم بڵێت من پیاوێکم شاژنێکی وەك کلیۆپاترا کەسێزدە پشتی پاشابوون ڕاکێشم کردووە بۆڕۆم تاسەر لەوڵاتەکەی هەڵبێنێت، بەڵام ئەنتوان کەوتبۆ ژێر منەت و چاکەکاری کلۆپاتراو نەیدەتوانی کلیۆپاترا لەگەڵخۆیدا ببات بۆ ڕۆم بۆنیشاندانی گەورەیی خۆی، کاتێ سیزاریان لەڕۆمدا کوشت، من وخاتونەکەم بەجلوبەرگی ئاساییەوە هەڵاتین، بەڵام دوای کوژرانی ئەنتوان لەوانەیە خاتونەکەی من خۆم لەڕۆمدا ڕزگار بکات، لەوانەیە بەپلانی ئۆکتاو وئۆکتاوی-ی ژنی ئەنتوان کلیۆپاترا بکوژن، بۆیە خاتونەکەی من نەدەچوو بۆ ڕۆم، هەروەها ئۆکتاوی هاوسەری ئەنتوان دەیزانی هۆی نەگەڕانەوەی مێردەکەی بۆڕۆم ئەوەنییە

کەفەرمانڕەوای وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمە، بەڵکو زیاتر هۆکەی ئەوەیە ناوبراو گرفتاری عشقی کلیۆپاترا بووەو خاتونەکەی من نایەڵێت ئەنتوان بگەڕێتەوە ڕۆم.

- شازنی میسر ئاگاداری هەواڵەکانی ڕۆم بوو چونکە لەوێدا جاسوسی هەبوون و دەیزانی ئۆکتاوی هاوسەری ئەنتوان دەیەوێت بەخۆیی وکەشتییە جەگییە پڕ کەرەستەو سەربازەکانی حکومەتی ڕۆمیەوە بێت بۆ خۆرهەڵات، کلیۆپاترا بەبیستنی ئەم هەواڵە هەراسانبوو، چونکە پێشبینی ئەوەی دەکرد هەرکاتێ ئۆکتاوی بێت بۆ خۆرهەڵات ئەنتوانی لێدەستێنێتەوە ئیتر ئەم ناتوانێت لەگەڵ ئەنتواندابێت و بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێبکات، کەئەمەی بیست کلیۆپاترا بەمنی گوت شرمیون من عاشقی سوتاوی ئەنتوان نیم کەنەتوانم بەبێ ئەوبژیم، بەڵام من ناتوانم ببینم ئەو پیاوەی هۆگرمە لەگەڵ ژنێکی تریدا تەنانەت ئەگەر ژنیشی بێت، دەستلەملانبوونی من بۆئەنتوان تەنها بۆخاتری پاراستنی هێزوتوانای خۆمە، ئەگەر ئەنتوانم لەدەستبچێت ئەوا ئوکتاو وئۆکتاوی خوشکی من لەناودەبەن، من تائاگاداری ئەنتوان بکەم ئاگاداری خۆم دەکەم ئەگەر نەمزانیبا ئاگاداریکردنی ئەنتوان ئاگاداریکردنی خۆمە دەرگای خەزنەکانم بۆی واڵا نەدەکردو بێ درێغی پارەم نەدەدایە، کاتێ ئەنتوان لەئازەربایجان گەڕایەوە دەمزانی ئەگەر من دەستی نەگرم لەناودەچێت، ئەگەر هەواڵی تێکشکانی ئەنتوان گەیشتباوە ڕۆم ئوکتاو پەرلەمانی ڕۆمی ناچاردەکرد ئەنتوان لەسەر فەرمانڕەوایی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ژێر دەسەڵاتداریێتی ڕۆم لاببات، دیارە ئەوکات ئەنتوان دوو ڕێگای لەبەردەمدا دەمایەوە، یەکێیان ئەوەبوو بچێتەوە ڕۆم وپاشماوەی تەمەنی خۆی لەوێدا بەسەربەرێت ومانگانە موچێکی دیاریکراو لەحکومەت وەربگرێت- یان دەبا لەئیمپراتۆریەتی ڕۆم یاخی بێت، ئەگەر گەڕابایەوە ڕۆم بەوەی من ئیتر پارێزەرم نەدەما لەناویان دەبردم، واتە ئوکتاو وخوشکەکەی منیان دەکوشت، خۆ ئەگەر یاخیبایەو فەرمانی لەسەرکار لابردنی پەرلەمانی ڕۆمی جێبەجێ نەکردبا دەبوایە لەگەڵ ئوکتاودا کەوتبا شەڕ، لەکاتێکدا سوپایەکی بەهێزی نەمابوو ونەیدەتوانی لە بەردەم سوپای ئوکتاودا خۆی ڕاگرێت، ئەگەر ئەنتوان بڕیاری دابا یاخیبووبا، لەڕۆمدا کەس بەرگری لێنەدەکردو هەموو مەحکومیان دەکردو کوشتنی ئەویان بەحەڵاڵ دەزانی؛

- لەبەر ئەمەبوو بڕیارمدا ئەنتوان بپارێزم ونەیەڵم ئەو لەناوبچێت وتەختی پاشایەتی منیش لەدەستمدا بمێنێتەوە، بەڵام ئیستا ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان دەیەوێت بێتە ئێرەو ئەنتوانم لەدەست دەربێنێت، من خەفەت لەوەناخۆم ئەوهەموو پارەیەم لەپێناو ئەنتواندا خەرجکرد، چونکە دەزانم دەتوانم جارێکی تریش خەزنەکانم پڕبکەمەوە، من گومانم لەگۆڕانکاری سیاسی لەڕۆمدا هەیەو دەترسێم هاتنی ئۆکتاوی بۆئێرە ببێتە هۆی ئەوەی ئەنتوانم لەدەست بچێت وژنەکەی بیباتەوە بۆڕۆم، خۆ کەئەنتوانیش بڕواتەوە بۆڕۆم لەوانەیە بیکوژن، چونکە لەوێدا دەبێتە نێچیرێکی ئاسان بۆ ڕاوکردنی ئوکتاو، لەو ڕۆژەی خاتونەکەی من بیستی ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان دەیەوێت بۆسوریا بێت هەموو بیروهۆشی لەدارشتنی پلانێکدابوو بۆئەوەی ڕێگربێت لەبەردەم ئەوەی ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان نەیەت بۆسوریا، ئەگەر کلیۆپاترا کەرەستەو هۆکاری لەدەستدابا بۆ لەناوبردنی ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان بەدڵنیاییەوە

دەیوشت, ئەگەر خاتونەکەی من زانیبای بەدانی پارە دەتوانێت ئۆکتاوی بکوژێت ئەوا دوو کرور پارەی دەدا هەربۆ ئەوەندەی هاوسەرەکەی ئەنتوان لەڕۆمدا بمێنێتەوە.

- کلیۆپاترا دەیزانی بەڕوکەش ئۆکتاوی دەچێت بۆلای هاوسەرەکەی بەڵام کەبە فەرمانی براکەی ئوکتاو نەبێت ئەوژنە نەدەکەوتە ڕێ, ئوکتاو فەرمانی بەئۆکتاوی خوشکی داوە بچێت بۆلای مێردەکەی و لەدەست کلیۆپاترای دەربێنێت بۆئەوەی ئەو دوانە یەکنەگرن،
- —کلیۆپاترا بەئەنتوانی گوت: نامەیەك بۆئۆکتاوی هاوسەرت بنێرەو تێیدا بنوسە بابۆ خۆرهەلات نەیێت.
- —ئەنتوانیش لەوەڵامدا گوتی: نوسینی نامەیەکی ئاوا پێویستی بەبەهانەیەك هەیە, منیش هیچ بەهانەیەکم لەدەیتدانییە تابەئۆکتاوی بڵێم نەیەت بۆسوریا.
- —کلیۆپاترا گوتی: بۆ ژنەکەی خۆت بنوسە چونکە من بەتەمام بچم بۆشەڕ وناتوانم لێرەدا بمێنمەوە بۆیە هاتنی تۆ بۆسوریا بێ هودەییە.
- —ئەنتوان گوتی: من بەتەمام بچم بۆشەڕ بەڵام تاچەك وتفاقی سەربازیم لەڕۆمەوە بۆ نەیەت ناتوانم لێرە بڕۆم.
- —کلیۆپاترا گوتی: دەزانم ناتوانی بچیت بۆجەنگ بەڵام هاوسەرەکەت دەزانێ تۆبۆیە داوای سەربازو چەك وتفاقی سەربازیت کردووە تابچیت بۆشەڕ ئەگەر بۆژنەکەت بنوسی دەچم بۆجەنگ باوەڕت پێدەکات.
- ئەنتوان نامەیەکی بۆ ئۆکتاوی ژنی نوسی کەناوەڕۆکەکەی بەمشێوەیەبوو: چونکە من بەتەمام بچم بۆشەڕ ئەگەر بشهێت بۆئێرە ئەوا من نابینێت بۆیە باشتر وایە نەیەیت بۆسوریا.
- لەنێوان سوریاو ڕۆمدا پۆستەچی دەوڵەت هەبوو بەڵام ڕۆیشتنی کەشتی پۆستی خێرانەبوو بۆیە ئەنتوان نامەکەی خۆی بەکەشتیەکی تایبەتی تیژڕەودا نارد تاکو زوتر بگاتە دەست هاوسەرەکەی, ئەو کەشتیە تیژڕەوە کەوتە ڕێ, بەڵام کاتێ ئەم کەشتیە گەیشتە ڕۆم کەشتیەکانی ڕۆمی وئۆکتاوی ژنی ئەنتوان کەوتبوونە ڕێ.
- پێنج ڕۆژ پێش کەوتنە ڕێی ئەو کەشتیەی نامەکەی ئەنتوانی بۆژنەکەی دەبرد کلیۆپاترا پێشبینی ئەوەی کردبوو کەشتیەکانی ڕۆم لەوانەیە کەوتنبەڕێ, بۆیە داوای لەئەنتوان کرد نامەیەکی تر بنوسێت وبۆ یۆنانی بنێرێت وداوا لەحوکمڕانی یۆنان بکات ئەو نامەیە بەئۆکتاوی هاوسەری بگەیەنێت تائەو بزانێت نابێ لەیۆنان تێپەڕێت و بەرەو سوریا بێت, ئەنتوان لەم نامەیەشیدا وەك نامەکەی پێشوتر دەستەواژەی جەنگی بەکارهێنابوو ونوسیبووی منێ بەرەو مەیدانی جەنگ دەڕۆم ئەگەر تۆبۆ سوریا بێیت ئەوا من نابینیت.
- دوای ئەوەی ئۆکتاوی گەیشتە یۆنان نامەی مێردەکەیان پێداو سەری لەونامەیە سوڕما, چونکە دەیزانی تاکەلوپەلی سەربازی نەگاتە ئەنتوان ناتوانێت بچێت بۆشەڕ ئۆکتاوی تێگەیشت ئەونامەیەی مێردەکەی نوسیویەتی ودەڵێ لەیۆنان بەملاوە نەیەیت, مەسەلە ڕۆیشتن نیە بۆمەیدانی شەڕ بەڵکو کلیۆپاترا ئەوی ناچارکردووە ئەم نامەیە بنوسێت, ئەوەی زانیی ڕکەبەرێکەی ئەو نامەیەی بەمێردەکەی

نوسیوە، کەچی گوێڕایەڵی کردوو نەهات بۆسوریا، بەڵام لەگەڵ ئەو کەشتیە جەنگیانەی سەربازو کەرەستەی جەنگیان بۆسوریا دەهێنا پیاوێکی بەناوی( نی جر) بۆلای ئەنتوان نارد, کاتێ کەشتیەکانی ڕۆم گەیشتنە سوریا ئەوپیاوەی لەلایەن ئۆکتاوی یەوە نێردرابوو هاتەلای ئەنتوان ولەوکاتەدا خاتونەکەی من لای ئەنتوان بوو منیش وەك خزمەتکاری تایبەتی ئەولەو ژوورەدا بووم دیاربوو ئەنتوان نێردراوەکەی دەناسی وگوتی( نی جر ) تۆ گەنجتر دیاری لەجاران, نی جر، گوتی کەس بەگەنجی نامێنێتەوە تەمەن کەڕۆیشت ناگەڕێتەوە.

- —ئەنتوان گوتی: بەڕاستی تۆ سپۆرتتری لەوکاتەی تۆم بۆدوجار بینی لەڕۆمدا، قەڵەو بووی.
- —نی جر گوتی: قەڵەویەکەی من بەهۆی ئاوهەوای دەریاوەیە چونکە ماوەیەك لە کەشتیدا بووم.
- —ئەنتوان لێی پرسی: چ هەواڵێکی تازەت بۆمن هێناوە؟
- —نی جر گوتی: ئەوەی من هێناومە پەیامێکە لەلایەن هاوسەرەکەتەوە ئۆکتاوی.
- —ئەنتوان گوتی: پەیامەکەتم پێ بڵێ,
- —نی جر سەیرێکی خاتونەکەی منی کردوو گوتی من ئیستا ناتوانم پەیامی هاوسەرەکەت پێ بڵێم چونکە دەبێ تەنها خۆم وخۆت بین.
- —ئەنتوان گوتی: کلیۆپاترا شاژنی میسر کەلێرەدایە بێگانە نیەو دەتوانێت گوێ لە پەیامی ژنەکەی من بێت.
- —نی جر گوتی: من باوەڕدەکەم کەکلیۆپاترای شاژنی میسر یەکێکە لەژنە مەزنەکانی دنیا, ئەو ئەگەر شاژنیش نەبایە لەدیارترین ژنی جیهان هەژماردەکرا, چونکە لەدنیادا لەو جوانتر نییە, لەخۆرهەڵات وخۆرئاواو هەرکەسێ بیەوێت لەسەرجوانی بدوێت ناوی کلیۆپاترا دەهێنێت, من زۆر جار لەهاوسەرەکەی تۆم بیستووە کەدەیگوت شاژنی میسر لەمن جوانترە, تەنها ئەمڕۆ کلیۆپاترا نمونەی جوانی نییە بەڵکو تادنیا بمێنێت خەڵك ئەو بەنمونەی جوانی وشۆخ و شەنگی دەهێننەوە.
- من هەستم پێهەڵاگوتنەکەی نی جر کاریگەری زۆر دەکاتە سەر خاتونەکەی من چونکە تائەو کاتە هیچ ڕۆمیەك لەلای ئەنتوان باسی جوانی کلیۆپاترای نەکردبوو, نی جر بەو قسانەی کەبەڕوکەش لەکانگای دڵیەوە دەهاتن وپێی هەڵادەگوت کاری کردبۆ سەر خاتونەکەی منیش ونەرمی کرە, نی جر دوای ئەوەی بەجوانی کلیۆپاترای هەڵاگوت گوتی، باشتر وایە پەیامی ژنێك بۆمێردەکەی شاژنی میسر گوێی لێنەبێت چونکە لەنێوان ژن ومێردا زۆرشت هەیە پێویستە تەنها خۆیان ئەمانە بزانن، بائەمەش بڵێم ئەم پەیامەی ئۆکتاوی هاوسەری بەڕێزتان پەیوەندی بەشاژنی میسرەوە نییە, ئەو قسەی دوایی نی جر وەك من تێبینیمکرد لەدرۆ دەچوو، پەیامەکەی ئۆکتاوی پەیوەندی بەکلیۆپاتراوە هەبوو, بەڵام نی جر بەوقسە خۆشانەی لەسەرەتادا کردنی خاتونەکەی منی نەرم کردبوو وکلۆپاترا گوتی من لێرە دەچمە دەرێ تا نی جر بتوانێت پەیامەکەی بەگەیەنێت.
- خاتونەکەی من لەژوورەکە چۆدەرێ، منیش لەگەڵیدا چوومە دەرێ.
- —من بەکلیۆپاترام گوت: ئایا پێتوانیە نی جر سەبارەت بەپەیامەکە درۆ دەکات و پەیوەندی بەتۆوە هەیە؟

- کلیۆپاترا گوتی: بێگومان پەیوەندی بەمنەوە هەیە بەڵام من ترسم لەوپەیامەی ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان نییە, بەڵکو دەسترم خودی خۆی بۆئێرەبێت, چونکە تازە بوونەوەی دیدار لەنێوان ژن ومێرددا دوای ماوەیەك دووری, زۆر کاریگەری دەبێت, دەنا ناردنی نامە لەلایەن ژنەوە بۆمێردەکەی کاریگەری ئەوتۆی نییە.
- ئەو قسەی خاتونەکەی خۆمم لەناخی دڵمەوە بەڕاست زانی چونکە کاتێ کەسێك لەبەر چاوان نەبێت بیردەچێتەوە ئەگەر ژن ومێردیشبن, دوای ئەوەی نی جر پەیامەکەی خۆی گەیاند گەڕایەوە بۆ ڕۆم وئیتر نەمانبینیەوە, کلیۆپاترا لەئەنتوانی نەپرسی پەیامی هاوسەرەکەت چیبوو, ئەنتوانیش بەخاتونەکەی منی نەگوت هاوسەرەکەی چ پەیامێکی بۆناردووە, هەمانڕۆژی پەیامەکەی ئۆکتاوی بەئەنتوان گەیشت, شاژنی میسر کەشتیەکی خستە ژێر دەسەڵاتی تیەی مێردم کەتازە لەئەرمەنستان گەڕابۆوەو پێی گوت بچۆبۆ یۆنان ونامەیەکی بۆفەرمانڕەوای یۆنان نادرو تێیدا داوای کردبوو مۆڵەتی تیە بدات لەپۆستەکانی حکومەتی یۆنانەوە نامە بۆسوریا بنێرێت, شاژنی میسر بە مێردەکەمی گوت ئەگەر گەیشتیتە یۆنان بەردەوام چاودێری ئۆکتاوی ژنی ئەنتوان بکەو بزانە چ دەکات وبۆکوێ دەچێت ئەگەر زانیت بەتەمایە سەفەربکات بزانە بۆکوێ دەچێت هەرجارەی پۆستی حکومەتی یۆنانیش بۆسوریا دێت نامەیەکم بۆبنوسەو لە هەواڵەکانی ئۆکتاوی- م ئاگاداربکەوە, تیە هەر ئەو ڕۆژە بەرەو یۆنان ڕۆیشت, خاتونەکەی من بۆماوەی سێ ڕۆژ, سەبارەت بەئۆکتاوی لەگەڵ مێردەکەیدا گفتوگۆی نەکردو ڕۆژی چوارەم بەئەنتوانی گوت ئایا فەرماننادەی ژنەکەت بگەڕێتەوە ڕۆم؟
- کلیۆپاترا لەمانەوەی ئۆکتاوی لەیۆنان دەترسا, چونکە ئەگەری ئەوەی هەبوو بڕیاربدات بێت بۆلای مێردەکەی, بەڵام کەبگەڕێتەوە ڕۆم دڵنیا دەبێتەوەو دڵ ڕوون دەبێت لەوەی ئیتر ئۆکتاوی ناتوانێت بەئاسانی بێتە سوریا،
- -ئەنتوان بەخاتونەکەی منی گوت: گەڕاندنەوەی ئۆکتاوی بۆ ڕۆم دەستەواژەیەکی گونجاوی دەوێت دەبێ من بەشێوەیەك ئۆکتاوی بگەڕێنمەوە ڕۆم لێمتووڕە نەبێت.
- -کلۆپاترا گوتی: نامەیەکی بۆبنوسەو تێیدا بڵێ بوونی ئەو لەڕۆمدا زۆر پێویستە چونکە لەڕۆمدا دەتوانێت ڕێگربێت لەبەردەم کارونەخشەکانی دوژمنانمدا, بەڵام ئەگەر لەڕۆمدانەبێت دوژمنان بەئازادی دەست بۆدوژمنکاری من دەبەن.
- ئەو بەهانەیەی خاتونەکەی من بەئەنتوانی گوت زۆر جێگای قبوڵکردن نەبوو بەلا لەگەڵ ئەوەشدا ئەنتوان نامەیەکی بەهەمان ناوەڕۆك بۆهاوسەرەکەی ئۆکتاوی نوسی و تێیدا نوسیبوو، بونی تۆ لەڕۆمدا بۆمن زەرورییە, چونکە تۆ لەڕۆمدا سەنگەری منی و ئاگاداری من دەکەیت ونایەڵیت دوژمنان بێ ترس دژبە من پلان ونەخشەی دوژمنکاری داڕێژن, بەڵام چونکە ئیستا لەیۆناندایت, دوژمنەکانمان بواریان بۆڕەخساوە دەست بۆ کاری دوژمنکارانەی دژبە من ببەن.
- دوای ئەوەی نامەکە گەیشتە دەستی ئۆکتاوی، ئەولەیۆنانەوە بەرەو ڕۆم کەوتە ڕێ, خاتونەکەی من بەمێردەکەمی گوتبوو ئۆکتاوی بۆهەر شوێنێك بچێت دوای کەوە, بەڵام کلیۆپاترا مەبەستی لەوەنەبوو تیە تاڕۆم چاودێری بکات, بۆیە تیە نامەیەکی بۆ کلیۆپاترا نوسیبوو لەونامەیەدا گوتبووی(

ئەو کەسە لەژێر چاودێری دایە بەرەو ڕۆم کەوتۆتە ڕێ ومنیش بەکەشتی بەدوایدا دەڕۆم) کاتێ کلیۆپاترا نامەکەی خوێندەوە پێکەنی وگوتی شرمیون مێردەکەت تاڕۆم بەدوای ئۆکتاوی دەکەوێت, تیە کەشتیەکەی ئۆکتاوی چاودێری کردبوو تانزیك سنوری ڕۆم وئیتر لەوێوە لەترسان گەڕابۆوە, چونکە بەندەرەکە کەوتبۆ بەشی ژێر دەسەڵاتداریەتی ئۆکتاو, ئەگەر بیانزانیبا تیە لە لایەن کلیۆپاتراوە بۆجاسوسیکردن لەسەر ئۆکتاوی نێردراوە دەیانکوشت, دوای ئەوەی تیە دڵنیابوو لەوەی ئۆکتاوی گەڕایەوە ڕۆم, ئەویش گەڕایەوەو ڕاپۆرتەکەی خۆی بەکلیۆپاترادا‌و خاتونەکەی منیش گوتی شرمیون ئیتر من لەمەترسی هاتنی ئۆکتاوی بۆسوریا ناترسم چونکە دەزانم لەڕۆمدایە.

# سەفەر کردن بۆ فەڵەستین

- دوای ئەوەی خاتونەکەی من لەئۆکتاوی ژنی ئەنتوان ئاسودەبوو, کەوتە بیرکردنەوەی جێبەجێکردنی نەخشە گەورە سیاسەتەکەی خۆی- واتە بەدەستهێنانی خاکی تازە بە تایبەت خاکی وڵاتی فەڵەستین, داوای لەئەنتوان کرد سەرتاپای خاکی فەڵەستینی بداتێ.
- -ئەنتوان گوتی: من ئامادەم هەموو خاکی فەڵەستین بەتۆ بدەم, بەڵام ئەوێ پاشای هەیەو پاشایەتی ئەوێ حکومەتی ڕۆم بەڕەسمی ناسیویەتی ومن ناتوانم ئەو بەشە بەتۆ بدەم، چونکە جگە لەوەی پاشای فەڵەستین بەناوی پاشای قەومی یەهودی ناسراوەو بە توندی بەرگری لەخۆیان دەکەن, پەرلەمانی ڕۆمیش دژی ئەوەیە.
- -کلیۆپاترا گوتی: من دەچم بۆفەڵەستین پاشای نەتەوەی جولەکە ڕازی دەکەم کە وڵاتەکەی خۆی بخاتە ژێر ڕکێفی من.
- -ئەنتوان گوتی: ئەگەر بتوانیت ئەم کارەبکەیت ئەوا بەشێك لەکێشەکە چارەسەر دەکرێت, خاتونەکەی من بڕیاریدا بچێت بۆ فەڵەستین، بۆئەوەی مەزنی خۆی نیشانی (هرود)ی پاشای فەڵەستین بدات, ناردی کەشتیە بێ هاوتا مەزنەکەی خۆی لەمیسرەوە بۆبێت بۆسوریا وئێمە لەسوریاوە بەرەو فەڵەستین کەوتینە ڕێ.
- پێشئەوەی بەرەو فەڵەستین بکەوێتە ڕێ تێبینیمکرد خاتونەکەی من دەیەوێت کەڵك لە جوانیەکەی وەربگرێت بۆسەرنج ڕاکێشانی هرودی پاشای نەتەوەی ئیسرائیل, بۆ ئەوەی بیکاتە عاشقی خۆی, کلیۆپاترا لەئیرەیی نەدەترسا لەبەرئەوەی هێندە لە فەڵەستیندا نامێنێتەوەو زوو هرود لەخشتە دەبات ودوای گەیشتنی بەماوەیەکی کەم ئەنجامی باش بەدەست دەهێنێت, کاتێ ئێمە گەیشتینە فەڵەستین هرود لەئۆرشەلیم بوو ولەڕۆخی دەریادا چاوەڕوانی خاتونەکەی منی دەکرد, جولەکەکان نەتەوەیەکن خۆبەزلزان چونکە خۆیان لەهەموو نەتەوەکانی تری دنیا بەبەرزتر دەزانن, باوەڕی ئاینی ئەمانە ئەوەیە خوا لەمیللەتی جولەکەی باشتر دروستنەکردووەو میللەتی ئیسرائیل بۆیە دروستکراون تاحوکمی هەموو میللەتەکانی تری دنیا بکەن ودەبێ هەموو نەتەوەکانی تر کۆیلەی نەتەوەی جولەکەبن,

هەرچەندە لوتبەرزی جولەکەکانیش بەناوبانگە, بەڵام کاتێ خاتونەکەی من لەکەشتی دابەزی پاشای جولەکەکان کە گەنجێکی بەهەیکەل وریش ڕەش وقۆزبوو, لەبەردەم خاتونەکەی مندا نوشتایەوە, کلیۆپاترا بەوردی لەپاشای جولەکەکانی ڕوانی وگوتی پێویستە پیرۆزبایت لێبکەم چونکە پیاوێکی جوانی, ئینجا کلیۆپاتراو هرود سواری کەژاوەبوون وبەڕێ کەوتن و من وخزمەتکارەکانی تری شاژنیش سواری کەژاوەی تربووین وبەدوای ئەواندا چوین, لەڕۆخی دەریاوە تاشاری ئۆرشەلیم ماوەیەکی دورودرێژە, چەند ڕۆژێك بەڕێوە بووین تاگەیشتینە ئۆرشەلیم, دوای گەیشتنمان بەوشارە پاشای میسر کۆشکەکەی خۆی بۆ خاتونەکەی من دیاریکرد کەتێیدا نیشتەجێ بێت وخۆی چووە کۆشکێکی تر, شاژنی میسر بەمنی گوت هرود ژنی هەیەو بەپێکەنینەوە گوتی باوەڕناکەم لەڕووی جوانیەوە شان لەشانی من بدات, یەکەم ڕۆژ کەخاتونەکەی من گەیشتە کۆشکی پاشای جولەکەکان, هاوسەرەکەی هرود لەدەم دەروازەی کۆشکدا بۆپێشوازی کلیۆپاترا ڕاوەستابوو, کاتێ چاوم بەمریەمی هاوسەری هرود کەوت پێشبینی ئەوەمکرد خاتونەکەی من ناتوانێت دڵی هرود ڕاکێشێ وکەمەندی عشقی خۆی بکات، چونکە مریەم ژنێکبوو تەمەنی هەژدە ساڵان هەرچەندە کەمێ لوتی چەمابۆوە( ئەمەش نیشانەی نەتەوەی جولەکەیە)و لەجوانیەکەی ئەوی کەمدەکردەوە, بەڵام لەبەرامبەردا چاو برۆی ڕەش وڕوخساری گەش وسپی ودەمی زۆر بچوکی ئەو زۆر ڕۆح سوك و خۆشەویستی کردبوو, جگە لەگەنجی وجوانیەکەی مریەم, شازادەی جولەکەبوو لە نەوەی پاشاکانی( منحشب )(1) بوو,( منحشب، ناوی ئەو برایانەیە کەلە سەدەی دووەمی پێش میلاددا دژبە ڕۆمییەکان ڕاپەڕیون وخاکی فەلەستینیان ئازادکردووە، شەڕەکانی ئەمانە دژبە حکومەتی ڕۆم بۆتە یەکێك لەداستانە مەزنەکانی جولەکەکان و نەوەی ئەمانەش لەناو جولەکەکاندا خاوەنی ڕێزی تایبەتی بوون – و فارسی) ئەو گەورەیی بنەماڵەکەی زۆرلای مێردەکەی خۆشەویستی کردبوو.

- پێش ئەوەی بگەینە ئۆرشەلیم, من تێبینیمکرد هەرچەندە پاشای جولەکەکان زۆر ڕێز لەخاتونەکەی من دەگرێت بەڵام بەچاوی عشقەوە سەیری ناکات و وەڵامی ڕوونی هەندێ تانەوتەشەری خاتونەکەی من ناداتەوە, من زانیم خاتونەکەی من لەکەم کاریگەری جنسی لەسەر پاشای جولەکەکان ناڕەحەتە، بەڵام بەوئاستەنا کەنائومێد بووبێت بەڵکو لەوە دڵنیگەرانبوو بۆچی جوانیەکەی ئەو کارناکاتە سەرپاشای جولەکەکان وئەوش وەك سیزارو ئەنتوان سەری موعتاجی ناخاتە دەم دەرگای ئەو– واتە گرفتاری جوانیەکەی نابێت وبەشەیداییەوە هۆگری نابێت؟ لەکۆشکی پاشایەتی ئۆرشەلیمدا منیان دەناسی دەیانزانی ئەگەر بیانەوێت بەبێ دیداری ڕەسمی بچن بۆ لای کلیۆپاترا ئەوا دەبێ بێن بۆلای من, بەڵام من بەپێچەوانەی ئارەزووی کلیۆپاترا هەڵسوکەوتم نەدەکردو هەرکەسێك ویستبای بچێت بۆلای شاژنی میسر پێشان دەچوومە لای کلیۆپاتراو پێمدەگوت کەسێك بەوناوە دەیەوێت سەردانت بکات, ڕازی بێت بۆلات– یان نا.
- دوای دە ڕۆژ مانەوەمان لەئۆرشەلیمدا بەدیارکەوت پاشای جولەکەکان هرود شەیدای خاتونەکەی من نەبووەو جوانی وگەنجی هاوسەرەکەی بۆتە ڕێگر لەبەردەم ئەمەی عاشقی کلیۆپاترابێت, لەشەوی یازدەهەمدا, لەوکاتەی من خەریکی خەوتن بووم پێیان گوتم ژنێك هاتووە دەیەوێت بتبینێت, دیاربوو

پاسەوانەکان ڕێگایان نەدابوو بێتەناو کۆشکی پاشایەتیەوە، بۆیە ئەو لەبەردەم دەروازەکەدا بەچاوەڕوانی منەوە ڕاوەستابوو, لەپاسەوانەکانم پرسی: ئەو ژنە کێیەو چ کارێکی بەمنە؟

- گوتیان ئەو ژنە ناوی خۆی نالێت وپەرچەی داداوەتەوە بۆئەوەی دەموچاوی دیارنەبێت, بەلام دەلێت ئەگەر شرمیون بمبینێت ڕێگامدەدات بێمەناو کۆشکی پاشایەتیەوە.
- -لێم پرسین شێوەو ڕەفتاری ئەوژنە چۆنە؟
- -پاسەوانەکان گوتیان: ژنێکی بالابەرز وجلوبەرگێکی جوانی لەبەرەو لە دەولەمەندەکانی ئۆرشەلیم دەچێت, بەلام چونکە پەرچەی کردووە نازانرێت گەنجە-یان پیر.
- -گوتم بچن پێی بلێن ئیستا شەوەو باسبەینێ بێتەوە بۆلام.
- پاسەوانەکان گوتیان ئەوژنە سورە لەسەر ئەوەی لەم کاتەدا تۆ ببینێت ودەلێت ناتوانێت سبەی بێتەوە, منیش بۆدیتنی ئەو ژنە لەکۆشك چوومە دەرێ، لەبەرئەوەی من ئەوم نەدەناسی نەمدەتوانی ڕێگای پێبدەم بێتە ناوکۆشکەوە, چون ئەگەری ئەوە هەبوو تەنانەت ژن نەبێت, بۆیە پێم باشتربوو خۆم بۆ بینینی بچمەلای، لەدەروازەی کۆشك چوومە دەرێ چاوم بەژنێکی مەقنە پۆشی بالابەرز کەوت, کاتێ ئەو ژنە منی بینی بەزمانی یۆنانی گوتی شرمیون سوپاست دەکەم کەبۆ بینینی من لەکۆشك هاتوویە دەرێ.
- -گوتم بۆتۆ ئێمەت لەمەوبەر دیتووە وادەمناسی؟
- -ژنەکە گوتی: بەلێ، من تۆم لەگەل شاژنی میسر بینیوە.
- -گوتم: پەچەکەت لادە تابتبینم وبتناسم.
- ئەو ژنە ڕووی بەرەوئەولا وەرگێڕا تاپاسەوانەکان نەیبینن ودواتر پەرچەکەی لاداو ڕوخساری دەرکەوت، بینیم ژنێکی چل- یان چل وپێنج سالەیەو لوتێکی کەمێ چەماوەی جولەکانەی هەیە، بەوەی گەنجیش نەمابوو بەلام چاوبرۆ ڕەشەکانی هەرجوانبوون و دەمە گۆشتن وبچوکەکەی دلگیربوون، من لەمەوبەر ئەو ژنەم نەدیبوو, لەگەل ئەوەشدا بەئاشنام دەهاتە بەرچاو،
- -لێم پرسی: تۆ کێی چ کارێکت بەمنە؟
- -ژنەکە گوتی: من خۆم بەتۆ دەناسێنم, بەمەرجێ ناونیشانی من جگەلە شاژنی میسر بەکەسی تر نەلێیت، دوای ئەو قسەیەی پەرچەکەی بەسەر دەموچاویدا دادایەوەو چاو وبرۆ ڕەشەکانی نادیارکردنەوەو گوتی: من ( ئەلکساندرا )ی دایکی مریەمم ومریەم هاوسەری هرودی پاشای جولەکانە, ئەو کاتە تێگەیشتم بۆچی ئاکارو ڕەفتاری ئەو ژنەم بەئاشنا دێتە بەرچاو چونکە ڕووخساری لەڕووخساری کچەکەی مریەم دەچوو, کاتێ گوێم لێبوو ئەوژنە دەلێت دایکی ژنی پاشای جولەکەم, باوەڕم بەقسەکەی کرد, چونکە پۆشاکی گرانبەهاو ئاکاری دەموچاوی ئەوەی نیشاندەدا دایکی مریەمەیە, بەوەی ئەوم ناسی دەبوا بۆڕێزگرتن لەوەی دایکی ژنی پاشای جولەکەیە بیبەمە ناو کۆشکەوە بەلام تێبینی ئەوەم کرد لەوانەیە کینەی لەخاتونەکەی من هەلگرتبێت و بیەوێت زەبرێکی لێبوەشێنێت ولەوانەیە ئەوەی زانیبێت کەخاتونەکەی من دەیەوێت مێردی کچەکەی عاشقی خۆی بکات, بۆیە شێوەی قسەکردنەکەی خۆم گۆڕی و نەمهێنایە ناو کۆشکەوە, دایکی مریەم گوتی ناوم

ئەلکساندرایە ئەمە ناوێکی یۆنانی بوو, دەمزانی زۆر لەجولەکەکان ناوی یۆنانیان لێیە, ناوە یۆنانیەکان لەخۆرهەڵاتدا دەمێکە باون، تەنانەت جولەکەکان لەدێر زەمانەوە ناوی یۆنانیان لەخۆیان ناوە.

- بەو ژنەم گوت خاتونەکەم بێگومان تۆکارێکی زەروریت بەمنە دەنا بەم شەوە نەدەهاتی ئیستاش پێم بڵێ چ کارێکت هەیە؟

-گوتی: من بۆیە هاتوم بۆلای تۆ تایاریدەم بدەیت کلیۆپاترا ببینم, دەبێ من ئەوببینم وسەبارەت بەمەسەلەیەکی گرنگ لەگەڵیدا قسەبکەم.

-گوتم ئایا دەتوانم لەتۆ بپرسم ئەو باسە چییە؟

-ئەلیکساندرا گوتی: ئەمە باسێکی دوورو درێژە ئیستا ناتوانم لێرەدا بۆت بگێرمەوە بەڵام تەنها ئەوەندەت پێدەڵێم، وابەستەیە بە(خاخام)ی گەورەی پەرستگای جولەکان.

-گوتم ئەی خاتون: ئایا تۆ پێتوایە مەسەلەیەك وابەستەبێت بە(خاخام)ی گەورەی پەرستگای جولەکان پەیوەندی بەشاژنی میسرەوە دەبێت؟

-ئەو ژنە گوتی: بەڵێ شرمیون چونکە من دەمەوێت هاوکاری شاژنی میسر بۆخۆم دەستەبەر بکەم.

-لەئەلکساندرام پرسی: چ کاتێك دەتەوێت کلیۆپاترا ببینیت؟

-گوتی: تازوتر ئەو ببینم باشترە.

-گوتم ئەی خاتوون: تۆ لێرەبە تامن دەچمە لای کلیۆپاتراو بزانم نەخەوتووە ئەگەر بەخەبەربوو پێی دەڵێم تۆهاتوی بۆلای, بەڵام نازانم داخوا رێگات پێدەدات ئەمشەو ببینی- یان نا.

-ئەلکساندرا گوتی: باشە من لێرەدا دەوەستم تاتۆ دەگەرێیتەوە.

-من گەرامەوە ناوکۆشك و بەرەو ژووری خەوەکەی کلیۆپاترا چووم ودیتم نەخەوتووە, بەخاتونەکەی خۆم گوت ئەلکساندرا دایکی ژنی پاشای نەتەوەی ئیسرائیلی هاتووە دەیەوێت تۆ ببینێت، لیشم پرسیوە چ کارێکت پێیە؟ گوتی دەیەوێت سەبارەت بە خاخامی گەورەی پەرستگای جولەکەکان داوای یاریدەدانی لێبکەم.

-کاتێ خاتونەکەی من گوێی لەو قسەیەبوو گوتی: ئیستا ئەو لەکوێیە؟

-گوتم: لەدەرەوەی کۆشکدا چاوەروانە.

-کلیۆپاترا گوتی: بچۆ بیهێنە بۆلام،

دیاربوو مەسەلەی خاخامی گەورەی پەرستگای جولەکەکان شتێکی گرنگبوو,خاتونەکەی من ئەمەی دەزانی بەڵام من ئاگام لێنەبوو, ئیتر چووم بە ئەلکساندرام گوت خاتونەکەی من ئامادەیە بیبینێت ولەگەڵخۆمدا هێنامە ناو کۆشکەوەو بردمە لای کلیۆپاترا, هەرکە ئەلکساندرا گەیشتە ژووری کلیۆپاترا دەستی گرت ولەتەك خۆیدا دایناو گوتی بەبینینت خۆشحاڵبووم، ئینجا بەمنی گوت شرمیون قژم بۆداهێنە, منیش شانەیەکم گرتە دەست وهێواش هێواش پرچەکانیم بۆ شانە دەکرد,

-کلیۆپاترا گوتی ئەلکساندرا چیت هەیە بیڵێ شرمیونیش باوەرپێکراوی منە من هیچ لەئەو ناشارمەوە.

-ئەلکساندرا گوتی: ئەی شاژنی میسر نازانم تۆ ئاگاداری پێشینەی بنەماڵەکەی ئێمەی- نان نا؟

-شاژنی میسر گوتی: من دەزانم ئێوە لەبنەچەی(منحشب)ن و ئەو بنەماڵەیەش بەناوبانگە.

-ئەلكساندرا گوتی: ئەی شاژنی میسر، لەو ڕۆژەوەی برایانی منحشب توانیویانە خاكی كەنعان سەربەخۆ وئازادبكەن خاخامی گەورەی پەرستگای ئێمە هەمیشە لە كەسانێك هەڵبژێردراون كەلەنەوەی منحشب بوون، بەڵام هرود ئەم نەریتەی پێشێلكردووەو یەك جولەكەی خەڵكی شاری( بابل )ی بەخاخامی گەورەی پەرستگاكەی ئێمە داناوە.

-كلیۆپاترا گوتی: ئەوم دیوە دەیناسم،

-ئەلكساندرا گوتی: لەو ڕۆژەوەی بنەماڵەی ئێمە لەسەرۆكایەتیكردنی پەرستگای گەورە وەلانراوە، ئێمە سوكوڕیسوا بوین وخەڵك بەلالوتییەوە سەیرمان دەكەن، دوای ئەوەی هرود ئێمەی لەسەرۆكی پەرستگا لابرد بۆئەوەی چاكەمان لەگەڵدابكاو خۆشەویستی خۆی نیشانبدات كچەكەمی كردە هاوسەری خۆی، بەڵام من دەزانم ئەمە لەپای خۆشەویستی ئەوەوە نەبوو بۆئێمە، بەڵكو هرود عاشقی كچەكەم ببوو بۆیە هێنای، بەمەش نەیتوانی سەرشۆڕیەكەی ئێمە لاببات لای خەڵك.

-خاتونەكەی من گوتی: ئەلكساندرا چۆنچۆنی هرود توانی نەریتی دێرینی ئێوە لاببات و پیاوێكی تر كەلەپشتی (منحشب)یەكان نەبێت بەسەرۆكی پەرستگای جولەكانی دابنێت؟ من دەزانم ئێوە زۆر ڕێز لەنەریتی خۆتان دەگرن وپاشاكانی پێشوتان نەیانتوانیوە نەریت بگۆڕن.

-ئەلكساندرا گوتی: ئەوەی بووە هۆی ئەوەی هرود بتوانێت جولەكەیەكی بابلی بكاتە سەرۆكی پەرستگا ئەوەبوو كوڕەكەی من منداڵبوو وكەسی تریش لەبنەماڵەكەماندا نەبوو كەشایستەی سەرۆكایەتی پەرستگای گەورەبێت، بەڵام ئیستا كوڕەكەم گەورە بووەو دەتوانێت ببێتە لێپرسراوی یەكەمی پەرستگای گەورە.

-كلیۆپاترا پرسی: ناوی كوڕەكەی ئێوە چیە؟

-ئەلكساندرا گوتی: ناوی كوڕەكەی من( ئاریستوبول)ە،

-شاژنی میسر گوتی: باشە دەتەوێت من چیت بۆبكەم؟

-ئەلكساندرا گوتی: من لەتۆ داواكارم یارمەتیم بدەیت تائانانلی لەسەر سەرۆكایەتی پەرستگا لابرێت وكوڕەكەم بچێتە شوێنەكەی، بۆیەش داوای یارمەتی لەتۆ دەكەم چونكە تۆدەتوانیت هرود ناچاربكەیت ئەوپیاوە لەسەرۆكایەتی پەرستگا لاببات لەبەرئەوەی پاشا گوێ لەداواكاریەكانی تۆدەگرێت.

-كلیۆپاترا پرسی: ئەگەر من ئەم كارە بكەم چ كەڵكێكی بۆ من دەبێت؟

-ئەلكساندرا گوتی: من نازانم تۆ چاوەڕوانی چ لەمن دەكەیت، بەڵام هەرچیت بوێ دەتدەمێ.

-كلیۆپاترا گوتی: ئەلكساندرا من پێویستم بەپارەی تۆنییە چونكە خۆم بەتواناو خاوەن سامانم.

-ئەلكساندرا گوتی: دەزانم تۆ دەوڵەمەندترین ژنی دنیای.

-كلیۆپاترا گوتی: من داوای خاك دەكەم لەتۆ ئایە تۆ ئامادەی لەبەرامبەر ئەوەی كوڕەكەی تۆ بكەمە خاخامی گەورەی پەرستگای جولەكەكان تۆفەڵەستین بدەیت بەمن و بكەوێتە ژێر دەسەڵاتداریتی من؟

-ئەلكساندرا گوتی: ئەی شازادەی میسر بۆخۆت دەزانی ئەوكارە لەدەست من نایەت، چونكە ئەگەر كوڕەكەی من ببێتە سەرۆكی پەرستگاش هەرناتونێت وڵاتی ئیسرائیل بە كەسانی تر بدات، تەنها پاشای نەتەوەی جولەكە دەتوانێت ئەوكارەبكات.

-كلیۆپاترا گوتی: خاخامی گەورەی پەرستگای جولەكەكانیش دەتوانێت ئەوكارە بكات،

-ئەلکساندرا گوتی: ئەی شازادەی میسر من نەمبیستوە خاخام بتوانێت خاکی ولات بەخەڵکانی تر ببەخشێت.

-کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر خاخامی پەرستگاکەی ئێوە ببێت بەپاشا دەتوانێت فەلستین بکات بەبەشێك لەخاکی ژێر دەسەلاتداریەتی من؟

-ئەلکساندرا بەسەر سامیەوە لەشاژنی میسر خۆربوەو هیچی نەگوت،

-کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر پاشای ئێوە بمرێت وجێنشینی نەبێت کێ لەجێگای ئەو دادەنرێت؟

-ئەلکساندرا گوتی: هەرکاتێ پاشای نەتەوەی ئیسرائیل بمرێت وجێنشینی نەبێت ئەوا خاخامی گەورەی پەرستگا کاروباری دەولەت دەگرێتە دەست.

-کلیۆپاترا گوتی: کەواتە خاخامی پەرستگای گەورەی ئێوە دەتوانێت ببێت بەپاشا؟

-ئەلکساندرا گوتی: بەلێ،

-کلیۆپاترا پرسی: ئایا کچەکەت کەشوی بەپاشا کردووە کوڕی لێی هەیە- یان نا؟

-ئەلکساندرا گوتی: نەخێر،

-شاژنی میسر گوتی: ئەگەر هرود بمرێت کوڕەکەی تۆ کەبوبێت بەسەرۆکی پەرستگای گەورەی ئێوە دەبێت بەپاشاو دوای ئەوەی کاروباری دەولەتی گرتەدەست دەتوانێت ولاتەکەتان بخاتە ژێر دەسەلاتداریەتی من ومنیش ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی دەهێلمەوە.

-ئەلکساندرا گوتی: هرود گەنجە نامەوێت بمرێت.

-شاژنی میسر گوتی: زۆرجار گەنجەکانیش وەك بەسالاچوەکان دەمرن.

-ئەلکساندرا بەخێسەوە لەشاژنی میسری ڕوانی وگوتی: مەبەستت لەچییە ؟

-کلیۆپاتر گوتی: من کوڕەکەی تۆ دەکەمە سەرۆکی پەرستگا ئینجا کەهرود پاشای ئێوە مرد، کوڕەکەت لەجێگای ئەودادەنێم ئەوکات فەلەستین دەخەیتە ژێر دەسەلاتداریەتی من؟

-ئەلکساندرا هەر تێنەدەگەیشت مەبەستی کلیۆپاترا چییە، تاخاتونەکەی من گوتی کەکوڕەکەی تۆمکردە خاخامی گەورەی پەرستگا ئینجا هرود لەناودەبەم وئاریستوبولی کوڕت دەکەم بەبەڕێوەبەری کاروبارەکانی دەولەت.

-ئەلکساندرا بەو پلانە ڕازی بوو وکلیۆپاترا نامەیەکی بۆئەنتوان نوسی وتێدا داوای ئەوەی کردبوو فەرمان دەربکات ئانانل لەسەر سەرۆکایەتی پەرستگای گەورەی جولەکان لاببات وئاریستوبول لەجێگای ئەودا دابنێت، چونکە پلەی گرتنەدەست سەرۆکایەتی پەرستگای جولەکەکان مافی ئەو بنەمالەیە.

ڕێوڕەسم ئەوەبوو کەبەڕەسمی شورای بالای جولەکەکان سەرۆکی پەرستگا هەلبژێرن، بەلام لەڕاستیدا حکومەتی ڕۆم ئەمانەی دیاری دەکردو بەسەرۆکی پەرستگای دادەنان دوای ئەوەی نامەکە گەیشتە دەستی ئەنتوان، لەوەلامدا نوسیبوی ئەگەر سەرۆی پەرستگا لاببرێت هرودی پاشای ئیسرائیل تورەدەبێت وئەمەش کێشە بۆمن دروستدەکات جگەلەتورەیی هرودیش ئەم کارە ڕەنگدانەوەی خراپی بۆمن دەبێت لە ڕۆمدا، چونکە بەردەوام نەتەوەی جولەکە لای ڕۆمییەکان ڕێزی تایبەتیان بۆدانراوەو پەرلەمانی ڕۆم نایەوێت جولەکەکان لەخۆی بڕەنجێنێت، کاتێ ئەم نامەیە گەیشتە خاتونەکەم بەمنی

گوت شرمیون ئەگەر بیرم نەچوبێتەوە, مێردەکەت موزایك کارەو لە کۆشکی پاشایەتی ئەسکەندەریەدا کاریکردووەو لەوێشدا ئاشنایی لەگەڵ تۆدا پەیداکرد.

–گوتم بەڵێ ئەی خاتونەکەم: ئەو پێنج ساڵ لەیۆنان و پێنج ساڵیش لەڕۆمدا کاری مۆزایکی کردووەو فێری ئەو هونەرەبووە،

–کلیۆپاترا گوتی: هەموو مۆزایك کارێك نەقاشیشە ئەگەر وێنەکێش نەبێت ناتوانێت مۆزیککاری بکات(1).( لەکۆندا ئەوەی موزایك کاربووبێت نیگارکێشیشی زانیوە– و فارسی)

–گوتم بەڵێ: مێردەکەم نیگار کێشیشە.

–کلیۆپاترا گوتی: بینێرە بۆلام،

منیش چوم مێردەکەم دۆزیەوەو هێنام بۆلای کلیۆپاترا.

–شاژنی میسر لێی پرسی ئایا تۆ نیگارکێشی؟

–مێردەکەشم گوتی: بەڵێ،

–شاژن لێی پرسی: ئایا دەتوانیت وێنەی باش بکێشیت؟

–مێردەکەم بەدوودڵییەوە سەیری کلیۆپاترای کردو بێ دەنگ وەستا،

–کلۆپاترا گوتی: من حەزدەکەم وێنەی کەسێکم بۆبکێشی کەبینەرانی وابزانن خۆیەتی, واتە لەخاوەنەکەی بچێت،

–تیە گوتی: خاتونەکەم من ڕۆژگارێ باش نیگاری هاوشێوەی تەواوی خەڵکم دەکێشا, بەلام بەوەی ماوەیەکە دەستم لێهەڵگرتووە, باوەڕناکەم ئەمرۆ بتوانم وەك جاران دەستڕەنگینبم،

–کلیۆپاترا گوتی: ئایا هیچ نیگارکێشێکت پێ شك نایە کەبتوانێت وێنەی کەسێك وەکو خۆی بکێشێتەوە؟

–مێردەکەم گوتی: من دڵنیام جولەکەکان نیگارکێشی بەتوانایان نییە چونکە زۆر حەزیان لەم هونەرەنییە وهەرگیز نیگارکێشێکی دیاریان نەبووە, لەمیسردا نیگارکێشی باش هەن بەلام ناتوانن وەکو خۆی بیکێشنەوە ئەوانە تەنها بۆجوانکردنی ڕووکەشی کۆشك وتەلارەکان کاردەکەن, بەلام لەسوریادا کەخۆم خەڵکی ئەوێم، چەند نیگارکێشێکی بلیمەت هەن دەتوانن وێنە کێشراوەکەو خاوەنەکەی لێکجیانەکرێنەوە،

–کلیۆپاترا گوتی: هەرئەمرۆ بکەوە ڕێ وبچۆ بۆسوریاو باشترین نیگارکێشم بۆبێنە ئێرەو چەندی حەقدەست ویست لەلایەن منەوە تۆبیدەیە, خاتونەکەی من بانگی ژمێریارە تایبەتیەکەی خۆی کردوو گوتی چەکەیەکی بۆبنوسە تاکو تیە لەبانکی سوریا وەریبگرێت, مێردەکەم هەرئەو ڕۆژە کەوتە ڕێ وخۆی گەیاندە سەردەریا تاسواری کەشتی بێت وبچێت بۆسوریا،

من لەخاتونەکەی خۆم نەپرسی بۆمێردەکەی منت نارد بۆسوریا تانیگارکێشێت بۆ بێنێت، چونکە دەمزانی دوای گەڕانەوەی تیە لەسوریا دەزانم بۆچییە،

کاتێ مێردەکەم لەسوریا گەڕایەوە نیگارکێشێکی ڕیش ماش وبرینجی لەگەڵخۆیدا هێنابوو.

-شاژن لەنیگارکێشە سریانیەکەی پرسی ئایا تۆ دەتوانی وێنەی هاوشێوەی کەسێك وەکو خۆی دروستبکەیتەوە؟

-نیگارکێشەکە گوتی: بەڵێ،

-کلیۆپاترا گوتی: بێ گومان کەرەستەی کاری خۆت لەگەڵخۆتدا هێناوە؟

-نیگارکێشەکە گوتی: بەڵێ،

-شاژن لەئەوی پرسی، ئەی کوا کەرەستەکانی کارکردنت؟

-نیگارکێشەکە گوتی: پێمە،

پیاوە کامڵەکە پاش کەمێ کەرەستەی وێنە کێشانەکەی خۆی هێنا.

-کلیۆپاترا گوتی: وێنەی‌کارەکەرەکەی خۆم شرمیون بکێشەوە.

-نیگار کێشەکە گوتی: دەبێ ئەو دابنیشێت تامن بتوانم ئاکارەکەی لای خۆم وێنابکەم، منیش لەسەر بڕیاری شاژنی میسر دانیشتم وپیاوە نیگارکێشەکەش پاپی(1) ڕۆسێکی(جۆرە کاغەزێکە-و فارسی) خستەسەر تەختەیەکی پانکەڵەو دواتر( کلموس ) یکی(1) (واتە- پێنوس) دەرهێناو لەناو مەرەکەبەکەی هەڵکێشاو دەستیکرد بەنیگارکێشان.

-دوای ماوەیەکی کەم، پیاوە کامڵەکە کەدانیشتبوو هەڵسایە سەرپێ وئەوەی کێشابووی دایە دەستی کلیۆپاترا وگوتی: ئەم وێنەیە بەقەڵەمی ڕەش کێشراوە بۆیە ڕەنگی ڕوخساری دیارنییە، بەڵام کەبتەوێت من دەتوانم ئەو وێنەیە ڕەنگ بکەم و ئەو کات ڕوخساری بەتەواوی دەردەچێت.

-کلیۆپاترا بەمنی گوت: شرمیون وەرە ونەکەی خۆت ببینە.

منیش لەکلیۆپاترا نزیکبوومەوەو بینیم جگە لەوەی ڕەش وسپی بوو ئەوەندە لەمن دەچوو کاتێ بینیم وامدەزانی لەئاوێنەدا سەیری خۆم دەکەم،

-ئینجا شاژنی میسر بەوپیاوە نیگارکێشەی گوت: من تۆ بۆماڵی یەك شازادە خانمی جولەکە دەنێرم تاوێنەی کوڕەکەی کەناوی( ئاریستوبول )ە بکێشیتەوە، ئاریستوبول کوڕێکی تەمەن حەڤدە ساڵەو دەڵێن لەفەلەستیندا کەس لەوقۆزتر نییە، تۆ دەبێ وێنەی ئەو وابکێشی جیاوازی لەگەڵخۆیدا نەبێت، ئایا دەتوانیت لەعۆدەی ئەمکارە بێیت؟

-نیگارکێشە سریانیەکە گوتی: بەڵێ،

دیاربوو ئەلکساندرای دایکی ئاریستوبول دەیزانی خاتونەکەی من دەیەوێت نیگارکێشێك بۆماڵەکەیان بنێرێت تاوێنەی کوڕەکەی دروستبکاتەوە، دواتر شاژنی میسر بەنیگارکێشەکەی گوت نابێ لەوماڵە بێتە دەرێ تاوێنەی ئەوکوڕە دەکێشیت و ئینجا ئەو وێنەیە بۆمن بهێنیتەوەو دواتر ئازادی ودەتوانی بۆسوریا بگەڕێیتەوە.

نیگارکێشە ڕیش ماش و برینجیەکە لەگەڵ تیەی مێردمدا بەڕێ کەوتن، من دڵنیابووم خاتونەکەی من عاشقی ئاریستوبول نەبووە چونکە کلیۆپاترا ژنێك نەبوو عاشقی کوڕی گومناوبێت، هەرچەندە قۆزترین کوڕی ئیسرائیلیشبێت، لەژیانی شاژندا عشق کەرەستەیەکبوو لەفاکتەرە بەهێزەکانی سیاسەتکردن وهەمیشە عشقی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتداریەتی تەختی پاشایاتی خۆی بەکاردەهێنا، من

ئاریسوتوبولی شازادەی جولەکەم نەبینیبوو تائەو ڕۆژەی نیگارکێشە سریانیەکە بەخۆیو لەوحە ڕەنگی یەکەی ناوبراوەوە هاتەناو کۆشکی پاشایەتی ئیسرائیل، ئەوکاتە باوەڕمکرد ئەوجوانترین کوڕی جولەکەیە، دوای ئەوەی کلیۆپاترا نیگارکێشەکەی بۆماڵی ئەلکساندرا نارد تاوێنەی ئارسیتوبولی کوڕی بکێشێتەوە، دوای ئەوەی نیگارکێشە سوریەکە وێنە کێشراوەکەی ئاریستوبولی بۆ خاتونەکەی من هێنایە شازادەی میسر نامەیەکی بۆئەنتوان نوسی و دایە دەستی تیەی مێردم وگوتی ئەم نامەیە و ئەم لەوحەیە بدەرە دەستی ئەنتوان لەسوریا.

ئەوکاتە تێگەیشتم خاتونەکەی من دەیەوێت کەڵك لەخاڵە لاوازەکانی ئەنتوان وەرگرێت وناچاریبکات ئاریستوبول بەسەرۆکی پەرستگای جولەکەکان دابنێت, ئەم ئۆینەی کلیۆپاترا سەریگرت, دوای ئەوەی ئەنتوان وێنەی ئاریستوبولی بینیبوو بۆخاتونەکەی منی نوسیبوو، شازادێکی ئاوا جوان لەئانانل شایستەترە ببێتە سەرۆکی پەرستگای جولەکەکان ومن حەزدەکەم ئەوببینم, بەلام ئەنتوان ئاریستوبولی نەدی, ئەنتوان بۆ لابردنی ئانانل ودانانی ئاریستوبول لەجێگایدا بەهانەیەکی بەجێی بەدەستەوەبوو ئەمیش ئەوەبوو سەرۆکایەتیکردنی پەرستگای گەورەی جولەکەکان مافی تەواوی ڕۆڵەکانی( منحشب )ە، بۆیە( ئانانل )یش کراوە بەسەرۆکی پەرستگا چونکە ئەوکات ئاریستوبول تەمەنی بچوکبووە، ئێستاش ئاریستوبول گەورەبووەو دەبێ ببێتە سەرۆکی پەرستگای گەورەی جولەکەکان.

کاتێ شۆرای باڵای جولەکەکان زانیان ئەنتوان دەیەوێت سەرۆکی پەرستگا بگۆرێت چوون لەهرودیان پرسی ئایا پاشا ئۆئاگاداری ئەو ڕایەی ئەنتوانی- یان نا؟

هرودیش لەبیستنی ئەمە سەرسامبوو ونامەیەکی نووسی, بەلام ئەنتوان لەوەلامدا گوتبووی ئانانل کەسێکی زۆردارە چونکە مافی ئاریستوبولی پێشێلکردووەو ئێستاش ئەو گەورەبووەو دبێ ببێتە سەرۆکی پەرستگای گەورە، پاساو هێنانەوەی ئەنتوان گونجاوبوو, هرود نەیدەتوانی بەهانەیەکی شیاو بۆئەو قسەیە بهێنێتەوە, شورای جولەکەکان بڕیاریاندا ئانانل لابرێت وئریستوبول جێگای بگرێتەوەو ببێتە سەرۆکی پەرستگای گەورەی جولەکەکان, کاتێ دانیشتوانی ئۆرشەلیم بیستیان کەسێکی نەوەی منحشب دەبێتە سەرۆکی پەرستگای گەورە زۆر دڵخۆشبوون وکردیان بەجەژن و بۆئەوەی سەرۆکە گەنجەکەی پەرستگای گەورە بۆبنکەی سەرۆکایەتی ببەن تابوتە(1) (ئەوناوە بەئەسڵ پێی دەگوترێت نخل اتحاد- بەلام بەرزتربووە لە تابووتی مردوان و بۆ بۆنەی تایبەت بەکاریان هیناوە، وەك ڕێپێوانەکان و شەڕکردنەکان، کەخستویانەتە پێشخویان وپێیانوابووە لەبەرەکەتی ئەو تابووتە سەرکەوتوودەبن – یان بەنیازی خۆیان دەگەن، و فارسی )سندوقیە گەورەکەیان هێنا تالەسەرشانی خۆیان بۆپەرستگای ببەن, ئاریستوبولی گەنج بەجلوبەرگی سەرۆکایەتی پەرستگاوە جوانتردیاربوو, هرود پاشای جولەکەکان کاتێ زانی ئەنتوان لایەنگری ئاریستوبول- ە بێدەنگی هەڵبژارد, ئەو ڕۆژەی ئاریستوبول بەرەو پەرستگا دەچوو تاسەرۆکایەتی پەرستگا بگرێتەدەست, هرود لەورووژان ومەراسیم گرتن وپێشوازیکردنی خەڵك بۆئەو بۆی روونبۆوەکە جولەکەکان خۆشیان دەوێت وناتوانێت بەئاشکرا دژایەتی بکات، چونکە زۆری لەسەردەکەوێت, ئیتر هرود کەوتە پلاندانان بۆلەناوبردنی ئاریستوبول لەهەمان کاتیشدا کلیۆپاترا خەریکی داڕشتنی نەخشەیەکبوو بۆ لەناوبردنی هرود, بەلام هرود پلانی

لەناوبردنی ئاریستوبولی زووتر جێبەجێکرد، ئاریستوبول لەوەرزی هاویندابوو بەسەرۆکی پەرستگای گەورەی جولەکەکان. هرود لەباخە تایبەتیەکەی خۆیدا بەسەری دەبرد کەلەشاری ئەریمە بوو وباخەکەی حەوزێکی مەلەی گەورەی تێدابوو, هرود بەبۆنەی هەڵبژاردنی ئاریستوبول ئاهەنگێکی لەوێدا بۆناوبراو سازکردو بانگهێشتی هەندێ گەنجی هاوتەمەنی ئاریستوبولیشی کردبوو بۆئاهەنگە, چونکە گەرمابوو ئەمانە دەستیانکرد بەمەلەکردن, گەنجەکان لەناو حەوزەکەدا مەلەیاندەکردو گاڵتەو گەپیاندەکرد، سەرۆکی پەرستگای گەورەی جولەکەکانیش کەتەمەنی حەڤدە ساڵانبوو بەشداربوون لەومەلە کردنەدا, لەوکاتەدا لەپڕ ئاریستوبول دیارنەما چەند لێی گەڕان نەیاندۆزیەوە پاش دوو ڕۆژ تەرمی ئاریستوبول لەسەرووی ئاوی حەوزەکە سەراو کەوتبۆوە, هەرزوو خاتونەکەی من زانی ئەوە فیکی هرودەو ئەو ئاریستوبولی لەناوبردووە, ئەوگەنجانەی کەلەناو حەوزەکەدا لەگەڵ ئاریستوبول مەلەیاندەکرد هەموویان دەیانگوت ئێمە وامانزانیوە ئاریستوبول لەحەوزی مەلەکە چۆتە دەرێ, بۆیە نەدەتوانرا بکوژی ناوبراو بدۆزرێتەوە, دوای ئەوەی تەرمی ئاریستوبولیان دۆزیەوە هرودی پاشای جولەکەکان پرسەی لەئۆرشەلیم وئەریحەدا دانا, بەڵام نەکلیۆپاتراو نە ئەلکساندرای دایکی ئاریستوبول بەمە فریویان نەخوارد, دوای ئەوەی شازادەی جولەکەکان ئاریستوبول کوژرا, ئەو پلانەی خاتونەکەی من بۆلەناوبردنی هرود دایڕشتبوو هەڵوەشایەوە, چونکە ئەگەر پاشای جولەکەکانی لەناوبردبا کەسێکنەبوو جێگای متمانەی کلیۆپاترابێت ولەشوێنی ئەوی دابنێتەوە, دایکی ئاریستوبول هاتە لای خاتونەکەی من وگریاو گوتی داوات لێدەکەم تۆڵەی خوێنی کوڕەکەم لەهرود بکەیتەوەو لەناوی بەریت، بەوەی زستان داهات ئەنتوان لەسوریاوە چوو بۆ ئەسکەندەریەو نامەیەکی بۆکلیۆپاترا نوسیبوو کەبێتەوە بۆئەسکەندەریە, کلیۆپاترا گفتی بەئەلکساندرای دایکی ئاریستوبولداو گوتی: کەگەڕامەوە ئەسکەندەریە تۆڵەی کوڕەکەت بۆ دەکەمەوە, ئینجا چووینەوە ئەسکەندەریەو هەرکە کلیۆپاترا ئەنتوانی بینی لێی پرسی ها چ دیاریەکت بۆ هێناوم.

–ئەنتوان گوتی: من هیچی وام نەبوو کەشایستەی شاژنێکی جوانی وەك تۆبێت.

–کلیۆپاترا گوتی: کاتێ دڵدار ماوەیەك لەدوولبەرەکەی دووردەکەوێتەوە دیاری بۆ دێنێ ئێستاش من دیاریم لەتۆدەوێت.

–ئەنتوان گوتی: چیت دەوێ تاوەك دیاری بتدەمێ؟

–کلیۆپاترا گوتی: من سەری هرودم وەك دیاری لەتۆدەوێت.

–ئەنتوان گوتی: بۆ هرودی پاشای جولەکەکان چیکردووە واتۆ داوای سەری بڕاوی ئەو دەکەیت؟

–کلیۆپاترا گوتی: هرود ئاریستوبولی سەرۆکی پەرستگای ئۆرشەلیمی کوشت, لەمەش خراپتر بەکوشتنی ئەو پلانەکەی کەبۆخستنە پاڵی خاکی فەلەستین بۆسەر خاکی میسر دامڕشتبوو هەڵوەشاندەوە.

–ئەنتوان گوتی: کوشتنی هرود کەڵکی نییە چونکە دوای ئەوەی سەری بڕاوی ئەوم وەك دیاری دایە تۆ, خاخام ئانانل دەبێتە پاشای جولەکەکان چون ئەو جێگری نیە, ئەگەر دەتەوێت تۆڵەی لێبکەیتەوە ئەوا دەستبەسەر زێڕو گەنجینەکەیدابگرە, ئەمە جگە لەوەی ئەگەر سەری هرود بپەڕێندرێت ئەوا لەڕۆمدا دەنگی ناڕەزایی بەرزدەبێتەوە, لەوانەیە پەرلەمانی ڕۆم دژبەمن دەست بۆبەکارهێنانی هێزو

کاری سەربازی ببات وبیەوێت تۆڵەی ئەوم لێبکاتەوە، چونکە ئوکتاو ئەم هەلە بۆخۆی دەقۆزێتەوە تاهێرش بکاتە سەرمن.
کلیۆپاترا زانی ئەنتوان ڕاستدەکات, خاتونەکەی من ژنێك نەبوو کەئەمشتانە لەبەرچاو نەگرێت ونەزانێت, ئەگەر کلیۆپاترا بەپلانی خۆی هرودی کوشتبا ئەوا لەڕۆمدا دەیانگوت هرود دوژمنی خۆی هەبووەو کوشتویەتی بەڵام کەئەنتوان کوشتبای و ئاشکرابا ئەوا ئەمە ڕەنگدانەوەی خراپی دەبوو وپەرلەمانی ڕۆم لەژێر فشاری ئوکتاودا ناچاردەبوو بڕیارێك دەربکات بەهێرش کردنەسەر ئەنتوان، لەوکاتانەدا خاتونەکەی من تورەییەکی زۆری لەدڵدابوو بەڵام نەیدزانی چیبکات, ئەنتوان گوتی سەبارەت بە کوشتنی ئاریستوبول من لێپێچینەوەو هەڕەشە لەپاشای جولەکەکان دەکەم و بۆ ڕێککەوتنیش داوای لێدەکەم چی گەنجینەی هەیە بیدات ومنیش بەشێك لەمەت دەدەمێ وتۆش کەمێکی بدەرە دایکی ئاریستوبول وڕازی بکە, بەڵام دەربارەی ئەوەی فەڵەستین بخەیتە ژێر دەسەڵاتداریەتی خۆت جارێ پەلەمەکەو چاوەڕوانی هەلێکی تربە.
ئەنتوان داوای هرودی کرد پاشای جولەکەکان هات بۆئەسکەندەریەو ئەنتوان بە کوشتنی ئاریستوبولی تاوانباریکرد, بەڵام هرود بەرگری لەخۆیکردو گوتی من لە کوژرانی ئاریستوبولدا دەستم نەبووە, ئەو بۆتە قوربانی نەزانی خۆیەو لەحەوزەکەدا خنکاوە, ئەنتوان دەیزانی ناتوانێت کوژرانی ئاریستوبول بەسەر هرودا بسەپێنێت, چونکە هرود بەسەرۆکی پەرستگای جولەکەکانی نەگوتبوو خۆت ڕووتبکەرەوەو مەلەبکە, ناوبراو بەمەیلی خۆی چۆتە ناوحەوزەکە بۆمەلەکردن, بەڵام ئەنتوان هەڕەشەی ئەوەی لێکردو گوتی هەموو ئەو لاوانەی لەوڕۆژەدا مەلەیانکردبوو بۆم دەستگیربکەو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدابکەو ڕاستیەکەم بۆڕوون بکەرەوە, سەرئەنجام لەسەر ئەوە ڕێککەوتن هرود پاشای جولەکەکان سێ کرور سس ترز, بدات تا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا نەکرێت, هرود گوتی بۆدانی ئەوپارەیە دەبێ بچمەوە بۆ فەڵەستین, ئەنتوان لیژنەیەکی لەئەفسەرەکانی خۆی پێکەوەناو لەگەڵ هرودا ناردنی بۆ ئیسرائیل تاپارەکە وەربگرن, دوای ئەوەی ئەو پارەیە گەیشتە ئەسکەندەریە ئەنتوان بە کلۆپاترای گوت نیو کرور سس بۆئەلکساندرای دایکی ئاریستو بنێرە تافەرامۆشی کوژرانی کوڕەکەی پێبێت وکەمێ دڵی سێبوری بێت, ئەنتوان زستانی لە ئەسکەندەریەدا بەسەربردو لەبەهاردا بەرەو سوریا کەوتەڕێ تالەوێوە بچێت بۆ ئاسیای بچوك چونکە( ئارداوتز ) پاشای ئەرمەنستان دەستی لەگەڵ ئاشکانیەکان تێکەڵاو کردبوو وپشتی لەڕۆم کردبوو، دوای ئەوەی ئەنتوان لەشاری فەرهاد ئەسپی ئازەربانجاندا تێشکاو هەڵاتەوە بۆسوریا, ئارداوتزی پاشای ئەرمەنستان زانی ئەنتوان ئەوهێزە سەربازیانەی جارانی نەماوە بۆیە دوای گەڕانەوەی ئەنوان بۆسوریا پاشای ناوبراو لەئێرانیەکان نزیکبۆوەو پەیوەندی پتەوی دروستکرد لەنێوان خۆی وپاشای ئاشکانیەکاندا, ئەنتوان ئەمەی دەزانی بەڵام ئەوکات نەیدەتوانی لەشکرکێشی بکاتە سەر ئەرمەنستان چونکە سوپاکەی لەحاڵەتێکی خراپدابوو, بەڵام ئەمڕۆکە ئەنتوان لە ئەسکەندەریەوە بەرەو سوریا کوتۆتە ڕێ خاوەنی لەشکرە, لەوکاتەدا ئەنتوان ئامادەباشی تەواوی کردبوو بۆهێرشکردنە سەر ئەرمەنسان, بەڵام بۆئەوەی پاشای ئەرمەنستان بەهەڵەداببات پروپاگەندەی ئەوەی بڵاوکردەوە کەدەیەوێت هێرش بکاتە سەر ئازەربایجان وپاشای ئاشکانیەکان لەناوبەرێت, خاتونەکەی من دەیگوت تائەنتوان زیندووبێت, ناتوانێت شەڕی ئاشکانیەکان بکات، چونکە ئەو

پاشەکشە سامناکەی لە وەرزی زستاندا ڕووبەڕووی سوپاکەی بووە لەئازەربانیجان ڕۆحیەتی سەربازەکانی دابەزاندووە، کاتێ سوپای ڕۆمی گەیشتە ئەرمەنستان لەوێدا مانەوەو زۆر کاری دژە مرۆییانکرد کەبچوکترینیان ئەوەبوو دەستیان بەسەر مڵکومالی خڵکەکەیدا گرت، ئەنتوانیش هەرچی گەنجینەی پاشای ئەرمەنستان هەیە دەستیبەسەردا گرت وپاشاو هاوسەرەکەیی وڕۆڵەکانیشی بەدیل گرتن ولەگەڵ خۆیدا هێنانی بۆئەسکەندەریە بۆ تێهەڵێنانەوەی شەڕە دۆڕاوەکەی ئازەربایجان، بڕیاریدا ئاهەنگی سەرکەوتن بگێرێت.

## ئاهەنگی سەرکەوتنی گەورە لە ئەسکەندەریەدا

تائەو مێژووە ڕووینەدابوو سەردارێکی ڕۆمی دوای گەڕانەوەی بەسەرکەوتویی ئاهەنگی سەرکەوتنی لەشارێکی تر جگە لەڕۆم بگێرێت، ئەو ئاهەنگەش نەپەرلەمانی ڕۆم ونەخودی ئەو سەردارەش سازی نەکردبێت، بەڵام ئەنتوان ئەو نەریتەی گۆڕی و ئاهەنگی سەرکەوتنی خۆی لەئەسکەندەریەدا گێڕا، ئەنتوان لەبەرئەوە ئاهەنگی سەرکەوتنی خۆی لەئەسکەندەریەدا سازکرد تالەشکۆمەندی خۆشەویستەکەی خۆی کلیۆپاترا زیادبکات وپاشای ئەرمەنستان وهاوسەرەکەیی وڕۆڵەکانی ئەمان بەبەردەم کلیۆپاترادا تێپەڕن، بەرنامەی ئاهەنگی سەرکەوتن بەمشێوەیە داڕێژا کەلە ناوەندی گۆڕەپانی سێرکی ئەسکەندەریەدا سەکۆیەکی بچوك دروستبکەن کورسیەکی لەزیو دروستکراوی لەسەردابنێن تالەڕۆژی ئاهەنگەکەدا خاتونەکەی من بەجلوبەرگی خوای میسرییەوە لەسەری دانیشێت بۆئەو ڕۆژەش جلوبەرگی تایبەتی کلیۆپاترا بەکردندران کەدامێنی ئەوکراسە پێش کورسیەکەی بەپانتایی چل پێ دەوراندەوری داپۆشێت، لەو ڕۆژەدا کەس نابێ لەدەورپشتی خاتونەکەی مندابێت وخوای میسری بەتەنیا لەسەر تەختی کورسییە زیوەکە دانیشێت.

دواتر پاشای ئەرمەنستان وهاوسەرەکەیی وڕۆڵەکانیان کەبەزنجیری زێڕ کۆتکرابوون، بەبەردەم خاتونەکەی منداتێپەڕێنن، ئەو زێڕەی بۆدروستکردنی زنجیرە زێڕەکەی دەستوپێی پاشای ئەرمەنستان وهاوسەرەکەیی وڕۆڵەکانی خەرجکرابوو لەخەزنەی خودی پاشای ئەرمەنستانبوو، بەپێی ئەو بەرنامەیە دوای ئەوەی پاشای ئەرمەنستان وهاوسەرو منداڵەکانی گەیشتنە بەردەم کلیۆپاترا دەبوا ئەوانە سوژدەیان بۆشاژنی میسر ببردبا و تاماوەی ژماردنی لەیەکەوە بۆسەد سەریان لەسودە هەڵنەگرتبایەوە، دوای ئەوە هەڵسابانەوەو ڕۆیشبان، دوای تێپەڕبوونی پاشاو خێزانەکەی پاشای ئەرمەنستان، دەبوا دە کەس لەلێپرسراوە گەورەکانی حکومەتی پاشای ئەرمەنستان سەریان پەڕێندراباو کرابان بەقوربانی لەپێناو خواکانی میسرو ڕۆمدا، دوای ئەوە شەراب وخواردنیان بەسەر بینەراندا دابەشکرابا، لەو ڕۆژە دیاریکراوەدا هەموو دانیشتوانی ئەسکەندەریە بەرەو سێرکەمك چوون تابتوانن ئەو مەراسیمە ببینن کەبە بۆنەی سەرکەوتنی ئەنتوانەوە سازکراوە، لەکاتژمێری دیاریکراودا

خاتونەکەی‌من سواری کەژاوە تایبەتیەکەی بوو کەسەد کەس هەڵیاندەگرت, لەو کاتەدا چاولەبینینی ئەو جوانیەی ئەو تێرنەدەبوو، گەیشتە گۆڕەپانی سێرکەکەو لەسەر کورسییە زیوینیەکە دانیشت وەستوپێوەندەکانیش دامەنی کراسەکەیان بەچواردەوری‌دا پانکردەوە, من یەکەمجارمبوو خاتونەکەی خۆم وابەجوانی ببینم, کلیۆپاترا لەو ڕۆژەدا وەك خوایەکی ڕاستەقینە دەهاتە بەرچاو وهەرکەسێ ئەوی بینیبا لەبەرامبەر ئەو هەموو مەزنی وشکۆمەندیەیدا حەزی دەکرد کڕنوژ بەرێت, کەمێ بەرنامەی مەراسیمەکە گۆڕانکاری بەسەرداهات ئەویش ئەوەبوو بڕیار وابوو سەرەتا پاشای ئەرمەنستان وخێزانەکەی بەبەردەم کلیۆپاترادا بێن وکڕنوژببەن وتێپەڕن، ئینجا دە لێپرسراوە گەورەکەی حکومەتی ئەرمەنستان بکەن بەقوربانی خواکانی میسرو ڕۆم, ئەمەیان پێچەوانە کردەوە، واتە سەرەتا دە لێپرسراوەکە سەردەبڕان.

من لەو ڕۆژەدا لەلۆژێکدا دانیشتبووم کەوتبۆ ڕووبەڕووی خاتونەکەی خۆم, لە بەرامبەر کلیۆپاترادا پەردەیەکیان دانابوو وەك شانازیکردن بەخوای شکارو لەبەردەم ئەو پەردەیەشدا قەدی دارێکیان چەقاندبوو, ئەو دە کەسە لێپرسراوە ئەرمەنستانیەیان یەك لەدوای یەك هێنان و لەبەرامبەر ئەو قەدە دارە چەقێنراوەدا دایاننان وجەلادکەش بەوەشاندنی یەك زەبری شمشێرەکەی سەری لەلاشەی جیادەکردنەوە, ئەو دە سەر براوەیان لەڕیزیەك لەدەم پەردەکەدا بەرامبەر کلیۆپاترا لەسەر زەوی دانان، دواتر عەرەبانە هاتن ولاشەکانی ئەمانەی لەسێرکەکە برانەدەرێ، ئینجا نۆرەی تێپەڕینی پاشاو خێزانەکەی بوو بەبەردەم کلیۆپاترادا, پاشای ئەرمەنستان سەڵتەی ئەرخەوانی پاشایەتی وتاجی لەسەربوو بەڵام زنجیری زێڕوکۆتیانکردبوو, لەپێشەوەیان پاشای ئەرمەنستان دەڕۆیشت دوای ئەو هاوسەرەکەیی ودواتر دوو کوڕ وکچەکەی لە پشتیانەوە دەهاتن.

لەدەور وپشتی ئەوانیشدا سەربازان بەجلوبەرگی سوری ڕەسمیەوە دەهاتن و ڕمێکی درێژیان بەدەستەوەبوو ئەو سەربازانە بەشێوەیك دەڕۆیشتن کەبەرچاوی کلیۆپاتراو بینەران نەگیرێت, بەپێی ئەو بەرنامەیەی داڕێژرابوو دەبوا فەرماندەی سەربازەکان فەرمان بەپاشای ئەرمەنستان وخێزانەکەی بکات لەبەردەم کلیۆپاترادا کڕنوژببەن, لە ئاست بەردەمی کلیۆپاترادا ئەفسەرە سەربازیەکە فەرمانی‌دا پاشاوخێزانەکەی کڕنوژ بۆ شاژنی میسر ببەن, بەڵام نەپاشای ئەرمەنستان ونەهاوسەرو ڕۆڵەکانی کڕنوژیان نەبرد, بەوەی ئەواتە یاخیبوون وکڕنوژیان نەبرد, من لەدڵی خۆمدا ئافەرینم بۆ ئازایەتی ئەوانە گوت, ساتێکی مەترسیدار هاتەپێش چونکە خێزان وپاشای ئەرمەنستان سەرپێچیانکردو لەبەردەم کلیۆپاترادا سوژدەیان نەبرد، دەبێ ئەوانە بکوژرێن, دەبوا فەرمانی کوشتنیشیان لەلایەن کلیۆپاتراوە درابا, چونکە ئەنتوان لەوێ نەبوو, ئەنتوان دەیویست لەو ڕۆژەدا شکۆمەندی خۆشەویستەکەی خۆی بەدیاربخات و پێی وابوو ئەگەر ئەو لەگەڵیدابێت لەمەزنی وشکۆمەندی ئەو کەمدەکاتەوە, ئەو ئەفسەرە ڕۆمیەی لەگەڵیاندابوو دەیتوانی پاشاو خێزانەکەی ناچاربکەن سوژدە بۆ کلیۆپاترا ببەن, بەڵام بۆ ڕێزلێنان لەکلیۆپاترا ئەو کارەی نەکرد, ئەگەر ئەو ئەفسەرە ڕۆمیەی لەتەك پاشای ئەرمەنستان وخێزانەکەیدابوو بەزۆر کڕنوژی پێ بردبان, وەك سوکایەتی کردنێکوابوو بەخودی کلیۆپاترا چونکە ئەمانە پاشاوخێزانی پاشابوون, لەوسێرکە گەورەی ئەسکەندەریەدا کەس نوقەی لێوە نەدەهات بێ دەنگی باڵی کێشابوو من پێموابوو هەموویان وەك من هەناسەیان لەسینگیاندا ڕاگرتووە,

چونکە هەموویان دەیانزانی بەپێی قانونی ڕۆمی ئەوەی سەرپێچی فەرمانەکان بکات سزای کوشتنەو دەبوا لەوساتەوەختەدا سەری ئادواتز وخێزانەکەی بپەڕێندرابا, ئەگەر کلۆپاترا بەدەستی ئاماژەیەکی کردبا ئەوا یەکسەرە جەللادەکان سەریان لەلاشەیان جیادەکردنەوە, بەڵام شاژنی میسر دەستی نەجولاند, پاشای ئەرمەنستان وهاوسەرو ڕۆڵەکانی دوای ئەوەی ماوەیەك لەبەرامبەر کلیۆپاترادا وەستان کەوتنەوە ڕێ و ڕۆیشتنەوە زیندانەکەیان, بەتێپەربوونی پاشای ئەرمەنستان وخێزانەکەی بەشی گرنگی ئاهەنگەکە کۆتایی هات وهەندێ برگەی تری ئاهەنگەکە کەبۆخۆش گوزەراندنی خەڵکەکەبوو دەستپێکرد, ئینجا شەراب وخواردنیان بەسەر هەموو بینەراندا دابەشیەوەو من لەوکاتەدا لەسێرکەکە چوومە دەرێو گەڕامەوە کۆشکی پاشایەتی, پێش ئەوەی خاتونەکەی من لەسێرکەکە بێتەوە، هەواڵی یاخیبوونی پاشای ئەرمەنستان وخێزانەکەی بەئەنتوان گەیشت, دوای ئەوەی خاتونەکەی من گەیشتەوە کۆشکی پاشایەتی ئەنتوان لەئەوی پرسی بۆبڕیاری کوشتنی ئەوانەت دەرنەکرد؟

-کلیۆپاترا گوتی: بۆیە فەرمانی کوشتنی ئەوانەم دەرنەکرد چونکە بوێری ئاردواتز کاریتێکردم, من وێنای ئەوەم نەدەکرد پاشایەکی دیل کەهەموو شتێکی لەدەستداوە ئەوەندە قارەمانبێت بۆکڕنوژ نەبردنێت لەڕۆحی خۆی ببورێت, ئەگەر من فەرمانی کوشتنی ئەوانمدابا خۆم لەبەرامبەر ئەو پاشایەو هاوسەرەکەیی وکوڕو کچەکانیدا بە لاواز دەهاتەپێشچاو بۆیە چاوپۆشیم لەکوشتنی ئەوانە کرد تاخۆم لەبەرامبەر ئەوانەدا بە بچوك نەبینم.

گێڕانی ئاهەنگی سەرکەوتنی ئەنتوان لەمیسردا بەشێوەیەکی زۆر خراپ لەڕۆمدا دەنگیدایەوە, کەدەسەڵاتدارانی ڕۆم پێیانوابوو ئەرزو ئاسمان لێکیداوە, هەرگیز ڕووی نەداوە ئاهەنگی سەرکەوتنی یەك سەرداری ڕۆمی لەشارێکی تر جگەلە ڕۆم بەرپا بکرێت, ئەنتوان ئەم باوەی داهێنا, لەڕۆمدا ئەوکارەی ئەنتوان وەك یاخیبوون دەنگی دایەوەو قسەیان لەسەر ئەوەدەکرد لەشکرکێشی بکەنەسەر ئەنتوان وبیکوژن, بەڵام دواتر ئەنتوان دیاری بەنرخی بۆ سیناتۆرەکانی ڕۆم ناردو ئەوانە تورەبونەکەیان دامرکایەوە, ڕۆژێکیان کلیوپاترا بەمنی گوت: پاش مانگێکی تر مەراسیمێك لەتەك گۆڕەکەی ئەسکەندەردا (أ) (مەبەست لەمەزاری ئەسکەندەی گەورەیە، هەرچەندە تەواو ساغ نەبوتەوە گۆڕی ناوبراو لەکوێدایەو مێژوو نووسەکان لەسەر شوێنی گۆڕی ئەسکەندەر کۆکنین کەلە میسردابیت- و فارسی) دەکرێت کەپێشینەی نەبووەو نابێ، ئەو کەسانەی لەشاری ئەسکەندەریە شارەزان دەزانین لەشاریگای ناوشارەوە بۆسەر گۆڕی ئەسکەندەر چەند دوورە، دوای مانێك بانگەوازیانکرد خەڵك بچێت بۆسەر گۆڕی ئەسکەندەر چونکە لەوێدا پلەوپایەی تر بەشاژنی میسر دەدرێت، لەتەك گۆڕی ئەسکەندەردا کەکەوتۆتە دەم دەشت، بەئاسن وتەختە سەکۆیەك و کورسی تایبەتیان دروستکردن بۆئەنتوان وکلیوپاترا وسیزاریۆنی کوڕی سیزار کەبەرەسمی بەڕۆڵەی خۆی ناساندو سێ ڕۆڵەکەی تری کلیوپاتراش دوانیان جۆتلانەبوون، تالەسەر ئەو کورسییانە دانیشن، لەوڕۆژە دیاریکراوەدا ئەو شەش کورسییە دانران کەهی ئەنتوان و کلیوپاترا گەورەتربوون لەکورسیەکانیتر، خەڵکێکی زۆر لەسەر گۆڕی ئەسکەندەر کۆبونەوە بۆبینینی ئەوئاهەنگە، سەرەتا کلیوپاترا لەسەر کورسیەکەی دانیشت ودواتر

ئەنتوان وئینجا سیزاریون و منداڵەکانی تر دانیشتن، ئەوکات تەمەنی سیزاریۆن (13) ساڵانبوو، بەلاّم دوو منداڵە جووتلاّنەکەی کلیوپاترا کەلە ئەنتوان بوون تەمەنیان نەگەیشتبوّ شەش ساڵان، دوای دانیشتنی ئەمانە، بەتلمیوس کوڕە بچۆلانەکەی کلیوپاترا دانیشت، دوای ئەوە بۆقچی سوپا دەستیکرد بەبوق لێدان ئەمەش واتای سەرەتای دەستپێکردنی ئاهەنگەکەی دەگەیاند، ئینجا ئەنتوان وتەیەکی پێشکەش کرد وگوتی لەمڕۆوە کلیوپاترا دەبێتە شاژنی میسر وقوبرس وهەندێ لەخاکی فەلەستین وناونیشانی شای شاهانی پێ دەبەخشرێت، دواتر ئەو تاجە تازەیەی کەبۆ خاتونەکەی من دروستکرابوو، ئەنتوان نایەسەری ئەو و ئینجا سیزاریونی نیشانی خەڵکداو گوتی هەمووتان دەزانن شاژنی میسر لەرابردودا ژنی سیزاربووەو ئەم منداڵەش کەناوی سیزاریۆنە کوڕی سیزارەو لەمڕۆ بەدواوە ئەوکوڕە بەشای شایان دەناسرێت وتاجی تایبەت لەسەردەنێت، دواتر ئەو تاجەی کەبۆ سیزاریۆنیان دروستکردبوو نایانە سەری، پاش کەمێکیتر ئەنتوان ئامارەی بۆئەلکساندەر هلیوسی کردو(1) ( ئەلکسەندەر هلیوسی کوڕە- و فارسی)گوتی لەمڕۆ بەدواوە ئەلکساندەریش دەبێتە خاوەن پلەوپایەی پاشای ئەرمەنستان وهەموو خاکی نێوان روباری فرات وروباری سند، تاجێکیشی نایە سەری ئەویش، دیارە ئەو شوێنانەی بۆ دەسەلاّتداریتی ئەو دانرابوون لەژێر رکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا نەبوون، بەلاّم چونکە بەئومێدی ئەوەبوو بیانخاتە ژێر دەسەلاّتداریەتی خۆی بۆیە ئەوی کرد بەپاشای ئەوخاکانە، ئەو ولاّتانەی کەکەوتبوونە خۆرئاوای میسریش دران بەکلیوپاترا سلنەی کچی کلیوپاتراو بەتلمیوسیش کە تەمەنی دووساڵانبوو بووبە پاشای ئاسیای بچووك، وەك دیارە هەریەك لەمنداڵەکانی کلیوپاترا بوون بەشای چەند ولاّتێك وئاشکرایە ئەمانە نەیاندەتوانی حوکمی ئەو شوێنانە بکەن و خاتونەکەی من پاشای راستەقینەی ئەوشوێنانەبوو، لەنێوان ئەو شتانەی کەلەو ڕۆژەدا ئەنتوان ئامارەی بۆکرد ئەوەبوو سیزاریۆنی بەڕۆڵەی شەرعی سیزار وکلیوپاترا لەقەڵەمدا ئەمە لەڕووی سیاسییەوە زۆر گرنگبوو چونکە ئوکتاو-ی رکەبەری ئەو لەڕۆمدا خۆی بەکوڕی سیزار ناساندبوو ودەزانی، ئەنتوان دەیویست لە ڕێگای قانونیەوە بسەلمێندرێت کەسیزار کوڕی شەرعی هەیە ولەئەسکەندەریەدایە، ئەو پروپاگەندەیەی ئوکتاوکە کوڕی سیزارەو هەموو لایەکیش دەیانزانی ئەو لەپشتی سیزارنیەو تەنها زرکوڕیەتی، ئەمە مەترسی دەخستەسەر پلەوپایەی ئەو لەڕۆمداو دەبوا سیزاریۆن بوبا بەجێگرەوەی سیزار، ئوکتاو بەبیستنی ئەوەی ئەنتوان سیزاریۆنی بەکوڕی کلیوپاتراو سیزار ناساندووە، بەمە ئەوەی نیشانداوە کەدڵی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم، شاری ڕۆم نییە بەڵکو ئەسکەندەریەیە، هەروەها هەندێ لەو ولاّتانەی کەئەنتوان بەکوڕەکەی کلیوپاترای بەخشی وتاجی حوکمڕانی ئەوانی خستە سەری لەژێر دەسەلاّتداریەتی ئوکتاودابوون، بەلاّم لەگەڵ ئەمانەشدا ئەنتوان و کلیوپاترا وایانیشاندا کەنەخشەی ئەمانە لەسەرهەمان رەوشی ئەسکەندەری گەورەیەو دەیانەوێت هەموو ئەو ولاّتانەی کەئەسکەندەری گەورە خستبونیە ژێر رکێفی خۆی ئەمانەش بیخەینە ژێر دەسەلاتداریەتی میسر، بۆیە ئەو تاج بەخشینانە لەسەر گۆڕی ئەسکەندەربوو، ئەوەندەی من لێی تێگەیشتبم خاتونەکەی من وئەنتوان دەیانویست یەك ئیمپراتۆریەتی تازە دروستبکەن وسەربەخۆ ئەوئیمپراتۆریەتە دانێن ورایبگەیەنن کەڕۆم بەدڵی ئیمپراتۆری نازانن وئەسکەندەریە دڵی

ئیمپراتۆریەتیەو بەناوی ئیمپراتۆریەتی خۆرهەلاتەوەیە، ئەوی لەهەموو شتێك زیاتر سەبارەت بەئوکتاو مەترسی هەبوو، مەسەلەی بەرەسمی دانپیانانی ئەنتوانبوو بەبەشەرعی ناسینی سیزاریون بەکوڕی شەرعی سیزارو کلیوپاترا، بەوەی ئەنتوان رایگەیاند سیزاریۆن بوو بەشای شاهان و ولاتێکی بەئەوبەخشی، چونکە دەیویست سیزاریۆن ببێتە ئیمپراتۆری رۆم، ئەو رۆژەی لەتەك مەزارەکەی ئەسکەندەری گەورە پاشا تازەکان دیاریکران و هەموویان منداڵی کلیوپاترابوون، دەمزانی ئەوەی ئەو نەخشەیەی کێشاوە خاتونەکەی منە، چونکە ئەنتوان سەری لەکاروباری سیاسی دەرنەدەچوو وئەوەندە بیرمەند و وشیارنەبوو، بەڵکو ئەو تەنها جێبەجێکەری ئەو نەخشەیەبوو، کلیوپاترا بەدانانی ئەو پلانە دەیویست ببێتە جێنشینی ئەسکەندەری گەورە، بەو جیاوازیەی کاتێ ئەسکەندەری گەورە مردوو منداڵی لەدوا بەجێ نەمان ئیمپراتۆریەتیەکەی پارچەپارچە بوو وهەربەشەی کەوتە دەست شاو میرێك، بەلاّم خاتونەکەی من دەیویست دوای مردنی خۆی رۆڵەکانی لەوئیمپراتۆریەتەدا حوکمبکەن ولەرێگای منداڵەکانیەوە ناوەکەی بەزیندویی بمێنێتەوە، لەبەرئەوەشبوو هیچ لەرۆڵەکانی ئەو جگەلە سیزاریۆن ناوی باوکیانیان هەڵنەگرتبوو، ناوی سیزاریۆنیش شاژنی میسر بۆبەرژەوەندی سیاسی نابووی تائەو کوڕەی بتوانێت کەڵك لەکەسایەتی وگەورەیی ومیراتگرەوەیی سیزار وەربگرێت، خاتونەکەی من دەیویست پێشئەوەی ئەنتوان بمرێت رەگوڕیشەی ئیمپراتۆریەکەی خۆی بەهێزبکات، تاکە ئەنتوانیش مرد رۆم نەتوانێت ئیمپراتۆریەتیەکەی لەناوبەرێت، لەرۆمدا باش بۆیان ئاشکرابوو کەهۆکاری دروستکردنی ئەو ئیمپراتۆریەتیە تازەیەی خۆرهەلات کلیوپاترایە نەك ئەنتوان، ئوکتاو ونوێنەرانی پەرلەمانی رۆم دەیانزانی ئەنتوان ئەو پیاوەنییە بتوانێت ئەونەخشەیە داڕێژێت، بەڵکو ئەوە خاتونەکەی منە کەدەتوانێت نەخشەی ئاوا داڕێژێت، ئیتر وردە وردە بەبەسەرچوونی کات راستی تیشکانەکەی ئەنتوانیش لەشاری فەرهاد ئەسپ مەعلومبوو وئوکتاو وسیناتۆرەکانی رۆم زانیان کەئەنتوان لەشەڕی ئازەربایجاندا تیشکاوەو ئەو نامەی بۆئەوانیشی ناردبوو بەوەی سەرکەوتوو بووە لەو شەرەدا درۆ و هەڵبەستراوبووەو ئەو پارە زۆرەی کەگوایە لەئازەربایجاندا بەتالاّن گرتبوی هی کلیوپاترا بووە، بۆیە لەرۆمدا دوژمنکارانی خاتونەکەی من زۆربوون وئەندام پەرلەمانەکان لەپەرلەمانی رۆمدا رەخنەیان لەکلوپاترا گرتبوو وقسەی سوکیان پێ گوتبوو، رۆژێکیان یەکێك لەو سیناتۆرانە لەوتەیەکی خۆیدا گوتبوی، من زانیاری تەواوم لەسەر ئەوە پێگەیشتووە کەکلیوپاترا مامۆستای بۆمنداڵەکانی خۆی گرتووە تاداب ونەریتی پاشایانی خۆرهەلاتی فێری رۆڵەکانی بکات ولەمانەش مامۆستایەك بەناوی (نیکولا)ی خەڵکی دیمەشق خەریکی تەربیەتدانیانەو دەیانەوێت (ئەلکساندەرهلیوسی) کوڕی کلیوپاترا فێری زمانی پاهلەوی بکەن، چونکە ئومێدەوارن ناوبراوببێت بەپاشای ئێران، ئەمە راستبوو خاتونەکەی من بۆفێرکردنی کوڕەکەی مامۆستایەکی بۆگرتبوو تافێری زمانی پەهلەوی بکات، هەمان ئەوسیناتۆرە لەدەقی وتەکەیدا گوتبووی کلیوپاترا رۆحی بزوێنەری ئەنتوانەو هەموو ئەوکارە سیاسیانەی ئەنتوان دەیکات لەکلیوپاتراوە سەرچاوە دەگرن ئەگەر دەتانەوێت ئەنتوان دژی رۆم کاری نابەجێ نەکات ئەوا کلیوپاترا بکوژن- یان لێی دوربخەنەوە، بەلام کلیوپاترا بە شێوەیەکی وا وشیارانە ئاگاداری خۆی دەکرد کەس نەیدەتوانی زەفەری پێبیات، دوای ئەوەی مەعلوومبوو رۆم دەیەوێت زەبر لەکلیوپاترا بوەشێنێت ئیتر خاتونەکەی من کەمتر لەکۆشك دەچۆ دەرێ، کاتێ ویستباشی بچێتە دەرێ کۆمەڵێ

سەربازی تایبەتی لەگەڵخۆیدا دەبردن وچواردەوری کەژاوەکەیان دەگرت ونەیاندەهێشت کەس لەکلیۆپاترا نزیکبێتەوە, یەکێك لەو ڕەخنە گەورانەی ئۆکتاو لەئەنتوانی دەگرت ئەوەبوو ئەنتوان پاشای ئەرمەنستان وژن و منداڵەکانی گرتوون لەکاتێکا ئەوانە دۆستی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمبوون وگیرانی ئەمانە نەنگی وشورەییە بۆ ڕۆم, ئەنتوان لەبەر ئەوە لەشکرکێشی کردەسەر ئەرمەنستان تاتێشکانەکەی خۆی لەبەرامبەر ئازەربایجاندا پربکاتەوەو بشارێتەوە, ئەو ڕۆژانەی ئەنتوان ئاهەنگی سەرکەوتنی خۆی بەسەر وڵاتی ئەرمەنستاندا دەگێرا, خەڵك درکیان بەو ڕاستیە دەکرد کەئەو مەراسیمە گەورەیە زۆری زیادەو نەدەبا ئەنتوان بۆئەو سەرکەوتنەی ئەوئاهەنگە گەورەیەی سازکردبا وپاشاو خێزانەکەی ئەرمەنستانی بەدیلی هێنابان بۆمیسر, من بوێری پاشای ئەرمەنستان و ژن و منداڵەکانی ئەوم بەناکۆك ودژ بەمەزنی کلیۆپاترا دەزانی بەڵام دوای ئەوەی ڕاگەیێندرا کەکوڕی کلیۆپاترا بەڕەسمی کرابە پاشای ئەرمەنستان, ئیتر خاتونەکەی من نەیدەتوانی ئاردواتزو هاوسەرەکەیی ومنداڵەکانی ئازادبکات.

ئوکتاو دەیزانی ئامانجی ئەنتوان بەوەی سیزاریۆنی بەکوڕی ڕەسمی سیزار ناساندووە زیاتر بۆجێگا پێلێژکردنی ئەوە, بۆیە فەرمانی بەسیناتۆرەکان کردبوو کەلە پەرلەماندا وتە دژبە ئەنتوان پێشکەشبکەن, ئەمانەش لەوتەکانی خۆیاندا هێرشیان دەکردەسەر ئەنتوان ودەیانگوت سیزاریۆن ڕۆڵەی سیزارنییە بەڵکو کوڕی بەتلیموسی چواردەهەمە, هەندێ لەسیناتۆرەکان لەوتەکانی خۆیاندا پروپاگەندەی ئەوەیاندەکرد کەکلیۆپاترا سیزاریۆنی لەسیزار نەگرتووەو شاژنی میسر سیزاری ناچارکردووە ڕۆڵەکەی خۆی بە کوڕی خۆی قەبوڵبکات, سیناتۆرەکان لەوتەکانی خۆیاندا دەیانگوت گریمان منداڵەکەی کلیۆپاتراش لەپشتی سیزار بزانرێت, دەبێ پەرلەمانی ڕۆم دانی پێدانێ نەئەنتوان, ئەنتوان بۆی نییە ئەوە ڕابگەیەنێت سیزاریۆن ڕۆڵەی سیزارە چونکە ئەمە لە کەسایەتی ومەزنی ئیمپراتۆرو دیکتاتۆرێکی وەك سیزار کەمدەکاتەوەو دەبێ ئەو ببێتە جێنشینی حەقی ئەو. خودی ئوکتاویش لەوتەیەکیدا هێرشیکردەسەر ئەنتوان وگوتی ئەوپیاوە لەبری ئەوەی کاتەکانی خۆی بۆکاروباری ئیمپراتۆریەتی ڕۆم تەرخانبکات هەموو کاتەکانی خۆی لەگەڵ کلیۆپاترادا بەسەردەبات و بۆمەعشوقەکەیەتی، کاتێ ئەنتوان ئەوقسەیەی ئوکتاو-ی بیستەوە نامەیەکی بۆئوکتاو ناردوو تێیدا نوسیبووی گریمان من مەعشوقەی کلیۆپاترابم, ئایا تازە عاشقیبووم- یان لەمێژساڵە من بوومە هاوبەشی ژیانی ئەو؟ بۆ تۆ تائێستا دژی ئەو مەسەلەیە نەبووی وئیستا هاوارت لێبەرزبۆتەوە؟ بەلای تۆوە پێکەوەبوون ودۆستایەتی کردنی پیاوێك لەگەڵ ژنێکدا ئەوەندە گرنگە کەواتۆ ئەوهات وهاوارەی لەسەربنێیتەوە؟ ئەنتوان دەیزانی ئوکتاو مەسەلەی پەیوەندی نێوان خۆیی وکلیۆپاترای کردۆتە دەستەواژەو کەرەستەیەك بۆ سوككردنی وتەی سیناتۆرەکانی ڕۆم کاریگەریان لەخەڵکی ڕۆمکردبوو, بەڵام ئەو قسانەی ئوکتاو کەدەیگوت ئەنتوان لەگەڵ کلیۆپاترادا ڕادەبوێرێت ومەعشوقەیەتی کاریگەریان لەسەر ڕای گشتی نەبوو, چونکە بەلای ڕۆمیەکانەوە زۆر ئاسایی بوو، ڕۆمیەك لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا ڕابوێرێت.

من لەمەوبەر باسمکرد ئەنتوان ئەوکاتەی کەلە ڕۆمیشبوو کاتەکانی خۆی بۆ ڕابواردن تەرخانکردبوو وتەنها ئەوکاتە دەستی لەڕابواردن وخواردنەوەو عەیش ونەیش هەڵگرت کەلەگەڵ خاتونەکەی مندابوو بەئاشنا بەلای ڕۆمیەکانەوە ئەمە نەببوە جێگای ڕەخنەو کەموکوڕی چونکە ڕۆمیەکان لەلایەنی ڕەوشتی

سێکسیەوە دامێن پسبوون، بەڵام ڕۆمیەکان لەململانێی سیاسیدا هەوڵدەدەن نهێنی یەکتری بزانن بۆئەوەی دژی ڕکەبەرێکانیان بەکاری بهێنن بۆئەوەی ڕیسوایانبکەن، کاتێ ئەنتوان سیزاریۆنی بە کوڕی سیزار ناوبرد، ئوکاتو زانی کوشتنی سیزاریۆن بۆتە شتێکی زەروری چونکە ئەگەر ئەوکوڕە بەزیندویی بمێنێتەوە دەسەڵات وهێزی لەدەست دەردێنێت، ئەوکاتە سیزاریۆن تەمەنی سێزدە ساڵانبوو وسێ چوار ساڵی تر دەگەیشتە تەمەنی باڵقبوون و دەهاتە ناودنیای سیاسەتەوە، جگە لەوەی ناوی باوکی سیزاری هەڵگرتبوو دەیتوانی کەڵك لەوسامانە زۆرەی دایکیشی کلیۆپاترا وەربگرێت، خاتونەکەی من بەوژیری و داناییەی هەبوو دەیزانی سیزاریۆن لەمەترسیدایەو دەبێ بەباشی پارێزگاری لێبکات تادەستی ئەوپیاوخراپە نێردراوانەی ئوکتاو بۆکوشتنی سیزاریۆنی دەنێرێت نەیگاتێ وزەفەری پێنەبەن وبیکوژن، وەك گوتم ئوکتاو وەك ئەنتوان دامێنپیس نەبوو دەیتوانی بەسەرنەفسی خۆیدا زاڵبێت، بەڵام ئەولەگەڵ ئەوەشدا هەندێ خاڵی لاوازی هەبوون کە ئەنتوان بیانکات بەدەستەواژە بۆلێدانی ناوبراو وسوککردنی، ئوکتاو ژنێکی خۆشدەویست ناوی (لیوی) بوو وهاوسەری پیاوێکی ڕۆمی بوو بەناوی( نیرون ) (لێرەدا نیرۆن پیاوێکی ئاسایی رۆمییە، نەك ن یرۆنی دیکتاتۆی بەناوبانگی رۆمی کە ناوی تەواوی ئەو، تی بەریوس، کلودیوس نیرونە – و فارسی) ئوکتاو بەشێوەیەك عاشقی ئەو ژنەببوو تەنانەت هاوسەرەکەی خۆی لەبەرخاتری ئەو تەڵاقداو نێرونی مێردی ئەوژنەی ناچارکرد دەست لەهاوسەرەکەی هەڵگرێت ودواتر ڕاستەوخۆ لیوی کردە هاوسەری خۆی وئەو ژنە ئەوکات سکی پێنج مانگبوو، بەو بۆنەشەوە کۆمەڵی لەدۆست وبرادەرەکانی خۆی بۆئاهەنگی گواستنەوەی لیوی بانگهێشت کردبوو ویەکێك لەمانەش نیرونی مێردی لیوی بوو، ئەشرافەکانی ڕۆم عادەتیان وایە لەکاتێ نانخواردندا پاڵبدەنەوە بەنیوە ڕاکشاوی نانبخۆن، لەوکاتەدا ورگی لیوی بەهۆی ئەوەی سکی پێنج مانگبوو لەسەر نانخواردنەکە بەزەقی بەدیارکەوتبوو وهەموو ئامادەبوان زانیان ئەو ژنە سکی هەیە، لیوی دوای چوارمانگ شوکردنی بەئوکتاو کوڕێکی بوو، بەگاڵتەپێکردنەوە دەیانگوت ئوکتاو بەختی باشی هەیە چونکە ژنەکەی دوای چوارمانگ لەگواستنەوەی منداڵیبووە، بەپێی قانونی ڕۆمی باوکی منداڵ ئەوکەسەیە کەمێردی دایکی بێت، بەڵام ئوکتاو ئامادەنەبوو منداڵەکەی لیوی بەڕۆڵەی خۆی قبوڵبکات ودوای لەدایکبوونی ئەو منداڵە ناردیەوە بۆماڵی نیرون تاباوکە ڕاستەقینەکەی ئەومنداڵە لەڕێگای گرتنی دایانەوە بەخێوی بکات، پەیوەندیەکانی نێوان ئەنتوان وئوکتاو بەشێوەیەك گرژو ئاڵۆزبوو تەنانەت مەترسی شەڕلێکەوتنەوەی هەبوو، خاتونەکەی من بەئەنتوانی گوت: من پێموایە ئوکتاو کە ناتوانێت بەڕێگای سیاسی لەناوت بەرێت بیرلەوە دەکاتەوە لەگەڵتدا بکەوێتە جەنگی سەربازی وتۆش خۆت ئامادەبکە بۆشەڕ چونکە بەهانەی باشت هەیە بۆکۆکردنەوەی سوپاو ئەو بەهانەشت ئەوەیە تۆ دەتەوێت سوپا کۆبکەیتەوە بۆهێرشکردنە سەر ئازەربایجان و لەناوبردنی حکومەتی ئاشکانیان لەئێران، ئەگەر دوابکەویت دوورنیە ناخاڵ بکەویتەبەر هێرش ونەتوانی سوپا کۆبکەیتەوە،

–ئەنتوان گوتی: کۆکردنەوەی سەربازو تەیارکردنیان پارەی دەوێت منیش پارەم نییە،

-خاتونەکەی من گوتی: چەند پارەت بوێت ئەوا من پێتدەدەم وتۆش سوپاکەی خۆت لەسوریادا پڕچەکبکە تاوابزانن دەتەوێت هێرش بکەیتەسەر ئێران وبەردەوامیش ئاگاداری هەواڵەکانی ڕۆم بەوناخافڵنەبیت.

ئیتر خاتونەکەی من دەرگای خەزنەکانی خۆی کردنەوەو دوازدە کرور سکەی زێڕی دا بەئەنتوان تابۆ خەرجی دروستکردنی سوپاو پڕچەککردنیان ومەشقپێکردنیان خەرج بکرێت, بۆ ئەو مەبەستە ئەنتوان چوو بۆسوریا ودوای مانگێك کلیۆپاترا بەمنی گوت شرمیون پێویستە ئێمەش بچین بۆسوریا،

-گوتم چ کات حەزدەکەیت من ئامادەم،

-خاتونەکەی من گوتی: من پێویستە بچم بۆسوریا لەبەردوو هۆ، یەکەم: بزانم ئەو پارەی من دام بەئەنتوان لەخەرجی دروستکردنی سوپادا بەکاری هێناوە, دووەمیش بۆ ئەوەی نەیەڵم ئەنتوان وئوکتاو ڕێکبکەونەوەو ئاشتبېنەوە, چونکە ئەگەر ئەودوانە ببنەوە دۆست ئەوامن لەناودەچم.

خاتونەکەی من ڕاستی دەکرد دەمزانی چۆنیەتی سیاسەت وایە ئەگەر ئەنتوان و ئوکتاو ئاشتبوبانایەوە ئەوا خاتونەکەی من دەبوو بەقوربانی, ئێمە بۆجارێکی تر چووینەوە سوریاK لەوێ خاتونەکەی من تەنها چاودێری ئەوەی نەدەکرد نەیەڵێت ئەنتوان وئوکتاو ئاشتببنەوە بەڵکو ڕۆژانە دەچوو سەردانی ئەوسەربازانەی دەکرد کە مەشقیان پێدەکرا؟

دەمزانی خاتونەکەی من لەڕابردوودا فەرماندەی فەخری لەشکری ئەسکەندەربوو لە میسر, کاتێ شێوازی هەڵسوکەوتی ئەومدەدی لەبەرخۆمەوە دەمگوت ئەگەر کلیۆپاترا پیاوبا ئەوادەبووە گەورەترین سەرداری جەنگی جیهانی وەتا سیزاریشی دەخستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، ڕۆژێکیان کلیۆپاترا زۆر بەماندویی وشەکەتی لەسەردانیکردنی سەربازگەکانی مەشقپێکردن گەڕایەوەو من بەئەوم گوت، بۆچی ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت کەمێ بیر لەتەندروستی خۆت بکەرەوەو پشویدە.

-کلیۆپاترا گوتی: شرمیون گرتنەدەستی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم ئەوە دێنێت خۆی بۆ ماندوو بکەیت, لەو ڕۆژەدا بەتەواوەتی پەیم بەنەخشەی سەرەکی خاتونەکەی خۆمبرد لام ڕوونبۆوە کەکلیۆپاترا نەخشەی گرتنەدەستی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی کێشاوە, ئەگەر لەنێوان ئەنتوان وئوکتاودا شەڕ ڕوویدابا ئەوائەنتوان سەردەکەوت ودەبووە ئیمپراتۆری ڕەهای ڕۆم، سەرئەنجام خاتونەکەی من دەسەڵاداریێتی حکوەتی ڕۆمی دەگرتەدەست بەڵام ئەگەر ئوکتاو سەرکەوتوبا ئەواتەختی پاشایەتی میسر لەبەین دەچوو, بەپێی ئەو زانیاریەی من لام گەڵاڵەببو کلیۆپاترا دەیویست بەشێوەیەك سوپای ئەنتوان بەهێز بکات ئوکتاو تێکبشکێنێت، دوای ئەوەی سوپای ئەنتوان لەسوریادا سازوپەرداخکرا، خاتونەکەی من بەئەنتوانی گوت ئینجا لەیۆناندا خەریکی دروستکردنی سوپابەو پڕچەکیان بکە چونکە سەربازانی یۆنانی بەئازایەتی بەناوبانگن, ئەنتوان دەیویست بۆ کۆکردنەوەو دروستکردنی سوپا بچێت بۆیۆنان, خاتونەکەی من گوتی منیش لەگەڵ تۆدا دێم, مەبەستی کلیۆپاترا ئەوەبوو خۆی بەدانیشتوانی یۆنان بناسێنێت تاشاژنی میسر کەبەرەچەڵەك یۆنانی بوو ببینن, تائەوکاتە کلیۆپاترا یۆنانی نەبینیبوو خەڵکی ئەسیناش وەسفی خاتونەکەی منیان بیستبوو بەڵام خودی ئەویان نەبینیبوو, کاتێ هەواڵی هاتنی شاژنی میسر گەیشتە دانیشتوانی ئەسنا کەبەبنەچە یۆنانییە, ژن و پیاوی ئەوشارە خۆیان

بۆپێشوازیکردنی شاژنی میسر ئامادەکرد, چوونی خاتونەکەی من بۆیۆنان وەك هەموو کارەکانی تری لایەنی سیاسی لەخۆگرتبوو، دەیویست خۆی نیشانی دانیشتوانی ئەسینابدات تاکەڕۆژێك دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی گرتەدەست یۆنانیەکان ئەوبەشای خۆیان بزانن، ئەگەر نەشیتوانی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بگرێتەدەست بتوانێت ببێتە پاشای یۆنان وقوبرس وفەلەستین، ئەو ڕۆژەی خاتونەکەی من گەیشتە ئەسینا، ژن وپیاو ومندال لەسەرڕێگاکەیدا وەستابوون وهاواریاندەکرد ئەی ئیلاهی میسر بەخێربێیت, دوای گەیشتنمان بەئەسینا, سەرەتا خانمەکەی منیان بۆپەرستگای گەورەی ئەسینا( ئیلاهی شار)بردو سەنەدی هاولاتیانی شاری ئەسینایان دایەدەستی خاتونەکەی من وکلیۆپاتراش جلوبەرگی پاشایەتی داکەندن وکراسێکی سپی لەبەرکردو جلوبەرگی مولکی ژنانی یۆنانی لەبەرکرد.

لەرۆژی دووەمی گەیشتنمان بەئەسینا، کیلۆ پاترا دوو کرور سکەی زێری کردە دیاری بۆپەرستگای گەورەی ئەسین ودوو پەرستگای تری شار، ئەگەر لەترسی ئەنتوان نەبایە ئەوا دانیشتوانی ئەسینا کلیۆپاترایان بەڕەسمی بەپاشای خۆیاندادەنا, بەلام چونکە دەیانزانی ئەنتوان فەرماندەی گشتی یۆنانە نەدەوێران خاتونەکەی من بەڕەسمی بەپاشای یۆنان هەلبژێرن.

# شەڕی چارەنوسسازی

## ئاکتیوم

کاتێ ئێمە لەئەسینا بوین, هەوالێك بەئەنتوان گەیشت کەئوکتاو لەڕۆمدا خەریکی سازکردنی سوپایەکی بەهێزەو دەیەوێت دوای ئەوەی سوپاکەی تەیارکرد بەیۆناندا بەرەوخۆرهەلات بچێت.

-کلیۆپاترا بەئەنتوانی گوت: بەدلنیاییەوە ئوکتاو ئەوسوپایەی بۆشەڕی تۆ سازکردووە,

-ئەنتوان ئەم قسەیەی کلیۆپاترای بە ڕاست زانی و سەری بۆلەقاند.

-کلیۆپاترا لێی پرسی: ئایا تۆ لەپشتەوەی خۆت دلنیای- واتە تۆپێتوانیە ئوکتاو بولەناوبردنی ئێمە ڕێککەوتنێکی نهێنی لەگەل ئێرانیەکاندا مۆرنەکردبێت؟ یان لەگەل ئەواندا پێکنەهاتبێت؟

ئەنتوان گوتی: ئەم پێشبینی کردنە دوورە، چونکە حکومەتی ڕۆم چەندجارێك شەڕو پێکدانانی لەگەل ئێرانیەکانداکردووە.

-کلیۆپاترا گوتی: ئەگەر ئوکتاو لەگەل حکومەتی ئاشکانیەکاندا ڕێککەوتبێ, ئەواهەر کەسوپای ڕۆم کەوتەڕێ سوپای ئاشکانیەکانیش دێنەناو خاکی سوریاوە وتۆ لەدوو لاوەدەکەویتەبەر هێرش، من وام پێباشە سوپاکەی خۆت لەسوریاوە بێنیت بۆیۆنان چونکە گواستنەوەی سوپاکەت لەسوریاوە بۆیۆنان چەند قازانجێکی هەیە.

یەکەم: ئەگەر ئوکتاو لەگەل پاشای ئاشکانیەکاندا بوبێت بەهاوپەیمان سوپاکەی تۆ لە لایەن ئێرانیەکانەوە توشی هێرشکردنەسەر نابێت, وەك بۆخۆت دەزانی پاشای ئاشکانیەکان بۆهێرشکردنەسەر تۆ بۆئێرەنایەت، قازانجی دووەم ئەوەیە هەر کە بیستت ئوکتاو بەخۆیی

وسوپاکەیەوە کەوتۆتە ڕێ تۆش سوپاکەت بۆ ڕووبەڕووبوەوەی ئەو سازدەکەیت, سێیەمین قازانجیش ئەوەیە دوژمنەکانی تۆ لەیۆنان و وڵاتانی باڵکاندا گەورەیی سوپای تۆ دەبینن و گوێ بەئامۆژگاری بانگەوازەکانی ئوکتاو نادەن ودژبە تۆ ڕاپەڕن.

-ئەنتوان ئەم بۆچونەشی بەڕاست زانی وفەرمانیدا سوپاکەی لەسوریاوە بۆیۆنان نێت ئەوکاتەی سوپای ئەنتوان لەسوریادابوو ڕۆمیەکان پێیانوابوو ئەوسوپایە بۆشەڕی ئاشکانیەکان تەیارکراوە, بەڵام کاتێ ئەوسوپایە لەسوریاوە بۆیۆنان گوازرایەوە تێگەیشتن ئەنتوان مەبەستی هێرشکردنەسەر ئێرانیەکان نییە بەڵکو دەیەوێت هێرش بکاتەسەر ئوکتاو.

پێشوەخت کلیۆپاترا بەئەنتوانی گوت، لەوانەیە شەڕی تۆ لەگەڵ ئوکتاودا لەسەر دەریادا ڕووبدات, بۆئەوەی سوپای ئەنتوانیش لەسوریاوەبێت بۆیۆنان دەبوا بەسەر دەریادا تێپەڕیبا, هەروەها ئوکتاویش بۆهێنانی سوپای خۆی بۆخۆرهەڵات دەبوا بەسەر دەریادا تێپەڕێت ودوورنییە ئەودوو سوپایە لەسەر دریا تێکهەڵەنگون وشەڕو پێکدادان ڕووبدات, بۆیە دەبێ چەند دەتوانی کەشتی جەنگی دەریایی دروستبکە, کلیۆپاترا دووسەد کەشتی جەنگی میسری خستەژێر فەرمانی ئەنتوان وپێی گوت فەرمانێك بۆهەموو کارخانەکانی کەشتیی سازی خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دەربکە خەریکی دروستکردنی کەشتی جەنگی بن, لەسوریاو فەڵەستین و یۆناندا کارخانەکانی دروستکردنی کەشتی بەگورجی کەوتنە دروستکردنی کەشتی جەنگی, دوای ئەوەی ئێمە گەیشتینە یۆنان خاتونەکەی من دە کرور سکەی زێڕی تری دابەئەنتوان وبە بەردەوامی چاودێری ئەوەی دەکرد داخوا کاروبارەکانی سەربازی و مەشقکردن و کەلوپەلی سەربازی و تەیارکردنی سەربازەکان چۆنەوچۆن بەڕێوەدەچێت, چونکە ئەو هەواڵانەی لەڕۆمەوە دەهاتن تائکیدیان لەسەرئەوە دەکردەوە ئوکتاو-یش بەپەلە خەریکی کۆکردنەوەو تەیارکردنی سوپاکەیەتی ودەیەوێت بەرەوخۆرهەڵاتی بخاتەڕێ، لەڕۆمیشدا تەنانەت کەسانی ئاسایش دەیانزانی ئەوسوپایەی ئوکتاو بۆشەڕی ئەنتوانە, ژمارەی ئەوسەربازانەی ئەنتوان لەیۆناندا سازیکردبوون سەد ودە هەزارکەس بوو وژمارەی سەربازەکانی ئوکتاویش سەد هەزار کەسبوو، ژمارەی کەشتی سەربازی هەردوولا هی ئەنتوان (500) دانەبوو، ئوکتاویش(400) دانەی هەبوو, پێشئەوەی شەڕی ئاکتیوم( ا) (تەنگەبەرێگە کەوتۆتە خۆرئاوای یۆنان وکەنداوی ئامبرواسی: کەئەمڕۆ پێی دەڵێن ، ئارتا- و فارسی) دەستپێبکات من پێموابوو ئەنتوان سەردەکەوێت، خاتونەکەی منیش زۆر بەئومێدبوو ئەنتوان سەربکەوێت, ئەو لەوەدڵنیابوو هەرکاتێ سوپای ئوکتاو لەڕۆم بەڕێبکەوێت ئەوهەواڵەی پێدەگات, بەڵام لەپڕدا ئەو هەواڵە بەخاتونەکەی من گەیشت کەسوپای ئوکتاو گەیشتۆتە سەروی( ئایپر ) ا(هەرێمێکە لەیۆنان ودەکەوێتەسەر سنووری ئەلبانیا، و- فارسی)دیاربوو ئوکتاو لەوەژیرتربوو کەخاتونەکەی من وێنایدەکرد, ئەنتوان بۆجەنگ ئامادەباشی وەرگرتبوو، بەڵام پێی وانەبوو ئوکتاو لەناکاودا دەگاتە خۆرئاوای یۆنان, هێزی دەریایی ئەنتوان کەمن دەتوانم بەهێزی دەریایی خۆمانی بزانم (ا)(شرمیون مەبەستی لەهێزی دەریایی میسرە کەزۆربەی پێکهێناوە- و کوردی) کەلەدەم دەریای سەرخاکی یۆناندا دابەشکرابوون، ئەنتوان بەخێرایی ئەوکەشتیانەی کۆکردەوە, چەند لەشکرێکی ئێمەش لەسەرلێوار دەریا نیشتەجێ ببوون، ئەنتوان ئەوانیشی

کۆکردنەوە, هەروەها هەندێ تیپ و لەشکریش لەشارەکانی خۆرئاواو باکوری خۆرهەڵاتدابوون ئەنتوان ئەوانیشی کۆکردنەوە, هێزی دەریایی وزەمینی ئێمە بەپێی فەرمانی ئەنتوان لەکەنداوی ئامبرواسی دا دامەزران, لەپڕ هێزی دەریایی ئوکتاو گەیشتە دەم تەنگەبەری ئامرواسی لەوکاتەی هێزی دەریایی ئێمە لەناوکەنداوەکەدابوو, خاتونەکەی من بە توندی توڕەبوو ودیاربوو ئەنتوان خاوەخاوەیکردبوو، ئەگەر گورجوگۆڵی کردبا ئەوا هێزی دەریایی ئێمە نەدەکەوتنە شێوە ئابڵوقەبوونەوە, کەنداوی ئامبرواسی بەهۆی تەنگەبەرێکەوە دەچێتەوەسەر دەریا، درێژی ئەوتەنگەبەرە بیست وچوار هەزار ئانیشکە پانیەکەشی هەزارو سێسەد ئانیشکە لەدەم ئەوتەنگەبەرەیەدا کێویلکەیەك هەیە بەناوی ئاکتیوم،ە دوای ئەوەی هێزەکانی ئوکتاو گەیشتنە دەم تەنگەبەری ناوبراو بەشی سەروو وخوارووی تەنگەبەرەکەیان گرت، بەلام نەیتوانی بێتەسەر ناوەوەی چونکە لە هێزەکانی ئێمە دەترسا, ئێمە لەکەنداوی ئامبرواسی دا توشی گرفت بوینەوە، لەبەر ئەوەی ئوکتاو ئەوتەنگەبەرەی گرتبۆدەست, هەروەها هەندێ لەسوپای ئوکتاو هەوڵیاندەدا پەیوەندی نێوان هێزی دەریایی وهێزی وشکانی سوپای ئێمە ببڕێت. ئەو کاتە خاتونەکەی من بۆی دەرکەوت بەرامبەرەکەی کەسێکی لێزان وبەهێزەو ئەو کاراییەشی بۆتەهۆی ئەوەی لێوەشاوەبێت, ئەنتوانیش تێبینیکرد ئوکتاو لەڕووی تاکتیکییەوە لەئەو بەتواناترەو ئەمەش بەئاستێ توڕەیکرد کەکاری شێتانەی دەکردو بڕیاریدا چەند کەسێك سەریان بپەڕێندرێت بەتاوانی ئەوەی ئەوانە جاسوسن, ئەنتوان بەشێوەیەك لەخەڵك کەوتبۆ گومان تەنانەت لەخاتونەکەی منیش کەوتبۆشك بەوەی دەیەوێت دەرمانداوی بکات ودواتر ببێتە مەعشوقەی ئوکتاو, بێئاگابوو لەوەی خاتونەکەی من ناتوانێت ئاشنایەتی ئوکتاو دەستەبەربکات، دەنادەمێکبوو دەستی لە ئەو هەڵدەگرت, بۆیە کلیۆپاترا نەیدەتوانی سەرنجی ئوکتاو بۆلای خۆی ڕابکێشێت بردنی دڵی گەنجێکی.وەك ئوکتاو ئەستەمە چونکە جیاوازی تەمەنیان زۆربوو وشاژنی میسر لەبەرچاوی ئوکتاو وەك یەك ژنی پیر سەیردەکرا, لەوکاتانەی ئەنتوان لە خاتونەکەی من کەوتە گومان وپێیوابوو دەرمانداوی دەکات، ڕۆژێکیان لەکاتی نانخواردندا خاتونەکەی من دەستی ئەنتوانی گرت وگوتی لەوچێشتە نەخۆی.

–ئەنتوان گوتی: بۆچی؟

–کلیۆپاترا گوتی: ئیستا تێتدەگەیەنم بۆ لەوخواردنە نەخۆی, دوو ڕۆژ پێشتر هێزەکانی ئێمە چەند سەربازێکی ئوکتاویان دەستگیرکردبوو، کلیۆپاترا گوتی یەکێك لەوسەربازە دەستگیرکراوانەم بۆبێنن، کاتێ ئەو دیلەیان هێنا خاتونەکەی من بەئەوی گوت دانیشە, ئەو دیلە دانیشت وشاژنی میسر بەمنی گوت شرمیون ئەم قاپە خواردنە هەڵگرەو لەبەردەم ئەودیلەیدا دابنێو پێی بڵێ بیخوات، منیش ئەوخواردنەی کەلە بەردەم ئەنتواندابوو هەڵمگرت ولەبەردەم ئەو دیلە ڕۆمیەم داناو پێمگوت شاژنی میسر ڕێگای پێداوی ئەمخواردنە بخۆیی وتێربیت, ئەوپیاوە دیلەش بەچێژەوە خواردنەکەی خواردو هەرکەلێبۆوە لەپڕتێکچوو ورەنگی هەڵبزرکاو لەتاو ئازاری سکی هاواری کردو پێچی خواردن ودواتر لەجوڵە کەوت ومرد, لەوکاتەدا کلیۆپاترا بەئەنتوانی گوت ئەگەر من بمەوێت تۆ دەرمانداو بکەم تۆنەتدەزانی چ کاتێ دەرمانخواردوو دەکرێیت تانەهێڵیت من ئەوکارە بکەم وڕێگربیت, من دەمتوانی ئەمڕۆ تۆدەرمانداوبکەم وبتکوژم بەلام من ئەمکارەم نەکرد بۆیەلەخۆتەوە لەمن مەکەوە گومان وهۆش وبیری خۆت کە دەبێ بۆشەڕ بەکاربێنی بەگومانی بێ بناغەو هیچەوە سەرقاڵمەکە, من نەمبیستبوو

ئەنتوان بەكەسانی تر بڵێت كلیۆپاترا دەیەوێت دەرمانداوی بكات، بەڵام هەستمدەكرد هاتنەپێشی مەسەلەی دەرمانداوكردنی ئەنتوان لەلایەن كلیۆپاتراوە سەرەتای قۆناغێكە ئەوە نیشاندەدات ڕۆژگاری عشقی ئەودوانە گەیشتۆتە كۆتایی-یان لە نزیك كۆتایی هاتن دایە, چونكە ئەگەر دڵدارودلبەر یەكتریان خۆشبوێت ئەستەمە مەسەلەی دەرمانداوكردن وكوشن لەنێوانیاندا بێتەپێش, وردەوردە ئاشكرابوو ئوكتاو بە گەمارۆدانی هێزی دەریایی ئێمە دەیەوێت سوپاكەمان گرفتاربكات بەهۆی درێژ بونەوەی ئەوگەمارۆیە هەندێ لەئەفسەرەكانی ئێمە هەڵاتن، یەكێك لەوهەڵاتوانەی سوپای ئێمە دەستگیركراو ئەنتوان بڕیاریدا بەزیندویی بسوتێنرێت تابیێت بەپەند بۆ ئەوانی تر وهەڵنەیەن، بەڵام ئەفسەرەكانی سوپای ئێمە هەر لێرەولەوێ هەڵدەهاتن, ئێمە دەمانزانی ئوكتاو لەناو هێزی دەریایی وسوپای ئێمەدا جاسوسی هەن وئەو جاسوسانەی ئەو ئەفسەرەكانی ئێمە فریودەدەن هەڵبێن، بێگومان ئوكتاو پارەی بۆ ئەمە دەداو ئەگەری ئەوە هەبوو جاسوسەكانی ئەو دەستبكەن بەكاری تەقاندن و تێكشكاندنی كەشتییە جەنگیەكانی ئێمە, بۆ ڕێگاگرتن لەنیازە گڵاوەكانی جاسوسەكانی ئوكتاویش, چاودێریكەری سەربازی دانران وهاموشۆی كەشتیەكان تەنها لەكاتی دیاریكراودا بۆیان هەبوو وبۆ ئەوەی خراپكاران وجاسوسان نەتوانن بێنە ناو كەشتیەكانمانەوەو خەریكی سوتاندن و كونكردنیان بن, شەوێكیان لەكاتی ناندانادا خاتونەكەی من بەئەنتوانی گوت، ئەگەر تۆبە یەك هەڵمەتی بەهێز ئەو ئابلۆقەیە نەشكێنی وكەشتیەكانی خۆت لەكەنداوەكەدا نەبەیتە دەرێ، ئەوا تێدادەچیت.

-ئەنتوان گوتی: چی بكەم؟

-كلیۆپاترا پێی ڕاگەیاند تۆدەبێ كارێك بكەیت لەیەك كاتا هێزی دەریایت وهێزی وشكانیت بكەونە جوڵە، ئەگەر هێزی دەریایی خۆت لێرە جێبێڵیت وسوپاكەت پاشەكشە پێبكەیت ئەوا ئیمپراتۆریەتی خۆرهەڵات لەدەست دەدەی، چونكە تۆ بەبێ هێزی دەریایی ناتوانی ئیمپراتۆریەتی خۆرهەڵات چاودێری بكەیت, جێهێشتنی كەشتیە جەنگیەكانت لەم كەنداوەدا وەك ئەوە وایە هێزی خۆی جێبێڵی وبڕۆی, ئیمپراتۆریەتی تۆ كەوتۆتە سەردەریا ئوكتاو بۆئەوەی لەناوت بەرێت ڕێگاچارەیەكی نیە جگەلەوەی لەدەریاوە هێرشت بكاتەسەر, تۆش دەبێ لەدەریاوە پێش بەهێرشی ئەوبگری, بۆیە پێویستت بەكەشتیە جەنگیەكانی خۆتە, تۆئەگەر كەشتیە جەنگیەكانی خۆت لەدەستبدەی وەك ئەوەوایە خۆت تەسلیمی ئوكتاو كردبێت، چونكە ئیتر ئوكتاو دەستی دەكرێتەوە بۆداگیركردنی ئیمپراتۆریەتەكەی تۆ, بۆخۆت دەبینی ڕۆژانە ئەوانەی لەگەڵتۆدان هەڵدێن ودەچن پەیوەندی بەسوپاكەی ئوكتاوەوە دەكەن، ئەگەر ئەم دۆخە ئاوابمێنێتەوە ئەوا تۆ بەتەنهایی دەمێنیتەوە, دەبێ بەهەر شێوەیەكبێت لەو كەنداوە بچیتەدەر هەتائەگەر لەوشەڕە خوێناویەشدا هەندێ لەكەشتیەكانی خۆت لە دەستیش بدەی, بەڵام ئەگەر لێرە بمێنیتەوە، ئەواهێزی دەریایت وسوپاكەشت هەمووی لەدەستدەدەیت, دوای ئەوەی ئەنتوان گوێی لەوقسانەی خاتونەكەی من بوو كۆبونەوەیەكی گەورەی لەگەڵ سەركردە گەورەكانی سوپادا سازداو تێیدا باسی بارودۆخی هێزی دەریایی كردوو گوتی، ئەگەر ئێمە بەمشێوەیەی ئێستا بمێنیتەوەو خۆمان لەشەڕ بپارێزین ئەوا لەناودەچین, ئەو ڕۆژەی ئێمە هاتینە كەنداوی ئاكتیوم نزیكەی (500) كەشتیمان هەبوو بەڵام ئەمڕۆ باوەڕناكەم( 250 ) كەشتی سازمان

مابێت، چونکە زۆر لەسەڵبەلێدەرەکانی ئێمە لەنەخۆشیدا مردوون وهەندێ لە ئەفسەرانی دەریایی ئێمەش هەڵاتوون, پێویستە ئێمە لێرەدەرچین تابتوانین ئوکتاو لەناوبەرین– یان نەیەڵین ئیمپراتۆریەتی خۆرهەڵات بکەوێتە دەست ئەو، ئەگەر لێرەدا بمێنینەوە ئوکتاو دەزانێت لێرەین وبەبێ ترس ودڵنیاییانە وڵاتانی ئیمپراتۆریەتی خۆرهەڵات داگیردەکات, بۆیە واچاکە ئێمە لێرەبڕۆین هەتا ئەگەر بۆپاراستنی ئیمپراتۆریەتەکەشمانبێت.

ئەفسەرانی سوپا ئەوبۆچونەی ئەنتوانیان بەدروستزانی وگوتیان پێویستە بۆشەڕ خۆمان ئامادەبکەین وبەهێرشێکی لەگوڕو بەهێز لەکەنداوی ئامبرواسی هێزە دەریاییەکەمان ببەینە دەرێ, ئیتر لەوکاتە بەدواوە هێزی سوپای ئێمە خەریکی ئامادەکاری هێرشکردنبوون، بەڵام کاتێ ویستیان کەشتیە جەنگیەکانمان سازبکەن بینیان تەنها دەتوانن (250) کەشتی لەکۆی گشتی(500) دانە ئامادەی شەڕبکەن, ئەنتوان بڕیاریدا بیست هەزار سەرباز بچنە سەرکەشتیە جەنگیەکان بۆ شەڕکردن, بەڵام سەرکردە سەربازیەکان لەگەڵ ئەوڕایەی ئەنتواندا نەبوون وگوتیان سەربازانی وشکانی ناتوانن لەسەرکەشتی کەهەمیشە لەجوڵاندایە شەڕبکەن، چونکە ئەوان بەشەڕی سەر زەوی ڕاهاتوون, ئەنتوان سەرلیقەی شەڕی دەریایی کەمبوو، بەڵام لەشەڕکردنی سەر زەوی شارەزاییەکی سەرشاری هەبوو, ئەنتوان بۆچوونی ئەوانی ڕەتکردەوە, ئوکتاویش وەك لەمەوبەر ئاماژەم بۆکرد خۆرهەڵات وخۆرئاوای تەنگەبەری ئامبرواسی داگیرکردبوو, لەهاموشۆو جموڵی سەربازیەوە دەیزانی ئەنتوان بەتەمای شەڕکردنەو دەیەوێت هێزە دەریاییەکەی لەوکەنداوە دەربازبکات, ئوکتاویش کۆبونەوەی لەگەڵ سەرکردە سەربازیەکانی خۆیداکردبوو وبۆتاوتوێ کردنی ئەمەو هەندێ لەسەرکردە سەربازیەکانی ئەو ڕایان وابوو کەلێگەڕێن کەشتیە جەنگیەکانی ئەنتوان لەکەنداوەکە بێنە دەرێ وهەرکە گەیشتنە دەم دەریا هێرشیان بکرێتە سەرو لەناوببرێن, هەندێ لە سەرکردە سەربازیەکانی تری ئوکتاو دژی ئەو ڕایەی یەکەمبوون وگوتویانە دوای ئەوەی کەشتیە جەنگیەکانی ئەنتوان لەکەنداوی ئاکتیوم دەرچوون لەوانەیە هەڵێن و ئێمە نەتوانین ئەوانە تێکبشکێنین وئەنتوان بچێت بۆسوریا– یان میسرو شەڕی ئێمەش لەگەڵ ئەودا درێژە بکێشێت باشترین شوێن بۆلەناوبردنی کەشتیەکانی ئەنتوان ئێرەیەو نابێ ڕێگایان پێبدرێت لەکەنداوەکە بێنەدەرێ وپێویستە پێشئەوەی کەشتیەکانی ئەنتوان بگەنە دەریا ئێمە تێکیانبشکێنین ونقوومیانبکەین, سەرئەنجام لەسەر ئەوە ڕێککەوتن لێگەڕێن کەشتیەکانی ئەنتوان لەتەنگەبەری ئاکتیومەوە تێپەڕن, لەدەریادا تەنها ئیرادەی مرۆڤ ڕووداو پێشهاتەکان دروستناکات، بەڵکو ئاراستەی باوجوڵەی شەپۆلەکانی دەریاش کاریگەری گەورەیان هەیە, کاتێ پڕچەککردن و سازکردنی کەشتیە جەنگیەکانی ئێمە تەواوبوو دەریا تۆفانێکی بەهێزی هەڵکرد بەشێوەیەك کە ئوکتاو گەروی کەنداوەکەی داگیرکردبوو ناچاربوو کەشتیە جەنگیەکانی خۆی لەگەروی کەنداوەکە دەکێشێت چونکە ئەگەر کەشتیەکانی لەتەنگەبەرەکەدا هێشتبایەوە ئەوا ئەگەری نغرۆبونیان لێدەکرا, ئەوکاتەی سەربازەکانی میسری سواری کەشتیە جەنگیەکانی بوون دەریا تۆفانێکی هەڵکرد زۆر بەهێز, لەوکاتانەدا کەشتیەکانی ئێمە بەگەروەکەدا تێپەڕین وچوونە ناو دەریاوە, ئەنتوان بڕوای نەدەکرد هەلێکی ئاوا بێتەپێش و ئەو بەکەشتیەکانی تایبەت بەخۆیەوە لەتەنگەبەری ئامبرواسی دەربچێت

ورزگاریبێت, دوای کەمێ لەتێپەڕبوونی کەشتیەکانی ئێمە دەریا ئارامبۆوەو ئێمە گەیشتینە دەریای بلهوسی و ئاراستەی هەواڵ لەو دەریایەدا ناڕێکەو هەر جارەی بەرەو لایەك هەڵدەکات کەهەڵیشیکرد تاخۆرئاوابوون بەردەوامدەبێت, کاتێ گەیشتینە ددەریای ئابونین ئیتر هەوا ئارامبۆوە, بەڵام لەدەریادا هاتنی بالەپڕدێت ولەپڕیش نامێنێت, کاتێ کەشتیەکانی ئەنتوان لەتەنگەبەری ئاکتیوم چونە دەرێ, بەدووبەش ڕۆیشتن دەستەی یەکەم هی ئەنتوان و دەستەی دووەمیش پێکهاتبوون لەشەست کەشتی جەنگی وابەستە بەخاتونەکەی من، چونکە ئەنتوان نەیدەویست کلیۆپاترا لە شەڕدا دەستگیربکرێت-یان بکوژرێت, پێشئەوەی ئێمە بەگەرووی کەنداوی ئاکتیومدا تێپەڕین، ئەنتوان بەخاتونەکەی منی گوت لەسەر وشکانی بمێنەوە، بەڵام کلیۆپاترا ڕازی نەبوو وگوتی ئەگەر تۆ لەمشەڕەدا سەرکەویت ئەواسەرکەوتنی منە، ئەگەر بشدۆڕێیت, مانەوەی من لەوشکانیدا ڕزگارم ناکات, بۆیە لەگەڵ تۆدادێم, لەوکاتەدابوو کەئەنتوان وکلیۆپاترا بڕیاریاندا شەست کەشتی جەنگی لەگەڵ شاژنی میسردا لە ڕیزی دووەمدا بڕۆن ئەمەش بۆئەوەبوو، ئەگەر شەڕەکە گەیشتە شلۆقی شاژنی میسر خۆی ڕزگاربکات, کەشتیەکانی ئێمە لەچاو کەشتیەکانی ئوکتاودا سەنگینتربوون چونکە ئەنتوان لەوبڕوایەدابوو کەشتی قورس باشترە بۆڕۆیشتن، بۆیە بەکارخانەکانی کەشتی دروستکردنی گوتبوو کەشتی جەنگی قورسی بۆدروستبکەن, دیارە کەشتی سەنگینتر زۆرتر سەربازان هەڵدەگرێت ولەکاتی پێداکێشانی بەکەشتی دوژمن تێکیدەشکێنێت, بەڵام کەموکوڕی ئەوەی هەیە خێرانیەو کەشتیە سوکەکان زیاتر کۆنترۆڵدەکرێن وخێراترن ودەتوانرێت بەئاسانی بەرەوپێش ودواوچەپ وڕاست لێیانبخوردرێت. من لەپشتی خاتونەکەی خۆمەوە وەستابوم وشەڕی نێوان کەشتیە جەنگیەکانی خۆمان وئوکتاوم دەبینی کەشتیە جەنگیەکانی ئەنتوان بەڕیز پانەویان لە بەرامبەر کەشتیە جەنگیەکانی ئوکتاودا کەوتبونە ڕێ، هەریەك لەکەشتیە جەنگیەکانی ئەنتوان دەیانویست بەخێرایی خۆیان بکێشن بەکەشتیەکانی ئوکتاو وتێکیان بشکێنن، بەڵام کەشتیە جەنگیە سوکەڵەکانی ئوکتاو خۆیان لادەدا, بۆئەوەی کەشتیەکانی ئوکتاو تێکبشکێنن دەبوا تیغەی دەمی کەشتیەکانیان بەکەشتیەکانی ئوکتاو بکێشابا، بەڵام چونکە کەشتیەکانی ئوکتاو سوکەڵەتربوون خۆیان لادەداو لەکەلەکەوە تیغەکانی دەمی کەشتیەکانی خۆیان لەکەشتیەکانی ئێمە هەڵدەچەقاند, ئینجا شەڕی دەریایی دەستێپێکردو هەردوو کەشتی بەهاویشتنی زنجیرێك بۆسەر ئەوەکەیتر لەنگەری قولبەکانیان پێوەدەبوو وبەیەکتریەوە جوتدەبوون ودواتر جەنگاوەرەکانی سەری بەگورزو ڕمب وتەورو شمشێرو خەنجەر دەکەوتنە گیانی یەکتری و ئیتر سەر نشینە سەربازیەکان دەبوا بۆئەوە تێکۆشابان کەشتی بەرامبەریان لەناوبردبا, ئێمە لەدورەوە دیمەنی شەڕەکانمان دەبینی وهاواری سەربازەکانی ئوکتاو وئەنتوانمان دەبیست، دەمانبینی چۆن کوژراوەکان دەخەنە ناو دەریاوە تارێگای شەڕکردنیان نەگیردرێت, کاتێ کەشتیەك لەبەین دەچوو وسەرنشینەکانی دەکوژران کەشتی هێرشکەر لێی دوردەکەوتەوەو بەرەوکەشتیەکیتر دەچوو تایاریدەی هاوسەربازەکانی خۆی بدات, وردەوردە بەدیارکەوت لەشکستخواردویی داین وسوپای ئێمە تێکدەشکێت, من دەمبینی لەهەندێ شوێن پێنج کەشتی ئوکتاو لەیەك کەشتی ئێمە وەرەوکابوون، ئەوانە چونکە کەشتی شەڕکەری ئێمە کەمبیبونەوە یاریدەی کەشتیەکانی تری خۆیاندەدا, لەکاتێکی چاوەڕواننەکراودا خاتونەکەی من فەرمانی بەفەرماندەی کەشتیەکەیدا سێ چارۆکە سور ڕەنگەکە هەڵکات, دواتر گوتی چارۆکە زەردە

گەورەکەش بکەوە, پاش کەمێ چارۆکەکان کرانەوە, ئەوەی کەشتیەکەی ئێمە کردی کەشتیەکانی تریش بەهەمان شێوە چارۆکەکانیان هەڵدان، شەست کەشتی جەنگی شاژنی میسر چارۆکەکانیان هەڵدان وسەڵبەلێدەرەکان ئامادەی دەستبەکاربونیانبوون وئیتر ڕێگای خۆرئاوامان گرتەبەر دوای ئەوەی بەڕێ کەوتین وهەڵدانی ئەو چارۆکە زەردەی کەشتیەکەی ئێمە ئیشارەتێکبوو لەنێوان کلیۆپاتراو ئەنتوانیدا چونکە هەرکە ئێمە بەڕێ کەوتین هەندێ لەوکەشتیانەی سێ ڕیز سەڵبەلێدریان هەبوون وخەریکی شەرکردنبوون لەمەیدانی شەڕ جیابوونەوەو بەرەو خوارو کەوتنەڕێ، دیاربوو ئەو کەشتیانە ئەنتوانیان لەگەڵەو خەریکی هەلاتنن, خاتونەکەی من وئەنتوان لەسەر ئەوەرێککەوتبوون ئەگەر تێکشکان ئەوا کلیۆپاترا بەشەست کەشتی جەنگی خۆیەوە بگەڕێتەوە بۆمیسرو دواتر ئەنتوانیش بەدوایدابێت, بۆیە ئەو شەست کەشتیە جەنگیەی میسریان نەبردە ناوشەڕەکەوە بەتایبەت لەبەرئەوەی پارەو سامانی خاتونەکەی من لەوکەشتیانەدابوون و نەیاندەویست بکەوێتە دەستی ئوکتاو- یان نقومی دەریابێت, ئەنتوان بێ بیرکردنەوەو هۆشمەندی لەمەیدانی شەڕی ئاکتیومدا هەلات, ئەودەیزانی لەمشەڕەدا دۆڕاوە ئەگەر لەتەك سوپاکەی خۆیدا مابایەوەو تاکۆتایی بەدلێرانە بجەنگابا- یان وەك سەربازە کوژراوەکانی تری خۆی بەکوشت چووبا- یان دەستگیرکرابا، ئەوا ئوکتاو ئەوی بەزنجیر دەبەستەوەو بۆئەوەی سەکەوتنی خۆی نیشانی هەموو لایەکبدات, ئەوی دەبردەوە ڕۆم ودوای ئەوەی نیشانی خەڵکی ڕۆمی دەدا دەیکوشت، بەلام کەخۆی بگەیەنێتەوە خاتونەکەی من ولەگەڵ ئەودا بچێتە میسر- ئومێدەواردەبێت بەپارەو نفوزی کلیۆپاترا جارێکیتر سوپا دروستبکاتەوە, خۆئەگەر نەشتوانێت ئوکتاو لەناوبەرێت دەتوانێت پارێزگاری لە ئیمپراتۆریەتیەکەی بکات کەپێکهاتبوو لە ئاسیای بچوك وسوریاو فەلەستین و ولاتانی سەروی ئەفریقا.

بەلام جێهێشتنی هێزی دەریاییەکەی وهەلاتنی لەمەیدانی شەڕ ئەوەی سەلماند ئەنتوان شایستەی سەرکردەیکردن نییە, ئەگەر ئەو فەرمانی پاشەکشەکردنی دەرکردبا, دەتوانرا بگوترێت نەیویستوە هێزە دەریاییەکەی لەدەستبدات, بەلام ئەنتوان بێ ئەوەی فەرمانی پاشەکشەکردن بەکەشتیەکانی خۆی بدات لەمەیدانی جەنگ هەلات, ئیتر من لەشوێنی شەڕەکەدا نەمام تابزانم چی ڕوویدا، بەلام دواتر بیستمەوە کە فەرماندەی کەشتیە جەنگیەکانی ئەنتوان تادواین دڵۆپەی خوێنیان جەنگیون, ئەوانە نەیانزانیووە ئەنتوان مەیدانی شەڕی جێهێشتووەو هەلاتووە، بەوەی لەلایەن فەرماندەی گشتیەکانەوە فەرمانی پاشەکشەکردن دەرنەچووە، لێپرسراوانی دەریایی بەردەوامبوون لەدرێژەدان بەشەڕ تاسوپای ئوکتاو زۆر لەوکەشتیانەی نغرۆکردن و هەندێکیشی کاتێ شەوداهاتووە ،بەوەی بۆمنیان گێڕایەوە، دەریا ڕووناکبۆوە بەهۆی گڕی ئاگری ئەوکەشتیانەی کەدەسوتان, ئوکتاو بەشێوەیەك شاگەشکەببوو لەسەرکەوتنەکەی ئاگای لەبەدواکەوتنی ئێمە نەبوو تائەنتوان دەستگیربکات, ئیتر کەویستباشی بەدوامانکەوێت نەماندەگەیشتەوە, چونکە کاتێ پێی زانی ئەنتوان هەلاتووە ئێمە زۆر دوورکەوتبوینەوەو ئەو نەیدەتوانی بمانگاتێ, ئوکتاو درەنگ بە هەلاتنی ئەنتوانی زانی وکاتێ ئێمە بەتەنگەبەری کەنداوی ئامبراسی دا تێپەڕین هەندێ لەسەربازانی ئەنتوان لەسەر وشکانی مابونەوەو ئەوانە لەژێر فەرماندەی کەسێکدابوون کەناو( کاتی دیوس )بوو وپیاوێکی کاراو قارەمانبوو، کاتێ بیستی ئەنتوان لەمەیدانی شەڕ هەلاتووە سەربازەکانی خۆی کۆکردنەوەو بەئەوانی گوتبوو من دڵنیام

ئەنتوان چووە هێزیتر بهێنێت وپێویستە لەسەرمان ئێمە لێرەوە بەرەو مەکەدۆنیا بڕۆین، چونکە لەوێدا دەتوانین زیاتر خۆمان ڕاگرین وچاوەڕێ بین، ئوکتاو کەزانی ئەنتوان هەڵاتووە، پەیامێکی بۆئەو فەرماندە سەربازیەی ئەنتوان ناردوتێیدا نوسیبووی ئەگەر تۆبەرگری بکەیت کارێکی بێکەڵکەو باشتروایە چەکەکانی خۆت تەسلیم بکەیت و ئینجا پەیوەندی بەسوپاکەی منەوەبکەیت، بەڵام دیوس ڕازی نەبووە خۆی بەدەستەوە بدات وسەربازەکانی خۆی بۆمەکەدۆنیا بردوون، (کاتێ دیوس) پێیوانەبوو ئەنتوان هەڵاتبێ، ئەو وای بیرکردەوە ئەنتوان چووە تاهێزی فریاگوزاری بهێنێت، دوای ئەوەی لای ڕوونبۆوە لەمەیدانی شەڕ هەڵاتووە بەشێوەیەك نائومێدو مەینەتباربوو سەربازەکانی خۆی جێهێشتن وسەری خۆی هەڵگرت، سەربازەکانیش کەفەرماندەیان نەمابوو، خۆیان بەدەستەوەداو هەندێ چونەناو سوپای ئوکتاو وهەندێکی تریشیان ڕێگای سوریایان گرتەبەر، ئوکتاو لەوشوێنەی مەنزڵگای خۆی لێدانابوو شارێکی دامەزراند بەناوی( نیکو پولیس ) واتە شاری سەرکەوتن، بڕیاریشیدا هەرچوار ساڵ جارێك لەوشارەدا ( ئۆلمپیاد) بکرێت و لاوەکانی یۆنان بێن لەم شارەدا ئۆلۆمپیاد ئەنجامبدەن، لەنزیك تیغەی گەروی کەنداوی ئاکتیوم، پەرستگایەکی لێبوو بەناوی( ئاپولو) خوای جوانی پیاوان، ئوکتاو لەم سەرکەوتنەیدا خۆی بەقەرزداری یاریدەدانی ئاپولو دەزانی، دیاریەکی گەورەی پێشکەش بەئاپولوکرد.

شتیەکانی خاتونەکەی من کەچارۆکەی ئەرخەوانیان هەڵدابوو، بەخێرایی بەرەو میسر ڕۆیشتن، ئەنتوانیش بۆ ئەوەی سام وترسی ئەوتێشکانەی لەبیرخۆی بباتەوە دەستی کردبوو بەشەرابخواردنەوە، کاتێ کەشتیەکانی ئێمە گەیشتنە خوارووی یۆنان، دڵنیابوون کەئوکتاو بەدوامانەوەنیە، سێ ڕۆژ لەوێدا ماینەوە، کلیۆپاترا بەئەنتوانی گوت، هەندێ لەوانەی لەگەڵتاماون بونیان زەروری نییە- یان لەوانەیە خیانەتمان پێبکەن، لێرەدا جێیانبێڵە، ئەنتوانیش فەرمانی خاتونەکەی منی جێبەجێکردو هەندێ لەوانەی لەسەر کەشتیەکانی دابەزاندو جێیهێشتن، خاتونەکەی من فەرمانیدا هەندێ پارە بدرێت بەمانە بۆئەوەی بتوانن پێی بژین، ئینجا بەڕێکەوتین وڕاستەوخۆ بەرەو سەروی ئەفریقا تاگەیشتینە پاراتونیوم( أ ) (شارێکبووە لە سەر خاکی ئەمڕۆی لیبیا- و فارسی)و لەوێدا خاتونەکەی من لە ئەنتوان جیابۆوەو ئێمە ڕێگای میسرمان گرتەبەر، ئەنتوانیش بۆیە لەوشارەدا مایەوە تاچوار لەشکر کەهی حکومەتی لیبیی بوو، لەگەڵخۆیدا بۆمیسری بهێنیت، ئەنتوان نوێنەرێکی خۆی بۆشاری سیرنابیك( أ ) ( شارێك بووە لەسەر خاکی ئێستای لیبیاو دانیشتوانەکانی یۆنانی بوون – و فارسی) بۆلای فەرماندەی ئەولەشکرە نارد تابکەونە جوڵەوبێن بۆلای، بەڵام فەرماندەی ئەو لەشکرە لەبری ئەوەی فەرمانی ئەنتوان جێبەجێبکات، نێردراوەکەی ئەنتوانیشی دەستبەسەرکرد، چونکە هەواڵی شەڕی ئاکتیوم بەئەو گەیشتبوو وزانیبووی ئەنتوان لەوشەڕەدا تێشکاوەو ئوکتاو سەرکەوتوو بووە، بۆیە دەبوا ئەو ملکەچی فەرمانی ئوکتاوبێت نەك ئەنتوان، دوو ڕۆژ دوای ئەوەی نێردراوەکەی ئەنتوانیان دەستبەسەرکرد، پیاوێك بەناوی (گالوس ) کەلەلایەن ئوکتاوەوە بەفەرمانڕەوای وڵاتانی ژێر ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دانرابوو گەیشتە سیرنابیك، ئەنتوان زانی نێردراوەکەی دەستبەسەرکراوەو( گالوس )یش وەك فەرمانڕەوای

گشتی وڵاتانی ژێر دەسەڵاتداریەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم لەلایەن ئوکتاوە دانراوە, ئیتر نەیتوانی هیچ کارێکبکات.

من ئەوەشم بیست دوای ئەوەی ئەنتوان نێردراوەکەی دەستبەسەرکراوەو گالوس لە لایەن ئوکتاوەوە بەفەرماندەی گشتی سەروی ئەفریقیا دانراوە, ویستویەتی خۆی بکوژێ, بەڵام نەیتوانیوە ئەو بڕیارەی خۆی جێبەجێبکات و دەست لەژیان هەڵگرێت؛ چونکە تائەوکاتەش ئومێدی بەخۆشیەکانی ژیان هەرمابوو, ئێمە دوای ئەوەی لەئەنتوان جیابوینەوەو بەرەومیسر کەوتینەڕێ وگیشتینە ئەسکەندەریە، پێشئەوەی بگەینە ئەسکەندەریە کلیۆپاترا فەرمانیدا کەشتیەکان برازێننەوەو کاتێ گەیشتینە بەندەری ئەسکەندەریە دەریاوانەکان سرودی سەرکەوتن بخوێنن, خاتونەکەی من وەك چۆن لەمەوبەر ئەنتوانی ناچارکرد سەرکەوتنامە بۆ ڕۆم بنوسێت, ئاواش خۆی بەسەرکەوتوو نیشاندا- بەوەی هیچ یەك لەکەشتیە جەنگیەکانی میسر لەناو نەچوو بوون وهەموویان بەساغی هاتبونەوە، ڕێی تێوەچوو باوەڕبەوەبکرێت شاژن سەرکەوتوو بوبێت, ئەشراف ولێرپسراوانی دەوڵەت وهاوڵاتیان خاتونەکەی منیان بەسەرکەوتوو زانی وپێشوازیەکی گەرمیانلێکرد, دوای ئەوەی گەیشتینەوە کۆشکی پاشایەتی ئەسکەندەریە, کلۆپاترا فەرمانیدا سوپاکەی لەحاڵەتی ئامادەباشی دابێت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەرڕاپەڕین وپێشهاتێك، کلیۆپاترا دەیزانی هەواڵی تێشکانی ئەنتوان دەگاتە ئەسکەندەریەو لەوانەیە ناحەزانی ئەو دەست بۆکاری گێرەشێوێنی و ڕاپەڕین بەرن، بۆیە دەبێ سوپاکەی بخاتە حاڵەتی ئامادەباشیەوە, بۆئەوەی هەر نائارامی وهەڵگەڕانەوەیەك دژبە ئەو ڕووبدات سەرکوتی بکات, من نازانم ئاردوارتزی پاشای ئەرمەنستان کەلە زینداندابوو، چۆن هەواڵی تێشکانی ئەنتوانی لەبەرامبەر ئوکتاودا بیستبوو، ئاردواتز لەمیسردا زیندانی بوو هەموو کاتەکانی خۆی بۆنوسین تەرخانکردبوو, خاتونەکەی من دەیگوت لەوانەیە ئوکتاو لەڕێگای جاسوسەکانیەوە هەواڵی تێشکانی سوپای ئەنتوانی بەناوبراو ڕاگەیاندبێت, ئوکتاو دەیزانی بە شێوەیەکی ناجوامێرانە پاشای ئەرمەنستان لەلایەن ئەنتوانەوە دەستگیرکراوە, ئوکتاو بۆئەوەی تۆڵە لەئەنتوان بکاتەوە دەیویست پاشای ئەرمەنستان لەزیندان ئازادبکات و بیگەڕێنێتەوە سەرتەختی پاشایەتی وڵاتەکە خۆی, بەڵام هەرکە خاتونەکەی من ئەمەی بیست فەرمانیدا سەری پاشای ئەرمەنستان لەلاشەی جیابکەنەوە, دوای ئەوەی پاشای ئەرمەنستان کوژرا, هەواڵی تێشکانی ئەنتوان وکلیۆپاترا لەشەڕی ئاکتیوم لەئەسکەندەریەدا بڵاوبۆوەو لەشەقامەکانی شارو تەنانەت لەدوو شوێنی ڕابواردنی گشتیشدا باسباسی شەڕی ئاکتیومبوو، خەڵك دەیانگوت چونکە ئەنتوان تێشکاوەو ئوکتاویش دوژمنی کلیۆپاترایە، ئەوا شاژنی میسر لەناودەبات- یان بەلانی کەمەوە کلیۆپاترا تەختی پاشایەتی میسر لەدەستدەدات ومیسر دەبێتە بەشێك لەئیمپراتۆریەتی ڕۆم, دیاربوو خەڵك لەلابردنی کلیۆپاترا لەسەرتەختی پاشایەتی شادمانبوون، چونکە دەیانزانی تائەو ڕۆژەی کلیۆپاترا حوکمرانی میسربکات دەبێ خەڵك خەرجی مەعشوقەکانی کلیۆپاترا بکێشن کەهەموویان بیانیبوون, جگەلەمەش دەبوا بەرگەی غرورو نازونوزی ئەمانەش بگرن, من بەڕای گشتی هاوڵاتیانی میسر دڵگرانبووم چونکە خاتونەکەی خۆم خۆشدەویست ودەمزانی خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی من وابەستە بەئەوەوەیە, ئەگەر ڕۆژێك بێ‌و کلیۆپاترا لەسەرتەختی پاشایەتی میسر لابرێت, هەرچەندە من لەبرساندا نامرم، بەڵام ژیانی خۆشگوزەرانی لەدەستدەدەم, من ومێردەکەم

بەکەڵك وەرگرتن لەهێزو کەسایەتی کلیۆپاترا ببوین بە کەسە ناسراوەکانی میسر، خەڵك بۆئەوەی خۆیان لەکلیۆپاترا نزیك بکەنەوە، پەنایان بۆئێمە دەهێنا هاوکاریان بکەین, دوای لەسەرکارلاچوونی کلیۆپاترا من ومێردەکەم ئەوەندەمان هەبوو پێی بژین, بەڵام ئەگەری ئەوەهەبوو بمانکوژن, خۆم وشوەکەم (بە تایبەت من) ئەوەندە لەکلیۆپاترا نزیکبووین ئەگەر ئەویان لەناوبردبا ئەوا ئێمەشیان دەکوشت.

یەکێك لەهیوایەتەکانی خاتونەکەی من ئەوەبوو حەزی دەکرد بەردەوام ئاگاداری هەموو شتێکبێت وزانیاری لەسەر جموجۆڵ وراو بۆچونی خەڵك ولێپرسراوانی دەوڵەت و دەرەوە هەبێت, چونکە لەناو ئەسکەندەریەشدا لایەنگرانی ئوکتاو هەبوون, هەموو ئەوانەی دەهاتن بۆمیسرو دەربارەی لەسەرکار لابردنی خاتونەکەی من قسەیاندەکرد دەستگیردەکران وسەرەتا ماڵ وسامانەکەی دەستی بەسەردادەگیراو دواتر دەیانکوشت, بەهۆی درێژە کێشانی ئەم دۆخە ترسناکە دانیشتوانی ئەسکەندەریە نەدەوێران لە ماڵەکانی خۆشیاندا سەبارەت بەهاتنی ئوکتاو ولەسەرکار لابردنی کلیۆپاترا قسەبکەن، شەو ورۆژ لەشەقامەکاندا لەشوێنە گشتیەکانی تری شاری ئەسکەندەریەدا مامورانی حکومەت دەگەڕان وهەرکە دەیانبینی چەند کەسێك کۆبونەوەو باسی لەسەرکارلابردن و لەناوبردنی کلیۆپاترا دەکەن، ئەوانەیان دەستگیردەکردن و بۆ زیندانیان دەبردن و دەستیاندەکرد بەئەشکەنجەدانیان بۆئەوەی پێیانبڵێن زێڕو پارەکانیان لەکوێ داناوە, دوای ئەوەی دەستیان بەسەر سامانەکانیاندادەگرت سەریان دەبڕین, کلیۆپاترا لە ترسی ئەوەی تەختی پاشایەتی میسر لەدەستبدات هەردەنگێکی ناکۆك ولایەنگری ئوکتاو هەبوایە دەمکوتی دەکرد, ئوکتاو لەمیسردا جگەلە جاسوسەکانی لایەنگری تریشی نەبوون، ئەوانەی لایەنگری ئوکتاویشیان دەکرد بۆ دژایەتیکردنی کلیۆپاترابوو, کلیۆپاترا دەسەڵاتی تەواوی بەمامورەکانی خۆی دابوو هەرچی گومانیان لێکرد دەستگیری بکەن و بیبەن بۆزیندان; کاتێ کەسێك بەتۆمەتی لایەنگری ئوکتاو دەستگیردەکرا هیچ ئومێدی بەردانی نەدەما, من دەمزانی ئەو دەسەڵاتداریە ڕەهایەی کلیۆپاترا داویەتی بەمامورەکانی خۆی سەرئەنجامێکی خراپی هەیە، بەڵام نەدەوێرام بەخاتونەکەی خۆم بڵێم ئەمکارە هەڵەیە, من لەسەرەتای ئەم سەرگوزەشتەیەشدا گوتم چونکە لەگەڵ خاتونەکەی خۆمدا خوێندوومە لەجوگرافیا شارەزایم هەبوو ولەوانەی مێژووشدا خوێندومە کە( پریکلس ) یاسا دانەری یۆنانی کەدووسەدەپێش دروستکردنی شاری ئەسکەندەریە ژیاوە, دەڵێت: نابێ مامورانی حکومەت بۆسزادانی خەڵك ئازادی ڕەهایان بدرێتێ، چونکە ئەوانە بەتێڕوانینی گشتی کەسانێکن زانیاریان لەسەر حکومەت ودەسەڵاتداری وڵات نییەو ناتوانن پەی بەڕاگرتنی دەسەڵاتداری دەوڵەت ببەن و هەموو چین وتوێژەکانی میللەت بەیەك چاو سەیردەکەن, دەسەڵاتدارێکی سادەی وەك خاتونەکەی من کەلە کۆشکی پاشایەتیدا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە هەموو چین وتوێژەکانی میللەت بەیەك چاو دەبینێت ورق وکینەی لەهیچ توێژێکیان نابێتەوە بەجیا، چونکە کینەی چینایەتی نییە, بەڵام مامورانی حکومەت چونکە لەچینێکی دیاری کراون وتەنها بەرژەوەندی چینی خۆیان وتاکەکەسیان لەبەرچاودەگرن وچین وتوێژەکانی تر وەك بێگانە سەیردەکەن, تەنها لەبیری بەرژەوەندی چینەکەیدانییە، تەنانەت ئەگەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی پێویستبکات چینەکانی تر لەبەریەك هەڵدەوەشێنێتەوەو لەناویان دەبات, جگە لەمەش مامورانی حکومەت کەسانی

سادەن خۆشەویستیو کینەیان تێدایە بوونی دەسەڵاتی تەواو بەوانە دەبێتە هۆی ئەوەی کینەی خۆیان بەخەڵکی برێژن- یان بۆدەستکەوتنی پارەو ماڵ وسامانی ئەمانە بۆهەڵبەستن وتاوانی جۆر بەجۆربکەن, لەئەسکەندەریەو هەموو شارەکانی تری میسردا مامورەکانی حکومەت کەوتنە گیانی خەڵك, هەندێك لە هاولاتیانیان هەر بۆسەبوری دڵی خۆیان لەناوبردن، هەندێکیشیان لەبەرخاتری دەستکەوتی ماددی کوشتن, ئینجا لەئەسکەندەریەو شارەکانی تردا ئەوەبووبەباو: ئەوانەی بیانەوێ لەسزای مامورەکانی دەوڵەت پارێزراوبن دەبێ باجبدەن بەمامورانی دەوڵەت, تەنانەت ژنانی هەردوو شوێنی ڕابواردنی گشتیش باجیاندەدا بەومامورانە, هەموو دانیشوانی شارەکانی میسر دەیانزانی ئەگەر باجنەدەن بەمامورانی حکومەت ئەوا دەستگیردەکرێن ودەبرێنە زیندان ودەکوژرێن, ئەگەر کلیۆپاترا بیزانیبا ئەمە چەند ناڕەزایی لای دانیشتوانی شارەکانی میسر دروستکردووە، ئەوکارە هەڵەیەی نەدەکرد, لەوکاتەی خاتونەکەی من بەسەختی ئەوانەی دەکوشتن کەدژنی, لەسەربەندەرەکانی ئەسکەندەریەدا کەشتیەکانی حکومەت باردەکران وسازدەکران بۆئەوەی ئەگەر هەواڵی هاتنی ئوکتاو بۆمیسر گەیشت کلیۆپاترا هەڵێت بۆهندستان, بۆیەش خاتونەکەی من هەندێ لەگەنجینە وسامان وپارەکەی خۆی گواستبۆوە بۆسەر ئەوکەشتیانە تالەکاتی هەڵاتندا ئەم سامانەی لەگەڵخۆیداببات بۆ هندستان, ئەگەر ئەو بۆهندستان چووبا ئەوا ئێمەش( من وتیە) لەگەڵیدا دەچووین چونکە نەماندەتوانی دوور لەکلیۆپاترا بژین, دوای ئەوەی ئەنتوان بۆی ڕوونبۆوە کەس لەسەروی ئەفریقادا بەدەنگ فەرمانەکانیدا نایەن وجوابی نادەنەوە, گەڕایەوە ئەسەندەریەو هاتەوەلای خاتونەکەی من، دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەرهاتنی ئەنتوان بۆئەسکەندەریە, کلیۆپاترا مەسەلەیەکی بە من ڕاگەیاند کەزۆر سەرسامی کردم، ئەویش ئەوەبوو کلیۆپاترا بەمنی گوت هرود پاشای فەڵەستین چۆتە بن کلێشەی ئەنتوانەوە بۆئەوەی بمکوژێت, من ئەوەم دەزانی دوای ئەوەی ئەنتون هاتەوە ئەسکەندەریە پاشای فەڵەستین دووجار تەتەرێکی تایبەتی خۆی بۆلای ئەنتوان ناردبوو, بەڵام نەمدەزانی نادرنی ئەوتەتەرە پەیوەندی بەکوشتنی خاتونەکەی منەوەیە, هرود پەیامێکی بۆئەنتوان ناردبوو ونووسیبووی باشترین ڕێگاچارەی تۆ بۆئاشتبوونەوە لەگەڵ ئوکتاودا، کوشتنی کلیۆپاترایە لەلایەن تۆوە, ئەگەرتۆ کلیۆپاترا بکوژی ئیتر ئوکتاو تێدەگات کەس نییە هانی تۆبدات دژبە ئەو بێت وئیتر ترسی لەتۆ نامێنێت, خۆت دەزانیت ئوکتاو دوژمنی کلیۆپاترایە ئەگەرتۆ سەری براوی شاژنی میسر بەدیاری بۆئوکتاو بنێری, ئەو، ئەودیاریەی تۆ قبوڵدەکات و لەگەڵتدا دەبێتەوە بەدۆست, داوا لەهرودکرابوو دوای کوشتنی کلیۆپاترا ئوکتاو وئەنتوان ئاشتبکاتەوەو دەیگوت ناردنی سەری براوی کلیۆپاترا بۆئوکتاو دەبێتەهۆی ئاشتبونەوەی تەواوی نێوانتان, بەڵام ئەنتوان وەك خاتونەکەی من بۆی گێڕامەوە ڕازی نەبووە، ئینجا کلیۆپاترا بەمنی گوت: شریون پێتوانەبێ ئەنتوان پیاوێکی شەریفە کەڕازی نەبووە من بکوژێت وسەرەکەم وەك دیاری بۆئوکتاو بنێرێت, بەڵکو لەبەرئەوە خۆی لەکوشتنی من پاراستووە چونکە تائێستاش لەژێر کاریگەری نفوزی منداپەو پێویستی بەمنە, ئەنتوان دەزانێت لەسیاسەتدا دۆستایەتی ودوژمنایەتی وابەستەیی بەبەژەوەندییەوەیە, ئوکتاو تائەو ڕۆژە حەزی لەدۆستایەتیکردنی ئەنتوانبوو کە پێویستی پێبوو, بەڵام ئەمڕۆ ئوکتاو پێویستی بەدۆستایەتی ئەنتوان نییە چونکە لەپەلوپۆ ودەسەڵاتی خستووە, ئەگەر ئەنتوان سەری من بەبڕاوی وەك دیاری بۆئوکتاو

بنێرێت ئەوالەمرۆ خراپتری بەسەردێت وئوکتاو زیاتر زاڵدەبێت, من ناڵێم ئوکتاو بەبینینی سەری براوی من دڵخۆشنابێت بەلآم ئەو لەوەژێرترە بەمە سەری درندەیەك- سەرێکی سەرشاری بیربچێتەوە کەئەویش سەری ئەنتوانە, دوای ئەوەی ئوکتاو سەری براوی منی بینی سەری ئەنتوانیش لەلاشەی جیادەکاتەوە, ئەنتوان لای ئوکتاو وئەودوژمنەنیە کەدوای تێکشکاندنی بەزەیی بەرۆحی دابێتەوە, ئەنتوان دوژمنێکە لەوانەیە لەئایندەدا سەربەرز بکاتەوەو مەترسی لەسەر ئەو دروستبکاتەوە, ئەنتوان زانیویەتی پێویستی بەبونی من هەیە بۆیە ڕازی نەبووە من بکوژێت, هەرزوو ئەو قسەیەی خاتونەکەی من وەڕاستگەڕا، چونکە ئوکتاو بڕیاریدابوو ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەلآتداریەتی ئەنتواندابوون داگیربکات, ئوکتاو سەرەتا ئاسیای بچوکی داگیرکرد دواتر سوریا, لەهیچ یەك لەم دوو وڵاتانە کەس بەرەنگاری وشەڕی نەکرد، دواتر فەڵەستینی بێ شەڕ داگیرکردو پاشای فەڵەستین دیاری گرانبەهای بۆئوکتاو ناردن, هەموو ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەلآتداریەتی ئیمپراتۆریەتی ئەنتواندابوون کەوتنەوە ژێر دەسەلآتی ئیمپراتۆریەتی ئوکتاو، جگەلە میسر هیچ شوێنێکی تر نەمابوو بۆ ئەنتوان, ئەوکاتە ئاشکرابوو کەتاکە پەناگای ئەنتوان میسرە، ئەگەر خاتونەکەی منی کوشتبا ئەوائەو پەناگایەشی لەدەستدەدا، چونکە ئەستەمبوو ئوکتاو لێی بگەڕێت ئەنتوان لەمیسردا دەسەلآتداریەتی بگرێتەدەست وهێرشی نەکاتەسەر, دوای ئەوەی ئوکتاو فەڵەستینیشی داگیرکرد, لەمیسر نزیکنەبۆوە بەڵکو گەڕایەوە بۆڕۆم ئەو پێشوازیەی پەرلەمانی ڕۆم لەئوکتاویانکرد نەزیری ئەو پێشوازیانەبوو کەلەسیزار دەکران, خاتونەکەی من دەیگوت سەرم سوڕماوە بۆچی ئوکتاو بۆمیسر نەهات، ئایا لەشەڕکردن لەگەڵ ئێمەدا دەترسێت- یان هۆکارێکی تر هەیە کەهێرش ناکاتە سەر میسر؟ پاش ماوەیەك کلیۆپاترا بەمنی گوت دوای ئەوەی ئێمە لەشەری ئاکتیومدا تێشکاین دڵنیابووم ئوکتاو هێرش دەکاتەسەر میسرو گونجاوترین کاتبوو بۆهاتنی، چونکە ئەوهێزی دەریایی وسوپایەکی بەهێزی لەگەڵدابوو، ئێمە ئەوەمان نەبوو، ئەو سەربازەکانی ڕۆحیەتێکی سەرکەوتوانەیان هەبوو، ئێمەش ڕۆحیەتی یەك تێکشکاو, هەروەها خاتونەکەی من گوتی لەوانەیە لەبەرئەوەش ئوکتاو هێرشی نەکردبێتەسەر میسر بۆئەوەی ئێمە لەحاڵەتی چاوەڕوانیدا بیڵێتەوەو لەچاولەڕێکاییدا شەکەت و بێزارمان بکات, لەوانەیە ئوکتاو وابیری کردبێتەوە خاتونەکەی من دوای تێشکانی شەڕی ئاکتیوم توشی نائومێدی بوبێتەوەو هەرکاتێ بیەوێت شەڕ لەگەڵیدابکات شاژنی میسر بەسەختی بەرەنگاری وشەڕبکات وئەمەش بەگرانی لەسەرئەو بکەوێت- واتە ئوکتاو، چونکە میسر وڵاتێکی بچوك نەبوو بەڕای من ئوکتاو وای بیرکردۆتەوە داگیرکردنی ئاسانییەو بەسەختی ڕووبەڕووی دەبنەوە.

# کلیۆپاترا لەهەوڵی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ ڕزگاربوون

ساڵێك بەسەر شەڕی ئاکتیومدا تێپەڕی لەماوەی ئەو ساڵەدا دوو ڕووداو هاتنەپێش کە شایانی باسکردنن, یەکەمیان ئەوەبوو کلیۆپاترا ڕایگەیاند کەسیزاریۆنی کوڕی باڵقبووەو پێویستە تاجی پاشایەتی میسر بخاتەسەر, بۆ سیزاریۆن تاجێکیان دروستکرد کەلەتاجی فرعەونەکانی میسر دەچوو تەنانەت ئارمی مەزهەبی تاجی فرعەونەکانیشیان لەسەر تاجەکەی سیزاریۆن دروستکردبوو, چونکە کلیۆپاترا پێشبینی ئەوەی دەکرد هەلومەرجێك بێتەپێشێ وهەڵێت بۆهندوستان, بۆیە دەیویست کوڕەکەی دوای خۆی ببێتە پادشای میسرو میسرییەکان ئەو قبوڵبکەن و وابزانن دەبێتە پاشای پارێزەری داب ونەریتەکانی میسری, من بەوەی کەنیزەکی تایبەتی شاژنی میسربووم وخاتونێکی بەرەچەڵەك یۆنانیم هەبوو, بەڵام هەرکاتێ ناوی فرعەونەکانی پێشوی میسرم گوێلێدەبوو هەستی ڕێزدانان بۆئەوانە بەدڵدادەگەڕا, هەر کاتێ ئەهرامەکانیشم دەدیتن لەبەرخۆمەوە دەمگوت ئەوپاشایانەی ئەمانەیان دروستکردوون پیاوی مەزن بوون, کلیۆپاترا دەیزانی شوێنەوارو تراديسيۆنە کۆنەکانی میسری لای میسریەکان جێگای ڕێزە، بۆیە بۆکوڕەکەی خۆی تاجێکی دروستکردووە کەزۆر لەتاجی فرعەونە کۆنەکانی میسر دەچوو، ئەمەش بۆئەوەی کاریگەری بخاتەسەر میسریەکان، ئاهەنگی دانانی تاجی پاشایەتی لەسەرسەری سیزاریۆن لەشاری دێرینی( ممفیس) بەڕێوەچوو, ئەو ڕۆژەی لەشاری ممفیسدا تاجیان نایەسەری سیزاریۆن, من لەوێبووم وبینیم سیزاریۆن لەڕووی شێوەو ئاکارەوە زۆر جیاوازی لەگەڵ فرعەونەکانی میسردانەبوو, وەك فرعەونەکان سەری تاشیبوو وتاجەکەیان نایەسەر سەرە تراشراوەکەی, جلوبەرگەکەی سیزاریۆنیش هەر جلوبەرگی فرعەونەکانی میسربوو ودەستەیەك کاهین بەجلوبەرگی میسری کۆنەوە بەسەری تاشراوەوە سروودی مەزهەبیان دەگوتەوە, لەهەمانڕۆژدا سەری چەند زیندانیەکیان بڕی، وەك قوربانی بۆئەو ڕێوڕەسمە چونکە لەکۆنیشدا لەکاتی ڕێوڕەسمی تاج داناندا قوربانیان بۆدەکرد, شێوازی تاج لەسەردانانی سیزاریۆن بەشێوازێکبوو کلیۆپاترا بە ناڕاستەوخۆ مەزهەبی دێرینی میسریەکانی قبوڵکرد, پێویستە بڵێم خاتونەکەی من لەدڵەوە باوەڕی

بەهیچ مەزهەبێك نەبوو, هەرچەندە ڕێزی بۆخواکانی یۆنانی دادەنا بەڵام ئەمە لەڕووی باوەڕبوون و دڵسۆزییەوە نەبوو, مەزهەب بەلای کلیۆپاتراوە وەك دۆستایەتی وعەشقەتی وشوکردن وبەکاربردنی جنس، کەرەستەیەکبوون بۆبەرەو پێشبردنی ئامانجە سیاسیەکانی, بۆیە لەوکاتەدا بۆ بەدەستهێنانی دڵی میسریەکان دەبێ واخۆی نیشانبدات کەلایەنگری مەزهەبی ئەوانە, بەڵام بەداخەوە لەهەمان ئەو کاتانەدا کەلەشاری ممفیسدا تاجی پاشایەتیان دەنایە سەری سیزاریۆن وناویاننا ڕامسس وکاهینەکانی میسری بەسەری تاشراوەوە سروودی مەزهەبیان دەگوتەوە، مامورەکانی‌حکومەتی میسر لەئەسکەندەریەو شارەکانیتردا خەڵکیان دەکوشت و باجیان لێوەردەگرتن, بۆیە ئەوبەڕووکەش خۆپیشاندانەی کلیۆپاترا بەوەی باوەڕی بە مەزهەبی کۆنی میسریەکان هەیە، کاریگەری لەسەر هاوڵاتیانی میسری جێنەهێشت, لەوڕۆژەدا من لەبەرخۆمەوە دەمگوت، ئەگەر باروذۆخێکی وابێتەپێش کلیۆپاترا لە میسر بڕوات وبچێ بۆهندستان, ئایا کوڕەکەی سیزاریۆن کەناونرا ڕامسس، دەتوانێ لە میسردا حوکمڕانی بکات؟ ئایا دەشێ دوای هەڵاتنی کلیۆپاترا ئوکتاو ڕازیبێت ڕامسس لەسەرتەختی پاشایەتی میسر بمێنێتەوە؟ بەوەی ئوکتاو خۆی بەمیراتگرەوەی شەرعی سیزار دەزانی وچاوی بەرینایی نەدەدا سیزاریۆنی بەڕووکەش کوڕی سیزار خۆی بەڕۆڵەی دیکتاتۆری داستانی ڕۆمی نیشانبدات؟ بەبۆچونی من لەناوبردنی کوڕەکەی سیزار زۆر لەفرعەونی میسر گرنگتربوو, ئەگەر سیزاریۆن فرعەونی میسر نەبوباو کەسێکی ئاسایش با ئوکتاو هەرلەناوی دەبرد, جاچجای ئەوەی بوبێتە فرعەونی میسریش, هەروەها پێویستی ئەوەش کەمیسریش داگیربکرێت وبکەوێتە ژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بواری کوشتنی ئەوی دەرەخساند، من سەرم لەوەسوڕما بۆ چۆن خاتونەکەی من دەیەوێت سیزاریۆن لەمیسردا بەجێبێڵێت و بۆ خۆی بۆهندستان هەڵبێت؟ ئایا بەئومێدی ئەوەیە ئەنتوان بەرگری لەکوڕەکەی ئەوبکات لەبەرامبەر ئوکتاودا؟ بەڵگە نەویستە ئەنتوان پێش کلیۆپاترا لەمیسر هەڵدێت، ئەگەر ئوکتاو هێرش بێنێت, ئایا خاتونەکەی من هیوای بەوەبوو میللەتی میسر بەرگری لەکوڕەکەی بکەن؟ ئەم ئومێدەش بێ بنچینەیە چونکە خەڵکی میسر بەهۆی زوڵم وستەمی مامورانی حکومەت زۆر ڕقیان لەکلیۆپاترا دەبۆوە، من دلنیابووم ئەگەر ئوکتاو پەلاماری میسری بدابا خەڵکی میسر وەك ڕزگارکەر سەیریاندەکردو پێشوازیان لێدەکرد, هەرچەندە تاج نرایە سەری سیزاریۆن و ناوی ڕامسسیان لێنا، بەڵام هەموو دەسەڵاتەکان هەر لە دەستی کلیۆپاترادا مابوون. ڕووداوی دووەم ئەوەبوو ماوەیەك پێشئەوەی سیزاریۆن تاجی پاشایەتی بنرێتەسەر خاتونەکەی من فەرمانی دابوو بەخێرایی گۆڕێکی شایستەی بۆ دروستبکەن, کلیۆپاترا لەکۆشکی پاشایەتی شاری ئەسکەندەریەدا مەزارێکی چواردەورە دیواری بۆ گۆڕەکەی خۆی دیاریکردو دە هەزار وەستاو کرێکاری بەکرێ گرتن بۆ دروستکردنی گۆڕەکەی، پێنج هەزاریان شەوانە تابەیانی کاریاندەکردو بەڕۆژ دەخەوتن، پێنج هەزارەکەی تریش بەڕۆژ کاریاندەکرد, خاتونەکەی من تەنها مەبەستی ئەوەنەبوو گۆڕ بۆخۆی دروستبکات، بەڵکو دەیویست مەزارێکی وابنیاتبنێت کەهەموو سامانەکەی خۆی تێداجێبکاتەوە, ئەو دەیزانی فرعەونەکانی میسر ئەو هەرەمانەیان تەنها بۆگۆڕی خۆیان دروستنەکردووە، بەڵکو بۆحەشاردانی سامانەکانیشیان بووە لەگەڵ خۆیاندا، بۆئەوەی کەس دوای ئەوان ئەوگەنجینانەی نەکەوێتەدەست, کلیۆپاترا دەیزانی یەکێك لەوهۆکارانەی دەبێتە پاڵنەری ئوکتاو وبۆهێرشکردنەسەر

میسر گەنجینەکەی ئەوە, بۆیە دەبێ سامانەکەی خۆی بشارێتەوە تانەکەوێتە دەست ئوکتاو, بۆیە مەزاری تەرمەکەی خۆی بەشێوەیەك دروستکرد جێگای سامانەکەشی تێدابێتەوە, من نامەوێت خۆم هەڵکێشم بەلاٌم دەڵێم لەناو هەموو ئەوانەی لەکۆشکی پاشایەتی میسردابوون، تەنها من دەمزانی گەنجینەی کلیۆپاترا لەشوێن مەزارگەکەیدا دانەنراوە, هەتا ئەنتوانیش ئەمەی نەدەزانی, بەلاٌم من ئاگاداری ئەوەبووم کەچینەکانی ژێر شوێنی ئارامگای کلیۆپاترا تەنها بۆئەوە دروستکراوە ئەگەر ڕۆمیەکان میسریان داگیرکرد فریوی پێبخۆن, من دەمزانی ژێر گۆڕی کلیۆپاترا هەندێ زێڕوزیوی لێدادەنرێت، بەلاٌم ئەمانە گەنجینەی تەواوی کلۆپاترانین, خاتونەکەی من زێڕو گەوهەرو گەنجینەکانی لەشوێنێکی تردا شاردبوونەوە, هەرئەو ساڵەی خەریکی دروستکردنی ئارامگای کلیۆپاترا بوون لەکۆشکی پاشایەتیدا، خاتونەکەی من فەرمانی دەرکرد ئەوکەسانەی بەتاوانی لایەنگری ئوکتاو دەگیردرێن نەیانکوژن, بەڵکو زیندانیان بکەن و هەرکاتێ ئەو داوای کردن ئەوگیراوانەی بۆبنێرن, من هەر زوو زانیم کلیۆپاترا دەیەوێت جۆری ژەهری مارەکانی خۆی لەسەرئەوانە بەتاقی بکاتەوە, خاتونەکەی من ژەهرناسبوو, ئەگەر زانیاری لەسەرجۆری ژەهرەکان نەبایە نەدەبوو بەنەوەی بتالیسە لەقەلەم بدریایە، هەموو پاشاکانی پشتاوپشتی کلیۆپاترا ژەهرناسبوون وئەوکاتانەی بەپێویستیان زانیوە، ژەهریان بەکارهێناوە, بۆیە خاتونەکەی من بڕیاریدا جۆری ژەهرەکان لەسەر ئەو بەندکراوانە بەتاقی بکاتەوەو بزانێت کامەیان کاریگەرترەو زوتر بەبێ ئازار مرۆ دەکوژێت, چونکە ئەو بیری لەوەدەکردەوە نەبادا هەلومەرجێك بێتەپێش ئەو بواری نەبێت هەڵێت وبکەوێتەدەست ئوکتاو وکۆت وزنجیری بکات وبیبات بۆ ڕۆم ولەئاهەنگی سەرکەوتنەکەیدا بەبەردەم خەڵکی ڕۆمدا ڕاکێشی بکات, چون نیشاندانی ئەو دیلانەی کەلێپرسراو وخاوەن پلەو پایەی بەرزبوون بەخەڵکی ڕۆم یەکێکبوو لەنەریتە باوەکانی سەرکردە سەرکەوتوەکانی ڕۆم, ئەو دیلانەیان بەبەردەم خەڵکی ڕۆمدا دەهێناو دواتر-یان دەیانکوشت- یان ئازادیان دەکرد, خاتونەکەی من لەکوژرانی خۆی نەدەترسا بەڵکو لەوەدەترسا بەدیلی بیگرن و بەکۆت وزنجیرەوە لەڕۆژی ئاهەنگی سەرکەوتنی ئوکتاودا ئەو بەبەردەم خەڵکی ڕۆمدا بێنن و دواتر ناچاری بکەن لەبەرامبەر ئوکتاودا بکەوێتە سەر ئەژنۆ وکڕنوژی پێببەن, هەرچەندە خاتونەکەی من لەڕۆژگاری سیزاردا چوو بۆ ڕۆم، بەلاٌم ئەوکات وەك میوانی سەرۆکی ئەو وڵاتەبوو, تائەو ڕۆژەی سیزاریان نەکوشت دامودەزگاکانی دەوڵەت بەڕەسمی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خاتونەکەی مندادەکرد, بەلاٌم ئوکتاو ڕێز بۆ خاتونەکەی من دانانێت وبەزنجیرکراوی دەیبات بۆ ڕۆم ونیشانی خەڵکی ڕۆمی دەدات و دواتر دەیکوژێت, کلیۆپاترا زیاتر مەترسی لەوەبوو ئوکتاو بەزیندویی بیهێڵێتەوە, بۆیە بڕیاریدا هەموو جۆرە ژەهرەکانی لەسەرئەو زیندانیانە بەتاقی بکاتەوە تابزانێت کام لەمانە بێ ئازاروخێرا مرۆڤ دەکوژێت, ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە کۆمەڵێ لەو تاوانبارانەیان دەهێنان بۆکۆشکی پاشایەتی, خاتونەکەی من لەکاتی نانخواردندا ئەو زیندانیانەی لەگەڵخۆیدا دەبرد بۆئەو هۆڵەی کەخۆی نانی تێدادەخوارد, ئەم تاوانبارانە کەزۆربەیان حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەردا درابوو بەشێوەیەك هەڵدەبژێردران کەهەندێکیان تەمەنیان گەنجبێت، هەندێکیتریان پیاوی کامڵ، هەندێکی تریشیان پیربن, تابزانێت داخوا ئەو ژەهرە چۆن کاردەکاتەسەر ئەوانەی گەنج و لەنیوەی تەمەندان و پیرن، پێشئەوەی ئەو زیندانیانە بێنەناو ئەوهۆڵە کلیۆپاترا فەرمانی دەدا خواردن بکەنە ئەو قاپانەی

کەشێوەو ڕەنگێکی تایبەتیان هەبوو ودواتر بۆخۆی ژەهری لەو قاپانەدەکرد, دوای ئەوەی تاوانبارەکان دەهاتن کلیۆپاترا خەندەی لەڕووی ئەوانەدا دەکردو مۆڵەتی دانیشتنی پێدەدان و بەشێوەیەك هەڵسوکەوتی دەکرد ئەوانە وایاندەزانی شازنی میسر بەزەیی پێیانداەێتەوەو بۆیان بەپەرۆشە, بۆیە ئەمخوانەی بۆ سازکردوون.

دوای ئەوەی ئەوانە دادەنیشتن ئەو قاپانەیان لەبەردەم دادەنان، هەندێ لەمانە لەنیوەی ناخواردنەکەدا بەلادا دەکەوتن، هەندێکی تریان دوای تەواوکردنی خواردنەکە دەکەوتن و گرمۆڵە دەبوون وپێچیاندەدان و لەتاوئازار هاواریان دەکرد، خاتونەکەمنیش بێبەزەییانە بێئەوەی مەرگ وئازاری ئەمانە کاری تێبکات سەیری دەکردن تابزانێت چۆن دەمرن, خاتونەکەی من دیمەنی مردنی ئەوکەسانەی بەوەمەبەستە سەیردەکرد تابزانێت لەڕۆژی تەنگانەو نائومێدی خۆیدا چۆن دەمرێت, کلیۆپاترا لەم تاقیکردنەوانەدا گەیشتە ئەوئەنجامەی، ژەهری بەهێز مرۆڤ بەئازارەوە دەکوژێت- بەڵام ژەهری بێقوەت بێ ئێش وئازار دنیا بەمرۆڤ جێدەهێڵێت، تائەو ڕۆژەی ئاشکرانەببوو خاتونەکەی من ئەوخەڵکە ژەهرخواردوو دەکات، کەس لەم زیندانیانە زەندەقیان نەچووبوو، بەڵام کاتێ ئەمە بڵاوبۆوە وئاشکرابوو، ئیتر ئەو زیندانیانە لەبەردەست وپێی کلۆپاترادا دەکەوتن ودەگریان ودەپاڕانەوە کەبەشمشێر سەریان بپەڕێنن- بەڵام ژەهرخواردوویان نەکەن, من سەرەتا باسی ئەوەمکرد خاتونەکەی من لە ڕۆژگاری گەنجیدا حەزی لەڕاگرتنی ماربوو وبەردەوام لەژورەکەی خۆیدا یەك دوو قەفەسی ماران هەبوو وبەردەوام مارەکان لەوقەفەسانەدا دەجوڵانەوە, هیچ پیاوێکی بەهێزو توانا هیچ جەنگاوەرێك نەدەوێرا مارێکی ژەهراو بگرێت، بەڵام خاتونەکەی من ملی ماری ناسراو بە( ماری زەنگوڵەدار)ی دەگرت بێ ئەوەی هیچ ترس ولەرز لەئەو بەدیارکەوێت, کلیۆپاترا بەمنی گوت: شرمیون، ئەگەر بتەوێت دەمی یەك ماری ژەهردار بگریت وپێتەوەنەدات دەبێ سەیری سەری مارەکە بکەیت وچاوت لەچاوەکانی ببڕیت, لەدنیادا مارنییە لەماری زەنگوڵەداری ئەفریقایی مەترسی دارترو خێراتر, ماری ناوبراو لەچاو تروکانێکدا بەمرۆڤەوەدەدات وژەهرەکەشی چارەسەری نییە, بەڵام ئەگەر تۆملی ماری زەنگوڵەداربگریت وچاوی تێبڕیت ئەوا پێتەوە نادات, بەوەی من تەمەنێکم لەگەڵ کلیۆپاترادا بەسەربردبوو, هەرگیز نەدەوێرام ئەومارانە بگرم چونکە ترسان لەمار شتێکی سروشتییە, ئەمجارەیان کلیۆپاترا بەم مارانە زیندانەکانی دەکوژتن، دوای ئەوەی ئەوانەیان دەهێنان کلیۆپاترا بۆخۆی دەستی دەبردە ناو قەفەسەکەو سەری مارەکەی دەگرتوو دەیهێنانە دەرێ, هەتا مارگرەگانیش نەدەوێران دەستیان ببەنەناو ئەو قەفەسانەو ماردەربێنن, چونکە دەیانزانی ئەو مارانە دەمێکە لەوقەفەزانەدا ماونەوەو تووڕەو هاربوون، خاتونەکەی من ئەو مارەی دەگرتەدەست وبەرەو ئەو زیندانیە دەستوپێ بەستراوە دەچوو وئەو مارەخێرا بەیەك تەکان پێوەیدەدا، دواتر خاتونەکەی من مارەکەی دەخستەوەناو قەفەسەکەو چاوەڕوانی شێوازی مردنی ئەو دەستوپێ بەستراوەی دەکرد داخوا چۆن گیان دەسپێرێت, ئەگەر ماری زەنگوڵەداری ئەفریقایی بەهەرکەسێکەوەبدات دوای یەك کاتژمێر ئەوکەسە لەشی سور هەڵدەبزرکێت وکەفی لەدەم دێتەدەرێ وهەناسەی لەسینگیدا پەنگ دەخواتەوەو دواتر دەمرێت، لەو کاتەی مارەکە بەوتاوانبارەیەوەدەدا تادەمرد بۆساتێ ئۆقنەی نەدەگرت. لەنێوان ژەهری هەموو مارەکاندا خاتونەکەی من تەنها ژەهری

جـۆرە مـارێکی بـەناوی(ئاسـپیك )( أ ) ( جۆرەمارێکـە لەسـەرووی ئـەفریقادا دەژیـت –و فارسـی) پەسەندکرد، ژەهری ماری ئاسپیك نەدەبووە هۆی ئازارو ئەشکەنجەی زۆرو ڕەنگی پێستی ئەوکەسەی نەدەگۆڕی– هـەتا تاشـی دروسـتنەدەکردو ئەوکەسـەی ئەومارەکـە پێـوەی دابـوو تـەنها حـەزی دەکـرد بخەوێت ولەکاتی نوستندا بـەبێ ئێش وئازارکێشان گیانی دەسپارد, کلیۆپاترا بـەمنی گوت شرمیون ئەگەر ڕۆژێ بێت, من بکەومە نائومێدی وتەنگانە ئەوا بەژەهری ماری ئاسپیك خۆم دەکوژم.

–گوتم ئەی خاتونەکەی من: ئایا ماری ئاسپیك دەتوانێت بەتۆوە بدات؟

–کلیۆپاترا گوتی: مار وەك سەگ نییە خاوەنەکەی خۆی بناسێتەوە, مار خاوەنەکەی خۆی ناناسێت، ئەگەر بۆجارێکیش خاوەنەکەی ناخافڵێت ئەوا پێوەی دەدات.

لەوکاتـەی شـەو وڕۆژ لەکۆشـکی پاشـایەتیدا خـەریکی دروسـتکردنی ئارامگـای خاتونەکـەی مـن بـوون وکلیۆپاترا خەریکی مارپێوەنانی زیندانیەکانبوو, ئـەنتوان کـەوتبۆ هـەوڵی ئـەوەی وڵاتـی لیبیا بخاتـەوە ژێر فەرمانی خۆی هەرنەبێ بۆئەوەی مەترسی لەشکری ڕۆمـی کەلـەو وڵاتـەدابوو لـەخۆی دووربخاتـەوە, ئەگـەری ئەوەهـەبوو لەشـکری ڕۆم لـەلیبیادا هێـرش بکەنەسـەر میسـرو ئـەنتوان دەسـتگیربکەن– یـان بیکوژن، دیارە ئەگەر هێرش بکەنەسەر میسریش ئەوا تـەختی پاشایەتی خاتونەکەی منیش نامێنێت, بۆیە کاتێ کلیۆپاترا زانی ئەنتوان نەخشەی ئـەوەی کێشاوە شاری پاراتونیومی لیبی داگیربکات, ئـەم بۆچونەی ئـەنتوانی پەسـەندکرد, پـاراتونیوم لـەلیبیادا بەنـدەرێکی گەورەیـەو ئەوکاتـە ببـووە بارەگـای گالوس؛ وەك لەمەوبەر گوتم گالوس ئەوپیاوەبوو کە دوای ئەوەی ئوکتاو لەشەری ئاکتیومدا سەرکەوت ئـەوی ناردبێتـە فـەرمانڕەوای گـشتی وڵاتـانی سـەروی ئـەفریقای ژێـر ئیمپراتۆریـەتی ڕۆم, ئـەنتوان لەمیسردا بەیاریدەدانی خاتونەکەی من سوپایەکی پێکەوەناو بەکەشتیە جەنگیەکانی میسری بـەرەو پاراتونیوم بەڕێکەوت, بەوەی ئەنتوان لەکەنداوی ئامبراسیدا کەوتبۆ داوەوەو ڕێگای دەرچوونی نـەبوو دەبوا بیزانیبـا دوای گەیـشتنی بەبەنـدەری پـاراتونیوم لەوانەیـە ڕێی ڕزگـاربوونی نـەمێنێت, گـالوس فەرمانـدەی گـشتی وڵاتـانی سـەرووی ئـەفریقا لـەدەم تەنگەبـەری بەنـدەری پاراتونیومـدا زنجـیری ڕایەڵەکردبوون بەشێوەیەك دەتوانرا ئەو زنجیرانە بەرزبکرێنەوە سەرئاوەکەو نـەوی بکرێنـەوە ناوئاوەکە، کاتێ ئەو زنجیرانەیان شل کردبان کەشتیەکان دەیانتوانی بچنەناو بەندەرەکەوەو بڕۆنە دەرلێی, بەڵام کە زنجیرەکانیـان ڕاکێـشابان وبەرزکردبانـەوە، کەشـتیەکان نەیانـدەتوانی بـێن وبـچن, کاتـێ ئـەنتوان بەکەشـتیەکانیەوە گەیـشتە نزیـك بەندەرەکـە زنجیرەکانیـان شـلکردبوون وچـوبوونەناو ئاوەکـە, هەرکـە ئـەنتوان بینـی دەم بەندەرەکـە سـوپای دوژمنـی لێنیـە بـە شـادمانیەوە کەشـتیەکانی خـۆی بردنـەناو کەنداوەکـە, دواتـر بەفـەرمانی گـالوس زنجیرەکانیـان کێشان وڕێگـای گەڕانـەوەی کەشـتیەکانی ئـەنتوان گیراو ئیتر هـەموو کەشـتیە جەنگیـەکانی ڕۆمـی هێرشـیان کردەسـەر کەشـتیەکانی ئەنتوان وڕۆمیـەکان ئاگریان بەردایە کەشتیەکانی ئەنتوان, بەشێوەیەك تینیـان بۆهێنـان ئـەنتوان ویـستی پاشەکشەبکات و وازلەشەڕکردن بهێنێت، بەڵام کەسەیریکرد گەرووی کەنداوەکە گیراوەو ڕێگای گەڕانەوە نییە, ڕۆمیـەکان زانیان ئەنتوان دەیەوێت هەڵێت، بۆیە بەگوڕتر هێرشیان هێناو هێندەی نەمابوو ئـەنتوان دەستگیربکەن, سەرئەنجام ئەنتوان توانی هەڵبێت وهەموو کەشتیەکانی ئەو لەوبەندەرەدا سوتێندران وئـەو سـەربازانەی

کەبە زیندویش مابوونەوە بەدیلگیران, دوای ئەوەی ئەنتوان لەم شەڕەدا تێشکاو هەڵاتەوە بۆ میسر, خاتونەکەی من لەوەگەیشت ئیتر ئەوپیاوە جێگای ئومێد نییەو پێویستە لێی جیابێتەوە, تائەو ڕۆژەش کلیۆپاترا بەئومێدبوو ئەنتوان پەندو ئەزمونی لەڕابردووی خۆی وەرگرتبێت وەهەوڵبدات هەڵەی تێشکانەکانی دووبارەنەکاتەوە، بەڵام دوای ئەو شەڕە گەمژانەیەی ئەنتوان لەبەندەری پاراتونیومداکردی وبەسەختی تێشکا, خاتونەکەی من ئیتر بڕوای دەرکەوت چی لەبارانـدا نەماوە، ئەگەر لەخۆی دورنەخاتەوە بەئاگری ئەو دەسوتێت.

خاتونەکەی من بڕیاریدا ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ ئوکتاودا ببەستێ، بۆئەو مەبەستەش نامەیەکی بۆئوکتاو بەیەك تەتەری میسریدا نارد بۆ ڕۆم وپێی گوت ئەم نامەیە بدەرەدەست ئوکتاو و وەڵامەکەشم بۆبێنەوە, ئینجا چەند پارچە گەوهەری گرانبەهای وەك دیاری بۆئوکتاو نارد, دوای ئەوەی ئوکتاو نامەودیاریەکانی کلیۆپاترای پێگەیشت, لەوەڵامی خاتونەکەی مندا بۆی نووسیبوو: ئەگەر دەتەوێت دۆستایەتی من بکەیت دەبێ هەموو گەنجینەی خۆت وتاجەکەشت تەسلیم بەمن بکەیت, جگە لەو نامەیەش ئوکتاو بەقسەش بەتەتەرە میسرنەکەی گوتبوو بەکلیۆپاترا بڵێ، ئەگەر ئەنتوان بکوژێت ئەوائاشتی لەگەڵدادەکەم, ئەنتوان هەستیکرد خاتونەکەی من چارەی ناوێت وئیتر ناتوانێت لەمیسردا بژیت, بۆیە نامەیەکی بۆئوکتاو نووسی و تێیدا داوای کردبوو ڕێگای پێبدات لەئەسینادا بژیت, ئوکتاو وەڵامی نامەکەی ئەنتوانی نەدایەوە تازیاتر ڕیسوابێت, خاتونەکەی منیش زانی ئەنتوان نامەی بۆ ئوکتاو ناردووەو داوای کردووە ڕێگای پێبدات لەیۆناندابژیت, کاتێ ئەنتوان زانی ئوکتاو وەڵامی نامەکەی ناداتەوە بۆئەوەی تورەیی ئوکتاو بۆئاشتی بگۆڕێت, دەستی بۆکارێکی نەنگ برد ئەویش ئەوەبوو( ترولیوس) کە یەکێکبوو لەبکوژانی سیزارو لە ترسی ئوکتاو هەڵاتبوو ولەمیسردا دەژیا, بێ ئاگاداری خاتونەکەی من دەستگیری کردو ناردی بۆ ڕۆم، پێویستە لێرەدا ئەمە بڵێین دوای ئەوەی ئوکتاو لەڕۆمدا دەسەڵاتی گرتەدەست, هەموو ئەوانەی دەستیان هەبوو لەکوشتنی سیزاردا کوشتنی, ئوکتاو بەپەرۆشنەبوو لەمردنی سیزار تاتۆڵە لەبکوژانی ئەوبکاتەوە, بەڵام چونکە خۆی بە میراتگرەوەی سیزار دەزانی بۆیە بەپێویستی دەزانی تۆڵە لەبکوژانی سیزار بکاتەوە, هەرچەندە خاتونەکەی من سیزاری خۆشدەویست وسیزاریۆنی کوڕەکەی خۆی بە ڕەسمی بەهی سیزار ناساند, بەڵام بڕیارینەدا ترولیوس بکوژێت وچاوپۆشی لێکرد, گەچی ئەنتوان ئەوی لەبیرنەکردبوو وبۆ ئەوەی لەئوکتاو نزیکبێتەوەو ڕێگای پێبدات لە یۆناند جێنشینبێت، ترولیوسی دەستگیرکردو بۆ ڕۆمی نارد تابەئوکتاو-ی بسەلمێنێت کەلایەنگری ئەوە, ئەنتوان تائەو ڕۆژە نیشانی دابوو کەسەرکردەیەکی ناشایستەیەو ناوبانگی دەرکردبوو کەپیاوێکی مێبازو عەیش ونەیش پەرستەو بۆسەبوری دڵیخۆی سڵ لەهیچ ناکاتەوە, بەڵام دوای ئەوەی ئەنتوان ترولیوسی دەستگیرکردو ناردی بۆ ڕۆم سەلماندی کەتەواو مایەفووتەو بۆئەوەی بتوانێت ماوەیەکی تریش درێژە بەخۆشگوزەرانی ژیانی خۆی بدات، لەدەست بردن بۆهەموو کارێك سڵناکاتەوە, کاتێ ئوکتاو لەوەڵامی نامەکەی کلۆپاترادا نوسیبووی ئەگەر ئەنتوان بکوژی ئەوائاشتی لەگەڵدا دەکات, کلیۆپاترا نامەیەکی تری بۆئوکتاو ناردوو تێیدا نوسیبووی ئەگەر ئەنتوان بکوژم چ شتێك گرێنتی ئەوئاشتی کردنە دەکات؟

ئوکتاویش لەوەڵامدا گوتبووی پەیماندانی من بەسە بۆئەمە, بەڵام خاتونەکەی من لەوە ژیرتربوو باوەڕ بەکەسێکی سیاسی بکات, ئەو دەیزانی دوای کوشتنی ئەنتوان ئوکتاو ئەو لەناودەبات, کلیۆپاترا دەیزانی زێروگەوهەری گەنجینەی ئەو بەجۆرێك بەلای ئوکتاوەوە بۆتەجێگای گرنگی پێدان کەناتوانێت دەستی لێهەڵگرێت، بۆ دەستگەیشتن بەوەش دەبێ کلۆپاترا لەناوببرێت, ئەمڕۆ کەئەو ڕۆژگارە بەسەرچووە من دەتوانم مەسەلەکان تێبگەم ودەزانم مەبەستی ئوکتاو فریودانی خاتونەکەی من بوو ودەیویست ئەنتوان بەدەستی کلیۆپاترا بەکوشتبدات و دواتر هێرش بکاتەسەر میسرو کلۆپاترا دەستگیربکات ولەگەڵخۆیدابیبات بۆ ڕۆم ودوای ئەوەی لەئاهەنگی سەرکەوتنەکەیدا نیشانی هاوڵاتیانی ڕۆمیدا بیکوژێت, خاتونەکەی من داوای گرێنتیەکی لەئوکتاوکرد, ئوکتاویش کوڕێکی گەنجی بەناوی تیرسوس نارد بۆلای کلیۆپاتراو ئەوکوڕە گەنج وجوانەش پەیامەکەی گەیاندە دەستی خاتونەکەی من کە بەم شێوەیەبوو: من حەزم لەتۆیە ئەگەر تۆ خۆت بەدەستەوە بدەیی وخۆشتبوێم ئەوا من چاولە ستاندنی زێرو زیوەکەت دەپۆشم, خاتونەکەی من ئەوکات تەمەنی سی ونۆ ساڵبوو بەڵام تائەو کاتەش ژنێکی جوان وتەڕبوو ودەیتوانی کاربکاتەسەر دڵی هەندێ پیاو وبیانخاتە کەمەندی عشقی خۆیەوە, بەڵام وەك لەمەوبەر گوتم ئوکتاو لەبەرامبەر خاتونەکەی مندا گەنجتربوو ولەوەنەدەچوو ئەوعاشقی ژنێکی سی ونۆ ساڵبیێت, هەر لەبەر ئەمەشبوو کلیۆپاترا بۆچەند ڕۆژێك تەتەرەکەی ئوکتاوی لەکۆشکی پاشایەتی ئەسکەندەریەدا هێشتەوە تالەناوبراو بپرسێت ولێکۆڵینەوەی وردی لەگەڵدابکات سەبارەت بەئوکتاو بۆی بدوێت وبۆی ڕوونبێتەوە داخوا عشقی ئوکتاو بۆئەو ڕاستە-یان هەریە ڕووکەش بۆفریودانیەتی, تیرسوس سوێندی بەخواکان دەخوارد، دەربڕینی عشقی ئوکتاو بۆئەو ڕاستەو لەکانگای دڵیەوەیەتی, ئەنتوان بیستیەوە کەنێردراوێکی ئوکتاو هاتووەو لەکۆشکی پاشایەتیدا ماوەتەوە، بەڵام نەیدەتوانی نارازیبێت و نەهێڵێت, من خاتونەکەی خۆمم باش دەناسی ودەمزانی ئەومهرەبانیەی کلیۆپاترا لەبەرامبەر( تیرسوس)ی نێردراوی ئوکتاو تەنها لەبەرئەوە نییە کەتەتەری ئوکتاوە, بەڵکو قۆزی ئەو کوڕەش کاریکردبۆسەر خاتونەکەی من, چونکە کاتێ کلیۆپاترا گەنجێکی بەدڵبا ئەوا بۆخۆی دەستەمۆی دەکردو بۆی دەکەوتە سەرپشت وشازادەی میسر لەم ڕووەوە ئاسان شلدەبوو, کلیۆپاترا لەگەڵ پیاوی گەورەی وەك سیزارو ئەنتوان عشق بازی ڕاستەقینەی نەدەکرد، لەناخیەوە حەزی لەوانەنەبوو وتەنها بۆ دەستکەوتی سیاسی وپاراستنی تەختی پاشایەتیەکەی لەگەڵ ئەوانەدا ڕایدەبواردو لەژێر پەردەی عەشقەتیدا کاری بۆئامانجەکانی دەکرد, تیرسوس زۆر بەشادمانیەوە گەڕایەوە بۆسوریا کەئەوکات ئوکتاو لەڕۆمەوە هاتبۆوە بۆسوریا, من دڵنیابووم دوای ئەوەی تیرسوس دەگاتەوەلای ئوکتاو زۆر بەخاتونەکەی من هەڵدەڵێت, چونکە ئەو هەم لەمیوانداریەتی باش وهەم لەڕابواردن ولەزەت وەرگرتن لەجەستەی کلیۆپاترا بەهرەمەندبووە, ئەمە جگەلەوەی دەسکەوتی مادديشی هەبوو، چونکە کاتێ گەڕایەوە بۆلای ئوکتاو لەسوریا، خاتونەکەی من چەندپارچە گەوهەرو زێڕێکی وەك دیاریەکی پاشایانە دابە تیرسوس خۆی, بەوەی من پارێزەری هەموو نهێنیەکانی کلیۆپاترابووم وهەموو نهێنیەکانی ژیانی ئەوم دەزانین، کەچی نەمتوانی لەوەبگەم داخواخاتونەکەی من بەڕێگای تیرسوسدا چ پەیامێکی بۆئوکتاو ناردووە، ئەمڕۆش کەمن ئیستا خەریکم ئەوبیرەوەریانەم دەخەمەسەر کاغەزو بۆنەوەکانی داهاتووی جێبێلم, دەزانم بۆیە کلیۆپاترا باسی ئەوپەیامەی

بۆنەکردووم کەبۆ ئوکتاوی ناردبوو، چونکە خەجاڵەتی لە خۆی دەکێشا بەمن بڵێت ڕازیبووە ئەنتوان بکات بەقوربانی لەپێناو پاراستنی تەختی پاشایەتیەکەی خۆی ودوای مردنیشی ڕۆڵەکانی حوکمی ئەم وڵاتەبکەن, خاتونەکەی من نەیدەویست من بزانم چەند بۆ ئوکتاو دایشکاندووە، تەنانەت تاعاشقەکەی خۆشی بکات بەقوربانی تەختی پاشایەتییەکەی.

دەقی ئەو ڕێککەوتنامەیەی کەلەنێوان خاتونەکەی من وئوکتاودابوو, بەم شێوەیەی خوارەوەبوو:

1- دەبوا ئوکتاو بەخەتی خۆی نووسیبای دوای هاتنی بۆمیسر دەبێ تەختی پاشایەتی میسر بەڕەسمی بناسێت و تائەو ڕۆژەی کلیۆپاترا زیندووبێت شاژنی تەختی پاشایەتی میسربێت و دوای مردنی خۆی سیزاریۆن کەدواتر ناونرا ڕامسس، ببێتە پاشای وڵات ودوای ئەویش منداڵەکانی تری شاژنی میسر حوکمی پاشایەتی میسر بکەن.

2-ئوکتاو بەڵێننامە پڕبکاتەوە، کاتێ گەیشتە شاری ئەسکەندەریە نابێ سوپای لەگەڵدابێت وتەنها دەبێ لەگەڵ سەد کەس لەدەستوپێوەندەکانی خۆی بێتەناو ئەسکەندەریە.

3- کلیۆپاتراش بەڵێنبدات دوای گەیشتنی ئوکتاو بەئەسکەندەریە دە کرور بەتلیموس پارەی کاش بدات بەئەو.

4- ئەگەر ئەنتوانیش ویستی لەبەرامبەر ئوکتاودا بکەوێتە شەڕ, ئەوا خاتونەکەی من بەنهێنی بەسەرکردە سەربازیەکانی سوپای میسر فەرمانبدات شەڕنەکەن وخۆیان بەدەستەوەبدەن.

لەم خاڵەی دواییاندا کەدوایین ماددەی ئەو پەیماننامەی نێوان خاتونەکەی من وئوکتاو بوو، دوو خاڵی تێدان کەجێگای سەرنجن, یەکێکیان مەسەلەی بەرەنگاری بوونەوەی ئەنتوانە ومرۆڤ وابیردەکاتەوە، باشە خۆ خاتونەکەی من دەیویست ئەنتوان بکات بە قوربانی، بۆباسی شەڕی ئەودەکات لەگەڵ ئوکتاودا ؟ ئایا باشتروانەبوو فەرمانبدەربکات ئەنتوان بکوژن تانەتوانێت ڕووبەڕووی ئوکتاو بوەستێتەوە, بۆیە پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوەبکەین ئەوکاتە ئەنتوان خۆی لەکلیۆپاترا بەدوور دەگرت وکۆمەڵێ ڕۆمی لە دەوروبەری خۆیدا کۆکردنەوە بۆئەوەی پارێزگاری لێبکەن, ئەو پێشبینی ئەوەی کردبوو لەوانەیە کلیۆپاترا کوشتنی ئەو وەك کارتێك بەکاربهێنێت بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ ئوکتاودا, لەبەر ئەوەش بوو ئەوخاڵە باسکرابوو چونکە خاتونەکەی من لەوکاتانەدا نەیدەتوانی ئەنتوان بکوژێت, دووەمیشیان ئەوەیە بۆچی کلیۆپاترا بەسەرکردە سەربازیەکانی سوپای میسری گوتبوو خۆتان بدەن بەدەستەوە ئایا بەئاشکرا نەیدەتوانی بەسوپاکەی بڵێت شەڕمەکەن, من دەڵێم نەخێر, لەبەرئەوەی چۆنیایەتی و کەسایەتی شاژنی میسر ئەوەی هڵنەدەگرت خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵکو دەبوا ئەو بەڕووکەش بەرگری کردباو واینیشاندابا شەڕلەبەرامبەر سەرداری ڕۆمیدا دەکات, کلیۆپاترا مامورەکانی حکومەتی بەردابۆ گیان ومالی ئەوکەسانەی لایەنگری ئوکتاو بوون, بۆیە بۆپاراستنی ئەو هەژمون و کەسایەتیەی خۆی دەبوا بەڕیایی واینیشاندابا شەڕدەکات, بۆئەوەی خەڵکی میسر نەڵێن کلۆپاترا لەگەڵ ئوکتاودا ڕێککەوتووە، بۆیە بێ شەڕ سوپای ئوکتاو دێتەناو میسرەوە، کاتێ ئەو هەواڵە لەناو خەڵکدا بڵاوبۆوە کە ئوکتاو دەیەوێت بێت بۆمیسر, سوپای میسر بۆ ڕێگاگرتن لەسوپای ئوکتاو کەوتنە حاڵەتی ئامادەباشی ولەلایەن کلیۆپاتراوە داوا لەئەنتوانکرا فەرماندەی گشتی سوپای میسر بگرێتەدەست,

خاتونەکەی من فەرماندەی سوپای دایەدەست ئەنتوان تاشەڕ لەگەڵ ئوکتاودابکات, سبەڵام لەژێرەوە بەسەرکردە سەربازیەکانی سوپای گوتبوو هەر کەسوپای ئوکتاو هات ئێوە بەسەربازەکانتانەوە خۆتان بەدەستەوەبدەن, ئوکتاو لە سوریاوە بەرەو میسر کەوتەڕێ و سەرەتا گەیشتە خۆرهەڵاتی میسر, لەخۆرهەڵاتی میسردا شارێك هەیە بەناوی پلوز وتیپێکی سەربازی سوپای میسری لەوشارەدابوو وکەسێك بەناوی سلوکوس فەرماندەی ئەو سەربازانەبوو, سلوکوس بەنهێنی فەرمانی خۆبەدەستەوەدانی لەلایەن کلیۆپاتراوە پێگەیشتوبوو, کاتێ ئەنتوان بیستیەوە سلوکوس بەبێ شەڕکردن خۆی بەدەستەوەداوە, ژن و منداڵەکانی کەلە ئەسکەندەریەدا دەژیان کوشت, خەڵك هەستیان بەوەکردبوو کەسلوکوس بەفەرمانی نهێنی کلیۆپاترا خۆی بەدەستەوەداوە, دواتر ئەنتوانیش بۆی ڕوونبۆوە سلوکوس خیانەتی نەکردووە بەڵکو بەفەرمانی نهێنی کلیۆپاترا خۆی بەدەستەوەداوە, ئیتر ئەنتوان ئەفسەرە پلە بەرزەکانی سوپای میسری دەرکردن وئەفسەری تری خستنە جێگایان تائەمانەش وەك سلوکوس خۆیان نەدەن بەدەستەوە, خاتونەکەی من بۆیە ئەنتوانی کردەفەرماندەی گشتی سوپای میسر بۆئەوەی لەگەڵ ئوکتاو بەشەڕدات ودواتر تەنها خۆی بمێنێتەوەو بکوژێت, بەڵام بەپێچەوانەوە ئەنتوان هەڵبژاردەی سوپای ئوکتاوی تێکشکاند, لەو ڕۆژگارەی کەخاتونەکەی من حەزیدەکرد ئەنتوان سەرکەوتوبێت ئەنتوان لەشەڕەکاندا تێدەشکا, لەم کاتەدا شاژنی میسر دەیویست ئەنتوان بکەوێتەدەست ئوکتاو, گەچی ئەنتوان وەك چرایەك دەچوو کەپێش کوژانەوەی تیشکی ڕووناکی بڵاوبکاتەوەو دواتر لەبەربێ نەوتی بکوژێتەوە, لەوڕۆژانەدا دواین مانگەکانی تەمەنی ئەنتوانبوو, چەند نمونەیەکی دلێری وقارەمانیەتی کەئەنتوان لەشەڕەکاندا نواندی بووە جێگای سەرسوڕمانی هەموولایەك بەتایبەت کلۆپاترا, بەشێوەیەك ئەو سەرکەوتنانە ئەنتوانیان دڵخۆش وسەرمەستکردبوو تەنانەت کاغەزی ئاگاداری بەنووکی تیرەکانەوە دەکردوو بەرەو سوپای ئوکتاوی دەهاویشتن ولەوکاغەزانەدا نووسرابوو ئەوسەربازەی خۆی بەدەستەوە بدات ئەوادووسەد وپەنجا بەتلیموس پارەی بەکاش دەدەنێ, ئۆکتاو لەبیستنەوەی ئەوە هەراسان نەبوو وبەسەربازەکانی خۆی گوت ئەنتوان دەیەوێت لەوسەرو سامانە زۆرەی میسر بێبەشتان بکات, ئەگەر ئێوە خۆتانبدەن بەدەستەوە لەوانەیە دوسەد وپەنجا بەتلیموسەکەشتان نەدەنێ, بەڵام کەپشوودرێژبن تائێمە دەگەینە میسر ئەوسامانی دنیامان دەکەوێتەدەست ومن ڕێگا بەئێوەدەدەم شارەکانی میسر تاڵانبکەن وئەسکەندەریەش دەوڵەمەندترین شاری دنیایەو سامان وگەنجینەی ڕۆم لەچاوهی میسر شتێکی هیچ نییەو زۆر کەمترە, کاتێ ئەنتوان زانی ناتوانێ سەربازەکانی ئوکتاو بۆلای خۆی ڕاکێشبکات, بۆئەوەی قارەمانیەتی خۆی دەربخات پەیامێکی بۆ ئوکتاو ناردو تێیدانوسیبوو، ئەگەر پیاویت وەرە بادوو بەدوو شەڕبکەین, لەوەڵامدا ئوکتاو گوتبووی من نامەوێ خۆم بکوژم چونکە نائومێدنیم تاخۆم بکوژم، من دڵنیام لەسەرکەوتنی خۆم, تۆ چونکە نائومێدی ودەزانی تێدەشکێیت, دەتەوێت بەڕێگای شەڕی دووقۆڵی خۆت بەکوشتبدەیت, بەهەر شێوەیەکبێت مردنی تۆ شتێکی ئاشکرایەو هەرکە کەوتیشیەدەستم دەتکوژم. ئەو قسەیەی ئەنتوان شتێکی ناقاڵانەبوو چونکە ئوکتاو پیاوێکی گەنج وبەهێزبوو وئەتوانیش کەسێکی بەتەمەنبوو وخۆی بۆ ئەو ڕانەدەگرت, دواتر خاتونەکەی من هەلێکی بۆڕەخسا کەبەنهێنی بەوفەرماندە تازانەی ئەنتوان داینابوون بڵێت ئەگەرشەڕ دەستی پێکردەوە خۆتان بەدەستەوەبدەن,

هەرواشبوو ئەوئەفسەرانەو سەربازەکانیان شەڕیاننەکردو خۆیان تەسلیمی سوپای ئوکتاوکردو ئەنتوانیش کەتەنها مایەوە ناچاربوو جارێکیتر لەمەیدانی شەڕهەڵبێتەوە, ئەوکاتە ئەنتوان تەمەنی پەنجاو سێ ساڵبوو، خاتونەکەی من دەیزانی تائەنتوان نەکوژرێت ئوکتاو دڵی ئاسودەنابێت, بۆیە پەیامێکی بۆئەنتوان نوسی وتێیدا گوتبووی ئیتر بۆچی دەتەوێت درێژە بەژیانی خۆت بدەیت؟ ئایا دەتەوێت بکەویتە چنگی ئوکتاو وئەوتۆ بەدیلی بباتەوە ڕۆم وبەدەستوپێی کۆتکراوەوە نیشانی هاوڵاتیانی ڕۆمیت بدات ؟ هەرچەندە تۆپیاوێکی ترسنۆکی ولێوەشاوەنی، بەڵام هەربەپیاو هەژمار دەکرێیت، بۆیە دەبێ پیاوئەوەندە غیرەتی هەبێت خۆی کۆتایی بەژیانی خۆی بێنێت تانەبێتە دیلی دەستی دوژمنەکەی وبەسوکی وریسواییەوە نەکوژرێت, دوای مردنی ئەنتوان من هەندێ شتی ئەفسانەییم بیست کەگوایە خاتونەکەی من ویستویەتی ئەنتوان لەناوببات بۆئەمەش پەنای بردووە بۆئۆین وفرت وفێڵ، فێڵەکەشی ئەوەبووە گوایا لەگەڵ شرمیوندا- واتە من، چۆتە ناوئەو گۆڕەی کەبۆ خۆی دروستکردبوو ودەرگاکەی لەسەرخۆی داخستووەو دواتر پروپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆتەوە گوایە کلیۆپاترا خۆی کوشتوە تائەم هەواڵە بەئەنتوان بگات، گوایا کاتێ هەواڵی خۆکوشتنی کلیۆپاترا بەئەنتوان گەیشتووە ئەو زۆر نائومێدبووەو بەنۆکەرەکەی خۆی گوتووە دەسکی شمشێرە دوو نوك تیژەکەم بۆبخەرە سەر زەوی و ڕووەو ئاسمان بیگرە خزمەتکارەکەشی کەناوی( ئاروس )بوو شمشێرەکەی ڕێك بۆداگرتووەو ئەنتوانیش بە گوڕ خۆیبەنوکی شمشێرەکە داداوەو شمشێرەکە بەدڵی ئەنتواندا ڕۆچووەو مردووە, ئەم پروپاگەندەیە سەبارەت بەخۆکوشتنی ئەنتوان هەڵبەستراوە, ڕاستی ئەنتوان لەو ڕۆژانەی دوایی تەمەنیدا خاتونەکەی منی خۆشنەدەویست ودەیزانی کلیۆپاترا دەیەوێت ئەوبکات بەقوربانی بۆئاشتی کردن لەگەڵ ئوکتاودا, ئەگەر لەوکاتانەدا هەواڵی خۆکوشتنی کلیۆپاترا بەئەنتوان گەیشتبا نەك خۆی دەکوشت بەڵکو شادمانیش دەبوو، چونکە ئەوکات لەوانەبوو لەگەڵ ئوکتاودا بتوانێت ئاشتی بکات, ئەوکەسانەی ئەوجۆرە پروپاگەندانە دەکەن کەسانی ساویلکەن ولۆژیکی مەسەلەکە لەبەرچاو ناگرن, ئەو پیاوەی دەیزانی خاتونەکەی من دەیکات بەقوربانی بۆپێکهاتن لەگەڵ دوژمنەکەیدا چۆن دوای مردنی ئەو ئەمیش خۆکوژی دەکات ؟

ڕاستیەکەی ئەوەیە وەك من دیتومەو بیستومە، خاتونەکەی من نامەیەکی بۆئەنتوان نووسی وبەوە ئامۆژگاری کردبوو کەئیتر ئەوئومێدی ئەوەی نەماوە وەك ڕابردووی لێبێتەوە بۆئەمەش نەکەوێتە دەستی ئوکتاو باشترین ڕێگاچارەی ئەوەیە کۆتایی بەژیانی خۆی بێنێت، دوای ئەوەی نامەی خاتونەکەی من بەدەستی ئەنتوان گەیشت, ئەنتوان بانگی ئاروسی خزمەتکاری کردووەو شمشێرە دەم دوفاقەتیژەکەی خۆی لەکالان ڕاکێشاوەو داویەتیە دەستی ئەو وپێی گوتووە بەیەك زەبری بەهێز نوکی ئەم شمشێرە لەسەر دڵم ڕۆکە, ئاروسی خزمەتکاریشی گوتویەتی ئەگەر تۆفەرمانی کوشتنیشم دەرکەی ناتوانم ئەم شمشێرە لەسەردڵت چەقێنم, دواتر ئەنتوان گوتویەتی باشە کەناتوانی ئەم شمشێرە لەدڵمدا نغرۆبکەیت بەدەستیەوە بگرەو چۆنت پێدەڵێم ئاوای ڕایگرە، خزمەتکارەکەشی بەقسەی کردووەو دەسکی شمشێرەکەی لەزەوی چەقاندووەو دەمەو ئاسۆ ڕایگرتووەو دواتر ئەنتوان کەمێ کشاوەتەوەو لەگوڕ خۆی بەنوکی شمشێرەکە کێشاوەو لەپشتی هاتۆتەوە دەرێ, بەڵام ئەنتوان دەستبەجێ

نەمردووە، کاتێ ئەوانەی دەوروبەری زانیویانە ئەنتوان هەوڵی خۆکوژی داوەو لەحاڵی گیانەڵادایە چونەتە بنباڵی ولێیان پرسیوە پێش مردنت چ ئاواتێکت هەیە ؟

ئەویش گوتویەتی حەزئەکەم بۆدواجار کلیۆپاترابیینم، دواتر ئەوداواکاریەی ئەنتوانیان بەخاتونەکەی من گەیاندو وکلیۆپاترا ڕازیبوو ئەوبێنن بۆلای تابیبینێت، من نازانم بۆئەنتوان دوائاواتی ئەوەبوو کلیۆپاترابیینێت، ئایا دەیویست سەرزەنشتی ئەوبکات کەبەئوکتاوی فرۆشت ؟

دەمزانی خاتونەکەی من بۆ ڕازی بوو ئەنتوان بۆدواجار ببینێت، هۆکەشی ئەمەبوو، کلۆپاترا بیری لەوەدەکردەوە نەك ئەنتوان چاکبێتەوەو بەزیندویی بمێنێتەوە، بەڵام کە هێنابایان بۆلای ئەو ئەوابەزیندویی دەرنەدەچوو وفەرمانیدەدا ئەنتوان بەبرینداریش بکوژن، هەرکە ئەنتوانیان گەیاندەلای کلیۆپاترا گیانی سپاردو خاتونەکەی من بەدووچاوی خۆی بینی ئەنتوان بۆدواین جار چاوی لێکنان، دوای مردنی ئەنتوان خاتونەکەی من تەتەرێکی بۆلای ئوکتاو نادر تابەئەو ڕابگەیەنێت ئەنتوان خۆی کوشتووەو ئەو شمشێرەی ئەنتوانیش خۆی پێکوشتبوو بۆئوکتاوی نارد، من دڵنیابووم لەوڕۆژەی ئەنتوان وئوکتاو هاتنەناو گۆڕەپانی سیاسەتەوە ڕکەبەری سەرسەختی یەکتری بوون ودواتر دژایەتیکردنی یەکتری لەنێوان ئەو دوانەدا سەری هەڵدا، هیچ کاتێ لەنێوان ئەنتوان وئوکتاودا دۆستایەتی ڕاستەقینە نەبووە هەتا ئەو کاتەی لەسەر حوکمکردنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیش پێکهاتن، کاتێ ئوکتاو هەواڵی خۆکوشتنی ئەنتوانی پێگەشت، وای بەباشزانی خۆی بەغەمگین وپرسەدار نیشانبدات، هەمان ئەو ڕۆڵەی کەسیزار دوای دیتنی سەری بڕاوی پومپە گێڕای و واینیشاندا بۆی غەمبارە، ئوکتاویش ئەو کارەکتەرەی گێڕا.

# دواین نەبەردی، سەرکەوتن- یان تێشکان

لەوانەی مێژووی سەردەمی خوێندکاریمدا هەندێکمان لەسەر مێژوو نووسی گەورە (توسیدید)(1)(
مێژوو نوسێکی بەناوبانگی یۆنانییە دێرینە- و فارسی) خوێندو ئەو ڕاست ئەکات کەدەڵێت، ئەگەر
بەوردی لەمێژوو وردبینەوە هەموو واقیعەکانی کۆمەڵایەتی ئاییندە لەسەر واقیعەکانی رابردوو،
پێشبینی دەکەیت وئەوەی لەئاییندە ڕوودەدات هەمان دووبارە بوونەوەی ئەوشتانەن کەلە ڕابردوودا
ڕوویانداوەو تەنها روکەشەکەیان دەگۆڕدرێت وبەڕیایی واینیشاندەدات کەتازەن، بۆ ئەوەی
ئەوراستەیەی سەرەوە کەبیسەلمێنم چۆنچۆنی مێژوو دووبارە دەبێتەوە، دەڵێم کاتێ بەتلیموسی
چواردەهەم( برا ومێری کیلۆ پاترا) پومپەی کوشت بۆئەوەبوو خۆی لای سیزار خۆشەویستبکات، بەڵام
لای سیزار خۆشەویستنەبوو، کیلۆپاتراش ئەنتوانی کرد بەقوربانی، تابێتە جێگای سەرنج
وخۆشەویستی ئۆکتاو، بەڵام خاتونەکەی منیش لای ئۆکتاو خۆشەویست نەبوو ونەیتوانی پارێزگاری
لەتەختی پاشایەتی خۆی بکات. دوای ئەوەی هەواڵی خۆکوشتنی ئەنتوان بەئۆکتاو گەیشت، ئۆکتاو
سەرکردە سەربازیەکانی خۆی بانگکردە خێمەکەی خۆی وپێی گوتن مەبەستی من لەم کۆبونەوەیە
ئەمەیە بەئێوە بڵێم من حەزم نەدەکرد ئەنتوان بمرێت ونەمدەویست ئەو پیاوە کۆتایی بەژیانی خۆی
بێنێت, من بۆیە هاتم بۆمیسر تالەگەڵ ئەنتواندا ئاشتی بکەم وپێشنیاری ئەوەی بۆبکەم فەرمانڕەوایی
یەکێك لەوڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم قبوڵبکات, ئەویش بەهۆی خراپ تێگەیشتنی
خۆی پێیوابوو من بۆ کوشتنی ئەو هاتووم بۆمیسر, مەبەستی ئوکتاو ئەوەبوو دۆست ولایەنگرانی
ئەنتوان لە ڕۆمدا نەڕەنجێن وئەوان ئەوبە بەرپرسیاری مردنی ئەنتوان نەزانن, لەوکاتەی ئەنتوان هەوڵی
ئەوەیدەدا خۆی لەکوژرانی ئەنتوان بەبێ گوناە نیشانبدات, خاتونەکەی من بڕیاریدا سیزاریۆنی کوڕی
دووربخاتەوە تائوکتاو دەستی نەگاتێ, ئەو پێیوابوو ئەگەر ئوکتاو بەڵێنەکەی خۆشی بباتەسەر
ئەواسیزاریۆن هەردەکوژێت، خاتونەکەی من لەسیاسەتکردندا زۆر وردبینبوو ودەیزانی ئوکتاو چاوی
بەرینایی نادات کوڕی سیزار بەزیندویی بمێنێتەوە, چونکە خۆی بەمیراتگرەوەی سیزاریۆنی دەزانی,
بۆیە کلیۆپاترا بانگی مێردەکەی منی کردوو گوتی: تیە من سیزاریۆن بەتۆ دەسپێرم تۆئەو لەگەڵخۆتدا
ببە بۆ کوش(1)(واتە خاکی سودانی ئەمڕۆ- و فارسی) و ئاگات لێبێت کەس دەستی لێنەوەشێنێت,
ئینجا خاتونەکەی من دوسەدو پەنجا هەزار بەتلیموسی زێڕی دایە مێردەکەم و پێی گوت، من بۆیە ئەم
پارەیە دەدەم بەتۆ تاکوڕەکەم لەکوشدا بەباشی بژیت، بەڵام تۆکەمێ دەستبەپارەوە بگرە لەبەرئەوەش
ئەمەت پێدەڵێم نەك هەلومەرجێك بێتەپێش من نەتوانم زووزوو پارەتان بۆبنێرم, تۆ لەکوشدا چاوەڕوانی
فەرمانی من بە ئەگەر تاشەش مانگیتر هیچ هەواڵێکت لەمنەوە پێنەگەیشت ئەواسیزاریۆن سواری
کەشتی بکەو ببیە بۆهندوستان ولەوێ خانوێك بکرەوتێیدا خزمەتی سیزاریۆن بکەوماوەی یەك ساڵ

لەوێ بمێنەوە تامن وەڵامت لێدەگێڕمەوە, ئەگەر دوای ئەوساڵە هیچ هەواڵێکت لەلایەن منەوە پێنەگەیشت, ئەوا چەند خزمەتکارێك بۆسیزاریۆن بگرەو بۆخۆت بگەڕێرەوە میسر، نەکەی سیزاریۆن لەگەڵخۆتدا بۆمیسر بێنیتەوە، چونکە ژیانی دەکەوێتە مەترسیەوەو دەیکوژن, دوای ئەوەی هاتیتەوە میسر خۆت بگەیەنە پەرستگای رامسسی دووەم کەلە دەم ڕووباری نیلە, بۆخۆت دەزانی لەبەردەم دەروازەی ئەو پەرستگایەدا چوارپەیکەری بەرد هەن وڕوویان لەخۆرهەڵاتە, لەناوەڕاستی نێوان لێواری ڕووباری نیل وپەرستگاکە گەنجینەیەکی شاراوە هەیە  کەبڕی دوو کرور بەتلیموسی زێڕی تێدایە, بێئەوەی کەس بتبینێت تۆ ئەوپارەیە لەگەڵخۆتدا بیبەرەوە هندوستان وبۆ ژیانی ڕۆژانەی سیزاریۆنی کوڕمی خەرجبکە, من نەمدەزانی خاتونەکەی من لەخۆرئاوای  میسردا پارەی شاردۆتەوە, خاتونەکەی من ئەوەندە متمانەی بەتیەی مێردمبوو شوێمی ئەوپارانەی پێکوت, چونکە دەیزانی مەحاڵە مێردەکەم خیانەتی لەگەڵدابکات وسەرکێشی فەرمانەکانی بکات, من دەزانم وەك چۆن لەنهێنی ئەوپارە شاردراوەیە بێئاگابووم ئاواش لەزۆر گەنجینەی تری شاراوی خاتونەکەی خۆم بێئاگام, دەمزانی هەندێ لەسامانی کلیۆپاترا لەئارامگاکەیدابوو، بەڵام گەنجینەی سەزەکی ئەو لەشوێنێکی تردا شاردرابوونەوەو دڵنیابووم ئەوانەی کەئەو گەنجینەیەشیان بۆخاتونەکەی من شاردۆتەوە کوژراون، لەوانەیە کلیۆپاترا ئەوانەی بەدەستی خۆی ژەهرخواردوو کردبێت من دەزانم بۆیە کلیۆپاترا شوێنی ئەوسامانە شاراوەی خۆی بەمن نەگوتووە چونکە وابیری کردۆتەوە ئەگەر من کەوتمە دەستی ئوکتاو لەژێر ئەشکەنجەکردندا شوێنی ئەوگەنجینانە دەدرکێنم, چونکە کەس ناتوانێ بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەرگەی ئازارو ئەشکەنجە بگرێت وبۆ ڕزگاربوونی لەئێش وئازار چی لەدڵدابێت دەیڵێت، منیش بەتێڕوانینی کلیۆپاترا لەتوانامدانەبووە بەرگەی ئەشکەنجەدانەکانی ئەنتوان بگرم وشوێنتی ئەو سامانە شاراوە ئاشکرا نەکەم, بەڵام کەوەك ئێستام بێ ئاگابام لەمە، ئەوا نەمدەتوانی هیچ بڵێم, وەك لەمەوبەر ئاماژەم بۆکرد یەکێك لەوبڕگانەی لەڕێککەتننامەکەی نێوان ئوکتاو وخاتونەکەی منداهەبوو، ئەوەبوو دەبوا ئوکتاو تەنها خۆیی وسەد کەسی دەستوپێوەندی خۆی لەگەڵدابێت کاتێ دێت بۆئەسکەندەریەو نابێ سوپاکەی بێتەناو ئەسکەندەریەوە, هەروەها هەربەپێی بڕگەیەکی تری ئەو ڕێککەوتننامەیە دەبوا هەرکەئوکتاو گەیشتە ئەسکەندەریە خاتونەکەی من دە کرور بەتلیموسی کاش بدات بەئەو, بەڵام ئەم خاڵەی دواییان پاشکۆیەکی هەبوو ئەویش ئەو بڕگەیەبوو کەدەبوا سوپای ئوکتاو لەسەرخاکی میسر بچێتە دەرێ چونکە کاتێ ئوکتاو ناڕازی باو بەهانەی گرتبا دەیتوانی ئەسکەنەریە داگیربکات, خاتونەکەی من منداڵۆچکێك نەبوو تابتوانرێت بەقسەی خۆش فریوبدرێت, ئەو دەیویست پارێزگاری لەتەختی پاشایەتی خۆی بکات, ئەگەر ئوکتاو ویستی خاتونەکەی من فریوبدات و(وەك لێرەو دوا ئەو واقیعە دەکەوێتە بەر چاو) وڵاتی میسر داگیربکات وگەنجینەی میسر بەتاڵان ببات وخاتونەکەی منیش بەدیلی ببات بۆڕۆم ولەئاهەنگی سەرکەوتنی خۆیدا نیشانی خەڵکی ڕۆمی بدات، کلۆپاترا ئەمەی لەبەرچاوگرتبوو, ڕۆژێکیان لەلایەن ئوکتاوەوە نێردراوێك بۆلای خاتونەکەی من هات وگوتی ئوکتاو دەیەوێت بێت بۆ ئەسکەندەریە, کلیۆپاتراش بەنێردراوەکەی گوت لەزمانی منەوە بەئوکتاو بڵێ دەبێ تەنها بەخۆیی وسەد کەسەوەبێت بۆئەسکەندەریەو سوپاکەی خۆی لەمیسر بباتە دەرێ, ئەو تەتەرە گەڕایەوە لای ئوکتاو ودوای چەند ڕۆژێك  دووبارە گەڕایەوەو بەکلیۆپاترای گوت، ئوکتاو دەڵێت:

ئەگەردەتەوێت سوپاکەم لەمیسر بکشێنمەوە ئەوا سیزاریۆن وەك گرینتی بنێرە بۆلای من, ئەوکاتە خاتونەکەی من تەواو بۆی ڕوونبۆوە ئۆکتاو بەڵێنەکەی خۆی دەشکێنێت، چونکە ئەو ڕۆژەی ڕێککەوتننامەکە لەنێوان خاتونەکەی من وئۆکتاودا مۆرکرا باسی گرینتی نەکرابوو, لێرەوە بەتەواوەتی خاتونەکەی من بۆی ئاشکرابوو ئۆکتاو نیازی پەیمانشکێنی هەیە, چونکە ئەگەر بیەوێت بەپێی بەڵێننامەکەی نێوانیان ڕەفتاربکات ئەواباسی گرینتی نەدەکرد, دوای ئەمە کلیۆپاترا هەستی بەوەکرد پێویستە هێزەکانی خۆی بۆشەڕ ئامادەبکات, فەرمانی بەولەشکرەدا کەبەناوی ئەسکەندەرەوە بوو لەسەربازگەی دەمەتهوردابوو بکەونە جوڵەو بەرەو ئەسکەندەریەبێن وبەربە سوپای ئۆکتاوبگرن کەدەیەوێت بەرەو پایەتەختی ئەسکەندەریەبێت, دوای ئەوەی ئەولەشکرە گەیشتە ئەسکەندەریە کلیۆپاترا فەرمانی پێکردن خۆیسان بۆشەڕی ئۆکتاو ئامادەبکەن, بەڵام ئیتر شاژنی میسر هێزی دەریایی ئەوتۆی نەمابوو تافەرمان بۆئەوانیش دەربکات ڕێگا لەسوپای ئەنتوان بگرن، کاتێ ئۆکتاو زانی سوپای میسر لەسەرڕێگایدایەو نایەڵێت بچنەناو ئەسکەندەریە، فەرمانی شەڕی دەرکرد, نابێ ئەوەشمان لەبیربچێت هیچ یەکەیەکی سەربازی تری میسر نەمابوون جگەلە لەشکری بەناو ئەسکەندەر تابتوانێت پشتیان پێببەستێت, چونکە هەموو یەکەسەربازیەکانی تری میسر ئەنتوان لەگەڵخۆیدا بردبوونی بۆشەڕو بەکوشتی دابوون.

بەوەی لەشکری بەناو ئەسکەندەر نزیکەی شەش هەزار سەربازبوو توانی بۆماوەی سێ ڕۆژ بەربە هێرشی سوپای ئۆکتاو بگرێت, ئەفسەرەکانی لەشکری ئەسکەندەر ئەوپەڕی دلێریان نواندو زۆربەیان کوژران, ئۆکتاو بەڕێگای جاسوسەکانی خۆی ئەوەی زانیبوو لەوانەیە کلیۆپاتر بەرەوخۆرئاوای میسر هەڵبێت ولەوێوە خۆی بگەیەنێتە وڵاتانی خۆرهەڵات, بۆیە دوو تیپی سەربازی خۆی ناردنە ناوچەی دلتا تانەیەڵێت کلیۆپاترا بەوێدا هەڵبێت, ئەوکەشتیە بازرگانیانەی کەهاموشۆیان بەڕووباری نیلدا دەکرد هەواڵی هاتنی دوو تیپی سەربازی ئۆکتاویان بۆسەر ناوچەی دلتا بەخاتونەکەی من گەیاند، هەر لەوکاتەشدا هەواڵی ئەوەگەیشت هێزی دەریایی ئۆکتاو گەیشتۆتە نزیك ئەسکەندەریە, ئۆکتاو بیری لەوەکردبۆوە لەوانەیە شەڕکردن لەگەڵ لەشکری بەناو ئەسکەندەردا درێژە بکێشێت، بۆیە ڕێگای خوارووی گرت تاکلیۆپاترا لەوێوە ڕانەکات، لەلایەکی تریشەوە هێزی دەریایی خۆی بەڕێخست, خاتونەکەی من بیستی هێزی دەریایی ئۆکتاو خەریکە لەئەسکەندەریە نزیك دەبێتەوە فەرمانیدا تەنگەبەری بەندەری ئەسکەندەریە بەزنجیربگرن تاکەشتیەکانی ئۆکتاو نەتوانن پێیداتێپەڕن, هەروەها فەرمانیدا کتێبەکانی کتێبخانەی ئەسکەندەریە ببەنە ژێر زەمینەوە تائەگەر شەڕلەناو شاردا ڕوویدا وەك ڕۆژگاری سیزار نەسوتێن, بەداخەوە بەهۆی ئەو زۆرو ستەمەی کە کلیۆپاترا لەدواین ڕۆژەکانی حوکمڕانیدا دەیکرد دانیشتوانی ئەسکەندەریە لەبەر خواکان دەپاڕانەوە زووتر سوپای ئۆکتاو بێتەمیسرو تەخت وتاراجی خاتونەکەی من تێکبدات وئیتر لەدەست ماموره ستەمکارەکانی کلیۆپاترا ڕزگاریانبێت, خاتونەکەی من تەنها زۆر وستەمی لەدوو شوێنی ڕابواردنی ئەسکەندەریە نەدەکردو هەرئەوانەی لەوێشدا کاریانەدەکرد خاتونەکەی منیان خۆشدەویست وەك لەمەوبەر گوتم کاتێ (بەتلیموسی شمشاڵ ژەن )باوکی کلیۆپاترا پاشای میسربوو خاتونەکەی من دەیگوت ئەگەر ببێتە پاشای میسر ئەواشوێنی ڕابواردنی گیشتی بەرەوپێش دەبات وزۆر گرنگی پێدەدات, کلیۆپاترا

ئەوبەڵێنەی خۆی بردەسەرو دوای ئەوەی چووە سەر تەختی پاشایەتی هەردوو شوێنی ڕابواردنی ئەسکەندەریەی بەشێوەیەکی وابەڕەواج و بوژاندەوە کەگەورەترین وخۆشترین شوێنی ڕابواردنبوو لەدنیادا، ئاشکرایە ئەو گرنگیدانەی شاژنی میسر بەودوو شوێنەی ڕابواردنی گشتی لەبەرخاتری ئەوەبوو زیاتر باجیان لێوەربگرێت وخەزنەکانی خۆی پێپڕبکات, یەکێك لەوکارانەی کە کلیۆپاترا بۆ بەرەوپێشبردن وڕەواجدانی زیاتری ئەوشوێنەی ڕابواردنی گشتی، ئەوەبوو ساڵانە لەهەریەك لەودوو شوێنەدا پێشبڕکێی جوانی سازدەکردو جوانترین ژنیش خەڵاتی لەلایەن کلیۆپاتراوە پێدەدراو خاتونەکەی من خەجاڵەتی لەم کارەی نەدەکێشا، چونکە بەپێی ئەو دەستورەی کەلەکۆنەوە درابوو بەوەی کارکەرانی شوێنی ڕابواردنی گشتی بەبەشێك لەکارفەرماکانی کۆشکی پاشایەتی هەژماردەکرێن, دوای ئەوەی ناوچەی سەری دلتا لەلایەن ئوکتاوەوە داگیرکرا, پەیوەندی نێوان سەروو وخوارووی میسر نەماو ئیتر تیەی مێردم وسیزاریۆن بێ هەواڵبوون, بەڵام خاتونەکەی من لەوبێهەواڵیەی تیە هەراسان نەببوو، چونکە دەیزانی پاش شەش مانگیتر مێردەکەم کوڕەکەی دەبات بۆهندوستان, ئێمە لەوکاتانەی کەپەیوەندی نێوان سەروو خوارووی میسر نەمابوو نەماندەزانی کەئوکتاو زانیویەتی سیزاریۆن چووە بۆناوچەی کوش و دوو هەزار سەربازی خۆی ناردوون بۆکوش تاسیزاریۆن بکوژن وسەرە بڕاوەکەی بۆ بێنن, من زۆر سوپاسی خواکانی میسر دەکەم کەکلیۆپاترا لەکاتی ژیانیدا هەواڵی کوژرانی سیزاریۆنی کوڕی نەزانی ودوای مردنی خاتونەکەم من ئەوهەواڵەم بیست, من دواتر بۆم ڕوونبۆوە ئوکتاو لەناو دەستوپێوەندەکانی کۆشکی پاشایەتی میسردا جاسوسی هەبوون ولەڕێگای ئەوانەوە ئەوەی زانیوە کەکلیۆپاترا سیزاریۆنی کوڕی ناردووە بۆناوچەی کوش تالەمەترسی دوورکەوێتەوە، کلۆپاترا پێیوابوو ئەگەربۆ خۆشی تێدابچێت ئەواسیزاریۆنی کوڕی سەلامەت دەبێت، نەیدەزانی ئوکتاو پێش مەرگی خۆی سیزاریۆن دەکوژێت, من پێموایە ئەوکارەساتەی بەسەر خاتونەکەی من هات، هۆکەی خودی خاتونەکەی من وئەژدادیبوون, چونکە ئەژدادی کلیۆپاترا کەبە ڕەچەڵەك یۆنانیبوون، ئەوەندە زوڵم وزۆرو پیاوکوژیان لەمیسرداکرد لایەنگرانی خەڵکی میسریان نەمابوون, یەکێك لەئەژدادەکانی کلیۆپاترا لەگەڵ دایکی و خوشکەکەیی وکچەکەی خۆیدابوو بەهاوسەرو کچەکەی منداڵێکی لەوباوکەی بوو ودوای ئەوەی ئەو کچۆڵەیە گەورەبوو پاشای میسر لەگەڵ ئەویشدابوو بەهاوسەرو ئەو پاشا زۆرداره هەموو کەس وکارە نێرینەکانی خۆی کوشتن، نەکا یەکێك لەمانە بیرلە گرتنەدەستی تەختی پاشایەتی میسر بکاتەوەو ئەو لەسەرکار لاببات، کلیۆپاتراش جگەلەوەی لەماوەی تەمەنی خۆیدا هەزاران کەسی کوشت- یان بەوکارە سوك وبێ ئابڕوانەی کەدەیکردو هیچ بەنەنگیشی نەدەزانین، لەمانەش پێشبڕکێی هەڵبژاردنی ژنی جوانی لەهەردوو شوێنی ڕابواردنی گشتیدا دانا وەك هونەرمەندان خەڵاتی پێشکەش بەمانە دەکرد، دیارە ئەمانەش سەرچاوەکەیان لەباوباپیرانی ئەوەوە بۆ خاتونەکەی من جێمابوون, ئەنتوان پێیوابوو سیزاریۆن لەخوارووی میسردا لەلایەن لەشکرێکەوە پارێزگاری لێدەکرێت، بۆیە دووهەزار سەربازی بۆکوشتنی ئەو ناردبوو، ئەگەر بیزانیبا تەنها مێردەکەی من وچەند خزمەتکارێك نەبێ کەسی تری لەگەڵدانیە ئەو هەموو سەربازانەی بۆکوشتنی نەدەنارد، ئەو ڕۆژەی سەربازەکانی ئوکتاو لەسەر ڕووباری دلتاوە بەکەشتی بەرەو کوش چوون ڕێگای هاموشۆی کەشتیە بازرگانیەکانیاننەدا هاموشۆبکەن تاکەس هەواڵی هاتنی ئەوسەربازانە نەگەیەنێتە سیزاریۆن

وتیەی مێردم, ئەوکاتە مێردەکەی من سیزاریۆنی بردبووە دێیەك کەکەوتبۆ نێوان نیلی شین ونیلی سپی, ڕووباری گەورەی نیل لەدوو سەرچاوەوەدێت کە یەکێکیان نیلی سپیەو ئەوی تریان بەهۆی شین نواندنی بەڕووباری شین ناودەبەن, ئەم دوو ڕووبارە لەناوچەی کوشدا یەکدەگرنەوەو ئینجا نیلی گەورە دروستدەکەن, لەنێوان ئەو دوو ڕووبارەدا دێیەك هەیە کەخەڵکی ڕەشپێستی بەژنوبالا بەرزی تێدادژین و بەناوچەی تەقای ناسراوە, مێردەکەی من لەودێیەدا خانوێکی گەورەی بۆسیزاریۆن بەکرێ گرتبوو ولەگەڵ دەستوپێوەندەکاندا لەوێدا دەژیان, پێشئەوەی سوپای ئوکتاو ڕێگای سەرو وخواروی میسربگرێت هەرسێ ڕۆژجارێك تیەی مێردم هەواڵی سیزاریۆنی بۆخاتونەکەی من دەنارد, کاتێ سوپای ئوکتاو دەگاتە نزیك ئەوگوندەی کە سیزاریۆنی تێدادەژیا کەس لەودێیە نەیانزانیبوو تائەوان ئابلۆقەی دیکەیان دابوو وڕێگایان نەدابوو کەس نەبێتە دەرێ ونەبچێتە ناوگوندی ناوبراو, دانشیتوانی ئەو دێیە هەموویان ڕەشپێست وبالابەرزبوون و هەر زوو ئەوچەند کەسە سپی پێستانەی کە لەوگوندەدا دەژیان ئاشکرابوون, کەس لەدانیشتوانی ئەو دێیە نەیاندەزانی کوڕی کلیۆپاترا لەدێکەیاندا دەژیت، بەڵام دەیانزانی چەند کەسێکی سپیپێست ماوەیەکە لەودێیەدا نیشتەجێبوون، بۆیە فەرماندە ڕۆمیەکە بەئاسانی ئەو خانووەی سیزاریۆنی تێدا دەژیا دۆزیوەتەوە, مێردەکەی من ودەستوپێوەندەکان ناخافڵبوون ونەیانتوانیبوو دەستبکەنەوەو سەرکردەی سەربازەکان سیزاریۆن دەستگیردەکات ودواتر دەکەوێتە لێکۆڵینەوە لەوەی ئایا ئەوکوڕەی گرتویانە کوڕی کلیۆپاترایە- یان نا, بۆئەمەش هەموو ئەونامانەی لەژوورەکەی سیزاریۆندابوون خوێندونیەوە، ئەونامانەش هی کلیۆپاترابوون کەبۆ سیزاریۆنی کوڕی ناردبوون, ئەوسەرکردە سەربازیە ڕۆمیە لەنامەکانەوە زانیبوی ئەوکوڕە دەستگیرکراوە ڕۆڵەی شازنی میسرە، بەڵام هەربۆ دڵنیابوونەوە لەوە بەجیاجیا کەوتبۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ تیەی مێردم و دەستوپێوەندەکانیتر بۆئەوەی تەواو دڵنیابێت لەوەی ئەوکوڕە دەستگیرکراوە سیزاریۆنی کوڕی سیزاری ئیمپراتۆری پێشووی ڕۆم وکلیۆپاترایە- یان نا.

ئەوپارەی کەتیەش لەکلیۆپاترای وەرگرتبوو تابۆ ژیانی ڕۆژانەی سیزاریۆنی خەرجبکات کەوتبۆدەست ئەوئەفسەرە ڕۆمیە, دوای ئەوەی فەرماندەی گشتی ئەو لەشکرە دڵنیابیبوو لەوەی ئەمە سیزاریۆنە سێ ئەفسەری سەربازی کۆکردونەوە، تابە بەرچاوی ئەوانەوە سیزاریۆن بکوژن, فەرماندەی گشتی ئەو لەشکرە چەند نوسراوێکی دەستکەوتبون ونیشانی ئەفسەرەکانی خۆیداون و دووبارە لەگەڵ تیەو دەستوپێوەندەکانی تردا لێکۆڵینەوەی کردبوو بۆئەوەی نەك بەهەڵەدابچێت و ئەو دەستگیرکراوە سیزاریۆن نەبێت، ئینجا ئەوفەرماندە ڕۆمیە کاغەزێکی هێناوەو داوای لەئەفسەرە پلەبەرزەکانی خۆی کردووە یەك بەیەك مۆری بکەن بۆپەسەندکردنی هەویەتی سیزاریۆن, دواتر فەرماندەی لەشکرەکە فەرمانی بەیەکێك لەسەربازە جەللادەکانی داوە سەری ئەوکوڕە لەگیانی جیابکاتەوە, جەلادەکەش دەستوپێی سیزاریۆنی بەستون ودواتر خستویەتیە سەر لاتەنیشتێکی وتەختێکی خستۆتە ژێر گەردنی، بۆئەوەی شمشێرەکە بەر زەوی نەکەوێت وبەیەك شمشێر وەشاندن سەری سیزاریۆنی لەلاشەی جیاکردۆتەوە, سیزاریۆن بەدلێرانە مردونیشانیدا کەشایستەی ئەوەیە ڕۆڵەی سیزارو کلیۆپاترابێت, دوای ئەوەی سەری سیزاریۆنیان بڕی, لێپرسراوی ئەولەشکرە کۆبونەوەیەکی تری لەگەڵ گەورە ئەفسەرەکانی خۆیدا سازکردوو جارێکیتر ئەمانە ئەوکاغەزەیان ئیمزاکردەوە کەڕاستی ودروستی سەری

براوی سیزاریۆن پەسەنددەکات, دواتر سەرە براوەکەیان خستۆتە ناو ساکێکەوەو بۆ ئەوەی پێش تێکچونی سەری سیزاریۆن بگاتەلای ئوکتاو لەگەڵ نامەیەکدا بەکەشتیەکی تیژڕەودا بۆئوکتاویان ناردووەو زوو گەیشتۆتە دەست ئوکتاو, ئەوکاتەی ئوکتاو داوای گرێنتی ئەوەی لەکلیۆپاترا دەکرد سیزاریۆنی کوڕی وەك بارمتە بۆ بنێرێت تەنها مەبەستی ئەوەبوو خاتونەکەی من تاقی بکاتەوە، دەنا دەیزانی کلیۆپاترا سیزاریۆن بەبارمتە نادات, بەڵام خاتونەکەی من خۆی نەدابەدەستەوەو بڕیاریدا بەرگریبکات, ئێمە نەماندەزانی سیزاریۆن کوژراوەو تیەو دەستوپێوەندەکانیش دەستگیرکراون وسەربازانی ڕۆمی لەگەڵخۆیاندا هێناویانن بۆسەروی میسر, خاتونەکەی من جگەلە شەڕکردن هیچ ڕێگاچارەیەکی نەبوو ولەبیری بەرگریکردن دابوو لەئەسکەندەریە, بەڵام وەك گوتم خەڵکی ئەسکەندەریە نەیاندەویست بەرگری لەوشارە بکەن وخواخوایانبوو هەرچی زووترە سوپای ئوکتاو ئەسکەندەریە داگیربکات تالەدەست زوڵمی کلیۆپاترا ڕزگریانبێت، ئەوکاتەی ڕەشپێستەکان لەباشورەوە هێرشیان کردەسەر ئەسکەندەریەو کلیۆپاترا داوای لەخەڵك کرد لەشکرێکی فیدایی دروستبکات بۆبەرگریکردن لەئەسکەنەریە بەدەیان وسەدان کەس وەك خۆبەش ناونووسی خۆیانیانکردو بەرگری قارەمانانەیان لەئەسکەندەریەکرد, هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو ئەوکات کلیۆپاترا کچێکی لێوەشاوەبوو ولەناو خەڵکیدا خۆشەویستبوو, بەڵام ئیستا کەئوکتاو دەیەوێت هێرشبکاتەسەر ئەسکەندەریە هیچ کەس لەدانیشتوانی شار ئامادەنین خۆبەخشانە بەرگری لەئەسکەندەریە بکەن، چونکە خەڵك لەزۆرو ستەمی کلیۆپاترا کەوتبوونە گیانەڵا, بۆیە کلۆپاترا هەوڵیدا پیاوەکانی ئەسکەندەریە بەزۆر بێنێتەناو هێزی میللیەوە, بێئاگابوو لەوەی خەڵك بەزەبری کوتەك ببەی بۆشەڕ بەرگریکەری ڕاستەقینە نابن وهەرکە هەلیان بۆڕەخسا تەسلیم بەدوژمن دەبن, بەڵام کلۆپاترا دڵی بەوەخۆشبوو توانیویەتی بەزۆر لەشکرێك پێکبێنێت, دوای ئەوەی سەری براوی سیزاریۆن گەیشتە ئوکتاو ئیتر دڵی کەمێ سێبوری پێداهات وبڕیاریدا ڕاستەوخۆ هێرش بکاتەسەر ئەسکەندەریەو لەسێ لاوە پەلاماری ئەسکەندەریەیاندا، یەکێکیان لەخۆرهەڵاتی ئەسکەندەریەوە بوو، دوومیان لەخۆرئاوای میسرەوەبوو– واتە لیبیا، سێیەمیشیان لەخۆرئاوای میسرەوەبوو, ئەو سەربازانەی کەکلیۆپاترا بەزۆر کردبوونی بەسەرباز دەستەدەستە خۆیان تەسلیمی سوپای ئوکتاو دەکرد، سەربازەکانی ئوکتاو لەبەرەی خۆرئاواو باشوری میسرەوە نزیکی ئەسکەندەریە بوونەوە, بەڵام لەبەرەی خۆرهەڵاتەوە نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن چونکە لەشکری بەناو ئەسکەندەریە پێشی بەسوپای ئوکتاو گرتبوو وبەسەختی شەڕیاندەکرد, کاتێ کلیۆپاترا زانی لەڕێگای وشکانیەوە بواری هەڵاتن نەماوە ویستی لەڕێگای دەریاوە هەڵبێت, هێزی دەریایی ئوکتاو کۆنترۆڵی تەواوی دەریایکربوو وهیچ کەشتی و بەلەمێك نەیدەتوانی بەبێ مۆڵەتی ئەوان لەبەندەری ئەسکەندەریە بچێتەدەرێ.

ئەو بەرگریکردنەی لەشکری بەناوئەسکەندەر کەڵکی نەبوو، چونکە سوپای ئوکتاو لەخۆرئاواو باشورەوە گەیشتبوونە نزیك ئەسکەندەریە, کلیۆپاترا بەئومێدی ئەوەبوو خەڵکی شەڕی ناوشار لەگەڵ سوپای ئوکتاودابکەن, بەڵام دانیشتوانی ئەسکەندەریە بەشێوەیەك لەهاتنی سەربازەکانی ئوکتاو شادمانبوون– تەنانەت باوەشیان پێدادەکردن وماچیاندەکردن, خاتونەکەی من بەئومێدبوو ڕێگایەك بدۆزێتەوەو پێداهەڵێت، بەڵام کاتێ سەربازەکانی ئوکتاو گەیشتنە پشت دیواری کۆشکی پاشایەتی ئەو

ئومێدەشی نەماو بەمنی گوت: شرمیون من پێویستە بمرم چونکە ئەگەر کۆتایی بەژیانی خۆم نەهێنم ئەوا دەکەومە دەست ئوکتاو وئەو لەگەڵخۆیدا دەمبات بۆ ڕۆم وبەسوکی تێدادەچم, دوای مردنم منداڵەکانی خۆم بەتۆ دەسپێرم، چونکە ئەمان لەپشتی ئەنتوانن باوەڕناکەم ئوکتاو ئەمانەبکوژێت, وەك بۆخۆت دەزانی من هەندێ لە گەنجینەی خۆم خستۆتە ئاراماگاکەمەوە تادوای مردنم بکەوێتەدەست ئوکتاو، هەرچەندە ئەو گەنجینەیە زۆر بەدڵی ئەونابێت، بەڵام هەربە دەستکەوتی دەزانێت, ئێستا کاتی ئەوەهاتووە دنیا بەجێبێڵم- پێویستە شوێنی گەنجینەکانی خۆم بەتۆبڵێم بۆئەوەی دوای مردنم ئەو زێڕوزیوانە بۆخەرجی منداڵەکانم بەکاربهێنی ودوای ئەوەی گەورەبوون ئەوپارەی مایەوە بیدەیتەوە دەستی خۆیان، کلیۆپاترا گوتی من سامانی خۆم لەسێ شوێندا شاردۆتەوە یەکێك لەوسێ شوێنانە ئەوەیە کەبەمێردەکەی تۆم گوت ولەنێوان پەرستگای ڕامسیسی دووەم وڕۆخی ڕووباری نیلدابوو, بەڵام ئەو پارەیە هی سیزاریونی کوڕمبوو, شوێنێکی تر کەگەنجینەی خۆم تێدا حەشارداوە گۆڕستانەکەی شاری( تبس)ە تۆ لەسەردەمی منداڵیتدا لەگەڵ مندا وانەی ئەندازیاریت خوێندووەو دەزانیت چوارگۆشە چوار قولینچکی هەیەو ئەوگۆڕستانەش چوارگۆشە هەڵکەوتووە, بۆئەوەی بزانی ئەوگەنجینەیە لەکوێدایە لەدوو هێڵی گریمانەیی ڕاست بکێشە کەهەرخەتەو لەگۆشەی چوارگۆشەوە(1) ( مەبەست لە گۆشەی 180یە -و کوردی) درێژ بێتەوە بۆزاویەکەی تری وخاڵی یەکتربڕی ئەو دوو هێڵە- واتە ناوەڕاستی چوار گۆشەکە بەناوەڕاستی گۆڕستانەکەدابێت، بەوشێوەیە شوێنی گەنجینە شاراوەکە دەدۆزیەوە، سێیەمین شوێنی شاردنەوەی گەنجینەی من لەنزیك( خئوپس)ە (1)( واتە هەرەمی گەورە کەبەناوی خئوپس ناوبراوە-و فارسی) ئەگەر لە تەك هەرەمی خئوپسدا بەڕووی خۆرئاوایدا بوەستی ولەدووری نزیکەی هەزار ئانیشك بڕوانی، شێوەی زەویەکە ئەوە بەتۆ نیشاندەدات کوێ شوێنی ئەو زێڕوزیوە ژێر خاکدراوانەیە, بەڵام ئەگەر کەسێکی نەزان سەریری ئەوشوێنەبکات نازانێت کوێیە بەڵام بەوەی تۆکەسێکی وشیار وخوێندەواری هەرکەسەیری ئەو زەویە بکەیت دەزانیت کەوتۆتەکوێ, بەهای کۆی ئەوگەنجینەی کەلەو سێ شوێنەدایە نزیکەی سی بەتلیموسە، بۆیە من چاوەڕوانی ئەوە لەتۆدەکەم دوای مردنی من ئەوپارەیە لەژیانی ڕۆژانەی منداڵەکانم خەرجبکەیت وهەندێکیش دەستی پێوەبگریت بۆئەوەی کەگەورە بوون بەشی زۆری ئەوپارەیە بدەیتە دەستی خۆیان, من دەزانم دوای یەك کاتژمێریتر ئوکتاو دەگاتەناو ئەم کۆشکەو تۆبواری ئەوەت نابێت تەرمەکەی من مۆمیایی بکەیت، نازانم لاشەکەی من چی لێبەسەردێت وئوکتاو چی لێدەکات، بەڵام باوەڕناکەم دوای مردنی من ئەولەمۆمیایکردنی تەرمەکەم ناڕازیبێت، ئەگەر ئوکتاو ڕازیبوو تەرمەکەی من لەم کۆشکەدا مۆمکیایی بکرێت ئەواتۆ وەستاکارە مۆمیاییەکان بێنە تالێرەدا مۆمیایم بکەن, پێیان بڵێ لەشی من وەك فرعەونەکان مۆمیایی بکەن هەتاهەرگیز تێکنەچێت, دوای ئەوەی لەشی منیان مۆمیاییکرد بمبەناو ئەوئارامگایەی کەلەم کۆشکەدا بۆخۆم دروستکردووە, تۆ بۆخۆت دەزانی من سێ تابوتم بۆتەرمەکەی خۆم دروستکردووە، یەکێکیان لەبەردەو ئەوی تریان لەتەختەو سێیەمیشیان لەزێڕ دروستکراوە, دوای ئەوەی تەرمەکەی من مۆمیایکرا بیخەرە تابوتە زێڕەکەو دواتر بیخەرە تابوتە تەختەکەو ئینجا بیخەرە تابوتە بەردینەکەو سەرەکانیان باش قایمبکەو دواتر تەرمەکەم بخەنە ئەوئاراماگا تایبەتیەی کەبۆ ئەم

مەبەستە دروستکراوە, لەئارامگاکەی مندا دوو قاپولکەی گەورەی پڕلەعەتری سوری هەیە, ئەو عەترە چەند بمێنێتەوە بۆنەکەی خۆشتردەبێت ومن حەزدەکەم ئەوشوێنەی تابوتەکەمی تێدادادەنرێت بۆنی عەترو گوڵاوی لێبێت, شرمنیون من سەبارەت بەتۆ هیچ ناڵێم چونکە من تۆم کردۆتە خاوەن سامان ودەزانم دوای مردنی من چاولەدەست نابیت، ئەگەر بارودۆخێکی ناهەموار هاتەپێش ودەستیان بەسەر سامانەکەتداگرت ئەوادەتوانی بەبارتەقای ئەوسامانەی لێتدەستێنن لەگەنجینەکانی منی هەڵگریتەوە, ئێستا بڕۆ ئەوقەفەسە بێنە کەماری ئاسپیکی تێدان تاکۆتایی بەژیانی خۆم بهێنم, من لەبەردەم کلیۆپاترادا کەوتمەسەر پێکانی وگوتم ئەی خاتونەکەم وازلەخۆکوشتن بێنە-یان پێشخۆت من بکوژە تامەرگی تۆ بەچاو نەبینم، کلیۆپاترا گوتی پێویستە تۆ بەزیندویی بمێنیتەوە تادوای من ئاگاداری منداڵەکانم بکەیت, دڵنیام تۆ بەزیندویی دەمێنیتەوەو ئوکتاو تۆ ناکوژێت, کاتێ تۆفان هەڵدەکات درەختی بەرزو بەساڵاچوو دەشکێنێت بەڵام هەرگیز ئەوگیایانەی کەلەکێڵگەی جوتیارێکی میسریدا دەڕوێن تۆفان زیانیان پێناگەیەنێت، تۆش بەبەراورد لەگەڵ مندا وەك ئەو گیایانەوای, دوای من تۆ بەزیندویی دەمێنیتەوەو دەتوانی ئاگاداری ڕۆڵەکانمبیت وگەورەیان بکەیت, بچۆ مارە ئاسپیکەکانم بۆبێنە چون ئەگەر خاوەخاوبکەین ئوکتاو دێتەناو ئەم کۆشکەو دەستگیرم دەکات.

-گوتم خاتونەکەم: تۆ نهێنی شوێنی گەنجینەکانی خۆت بەمن گوت ئایا لەوە ناترسیت دوای تۆ ئوکتاو من ئەشکەنجەبدات ومنیش لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا ئەم نهێنیە بدرکێنم وشوێنی گەنجینە شاراوەکان بەئەو بڵێم؟ ئایا باشترنەبوو بەمنیش نەڵێیت؟

-کلیۆپاترا گوتی: شرمیون من بیرم لەوە کردۆتەوە بەڵام هیچ ڕێگاچارەیەکی ترم نەبوو چونکە جگەلەتۆ باوەڕم بەکەسی تر نەبوو ودەبێ منداڵکانیشم دوای مردنی من درێژە بەژیانیان بدەن و باڵقبن بۆئەمەش پێویستیان بەپارەو خەرجی دەبێت, ئەگەرتۆ دوای مردنی من خێرا خۆت بگەیەنیتە ناوکارەکەرەکانی کۆشك, لەوانەیە ئوکتاو نەکەوێتە بیری ئەوەی لێکۆڵینەوەت لەگەڵدابکات دۆزینەوەی شوێنی گەنجینەکانی من بەتایبەت بەوەی هەندێ لەزێڕو زیو وگەوهەرەکانی من لەئاراماگاکەمدایەو ئەم بڕەش بۆسێبوری دانی دڵی ئوکتاو باشە, ئیتر هیچی تر قسەمەکە بڕۆ قەفەسی ئاسپیکەکانم بۆبێنەو دوای ئەوەی ئەو مارانە پێیەوەیاندام بۆخۆم دەرگای قەفەسەکەیان دادەخەمەوەو تۆش بیانبەوە شوێنەکەی خۆیان، دوای مەرگی من لەتۆ دەپرسن چۆن مردووم تۆش بڵێ بەپێوەدانی مار خۆیکوشتووە, ئیستاش وەرە تۆکە بەدرێژایی تەمەنی خۆت کارەکەری دڵسۆزی من بووی باماچت بکەم, من لەتاوا کەوتمە بەرپێکانی خاتونەکەم و ئەو لەزەوی ڕاستی کردمەوەو ماچی کردم و ئیتر چووم قەفەسی مارەکانم بۆهێنا، دواتر خاتونەکەی من قەفەسەکەی لەبەردەم خۆیدا دانان و بەهێواشی دەرگاکەی کردەوەو دەستی بردەناو قەفەسەکەو مارە ئاسپیەکەکە بێ ئەوەی ڕێزلە خاوەنەکەی خۆی بگرێت بەخێراییەکی بروسك ئاسا سەری خۆی تەکانداو بەدەستی کلیۆپاتراوەیدا، خاتونەکەی من لەپێوەدانی مارەکە ناڵاندی ودواتر هێواش دەستی لەقەفەسەکە هێنایە دەرێ ودەرگاکەی لێداخستەوەو بەمنی گوت ئەوئازارەی من هەستی پێدەکەم وەك دەرزی لەدەست هەڵچونەو دەزانم هیچ هەست بەئازاری تر ناکەم, بڕۆ قەفەسی مارەکە ببەوە شوێنەکەی خۆی, منیش بەخێرایی قەفەسی مارەکەم بردەوە شوێنەکەی خۆیی وبەپەلە هاتمەوەلای خاتونەکەی خۆم وبینیم چاوەکانی خەواڵوبوون,

-لێمپرسی: خاتونەکەم ئایا هەست بەئازار دەکەیت؟
-لەوەڵامدا گوتی: ئاشرمیون تەنها خەومدێت،
-پێم گوت: سەرت بخەرەسەر ڕانی من وبخەوە،
کلیۆپاترا بەدەست ئاماژەی بۆکردم کەلێی نزیکتربیمەوە،
منیش سەری خاتونەکەی خۆم بەرزکردەوەو خستمەسەر ڕانم ودوای چەند ساتێك شاژنی میسر خەوبردیەوە،
لەدەرەوەی کۆشکی پاشایەتیدا ژاوەژاوبوو، هەندێك لەسەربازانی ڕۆمی بەپێداکێشانی مورکێش دەیانویست دەروازەکانی کۆشك دەرپەڕێنن، لەکۆشکی پاشایەتیدا پێنج سەد سەربازهەبوون وبەقارەمانانە شەڕیان بەکرد، بەڵام ژمارەی سەربازانی ڕۆمکی زۆرتر بوون، دوای شکاندنی دەرگاکان هاتنەناو کۆشکی پاشایەتیەوە لەحەساری ناو کۆشکدا شەڕێکی سەخت لەنێوان سەربازەکانی ئوکتاو سەربازەکانی کۆشکی شایەتیدا ڕوویداو سەرئەنجام هەندێ لەوسەربازە میسریانە کوژران وئەوانی تریش خۆیاندا بەدەستەوەو پاش کەمێ ئوکتاو هاتەناو کۆشکی پاشایەتیەوە، پێشئەوەی ئوکتاو بێتەناو کۆشکەوە خاتونەکەی من بێ هیچ ئیش وئازارێك لەخەودا گیانی سپاردو منیش سەری ئەوم لەسەرڕانم لابردو خستمەسەر زەوی و لەوژوورە چوومەدەرێ، چونکە شاژن بەمنی گوتبوو بچمە لەگەڵ کارەکەرەکانی تری کۆشکی پاشایەتی تانەبمە جێگای سەرنجی ئوکتاو، ناخافڵ لەوەی من تادواین ساتەکانی ژیانی کلیۆپاترا لەگەڵی دابووم وهەموو خزمەتکارەکان ئەمەیان بەزانی وناوی منیان دەهێناو منیانەکردە جێگای سەرنجی ئوکتاو، دوای ئەوەی ئوکتاو گەیشتە کۆشکی پاشایەتی لەسۆراغی کلیۆپاترای پرسی وچووە ئەوژوورەو ئەوی بەمردوویی دۆزیەوەو زانی خۆکوژی کردووە، نۆیە بڕیاریدا لێکۆڵینەوە لەمردنەکەی بکات وخزمەتکارەکانیش ناوی منیان هێنا، بانگی منیانکرد بۆئەو ژوورەی کەکلیۆپاترای تێدامردبوو، ئوکتاو چۆنیەتی مردنی ئەوی لەمن پرسی ومنیش ڕاستیەکەم بۆگێڕایەوە، ئوکتاو سەبارەت بەسامانی خاتونەکەم لێی نەپرسیم، بەڵام لێمی پرسی پێشئەوەی بمرێت چی بەتۆگوت ؟
گوتم: وەسێتی لێکردووم تەرمەکەی مۆمیایی بکرێت وبخرێتە ئەوتابوتەی کەبۆ خۆی دروستکردوون ولەوانەدا بنێژرێت، ئەگەر تۆرازیبیت تەرمی خاتونەکەم مۆمیایی بکرێت ئەوامن بەهۆی مۆمیایی کارەکان تەرمەکەی مۆمیایی دەکەم؟
-ئوکتاو گوتی: ڕێگرنیم لەمۆمیایکردنی تەرمی خاتونەکەی تۆ بەگوێرەی ئەوەی بیستومە ئەو ئاراماگاکەی خۆی لەناو ئەم کۆشکەدا دروستکردووە؟
-گوتم: بەڵێ، قەبرەکەی ئەو لێرەدایە، ئایا ڕازیدەبیت من لێرە تەرمی خاتونەکەم مۆمیایی بکەم- یان حەزدەکەیت دەستوپێوەندەکانی کلیۆپاترا لێرەبڕۆن ؟
-ئوکتاو گوتی: تائەو کاتەی تەرمی کلیۆپاترا دەنێژرێت لێرەبە دوای ئەوە لێرەبڕۆ. ڕۆژی دواتر مۆمیاکارەکانم هێنان بۆکۆشك وکەلوپەل وپێداویستیەکانیانم بۆ ئامادەکردن تاتەرمی خاتونەکەم مۆمیایی بکەن هەتا ئەوکاتەش نەمدەزانی سیزاریۆنیان لەباشوری میسردا کوشتوو ومێردەکەشمیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ خۆرهەڵاتی میسر هێناوەتەوە، ئەو مۆمیاکارانەی کەهاتن بۆکۆشك تاتەرمی کلیۆپاترا

مۆمیایی بکەن، سەرەتا تەرمی کلیۆپاترایان خستە حەوزێکی خوێواوکەوە, چەند ڕۆژێك لەوئاوەدا مایەوە دواتر خستیانە حەوزێکی ترەوە کەکافوری تێکرابوو، دوای چەند ڕۆژێکی تر تەرمەکەیان دەرهێنایەوەو خستیانە حەوزێکی تر کەپڕلە خۆڵی مازوی هاڕدراوبوو, دەبێ لەکاتی مۆمیاکردنی تەرمێکدا ددانەکانی هەڵبکێشرێن و ئەو ددانانەش دەبنەهی مۆمیاکارەکان وئەوانیش ئەو ددانانە دەفرۆشن تاپزیشکەکان بیانکەن بەتاقم بۆئەو کەسانەی ددانیان کەوتوون, ددانی خاتونەکەی منیشیان کێشان ومنیش ئەو ددانانەم لەمۆمیاکارەکان کڕیەوە تاوەك یادگاری لای خۆم بیانهێڵمەوە, دوای ئەوەی تەرمەکەیان لەحەوزی سێیەم دەرهێنا سکیان دڕی وهەرچی لەناو هەناو وسینگی کلیۆپاترادابوو دەریانهێناو ئینجا مێشکی سەریشیان لەکونی لوتیەوە بەکەرەستەی تایبەت دەرهێنا, دواتر هەردوو ئەوچاوە جوانانەی کەپیاوانی وەك سیزارو ئەنتوانیان بەچۆك داهێنابوون دەرهێنان, چون ئەگەر ئەوچاوانە دەرنەهێندرابان دەڕزین ومۆمیاکردنەکەیان تێکدەدا.

مۆمیاکردنی تەرمی کلیۆپاترا حەفتاو پێنج ڕۆژی خایاندو بەدرێژایی ئەوماوەیە من لەکۆشکی پاشایەتی نەچوومە دەرێ، چونکە ئوکتاو ڕێگای نەدەدا خزمەتکارەکان لەکۆشك بچنەدەرێ, ئێمە تەنها لەڕێگای پاسەوانەکانەوە پەیوەندیمان بەدەرەوەی کۆشکەوە هەبوو، ئەوانیش هیچیان بۆباس نەدەکردین، من تائەوکاتەش لەکوژرانی سیزاریۆن بێئاگابووم و نەمدەزانی مێردەکەمیان لەسەربازگەی دەمەتهوردا زیندانی کردووە, پێشئەوەی تەرمی کلیۆپاترا بنێژرێت, ئوکتاو هەموو زێڕو گەوهەرەکانی ناو ئارامگای کلیۆپاترای بردو منداڵەکانی کلیۆپاتراش کەلەپشتی ئەنتوانبوون و دەبوا من سەرپەرشتیان بکەم، لەکۆشکی پاشایەتی میسری بدرنەدەرێ, من لەوە دەترسام ئوکتاو ئەومنداڵانەی کلیۆپاترا بکوژێت, بەڵام ئوکتاو ئەومنداڵانەی لەژێر چاودێری چەند دایانێکی تایبەتیدا گەورەکردن و ئەمڕۆ کەوامن ئەم ڕاستیانە دەنووسمەوە منداڵەکانی شاژنی میسر لەڕۆمدان و بوونە خاوەن پلەوپایەی گەورە, هەرکە تەرمی کلیۆپاترایان بردە ئارامگاکەی ودەرگاکەیان داخست, ڕەفتاری ئوکتاو لەگەڵ من و خزمەتکارەکانی تری کۆشکدا گۆڕاو ئێمەیان زیندانی کرد, لەوکاتەدا زانیم سیزاریۆنیان کوشتووە، چونکە تیەی مێردمیان لەسەربازگەی دەمەنهوترەوە هێنا بۆ زیندان و چاوم تێی هەڵەنگوت, هۆی زیندانی کردنی ئێمە ئەوەبوو ئوکتاو دەیویست بزانێت کلیۆپاترا سامانی خۆی لەکوێدا شاردۆتەوە, ئوکتاو کەسەرەتا میسری دلگیرکرد، نەیدەزانی سامانی کلیۆپاترا زۆر لەوە زیاترە کەلەئارامگاکەیدایە, بەڵام دوای ئەوەی ماوەیەك لەمیسردا مایەوە, میسری وڕۆمیەکان بۆیان ڕوونکرادبۆوە کەکلۆپاترا سامانێکی زۆری هەبووەو ئەوەی لەئارامگاکەیدا دەستی کەوتووە بڕێکی زۆرکەمی سامانەکەیەتی, ئەوانە بەئوکتاویان گوتبوو، لەوانەیە شرمیون کەکارەکەری نزیکی شاژنی میسرو مێردەکەی ئەو، بزانن کلیۆپاترا سامانەکەی خۆی لەکوێدا شاردۆتەوە، هەموو ئەو دستوپێوەندانەی لەگەڵ ئێمەدا زیندانی کرابوون تائکیدیان لەسەر ئەم قسەیە کردبۆوە, بۆیە ئوکتاو بڕیاریدا من ومێردەم بخاتە ژێر ئەشکەنجەدانەوە, من کەتەواوی تەمەنی خۆم لەکۆشکی پاشایەتیدا بەسەربردووە، دەمزانی ئەشکەنجەدان چۆنە، هەروەها بیستبووم ڕۆمیەکان لەئەشکەنجەداندا شارەزاترین میللەتی دنیان, جەللادەکانی ڕۆمی ئەگەر بیانەوێت کەسێك ئەشکەنجەبدەن بەدڵنیاییەوە ناچاری دەکەن ئەوەی لەدڵی

دایە دەری ببڕێت وهیچ کەسێکیش ناتوانێت ڕۆمیەکان فریوبدات، چون ئەگەر ئەو کەسە ئیعترافیش بکات، بەرهەڵدای ناکەن و لەزینداندا دەیهێڵنەوە تابۆیان ڕووندەبێتەوە ئەو شتەی ئەو گوتویەتی ڕاستە- یان نا, خۆئەگەر درۆی کردبێ ئەوا سەختتر ئەشکەنجەی دەدەنەوە, ئەوکەسەی کەدەکەوێتە ژێر ئەشکەنجەدانی ئەمانە بەرگەی ئەوئازارە ناگرێت ونهێنی دڵی دەدرکێنێت, دیارە تائەشکەنجەش زیادبکات ئازارو ئێشەکان بەهێزتردەبن ولەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ئەندامی لەش وەك دەست وپێ و چاو وگوێ ولوت توشی لاوازی ولەناوچوون دەبنەوە, سەرئەنجام ئەوکەسەی بەرگەی ئازارناگرێت ودان بەونهێنیەدا دەنێت کەلایەتی, جارهەیە جەللادەکەی چاوی دەردەهێنێت وبەنابینا دەمێنێتەوە, من دەمزانی بەرگەگرتن بۆئەو ئەشکەنجانە شتێکی شێتیە چونکە مرۆ سەرئەنجام هەردەبێ ئەوەی لەدڵتدا حەشاریداوە بیڵێت وژیانیش بە کەمئەندامی سەختەو باشتروایە بمرێت, بۆیە پێشئەوەی جەللادەکە یەکەم شیشی سورکراوە بەگیانمدا بکات، داوامکرد ئوکتاو ببینم وشوێنی هەرسێك گەنجینە شاراوەکەی پێبڵێم ویەکێك لەمانە ئەو گەنجینەی ڕامسسی دووەم بوو کەکلیۆپاترا بەتیەی مێردمی سپاردبوو تابۆ گەورەکردنی سیزاریۆن خەرجیبکات, بەمە مێردەکەشم لەئەشکەنجەدان ڕزگارکرد، چونکە سیزاریۆن نەمابوو وئەو منداڵانەی تری کلیۆپاترا کە دەبوا کەڵك لەدوو گەنجینەکەی تر وەربگرن ئوکتاو بردبوونی, خۆ ئەگەر ئوکتاویش ئەمانەی نەبردبا ئەوا من لەژێر ئەشکەنجەدا ناچاردەکرام ئەوگەنجینە شاراوانە ئاشکرابکەم, دەستبەجێ ئوکتاو فەرمانی هەڵکەندنی ئەوسێ شوێنەی داو گەنجینەکانیان دەرهێنان و من ومێردەکەشمیان ئازادکرد, ئەو زێڕوگەوهەرەی دەست ئوکتاو کەوت زۆر لەوە زیاتربوو کەوێنای دەکرد، بۆیە چاوپۆشی لەسامانی من و مێردەکەم کردو ئێمە دوای بەربوونمان لەزیندان لەخانوێکی بچوکی ئەسکەندەریەدا درێژەمان بەژیانی خۆماندا، من لەتیە سێ منداڵمبوو یەکێك لەمانە کوڕبوو و دووکانی تریش کچ بوون، بەڵام هەرسێکیان مردن وئیستا کەبەساڵاچووم هیچ منداڵم نین, ژیانی من دوای مردنی خاتونەکەم شایانی باسکردن نیەو ئەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتوون تەنها مردنی ڕۆڵەکانمەو دواتریش مەرگی تیەی مێردم کەبەنەخۆشی تاعون مرد.

ئێستاش کەخەریکی نوسینی ئەم یاداشتانەم، وڵاتی میسر لەژێر دەسەڵاتداریەتی حکومەتی ڕۆمدایەو فەرمانڕەوایەکی ڕۆمی حوکمی نیشتمانەکەی ئێمە دەکات و فەرمانڕەوای ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیش هەر ئوکتاوە، بەڵام ئیستا لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا ئەو بەئوکتاو ناونابەن بەڵکو ناونراوە( ئیمپراتۆری مەزن )کەبە زمانی ڕۆمی پێی دەگوترێت( ئیمپراتۆر ئوگوستوس) لەکارە ڕەسمیەکان و وتارو نوسینەکاندا ئوکتاو بەم ناوانەی خوارەوە ناودەبەن( کاییوس، ژولیوس، سیزار، ئوکتاویوس، ئوگوستوس هەندێك لەدیارترین نووسەرو شاعیرانی ڕۆمی وەك هوراس، ویرژیل وتیت، لیو ئاڤید, ئەوەندەیان بەئوکتاو هەڵگوتوەو شعریان لەسەر هەڵداوەو نووسیوە تەنانەت ئوکتاو لای ڕۆمیەکان لەخواکان بالاتربووە, ئوکتاو لەمردنی کلیۆپاترا خۆی بەبێ گوناه نیشانداو گوتی، من بەرپرس نیم لەکوژرانی کلیۆپاترا, شاژنی میسر بێئەوەی هیچ فشارێکی بکەوێتەسەر خۆی کوشتووە, هەروەها دەیگوت: ئەگەر شاژنی میسر خۆی نەکوشتبا ئەوی لەجێگاکەی خۆیدا دەهێشتەوە تاکۆتایی تەمەنی پاشای میسربا.

بەڵام من دەزانم درۆدەکات، ئەگەر ئوکتاو دەستی بگەیشتایە خاتونەکەی من، بەدیلی دەگرت ولەگەڵ خۆیدادەیبرد بۆ ڕۆم، دوای ئەوەی ماوەیەك بەڕەزیلی دەیهێشتەوە دەیکوشت, ئەگەر ئوکتاو مەبەستی

کوشتنی کلیۆپاتراو دەستبەسەر داگرتنی سامانی ئەوی نەبوو بەڵێنەکەی خۆی نەدەشکاندو سوپاکەی خۆی نەدەهێنایە ناو میسر, ئەمرۆ ناوی ئۆکتاو بەئوگوستوس دەبەن- واتە مەزن, بەڵام ئەوپیاوە لەبەرچاوی من کەسێکی مایەپوچە، چونکە بەڵێنەکەی خۆی شکاند، ئەوی بەڵێنی خۆی بشکێنێت کەسێکی بودەڵیە, ئەو بەڵێنی بەخاتونەکەی مندابوو چاوی لەخاکی میسرەوە نییەو تەنها دێتەناو ئەسکەندەریەو بۆئەوەی بەهانەیەکیش بۆشکاندنی بەڵێنەکەی خۆی بدۆزێتەوە مەسەلەی بارمتەی هێنایەپێش, بەڵام خاتونەکەی من بۆئوکتاوی سەلماند ئەوخاوەنی مەزنیە چونکە بەپێوەدانی مار کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا تابەرەزیلی لەناونەبرێت و بەدەستی دوژمنەکەی بەکوشت نەچێت, من وزۆر لەهاونیشتمانیەکانم لەوبروایەدابن کلیۆپاترا لەشەڕ لەگەڵ کەسێکدا کەدواتر( ژولیوس سیزار)بوو بەگەورەترین سەرداری مێژووی ڕۆم وگەیشتە پلەی ئیمپراتۆری و خوایی تێشکا، بەڵام بەمەرگی دلێرانەی خۆی ئەم تێشکانەی بەسەرکەوتن گۆڕی.

کۆتایی

مێژوو خۆی دووبارەدەکاتەوە، بەڵام شێوازی ڕووداوەکان گۆڕانکاریان بەسەردادێت بەپێی ڕۆژگارو سەردەمەکان، ئەگەر لەوسۆنگەوە سەیری مێژوو بکەین، دەبێتە بۆچوونێکی ئایدیالی، خوێکە لەکوشەنیگای کۆمەلایەتی هاوچەرخیشەوە شیکاری ئەمەبکەین، پێوانەکان پێچەوانە دەبنەوە، خوکە بەتێڕوانینی تایبەت لێبیروانین- نەمێژوو زانستەو نەدووبارەش دەبێتەوە، تەنها هەندێ لەیەکچوونی سادە بەرووداو وپێشهاتەکانەوە دیارن، لێرەدا دەکەوینەنەبەردەم پرسیارێک، ئەویش ئەوەیە: ئایا لەکوێدا مێژوو بەهای خۆی لەدەستادات مادام ڕووداوەکان بەردەوام لەدووبارە بوونەوەدان؟

وەرگێڕ: کوردۆ



# نێوەندی بڵاوکردنەوەی ئاراس

ئامادەین بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانتان بە جوانترین شێوەی هونەری
بەچاپ گەیاندنی رۆمان و چیرۆك و شیعرو بابەتی فەلسەفی و هونەری


**ئاسیا:** 07701918565
**سانا:** 07301241518


نرخی (( 8000 )) دینارە

ڕووداروەکانی ئەم بەسەر هاتە مێژووییەی " شرمیون " بۆمان دەگێڕێتەوە : ئەو ڕاستیەمان لا ڕوون دەکاتەوە، ناداد پەروەری کۆمەڵایەتی هەرلەدێر زەمانەوە هەبووە، تەنانەت لە حکومەتێکی نمونەیی وەك "ڕۆم" یشدا کە بۆ ماوەی "١٥" سەدە دوای خۆی نمونەی نەبۆتەوە، بۆیە کاتێ لە مێژوو دەکۆڵینەوە پەی بە زۆر شت دەبەین لەوانەیە لای ئێمە تا ئێستاش تازە بن .

ئەوەی جێگەی سەرنجە لە پێش میلادەوە و لەڕۆمدا حکومەتی دیموکراسي و ئازادی هەبووە ، کەچی بۆماوەی هەزارو پێنج سەد ساڵ دوای ئەو مێژووە ، دیموکراسی لە دنیادا بەخانەی لە بیر چوونەوەو پەراوێز بوون سپێردرا.

**وەرگێڕی کوردی**



نێوەندی ئارام بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە